# رۆچنەیەک
# بۆ ئەدەبی کوردی
# لە رۆژهەڵاتی کوردستان

بەرگی یەکەم

## زمان و ئەدەبی زارەکی

ئامادەکردنی

شەریف فەلاح

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ڕاگەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی

# ڕۆچنەیەک بۆ ئەدەبی کوردی
# لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان

## بەرگی یەکەم:
## زمان و ئەدەبی زارەکی


ئامادەکردنی
شەریف فەلاح



سلێمانی
٢٠١٢

# رۆچنەیەک بۆ ئەدەبی کوردی

# لە رۆژهەلأتی کوردستان


- ئامادەکردنی: شەریف فەلاح
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- پیتچنی: ئامادەکار
- هەڵەچنی: کارزان عەبدوڵلأ
- نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: پەیام ئەحمەد
- سەرپەرشتیاری چاپ: کارزان عەبدوڵلأ
- قەبارەی کتێب: B4
- ژمارەی لاپەڕە: ٥٥٢
- زنجیرەی گشتیی کتێب: (٩٠٢)
- تیراژ : (٥٠٠) دانە
- چاپ: چاپخانەی لەریا
- نرخ: (٦٠٠٠) دینار
- ژمارەی سپاردنی (٢٦٦٦)ی ساڵی ٢٠١٢ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بلأوکردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران
ژمارەی تەلەفۆن: ٣٣٠١٩٤٩

# پێڕست

## بەرایی

پرۆژەی "رۆچنەیەك بۆ ئەدەبی كوردی لە رۆژهەڵاتی كوردستان"، ماوەی زیاتر لـە سێ ساڵ لەلام گەڵاڵە كرابوو، بەردەوام دەستپێكردنی ئەم كارە سەرەڕای سەرقاڵیی زۆر و هەلومەرجی ژیان و كاری وەرگێڕان و چالاكییە فەرهەنگی و ئەدەبییەكانی دیكـەم، میوانی زەینم بـوو. هەرچـەند بـە ئەنجامگەیانـدنی ئـەم چەشـنە كارانـە لەڕاسـتیدا پێویستی بە پشتیوانیی مادی و مەعنەوی، ناوەند و بنكەیەكی توێژینـەوەی فـەرمی، بەرنامـەی كـاری، لیژنـەی ئاكـادیمی و زانسـتی، رەچـاوكردنی چـۆنیەتی مێتـۆدی لێكۆڵینەوە و كاری بەردەوامی مەیدانی و دەرفەتی تایبەت هەیە، بـەڵام هەڵكەوتـەی شوێنی ژیان و كاری من و دوور بوونم لە جوگرافیای "رۆژهەڵاتی كوردستان" لەلایـەك و نەبوونی ئەو هەل و دەرفەتانەی كە لەسەرەوە باسم لێكردن لەلایـەكی تـر هێنایانمـە سەر ئەو قەناعەتەی كە دەست لەسەر دەستدانان و چاوەڕوانی بـۆ رەخسـاندنی هـەلی پێویست، كات بەفیڕۆدانە و هەنگاو نەنانی بەكردەوە بەرەو هەڵدێری هەڵـە و لاوازیـی فەرهەنگی و ئەدەبی و نەبوونی سەرچاوەی قۆناغەكانی رابردوو پەلكێشمان دەكەن.

بۆیە سەرەتای ١٣٨٩ی هـەتاوی (٢٠١٠ی زایـینی) پـاش پـۆلێنكردنی هـەوێن و گەوهەری پرۆژەكە لە بانگەوازێكـدا روو بـە سـەرجەم نووسـەر، ئـەدیب، لێكۆڵـەر و رۆشنبیرانی رۆژهەڵاتی كوردستان، بە فـەرمی دەسـپێكی پرۆژەكـەم راگەیانـد و داوای هاوكاریم لە هەموو لایەك كرد و لە سەرەتادا مەبەستم ئەوە بوو بـزانم چـەندە هێـز و كەس بەدەم بانگەوازی ئەم پرۆژە فەرهەنگییەوە دێن و لەم رێگایەوە چەندە مادەی خـاو و سەرچاوە و بابەت دەگاتە دەستم و چەند كەس ئامادە دەبن كە پێكەوە ئەم پرۆژەیە بە ئەنجام بگەیەنین، بەڵام ئـەوەی جێگـای داخ و كەسـەرە و دەبێـت هەڵوەسـتەی لەسـەر بكرێت، كەمتەرخەمی و ساردوسڕیی بەشێكی زۆر لە نووسەران و ئـەدیبانی جیـدی و

هەڵسووڕی ڕۆژهەڵات بوو لە بەرامبەر ئەم کارەدا و بەو چەشنەی کە چاوەڕوانی دەکرا، بەدەنگەوە نەهاتن. هەرچەند هەموو ڕێکار و ڕێگاکانی پێوەندیی حزووری و شێوەکانی پێوەندیی سەردەم (دونیای مەجازی) تاقیکرانەوە و پرۆژەکە بەتایبەتی بۆ تاکەکان نێردرا، مەخابن دیسان گرنگیی ئەم کارە و نەبوونی کارێکی جیدی لەمەڕ سەرچاوە، کۆکردنەوە و نووسینەوەی ڕەوت و قۆناغە زمانی و ئەدەبیی و فەرهەنگییەکان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان داینەچڵەکاندن. هەموو ئەو ساردی و سڕی و خەمساردییانە نەك تەنیا نەبوونە هۆی دڵساردی و پاشگەزبوونەوەم لەم کارە، بەڵکو بوونە هۆی پێداگری و سووربوونم لەسەر بەئەنجامگەیاندنی، بۆیە وەك نەریتی باوی کاری فەرهەنگی لە کوردستان کە بەدەرە لە کار و پرۆژەی هەرەوەزی و ڕێکخراوەیی، بە تەنیا شانم دایە بەر. لەوانەیە باسکردنی ئەو گرفت و ئاستەنگانەی کە لە ڕەوتی بەرەوپێشبردنی کارەکانی بەرگی یەکەمدا ڕووبەڕوومبوونەتەوە و ئەم گلەیی و گازندانە دڵی هێندێ کەس برەنجێنێت، بەڵام ئەمانە ڕاستییەکانی کاری فەرهەنگیی ئێمە و هەروەها ئەو گرفت و پەتایانەن کە دەست و پێمانیان بەستووە و ڕۆحی هاوکاری و هەست بە بەرپرسایەتییان لە ناخماندا کوشتووە.

باس نەکردنی ڕاستی و واقیعەکانی کاری فەرهەنگی و شاردنەوەیان، یەکەم: کڵاو لەسەرخۆنانە و دووەم: کوشتنی ڕۆح و ورەی ڕەخنەی بنیاتنەرە کە بەرەنجامەکەی پەروەردەی نەوەیەکی ترسنۆك، بێ هەڵوێست و پەراوێزنشینە.

باسکردنی ئەم مەسەلانە و خستنە ڕووی گرفت و ئاستەنگەکانی بەردەم لێکۆڵینەوە و کاری فەرهەنگی لە کوردستان و هێنانە بەرباسی ئەم پرسە بەو مانایەش نییە کە ئەم دۆخە ڕاستەڕێی کاری فەرهەنگیی ئێمە دیاری دەکات و نابێت بەشێوەی ڕەها لە قەڵەم بدرێت کە کەس بەدەنگەوە نەهاتووە یان حازر نەبووە یارمەتی بدات، بەڵکو زۆر قەڵەم بەدەست، شاعیر، مامۆستا، ئەدیب و ڕۆشنبیری کوردستانی ئێران لە ناوخۆ، لە هەرێمی کوردستان و دەرەوەی وڵات پێشوازییان لێکرد و بە تێبینی و سەرنجی بەنرخ ڕێنوێنییان کردم، بەڵام هاوکارییەکان لە ئاستی داخوازی و چاوەڕوانییەکاندا نەبوون، چونکە خۆرهەڵاتی کوردستان بەو تایبەتمەندییە فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەی کە هەیەتی و بە لەبەرچاوگرتنی توانایی، شارەزایی و پسپۆڕیی ئەدیب و نووسەرانی ئەو بەشەی نیشتمان، دەکرێت بەرهەم و شاکاری بەپێز و

پڕ ناوەرۆکتر لەم کارەی ئێستا کە لەبەر دەستدایە، ڕەوانەی کتێبخانەی ئەدەبی کوردی بکرێت.

مەسەلەیەکی دیکە کە دەمەوێت لە سەرەتای ئەم بەرهەمەدا لەگەڵ خوێنەران بیهێنمە بەرباس، چوارچێوەی کار، ناوەرۆك، ئاراستە و چۆنییەتی پۆلێنبەندیی ئەم پرۆژە و هەروەها چەند سەرنجێکی گشتییە لەمەڕ چەمکی "ئەدەبی کوردی" و ئەدەبی کوردیی ناوچەیی.

مێتۆدەکانی کارکردن و هەڵبژاردنی ناوەرۆکی ئەم پرۆژەیە "رۆچنەیەك بۆ ئەدەبی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان"، کە سەرجەم پێنج بەرگە، بەم چەشنەی خوارەوەیە:

- بەرگی یەکەم: زمان و ئەدەبی زاررەکی.
- بەرگی دووەم: شیعر، قۆناغەکانی کلاسیك و نوێ.
- بەرگی سێیەم: چیرۆك و ڕۆمان.
- بەرگی چوارەم: ڕەخنەی ئەدەبی کوردی.
- بەرگی پێنجەم: ڕەوشی ئەنجومەنە فەرهەنگی و ئەدەبییەکان، ڕۆژنامەگەریی ئەدەبیی و...

- شێوازی کارکردن و ئامانجی سەرەکیی ئەم پرۆژەیە، هەروەك لە بانگەوازی دەسپێکدا خرابووە روو، وەك دەسپێك و جۆرێك لە نووسینەوە و کۆکردنەوەی مێژووی ئەدەبی هاوچەرخە، واتە دەستنیشانکردنی سەرەتا، هۆکار و بەستێنە سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، مێژوویی، ئابووری و فکرییەکانی سەرهەڵدانی قۆناغ و ڕەوتەکانی زمان، ئەدەبی زارەکی، شیعر، چیرۆك و ژانرەکانی دیکەی ئەدەب و هونەر بووە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

- لەم پرۆژەیەدا جیا لە هێندێ وتار و لێکۆڵینەوە و دیمانە کە پێشتر ئەنجامدراون، ئاراستەی کارکردن لەسەر بنەمای دەق نەبووە، بەڵکو زیاتر هەوڵدراوە سەرجەم پێکهاتە و هەوێنی ئەم پرۆژەیە وەك ڕۆچنە و دەلاقەیەك بێت بۆ چوونە ناو پانتایی پڕ لە هزر و ڕەهەندی فکریی جیاواز کە لە بەستێنی زمان، ئەدەبی زارەکی، بەتایبەت شیعر، چیرۆك، ڕۆمان و لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە گۆڕێدان.

- هەروەك لە بانگەوازی سەرەتاشدا هاتبوو، لەم پرۆژەیەدا چوار جۆر کار کراوە. یەکەم: ڕاستەوخۆ لەلایەن ئامادەکارەوە لەگەڵ توێژەر، نووسەر، شاعیر، ئەدیب و

ڕەخنەگران دیمانەی بەربڵاو ئەنجامدراوە، دووەم: ئەوانەی کە ئامادە نەبوون لەڕێگای وتووێژەوە بەشدار بن، بابەت و لێکۆڵینەوەیان ناردووە. سێیەم: لەلایەن هاوکار و راوێژکارانی دڵسۆزەوە لە کوردستانی رۆژهەڵات دیمانەی تایبەت بۆ ئەم کارە ئەنجامدراوە، یان داوای بابەتی لێکۆڵینەوەی پێوەندیدار لە نووسەران کراوە. چوارەم: ئەو دیمانە و بابەت و لێکۆڵینەوانەی لەخۆگرتووە کە پێشتر لە گۆڤارە ئەدەبی و فەرهەنگییەکان یان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاو ببوونەوە و بە ئیزنی خاوەن بەرهەم تێیدا گونجێنراون.

یەکێك لە گرفتە سەرەکییەکانی بەردەم توێژینەوە ئەدەبییە کوردییەکان، گرفتی پێناسەی سنوورەکانییەتی. نەبوونی دەسەڵاتێکی یاسایی- سیاسیی کوردی، بە واتایەکی دی نەبوونی دەوڵەتێکی کوردی هەتارادەیەکی زۆر بڕیاردان لەبارەی سنوورەکانی "ئەدەبی کوردی" وەك ئەدەبیاتێکی نەتەوەیی کردووەتە پرسێکی نەلواو.

ئەوە راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە ئەدەبیاتی ئەمریکایی، بەریتانیایی و کانادایی، سەرەڕای ئەوەی کە هەموویان بە زمانی ئینگلیزیی نووسراون، لە یەکتر جیان و تایبەتمەندیی خۆیان هەیە و ئەمەش دەربڕی ئەوەیە کە زمان بە تەنیایی دەربڕی ناسنامەی ئەدەب و وێژە نییە. وەها ئاڵۆزییەك لە ئەدەبیاتی عەرەبی، ئیسپانیۆلی و ئەفریقای باشووریشدا هەیە. لەبەرئەوەی کە (دەوڵەت- نەتەوە)کان تەنیا لەسەر بنەمای سنوورە زمانییەکان پێکناهێنرێن، بەڵکو چەندین دەوڵەت و هەرێمی بچووکی ناوچەیی هەن کە خاوەنی زمانی هاوبەشن، بەڵام هەلومەرجی کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئابووریی جیاوازیان هەیە کە هەرکام بە نۆرەی خۆیان شێواز، رێچکە و رێبازی ئەدەبیی جیاواز بەرهەم دەهێنن. لەم رووەوە، زمانی هاوبەشی هێندێ لە ئەدەبە نەتەوەییەکان، بە واتای ئەدەبیاتی یەکسان و یەکگرتوو نییە. هەرچەشنە توێژینەوەیەك لەبارەی ئەدەبیات بۆ نموونە عەرەبی، دەبێت شێواز و رێبازە جیاوازەکان، مێژووی جیاواز و هێندێ جار ناهاوچەشنی دەوڵەتە جیاجیا عەرەبییەکان لێك بداتەوە، چونکە هەرکامەیان هەڵگری ئەدەبیاتی تایبەت بە خۆیانن. دۆزی "ئەدەبی کوردی" لەمەش ئاڵۆزترە. دۆخ و هەڵکەوتەی جیۆپۆلۆتیکی کورد و رووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ هاوکێشە سیاسییەکان و ئامانجی "دەوڵەت- نەتەوە" زاڵ و دەسەڵات بەدەستەکان، کورد لە هەرچەشنە هاوکاری و پێوەندییەکی یاسایی و فەرمی لەگەڵ یەکتر بێبەش

دەکات. ئەم بارودۆخە هەروا بە سانایی دەبێتە هۆی لێکجیابوونەوەی هەوڵ و تەقەلاکان و ئەگەری دەرفەت و جێبەجێکردنی هەرچەشنە توێژینەوە و تاوتوێیەکی هاوبەش لە بواری ئەدەبەوە نارەخسێنێت. کە وایە، لەوانەیە ئەدەبی کوردی لە بەشێك لە کوردستان گەشە بکات بەبێ ئەوەی کە کاریگەرییەکی ئەوتۆی لەسەر بەشەکانی دیکە هەبێت.

بارودۆخی مێژوویی و سیاسیی تایبەت بە نەتەوەی کورد و نەبوونی یەکگرتوویی جوغرافیایی- سیاسی، سەرنجدان بەوانی وەك نەتەوەیەکی یەکگرتوو بە واتای یاسایی- سیاسی هەتارادەیەك کردووەتە پرسێکی نەلواو. لەڕاستیدا کەتوار (واقیع)ی سیاسیی ناوچەیەك کە کورد تێیدا نیشتەجێن بووەتە هۆی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی جیاجیا و دابڕاوی ناسیۆنالیستی کە سەرەڕای کارلێك، نەیانتوانیوە نەتەوەیەك بە سنوور و چوارچێوەی پێناسەکراو بڕەخسێنن. لە ماوەی پێنج سەدەی رابردوودا ئەو ناوچەیەی کە بە کوردستان دەناسرێت و دانیشتووانی زۆربەیان کوردن، هیچکات لە یەکگرتوویی سیاسی بەهرەمەند نەبووە، لەم رووەوە، هیچکات پێکهاتەی دەوڵەتی یەکگرتوو بۆ بەڕێوەبەری و پێناسەی سنوورەکانی لەئارادا نەبووە. سەرەنجام بەڕێوەبەریی ئەو ناوچانە لە دەستی گرووپ و نەتەوەکانی دیکەی جیا لە کورددا بووە. کورد نزیك بە پێنج سەدە لەژێر دەسەڵاتی دوو ئیمپراتۆریی جیاواز، واتا سەفەوی و عوسمانییەکاندا بوون کە هەرکامەیان هەڵگری تایبەتمەندیی ئێتنیکی، مەزهەبی، سیاسی و کولتووریی تایبەت بە خۆیان بوون. سەرەنجام کورد سەرەتای سەدەی بیستەم لە کیانی نەتەوەیەکی یەکگرتوو بێبەش بوو، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە بیری ناسیۆنالیستی لەنێو نەتەوەکانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناڤین لە حاڵی گەشەسەندندا بوو. لەڕاستیدا دەورەی مۆدێرنی رۆژهەڵاتی ناڤین، یانی قۆناغی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی کە تێیدا دەوڵەت- نەتەوەگەلی نوێ وەك: تورکیا، عێراق و سوریا سەریان هەڵدا، هیچ چەشنە رزگارییەکی بۆ کورد بەدواوە نەبووە و نیشتمان و سنوورەکانیان دیسان لەنێوان ئێران و ئەو دەوڵەتە تازە بەدەسەڵات گەیشتووانە کە بەرهەمی رووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانی بوون، دابەشکرا. ئەو دەوڵاتانە کە هەرکامەیان لەژێر دەسەڵاتی سیستمی سیاسی و ئابووریی جیاوازدا بوون، بەئاشکرا پێکهاتەی لێکدابڕاو و بەتەواوەتی لێك جیاوازیان بنیات نا. کە وایە کورد لەبەر کەمینە و ژێردەستەبوونیان، لەژێر کاریگەریی وەها

پێکهاتەیەکی سیاسی، کولتووری و هەتاڕادەیەک کۆمەڵایەتیی جیاواز، بەشێوەی حاشاهەڵنەگر نەیانتوانی لە ڕێگای بنیاتنانی کولتوور و ناسنامەیەکی بەهێزەوە یەکگرتوو بن. سیاسەتی ڕاستەقینەی ئەو دەوڵەتانە لەو ڕەهەندانەوە کە پێوەندیی بە کوردەوە هەبووە، بە درێژایی مێژوو جیاواز بووە و هێندێ سیاسەتیشیان وەکو توانەوە، پاکتاوکردنی کولتووری و زمانی (فەرهەنگ سڕینەوە) و فیزیکی و حاشاکردن، لێکنزیک بوون و وەکو ستراتیژییەک گرتوویانەتە بەر، لەم ڕووەوە، بزووتنەوە سیاسی و فەرهەنگییەکانی کورد لەو وڵاتانە تایبەتمەندیی جیاواز و هەروەها داخوازیی جۆراوجۆریان هەبووە. کورد لەلایەن هەرکام لە وڵاتانانی زاڵەوە لەگەڵ هەڵسوکەوتی جیاواز بەرەوڕوو بووە، لە حاشاکردنی ڕەها و بێ ئەملاو ئەولاوە بگرە هەتا دانی جۆرێک لە سەربەخۆیی کولتووریی بەرتەسک. نەبوونی یەکگرتوویی سیاسی و کولتووری لەنێوان کورداندا بەهۆی دابەشبوون لەنێوان چەند وڵاتی جیاواز، خۆی لە سیاسەت و فەرهەنگێکی بەتەواوەتی لێکدابڕاویشدا دەرخستووە. هەربۆیە لە چوارچێوەی بزووتنەوە سیاسییەکانی کوردیشدا بەدەگمەن دەکرێت فکر و ئەندێشەیەک دەستنیشان بکەیت کە پرسی سەربەخۆیی کوردی وەک یەکەیەک (بزووتنەوەیەکی یەکگرتوو) ڕەچاو بکات. ئەم پرسە کاریگەریی لەسەر بوارەکانی دیکەش داناوە، هەربۆیە لە بواری فەرهەنگیْ کوردیشەوە ناکرێت بزاوتێکی فەرهەنگی و ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی دەستنیشان بکەین. بارودۆخی سیاسی تەنانەت کوردیشی لە بوونی ڕێنووسێکی یەکدەست و یەکگرتوو بێبەش کردووە. واقیعی دابەشبوونی کورد بەتایبەت لە سەدەی ئێستا و لە زەمەنێکدا کە مۆدێرنیتە و کەرەستەکانی، پرۆسەی ستانداردکردنی زمانە "نەتەوەیی" و "فەرمی"یە داسەپێنراوەکانی وەکو تورکی، عەرەبی و فارسی خێراتر دەکات، هەلومەرجی لەباری بۆ گەشە و پەرەپێدان و پێکهێنانی "زمانی پێوەر"ی کوردی نەڕەخساندووە. لەحاڵێکدا کە ئەدەبی مۆدێرن لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا لەناو دەوڵەت- نەتەوە تازەکان، خرابووە خزمەت ئایدیای پێکهێنانی ناسنامەی یەکگرتووە، بەڵام زاڵبوونی بارودۆخەکە نەیهێشت ببێتە دەرفەتێکیش بۆ نەتەوەی کورد. لە وەها بارودۆخێکدا هەرچەشنە چالاکی و پەرچەکردارێک لەلایەن کوردەکانەوە تەنانەت چالاکییە تەواو فەرهەنگییەکانیش بەناو خەبات و بەرەنگاری بەدژی دەسەڵاتی ئەو دەوڵاتانە لە قەڵەم دەدران. لە بەشە جیاجیاکانی کوردستان بەپێی

سیاسەتی ئەو دەوڵەتانەی کە کوردیان تێدا دەژی، ئەدەبیاتی کوردی یان حاشای لێکراوە، یان لە پەراوێزدا بووە و نەیتوانیوە لە چەقی بزاوتە ئەدەبییەکاندا خۆی دەربخات. لەڕاستیدا بارودۆخی کوردان یەکێك لە بەرچاوترینی ئەو نموونانەیە کە پێوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان سیاسەت و گەشەی ئەدەبیاتی نەتەوەیی دەردەخات. بۆ وێنە لە حاڵێکدا هەتاڕادەیەك هەلومەرجی شیاو و لە حاڵی بەرەوپێشچوون لە کوردستانی باشوور بووەتە هۆی گەشەکردنی ئەدەبی کوردی، لە چەند قۆناغێکدا حاشاکردنی ئاشکرا لە هەرچەشنە ناسنامەیەکی کوردی لە تورکیا، بووەتە هۆی ئەوەی کە هەرچەشنە ئەدەبێکی نووسراو سەرهەڵنەدات. ئەم پرسە لە کوردستانی ئێرانیش جگەلە قۆناغێکی کورت لە ماوەی شەڕی دووەمی جیهانی و لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی (١٩٤٦)ی زایینی لە تورکیا سەرکەوتووتر نەبووە. کورد لە کوردستانی ئێراندا هیچکات بەشێوەی فەرمی مافی خوێندن و نووسین بە زمانی دایکی نەبووە و هەموو نووسەرانی ئەو بەشەی نیشتمان بەشێوەی خۆڕسك هاتوونەتە ئەم بوارەوە و بەرهەمیان خولقاندووە. پاش شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی ١٣٥٧ی هەتاوی (١٩٧٩)ی زایینی چاپ و بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە، گۆڤار و نامیلکە و کتێب بە زمانی کوردی دەستی پێکرد و بۆ ماوەیەکی کاتی بووە و دواتر سانسۆر و زەخت و گوشارەکان دەستیان پێکردووەتەوە. لەگەڵ دامەزرانی گۆڤاری "سروە" و ئەو شەپۆلە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، جارێکی تر گوڕ و تینێکی دیکە لە مەیدانی ئەدەبی کوردی دەستی پێکرد و ئەم شەپۆلە لەگەڵ دامەزرانی ئەنجومەنە ئەدەبییەکان لە ساڵی ١٣٨٦ی هەتاوی (١٩٨٩ی زایینی) باڵای کرد و نووسەران و ئەدەبیانی کورد لە ڕۆژهەڵات لەوپەڕی بێدەرەتانیدا بەرهەمەکانیان چاپ و بڵاوکردەوە. ڕەوت و ڕێچکە ئەدەبییەکان لە ڕۆژهەڵات بە هاتنی بەرە و وەچەی نوێ، خۆیان گرت، لە ڕێگای وەرگێران و دەقی بیانییەوە ڕوانین و جیهانبینییەکان بۆ "ئەدەب" و "داهێنان" گۆڕانیان بەسەردا هات و ئەم ڕەوتە لە ناوەڕاستی دەیەی حەفتا لە دووتوێی دەقدا خۆی دەرخست و پاشان بەیاننامەی شیعریی "داکار" و ڕوانین و ڕەوتەکانی وەك:"چرکانە"، "شیعری جیاواز"، "ڕەوتی ڕچە"، "شیعری پێوەر"، "بەرەی چوارەم"، "شیعری شێت"، "نوێترخوازان"، لە چیرۆکیشدا "کۆڕی چیرۆکنووسانی خۆر" و ڕەوتی کورتە چیرۆك، بەشێوەی بەربڵاو و

بیروڕای جیاواز و پێکهاتەشکێنانە و جیهان تەوەرانە بوونە ناسنامەی ئەدەبی هاوچەرخی کوردی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئێستاش بەردەوامە، بەڵام ئەوەی جێگای هەڵوەستە و تێڕامانە، هاتنە گۆڕی چەند پرسیارێکە کە هێشتا بێ وەڵامن:

- ئاخۆ ئەو ڕێباز و ڕێچکە شیعری و چیرۆکییانەی کە لە مەیدانی ئەدەبی کوردیدا چ لە باشوور و چ لە ڕۆژهەڵات سەریان هەڵداوە کە بەردەوام کۆمەڵێك نووسەر و ئەدیب باسی لێوە دەکەن و خۆیان بە بنیاتنەری دادەنێن، دەکرێت بەپێی پێناسە و پێوەرە ئەدەبی و هونەرییەکان وەکو ڕەوت و ڕێچکەی ئەدەبی ناودێر بکرێن؟

- هەڵگری تایبەتمەندییەکانی بزاوتە ئەدەبییەکانیان هەن؟

- ئاخۆ زەمینە و بەستێنە کۆمەڵایەتی، سیاسی و فەرهەنگییەکانیان کامانەن؟

- لەسەر بنەمای ویست و داخوازیی کۆمەڵگای کوردی سەریان هەڵداوە، یان لاساییکردنەوەی ڕێچکەی کۆمەڵگا ئەدەبییەکانی دیکەن؟

- ئەو ڕەوت و قۆناغە ئەدەبییانە توانیویانە تەواکەری یەك بن، یان خێراییان پێوە دیارە و بازیان بەسەر یەکتردا داوە؟

لە گۆڕێدا نەبوونی پێوەندییەکی ڕێکوپێك لەنێوان چالاکییە ئەدەبییەکانی بەشە جیاجیاکانی کوردستان، بووەتە هۆی سەرهەڵدانی جۆرێك لە ئەدەبی کوردیی کەمتەمەن و کەمخایەن. پرسیار لێرەدا ئەوەیە کە ئاخۆ دەکرێت ئەم ئەدەبە لێکدابڕاوە بەناوی "ئەدەبی یەکگرتوو" ناودێر بکەین. لە نەبوونی ئەم پێوەندییە چڕوپڕ و بەردەوامەدا باسکردن لە ئەدەبێکی "تایبەت و دیاریکراو" ئاسان نییە و پێناسەکردنی بۆ لێکۆڵەرانی کورد لە ئێستا و داهاتوودا یەك لە ئاستەنگەکانە. باس نەکردنی ئەم گرفت و ئاستەنگانە و شرۆڤە نەکردنیان لەسەر بنەمای دەق و بەرهەمی بەردەست، نەوەکانی داهاتوو تووشی گومان و دڕدۆنگی دەکات کە ئاخۆ زاراوەی "ئەدەبی کوردی" چ پێناسەیەك هەڵدەگرێت و هەموو پارامێتر و تایبەتمەندییەکانی ئەدەبێکی نەتەوەیی هەیە؟

هەنووکە وەڵامدانەوە بەو پرسیارانەی پێشوو دەرگای دیالۆگێکمان بۆ ئاوەڵا دەکەن کە لەوێوە دەتوانین بگەینە داهێنان، هەتا نەوەی کونجکۆڵ و پرسیارخولقێنی داهاتوو بە بەرچاو ڕوونییەوە بێنە مەیدان.

هەر نەتەوەیەك پێکهاتە و تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ئەم توخم و گەوهەرە لەمەڕ ئەدەبیاتیش وەڕاست دەگەڕێت، هێشتا ئەستەمە باوەڕ بەوە بهێنین کە ئارمانجی "گوتە" لەبارەی "ئەدەبیاتی جیهان" لەگەڵ ئاوەز و لۆژیکدا دەگونجێت. گەڕانەوە بۆ پێناسەی ئەدەبیات لەسەر بنەمای ریشە و گەوهەرە نەتەوەییەکانی، ئەزموونێکی عەقڵانییە. زاراوەگەلێکی وەك "ئەدەبیاتی ئەمریکا"، "ئەدەبیاتی ئەڵمانی"، "ئەدەبیاتی سویدی" و هتد... هەتاڕادەیەك لە توێژینەوە ئەدەبییەکانی جیهاندا جێگایان گرتووە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ، کە چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەقێکی نووسراو مۆرکی نەتەوەیی بەخۆیەوە بگرێت؟ بە واتایەکی دی، چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەقێکی ئەدەبی مۆرکی ئەمریکایی، یان روسیی پێ ببەخشرێت؟ ئاخۆ ئەو هۆکارە تەنیا زمانە؟ ئەگەر وایە بۆچی ئەدەبیاتی ئەمریکا، بەریتانیایی و کانادا لێکجیا دەکەنەوە، سەرەڕای ئەو راستییەی کە هەموویان بە زمانی ئینگلیزی نووسراون، کە وایە دەگەینە ئەو راستییەی کە پێناسەی "ئەدەبیاتی نەتەوەیی" تەنیا پێوەندیی بە بنەمای زماننناسانەوە نییە.

لە رۆژهەڵاتی کوردستان لە قۆناغەکانی رابردوو و هەنووکەش زۆرن ئەو نووسەرە کوردانەی کە بە فارسی نووسیویانە و ئێستاش دەنووسن، ئاخۆ بەرهەمی ئەو نووسەرانەی کە لەباری نەتەوەییەوە کوردن، بەڵام بە زمانی فارسی بەرهەمیان خوڵقاندووە، بەشێکن لە ئەدەبی فارسی یان کوردی؟ چ پێوەندییەك لەنێوان ئەدەب و نەتەوەدا هەیە؟ یان ئەگەر گەوهەری نەتەوەییبوون لەسەر بنەمای جیاوازییەکانە، ئەو جیاوازییانە لە ئەدەبیاتیاندا چۆن رەنگ دەدەنەوە؟ ئەدەبیاتی ناوچەیی چ پێناسەیەك هەڵدگرێت و لە کام خانەی ئەدەبی نیشتمانیدا جێگا دەگرێت؟

پرسی زمان، وەك سەرەکیترین توخم و گەوهەری شوناسی نەتەوەیی (لانیکەم بۆ کورد)، لە رۆژهەڵاتی کوردستان خاوەن چ پێگەیەکە، رەوت و قۆناغە جیاجیاکانی کامانەن و نووسەران و ئەدیبانی کورد چۆن لەگەڵ پرسی زمانی کوردی بەرەورِوو بوونەتەوە؟ خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکی لە کوردستانی رۆژهەڵات کە لە سیستمی پەروەردەدا بە فەرمی ناخوێنرێت، چ کێشە و ئاستەنگێکی خوڵقاندووە و بەرپێژ و خوێنەرانی ئەدەبی کوردی چۆن لەم کێشەیە دەڕوانن؟

چەند ساڵێکە باسکردن لە زمانی یەکگرتووی کوردی لە ناوەندە فەرهەنگی، ئەدەبی و رۆشنبیرییەکان گەرمە و شانبەشانی ئەم مەسەلەیە زاراوە و دیالێکتەکانی ئەم زمانە و بەتایبەت کرمانجی، هەورامی و کەلهوڕی خەریکی خۆسەلماندن و فۆرم و قەوارەگرتنن. لە مەیدانی ئەدەب و نووسین و بەتایبەت شیعردا خەریکن گەشە دەکەن، ئاخۆ ئەم گەشەکردنە دەبێت وەك دەرفەت و دەرەتانێك بۆ بووژانەوەی زمان و کولتووری ناوچەیی لێکبدرێتەوە یان وەك خەسارێك کە لە درێژ ماوەدا زەرەر لە پرسی زمانی نەتەوەیی دەدەن؟ پرسی "نووسین" و ئەدەبیاتی نەتەوەیی دەبێت چۆن لەگەڵ ئەم بابەتە هەستیارە پێناسە بکرێت و نووسین بە چەند دیالێکتی جیاواز لەلایەك و لەلایەکی دیکەشەوە جێنەکەوتنی زمانی یەکگرتوو (پێوەر)، بەرەو کوێمان دەبەن؟ ئەم پرسیارانە و چەند پرسیاری دیکەی پێوەندیدار لە بەشی زمانی ئەم پرۆژەیەدا لەلایەن چەند نووسەر و شارەزایەکی بواری زمانەوە لە چوارچێوەی چەند رایەکی جیاوازدا دەخرێنە روو.

خوێنەرانی ئەم کتێبە لەوانەیە یەکەم پرسیار کە لایان گەڵاڵە بێت، ناوی "رۆژهەڵاتی کوردستان" بێت وەك دەستنیشانکردنی جوغرافیا و ناوچەیەکی تایبەت بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم پرۆژەیە، ئەمە لە راستی و واقیعێکی سیاسییەوە سەرچاوە دەگرێت و حاشای لێناکرێت کە نەتەوەی کورد بەسەر چوار وڵاتی جیاوازدا دابەش بووە کە هەرکامەیان هەڵگری بارودۆخ و تایبەتمەندیی سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ئابووریی جیاواز لە یەکترن و کوردیش وەك نەتەوەیەکی ژێردەست و کەمینەیەکی پەراوێزخراو لەژێر کاریگەری و هێژمۆنیی زاڵی ئەو حکومەتانە بەدەر نەبووە و ئەدەبیاتیش وەك یەکێك لە ژێرخانەکانی نەتەوە کاریگەریی هەرکام لەو وڵاتانەی بەسەرەوەیە.

کۆمەڵناسانی ئەدەبیات لەو باوەڕەدان لە هەر شوێنێك زمان و دیالێکتی جیاواز هەبن، ئەدەب و سەرنجی جیاوازیش سەر هەڵدەدەن. لە دەستنیشانکردنی شێواز و رێبازی نووسینی هەر نووسەرێکدا، جیا لە خەون و خەیاڵ و هەستە تاکەکەسی و دەروونییەکان، کۆمەڵێکی بەرچاو لە گەوهەر و توخمەکانی پێوەندیدار بە ژینگەی کۆمەڵایەتی و جوغرافیایی بەردەوام کاریگەری و رۆڵیان هەبووە. تەنانەت ماکە و هەوێنی پاڵنەرە دەروونییەکانیش زۆر بە ئاسانی دەکەونە ژێر سێبەری کاریگەرییە

دەروونییەکانی نووسەرەوە. ئەگەر قەوارە و پێکهاتەی بەرهەمێکی ئەدەبی- بەتایبەت لە ژانرە ریواییەکاندا- لەسەر بنەمای چوار ئەستوونددەکی "هەلبژاردنی بابەت، بەژنی زەمانی، جیهانبینی و لایەنی هونەری و ستاتیکا" بنیات نرابێت، بەرچاوترین مادەی خاو و سەرەکیی ئەو پێکهاتەیە، لە ڕێگای هۆکاری دیکەوە هەڵدەهێنجرێت کە هەموویان پێوەندییان بە ویست و داخوازیی شوێنی ژیان و ناوچەی نیشتەجێبوونی خاوەن بەرهەمەوە هەیە، هۆکارگەلێکی وەك: ژینگەی کۆمەلایەتی، سیاسی، فەرهەنگی، ئابووری، مێژوویی و ژینگەی سروشتی. هەر نووسەرێك جیا لە کاریگەرییە بەرینە جیهانییەکان، لەبەر بەستراوەیی جوغرافیایی بە ناوچەیەکی تایبەت، بە تێکەڵاو و گریّ خواردن لەگەڵ ئەو بنەما و گەوهەرانە، لە زەین و پێشینەی خۆیدا شوێنیان بۆ دەکاتەوە و چ بیەوێت و چ نەیەوێت هێندێ جار بەشێوەی پەتی و هێندێ جاریش قووڵ و بنەڕەتی لە بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییەکاندا، پەرچەکرداری هاوچەشن لەگەڵ نووسەرانی هاوناوچەی خۆیدا دەخاتە روو و ئەوکاتەیە کە بەرفرەهیی ئەو خاڵە هاوبەشانە دەتوانێت شێواز و ڕەوتی ئەدەبیی ناوچە و هەرێمێك لە هەرێمێکی دیکە جیا بکاتەوە. لەوانەیە ئەدەبیاتی هەرێمی و خاڵە جیاوازەکانیان لەگەڵ هەرێمێکی دیکە بۆ ئەدەبی زارەکی و فۆلکلۆر بەپێی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی وەڕاست نەگەڕێت، چونکە زارەکی بوون، گواستنەوەی فۆلکلۆر بەشێوازی نەریتی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، سەفەرکردنی لە کولتوور و ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە سنوور ناناسێت و زۆرجار جۆری گێڕانەوە و ناوەرۆکی دەقە ڕەسەن و فۆلکلۆرییەکان لێك دەچن و تەنانەت هێندێ جاریش ئەفسانە و ئوستوورەی شارستانییەتە جیاوازەکانیش خاڵە هاوبەشەکانیان لە خاڵی جیاوازیان زێدەترە. ئەم پرسە نابێت بەشێوەی رەها لێی بڕوانرێت، چونکە بەشێك لە ئاوازە فۆلکلۆرییەکان، بەیت و باو، بەند، لای لایە، لاواندنەوەکان تایبەتی ناوچەیەکن و لە ناوچەکانی دیکە پێگەیان نییە.

بەڵام لە ئەدەبی نویسیاری و هاوچەرخدا ئەم مەسەلەیە جیاوازترە، کاریگەریی بەرین و بەربلاوی دیاردەی بەجیهانیبوون و زەخت و گوشارهێنان بۆ کولتوورە بەرتەسکە خۆماڵی و ناوچەییەکان، کەشێکی وای خولقاندووە کە بژاردە و نوخبەکانی هەر نەتەوەیەك بۆ خۆپاراستن و نەتوانەوە لە قاوخی ئەو کولتوورە جیهان داگرەدا،

لەسەر بنەمای ئەندێشە و گەوهەرە ناوچەیی و خۆماڵییەکان و بە زمان و داڕشتنی ئەمڕۆییەوە، ناودرۆکی بەرهەمی هاوچەرخ برازێننەوە. هەرچەند دوو بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باشووری کوردستان بەهۆی هاوسنووری و لێك نزیکییان لەباری سروشتی و جوغرافیاوە، بەدرێژایی مێژوو پێکەوە پێوەندیی ئابووری و کۆمەڵایەتییان لە ئاستی بەرتەسکدا هەبووە، چونکە هەرکام لەژێر کاریگەری و هێژمۆنیی زاڵی دەسەڵات و حکومەتی فارس و عەرەبدا بوون، کەمتر کاریگەری فەرهەنگی و زمانییان لەسەر یەکتر هەبووە و ڕەوت و ڕێبازە ئەدەبییەکانی هەرکام لەو دوو بەشە لە کوردستان کەمتر ئاگاداری تایبەتمەندیی یەکتر بوون.

ئەوەش سروشتییە نووسەر و شاعیری هەر دەڤەر و ناوچەیەك لەگەڵ ناوچەیەکی دی لەباری خەیاڵ، ئەندێشە و ناوەرۆکەوە جیاواز بێت، بۆ وێنە نووسەرێکی کرماشان، ئیلام، سەحنە و بیستوون و... لەگەڵ نووسەرێکی خەڵکی کەرکووك و بادینان و دهۆك ڕوانینیان جیا لە پرسە نەتەوەییەکان جیاوازە و کێو و شاخ و پێدەشت و لێڕەوار و سروشتی دەورووبەری هەرکام لەو ناوچانە لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگ دەداتەوە کە تایبەتی ئەو دەڤەرانەن. بۆ وێنە کەش و هەوا و دۆخی سروشتیی هەورامانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگەڵ دەشتی هەولێر و مەخموور و ئالتوون کوپری جیاوازیی ئێجگار زۆریان هەیە، هەر ئەم جوغرافیا و سروشتەیە لە پلەی یەکەمدا کاریگەریی ڕاستەخۆی لەسەر نووسەر و هونەرمەند هەیە.

پرسی ئەدەبیاتی ناوچەیی و گرێدانی بە زاراوەی "ئەدەبی کوردی" بە نیسبەت دوو بەشی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، زیاتر لە ژانرەکانی شیعر، چیرۆك و ڕۆماندا بەرجەستە دەبنەوە، چونکە هەرکام لەم ژانرانە لە هەردوو بەشی کوردستان لە قۆناغی جیاجیادا ڕەوت، ڕێچکە و بزاوتی تازە تێیاندا سەری هەڵداوە و لە ژانری شیعردا هەم قۆناغی کلاسیك و هەم قۆناغی نوێ بە جۆرێك کاریگەرییان لەسەر یەکتر هەبووە، بەڵام هەتا ئێستا بەشێوەی ئاکادیمی، مەیدانی و بە مێتۆدی زانستی کە لەسەر بنەمای دەق بێت، لێکۆڵینەوەی هەمەلایەنە لەسەر کاریگەریی دوو لایەنەی ئەدەبی کوردی ئەو دوو بەشەی نیشتمان نەکراوە و ئەم پرسانە بە هەڵپەسێراوی ماونەتەوە و هەر لە چوارچێوەی قسە و دروشم و بانگەشەدان. ئاراستەی ئەم پڕۆژەیە لە بەرگی دووەم و سێیەمدا کە لەسەر دوو ژانری شیعر و چیرۆکە، دەرخەری ڕەوت و قۆناغە

شیعرییە جیاوازەکان و هەروەها گەوهەر و بەستێنەکانی سەرهەڵدانی چیرۆك و رۆمانی هاوچەرخە لە رۆژهەڵاتی کوردستان و لەوانەیە وەڵامی هێندێ پرسی تاریك و ناڕوون بدەنەوە. یان دەروازەیەك بێت بۆ کردنەوەی باسێکی جیدی و دیالۆگێکی چڕوپڕی سەر داپۆشراو. لە دووتوێی وتار، لێکۆڵینەوە و دیمانەکانی بەرگی دووەمدا کە لەسەر قۆناغ و شەپۆلەکانی شیعری هاوچەرخی کوردی لە رۆژهەڵاتی کوردستان وەك جوغرافیایەکی جیاواز خراونەتە روو، فکر و رای جیاواز و جیهانبینیی پێکهاتەشکێن دێنە بەرباس. لێرەدایە کە جیاوازییەکان دەردەکەون و ئامانجی سەرەکیی ئەم پڕۆژەیە بۆ خوێنەری کورد دەردەکەوێت کە لەبەرچی رۆژهەڵاتی کوردستان بۆ ئەم پڕۆژەیە دەستنیشان کراوە:

- یەکەم: نووسینەوە، کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوە و مادە خاوانەی کە لەسەر ئەدەبی کوردیی رۆژهەڵات نووسراون لە دووتوێی کتێبدا.

- دووەم: خستنەڕووی ئەو تایبەتمەندی و توخمە گەوهەرییانەی کە لە هەرکام لە ژانرە ئەدەبییەکانی ئەو بەشەدا هەن بۆ ئاسانکاریی لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکانی داهاتوو.

- سێیەم: خستنەڕووی بەستێنە سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و مێژووییەکانی هەرکام لە ژانر و رەوتە شیعرییەکان.

- چوارەم: هەوڵێکی بچووك لەپێناو نووسینەوەی "مێژووی ئەدەبی کوردی" لە ناوچەیەکی دیاریکراودا.

ئەم پڕۆژەیە تەنیا بەرهەمی منی ئامادەکار نییە، بەڵکو بەرهەمی هزر و ئەندێشەی سەرجەم ئەو کەسانەیە کە بابەتیان تێدایە و هاوکاری و یارمەتییان کردووە هەتا بگاتە ئەنجام.

بێگومان ئەم کارەش وەکو هەر کار و پڕۆژەیەکی لێکۆڵینەوە لە لاوازی و کەموکووڕی بەدەر نییە، چونکە بەرەنجامی بیرێکی خۆڕسکە لەوپەڕی کەمدەرفەتی و بێدەرەتانیدا، هەربۆیە چاوەڕێی دەکەم لەلایەن سەرجەم نووسەر و ئەدەیب و بەتایبەت رەخنەگرانی کوردەوە رەخنەی زانستی، پێشنیار و راوێژی بەپێز رووبەڕووی ئەم پڕۆژەیە بکرێتەوە.

دەستنیشانکردنی کەموکورتییەکان بەرگەکانی دیکەی ئەم پرۆژەیە دەوڵەمەنـدتر دەکات، بە پێچەوانەوە کەمتەرخەمی و بێوازی نواندنیش بە واتای دووپاتبوونەوەی هەڵەکانە.

شەریف فەلاح
بانەمەڕی ۱۳۹۱ی هەتاوی
فێڤریەی ۲۰۱۲ی زایینی

## زمانی کوردی، ئایدیۆلۆجی و ناخودئاگا:

## چەند بیرۆکەیەکی تیۆریک و چەند نموونەیەکی پراکتیک

دیمانە لەگەڵ د. بەختیار سەجادی

سازدانی: مەسعوود بینەندە- مەریوان

**سەردێڕی باسەکانی ئەم وتووێژە:**

١- زمان و جۆرەکانی لێکۆڵینەوە لە زمان.

٢- فەلسەفەی زمان یان فەلسەفەی زمانناسانە؟

٣- لەناوچوونی سەربەخۆیی وشە لە زمانی کوردیدا: نموونەیەکی پراکتیکی لە زمانناسیی مەعریفی.

٤- دەربارەی پەرەسەندنی زمانی کوردی.

٥- دەربارەی زمانی زانستیی کوردی.

٦- لێکۆڵینەوە لە پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجی: کێشە تیۆریکەکان.

٧- زمانی کوردی و ئایدیۆلۆجی: تیۆرییەکان.

٨- زمانی کوردی و ئایدیۆلۆجی: نموونەیەکی پراکتیکی.

٩- قەیرانی شوناس چ پێوەندییەکی بە پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجییەوە هەیە؟

١٠- پێوەندیی زمان و ناخودئاگا: تیۆرییەکان.

١١- پێوەندیی زمانی کوردی و ناخودئاگا: نموونەکان.

**تکایە سەرەتا لەسەر زمان و جۆرەکانی لێکۆڵینەوە لە زمان قسە بکەن.**

زۆربەی ئەو کەسانەی چ بەشێوەی زانستی و پسپۆڕانە و یان بەهۆی ئارەزووی تاکەکەسیی خۆیانەوە لە زمان دەکۆڵنەوە زمان تەنیا وەك سینتاکس (ڕێزمان، بنەما و ڕستەسازی)، سیمانتیکس (مانا و واتاسازی) و فۆنۆلۆجی (دەنگناسی) ڕەچاو دەکەن، یان لەوانەیە بەکەڵکوەرگرتن لە بیرۆکە بنەماییخوازەکان(structuralist) ، زمان وەکو سیستمێك لە نیشانەکان تەماشا بکەن بۆ سازبوونی پێوەندی. دیارە ئەنجامدانی ئەم کارانە پێویستە و دەبێت ئێمە خاوەنی چەندین و چەندان بەرهەم بین لەم بوارانەدا، بەڵام من هەر لە سەرەتاوە تاکو ئێستاش، سەرەڕای خوێندنی ئەو وانانە بەشێوەیەکی ئاکادیمیك، لەو بەستێنانەدا کارم نەکردووە، بەڵکو گرنگیم داوەتە هەندێ لقوپۆپی

تری پێوەندیدار بە زمانـەوە. دوو هـۆی سەرەکیشـم بـۆ کـار نـەکردن لـەو ئاقارانـەی سەرەوەدا هەبووە:

هۆی یەکەم ئەوە بووە، کە کارکردن لەم ئاقارانەدا بەجۆرێك بووەتە پارادایمی زاڵی خوێندنەوە زمانەوانییەکان لای ئێمە. زۆرن ئەو کەسانەی خـەریکی کـارکردنن لەسـەر ئەو بابەتانەی سەرەوە چ لەمدیو و چ لە زۆرێك لە نامە ماجستێر و دکتۆراکانی بەشی کوردیی زانکۆکانی باشوور و تا رادەیەکیش لێـرە بەتایبـەت، لـە تێـزی ماجسـتێر و دکتۆراکانی بەشی زمانناسیی زانکۆکـانی ئێـران، واتـە، لێکۆڵینـەوە لـە رێزمـان و واتاسازی و دەنگناسـی لـە زمـانی کوردیـدا بەمەبەسـتی تێگەیشـتن و پۆلێنکـاریی تایبەتمەندییەکانی زاراوە و بنزاراوە و شێوەزارە جیاجیاکانی زمانی کوردی.

هـۆی دووەم ئەوەیـە، کـە کـەمتر لێکۆڵینەوەیـەکمان بـە زمـانی کـوردی لـە بەردەستدایە کە دەربارەی، بۆ نموونە، فەلسەفەی زمان بێ، یان بەشێوەیەکی تیۆریك و بە پاڵپشتی بۆچوونە رەخنەییەکان (critical approaches) هـەوڵی دابێـت لـە زمانناسیی کۆمەڵایەتی، یان زمانناسیی دەروونی، یان زمانناسیی مەعریفی کـەڵکی وەرگرتبێت. ژمارەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم ئاقارانـەدا هاتوونەتـە بەرهـەم و هـەوڵی دەستەبەرکردنی روانگەیەکی تیۆریکیان دابێت دەربارەی زمانی کوردی، زۆر کەمن.

### ئایا فەلسفەی زمان و فەلسەفەی زمانناسانە جیاوازن؟

فەلسەفەی زمان (philosophy of language) لە فەلسەفەی زمانناسانە (linguistic philosophy)بە تەواوی جیاوازە. لێرەدا ماوەی ئەوەمان نییە بـاس لەم جیاوازییانە بکەین و سەرچاوە لەم بارەیەوە زۆرن، بەتایبەت بە زمـانی ئینگلیـزی. ئێمە ئێستا لە زمانی کوردیدا زیاتر خەریکین بەجۆرێك لە ئاقاری فەلسەفەی زمانـدا کار دەکەین و لەڕاستیدا زۆر بەدەگمەن توانراوە لە بەستێنی فەلسەفەی زمانناسـانەدا دەقێك بە کوردی بێتە بەرهەم. دەشکرێت لـەو لێکۆڵینەوانـەی دەربـارەی زمانناسـیی کۆمـەڵایەتی، یان زمانناسیی دەروونی بە کوردی بە ئەنجام گەیشتوون باس لـە هاتنـە ئارای جۆرێك لە فەلسەفەی زمان بکەین، هەرچەند وەك دەزانرێـت بەڕاسـتی ژمـارەی کارەکان لەم ئاقارەشدا زۆر کەمن.

نەبوونی فەلسەفەی زمانناسانە لە دەقە کوردییەکاندا پێوەندیی راستەوخۆی هەیە بەو قسە دووبارەیەی کە بۆچی کورد نەیتوانیوە بە زمانی کوردی فەلسەفە و سیستمی فەلسەفی بەرهەم بهێنێت. من پێم وایە پێویستە سەرەتا بە لێکۆڵینەوە لە فەلسەفەی زمانەوە دەست پێ بکەین، ئەم رێگایە لە ئاکامدا دەتوانێت بمان گەیەنێتە باسکردن، یان بەرهەمهێنانی جۆرێك لە فەلسەفەی زمانناسانە. بە واتایەکی تر، کارکردن لە ئاقاریَ فەلسەفەی زماندا و لە بەستێنی زمانی کوریدا، لە ئەنجامدا دەتوانێت جۆرێك فەلسەفەی زمانناسانەمان بۆ بەرهەم بهێنێت و ئەم فەلسەفەیەش (مەبەست فەلسەفەی زمانناسانەیە)، دەتوانێت بۆخۆی رۆڵی سیستمێکی فەلسەفیی تایبەت و سەربەخۆ بگێڕێت.

کارکردن لە ئاقاری فەلسەفەی زماندا پێویستی بە سەرنجدان هەیە بە لقە پسپۆڕانەییەکانی تری زمانناسی وەك زمانناسیی کۆمەڵایەتی (sociolinguistics)، زمانناسیی دەروونی (psycholinguistics)، و بەتایبەت زمانناسیی مەعریفی. (epistemolinguistics) زمانناسیی مەعریفی لە تیۆریی ئەدەبی و فەرهەنگی و رەخنەگرانەی هاوچەرخدا یەکێکە لە باسە فرەدووبارەکان. رەنگە یەکەم کەس کە بەشێوەیەکی پسپۆڕانە لەم پرسەی کۆڵیبێتەوە فەیلەسووفی فەڕەنسی "ئێتیەن بۆنۆ کۆندیاك" بێت. کۆندیاك لە ساڵی ١٧٤٦دا کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناوی وتارێك دەربارەی سەرچاوەکانی زانیاریی مرۆڤ. ئەم بەرهەمە بەپێزە هەر لەو سەدەیەدا خێرا پاش چەند ساڵ کرا بە ئینگلیزی. کۆندیاك هاوشان لەگەڵ "بێرکێلی" یەکەم بیرمەند بوون باس لە پرسی مەعریفی-زمانناسانە بکەن (Epistemolinguistic Question)، واتە، پێوەندیی نێوان زمان و پێشکەوتنی دەروونیی تاکەکەس، یان ئەوەی کە نیشانە زمانناسانەکان چ دەورێکیان هەیە لە چەمکاندنی ئیدەکان. دیارە لێرەدا 'ئیدە' زاراوەیەکە لە سیستمی فەلسەفی جان لاك-ەوە وەریان گرتبوو و هەر ئەمەش باشترین بەڵگەیە بۆئەوەی کە ئەم باسانە سەرەتا لە فەلسەفەی شیکارانەی ئەنگلۆساکسۆندا بایەخیان دراوەتێ. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا، هەوڵەکانی چەند مەنتیقزان و فەیلسووفێکی ئەڵمانی و بەریتانیایی وەك: "گۆتلۆب فریگێ و بێرتراند راسێل" دەربارەی زمان و تایبەتمەندییەکانی ئەم بازنەیەی کاملتر کرد، بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە،

٣- بەکار نەهێنانی مانشێتی زۆر کورت.

٤- گەمە نەکردن لەگەڵ فۆرم و شێوەی وشە و پیتەکان.

٥- درێژبوونی ئەو زمانەی ڕێکلامەکانی پێ دەنووسرێت و درێژدادڕی لە وەسفەکاندا.

٦- سەرنج نەدان بە جیاوازی و ئاستی کاریگەریی جۆرە جیاجیاکانی ڕستە لەسەر خوێنەر.

٧- نامۆدێرن بوونی شێوەی دیزاینی لاپەڕەکان کە ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر زمانی بەکارهاتوو لەو لاپەڕەیەدا.

٨- سەرنەکەوتن لە سڕینەوەی کاریگەریی ڕۆژنامەنووسیی عەرەبی بەسەر ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا بەتایبەت لە ڕووی قەرەباڵغی و ناڕێکوپێکی لاپەڕەی یەکەم و هەڵبژاردنی سەردێڕی دووردورێژ.

٩- ڕەچاو نەکردنی ڕێساکانی خاڵبەندی تەنانەت لە مانشێتەکانیشدا و پشتگوێخستنی یاساکانی پەرەگرافبەندی لە ستوونەکاندا.

١٠- نەبوونی شێوازێکی کورت و تایبەت لە زمان لە تەنیشت وێنەکاندا.

کەواتە، وەك ئەو نموونانەی سەرەوە دەری دەخەن، زمانی کوردی، بەتایبەت لە شێوازگەلی زانستی و تەنانەت ڕۆژنامەنووسانەی خۆیدا، هێشتا بە تەواوی گەشەی نەکردووە و لەم پێناوەشدا گەلەك کار بۆ کردن لە بەردەمماندایە.

**ئێوە لە نووسین و لێکۆڵینەوەکانتاندا بەدواداچوونتان بۆ پێوەندی نێوان ئایدیۆلۆجی و زمان کردووە، تکایە ئەم پرسە شی بکەنەوە؟**

توێژینەوەی جۆری میکانیزمی پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجی کارێکی دووردورێژ و گرنگ و سەختە. سەختییەکەی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەم کارە سەرەتا پێویستی بە دەستەبەرکردنی ڕوانگەیەکی تیۆریك هەیە و تێگەیشتن لەو تیۆرییانەش کە باسی پێوەندی ئایدیۆلۆجی و زمان دەکەن پێویستیان بە پێشینەیەکی خوێندنەوەیی پتەو هەیە. زۆر سەختە بتوانین ڕوانگەیەکی تیۆریك دەستەبەر بکەین بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرجەم لایەنەکانی پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجی، ڕوانگەیەك

که له لایەکەوە خاڵە لاوازەکانی روانگە تیۆریکەکانی تری تێدا نەبێت و لەلایەکی تریشەوە توانیبێتی سوود لە روانگە جیاجیاکان وەربگرێت بەشێوەیەك کە رووبەڕووی کێشەی تیۆریك نەبێتەوە.

لێرەدا مەبەستم لە کێشەی تیۆریك، بۆ نموونە، کێشەی نێوان بۆچوونە دەروونناسانە و کۆمەڵناسانەکانە بۆ شیکاریی پێوەندیی نێوان زمان و سووژە، یان کێشەی نێوان رەچاوکردنی زمان وەك بابەتێکی تاکەکەسی و مولکی تاکەکەس و داهێنانی تاکەکەسی و زمان وەك بابەتێکی جیهانی و مولکی ئەو کۆمەڵگایەی تێدا بەکاردەبرێت، یان کێشەی نێوان زمان وەك بابەتێکی دەرهەست و ئایدیۆلۆجی (بەمانا ئالتووسێرییەکەی) وەك بابەتێکی بەرهەست، کێشەی نێوان ئایدیۆلۆجی و ناخودئاگا، یان تایبەتمەندیی ئەو هاوکێشەیەی ئایدیۆلۆجی بە ناخودئاگاوە دەبەستێتەوە. گرفتە تیۆریکەکان لە تێکهەڵکێشکردنی ئەم تیۆرییانەدایە.

گەر بمەوێت نموونەیەکی سادەی کلاسیك لەم کێشە تیۆریکانە بهێنمەوە، دەتوانم ئاماژە بکەم بۆ تێکهەڵکێشکردنی دوو سیستمی فەلسەفی هێگێل و مارکس، کە هەر لە یەکەم پلەکاندا رووبەڕووی کێشەی تیۆریك دەبێتەوە. دیارە بیرمەندانی هاوچەرخ لێرەدا دەبن بە دوو دەستەوە: هەندێکیان وەك کۆمەڵناسە کلاسیکەکان یان دەروونناسە فرۆیدییەکان وەڵامیان نەگەتیڤە و دژی وەها تێکەڵکارییەکی تیۆریکن، بەڵام خوێندنەوەی بەرهەمی چەند بیرمەندێکی هاوسەردەم بەو ئەنجامەمان دەگەیەنێت کە ئەوان لەگەڵ ئەم تێکهەڵکێشکردنەدان. هەندێ تیۆری داڕێژی وەکو لاکلائۆ، مووف، باتلێر، ژیژەك، جەیمسۆن، هیس، مەککەیب، و ئاگامبێن هاوکات لە هەر دوو روانگە تیۆریکەکانی راست و چەپ، کۆمەڵناسی و دەروونناسی، مارکسیزم و دەروونشیکاری، و یان هێگێل و مارکس کەڵك وەردەگرن بۆ خەملاندنی روانگە تیۆریکەکانی خۆیان.

من پێم وایە کە تەنانەت ئەو بیرمەندانەی سەرەوەش بەشێوەیەکی راستەوخۆ تەرکیزیان نەکردووەتە سەر میکانیزمی پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجی. مەبەستم ئەوەیە باسکردن لە میکانیزمی پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجی و سەرهەڵدانی کێشە تیۆریکەکان لەم پێوەندییەدا هیچکات نەبووەتە پرسێکی ناوەندی بۆ ئەوان. من روانگەکەی خۆم دەربارەی پێوەندیی زمان و ئایدیۆلۆجی بە جۆرێك بە درێژەپێدەری تێزەکانی لاکلائۆ دادەنێم وەك چۆن پێشم وایە- و کەمتر کەسێك ئەوەشی

جۆریك لە گۆڕانکاریی میتۆدۆلۆژیك دەبینین لەم ئاقارەدا، جۆرێـك لـە وەرچـەرخان، ئەمجارەیان لە فەلسەفەی شیکارانەوە بەرەو نەریتی فەلسەفیی ئیدیالیزمی ئـەڵمانی و بەتایبەت گرنگیدانی زیاتر بە هیگڵ. لێرەدا درەوشاوەترین ناو و کاریگەرترینیان ژاك لاکان-ە. لاکان بە خوێندنەوەی زمانناسیی بنەماییگەرایانەوە توانی گـوڕوتینێکی زۆر ببەخشێتە دەروونشیکاری. ئەو بـە تێکـەڵکردنی روانگـەکانی فرۆیـد بـۆ راڤـەکاریی خەونەکان و تیۆرییەکانی زمانناسی گەورەی بنەماییخوازی رووسی، رۆمەن یاکوبسـن، و پاشان بە پاڵپشتی فەلسەفەی هیگڵ و بیرۆکە هیگڵییەکان دەربارەی ئەویدیکەیی (otherness)و خود-هۆشـیاری (self-consciousness) تـوانی تیۆرییـەکی گشتگیر و دنیاداگر دەربارەی پێوەندیی نێوان زمان و ناخودئاگا، پێوندیی نێوان زمـان و ناسنامە و چۆنیەتی لێکۆڵینەوە لە شوناسی مرۆیی بەپێی زمانەکەی بخاتە روو.

گرنگایەتیی ئەو باسانەی سەرەوە کاتیٚ زیاتر بۆمان دەردەکەوێت کـە ئاوڕێـك لـە پێوندیی نێوان زمانی کوردی و چەند پرسێکی گرنگ بدەینەوە و هەنـدیٚ بـاس وەکـو ئەمانەی خوارەوە بهێنینە ئاراوە:

زمانی کوردی و نووسین یان وەرگێڕانی دەقی فەلسەفی و تیۆریك.
زمانی کوردی و پرسی دەرهەستکاری/ بەرهەستکاری لەم زمانەدا.
زمانی کوردی و بەلاغیبوون.
زمانی کوردی و سروشتیبوون.
زمانی کوردی و بیرکاریی ئاسایی.
زمانی کوردی و ناڕاستەوخۆیەتی.
زمانی کوردی و شێوازگەلی ئارکەیك، رۆژنامەنووسانە، بازرگانیانە.
زمانی کوردی لە ئامێرە دیجیتاڵەکاندا وەك تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر و مۆبایل.
زمانی زانستیی کوردی.
کێشەی لەحن لە زمانی کوردیدا.
پرسی زەینیبوون و بابەتێتی لە زمانی زانستی کوردیدا.

دیارە ئەم باسانە دەمانباتـە نێـو هەنـدیٚ باسـی تـر وەك کێشـەی ساکارسـازی و گشتیکردنەوە لە زمانی کوردیدا، وەك کێشەی پەراوێزسازی و رابردووخوازی لە زمانی

کوردیدا، وەك مەسەلەی ئایدیۆلۆجیك بوونی هەندێ شێواز و وشە و دەستەواژە لە زمانی کوردیدا، کە هەرکام لەم باسانە بۆ خۆیان بابەتی یەك سیمیناری جیان.

دیارە من لێرەدا تەنیا سەردێڕی باسەکانم درکاند و بۆ خۆیشم خەریکم هەڵەی زۆر نووسەری کورد و فارس دووبارە دەکەمەوە کە بە تەنیا ناوبردن لە کێشەکان پێیان وایە چارەسەریشیان کردووە. ئەوان بەداخەوە هەر تەنیا سەردێڕی هەواڵەکان دەڵێنەوە و ئیدی ئاگاداری ناوەڕۆکی هەواڵەکە نین و ئەمەش وا خەریکە دەبێتە جۆرێ پارادایمی رۆشنبیریی زاڵ لای ئێمە. بۆ نموونە، لە زۆر نووسینی کوردیدا چاوم بە مەسەلەی پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجی کەوتووە کە نووسەرەکە تەنیا و تەنیا بەشێوەیەکی زۆر سادە و رووکەشییانە و بەبێ رەچاوکردنی یەکەم بنەواشەکانی نووسینێکی زانستی و بەبێ لێکۆڵینەوە لە پێناسە جیاجیاکانی ئایدیۆلۆجی و بەبێ سەرنجدان بە لێکۆڵینەوە تیۆریکەکان لەم ئاقارەدا و بەبێ خوێندنەوەی سەرچاوە یەکەم و سەرەکییەکان لەم بوارەدا، باسی لەو پێوەندییە کردووە، واتە ئاماژەدان بە کێشەکە بەبێ لێکۆڵینەوە لە کێشەکە، یان دووبارەکردنەوەی هەندێ قسە و وتە وەکو حوکمێك بەبێ شیکردنەوەیان. لەبەرئەوەی منیش ئەو هەڵەیە دووبارە نەکەمەوە دەتوانم لێرەدا تەنیا یەك نموونە یەك تۆز بە وردی باس بکەم کە ئەویش سڕینەوەی تاکایەتی و سەربەخۆییە لە وشەکان لە هەندێ شێوازی نڤیساریی زمانی کوردیدا.

**جەنابتان لە هەندێ وتاردا باسی لەناوچوونی سەربەخۆیی وشەتان کردووە لە زمانی کوردیدا، تکایە لەو بوارەوە باس بکەن؟**

ئەم کارە جۆرێکە لە بەکارهێنانی بۆچوونی زمانناسیی مەعریفی بۆ شیکاریی ناسنامەی ئەو سووژەیەی بەو زمانە قسە دەکات. ئەمەش ئەو لقە زانستییەیە کە باس لە پێوەندیی نێوان زمان و جۆری مەعریفەی بەرهەمهێنراو دەکات لەو زمانەدا، یان هەندێ بیرۆکەی مەعریفیی تازە دەربارەی ئەو زمانە بەرهەم دەهێنێت کە پشتیان بە هەمان مۆرك و تایبەتمەندییەکانی زمان بەستووە. لێرەدا هەوڵ دەدەم بە کورتی باس لەم نموونەیە بکەم:

لە هەندێ شێوازی نڤیساریی زمانی کوردیدا زۆرجار سەربەخۆیی و مۆرکی تاقانەی وشەکان لەناو دەچێت. ئەگەر بمەوێت نموونەیەکی هەرە سادەتان بۆ باس بکەم،

دەبێت بەشێوەیەکی وردەکارانە تەماشای چۆنییەتی نووسینی 'ئەم و ئەو' بکەین لە کوردیدا بە بەراورد لەگەڵ زمانەکانی تردا:

لە فارسیدا: این و ان.

لە ئینگلیزیدا: this and that

لە فەڕەنسیدا: cette et cela

لە عەرەبیدا: هذة و تلك

بەڵام لە کوردیدا ڕۆژنامەنووسەکانمان دەنووسن: 'ئەم و ئەو'، یان 'ئەموئەو' لەجیاتی 'ئەم و ئەو'.

گەر سەرنجی ورد بدەین، ئەم دەستەواژەیە لە هەموو ئەو زمانانەی سەرەوە لە سێ وشە پێکهاتووە، کەچی لە کوردیدا بووە بە دوو وشە، یان تەنانەت هەندێ جار یەك وشە. واتە لێرەدا ئێمە سەربەخۆیی وشەی 'و'مان زەوتکردووە کە بۆ خۆی ئامرازی پێوەندییە و یەك وشەی سەربەخۆیە. تەنانەت هەندێ جار دەبینین کە بەم شێوەیە دەینووسن: ئەموئەو! هەمان ئەم شێوە نووسینە لە چەند نموونەیەکی تردا دەبینین، بۆ نموونە دەنووسرێت 'ماڵێکیتر' لە جیا تی 'ماڵێکی تر'. هەمان ئەم ڕەوشە لە نووسینی کرداری 'دا' دا دەبینرێت: 'من کتێبەکەم بە تۆدا' لە جیاتی 'من کتێبەکەم بە تۆ دا'.

بەڵام کێشەکە بەم ساکارییەی سەرەوە نییە و زۆر قووڵترە لەوەی بیری لێدەکەینەوە: ئایا ئەم لەناوبردنی سەربەخۆییە لە وشەدا ناگەڕێتەوە بۆ لەناوچوونی سەربەخۆیی لە زەینییەت و ناخودئاگای ئێمەدا؟ لێرەدا با لەوە گەڕێین کامیان هۆکار و کامیان هۆکردن و با تەنیا تۆزێ سەرنج بدەینە پێوەندیی نێوانیان، ئەو پێوەندییەی ئێمە بە هیچ شێوەیەك ئاوڕمان لێ نەداوەتەوە. ئایا ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ لەناوچوونی تاکایەتی لە سیستمی فەرهەنگیی ئێمەدا؟ ئایا ئەو سیستمە فەرهەنگییەی تاکایەتی بەرهەم نەهێناوە لە ڕێنووسەکەشیدا بەر بە تاکایەتی ناگرێت؟ ئایا ئەم شێوە نووسینە، بەرهەمهێنانەوەی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی زەینییەتی سووژەی کوردی نییە کە بریتییە لە نەبوونی تاکایەتی؟

ڕۆژنامەنووسێکی فەقیر کە لە نووسینگەی ڕۆژنامەیەك یان کەناڵێکی تەلەفزیۆنیدا دانیشتووە و خەریکی کاری ڕۆژانەیەتی، ئەم کارە بە بیرکردنەوە و تێڕامانەوە ئەنجام نادات، بەڵکو ئەم دیاردەیە بەشێوەی ناخودئاگا لە دەقەکەدا دەردەکەوێت. بۆ ئێمەمانانیش بندێڕەکان لە دێڕەکان گرنگترن، یان ئەو شتانەی کە دەق نایەوێت بیلێت گرنگترە لەو شتانەی بە ئاشکرایی دەریخستوون. واتە، لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە خودی زمانەکەوە دەتوانین لە ناسنامە و جۆری سابجێکتیڤیتی سووژەکە تێبگەین.

لە لایەکی ترەوە، کە لەجیاتی 'ئەم و ئەو' دەنووسین 'ئەمو ئەو' یان 'ئەمو ئەو' یان 'ئەموئەو'، ئەمە فەرزکردنی زمانی ئاخافتنە بەسەر زمانی نووسیندا. بە واتایەکی تر، لێرەدا ئەمە گرنگ نییە کە سنووری نێوان ئەم دوو جۆرە زمانە تێکشکاوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەمە زمانی ئاخافتنە کە بەسەر زمانی نووسیندا زاڵ بووە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە شتەکان لای ئێمە ڕێك پێچەوانە بوونەتەوە: لەجیاتی ئەوەی ئێمە خاوەنی زمانێکی زانستیی نووسراو و یەکگرتوو و پاراو بین و لەم زمانە کەڵك وەربگرین بۆ ڕێکوپێککردنی زمانی بەڵگاندنەکانمان و سەر و سامان بەخشین بە جۆری مشتومڕە زارەکییە سیاسی و ئایینی و فەرهەنگییەکانمان و بردنە سەری ئاستی ئەو مشتومڕانە لە باری کەلامی و زانستییەوە، ڕەوتەکە یەکسەر پێچەوانە بووەتەوە، نەك هەر ئەو کارەمان نەکردووە، بەڵکو زمانی نووسینەکەشمان ڕێك لەسەر و بەپێی بنەمای زمانی ئاخافتنەکەمان داڕشتووە و تاپیکردووە کە شێوازێکی ناعەقڵانی و نازانستیی زمانە.

بێجگە لەمانەش، ئەوانەی ئاگاداری بیرۆکەکانی قوتابخانەی پاش بنەماییخوازیی دێریدان، دەزانن کە یەکێك لە دەرئەنجامە هەرە گرنگەکانی ئەو تیۆرییە دنیاداگر و سەردەمسازە ئەوە بوو کە ئەوەی خستە ڕوو کە فەرهەنگی ڕۆژئاوایی لە ڕابردوودا بەردەوام گوتە و ئاخافتنی فەرز کردووە بەسەر نووسیندا، ئەمەش یەکێك بووە لە هۆکارەکانی پەرەنەسەندنی ئەو شارستانییەتە بۆ ماوەیەکی زۆری یەك هەزار و پێنجسەد ساڵە. باشترین نموونەی بایەخدان بە ئاخافتن لەچاو نووسیندا شێوە بۆچوونی سوقرات و مەسیح بوو کە گرنگییان دەدایە ئاخافتن، نەك نووسین. ئەمە ئەفلاتوون بوو قسەکانی سوقراتی نووسی و هەمان کار ئەو چوار حەوارییە ناسراوە بۆ مەسیح

کردیان. گەر دێریدا دەربارەی فەرهەنگ و شارستانێتی رۆژئاوا وا دەڵێت، کەواتە ئێمەی کورد دەربارەی فەرهەنگ و شارستانێتی خۆمان بڵێین چی کە هاتووین و زمانی نووسینەکەشمان هەر بەپێی شێوەی ئاخافتنەکەمان نووسیودتەوە؟

هەر بە هەمان شێوە با نموونەیەکی تر بهێنینەوە: تاکو ئێستا نەمانبینیوە لە رۆژنامە یان کتێبێکی ئینگلیزیدا لەبەر کەمیی مەودا دوو وشە پێکەوە بلکێندرێن و گەر وشەیەك بکەوێتە کۆتایی دێڕەکەوە و مەوداکەش کەم بێت، ئەوا وەکو یاسایەکی رێنووسییانە لە هێڵێك بەناوی 'هایفێن' کەڵك وەردەگیردرێت و درێژەی وشە دەکەوێتە دێڕی دواییەوە. لە چاپەمەنییە کوردییەکاندا و بەتایبەت لە رۆژنامەکاندا، گەر حاڵەتی وا رووبدات، یان دوو وشەکە پێکەوە دەلکێنرێن یان مەودایەکی زۆر بە سپەیس لەنێوان وشەکاندا دروست دەکەن بۆئەوەی سەرجەمی وشەی دووەم بکەوێتە دیڕی دواییەوە. هەموو ئەم فڕوفێڵانەش لەبەر ئەوەیە کە چوارچێوەی گشتیی ئەو ستوونە، یان ئەو چوارگۆشەیەی بابەتەکەی تێدا دانراوە تێك نەچێت. ئایا ئەمە نموونەی قوربانیکردنی تاك نییە لە بەرامبەر کۆدا؟ ئایا ئەمە لەناوبردنی پاژ نییە لە بەرامبەر گشتدا؟ لێرەدا تاکەکە هەمان وشەکەیە و کۆکە کۆی ئەو چوارگۆشەیەیە کە کۆی بابەتەکەی تێدا دانراوە. ئایا ئەمە ناگەڕێتەوە بۆئەوەی کە سابجێکتیڤیتییە پێکهێنەرەکانی ناسنامەی ئێمە بەردەوام تاکیان لەبەردەم کۆدا قوربانی کردووە؟

لە ئەلفوبێی لاتینیدا هەر پیتە و سەربەخۆیە و هەربۆیەش گرافیستەکان دەتوانن گەلەك نوێکاری و دیزانی تازە لە وشەکان دروست بکەن، بۆ نموونە، کۆمەڵێ بار لە بەریتانیا هەن بە ناوی (amBer rooms)، گەر سەرنج بدەین تێدەگەین کە لەم لۆگۆیەدا پیتی (B) بە کاپیتاڵ نووسراوە، کەچی پیتەکانی تر بە سمۆڵ، ئەم تایبەتمەندییە لە زماندا دەستی نەخشەسازەکان ئاوەڵا دەکات لەپێناو نوێکاریی لۆگۆی تازە بۆ مارکە بازرگانییەکان و ئەو لۆگەیەی سەرەوە بووەتە مارکی بازرگانیی ئەو بارانە. گەر بمەوێت لە ئێران نموونەیەك بهێنمەوە، پێموایە یەکەم جار بەشێوەیەکی بەربلاو ئەم کارە لە لۆگۆی رۆژنامەی همشهری-دا کرا. گەر ئێوە لۆگۆی رۆژنامەی هەمشەهری بهێننە بەرچاو، تێدەگەن کە رەنگە بۆ یەکەم جار بوو بێت ئێرانییەکان بە زەقی سەرنجیان بۆ لای سەربەخۆیی پیتەکان راکێشرابێت، چونکە لەم لۆگۆیەدا چەند هێڵێکی ئەستوونی پیتەکانی وشەی همشهری لێکدی جیا دەکەنەوە. لەم

ساتەوەختەدایە کە نەك هەر وشەکان، بەڵکو پیتەکانیش دەبنە خاوەنی سەربەخۆیی و تاکایەتی و هەر کامەیان دەبنە خاوەنی شکڵ و سیمایەکی سەربەخۆ.

رەنگە بڵێین ئەمانەی سەرەوە هەموویان پێوەندییان بە رێنووس و شێوەی نووسینی پیت و وشەکانەوەیە و خودی زمانەکە وا نییە، یان ئەمە پێوەندی بە هونەری دیزاین و نەخشەسازی و دارشتنی لاپەڕەکانەوە هەیە، نەك بە خودی زمانەکەوە، کەواتە، لێرەدا دەبێت نموونەیەکی تری لەناوچوونی سەربەخۆیی وشە ئەم جارەیان لە زمانی کوردیدا بهێنمەوە:

لە زمانی کوردیدا کۆمەڵێك وشە و زاراوە هەن کە بە پەیڕەوی لە یەکێك لە رێساکانی دووپاتەسازی (reduplication) دروست دەکرێن. راستە کە ئەم جۆرە زاراوانە لە زمانێکی وەك فارسیشدا هەن (وەك پنجره منجره)، بەڵام ئەم رێسایە لە کوردیدا زیاتر لەرێگەی پێکەوەنووسانی دوو وشەی سەربەخۆوە ساز دەکرێت. ئەم زاراوانە لە کوردیدا زۆرن و من بەشێکی زۆرم لێ کۆکردوونەتەوە کە زیاتر لە سێسەد دانەن، وەك:

کاروبار، شاخوداخ، حاڵوماڵ، جاروبار، ئاوتاو، دەموچاو، هاتوهاوار، قینوقڕە، تاکوتەرا، پاروپێرار، ماڵ ومناڵ، سەروبەر، گیروگرفت، تەنگ و چەڵەمە، کۆسپ و تەگەرە، کەلوپەل، شتومەك، قاتوقڕ، خاك وخۆڵ، هەراوهوریا، لێرەولەوێ، ئانوسات، کاتوسات، رێکوپێك، خەستوخۆڵ، تارومار، خواروخێچ، گێلوویل، گێلوگەوج، پانوپۆڕ، لارولوێر، سوروسوێر، سپیاوسووراو، ئاخوداخ، لەنجەولار، فیکوفاك، پلەوپایە، جێگەوپێگە، و هتد.

گەر تۆزێك لەم دەستەواژانە بکۆڵینەوە، بەم دەرئەنجامانەی خوارەوە دەگەین:

١- ئەم زاراوانە هەندێکیان ناوەدەنگن (onomatopoeia)، کە ژمارەی یەکجار زۆری ئەم جۆرە وشانە لە زمانی کوردیدا نیشاندەری سروشتیبوون و پێشمودێرنبوونی ئەم زمانەیە (ئەمەش بۆخۆی سەردێری باسێکی ترە کە ئێستا ئاماژەی بۆ ناکەم).

٢- لەم وشانەوە هەندێ وشەی تریش دروست بوون، کە ئەم خاڵە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم رێسا و تایبەتمەندییە لە بردوپێداندا بووە، ئەگەرچی لە دەوڵەمەندترکردنی

زمانی کوردی لە رووی ژمارەی وشەکانەوە سوودبەخش بووە، بەلاَم لە هەمان کاتیشدا رێگر بووە لەبەردەم بەتایبەتکردنەوە و بەتاککردنەوە و لە ئەنجامدا بە زانستیکردنەوەی زمانی کوردی، واتە، بۆ نموونە، ماڵ و منالّ نەك ماڵە و نەك منالّ، بەلاَم واتایەکی گشتیتری هەیە، هەر بە هەمان شێوەش، سەروسامان نەك سەرە و نەك سامان و لێرەدا تاکایەتی و تایبەتمەندێتی تاك لە هەردوو وشەکە سەندراوەتەوە و یەك یەکەی مانایی تازە دروستکراوە کە یەکەیەکی مانایی گشتییە.

٣- زۆربەی ئەم وشانە ناون و ئەم خاڵەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە تەنانەت هەندێ ناو لە زمانی کوردیدا گشتین و لە دوو وشەی ترەوە دروستبوون. باشترین نموونە لێرەدا 'دەموچاو'-ە کە نەك دەمە و نەك چاو بەڵکو بە مانای 'چهرە' یان 'روخسار' بەکار دەبرێت.

٤- هەرچەند بەشێکیان ئاوەڵکردارن، بەلاَم بۆ ورد روانین لە چۆنییەتی کردارێك دیسانەوە لە کۆمەلّێ وشەی گشتی کەلّك وەرگیراوە.

٥- ئەمرۆکە ئەم وشانە پێکەوە دەنووسرێن، وەك ئەوەی لەجیاتی ماڵ و حالّ دەنووسرێت مالّوحالّ.

٦- راستە هەندێکیان یان لە بنەڕەتدا فارسین و یان لە فارسیشدا بەکار دەهێنرێن، بەلاَم رێژەی بەکارهێنانیان لە کوردیدا یەکجار زۆرترە لە فارسی.

٧- ئەم وشانە دوو دەستەن: یان هەردوو وشەکە مانادارن یان تەنیا یەکێکیان مانای هەیە. دەستەی یەکەم، وەك: دەوروپشت، دەستەی دووەم وەك: فڕوفێڵ.

٨- لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا و بەتایبەت لە کلاسیزمی کرمانجیی ناوەڕاستدا رادەی بەکارهێنانی ئەو وشانە کەمترە، کەچی لە فۆلکلۆری کوردیدا و لە ئەدەبی کلاسیکی گۆرانیدا زۆرن.

٩- کاتێ زیاتر دەوری ئەم وشانەمان بۆ دەردەکەوێت کە بزانین ژمارەیان زیاتر لە ٣٠٠ دانەیە و هەر هەمووشیان بە گوێی خەڵك ئاشنان و رۆژانە و بەلێشاو لەلایەن هەموو کەسێکەوە و لە هەموو کەناڵە بینراو و بیستراو و ئینتەرنێتییەکانیشدا بەکار دەهێنرێن.

پاش ئەو دەرئەنجامگیرییانەی سەرەوە، ئێستا دەبێت باسوخواسیان لەسەر بکەین: ئایا ژمارەی یەکجار زۆری ئەم وشانە لە زمانی کوردیدا و رێژەی زۆری بەکارهێنانیان

دیسانەوە جارێکی تر سەلمێنەری ئەو راستییە نین کە زمانی کوردی بەر بە تاکایەتیی وشەکان دەگرێت؟ کە دەڵێین شاخوداخ، ئەوا لە جیاتی دوو وشە یان دوو چەمك یان دوو وێنە تەنیا یەك چەمکمان بۆ سازبووە و ئەم چەمکە تازەیەش نەك شاخە و نەك داخ و تەنیا شاخوداخە. لێرەدا وشەی دووەم، واتە داخ بە تەواوەتی ماناکەی خۆی لێرەدا لەدەست داوە. هەر بە هەمان شێوە کە دەڵێین شتومەك ئەمە وشە دوانییەکەیە کە لە جێگەی یەك وشەدا دانیشتووە و گەر لێکیان جودا بکەینەوە، هیچکامیان مانای وشەکەیان نییە. واتە قوربانیکردنی دوو وشەی سەربەخۆ بە مەبەستی سازکردنی یەك وشە، هەرچەندە وشەی دووەم واتە 'مەك' خاوەن مانا نییە. مەك پاشگریش نییە کە بتوانین یاسایەکی بۆ بدۆزینەوە. ئایا ئەمە جۆرێك نییە لە گشتی کردنەوەیەکی نارێسامەند؟ واتە جۆرێك نییە لە بە یەك یەکەی مانایی دانانی دوو یەکەی مانایی سەربەخۆ؟ ئێمە رۆژانە خەریکی بەکارهێنانی ئەو جۆرە وشانەین بەبێ ئەوەی بزانین کە ئەم وشانە زەینییەتی گشتیسازانەمان بۆ بەرهەم دەهێننەوە، بەبێ ئەوەی بزانین ئەم وشانە بەر بە تایبەتیبوون دەگرن. دیارە تایبەتیبوون و پاژنوارین یەکەم پێشمەرجی نیگای فەلسەفییە، کەچی ئەم وشانە رەهەندێکی تەواو گشتی و بەتاڵ لە تایبەتیبوون دەدەنە دەقە کوردییەکان. لە بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانەدا لە دەقێکی زانستیدا بەبێ ئەوەی بزانین یەکەم مەرجی نووسینی زانستی یان فەلسەفیمان رەچاو نەکردووە، کە ئەویش 'دەقیق' بوونە.

لێرەدا با نموونەیەکی تر لە هەمان بابەت، واتە لە پرسی لەناوچوونی سەربەخۆیی وشەکان، بهێنمەوە: من ناوم بەختیار سەجادی-یە، نەك بەختیاری سەجادی. واتە، لەکاتێکدا هەمووان خاوەنی ناوێکی بچووکی سەربەخۆ و ناوێکی خێزانیی سەربەخۆن، لە نووسینی کوردیدا 'ی' دەلکێندرێت بە ناوی بچووکی منەوە و بەختیارەکە دەبێتە بەختیاری! هەڵبەت ئەمە لە ئاخافتنی فارسیشدا هەر وایە، بەڵام لە فارسیدا نانووسرێت و هەر تەنیا دەبێژرێت. لەوانەیە خێرا بپرسین کە لەناو کوردانی باشووردا کە ناوی کەسەکان سولاسین ئەم تایبەتمەندییە نابیندرێت. واتە، بۆ نموونە، ئەوان دەڵێن و دەنووسن 'ئەحمەد محەمەد ئیبراهیم'، بەڵام با لە بیرمان نەچێت کە هەر لە باشووردا و بەتایبەت لە کۆمەڵگا بچووکەکاندا و یان لەناو بازاڕدا دیسانەوە هەر ئەم

خەسڵەتە دەبینین وەك چۆن دەڵێن خولەی بەقاڵ، یان كاك ئەحمەدی شێخ، یان سەعەی چاولار. لێرەدا با هۆكاری ئەم مەسەلەیە تۆزێ روون بكەمەوە:

زمانی كوردی گەرچی وەك زۆر زمانی تر بەرهەمی كۆمەڵگایەكی پێش مۆدێرنە، بەڵام ئێستاش هەر تا رادەیەكی زۆر لەو قۆناغەدا ماوەتەوە. لەم جۆرە كۆمەڵگایانەدا بە حوكمی ئەوەی شارەكان زۆر بچووكن یان زۆربەی خەڵكەكە لە گوندان دەژین هەموومان یەكتر دەناسن. واتە لە گونددا لەوانەیە بە من بڵێم بەختیاری كوڕی سەید ئەمینی كوڕی سەید بەها، واتە ئەو بەختیارەی ناوی مەعریفەیە و كەواتە دەیناسین. ئەم شێوە باوەی ناولێنان ئێستاش لە گوندەكانی كوردستاندا هەر ماوە وەك چۆن دەڵێن كەماڵی سەرتاس، حەمەی ئاغا،ساڵحی دەروێش كەریم. ئەمە ئەندێشەیەكی زۆر ساكارە گەر وا بزانین ئەم زیادكردنە تەنیا 'ی' ئیزافەیە، زیادكردنی 'ی' بەو ناوانە بۆ ئاماژەدانە بەو ئاوەڵناوەی كەسەكەی پێدەناسرێتەوە، واتە دانانی دەلالەتی مەعریفە لەسەر ئەو ناوە، واتە هەم بێژەر و هەم بیسەرەكە كەسەكە دەناسن، بەڵام دەزانین كە ئەمڕۆژە لە شارە گەورەكانی كوردستاندا كەسەكان هەمووان ناناسن. ئەم جۆرە زەینییەتە وا لە سووژەی كوردی دەكات گەر تەنانەت بیست ساڵیش لە ئەورووپا بژی لە وێبلاگەكەیدا و لە نووسینەكانیدا لەبری ئەوەی، بۆ نموونە، بنووسێت 'ئەحمەد محەمەدی' دەنووسێت 'ئەحمەدی محەمەدی'. ئەمە لەلایەكی ترەوە دیسانەوە زاڵكردنی ئاخافتنە بەسەر نووسیندا كە لە سەرەوە دەرئەنجامە نەرێنییەكانم باسكرد. ئەمەش جگە لەوەی سەربەخۆیی وشەكە لە ناوچووە، چونكە پیتێكی خراوەتە سەر كە هیچ پێوەندییەكی بە ناوەكەوە وەكو وشەیەكی سەربەخۆ نییە، ئەمەش جگە لەوەی هەر لەم رێگەیەوە هەوڵ دەدرێت وشەكانیش بلكێنرێن بە یەكەوە.

هەر ئەم بابەتە پێچەوانەكەشی راستە، واتە تەنانەت ئێستاش زۆر نووسەری كورد 'ی' زیادە ناخانە سەر ناوەكە، بۆیە كاتێ دەنووسن 'رۆژنامەنووسی ئازاد' ئێمە نازانین مەبەستیان پیشەی رۆژنامەنووسیی ئازادە، یان ئەو كەسەی كە رۆژنامەنووسێكی ئازادە، واتە، یەكەمین كار و مەبەستی نووسین كە تێگەیشتنە لێی، لیمان زەوت دەكرێت. ئەو نموونانە تێكەڵی و پێكەڵی رەوتی سەرهەڵدان و گەشەكردنی فیكریی ئێمە دەردەخات كە من ناوی دەنێم گەشەكردنی ناكامڵی ناهاوسەنگی ئاڵۆز.

دیسانەوە هەر دەربارەی بەر بە تاکایەتی گرتن لە نووسینی کوردیدا بڕوانە بۆ شێوەی بەکارهێنانی کاما لە کوردیدا کە وەك دەبینین سەربەخۆیی وشە دەخاتە مەترسییەوە: لە ئینگلیزیدا دەنووسن:

My car, house, and family

لە کوردیدا: سەیارەکەو، خانووەکەو، خانەوادەکەم

لێرەدا وشەی خانوو کە سەربەخۆیە و یەك یەکەیە و دەبێت لەنێوان دوو کۆمادا بێت، کەچی لای ئێمە ئامرازی پێوەندی 'و' دەخەنە سەری و سەربەخۆییەکەی لێ دەسێنرێتەوە.

نموونەیەکی تری هەر ئەم پرسە، واتە پرسی لەناوچوونی سەربەخۆیی وشە، بەکارهێنان و ریزکردنی چەندین وشەی هاومانایە لە یەك رستەدا. دیارە ئەمە لە زمانێکی وەك ئینگلیزیدا وەك هەڵەی گرامێری ناوی لێ دەبرێت، کەچی لە کوردیدا ئاساییە وەك ئەوەی چۆن دەڵێن:

بە ناوی خوای گەورە و مەزن.

ئەم تابلۆیە زۆر جوان و قەشەنگە.

ئەم بەرنامەیە باسی شتی نوێ و مۆدێرن دەکات.

دیسانەوە لێرەدا لەجیاتی یەك وشە لە چەندین وشە کەڵکمان وەرگرتووە کە هەموویان لەباری ماناییەوە یان هاوواتان یان زۆر لەیەك نزیکن، ئەمەش واتە لەناوبردنی دیقەت لە زماندا. ئەرێ بە راستی 'دەقیق' بوون کە یەکەم مەرجی زمانی زانستی و زمانی فەلسەفییە لە کوردیدا دەبێتە چی؟ ئەگەر هاوواتای 'ورد' یان 'رێکوپێك'ی بۆ دابنێین، دیسانەوە رووبەڕووی گرفت دەبینەوە. ئایا ئەو واژانەی کە لە زمانی زانستیدا، نەك هەر بەلێشاو بەکاردەبرێن، بەڵکو بۆخۆشیان پێشمەرجی نووسین و لێکۆڵینەوەن، لە زمانی کوردیدا هاوواتاکانیان چییە؟ ئێمە هێشتا نەمان توانیوە هاواتایەکی پڕ بە پێست بۆ زاراوەی فرەدووبارە و هەرە گرنگی (argument) لە کوردیدا بدۆزینەوە یان دروستی بکەین.

نموونەیەکی تری هەر ئەم باسە ئەو ئاڵۆزییەیە لە تایپی کوردیدا کە گەلەك جاران ئەو زاراوانەی یەك وشەی سەربەخۆ و تاك پێکهاتوون جیادەکرێنەوە، کەچی رێك بە پێچەوانەوە ئەو دەستەواژانەی لە چەندین وشە پێکەێنراون دەلکێندرێن بەیەکەوە و

وەکو یەك وشەیان لێدێ: نموونەیەی یەکەم وەك 'دوو ساڵانە'، 'مێژوو نووسی'، 'بنەما خوازانە'، و نموونەی دووەم وەك 'لەتاران'، 'بەهۆی'، 'کەخۆر هەڵهات' و زۆر نموونەی تر.

رەنگە ئەم نموونانە بۆ خوێنەران ئاسایی و بێبایەخ بێنە بەرچاو، بەڵام کێشەکان کاتێ سەرهەڵدەدەن کە بیر لە دیجیتاڵیزەبوونی هەموو ئامێرەکانی دنیای ئیمڕۆ بکەینەوە کە بەو پێیە تەنیا کەم یان زیادکردنی یەك خاڵ دەتوانێت هەموو کارەکان تێکبدات، وەك لە فۆرمەکاندا، لە پاسپۆرت، لە زانکۆکاندا، یان لە مۆتۆرە ئینتەرنێتییەکانی گەڕاندا، یان لە تینك تانکە ئانلاینەکاندا، یان لە بارکۆدی سەر کەلوپەلەکانی نێو سوپەرمارکێتێك، یان لە جۆری نووسینی ناوەکەت لەسەر کرێدیت کارتەکەت، یان لە جۆری تایپی ناوی ئیمەیڵ یان ماڵپەڕەکەت. ئەوەی بەلای منەوە زۆر زۆر سەیرە ئەوەیە کە بەشێکی هەرە زۆری ئەو نووسەرە کوردانەی دانیشتووی رۆژئاوان هیچ شتێکیان دەربارەی ئەم پرسە لە زمانی کوردیدا نەدرکاندووە! زۆر ئاساییە نووسەرێکی کوردی دانیشتووی نیشتمان هەست بەو گرنگایەتییە نەکات، چونکە ژیان لای ئێمە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت دیجیتالیزە و ئیلیکترۆنیزە نەبووەتەوە، بەڵام ئایا لەناوبردنی تاکایەتی و سەربەخۆیی وشەکان لە زمانی کوردیدا لەم پێناوەدا گەلەك گرفتمان بۆ دروست ناکات؟

لێرەدا دەبێت پەنجە بخەمە سەر دەوری دوو شەپۆلی گەورەی رۆشنبیریی کوردی لەم ئاڵۆزییەی ئێستای زمانی کوردی و دۆخی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردیدا. دەستەی یەکەم ئەوانە بوون کە لە شەست و هەفتاکانی سەدەی بیستەمدا و بەهۆی پێوەندیی ئەوسای عێراق و سۆڤیەت روویان لە سۆڤیەت کرد بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە. ئەوەی ئاگاداری رەوتی بەرهەمهێنانی فیکر و فەلسەفە و تیۆریی دنیای هاوسەردەم بێت، باش دەزانێت کە پارادایمی زاڵ و رەسمی و حکومی لە سۆڤیەتی جاران بەتایبەتی لە رووی زانستە مرۆییەکانەوە زۆر پاشکەوتوو بوو و بەسەرهاتی فۆرماڵیستەکان و کەسانێکی وەك باختین و یاکوبسن باشترین نموونەن بۆ ئەم مەبەستە. ئەو پۆلە نووسەرە کوردەی روویان لە سۆڤیەت کرد لەگەڵ خۆیان ئەو پارادایمە لێکۆڵینەوەییەیان بۆ بە دیاری هێنایەنەوە کە زیاتر گرنگی دەدایە ناوەڕۆك تاکو فۆرم. زیاتر گرنگی دەدایە ریالیزمی کۆمەڵایەتی تاکو بنەمای هونەری لە ئەدەب و هونەردا و دیارە لە ئەدەبدا بنەما و فۆرم لە وشە پێکهاتووە. ئەمە هەر پشتگوێخستنی تاکایەتیی وشەکان و

گرنگیدان بە ناوەرۆکی گشتیی بەرهەمەکانی لیّ نەکەوتەوە، بەڵکو، وەك دەزانن، زۆربەی هەرە زۆری ئەو کتێبانەی ئەوان لە رووسییەوە کردیان بە کوردی، مەبەستم ئەو بەرهەمانەی باسی زانستە مرۆییەکان دەکەن، ئێستا کەس نایانخوێنێتەوە، ئەمەش رووداوێکی شاز نییە، چونکە لە دنیای ئەمڕۆدا کەس ئەو جۆرە بەرهەمانە ناخوێنێتەوە. ئەو تێزە دکتۆرایانەی لە سۆڤیەتی جاراندا و لەلایەن کوردانەوە نووسراون، پەیڕەوییان لە پارادایمی جیهانی و زاڵی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە نەکردووە، هەر بۆیەش ئەمڕۆکە ژمارە تینك تانکە رووسییەکان لەچاو ئینگلیزییەکان یەکجار زۆر کەمە و پارادایمی زاڵی لێکۆڵینەوە رووسییەکانی ناوەڕاست و چارەکی سێیەمی سەدەی بیستەم بە تەواوی رووی لە داکشان کردووە. دیارە ئەو پێوەرە دنیاداگرانە (universal)کە لە تینك تانکە ئانلاینە ئینگلیزییەکاندا رەچاو دەکرێن، هی کەس نین و بەڵکو ئەمڕۆکە بوونەتە موڵکی هەموان و هەموانیش دەبێت لە لێکۆڵینەوەکانیاندا رەچاویان بکەن.

شەپۆلی دووەم تاقمێ لەو شاعیر و نووسەرە کوردانە بوون کە لە هەشتاکان و بە تایبەت لە نەوەدەکاندا روویان لە ناوەڕاست و باکووری ئەورووپا کرد. گەر بە وردی سەرنج بدەین، تێدەگین زۆربەی بیرمەندە دیارەکانی خودی ئەو وڵاتانە ئەمڕۆکە لە تینك تانکە ئینگلیزییەکاندا بەرهەمەکانیان بڵاو دەکەنەوە، کەچی نووسەر و رۆشنبیرانی ئێمە شێوەی زمانی و پارادایمی لێکۆڵینەوەیی ئەوانیان بۆ بە دیاری هێناین. باشترین نموونە لێرەدا جۆری تایبەتی رێنووسی کوردییە لە بەرهەمەکانی جەماعەتی گۆڤاری رەهەند. بۆ نموونە، وەك چۆن لە زمانی ئەڵمانیدا وشەکان درێژن و بە پێچەوانەی فەرەنسی و ئینگلیزی لە گەلەك پیت پێکهاتوون، ئەوا ئەوانیش ئەو هەوڵەیان بۆ زمانی کوردی دا و لەجیاتی 'وە پشت گوێ خستن' یان 'وە پشتگوێ خستن' دەیاننووسی 'وەپشتگوێخستن'. واتە، لێرەدا لە پڕێکدا وشە کوردییەکان تا دەهات درێژتر دەبوونەوە! دیسانەوە لەوانەیە هەر ئەم پرسە بێبایەخ بێتە بەرچاو، بەڵام ئایا گرنگیدانی زۆربەی نووسەران و توێژەرانی کورد بە فەلسەفەی قارەیی هۆی دوورکەوتنەوەی ئێمە نەبوو لە فەلسەفەی شیکارانی ئەنگلۆساکۆن؟ ئایا بیرتان لەوە کردووەتە بۆچی لەناو کورددا هێندە کتێب و وتار و ستوون و یاداشت لەسەر کەسێکی وەك نیچە نووسراوە، کەچی یەك لە سەدی ئەوە لەسەر کەسێکی وەك راسێل نەهاتووەتە بەرهەم. ئەو راسێل-ەی

باسی لە بیرکاری ئاسایی بوونی زمان دەکرد. دیسانەوە، ئایا ئەمە هۆکار نییە بۆ پانەگرتنی زانستی مەنتیق لە زمانی کوردیدا و ئایا هەر ئەمە نەبووەتە هۆکاری ئەو ئالۆزییە میتۆدۆلۆژیکییەی گوتاری رۆشنبیریی کوردی؟ ئەو رۆشنبیرییەی ئێستاش هەر ئەوە دەربارەی زمان دەڵێتەوە کە هەیدیگەر وتوویەتی و رەنگە فرەدووبارەترین رستەیەك بێت کە لە زمانی فەیلەسوفێکەوە کرابێت بە کوردی.

خاڵێکی گرنگ لەم باسەدا کە من چیدی زیاتر لە سەری نارۆم ئەوەیە کە هەر ئەم جۆرە بەکارهێنانەی زمان بۆ خۆی پاش ماوەیەك تایبەتمەندییەکی ئایدیۆلۆجیك دەگرێتە خۆی. واتە، نووسەرێکی تازەباو لەبری ئەوەی بنووسێ 'من و تۆ' دەنووسێ 'منو تۆ' یان 'منوتۆ'. واتە لێرەدا ئەم شێوە بەکارهێنانەوەیە سەرەتا بەهۆی نەبوونی تاکایەتی لە سابجێکتیڤیتیی مەدا بەشێوەیەکی ناخودئاگا هاتە بەرهەمهێنان، ئەمجارەیان و لە قۆناغێکی تردا دەگاتە قۆناغی بەرهەمهێنانەوەی ئایدیۆلۆجیك و ئەمجارەیان دەبێت وەکو رێسایەك وا بنووسرێت! ئەمەش وەك ئالتووسێر دەڵێت هەمان بەرهەمهێنانەوەی بارودۆخی بەرهەمهێنانە کە لە زمانی کوردیدا بەئاشکرا دەبینرێت:

The reproduction of the condition of production

لە وەها دۆخێکدا و بە مەبەستی گشتگیربوونەوەی ئەم رێسانە پێویستە چوار توخم ئامادە بن کە بریتین لە ئایدیۆلۆجی، ئەنستیتۆ، گوتار، بەردەنگ. ئەم چوار توخمەش ئێستاکە ئامادەن و بەتایبەت گەر نووسەرەکەش ناودار بێت و هەمووان بابەتەکە بخوێننەوە، ئیدی هەمووان وەك یاسایەك تەماشای دەکەن. لەم حاڵەتدا بەردەنگ هێندە تەرکیز دەکاتە سەر پەیام و ناوەڕۆکی نووسینەکە کە ئیدی ئاگاداری ئەوەیە نییە سەرجەم لایەن و تایبەتمەندییەکانی تری ئەو نووسینە و تەنانەت ئەو پارادایمەی دەقەکە پەیوەستیەتی بەشێوەیەکی ناخودئاگا کاری تێدەکەن. ئەمەش واتە وەرگرتنەوەی ئایدیۆلۆجی بەبێ هیچ گرفتێك. لەم حاڵەتەدا ئیدی پرسیارەکان رووبەڕووی ئەو پارادایمە نابنەوە، بەڵکو تەنیا رووبەڕووی پەیام و ناوەرۆکی دەقەکە دەبنەوە. لێرەدا بەسەرهاتی ئەم دەقە وەکو بەسەرهاتی رستەکەی هەیدیگەری لێدێ (سەیر لەوەدایە کە کەسەکان بە کوردی قسە دەکەن، بەڵام ئەم قسەیەی هەیدگەر بە فارسی دەڵێننەوە چما هەیدیگەر فارس بووە یان ئەمەی بە فارسی گوتووە. ئەم نموونەیە رێك وەك کاردانەوەی ئەو بێژەرەیە کە لە کاتی بەرنامەیەکی زیندوودا دەپژمێ و خێرا

دەڵێ 'عفوا' لەجیاتی 'ببوورن'. واتە هەر بە هەمان شێوە کە زمانی فارسی لە ناخودئاگای سووژەی کوردی لە ئێراندا جێگیر بووە هەر بە هەمان شێوەش زمانی عەرەبی لە ناخودئاگای سووژەی کوردی لە عێراق).

بەشێکی زۆری ئەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە کە من وەکو رەهەند یان لایەنی ئایدیۆلۆجیکی شوناس و ناسنامەی سووژەی کوردی لە قەڵەمی دەدەم، لە ناخودئاگای ئێمەدا جێگیر بوونە و هەر جۆرە هەوڵدانێك بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو ئایدیۆلۆجییانە واتە خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕ لەگەڵ بەشێکی زۆر لەو پانتاییەی ناخودئاگای کوردی داگیرکردووە.

ئەمڕۆژە هەمووان باسی گرنگایەتیی زمان دەکەن، بەڵام هۆکارەکانی ئەم گرنگایەتییە باس ناکەن، بەڵام باس لەو روانگە تیۆریکانە ناکەن هەر کامیان بەشێوەیەکی جیا لەم پرسەیان کۆڵیوەتەوە. من ماندوو بووم هێندە ئەو قسەیەی هەیدیگەرم بیستووە دەربارەی زمان. لەم رۆژانەدا تەماشای بەرنامەیەکم دەکرد کە برادەرێك لە کۆنفرانسێکدا بە کوردی قسەی دەکرد و پاشان وتی هەیدیگەر دەڵێت زبان خانەی هستی است. سەیر لەوەدایە کە بە تەواوەتی دڵنیام لەوەی زۆربەی هەرە زۆری ئەو کەسانەی قسەکەی هەیدیگەر دووبارە دەکەنەوە، ئەو قسەیەیان لە نووسینێکی هەیدیگەردا نەدیتووە، یان سەرزارەکی بیستوویانە و یان لە نووسینێکدا خوێندوویانەتەوە کە نووسەرەکەش بۆخۆی وەك خوێنەرەکە ئەو قسەیەی لە نووسینەکەی هەیدیگەردا نەدۆزیوەتەوە. ئەو قسەیەی هەیدیگەر قەت پێوەندی بەو بابەتانەوە نییە کە برایان و خوشکانی ئازیزی رۆشنبیری ئێمە لەملاو لەولا دەیدرکێنن. ئەم قسەیەی هەیدیگەر چیرۆکێکی تری لە پشتە و قەت پێوەندی بەم باسانەوە نییە.

ئەو نموونانەی سەرەوە تەنیا و تەنیا بەشێکی بچووکن لە کۆسپەکانی بەردەم سازبوونی شێوازێکی زانستیی پاراو و رێکوپێك لە زمانی کوردیدا. دیارە باسکردن لە کۆسپەکانی تر و چارەسەرکردنیان پێویستی بە مەودا و ماوەی زۆرترە.

**ئێوە پەرەسەندنی زمانی کوردی چۆن لێکدەدەنەوە؟**

سەرجەم ئەو باسانەی سەرەوە دەمانبات بەرەو ئاقارێك کە پێی دەوترێت پەرەسەندی زمان (Development of language)، من پێشتر لە چەند شوێنێکدا ئەم

باسەم هێناوەتە گۆڕێ، بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەم باسەم لە پێشەکیی وەرگێڕانی کتێبەکەی باختین و لە بەشێکی کتێبی پارادایمی پەرەسەندنی کولتووریدا درکاندووە و چیدی لێرەدا پێویست بە دووبارەکردنەوەیان ناکات، بەڵام لێرەدا دەکرێت زیاتر قسەی لەسەر بکەین:

زۆر بە کورتی، دەکرێت زمان بخەینە دوو خانەوە: زمانی قسەکردن و زمانی نووسین. زمانی نووسین بۆ خۆی بەسەر چەندین لقی جیاجیادا دابەش دەکرێت وەك جۆرە جیاوازەکانی زمانی ئەدەبی، یان زمانی ڕۆژنامەنووسانە، زمانی ئارکەیك، زمانی زانستی، زمانی بەکارهاتوو لە ئامێرە دیجیتاڵەکاندا، زمانی ڕێکلامەکان و زمانی سەر تابلۆکان. کاتێ زمانێك پەرەیسەندووە کە لەم بەشە جیاوازانەدا نەشونمای کردبێت. زمانی کوردی لەم بەشانەدا بە تەواوی پەرەی نەسەندووە بەتایبەت لە بەشی زمانی زانستیدا.

بە بەراوردێکی خێرای زمانی کوردی لەگەڵ زمانی فارسی، یان ئینگلیزیدا، ئەوەمان بە سانایی بۆ دەردەکەوێت کە کوردی لە ڕووی ئاستی گەشەسەندنەوە ڕەوتێکی زۆر لاوازی پێواوە. بەراوردکردنێکی خێرای دەقە فەلسەفی و تیۆریکەکانی سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی بیستەم لە کتێبخانەی فارسیدا ئەو ڕاستییەمان بۆ دەخاتە بەرچاو کە زمانی فارسی لە سەدەی بیستەمدا بەشێوەیەکی دیار و تەنانەت سەیروسەمەرەش گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. بۆ نموونە، گەر بەراوردێك بکەین لەنێوان زمانی بەکارهێنراو لە وەرگێڕانەکانی محەمەد عەلی فرووغی لە بەرهەمەکانی دیکارت لە سەرەتای سەدەی بیستەم و وەرگێڕانەکانی حەمید عەنایەت لە هێگێل لە ناوەڕاستی هەمان سەدە و وەرگێڕانەکانی حسێن بەشیریە لە توماس هابز و عەبدولکەریم ڕەشیدیان لە کانت و داریووش ئاشووری لە نیچە و موراد فەرهادپوور لە ئادۆرنۆ لە کۆتایی هەمان سەدە گەلەك خاڵی سەرنجڕاکێشمان دەست دەکەوێت.

جۆری وشەکان، بنەمای ڕستەکان، ژمارەی زاراوە نوێ و لاتینییەکان، یان زاراوە کۆن و عەرەبییەکان و هەروەها کورتی و درێژیی لاڕستەکان، شوێنی ئاوەڵکردارەکان، زیادکردن یان لابردنی ئاوەڵناوەکان و تەنانەت ڕەچاوکردنی خاڵبەندی و پەرەگرافبەندی لەم وەرگێڕانانەدا لێکدی بە تەواوی جیاوازن. ئەو وەرگێڕە ئاماژە بۆکراوانە توانیویانە تا ڕادەیەکی زۆر بەرچاو زمانی فارسی بەتایبەت لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەقە

فەلسەفی و تیۆریکەکانی ڕۆژئاوادا بخەملێنن و دەوری سەرەکی بگێڕن لە بەرەوپێشبردنی زمانی فارسی و ئامادەکردنی ئەو زمانە بۆ بەکارهێنان و لەخۆگرتن و پەرەپێدان و داهێنانی ئەندێشە و بیر و بیرۆکەی ڕەخنەیی و تیۆریک. ئەوان لەم ڕێگەیەدا تا ڕادەیەکی زۆر باش سەرکەوتوو بوون و زمانی فارسی لەم ڕووەوە گەلەك زیاتر و کاملتر و باشتر لە زمانی تورکی یان عەرەبی گەشەی سەندووە.

پرسی گەشەسەندنی زمان (development of language) یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی گوتاری ئاکادیمیکی هاوچەرخ. دەوری چارەنووسسازی زمان بەگشتی و کاریگەریی زمانناسیی پاش سوسووری لە بەشە جیاجیاکانی زانستە مرۆییەکان و سەرهەڵدانی ئەو لقوپۆپە زۆرەی زمانناسیی هاوچەرخ لە لایەکەوە و تایبەتمەندییە جەوهەری و شێوەییەکان و سیمای هەنووکەیی زمانی کوردی لەلایەکی ترەوە، ناچارمان دەکەن زیاتر و وردتر لە جاران سەرنج بدەینە پرسی گەشەسەندنی زمانی کوردی.

هەروەها ئەو گۆڕانکارییانەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە و بەهۆی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانیی کوردییەوە بەسەر زمانی کوردیدا هاتووە تا دەگاتە زمانی نوێی شیعری گۆران و شاعیرانی دوایی و زمانی چیرۆکنووسیی نیو سەدەی ڕابردوو و زمانی دەقە نووسراو و وەرگێڕدراوەکانی لێکۆڵینەوە جیاجیاکان و بەم دواییانەش زمانی بەکارهێنراو لە چاتی ئینتەرنێتی، یان پەیامۆکی مۆبایل و سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان دەلالەت لە جۆرێ گۆڕانکاری دەکەن لە زمانی کوردیدا. هەندێ لەم زمانانە و زۆرێك شێوازی تری بەکارهێنراو لە بەستێنە جیاجیاکاندا زۆربەی کاتەکان ڕووبەڕووی جۆرێ سەرسامی، درەنگ تێگەیشتن، چەوت تێگەیشتن یان هەر تێنەگەیشتن، یان هەستکردن بە دیاردەیەکی تازەمان دەکەنەوە. جیا لەمەش، دابڕانی زمانی نووسەران لە یەکتر و بەدیهاتنی جۆرێ پاشاگەردانی لە شێوەی بەکارهێنانی زاراوەکان لە نووسیندا و ساکارکردنەوەی بابەتەکان، کورتکردنەوەی ڕستەکان، لابردنی ئاوەڵکردار و پشتگوێخستنی ئاوەڵناوەکان و ڕەچاو نەکردنی دەوری ڕێزمانیی پاشگر و پێشگرەکانی زمانی کوردی و هەروەهاش وەفادار نەبوون بە شکڵ و شێوەی دەقەکان لە وەرگێڕانەکاندا بووەتە هۆی سڕینەوەی متمانە لە ژمارەیەکی زۆر لە نووسەر و وەرگێڕی کورد.

**زۆرجار باسی زمانی زانستیی کوردی دەکرێت، بیر و رای ئێوە لەو بوارەدا چییە؟**

زمانی کوردی لەبەر چەندین هۆکاری ئاشکرا، کە هەندێکیانم بەکورتی لەسەرەوە باسکرد، لە شێوازە جیاجیاکانی رۆژنامەنووسی و بەتایبەت لە شێوازی فەلسەفی و زانستیدا گەشەی نەکردووە. چارەسەر چییە؟ وەڵامەکە زۆر ئاسانە، بەڵام بەکردەوە دەرهێنانی زۆر سەختە: (of language Development)، واتە دەبێت زمانی کوردی پەرە بسێنێت.

لە پەرەسەندنی زمانی کوردیدا، پاش قسەکردن لەسەر کۆسپەکانی بەردەم پەرسەندنی ئەم زمانە، پێویستە سەرەتا تیشك بخەینە سەر ئەو لایەن و تایبەتمەندییانەی زمانی کوردی وەکو خاڵی لاواز لەبەردەم پەرەسەندنیدا قوت دەبنەوە. کەواتە، کێشەکە هەر تەنیا بەوە چارەسەر ناکرێت کە، وەك چۆن زۆر کەس دەڵێن، دەست بکەینە وەرگێڕانی دەقە زانستییەکان. ئەو خاڵە لاوازانە بەشێکیان دەگەڕێنەوە بۆ ئاستی پەرەسەندنی زمانی کوردی کە زمانێکە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت لە هەندێ رووەوە بەشێوەیەکی پێشمۆدێرن ماوەتەوە و هێشتا گەشەی نەکردووە، بەشێکیان دەگەڕێنەوە بۆ سروشتیبوونی ئەم زمانە، بەشێکیان پەیوەستن بە زاڵێتیی ئەدەبی بەلاغەتخوازی کلاسیکی کە گرنگی ناداتە پێناسەی وردەکارانەی چەمکەکان و تەنیا بەکاریان دەهێنێتەوە، بەڵام ئەوەی بە لای منەوە گرنگە لە لایەکەوە سەرنج نەدانی نووسەرانی کوردە بە بابەتی پەرەسەندنی زمان و لەلایەکی تریشەوە هاتنە ئارای ئەو خاڵە لاوازانەیە کە بەم دواییانە لە زمانی کوردیدا هاتوونەتە بەرهەم، ئەو خاڵانەی وەك پێشتر باسم کرد رەهەندێکی ئایدۆلۆجیکیشیان گرتووەتە خۆ.

سەیر لەوەدایە کە کاتێ نووسینی زۆر کەس دەخوێنمەوە، ئەو نووسینانەی بانگەشەی زانستیبوون دەکەن، زۆر بە ئاسانی دەبینم کە ئەو تایبەتمەندییانەی لە مۆرکی زانستیبوون دوورن دیسانەوە سەر لەنوێ لە هەمان دەقدا دووبارە بوونەتەوە. ئەم تایبەتمەندییانە زۆرن و لێرەشدا ناچارم ناوی هەندێکیان بهێنم و لەبەرئەوەی هەڵەی کەسانی تر دووبارە نەکەمەوە لانیکەم یەکێکیان تۆزێك بە وردی شی بکەمەوە، واتە سەردێڕی بەشێکی تر لە هەواڵەکان دەڵێمەوە، بەڵام تەنیا ئەوەی یەکەم شی دەکەمەوە. هەندێ لە سەردێڕەکان ئەمانەن:

زمانی کوردی و سروشتیبوون.

زمانی کوردی و بابەتێتی.

زمانی کوردی و پاژنواڕین و خۆ دوورخستنەوە لە گشتی کردنەوە.

زمانی کوردی و ساکارسازی.

زمانی کوردی و پەراوێزسازی.

زمانی کوردی و نەزم.

زمانی کوردی و تاکایەتی.

زمانی کوردی و موجامەلە.

زانستی مۆدێرن لە ڕێنیسانس بەم لاوە (زیاتر بە بەیکن و دێکارت و پێش ئەوانیش بە گالیلە و کۆپەرنیك و پاش ئەوان بە نیوتۆن و پاسکاڵەوە) رووی لە گەشەکردن کرد و لە بنەڕەتدا هەوڵێك بوو بۆ دەسەڵات گرتن بەسەر سروشتدا، یان باشتر بڵێین هەوڵێك بوو بۆ دۆزینەوە و تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەی یاسا سروشتییەکان. پاش ئەم قۆناغانە و لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەم لاشەوە شێوازی نووسین لە زانستە مرۆییەکاندا بەهۆی گرێدانیان بە فەلسەفەی هاوسەردەمەوە، بوونە خاوەنی رەهەندێکی پاژنواڕانە، بە چەشنێك کە بەردەوام هەوڵیان داوە خۆیان لە گشتیکردنەوە و ساکارسازی دوورخەنەوە و لەجیاتی ئەمە، پێناسەی وردی ڕێکوپێك بۆ ئەو چەمکانە ئاراستە بکەن کە پێشتر بە ئاسانی لە دەقەکاندا دووبارە دەبوونەوە.

کەواتە، یەکەم هەنگاو لەم ڕەوتەدا، لە ڕەوتی پەرەسەندنی زمانی کوردیدا، بریتییە لە خۆ دوورخستنەوە لە بنەواشەی سروشتێتی لە زمانی کوردیدا. زمانی ئێمە بە نیسبەت ئیشارەت دان بە سروشت و دیاردە سروشتییەکانەوە و جۆرەکانی گوڵ و گیا و گیاندارەکانی تری نێو سروشت و ئامێرە کۆنەکانی جووتیاری و کشتوکاڵ کەم ناهێنێت. لە کوردستاندا و بەتایبەت لەم دوو سێ سەدەیەی رابردوودا و بەتایبەت لە سەدەگەلی هەژدە و نۆزدە چەندین میرنشین لەئارادا بوون. بە حوکمی نەبوونی شاری گەورە لەو میرنشینانەدا و کەواتە نەبوون یان کەمبوونی چینی مامناوەندیی و بە حوکمی ئەوەی زۆربەی خەڵکەکە لە گوندەکان یان شارۆچکەکاندا ژیاون، تا رادەیەکی

زۆر، ئاڵوگۆڕ و هاتوچۆ لەنێوان زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی ئەو کۆمەڵگایانەدا لەئارادا نەبووە. هەر لەبەر ئەم دوو هۆکارە، زمانی کوردی لەژێر دەسەڵاتی هەرکام لەو میرنشینانە یان ناوچە جوگرافیاییە جیاجیایانە بەشێوەیەکی جیا و بەدوور لە بەشەکانی تر زۆر بە هێمنی گەشەی کردووە. بەڕاستی دەوڵەمەندبوونی زمانی کوردی لەم رووە جێگەی سەرسووڕمانەوە. راستە هیچ کات دەسەڵاتێکی ناوەندی لە ئارادا نەبووە، ئەمانە بەیەکەوە ببەستێتەوە، بەڵام لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە ئەم زمانە لە هەندێ رووەوە وەك لە سەرەوە وتم پەرەی سەندووە و هەرکام لە دیالێکتیکەکان بۆ خۆیان قامووسێکی وشەیی جیاوازیان هەیە. تەنیا مەگەر شاعیرێکی کوردینووس بەهۆی خوێندنەوەی بەرهەمی شاعیرانی ناوچە کوردییەکانی تر یان بەتایبەتی بەهۆی سەفەر و گەڕانەوە توانیبێتی کەڵك لەو فەرهەنگە دەوڵەمەندە وەربگرێت و بازنەی وشەیی خۆی بەرفراوانتر بکاتەوە. دوو نموونەی هەڵکەوتوو لێرەدا کە توانیبێتیان لە قامووسی وشەیی ناوچەکانی تر سوود وەربگرن نالی و مەحوی-ن.

ئەم قامووسە زۆرتر بە وشە سروشتییەکانەوە خەملێنراوە یان ئەو وشانەی کاروباری رۆژانەی خەڵك بەڕێوە دەبەن. بەگشتی ئەم قامووسە جیاجیایانە زۆر بەدەگمەن هەڵگری وشە و دەستەواژەی زانستی یان هەڵگری بارێکی فەلسەفیی تایبەتن.

یەکێك لەو نموونانەی بە باشترین شێوە سروشتیبوونی زمان و زەینییەتی مە پیشان دەدا ناوی گۆڤارە کوردییەکانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەمە. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەملاوە تا ئەم دواییانە ناوی زۆربەی گۆڤارەکان و رۆژنامەکان لە دیاردە، یان بەشێکی سروشتەوە وەرگیرابوون وەك گەلاوێژ، شەفەق، گزنگ، ئاویەر، سیروان. ئەم دیاردەیە ئەمرۆکە لە کۆمپانییای فرۆکەوانیشدا رەنگی داوەتەوە وەك کۆمپانیای ئەزمەڕ، بەڵام لە قۆناغێکی تردا دەبینین ناوی گۆڤار و رۆژنامەکان دەگۆڕدرێت و ئەمجارەیان ناوەکان بەجۆرێك دەلالەت لە کردەوەی رامان و رەخنە دەکەن وەك رامان، هزر، رەهەند، پرسیار، دەق، راڤە، بەڵام دیسانەوە رەهەندی ئایدیالسیتی شوناسی ئێمە لە هەندێ ناوی تردا وەك ئایندە و سبەی رەنگ دەداتەوە. واتە، ئەم ناوە پڕ لە تێڕامانانە نەیانتوانیوە بەر بە ئایدیالیزمی ئامادە لە ناسنامەی ئێمەدا بگرن، یان لانیکەم لێی ورد ببنەوە.

بەڵگەیەکی ئاشکرا بۆ سروشتیبوونی زمانی کوردی ژمارەی یەکجار زۆری ناوە دەنگەکانە لە زمانی کوردیدا. وەك دەزانرێت ناوە دەنگ ئەو وشەیەیە کە دەنگی دیاردە یان رووداوێکی سروشتی دەنوێنێتەوە، وەك حیلاندان، بۆڵەبۆڵ، گیزەگیز و هتد. لێرەدا دەبێ تۆزێ زیاتر بابەتەکە شی بکەمەوە: ئەم تایبەتمەندییانەی زمانی کوردی بەپێچەوانەوە نەك هەر زمانی کوردییان دەوڵەمەند (!) نەکردووە، وەك چۆن بووەتە وێردی سەرزمانی هەژاریستەکانی لای ئێمە، بەڵکو بۆخۆشیان بوونەتە کۆسپ لەبەردەم گەشەکردنی زمانی کوردیدا، خودی ئەم بڕوایە کە زمانی کوردی زمانێکی دەوڵەمەندە، نەك هەر لە رووی زانستییەوە راست نییە، بەڵکو بووەتە بڕوایەکی ئایدیۆلۆجیك، زاڵێتیی ئەم گوتارە ئایدیۆلۆجیکەش وای کردووە زۆر بەدەگمەن کەس بوێرێت باس لە خاڵە لاوازەکانی زمانی کوردی بکات. دیسانەوە زاڵێتیی ئەم گوتارە ئایدیۆلۆجیکە جۆرێك لە پارادایمی رۆشنبیریی نەریتەوانی پێکهێناوە، ئەو پارادایمەی کە دەبێتە دژکاری هەر جۆرە هەوڵێك کە بیەوێت ئەنجامگیرییەکی فەلسەفی لە تایبەتمەندییەکانی ئەو پارادایمە بگرێ.

بە کورتی، چ لە زمانی خەڵکی ئاساییدا و چ لە بەرهەمی شاعیرانی کورددا و بەتایبەت لەو قوتابخانەیەی بە رۆمانتیسیزم یان ئەردەڵانی- گۆرانی و هەروەهاش لە رۆمانتیسیزمی نوێ یان بەرهەمی گۆراندا، سروشتیبوون بووەتە بەشێك لە ناسنامەی سووژەی کوردی. شیعری مەولەوی کورد و گۆران باشترین نموونەن بۆ دەستنیشانکردنی لایەنی سروشتیبوونی زمانی کوردی. ئەمە خاڵی لاواز نییە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە لایەنەکانی تری زمانی کوردی گەشەی نەسەندووە. هەر بۆیە چەندین جار وتوومە کە زمانی مەسعوود محەمەد بۆ ئێمە لە زمانی هاورێکانی وەك هەژار و هێمن و گۆران گەلەك سوودمەندترە. ئەگەر زمانی هەژار و هێمن و گۆران دەتوانن گەلەك سوودمەند بن بۆ رۆماننووس یان شاعیرێك، ئەوا زمانی مەسعود محەمەد دەتوانێت وەکو دەستپێك یان رێپیشاندەرێك بێ بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت پەخشانی زانستی بنووسن، هەرچەندە زۆر زاراوە و چەمك هەن کە مەسعوود محەمەد هەر ئاماژەی بۆ نەکردوون.

سروشتیبوون کە بووەتە لایەنێك لە ناسنامەی ئێمەی کورد (بەتایبەت بەهۆی تێپەڕ نەبوون بەناو هەردوو پرۆسەی مۆدێرنیتە و مۆدێرنیزاسیۆندا) لە زمانەکەشماندا رەنگیداوەتەوە، بەڵام خاڵی هەرە گرنگ ئەوەیە کە ئەم تایبەتمەندییە لە نووسینی

زانستیی کوردیشدا رەنگیداوەتەوە و نووسەران ئەو رەهەند و توخم و تایبەتمەندییە سروشتییانە دیسانەوە لە بەرهەمەکانیاندا، بەشێوەیەکی ناخودئاگا، واتە بەبێ ئەوەی بۆخۆیان ئاگایان لێ بێت، دووبارە دەکەنەوە. ئایا سروشتیبوون لە زماندا سەر لەنوێ رەهەندێکی سروشتی لە سابجێکتیڤیتیی ئێمەدا بەرهەم ناهێنێتەوە؟ کە زمانەکەت سروشتی و خۆماڵیانە بوو، واتە ئەوەی کە لە پارادایمی جیهانیی زمانی زانستی دوور دەکەوێتەوە. لێرەدا ئەم باسە، واتە، باسی سروشتیبوونی زمانی کوردی، درێژە پێنادەم و خوێنەر دەتوانێت لەم بارەیەوە ئەو وتارەی من بخوێنێتەوە کە لەسەر هۆکارەکان و تایبەتمەندییەکان و دەرئەنجامەکانی سروشتیبوونی زمانی کوردی لە سونەتی ئەدەبیی گۆرانی ئەدەبی کوردیدا نووسیومە و لەوێ کۆمەڵێ باسی ترم درکاندووە وەك پێناسە و دەوری سروشت لە سۆفیگەریدا و بیرۆکەی یەکێتیبوون لە سۆفیگەریدا و پێوەندی بە لایەنی سروشتیبوونی زمانی کوردییەوە بە سەرنجدان بەو خاڵەی زۆربەی شاعیرە کلاسیکە کوردەکان بەجۆرێك لە جۆرەکان پێوەندییان بە سۆفییەتەوە هەبووە.

بەڵام، ئەگەر بمەوێت چەند نموونەیەکی ئەمڕۆژی بهێنمەوە، دەبێت باس لەو نموونانە بکەم کە بە تەواوی دەرخەری شوناسی سروشتی و پێشمۆدێرن و سونەتیی سووژەی کوردین و هەر ئەمەش بووەتە هۆی بەرهەمهێنانەوەی لایەنی ناعەقڵانی و نابیرکارانە و ئاڵۆزیی زۆرێك لە سابجێکتیڤیتییەکانی ئامادە لە شوناسی سووژەی کوردیدا. لێرەدا هەوڵ دەدەم چەند نموونەیەك لە تایبەتمەندیی زمانی کوردی بهێنمەوە، یان راستتر وایە بڵێم چەند نموونەیەك لە بەکارهێنانی زمانی کوردی:

١- لە رووبەرگی زۆر کتێبدا رستەگەلێکی هاوشێوەی ئەمەی خوارەوە دەبینین:
(حەمەی مەلاکەریم) کۆی کردووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە و پەراوێزی بۆ داناوە.

٢- لە رێستورانتەکاندا و لە مانگی رەمەزاندا ئەم جۆرە رستانە دەخوێنینەوە:
لە مانگی موبارەکی رەمەزاندا ئاشی گەرم بۆ بەربانگی بەرۆژووە ئازیزەکان هەموو ئێوارەیەك ئامادەیە.

٣- ئەم جۆرە رستانە لەسەر کەناڵە ئاسمانییەکان دەبینین و دەبیستین:

ئەم بەرنامەیە لەسەر شاشە خنجیلانەکەی کوردسات هەموو شەوانی هەینی ببینە.

ئەو سێ نموونە جیاوازەی سەرەوە لە یەك زەینییەتەوە سەرچاوەیان گرتووە. گەر دیقەت بدەین تێدەگەین کە رستەکان لە هەرسێ نموونەکەدا زۆر درێژ و خۆماڵییانەن و بە تەواوەتی زاڵیّتی ئاخافتنیان بەسەرەوە دیارە. ئەم رستانە مۆرکێکی خۆماڵییانە و پێشمودێرن و سروشتییان پێوە دیارە و گەر بمانەوێت هاوشێوەکانیان لە زمانگەلی ئینگلیزی یان فەرەنسیدا و تەنانەت بەم دواییانەش لە زمانی فارسیدا بدۆزینەوە، ئەوا رووبەڕووی هەندێ رستە یان دەستەواژەی کورت و بابەتییانە و تەنانەت میکانیکیش دەبینەوە وەك ئەوەی لەجیاتی نموونەی دووەم تەنیا بنووسین 'ئاشی گەرم'. خاڵی سەیرتر ئەوەیە کە هەر ئەم جۆرە زمانە لە ریکلامە بازرگانییەکانی ئێستادا دووبارە دەبێتەوە، ئەمەش بە تەواوی دژ بە رێساکانی چۆنییەتیی بەکارهێنانی زمانە لە ریکلامدا، چونکە وەك دەزانرێت زمان لە ریکلامدا خاوەن شێوازێکی تایبەتە کە کورتی یەکەم مەرجیەتی.

گەر بمەوێت تیشکی زیاتر بخەمە سەر هەندێکی تر لەو تایبەتمەندییە دەستکرد و ئایدیۆلۆجیکانەی لە زمانی کوردیدا و لەبەر هۆکاری ئاشکرا بوونەتە خاوەنی قورساییەکی یەکجار زۆر و هەمووشیان بە تەواوەتی لەگەڵ رێساکانی زمانێکی زانستیدا ناتەبان، دەبێت کورتە ئاماژەیەك بۆ ئەم نموونانە بکەین:

١- بەکارهێنانی لە رادەبەدەری دەستەواژەی 'هەرە هەرە' لەجیاتی 'یەکێ لە هەرە'، وەك:

شاعیرێکی هەرە هەرە گەورەی کورد.

کارەساتێکی هەرە دڵتەزێن.

فیلمێکی هەرە هەرە خۆش.

گەر بە وردی سەیرکەین، تێدەگەین کە ئەو کوردانەی ئینگلیزییەکی کرچوکاڵ دەزانن، لە قسەکردن بە زمانی ئینگلیزی یەکجار زۆر کەڵك لەو جۆرە دەستەواژانە وەردەگرن و لایەنی بەرامبەریش، بەتایبەت گەر رۆژئاوایی بێت، خێرا لەو رەهاگەرییە

تێدەگات کە لە قسەکەی ئەم ئاخێوەرە کوردەدایە. ئەم جۆرە دەستەواژانە لەو کوردانەی ئینگلیزییەکی باش نازانن زۆر دەردەکەون:

The mos famoust...the most important...the most beautiful...the greatest..

لە زمانی زانستیی ئینگلیزیدا بەدەگمەن لەو دەستەواژانەی سەرەوە کەڵك وەردەگیردرێت، چونکە یەکەم ئەوەی کە ئەم جۆرە رستانە راست نین و لەوانەیە شاعیرێکی تر 'هەرە هەرە' گەورە بێت، نەك ئەوەي بەرباس، دووەم ئەوەی کە ئەم جۆرە نووسینە جۆرێك لە ئەبسولوتیزمي (absolutism) پێوە دیارە، واتە، کە تۆ ئەم دەستەواژەیەت بۆ کەس یان دیاردە یان شتێك بەکارهێنا، ئیدي بەو مانایەیە کە تۆ کەسەکاني تر یان دیاردەکاني تر یان شتەکاني تر بە هەرەهەرە گەورە و دڵتەزێن نازانیت. ئەمە یەکێکە لەو نموونانەي پیشاندەري ئەبسولوتیزمە لە زماندا، ئەو ئەبسولوتیزمەی لە سابجێکتیڤیتیي سووژەدا بووني هەیە. ئەمە زۆر گرنگە کە ئێمە دەبێت بەردەوام ئەوەمان لەیاد بێت کە نەزمي زمان لەڕاستیدا نەزمي کۆمەڵگا و نەزمي فەرهەنگ دیاري دەکات. واتە ئەم جۆرە ئەبسولوتیزمە لە زماندا هەم ئەبسولوتیزم لە فەرهەنگدا بەرهەم دەهێنێت و هەم دەربڕي ئەبسولتیزمي نێو ئەو فەرهەنگەیە:

order of language ► order of culture ► order of society

٢- نموونەیەکی تر، دووبارەکردنەوەی کردارەکانە لەیەك رستەدا، وەك:

"باسکردن لەم دیاردەیە باسکردنە لە..."

"ئاماژەکردن بەم بابەتە ئاماژەکردنە بە..."

"رۆچوونە نێو ئەم باسە رۆچوونە بە نێو..."

هەڵەیە گەر بڵێین ئەمە تەنیا دووبارەکردنەوەیەکي سیاکارە، بەڵکو ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەبووني وردبینی لە هەڵبژاردنی وشە و واتە وردبیني لە تێفکرین و نواڕیندا. ئەمەش واتە یەکەم رەنگدانەوەی زینییەتي گشتیکردنەوە لە زماندا. گەر

هەر یەك لەم رستانە بکەین بە ئینگلیزی، ئەوا لەو زمانەدا وەکو شتێکی نامۆ دێنە بەرچاو:

To discuss this point is to discuss...
To describe this is to describe...
To focus on this point is to focus on...

هەر ئەم دووبارە بوونەوەیە لە سینتاکسیشدا روو دەدات، لە سینتاکسی یەك پەرەگرافدا، وەك:
"ئایا ئەم باسکردن نییە لە...؟ ئایا ئەمە پیشاندەری ئەوە نییە کە...؟ ئایا ئەم ئەوەمان لا دروست ناکات کە...؟"
یان:
"ئێمە ئازادیمان دەوێ، ئێمە نانمان دەوێ. ئێمە ئاومان دەوێ. ئێمە ئیمکانیاتمان دەوێ".

ئەمە واتە دەقاودەق نواندنەوەی زمانی قسەکردن لە نووسیندا. ئەو جۆرە نووسەرانە، کە باشترە پێیان بڵێین نووسەری رۆژنامە، ئەم تەکنیکە بۆ کاریگەریی دانانی زیاتر لەسەر خوێنەر بەکاردەهێنن و ئەمە جۆرێکە لە هونەرەکانی زانستی رێتۆریکا، بەڵام دەبێت ئەوەمان بەردەوام لەیاد بێت کە کاریگەریی دەقێکی زانستی بە دەرئەنجامەکانییەتی، نەك بە بزواندنی هەستی خوێنەر. ئەم جۆرە زمانە ناچێتە خانەی نووسینی زانستییەوە، چونکە دیارە مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە رێتۆریکییە بزواندنی هەستە، نەك خستنەرووی دەرئەنجامگیرییەك بەشێوەیەکی زانستی. وەك دەزانن، ئەم جۆرە زمانە، ئەمڕۆکە بەداخەوە بووەتە زمانی زاڵی نووسینەکان.

٣- ئەو ئەبسولوتیزمەی سەرەوە (نموونەی ژمارە یەك) کاتێ کامڵ دەبێت کە رادیکالیزمیش دێتە یارمەتیی. لێرەدا وەك نموونە چەند وشەیەك دەهێنمەوە کە پیشاندەری رادیکالیزمن، وەك: کوشندە، ئیفلیجکەر، وێران، دارماو. دیسانەوە ئەم

رادیکالیزمە کاتێ کامڵتر دەبێت کە هەندێ دەستەواژەی گشتیشی دەخرێتە سەر، وەك وشە گشتییەکانی 'دەسەڵات' و 'حکومەت'. کەواتە، رستەکان بەم شێوەیەی خوارەوە دەنووسرێن:

"دەرئەنجامی هەرە هەرە کۆشندە و ئیفلیجکەری ئەم دەسەڵاتە ئەوەیە کە..."

ئەگەر ئێمە سەرجەم تینك تانکە ئانلاینەکان بگەڕێین، لەوانەی یەك رستەی بەم چەشنە نەدۆزینەوە و گەر نووسەرێکیش بەم شێوەیە بنووسێت، ئەوا خێرا داوەرەکانی ئەو ژورناڵە بابەتەکەی ڕەت دەکەنەوە، چونکە هەر ئەم رستە بە رواڵەت دروست و سادەیە سێ تایبەتمەندیی ئەبسولوتیزم و رادیکالیزم و گشتیکردنەوەی لەگەڵدایە کە لە زەینییەتێکەوە هەڵقوڵاوە کە خاوەنی هەرسێ جۆری نەخۆشییەکەیە. هەمووشمان دەزانین کورد تا ئێستاش خاوەنی ژورناڵێکی (peer reviewed) نییە و کەواتە بابەتی نووسەرەکانمان بەبێ پێداچوونەوەی داوەرەکان و تەنیا بە ویستی سەرنووسەر دادەبەزێنرێن. نەبوونی ئەو جۆرە ژورناڵانە لە کوردیدا بووەتە هۆی هاتنەئارای ئەو ئاڵۆزییەی لە مێتۆدۆلۆژیی نووسینە کوردییەکاندا، کەواتە لە ڕەوتی بەرهەمهێنانی ئەندێشە لەناو کورددا بەدیدکرێت.

٤- دیسانەوە ئەم ئەبسولوتیزم و دووبارەکاری و رادیکالیزمە (واتە، نموونەکانی ژمارە یەك، دوو و سێ لە سەرەوە) کاتێ دەبێتە نووسینێکی کۆمیك کە نووسەر تێیدا لە 'هتد' و 'تاد' و 'هەتا دوایی' و سێ خاڵ (...) کەڵك وەردەگرێت. وەك دەزانین زۆر بەدەگمەن لە نووسینێکی زانستیدا لەمانە کەڵك وەردەگرین، کەچی لە نووسینی برایان و خوشکانی ئازیزی رۆشنبیرماندا ئەم جۆرە تەکنیکانە زۆر بەکاردەهێنرێن. رۆژانە و لە چاپەمەنییەکاندا بەردەوام چاومان بەم جۆرە رستانە دەکەوێت کە هاوشێوازی ئەم نموونەیەی خوارەوەن:

"دەرئەنجامی هەرە هەرە کوشندە و ئیفلیجکەری ئەم دەسەڵاتە ئەوەیە کە بوارەکانی ئابووریی و فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەلایەتی و... هتدی خستووەتە بەر

مەترسییەکی تا سەرئێسقان کوشندەوە و باسکردن لەم مەسەلەیە باسکردنە لە یەك دنیا...".

لێرەدا با ئەو رستە نامۆ و کۆمیکەی سەرەوە تۆزێ شیبکەمەوە:

'هەرە هەرە': پیشاندەری ئەبسولوتیزمە.

'کوشندە و ئیفلیجکەر': دەربڕی رادیکالیزمە.

'دەسەڵات': وشەیەکی تەواو گشتییە.

'بوارەکانی ئابووریی، فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتی': دیسانەوە گشتی بێژی و نەبوونی وردبینی

..'هتد': گشتیبێژیێ

'تا سەر ئێسقان کوشندە': رادیکالیزم و ئەبسولوتیزم.

'باسکردن لەم مەسەلەیە باسکردنە لە': دووبارەکردنەوە و نەبوونی تایبەتمەندی و وردبینی.

'یەك دنیا': گشتیبینی و ساکارسازی.

٥- تێکەڵکردنی سنوورەکانی زمانی قسەکردن و زمانی زانستی.

زمانی قسەکردن خاوەنی کۆمەڵێ وشە و زاراوە و شێوازە کە نابێت لە زمانی زانستیدا بەکاربرێن. واتە، نابێت سەرجەم وشە زارەکییەکان لە نووسیندا بەکار بهێنرێن. من کە لە بەریتانیا خوێندکار بووم سەرەتا لیستێکیان دامێ کە پێکهاتبوو لە زۆر وشەی ئینگلیزی، ئەو وشانە بە زۆری لە ئاخافتندا بەکاردەبرێن، بەڵام ئێمە بۆمان نەبوو لە نووسیندا بەکاریان بەرین.

٦- ئەو حاڵەتانەی سەرەوە کاتێ بە تەواوی بێ ئاگابوونی نووسەر لە میتۆدۆلۆژیی نووسینی زانستیمان بۆ دەردەخەن، کە دەڵێن:

گەلێك وتار لە سەر ئەم بابەتە نووسراوە.

گەلێك نووسەر ئەم بابەتەیان درکاندووە.

لای سارتەر

لای نیتشە

سەرەتا ئەوە بڵێین مەبەستی نووسەر کام وتارە یان کام کتێبە. کام ئارگیومێنتی کام کتێب؟ پاشان، کامەیە ئەو رستەیەی سارتەر یان نیچە یان کانت و لە کام سەرچاوەوە دەرمان هێناوە و تۆ چیت خستووەتە سەر ئەو رستەیە و یان رووبەڕووی چ رەخنەیەکی دەکەیتەوە و ئەم کارە بەپێی کام مێتۆدۆلۆژی ئەنجام دەدەیت و ئارگیومێنتەکەت کامەیە و ئەو تیۆرییەی پشتی پێ دەبەستی کامەیە و کوانێ پێناسەی زاراوەکانت؟

زمانی زانستیی کوردی گەشە ناکات مەگەر ئەوەی نووسەرەکان ئەم خاڵانە رەچاو بکەن، من دڵنیاشم لەوەی کە زۆربەیان ناتوانن، چونکە ئەم کێشانە لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ جیاوازیی نێوان دوو گوتاری رۆشنبیری و گوتاری ئاکادیمیك و زاڵتربووبی گوتاری رۆشنبیری لەناو کورددا لەچاو گوتاری ئاکادیمیك، ئەم قسەیەی من داکۆکیکردن نییە لە گوتاری ئاکادیمیك لەناو کورددا، چونکە وەك دەزانین ئەم گوتارەش بۆخۆی چەندین رەخنەی لەسەرە، بەڵکو خستنەڕووی خاڵە لاوازەکانی ئەو گوتارەیە بە گوتاری رۆشنبیریی کوردی ناوی دەرکردووە، ئەم خاڵە لاوازانەش بەهەشتی خۆیان لە خانەی مێتۆدۆلۆژیدا دەبیننەوە. من لێرەدا چیدی لەسەر ئەم باسە ناڕۆم و باسکردن لە جیاوازییەکانی ئەم دوو گوتارە دادەنێم بۆ دەرفەتێکی تر. ئەو خاڵانەی سەرەوە تەنیا چەند نموونەیەکی کەمن لەو تایبەتمەندییانەی مۆرکی زانستیبوون لە دەقێك دەستێننەوە. لەڕاستیدا گرنترین کێشەی نووسینە زانستییەکان لە زمانی کوردیدا کێشەی مێتۆدۆلۆژییە.

لە پاڵ ئەمەشدا، لە گەشەکردنی زمانی کوردیدا و پاراوبوونی شێوازی زانستی لە زمانی کوردیدا دەبێت سەرەتا رووبەڕووی جۆرێك لە دابڕانی مەعریفەناسانە ببینەوە، واتە وازهێنان لە زۆربەی ئەو شێوە باوانەی تا ئێستا لە نووسینی بەناو زانستیدا بەکارمان هێناون و ئێستاکانەش بە جۆرێك بوونەتە ئایدیۆلۆجی. لەم رۆژانەدا وێبلاگی نووسەرێکی خەڵکی باشوورم دیت کە وەك لاساییکردنەوەیەك لە رۆشنبیرە دیارەکان نووسیبووی:

"چوونە ناو ئەم باسە کوشندەیە چوونە ناو دنیایەکی هەرە ئیفلیجکەرە و گەلێك کتێب و وتار و هتد لەسەر ئەم پرسە نووسراوە و دەشێت مرۆڤ ئاوڕێکی هەرە هەرە جیدییان لێ بداتەوە".

وەك وتم، لەوانەیە تۆ لە نووسینە رۆشنبیرییە و زانستییەکانی زمانەکانی تردا هەر رستەیەکی ئاوەهات وەبەرچاو نەکەوێت. خاڵی سەیر ئەوەیە کە لە کۆتاییشدا فەرمانمان دەداتێ کە ئاورێکی جیدی لەو مەسەلەیە بدەینەوە! گەر تۆ ئەم رستەیە بکەیتە ئینگلیزی، بیسەر بە سەرسوورمانەوە تەماشات دەکات بەتایبەت ئەوەی کە ئەم رستەیە بە تووڕەییەوە بدرکێنێت. ئەمەش دیسانەوە کێشەیەکەی تری زمانی زانستیی کوردیم بیر دەخاتەوە، واتە کێشەی لەحن. من پێشتر باسی ئەم کێشەیەم لە چیرۆك و رۆماندا کردووە. بە نیسبەت نووسینی زانستیشەوە، دەبێ بڵێم کە بابەتیبوون کە یەکەم خەسڵەتی زانستە، بەڵام ئێمە ئەم خەسڵەتە لە زمانی کوردیدا بەدەگمەن دەبینین. بۆ نموونە، ماڵپەڕێك لەسەر لاپەڕەی سەرەکیی خۆی دەنووسێت 'رەخنە بە چەکوش'، ماڵپەڕێکی تر کە گوایە دەیەوێت بڵێت من لەوان نیم لە لاپەڕەی یەکەمی نووسیویەتی 'رەخنە بە زمانی گوڵ'. لەوانەیە ئەمەی دووەممان بە لاوە پەسند بێت، بەڵام لەڕاستیدا هەردووکیان یەکێکن، واتە رەخنە چ بە زمانی چەکوش بێت و چ بە زمانی گوڵ لە هەردوو حاڵەتەکەدا زەینییە، کەچی راست بە پێچەوانەوە، یەکەم مەرجی نووسینی رەخنە وەك نووسینێکی زانستی ئەوەیە کە دەبێت زەینی نەبێت، بەڵکو بابەتییانە بێت، واتە نە بە چەکوش و نە بە گوڵ.

بۆ من کارەساتەکە لەوەدایە کە هیچکام لەو هەموو رستەیەی لە سەرەوە وەك نموونە هێنامەوە هیچ کێشەیەك بۆ خوێنەری کورد ساز ناکەن، واتە، ئێمە زۆر بە ئاسانی و بێ گرفت ئەو رستانە وەردەگرین، لێیان تێدەگەین، بە دروستیشیان دەزانین و لاساییشیان دەکەینەوە. واتە سووڕخواردنەوە بە دەوری بازنەیەکی ئایدیۆلۆجیکدا کە ناوی خۆی ناوەتە گوتاری رۆشنبیریی کوردی. چ لە جۆرە تەقلیدییەکەی و چ لە جۆرە تازەکەی ئەم دە پازدە ساڵەی دوایی.

گەر بمەوێت تۆزێك زیاتر باسی شێواز و ئوسلووبەکانی تری زمان بکەم و قامك بخەمە سەر پەرە نەسەندنیان لە زمانی کوردیدا، ئەوا دەبێت باسی زمانی رۆژنامەنووسیمان بکەین. زۆربەی خەسڵەتەکانی زمانی رۆژنامەنووسانە لەناو ئێمەدا نین، وەك:

١- بەکارنەهێنانی وشە کورتکراوەکان.

٢- بەکارنەهێنانی وشە تازە دروستبووەکان کە هەر پیتەو سەرەتای وشەیەکە.

درکاندووە- کە بەشێك لە تێزەکانی لاکلائۆ بە جۆرێ درێژەپێدەر و کاملکەری روانگەکانی ئالتووسێرن بۆ شیکاریی سۆوژە، بەتایبەت ئەو بەشەی باسی دالی بۆش(empty signifier) دەکات و باسی کاریگەرییەکانی ئەم دالە دەکات لە میکانیزمی بەرەوپێشچوونی کاری ئایدیۆلۆجی و بەتایبەت لە مانەوەی گوتاری سیاسیدا. من ئەم بابەتانەم بە وردی لە تێزی دکتۆراکەمدا لە بەریتانیا باسکردووە کە بەشێوەی ئۆنلاین هەیە و هەمووان دەتوانن ببیینن و چیدی لێرەدا دووبارەی ناکەمەوە، کەواتە با بێینەوە سەر باسکردن لەسەر زمانی کوردی و پێوەندیی بە ئایدیۆلۆجییەوە و دەرئەنجامی ئەم پێوەندییەش لەسەر ناسنامەی سووژەی کوردی.

راستە هەموو زمانەکان رەهەند و لایەن و مۆرکی ئایدیۆلۆجیکیان تێدایە، بەلام لەوانەیە زمانی کوردی یەکێك بێت لەو زمانانەی کە زیاتر لە هەر زمانێکی تر رەهەندی ئایدیۆلۆجیکی تێدا بەرجەستە بووبێتەوە. کورد بە حوکمی ئەوەی لە رابردوودا و بەتایبەت لە سەد سالی رابردوودا بەسەر چەندین دەولەت نەتەوەی جیاجیادا دابەش بووە و بە حوکمی ئەوەی خاوەنی چەندین حیزب و جەریان و رێکخراوی سیاسیی جیاجیا و تەنانەت هەندێ رێبازی ئایینی جیاوازیش بووە، کەواتە ئاساییە زمانی کوردی نەك هەر لایەنی ئایدیۆلۆجیك بوونی زەق بێتەوە، بەلکو لە رووبەرووبوونەوەی بەردەوامیشدا بێت لەگەل چەندین گوتاری ئایدیۆلۆجیکی جیاجیادا، ئەو گوتارانەی تەنانەت ئەمرۆکەش هەست پێدەکرێن. زمانی کوردی بەم چەشنە بووەتە مەیدانی رووبەرووبوونەی ئایدیۆلۆجییەکان. هەرچەند ئەم دیاردەیە لە زمانەکانی تریشدا دەبینرێت، بەلام کوردی بەهۆی گەشەنەکردنی لە دەولەت - نەتەوەدا و بەتایبەت بەهۆی لەئارادا نەبوونی زمانێکی رەسمی یان ئەو ناوەندە پەروەردەیی و زانستییانەی کە پەیرەوی لە زمانێکی زانستیی یەکدەست بکەن لایەن و تایبەتمەندیی ئایدیۆلۆجیکی بە تەواوی تێدا بەرجەستە بووەتەوە. سەرنج دان بە روانگە تیۆریکەکان دەربارەی دژبەربوونی زانست و ئایدیۆلۆجی لەم باسەدا دەتوانێت گەلێك سوودبەخش بێت. واتە، شیکردنەوەی تیۆریکی هاوکێشەی نێوان زانست و ئایدیۆلۆجی لە لایەکەوە و دەقی ئەدەبی و گوتاری ئایدیۆلۆجیك لەلایەکی ترەوە دەتوانێت یارمەتیدەرمان بێت لە تێگەیشتن لە چەمکی ئایدیۆلۆجی.

سووژەی کوردی لەبەر ئەو هۆکارەی سەرەوە خاوەن ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆجیکە.
لە سیمینارێکدا لە زانکۆی لەندەن ئەوەم خستە بەرباس کە ئایدیۆلۆجی هێندە سەراپای شوناسی کوردیی گرتووەتەوە کە تەنانەت ئەو خود یان ئیگۆوە عەقلانییەش کە بانگەشەی رزگاری لە ئایدیۆلۆجی و یان بانگەشەی ئازادی دەکات بۆ خۆشی بووەتە خاوەن مۆرکێکی ئایدیۆلۆجیك. ئەمەش دەسەڵاتی زۆر و لە رادەبەدەری ناسنامەی ئایدیۆلۆجیکی سووژەی کوردی دەردەخات کە لە پێوەندیی راستەوخۆدایە لەگەڵ ئەو شتەی کە دەکرێت بە ناخودئاگای کوردی ناودێری بکەین. ناسنامە کوردی بووەتە شوێنگەی ململانێی سابجێکتیڤیتییە ئایدیۆلۆجیکەکان و لێکۆڵینەوە لە گوتارە ئایدیۆلۆجیکەکانی دەرەوەی سووژە و رەنگدانەوەیان بەشێوەی سابجێکتیڤیتی لە ناسنامەی سووژەدا لەوانەیە یەکێك بێت لە گرنگترین بابەتەکانی هەرجۆرە پرۆژەیەکی رۆشنبیریی بەرفراوان.
با ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە سابجێکتیڤیتیی ئایدیۆلۆجیك لە هەردوو قۆناغی منداڵی و فێربوونی زمان و قۆناغی گەورەساڵیدا لە رێگەی زمانەوە بۆ سووژە سازدەکرێت. ئەم پرۆسەیە بە لێپێچینەوەی ئایدیۆلۆجیك (ideological interpellation) ناسراوە. هەموو شێوە زمانییەکان و شێوازەکان هەڵگری کۆمەڵە دالێکن کە من ناوم ناونەتە 'دالی ئایدیۆلۆجیك '(ideological signifier) 'ئەم دالە ئایدیۆلۆجیکانە لە رێگەی پرۆسەیەکەوە کە بە 'نامۆیی زمانناسانە ' (linguistic alienaton) ناودەبرێن تاکەکەس دەکەن بە سووژەی ئایدیۆلۆجی، ئەو ئایدیۆلۆجییەی دالەکە سەر بە وییە. واتە سووژە لە رێگەی دالی ئایدیۆلۆجیکەوە رووبەڕووی لێپێچینەوەی ئایدیۆلۆجیك دەبێتەوە و هەموو سووژەیەکیش سەر بۆ ئەم لێپێچینەوەیە دادەنەوێنێت مەگەر ئەوەی کە سەر بە گوتارێکی تری ئایدیۆلۆجیك بێت، واتە سووژە لەڕاستیدا سووژەی ئایدیۆلۆجییە، گەر زمانەکەش ئایدیۆلۆجیك بێت، سووژە دەبێتە سووژەی زمانی ئایدیۆلۆجیك و کەواتە خاوەنی سابجێکتیڤیتیی ئایدیۆلۆجیك.
ئەو مۆدێلە تیۆریکەی کە لە تێزەکەمدا پێشکەشم کردووە بە کورتی ئاوڕ لەم سێ خاڵە دەداتەوە: یەکەم، سووژە بەهۆی دیالێکتیکی نێوان- سابجێکتیڤیتی (inter-subjectivity dialectic)و هەروەهاش بەهۆی بۆشایی ناو -

سابجێکتیڤیتییەوە (intra-subjectivity lack) و لە ڕێگەی ئەم دیالێکتیکەوە دەبێتە خاوەنی کارکرد. ناسنامەی سووژە بەهۆی ململانێی بەردەوامی نێوان سابجێکتیڤیتییەکانەوە هەرگیز بەتەواوی کامڵ نییە و هەر بۆیەش بەردەوام ناتەواو دەمێنێتەوە. ئەم ململانێیانەش زۆربەی کات ناخودئاگان. دووەم ئەوەی کە سووژە بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆجیک لە ڕێگەی زمانەوە سازدەکرێت. ئەو میکانیزمەی کە لەم سۆنگەیەوە زمان و ئایدیۆلۆجی، سووژە ساز دەکەن هەرگیز ڕێگە بەوە نادەن کە سووژە بگاتە قۆناغی ئەمنەوێتی تەواو لەگەڵ دالگەلی ئایدۆلۆجیکدا. سێیەم خاڵێش ئەوەیە کە ناسنامەی سووژە لە زماندا دەنوێندرێتەوە و دواتر بەهۆی خودی سووژەوە بەرهەم دێتەوە.

**تکایە لەم پێوەندیەدا ئاماژە بە نموونەی پراکتیکی بکەن؟**

سادەترین ڕێگە بۆ نیشاندانی پێوەندیی نێوان ئایدیۆلۆجی و زمانی کوردی ئاوڕدانەوەیە لە دالە ئایدیۆلۆجیکەکانی زمانی کوردی و پاشان لێکۆڵینەوە لە لایەنی نیشانەناسانەی ئەو دالانە. بۆ نموونە، گەرچی لە زمانی کوردیدا هەر دوو دەستەواژەی 'پێشمەرگەی سەر شاخ' و 'گەریلای سەری چیا' خاوەنی یەك مانان، بەڵام وەك دەزانرێت ئەم دوو دەستەواژەیە وەك دوو دالی ئایدیۆلۆجیك سەر بە دوو ئەنستیتۆتی ئایدیۆلجیکن کە لێرەدا دوو حیزبی جیاوازن. وەك دەزانرێت دەستەواژەی 'گەریلای سەری چیا' لە دامودەزگا ڕاگەیەنەرە ڕەسمییەکانی باشووردا بەکار نابرێت بەهۆی ناکۆکیی سیاسی، یان ناهاوچەشنیی گوتاری سیاسی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی باشور لەگەڵ ئەو حیزبەی کە ئەم دەستەواژەیە بەکار دەبات. هەر بەهەمان شێوە، هەر ئەم وشەیە، واتە وشەی پێشمەرگە، کە خاوەنی دەلالەتێکی تەواو لێوانلێوە لە کوردایەتی لە ساڵەکانی ٧٨ و ٧٩ دا لە کوردستانی ئێران و لەلایەن حکومەتەوە ئاوەڵناوێکی خرایە سەر و تاقێمکی تازە دروست بوون ئەمجارەیان بە ناوی 'پێشمەرگەی موسڵمان'، دیارە زیادکردنی ئاوەڵناوێکی ئایینی لێرەدا باری ئایدیۆلۆجیکی ئەم زاراوەیە دووچەندان دەکاتەوە واتە، گرنگیدان بە کوردایەتی ئۆرتۆدۆکس، بەڵام بەو مەرجەی کە کەسەکان موسڵمان بن و بڕوای تەواویان بە ئیسلام بێت. ئەوەیە کە زۆرجار وتوومە زمانی

کوردی شوێنگەی ململانێی گوتارە ئایدیۆلۆجیکەکانە، ئەو گوتارانەی ئەنستیتۆتەکان دەیخەملێنن و ئاراستەی دەکەن.

یان نموونەیەکی تر ئەمجارەیان لەناو خۆی هەرێمی کوردستان بهێنمەوە. پێش ئیمزاکردنی رێککەوتنی ستراتیژیك (کە بە هەڵە و بەهۆی زاڵیی بنەمای وشەسازیی زمانی عەرەبییەوە لە باشوور بەشێوەی 'رێککەوتنی ستراتیژی' بەکار دەبرێت) دالی ئایدیۆلۆجیکی "کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان" زیاتر موڵکی یەکێتی بوو و یەکێك بوو لە قسە سەر زارەکانی بەڕێز مام جەلال و تا پێش سێ چوار ساڵ پارتی کەمتر ئەم دەستەواژەیەی بەکاردەهێنا، کەچی ئێستا وەك دەبینین ئەم دەستەواژەیە لە دەزگا راگەیەنەرە رەسمییەکانی پارتی و لایەنەکانی تریشدا دێتە بەکارهێنان و هەر بۆیەش چیدی موڵکی یەك حیزب نییە و ئیدی ئەو بارە ئایدیۆلۆجیکەی جارانی لەدەست داوە. ئەمە هەر کاریگەری رێککەوتنی ستراتیژیکی سیاسیی دوو حیزب لەسەر زمانی کوردی پیشان نادات، بەڵکو ئەوەش دەردەخات کە وەك چۆن دەستەواژەکان دەتوانن ببنە دالی ئایدیۆلۆجیك، هەرواش دەتوانن لە ئایدیۆلۆجی داماڵدرێن. من لە سیمینارێکدا لە بنکەی رۆشنبیریی کاوە لە سێپتامبەری ٢٠٠٣ هەمان ئەم مەسەلەیەم وت کە دوایی یەکێك لە رۆژنامەکان لە زاری منەوە کردبووی بە سەردێڕ. لەبەر گرنگیی باسەکە و لەبەرئەوەی کە پێوەندی بەم بابەتەوە هەیە ئەو سەردێڕە لێرەدا دووبارە دەکەمەوە: "بۆ سڕینەوەی کاریگەریتیی سەلبیی ئایدیۆلۆژیا لەسەر جەستەی شوناسی کوردی، ئەم جەستەیە پێویستی بە داتەکاندن و چاکسازی هەیە".

با نموونەیەکی تری سەرنجڕاکێش لەم دالە ئایدیۆلۆجیکانە بهێنینەوە: گەر سەرنجی ورد بدەین، تێدەگەین کە ئەو کوردانەی ئێران و بەتایبەت خەڵکی سەقز و زیاتر دیواندەرە و سنە و کامیاران کە کەمتر کوردییەکی پاراوی یەکگرتوو دەزانن لە کاتی قسەکردنیاندا و ئەوکاتەی دەیانەوێت یەکگرتوو قسە بکەن، کەڵك لە هەندێ وشە و دەستەواژە وەردەگرن کە بە تەواوەتی رەسەن و کوردین، بەڵام ئەمڕۆکە هێندە لەلایەن ئەم جۆرە کەسانەوە دووبارە دەبنەوە و هێندەش بە ئاسانی دیارە کە ئاخێوەرەکە ئاگاداری زمانی یەکگرتووی کوردی نییە، بوونەتە دالی ئایدیۆلۆجیك بۆ ئەو کەسەی بەکاریان دەهێنێت. ئەم دالە ئایدیۆلۆجیکانە ئەوە دەردەخەن کە کەسەکە کوردییەکی رەوان و پاراو نازانێت و خاوەنی پێشینەیەکی پتەوی خوێندنەوە نییە بە کوردی، هەر

بۆیە ئاگاداری زۆر باس نییە دەربارەی سووژە و مێژوو و فەرهەنگی کوردی، بەڵکو بە تەمبەڵییەکی سەیرەوە هەوڵ دەدا کوردیی ڕەسەن قسە بکات. هەندێ لەم وشانە بریتین لە بوار، هەوار و هەوارگە، تێکۆشان، مەیدانی ئەدەب، باس و لێکۆڵینەوە، کۆبوونەوە، سوپاس، زۆر، مامۆستا نالی، وێژە، کۆڕ.

نموونەیەکی تری داڵە ئایدیۆلۆجیکەکانی زمانی کوردی ئەو وشە سنەییانەن کە ڕاستە کوردین و ڕەسەنن، بەڵام چەند نووسەر و شاعیرێکی سنەیی تەنیا و تەنیا لەبەر پێداگرییان لەسەر بە ئەردەڵانی نووسین بە کاریان دەبەن (چونکە پێش چەند ساڵ بزاڤێکی لەم جۆرە لە سنە هەبوو و ئێستاش کەم تا کورت هەر ماوەتەوە)، وەك 'منیچ' لە جیاتی 'منیش' یان 'پیاگگەر' کە هەمان 'پیاوگەل'-ە. ئەمانە هەموویان دەچنە خانەی داڵی ئایدیۆلۆجیکەوە بەتایبەت ئەگەر کەسی نووسەر سەر بە گوتاری ئایدیۆلۆجیکی سنەییچێتی بێت.

نموونەیەکی تری زەقی داڵی ئایدیۆلۆجیك، بۆ وێنە، چۆنییەتی نووسینی ناوی 'محمد' ە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندندا. کوردستان تیڤی و زاگرۆس و کوردسات و گەلی کوردستان دەنووسن 'محەمەد'، کەچی دوو کەناڵی سپێدە و پەیام دەنووسن 'موحەممەد'. شێوە نووسینی 'موحەممەد' داڵێکی ئایدیۆلۆجیکە، ئەو کاناڵانە خاوەنی پەیڕەو و پرۆگرامێکی ئیسلامین و هەربۆیەش هەوڵ دەدەن ڕێنووسە کوردییەکە بە تەواوەتی و دەقاودەق وەك دەربڕینی عەرەبیی ئەو ناوە وابێت. هەر بەهەمان شێوەش، هەر دوو کەناڵی سپێدە و پەیام زۆر بە پێداگرییەوە وشە عەرەبییەکانی نێو شیعری کلاسیکی کوردی بە هەمان شێوە عەرەبییەکەیان دەنووسنەوە، کەچی لەو کەناڵانەی تردا ئەو وشە عەرەبییانە بە ڕێنووسی کوردی دەنووسرێنەوە.

نموونەیەکی تری ئەم داڵە ئایدیۆلۆجیکانە ئەمەیە: دوو وشەی 'ئێستا' و 'نها' هیچ جیاوازییەکی مانایی و ڕێزمانییان پێکەوە نییە، کەچی دوو کەناڵی کوردسات و گەلی کوردستان بە پێداگرییەوە هەریەکەو یەکێکیان بەکار دەهێنن. ئەم گۆمە کاتێ قووڵتر دەبێتەوە کە سەرنج بدەینە ئەو واقیعەی کە کەناڵی کەی ئێن ئێن لە دەستەواژەی 'بەپەلە' بۆ هەمان مەبەست سوود وەردەگرێت. واتە لە شارێکدا، واتە سلێمانی، سێ کەناڵی ئاسمانیت هەیە و هەر کامەیان لە یەك وشەی جیاواز بۆ یەك مەبەست کەڵك وەردەگرێت، کەچی هەر بیستودوو دەوڵەتی عەرەبی لە هەموو

راگەیاندنەکانیاندا بۆ ئەو مەبەستە تەنیا لە یەك وشە، واتە 'عاجل' کەڵك وەردەگرن.
لە زمانی ئینگلیزیدا هەر بە هەمان شێوەیە، واتە سەرجەم کەناڵە ئینگلیزییەکانی سەرجەم وڵاتانی دنیا لە دەستەی واژەیBreaking News بۆ نیشاندانی هەواڵێکی بەپەلە سوود وەردەگرن، کەچی لە کوردستاندا و لە یەك شاردا سێ کەناڵ لە سێ وشەی جیاواز بۆ یەك مەبەست ئەویش لە راگەیەنەرێکی گشتیدا کەڵك وەردەگرن. ئەم گەمەیە کاتێ سەرنجراکێشتر دەنوێنێت کە بزانین کوردستان تیڤی هەر بۆ هەمان مەبەست لە 'نوێ' سوود وەردەگرێت. بە واتایەکی تر، سەرجەم ئەم کەناڵانە پشتیان بەستووە بە کۆمەڵێ دالی ئایدیۆلۆجیکەوە. ئەم دالانە، سابجێکتیڤیتیی جیاواز لە شوناسی کوردیدا بەرهەم دەهێننەوە، واتە، ئەم کەناڵانە کە بانگەوازی یەکگرتوویی و خەباتی نیشتمانی دەکەن بۆ خۆیان گرنگترین دەوریان هەیە لە شپرزەیی و ئاڵۆزی و دابەشکاریی و ئایدیۆلۆجیکبوونی ناسنامەی کوردیدا.
لێرەدا گەر بمەوێت نموونەیەکی جیاواز لە زمانی ئایدیۆلۆجیك بهێنمەوە، دەبێت ئاماژە بۆ ئەو نموونانە بکەم کە تێیاندا دوو وشەی هاومانا، بەڵام یەکێکیان خاوەنی بارێکی زانستی، لە تەنیشت یەك ریز دەکرێن. ماوەیەك پێش ئێستا لە یەك رۆژدا سێ دیاردەی هاوشێوەم لەم جۆرە زمانە لە سێ کەناڵی تەلەفزیۆنی جیاوازدا بینی: سەرۆکی پەرلەمانی ئێران لە قسەکانی پێش دەستپێکی دانیشتنەکەی پەرلەماندا لە دەستەواژەی "روش و متد" کەڵکی وەرگرت. هەر هەمان رۆژ، د. بەرهەم ساڵح لە لێدوانێکیدا دەستەواژەی "مێتۆد و رێباز"ی بەکارهێنا. هەر هەمان رۆژ لە بەرنامەیەکی سیاسیی کەناڵێکی تردا دەستەواژەی "مێتۆد و رەوش"م بیست. گەر بمانەوێت لەم دیاردەیە بکۆڵینەوە (مەبەستم لە دیاردە لێرەدا بەکارهێنانی هاوشێوەی زمانە لەلایەن سێ لایەنی سیاسیی جیاوازەوە)، ئەوا بەم دەرئەنجامانەی خوارەوە دەگەین:

١- هەرسێ کەسەکە دەزانن کە مێتۆد و روش یان رێباز تا رادەیەك هەر یەك مانایان هەیە، کەچی بەئەنقەست و بە وریایی تەواوەوە هەردوو وشەکە کە خاوەنی یەك مانان لە تەنیشت یەك بەکار دەهێنن.

٢- هەرسێ لایەنەکە دەیانەوێت لەم ڕێگەیەوە مۆرک یان لایەن یان خەسڵەتێکی زانستییانە ببەخشنە قسەکانیان بەتایبەت لە ڕێگەی کەڵکوەرگرتن لە زاراوەی میێتۆدەوە.

٣- لەنێوان هەرسێ لایەنەکە لە لایەکەوە و زۆربەری هەرە زۆری بەردەنگەکانیان لە لایەکی ترەوە جۆرێك لە مەودا یان بۆشایی دروست دەبێت، بەهۆی ئەم جۆرە بەکارهێنانەی زمانەوە، یان وردتر بڵێم بەهۆی بەکارهێنانی وشەی میێتۆدەوە لەپاڵ وشەی ڕوش یان ڕێبازدا بەردەنگ لەوە ئاگادار دەکرێتەوە کە هەم باسەکە ڕەنگ و بۆنێکی زانستی هەیە و هەم کەسی ئاخێوەریش ئاگاداری ئەو زانستەیە. وشەی میێتۆد، جگە لەوەی کە وشەیەکی لاتینییە، لە باسە زانستییەکاندا دێتە بەکارهێنان و ڕێك دەمانخاتەوە بیری زاراوەی میێتۆدۆلۆژی کە زاراوەیەکی تەواو زانستییە.

٤- بۆشایی نێوان ئەو کەسانە و زۆربەی بەردەنگەکانیان بەو هۆیەوەیە کە زۆربەی بەردەنگەکانیان خێرا هەست دەکەن کە ئاخێوەران وشەیەکی گران و زانستییانە و گرنگیان بەکارهێناوە، ئەو وشەیەی ئەمان قەت بەکاری ناهێنن و مستەوای خوێنەواریشیان ئەو مۆڵەتەیان ناداتێ ئەو جۆرە وشانە بەکاربهێنن. کەواتە، بەردەنگەکان لێرەدا هەست بە جیایی یان بۆشاییەك دەکەن لەنێوان خۆیان و ئەو کەسانەدا.

٥- ڕاست بە پێچەوانەوە، ئەم بۆشاییە نەك هەر نابێتە هۆی لێك دوورکەوتنەوەی ئەم دوو لایەنە، بەڵکو دەشبێتە هۆی پێکەوە بەستنەوەیان. ئەم بۆشاییە وا لە بەردەنگ دەکات ببێتە سوورژەی ئاخێوەرەکە و ئەم بیرۆکەیەی لا گەڵاڵە دەبێت کە هەر ئەوانن باشترین کەس بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی وڵات. ئەم بۆشاییە بەردەوام لەنێوان ئاخێوەرەکە و بەردەنگەکەدا دروست دەکرێت و بەردەوام ئامادەیە و هەر ئەمەشە نابێتە هۆی لێکپچڕانیان. بە واتایەکی تر، ئەم بۆشاییە تا ڕادەیەکی زۆر لە هەمان بۆشایی دەچێ کە لاکلائۆ پێی وایە دال دروستی دەکات و دەبێتە هۆی بەردەوامبوون و مانەوەی گوتارە ئایدیۆلۆجیکەکان. سازبوونی ئەم بۆشاییە دەرئەنجامی کارابوونی ئایدیۆلۆجییە و سووژەکان جارێکی تر دەکاتەوە بە سووژەی خۆی.

ئەوانەی سەرەوە تەنیا چەند نموونەیەکی سادەن لەو ساتەوەختانەی زمان و ئایدیۆلۆجی دەگەینە یەك، بەڵام گەر بمانەوێت زیاتر لەسەر چۆنییەتی و میکانیزمی

ئەم بە یەك گەیشتنە قسە بکەین، ئەوا باسەکانمان دیسانەوە تیۆریك دەبنەوە و جێگەیان ئێرە نییە، بەڵام تەنیا ئەوە بڵێم کە لە ناسنامەی هەر سووژەیەکی کوردیدا جۆرێك لە دیالێکتیکی ناوەکی هەیە لەنێوان سابجێکتیڤیتییە ئایدیۆلۆجیکەکاندا و ئەم دیالێتیکانەش زۆربەی کاتەکان دالە ئایدیۆلۆجیکەکان و زمانی ئایدیۆلۆجیك سازی دەکەن. مەرج نییە ئەم دیالێکتیکانە بەردەوام بەئەنجام بگەن، بەڵکو، بەپێچەوانەوە، لە زۆربەی کاتەکاندا، ئەم دیالێکتیکانە لەبری بنیاتنەر بوون و گەیشتن بە سەنتێز، رووخێنەرن. واتە لەبری ئەوەی سابجێکتیڤیتییەکی تازە لە ناسنامەی سووژەدا دروست بێت و بە هۆشییەوە سووژە لە قەیرانی شوناس دەرباز بێت، سووژە نازانێت و ناتوانێت یەکێك لە سابجێکتیڤیتییە پێکهێنەرەکانی ناسنامەی خۆی بکاتە لایەنی زاڵی ناسنامەی خۆی. ئەمەش لە ئەنجامدا سووژەی کوردی لە باری دەروونناسانەوە تووشی ئەو شتە دەکات کە ئەمڕۆکە زۆرجار دەیبیستین: قەیرانی شوناس.

**قەیرانی شوناس چ پێوەندییەکی بە پێوەندیی نێوان زمان و ئایدیۆلۆجییەوە هەیە؟**

گەرچی ئەم زاراوەیە ئەمڕۆ لەلایەن زۆر کەسەوە و بەتایبەت لە راگەیەنەرەکاندا بەکار دەبرێت، بەڵام بۆ من قەیرانی ناسنامە هیچ نییە جگە لە ململانێ و دیالێکتیکی هەردەم ئامادەی نێوان ئایدیۆلۆجییە جیاوازەکان زمانی سووژەدا. روونتر بڵێم، ناسنامە دەکرێت بە دوو شێوەی تەواو جیاواز سەیر بکرێت. زۆربەی هەرە زۆری میدیاکان و تەنانەت خەڵکی شارەزا و پسپۆڕیش و بەتایبەت کوردناس و رۆژهەڵاتناسە رۆژئاواییەکان شوناس بە 'خودێتی' دادەنێن، کەچی لە روانگەی منەوە شوناس وەك 'هاوشێوەیی' سەیر دەکرێت. ئەمەش ئەو جیاوازییەیە کە باشتر لە هەرکەسێك پۆل ریکۆر باسی لێوە کردووە. ریکۆر دەڵێت: واژەی 'ئایدێنتیتی' لە هەناوی خۆیدا هەڵگری دوو واتای جیایە: selfhood and sameness باسکردنی جیاوازیی نێوان ئەم دوو بۆچوونە گەلەك سەختە، بەڵام بە نموونەیەکی ساکار کێشەکە چارەسەر دەبێت:

ئێمە دەتوانین بەدوو شێوەی جیاواز رووبەڕووی رستەی 'من کوردم' ببینەوە:

یەکەم، 'من' واتە 'کورد'، یان باشتر بڵێم: من - کورد. کەواتە، بۆ ناسینی 'من' پێویستە سەرەتا بزانین کوردان کێن، لە کوێ دەژین، سەر بە کام ئایین و ڕەچەڵەکن، فۆلکلۆر و مێژوو و ئەدەب و زمانەکەیان کامەیە، پاشان دەتوانین بزانین 'من' کێیە. ئەمە ئەو بۆچوونە باو و زاڵەی نێو نووسینەکانە، تەنانەت بەرهەمی هەندێ پرۆفێسۆر و مامۆستای زانکۆ و تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لە ئاکادێمیسیەنە ڕۆژئاواییەکانیش کە لەسەر مێژوو و ئەدەب و سیاسەتی کوردان کار دەکەن. من ئەم بۆچوونە بە سادە و ڕووکەشییانە دەزانم، چونکە ئەوان پێش ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە زاراوەی 'ئایدێنتیتی'یان پێشوەخت بۆخۆیان پێناسە کردووە و بەم پێش زەمینەیەوە کە دەزانن 'ئایدێنتیتی' چییە خەریکی کاری ڕۆژهەڵاتناسین. ئەوان تەنیا لایەنیselfhood -ی ئایدێنتیتی-یان بە لاوە مەبەست و گرنگە.

ڕێگەی دووەم بۆ تێگەیشتن لەو ڕستەیە ئەوەیە کە لەجیاتی ئەوەی بۆ تێگەیشتن لە 'من' لە زاراوەی ئاشنای 'کورد' کەڵك وەربگرین، سەرەتا بزانین ئەم 'من'ە لەگەڵ چیدا ئەمنەوە. بە واتایەکی تر، بۆ پێناسە و تێگەیشتن و لێکۆڵینەوەی 'من' پێویستە سەرەتا بزانین ئەو سابجێکتیڤیتییانە کامانەن کە ئەو 'من'یان پێکهێناوە. واتە، بە مەبەستی تێگەیشتن لە ناسنامەی 'من'، ئیدی خێرا ناچینەوە سەر پێناسەیەکی سادە و ئامادە کە هەمان کوردبوونییەتی. لێرەدا هەوڵ دەدەین لەوە تێبگەین کە 'من'، واتە شوناسی 'من' لەگەڵ چیدا ئەمنەوە. ئەمەش ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە لە نەریتی ئیدیالیزمی ئەڵمانیدا ئایدێنتیتی پێش ئەوەی بە مانای 'ناسنامە' بەکار ببرێت بە مانای 'ئەمنەوێتی' دێتە نووسین. واتە، هەروەك چۆن لە هێگێل-دا بۆ پێناسەی ئاغا پێویستمان بە کۆیلەیە و تا کۆیلەیەك نەبێت ئاغا و ئەربابێکیش لەئارادا نییە، یان وەك چۆن بۆ پێناسەی خودی مرۆیی پێویستە سەرەتا لەو سرووشتە تێبگەین کە ئەو خودەی پێکهێناوە، لێرەشدا بۆ تێگەیشتن لە ناسنامەی 'من' پێویستە سەرەتا ئەو سوبژێکتیڤیتانە دەستنیشان بکەین کە شوناسی ئەو 'من'یان پێکهێناوە.

بە سەرنجدان بەو خاڵەی کە زۆربەی سوبژێکتیڤیتییەکان ئایدیۆلۆجیکن و لە زمانی سووژەدا بەرهەم دەهێنرێنەوە، دەتوانین لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە لە زمانەوە شوناسی ئەو سووژەیە شی بکەینەوە. دیارە سەرجەم ئەم سوبژێکتیڤیتیانە لە زمانی

سووژەدا دەنوێنرێنەوە و لێرەدایە کە سەرنجدان بە زمان دەبێتە یەکەم و گرنگترین کاری ئێمە لە شیکردنەوە و ناسینی ناسنامە و کەواتە قەیرانی ناسنامەشدا. هەڵبەت وەکو دوا خاڵ لەم باسەدا ئەوەش بڵێم کە لێرەدا مەبەست لە 'من' تەنیا سووژەیە و ئیدی مەبەست هەندێ زاراوەی هاوشێوەی تر نییە وەك ئیگۆ، من، زەین و خود.

لەنێوان سابجێکتیڤیتییە پێکهێنەرەکانی شوناسی سووژەدا بەردەوام پێوەندییەکی دیالێکتیکی لەئارادایە. ئەم پێوەندییە دەکرێت بە دوو جۆری دیالێکتیکی نێوان - زەینیی بنیاتنەر و دیالێکتیکی نێوان- زەینی رووخێنەر دیاری بکەین. لە حاڵەتی یەکەمدا سابجێکتیڤیتییەکی تازە دروست دەبێت یان یەکێك لە سابجێکتیڤیتییەکان دەبێتە لایەنی زاڵی ئەو شوناسە. لە حاڵەتی دووەمدا سووژە لەنێوان ئەم سابجێکتیڤیتیانەدا سەرگەردانە و پێوەندییە دیالێکتیکییە نێوان - زەینییەکانی شوناسی ئەو سووژەیە ناتوانن بگەنە دەرئەنجامێك کە بەو پێیە بیچم بدەنە جیهانبینیی و روانینەکانی سووژە. لەم حاڵەتەدایە کە قەیرانی شوناس سەردەگرێت. هەڵبەت ئەوەش بڵێین کە هەر ئەم زاراوەیە ئەمڕۆژە بووەتە خاوەنی واتایەکی تەواو سیاسی، واتە، هەر لایەنی سیاسییە و لە هەوڵی زاڵکردنی سابجێکتیڤیتیی دڵخوازی خۆیەتی لەناو ناسنامەی سووژەکاندایە. ئەم زاراوەیە لە کۆمەڵناسیشدا بەلێشاو بەکار دەبرێت، بەڵام من بە مێتۆدێکی دەروونشیکارانەوە لەم دیاردەیە دەکۆڵمەوە و یەکسەر دەیبەستمەوە بە پێوەندییە دیالێکتیکەکانی نێو زمان و سابجێکتیڤیتییەوە. خاڵی هەرە گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە سەرجەم ئەم کارانە لە مەیدانی زماندا سەردەگرێت. واتە، قەیرانی شوناس هەم لە رێگە و بەهۆی زمانی سابجێکتیڤیتییە جیاجیاکانەوە دێتە ئاراوە و هەم لەناو زماندا رەنگ دەداتەوە.

شوناسی سووژە بەردەوام لە گۆڕاندایە و لەوانەیە لە یەکێك لە وێستگەکانی ئەم گۆڕانکارییانەدا سووژە رووبەڕووی قەیرانی شوناس ببێتەوە. شوناسی سووژە هیچ کاتێك رواڵەتێکی کامڵ و داخراو ناگرێتە خۆی و بەردەوام بەهۆی دیالێکتیکە هەمیشە ئامادەکانی نێوان سابجێکتیڤیتییەکانەوە دەگۆڕدرێت. سەرجەمی ئەو پرۆسەیەش هەم لە زماندا روو دەدات و هەم لە شیکردنەوەیدا دەبێت سەرنج بدەینە نواندنەوەی ئەو دیالێکتیکانە لە زمانی سووژەدا. لە شیکاریی قەیرانی ناسنامەی سووژەدا من سەرنج دەدەمە کاریگەریی لێپێچینەوە ئایدیۆلۆجیکی دەرەوەی کیانی

سووژه لەسەر نامۆیی زمانناسانەی سووژه. لێرەدا دەتوانین باس لە لێپێچینەوە ناوەکییەکانی سووژه بکەین و بە پەیڕەوی لە میتۆدی باتلێرەوە دەتوانین بەشێوەیەك باس لە لێپێچینەوەی هێگێلی (Hegelian Interpelation) بکەین. واتە، لە بۆچوونی مندا لێکۆڵینەوە لە دەرئەنجامەکانی لێپێچینەوە ئایدیۆلۆجیکە ناوخۆییەکانی سووژه و چۆنییەتی دەرکەوتنیان لە زماندا هەمان شیکردنەوەی قەیرانی ناسنامەی سووژەیە.

**پێوەندیی نێوان زمان و ناخودئاگا بە چ شێوەیەکە و تا چ ئاستێك گرنگ و چارەنووسسازە؟**

میکانیزمی نێوان سێکوچکەی زمان، ناخودئاگا و ئایدیۆلۆجی دەبێتە هۆی سازبوونی ناسنامەی سوژە. لەناو کورددا چەند پێویستمان بە شیکردنەوەی چەمکی ئایدیۆلۆجی هەیە دوو ئەوەندە پێویستمان بە پێناسە و راڤە و شیکاریی چەمکی ناخودئاگا هەیە. هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە میکانیزمی نێوان زمان و ناخودئاگا بووەتە باسێکی ناوەندی لە زۆربەی لێکۆڵینەوە دەروونشیکارانەکاندا، بەڵام پێش ئەم لێکۆڵینەوەیە پێویستە ئێمە زیاتر ئاوڕ لە چەمکی ناخودئاگا بدەینەوە. ناخودئاگا زۆرتر لەوەی بیری لێ دەکەینەوە لە کردار و بەرهەم و کەسایەتیماندا کاریگەر و ئامادەیە. با بەم پرسیارانەوە دەست پێ بکەین:

ئایا تائێستا ئەو پرسیارەمان لە خۆمان کردووە کە لەبەر چی لە تورکیا سەرەڕای ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری کەناڵەکانی راگەیاندن خاوەن دید و بۆچوونێکی سێکولارن، کەچی خەڵکی ئەو وڵاتە هێشتا زۆربەی هەرە زۆریان ئاینین؟ وەڵامەکە بۆ کەسێك ئاگاداری باسە تیۆریکەکان بێ دەربارەی ناخودئاگای مرۆیی و تواناکانی و کاریگەرییە درێژخایەنەکانی، زۆر سادەیە. تورکیا بۆ ماوەی چەندین سەدە یەکێك لە ناوەندە گەورەکانی دنیای ئیسلامی بوو. سابجێکتیڤیی ئایینی Religious subjectivity تەنانەت ئێستاکەش لایەنی زاڵی شوناسی سووژەی تورکیایی پێکدەهێنێت. دزەکردنی بیری ئایینی و وشە و دەستەواژە ئایینییەکان بە تەواوەتی لە زمانی تورکیی ئەستەنبۆڵیدا هەست پێدەکرێت و گەر بە وردی سەرنج بدەین، تێدەگەین کە تەنانەت لە زمانی ئەو کەناڵە سێکولارانەشدا هەست بە گەلێك دالی ئایدیۆلۆجیك دەکەین،

واتە، زمانەکە لێوانلێوە لە وشە و دەستەواژە ئیسلامییەکان کە وەك میرات لە عوسمانییەکانەوە ماونەتەوە. دەسەڵاتی ئەم دالانە هێندە زۆرن کە توانیویانە تا رادەیەك بەر بە رەوتی ئولگووسازیی سێکولار لەو ولاتەدا بگرن. لەم چەند ساڵەی دواییشدا کە لایەنی سیاسیی دەسەلاتداری هەنووکەیی هاتە سەر کار هێندەی تر ئەم رەوتە پەکی کەوت و ئێستا وا خەریکە تورکیا ببێتەوە بە وڵاتێکی بەهێزی ئولگووسازیی ئیسلامی. ئامادەبوونی ئوردوغان لە کۆبوونەوەی کۆمکاری عەرەبییدا لە میسر و هاوشێوەییەکانی سیاسەتەکانی تورکیا لەگەڵ کۆمکاریی عەرەبی لە چەند پرسی هەستیاری هەنووکەییدا ئەوەی خستەڕوو کە تورکیا و شوناسی تورکی زۆر زیاتر لەوەی هەستی پێدەکەین خۆی بە خانەخوێ و ئولگووی دنیای ئیسلامی دەزانێت. یەکێك لە دەرکەوتەکانی سابجێکتیڤیتیی ئایینی لە ناسنامەی سووژەی تورکیدا، ئەو سووژەیەی دەیەوێت ببێتە بەشێك لە ئەورووپا، ئامادەبوونی گەلەك دالی ئایدیۆلۆجیکە کە بوونەتە لایەنی زاڵ لە ناخودئاگای ئەو سووژەیەدا. یەکێك لە رێگەکانی پەرەسەندنی گوتارە سێکۆلارەکان لە گۆڕانکاریی زمانناسانەیە و ئەم کارەش لە رووی تیۆریکەوە مەحاڵە و گەریش سەر بگرێت، ئەوا درێژخایەنە.

نموونەیەکی تر لە دەسەڵاتی ناخودئاگا ئەمجارەیان لە ئێران شکستهێنانی ئەو هەموو هەوڵە بوو بۆ خاوێنکردنەوەی زمانی فارسی لە وشە و دەستەواژەی عەرەبی. بە واتایەکی تر، لە ئاقاری ئایدیۆلۆجی و ناخودئاگادا گەمەکان پێچەوانە دەبنەوە: واتە، لەجیاتی ئەوەی وشە فارسییەکان خۆماڵی بنوێنن بۆ فارسەکان و وشە عەرەبییەکان بیانی، رێك بە پێچەوانەوە، هەندێ وشەی فارسی بوونەتە خاوەنی بارێکی ئایدیۆلۆجیکی هێندە بەهێز کە ئیدی وشە عەرەبییەکان بەشێوەی ئایدیۆلۆجیك دەرناکەون. هۆکاری نائایدیۆلۆجیکبوونی وشە عەرەبییەکانی زمانی فارسی دەگەڕێتەوە بۆ جێگیربوونیان لە ناخودئاگای ئێرانییەکاندا بۆ ماوەی چەندین سەدە و بەکارهێنانیان لەو هەموو دەقە فارسییە کۆن و تازەیەدا و بوونیان بە ئولگوو لە کۆنەستی ئێرانیدا. ئایدیۆلۆجی تا لە ناخودئاگادا جێگیرتر و مسۆگەرتر بێت، کاریگەرترە و لەم حاڵەتەدایە کە ئیدی ئایدیۆلۆجیك بوونی فەرامۆش دەکرێت و دەبێتە بەشێك لە کیانی ئەو ناسنامەیە. ئەمە راڤەی زانستییانەی ئەو قسە باوەیە کە دەڵێن وشە عەرەبییەکان بوونەتە موڵکی زمانی فارسی.

ئەو پرۆسەیەی کە تێیدا زمان تاکەکەس دەکاتە سووژە و یان باشتر بڵێین تاکەکەس دەکاتە سووژەی خۆی، بە 'نامۆیی زمانناسانە' ناسراوە کە دەستەواژەیەکی لاکانیە(Linguistic alienation)، واتە ناسنامەی سووژە بەهۆ و لە ڕێگەی زمانەوە شکڵ دەگرێت. بە واتایەکی ڕوونتر، زمان نەك هەر شوناسی سووژە دابین دەکات، بەڵکو گرنگتر لەمە، زمان لە ناخودئاگای سووژەدا جێگیر دەبێت و دەست دەکاتە دروستکردنی سابجێکتیڤیتی. ناسنامەی مرۆڤ لەڕاستیدا بریتییە لە کۆی سابجێکتیڤیتییەکانی ئامادە لە ناخودئاگای ئەو سووژەیەدا، ئەو سابجێکتیڤیتیانەی زۆربەیان ئایدیۆلۆجیکن و بەهۆی زمانەوە سازکراون. بۆئەوەی ئەم تیۆریانە زۆر یونیڤێرسال نەبنەوە، ئەو ڕەخنەیەی بەردەوام لە لاکان گیراوە، دەکرێت باس لەوە بکەین کە پرۆسەی نامۆیی زمانناسانە هاوکات لە هەناوی خۆیدا هەڵگری لێپێچینەوەی ئایدیۆلۆجیکیشە. کەواتە، بەمەبەستی دیاریکردنی ناسنامەی سووژە، دەکرێت ئەو داڵە ئایدیۆلۆجیکانە دەستنیشان بکەین کە لە پرۆسەی نامۆیی زمانناسانەدا دەبنە هۆی سازبوونی سابجێکتیڤیتی لە شوناسی سووژەدا. داڵی ئایدیۆلۆجیك لە ناخودئاگای سووژەدا جێگیرە و لێرەدا پێوەندیی نێوان ئایدیۆلۆجی و ناخودئاگا دەبێتەوە بە کێشەیەکی تیۆریك کە دەبێت چارەسەری بکەین و ئیدی لێرەدا باس لەو چارەسەرکردنە ناکەم.

باسکردن دەربارەی زمانی کوردی و ناخودئاگای ئێمە سەرەتا پێویستی بە پێناسە و ڕاڤەکاریی چەمکی ناخودئاگا هەیە لە ئاقاری لێکۆڵینەوە کوردییەکاندا. ڕاستە ئەمە کارێکی تا بڵێی سەخت و درێژخایەن و بەرفراوانە، بەڵام دەستنیشانکردنی سابجێکتیڤیتییەکانی ئامادە لە زمانی کوردیدا ئەو ڕێگا سەختەمان بۆ هەموار دەکەن. واتە، بۆ تێگەیشتن لە ناخودئاگای کوردی دەبێت سەرەتا لەو سابجێکتیڤیتیانە تێبگەین کە ئەو ناخودئاگایەیان پێکهێناوە. ئەمەش دیسانەوە دەمانباتەوە سەر کارکردن لە سەر زمانی کوردی یان ئەو زمانانەی پێشتر لە پەروەردەکردنی سووژەی کوردیدا کاریگەر بوونە، وەك فارسی و عەرەبی و تورکی. کەواتە، هەموو ڕێگایەك دەچێتەوە بۆ 'زمان'.

ناخودئاگا نەك هەر بنەمایەکی وەك ئەوەی زمانی هەیە، بەڵکو لە ڕێگەی فێربوونی زمانەوەیە کە سووژە دەبێتە خاوەنی ناخودئاگایەکی تۆزێك تەکوزتر لەوەی

پێشتر هەڵگری بووە (مەبەست ئەو ناخودئاگایەی سووژە پێش فێربوونی زمان هەیبوو). لێرەدا ئێمە بە تەواوەتی لاکانین کاتێ دەڵێین بنەمای ناخودئاگا وەك بنەمای زمان دارێژراوە. واتە، ئەو زمانەی کەسێك دەکاتە سووژە، هاوکات بیچمیش دەداتە ناخودئاگای هەمان کەس. ئەمەش واتە پێوەندیی راستەوخۆی نێوان زمان و ناسنامە، هەڵبەت بە هەڵەدا نەچین، لێرەدا مەبەست لە زمان زمانی سووژەیە و مەبەست لە ناسنامە ناسنامەی سووژەیە. پێوەندییەکی دوولایەنە و دیالێکتیکی لەئارادایە لەنێوان زمانی کوردی و ناخودئاگای سووژەی کوردی بەشێوەیەك کە هەر یەکە ئەویدی بەرهەم دەهێنێتەوە. هەربۆیەش من هاوشێوەییەك دەبینم لەنێوانیاندا. باسکردن لەم هاوشێوەییە کاتی زۆرتری دەوێت و لێرەدا باسی ناکەم.

### ئایا دەکرێت چەند نموونەیەکی پراکتیکی لە پێوەندیی نێوان زمانی کوردی و ناخودئاگا بهێننەوە؟

باشترین شوێن بۆ نیشاندانی پێوەندیی ناخودئاگا و زمانی کوردی ئەو دەقە ئەدەبییانەن بەشێوەیەکی دەروونناسانە هەناوی کەسایەتییەکانیان خستووەتە روو. من ئەم کارەم پێشتر لە خوێندنەوەی دوو رۆمانی حەسار و سەگەکانی باوکم، بەرهەمی شێرزاد حەسەن و گرەوی بەختی هەڵاڵە بەرهەمی عەتا نەهایی بە ئەنجام گەیاندووە.

گەر بمەوێت لێرەدا ئاماژە بۆ چەند نموونەیەکی تیۆریك بکەم دەربارەی پێوەندیی زمان و ناخودئاگا، دەتوانم ئاماژە بۆ نەبوونی شێوەی داهاتووی فرمان لە رێزمانی کوردیدا بکەم و پاشان باسی و دەرئەنجامەکانی ئەم مەسەلەیە بکەم لە ناخودئاگای کوردیدا. وەك دەزانین لە زمانێکی وەکو ئینگلیزیدا ئێمە خاوەنی چەندین شێوەی جیاجیاین بۆ دەستنیشانکردنی ئەو کردارانەی لە داهاتوودا سەردەگرن، وەك:

I will call you
I shall call you
I am going to call you
I will be calling you

لە زمانی فارسیشدا گەرچی بە مەبەستی دیاریکردنی کرداری داهاتوو لە 'خواه' کەڵك وەردەگیردرێت، بەڵام ئەم جۆرە بەکارهێنانە ئەمڕۆکە بووەتە هەڵگری شێوازێکی

ڕەسمی. واتە لەبری 'خواهم رفت' دەوترێ 'می روم'. لە عەرەبییشدا 'س' و 'سوف' هەمان دەور دەگێڕن. لە کوردیدا، بەڵام، ئێمە خاوەنی شێوەیەکی تایبەت لە کردار نین ئاماژە بێت بۆ داهاتوو.

نەبوونی شێوەی داهاتوو لە کرداردا لە ڕێزمانی کوردیدا و بە تایبەت لە سۆرانیدا هەم هۆکار و هەم دەرئەنجامی جۆریکە لە 'رابردووخوازی' لە ناخودئاگای سووژەی کوردیدا (هەڵبەت لە کرمانجیدا یەك شێوەی کرداری داهاتووی نزیکمان هەیە). بۆیە دەڵێم هۆکار و دەرئەنجام، چونکە نازانین ئایا ئەمە نەبوونی ئەو کردارەیە کە زەینییەتەکەی بەرهەمهێناوە یان خودی زەینییەتەکەیە کە ئەو کردارەی بەرهەم نەهێناوە، هەڵبەت لێکۆڵینەوەکانی من بەو دەرئەنجامە گەیشتوون کە ئەمە نەبوونی ئەو کردارە لە زمانی کوردیدایە کە ئەو زەینییەتەی بۆ خولقاندووین. لێرەدا زۆر لەسەر ئەم پرسە ناڕۆم. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە خودی ئاگاداربوون لەم بیرۆکەیە دەتوانێت دەورێکی سوودبەخش ببینێت لە نەمانی ئەو زەینییەتەدا. ئەم دیاردەیە، واتە ئاگاداربوونەوەی سووژە لە کەمایەسییە جەوهەرییەکانی خۆی لەلایەن خودی سووژەکەوە بە(meta-awareness) ناودەبرێت.

نموونەیەکی تر لە پێوەندیی نێوان زمان و ناخودئاگای کوردی نەمانی سەربەخۆیی و تاکایەتی وشەکان لە زمانی کوریدایە کە لەسەرەوە باسم لێکرد و چەندین نموونەم بۆ هێنایەوە. ئەم تایبەتمەندییە بووەتە هۆکار و دەرئەنجامی پشتگوێخستنی تاکایەتی چ لە ناسنامە و چ لە سیستمی فەرهەنگیی ئێمەدا. بۆ نموونە، لە هەڵپەڕکێدا جگە لە سەرچۆپی هیچ جێگایەك بۆ تاکایەتی یەك تاکەکەسی ناو کۆڕی هەڵپەڕکێ نامێنێتەوە و دەبێت سەرجەم ئەوانەی پێکەوە هەڵدەپەڕن لە یەك ریتم و یەك جووڵەی ریتمیك پەیڕەوی بکەن و گەر کەسێك ئەم کارە نەکات نەزمی هەڵپەڕکێکە تێکدەچێت. واتە، ئەوانەی هەڵدەپەڕن سەربەخۆ نین لە جووڵەکانیاندا، بەڵکو سەر بەو ریتم و جووڵانەن کە هەمووان دەبێت ڕەچاوی بکەن. بە واتایەکی تر، نەبوونی سەربەخۆیی لە وشەدا چ لە دەربڕینیاندا و ج لە نووسینیاندا ئەمجارەیان لە نەبوونی سەربەخۆیی و تاکایەتی لە کایە فەرهەنگییەکانی ترماندا ڕەنگی داوەتەوە. ئەم نموونانە یەکجار زۆرن و دەتوانین دەرکەوتەکانیان لە شێوەکاری و موزیك و ئەدەبدا بدۆزینەوە.

یەکێکی تر لەو تایبەتمەندییانەی کە لە سەرەوە باسم کرد و دەکرێت دەرئەنجامەکانی لە ناخودئاگادا ببینرێتەوە سروشتی بوونی زمانی کوردییە، ئەم تایبەتمەندییە لە زەینییەتێکی پێشمۆدێرنەوە هەڵدەقوڵێ، سروشتیبوونی زمان و سابجێکتیڤیتیی پێشمۆدێرن یەکدی بەرهەم دەهێننەوە. ئەمە زەینییەتێکی مۆدێرنە کە دەتوانێت بە خودئاگاییەوە بەر بە مۆرك و لایەنە سروشتییەکانی زمانی کوردی لە نووسینێکدا بگرێت و بەردەوام هەوڵی رەچاوکردنی توخم و رەهەندە زانستییەکان بدات، واتە، زمان لە سروشتی بوونەوە بەرەو زانستیبوون ببات، هەرچەند پێوانی ئەم رەوتە یەکجار سەختە و لە ئێستاشدا ناتوانرێت بە تەواوی سەر بگرێت. هەر جۆرە گۆڕانکارییەك لە زماندا پێویستی بە ماوەیەکی درێژخایەن هەیە و با لە بیرمان نەچێتەوە کە گۆڕانکاریی لە زماندا، واتە گۆڕانکاری لە ناخودئاگادا. ئەم رەوتە هێندە ئەستەم و پڕ تەنگوچەڵەمە و درێژخایەنە کە زۆرێك لە بیرمەندان پێیان وایە ناتوانرێت سەر بگرێت، بەڵام چەند بیرمەندێکی پاش بنەماییخواز، بۆ نموونە باتلێر، ئەوەیان بۆ شی کردووینەتەوە کە ئەم کارە دەکرێت ئەنجام بدرێت، هەڵبەت لە ئاستێکی زۆر بچووکدا و بە رادەیەکی کەم. هەربۆیەش، ئێمە زۆر بە ئاسانی دەتوانین قامك بخەینە سەر ئەو خەسڵەتە نازانستییانەی دەقێکی کوردی کە خاوەنەکەی بانگەشەی زانستیبوونی بەرهەمەکەی دەکات. یان، گەر سەرجەمی بەرهەمەکانی بیرمەندێکی کورد بخەینە بەر لێکۆڵینەوە، زۆر ئاسانە قامك لەسەر ئەو دژایەتییانە دابنێین کە لەناو ئەو سیستمە فیکرییەیدایە کە بیرمەندەکە هەوڵی بەرهەمهێنانی داوە.

## پێناسە:

- خاوەنی دوو بڕوانامەی دکتۆرایە: ساڵی ۲۰۰۷ لە زانکۆی پونا لە هیند دکتۆرای فەلسەفەی وەرگرتووە، تێزەکەی لەسەر پێوەندیی نێوان فەلسەفەی رەخنەگرانە و تیۆریی ئەدەبی بووە. لە کۆتایی ساڵی ۲۰۱۰ لە زانکۆی ئێکسێتێر لە بەریتانیا دکتۆرای زمان و ئەدەبی ئینگلیزی تەواو کردووە و تێزەکەی لەسەر شیکردنەوەی ناسنامەی سووژە بووە لە رۆمانی هاوچەرخی ئینگلیزیدا.

- لە ساڵی ۱۹۹۷دا لە سەرتاسەری ئێراندا و لە تاقیکردنەوەکانی قۆناغی ماستێری سەرجەم زانکۆکاندا پلەی دووەمی بەدەستهێنا، تاکو ئێستاش دوو جار وەك مامۆستای نموونەیی و جارێك وەك توێژەری نموونەیی لە زانکۆی کوردستان لە سنە هەڵبژێردراوە.

- خاوەنی چەندین کتێبە، وەك فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی و چەندین کتێبی فەلسەفی و تیۆریشی لە فارسی و ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و فارسی، جگە لە نووسینی چەندین وتار، زیاتر لە بیست وتاری زانستیشی لە ئینگلیزییەوە کردووە بە کوردی.

- لە ساڵەکانی ۲۰۰۰ بۆ ۲۰۰۳ لە زیاتر لە دوازدە کۆنفرانسدا وتاری بە زمانی کوردی پێشکەشکردووە و لە ۲۰۰۵ بەملاوە چەندین سیمیناری تاکەکەسیشی بە زمانی ئینگلیزی لە زانکۆکانی ئێران و هەرێمی کوردستان و هیند و بەریتانیادا ئاراستەکردووە.

- توێژەرێکی کارایە لە ناردنی وتاری 'علمی-پژوهشی' بۆ گۆڤارە ئاکادیمیکەکانی زانکۆکانی ئێران و رۆژئاوا و کۆنفرانسە نێودەوڵەتییەکان.

- له بەشی زمان و ئەدەبی ئەدەبی ئینگلیزی و زمانناسی له کۆلێژی ئەدەبیات و زانستە مرۆییەکانی زانکۆی کوردستان له سنه مامۆستای زمان و ئەدەبی ئینگلیزییه و بواری پسپۆڕیشی رەخنه و تیۆریی ئەدەبی و فەرهەنگییە.

- مافی بڵاوکردنەوەی ئەم وتووێژە بۆ ئەم بەرهەمه پارێزراوه و ناوەرۆکەکەشی تەنیا به ئاماژەدان به سەرچاوەوە دەتوانرێت بەکاربهێنرێت.

## هزری نەتەوەیی و جیهانبینیی مرۆڤی کورد لە زماندا

## دیمانەیەک لەگەڵ مەسعوود بابایی نووسەر و شارەزای زمانی کوردی

سازدانی: شەریف فەلاح

**زمان رۆحی نەتەوەیە، ئەم پێناسەیە هەتا چەندە لەگەڵ دۆخی زمانی کوردیدا دەگونجێت و لە رابردوو و ئێستادا زمان لە پرۆسەی نەتەوەسازیی کورددا چ رۆڵێکی بینیوە و پێوەندیی شوناسی نەتەوەیی و زمانی کوردی چۆن دەبینیت؟**

زمان رۆحی نەتەوەیە. ئەم دەربڕینە دەربڕینی رۆحانیی زمانە. کاتێک ئێمە لە زماندا بە دیناو (مکاشفە) دەگەین، هەستێك بەسەرماندا باڵ دەکشێت کە هەستی مرۆڤبوونی ئێمەیە، جۆرە مرۆڤێك، وێنای شوناسی مرۆڤێك کە لەویدی جیاوازە. پەیوەستبوون بە زمانەوە پەیوەستبوونە بە خولیاگەرییەك. رایەڵێکی پێوەندیی خوازەییە بە نەوەی پێش خۆمان و پێشینانمان. بەو زمانە لەگەڵ نەوەی دوارۆژیش پێوەندی دەگرین. دەبینە رایەڵی دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەینێ. لەراستیدا دەبین بە مرۆڤێك کە لە خاکێکی خوازییدا رەگ دادەکوتین. هەڵبەت ئەگەر لە پەنجەرەی پێناسەی مامۆستا (عەلائەدین سەجادی)یەوە سەیری زمان بکەین کە دەڵێت: "زمان شادەماری نەتەوەیە" لە جێی رۆحی سەرگەردان شادەمارێك وێنا دەکەین کە رەگ و ریشەی لە خاکدایە و خەیاڵەکانی سەر لە ئاسمان دەسوون. شادەمار لە خاکی نیشتماندا رەگاژۆ دەکات و لەوێوە ئیدی رۆحی نەتەوە باڵا دەکات. گونجانی ئەم پێناسەیە لەگەڵ نەتەوەی کورددا کە فاکتەرە سیاسییەکانی بوونی نەتەوە و دانپیانانی سیاسەتی نێودەوڵەتی بە کیانێکی سیاسیی تێدا بەدی نەکراوە، ئاشکرا و دیارە. مرۆڤی کورد خاك و زێد و نیشتمان و سنوورەکانی لە زماندا زەق دەکاتەوە و نیشتمان و خاك و نەتەوە هەموویان لە زمانی کورددا زیندوون. هەربۆیە هەوڵدانی دوژمنانی کورد کوشتنی خەیاڵ و هزری نەتەوەیی کوردە کە لە ئاماژە زمانییەکانیدا دەردەکەوێت.

پرۆسەی نەتەوەسازی لە رێگەی زمانەوە پێوەندیی بەوەوە هەیە کە ئایا فاکتەرەکانی دیکەی فەرهەنگی و سیاسی لەبارەی کوردەوە بڕشتی نەتەوەسازییان چەند بێت. ئەگەر دەوڵەت نەتەوەیەك بونیاد بنێت، وەك لە مودێلی دەوڵەتی نەتەوەیی مودێرن و لە ئەنجامی مودێرنیتەی سیاسیدا هەبووە، رەنگە ئەمەکناسی بە دەوڵەت و بۆرژکراسیی مودێرن و مافی هاوڵاتی و چەندین گوتەزای جیاجیا هەموویان بەرهەمهێنی ناسیونالیزمێکی دەوڵەتی و سیاسی بن کە بەگوێرەی بەریان (گرایش) و وەفاداری بە دەوڵەت بونیاد نرابێت. ئێمە لە وەڵامی ئەم بەشە لە پرسیارەکە دەکەوینە سەر دووڕییانێك:

١- نەتەوە کیانێکی ئێستاییە و دابڕاوە لە مێژوو و ئەوانەی ئێستا هەن خاوەنی فەرهەنگێکی دواکەوتووی پێش مودێرنن و بەگشتی شێوەی ژیانی جڤاکی و فەرهەنگییان ئێجگار لە یەك دوورە.

لەم پێناسەیەدا نەتەوە داڕنراوە لە مێژوو و بەرهەمی دەوڵەتی مودێرنە. بەهەرحاڵ کەسانێك کە باوەڕیان بەم پێناسەیە هەیە لە روانگەی "دەوڵەت - نەتەوە"وە سەیری بابەتەکە دەکەن. گەلانی بێ دەوڵەت خاوەن کیانی فەرهەنگی/ئیتنیکین و لە ریزی نەتەوەدا پۆلێن ناکرێن. ئەم روانگەیە نەتەوەسازی بە واتای دروستکردنی نەتەوەیەك لەلایەن دەوڵەتەوە لێکدەداتەوە و لە تایبەتمەندیی مێژووکرد دای دەڕنێت.

٢- کەسانێکیش هەن باوەڕیان وایە کە نەتەوە کیانێکی مێژووییە. هەرچەند شێوە و بیچمی نەتەوە بەگوێرەی فراژوویی (تکامل، تگور) قۆناخە مێژووییەکان گۆڕانی بەسەردادێت، ئەم گۆڕانە بە واتای شێوە گۆڕان (دگردیسی)ە، وەکو گۆڕانی کرمێك کە دەبێتە پەپوولەیەك. ئەم گۆڕانە دابڕان لە رەگ و ریشە و بنماك (عنصر بنیادین) نییە. کاتێك نەتەوەیەك یادەوەریی مێژوویی خۆی دەگێڕێتەوە، لە رووی زمانی و نەژادییەوە خۆی بە نەژاد و نەتەوەیەك دەبەستێتەوە کە رەنگە لەگەڵ دۆخی ئێستایشی یەکانگیر نەبێت، بەڵام بەشێکی زۆری تایبەتمەندییەکانی هاوشێوەی نەتەوەیەك لە مێژوودان. ئەم هاوشێوەییە ئەگەر زمانی بێت و لە دەقە کۆنەکان و شوێنەوارەکاندا بەدی بکرێت، بوونی مێژوویی و ریشەی مێژوویی ئەو نەتەوەیە دەسەلمێنێت.

تیۆرییەکانی نەتەوەسازیی مودێرنیتە هەرچییەك بن، گرنگ نەتەوەکانن کە خۆیان پێناسە دەکەن. هەربۆیە پرۆسەی نەتەوەسازی لە رێگەی زمانەوە لە هەمبەر کورد وەڕاست دەگەڕێت، بەڵام لەمەڕ نەتەوەیەکی دی مەرج نییە راست بێت.

**جەنابت دەڵێی زمان مەوداسازە و هێڵ و سنووری من و بەرامبەر دیاری دەکات، ئەم تیۆرە لەمەڕ زمانی کوردی وەڕاست دەگەڕێت، زیاتر شی بکەرەوە؟**

فۆرمۆلی تیۆرەکە -ئەگەر بتوانم پێی بڵێم تیۆری- (مەودا/ جیاوازی)یە. پێویستە ئەوە بڵێم لە باس و خواسی شوناسی نەتەوەییدا من زمانگەرام. مێتۆدێك کە لەم بارەیەوە کەڵکم لێ وەرگرتووە، رەچاوی مەودا و جیاوازی دەکات. شوناس بریتییە

لە مەودای من لەگەڵ ئەویدی. مـەودا جیـاوازی دروسـت دەکـات. ئەگـەر سـەیرێکی جێناوەکانی زمان بکەین، شتێکی سەرنجڕاکێش بەدی دەکەین.

من - - - - - بنەمای هاوشێوەیی - - - - - ئێمە (هاوخوێن/ هاونیشـتمانی و هاونەتەوە و پێوەندیی خزمایەتی)

تۆ - - - - - بنەمای هاوشێوەیی - - - - - ئێوە (هاوخوێن/ هاونیشـتمانی و هاونەتەوە و پێوەندیی خزمایەتی)

ئەو - - - - - بنەمای هاوشێوەیی - - - - - ئەوان (هاوخوێن / هاونیشتمانی و هاونەتەوە و پێوەندیی خزمایەتی)

(ئێمە) کۆی (من)ەکانە/ (ئێوە) کۆی (تۆ)ە کانە/ (ئەوان) کـۆی (ئـەو)ەکانـە. سێ چەمکی خزم و ئاشنا و بێگانە لێرەدا بەبێ ئـەوەی زۆرکـەس هەسـتی پـێ بکـەن بەدی دەکرێن. لەوەش گرنگتر سێ بازنەی شوناس دروست دەبن کە بەرهەمی سیسـتمی نیشانەناسی و سیستمی نیشانەسازیی زمانن.

من - - - - - ئێمە/ بازنەی خزمایەتی (بازنەی یەکەم).

لە بەرانبەر مندا تۆ - - - - - ئێوە بازنەی ئاشنایەتییە. (بازنەی دووەم).

هەروەها لە بەرانبەر مـنـدا ئـەو - - - - - ئـەوان بازنـەی بێگانەییـە: (بازنـەی سێیەم).

هەر بەو شێوەیەش بازنەکانی دیکەش لە بەرانبەر من - - - - - ئێمە، وەهان.

هەڵبەت نابێت ئەمە بـە تێگەیشـتنێکی فاشیسـتی لێکبدرێتـەوە. واتـە نابێـت چـەمکەکانی ئاشـنایەتی و بەتایبـەتی بێگانـەیی بـە دوژمنایـەتی لێکبدرێنـەوە. دوژمنایەتی پێوەندیی بە پێکدادانی بەرژەوەندییەکانەوە هەیە و ئەم بابەتـە پێوەنـدیی بە بونیادی خۆناسین لە زماندا هەیە کە من بە مەودا- جیاوازی ناوم لێناوە.

هەروەك وتم سیستمی نیشانەسازیی زمـان سیسـتمێکی پۆلێنبەندییـە. مـرۆڤ لـە ڕێگەی نیشانە زمانییەکانەوە پێوەندییەکی دەنگی/ دیاردەیی و دواجار پۆلێنبەنـدیی واتایی جیهانی دەوروبەری دەناسێت و دەناسێنێت.

پۆلێنبەندیی واتایی لە دۆخی لێکسیکیی زماندا پێوەندێکە لەنێوان یەکەی وێنەیی/ دیاردەیی (واحد تصویری/ پدیداری)، یەکەی وێنایی/ خەیاڵی (واحد تصوری/ خەیاڵی) و یەکەی دەنگی و یەکەی واتایی.

ئەمە پێوەندییەکی زمانییە. یان باشتر بڵێم لۆژیکی هەموو زمانێکە وەڕاستگەڕانیشی لە هەمبەر زمانی کوردی وەکو زمانانی دیکەیە و کوردیش لەم ڕێسایە بەدەر نییە. لۆژیکی پێوەندیی کۆمەڵایەتی لە زماندا ڕەنگدەداتەوە. ئێمە لە سێگۆشەی کات و شوێن و ڕووداودا دەژین. هیچ دۆخێکی کاروباری سروشتی و مرۆیی لە دەرەوەی ئەم سێگۆشەیە ناگونجێت. زمان ڕەنگدانەوەی ئەم دۆخەیە و توخمەکانی بکەر و بەرکار و کردار بەگوێرەی بەرداشی کات و شوێن و ڕووداو ڕەوتی "کران" دەڕەخسێنن. ئەم ڕەوتە بەگوێرەی ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو بەشبەندیی ژیانی مرۆیی ڕێك دەخەن. ئەم ڕەوتە لە زماندا لە چوارچێوەی کردار، جێناو و ئاوەڵکردارەکان (قید) بوونی خودئاگای مرۆڤ لە گوتەزا زمانییەکاندا زەق دەبێتەوە. دەبێت ئاگادار بین خودئاگایی بەرهەمی زمان نییە، بەڵکو زمان گوێزەرەوەی ئەم خودئاگاییەیە بۆ کارەکتەرەکان. هەربۆیە چەمکی مەودا -جیاوازی لە هەناوی زماندا جێی خۆش کردووە. ئێمە بەگوێرەی ئەم تایبەتمەندییە دەچینە نێو پرۆسەی دیالکتیك و وتووێژەوە و لانیکەم لۆژیکی زمانی ڕۆژانە یان ئاخاوتنی ڕۆژانەمان ڕێك دەخەین، بەڵام ناسینی ئەم تایبەتمەندییە یارمەتیمان دەدات مەودا- جیاوازی وەك مێتۆدێك لە پرۆسەی دیناو (مکاشفە)ی زمانیدا بخەینەگەڕ. کۆد و نیشانەکانی زمانی کوردی ئاشکرا و دیارە لەگەڵ کۆد و نیشانەکانی زمانەکانی دیکە جیاوازە. وشەی جیاواز بریتییە لە سنووربەندیی نێوان دوو دیاردە. جیاوازی لە بیچم و دەنگ و ڕەنگ و سیستمی مۆرفیمیی زمان. جیاوازی هەوێنی پێناسەی کەسێتییە.

**ئەگەر بتەوێ خەسارناسییەکی کورتی پرسی زمانی کوردی بکەی چۆنی لێك دەدەیەوە؟**

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەوەی دەتوانم باسی بکەم لە سێ خاڵدا کورتی دەکەمەوە:

ئەلف: پەرتەوازەیی سروشتی.

ب: لێکترازان.

ج: دوورکەوتنەوە.

ئەلف: پەرتەوازەیی سروشتی مەبەست جوگرافیای زمانییە. بەرینایی جوگرافیای سروشتیی کوردستان و ئەزموونی وشە و دەستەواژەی جیاجیا بۆ دیاردە سروشتییەکان و رامانی مرۆڤی کورد لە دیاردەکان و رەهەندی روانین بۆ جیهانی دەوروبەر و ژینگەکەی کۆمەڵێ یەکەی زمانی لە چوارچێوەی دیالێکت دروست کردوون کە بوونەتە هەوێنی دەوڵەمەندی و لە هەمان کاتدا هەوێنی ناکۆکیشیان رەخساندووە.

ئەم ناکۆکییانە لە قۆناغی دووەمدا دەگەن بە لێکترازان.

ب: لێکترازان لە ژیانی سروشتی و شوانکارەیی و جوگرافیای سەخت و نالەباردا بەشێوە سروشتییەکەی هەبووە، بەڵام ئەوەی کە دواتر لە رووی شوناسەوە قەیرانساز بووە گوێزرانەوەی ئەم قەیرانە بووە بۆ کایەی سیاسی و دواتر سەپاندنی جۆرێك شوناسی نەخوازراوی ناوچەیی لەسەر بنەمای دیالێکت و شێوەزاری ناوچەیی کە کارەکتەری سیاسی بەگوێرەی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان بەکاری دێنێت و لە دوارۆژدا ئەم قەیرانە دەبێتە لەمپەر لەبەردەم شوناسی نەتەوەیی یەکپارچە و پرۆسەی نەتەوەسازی پەك دەخات. کەڵکئاوەژۆی سیاسەت لە زار و شێوەزار و ناوچەگەری بۆ بەدەستهێنانی هێزی سیاسی کارەساتبارترین قەڵاچۆی فەرهەنگییە کە لە داهاتوویەکی نە چەندان دووردا نیشانەکانی دەردەکەون. دواقۆناغی ئەم لێکترازانە دارمانی پرۆسەی نەتەوەسازی و ناسیونالیزم و سەرهەڵدانی شوناسی ئیتنیکییە. ئەگەر ئەم بارودۆخە بەردەوام بێت بەرای من گەیشتن بەم قۆناغە مەترسیدارە مسۆگەرە.

ج: دوورکەوتنەوەش لە ئەنجامی دوو قۆناغەکەی پێشوو بەوپەڕی مەودا دەگات و ئەوپەڕی جیاوازیش روو دەدات. کەوابوو ئەوکاتە زمانی نەتەوەیی لێڵ و نادیار دەبێت و هەر زار و زارۆچکەیەك رێچکەی سەربەخۆ وەردەگرن. ئەوکاتە زمانە تۆکمەکان بە ئاسانی ئەم زار و زارۆچکانە قووت دەدەن و ئاوابوونی کۆی زمانەکە دەست پێدەکات. ئۆباڵی ئەم کارەساتەش لە ئەستۆی سیاسەتبازانی کوردە کە خەریکە لە گێژاوی بێ شوناسیدا تووشمان دەکەن.

**له قۆناغە کاتییەکانی گەشەی زمانی کوردیدا زیاتر چ تـوخم و بیرۆکەیـەکی زاڵ رۆڵی گێڕاوە و هەبوونی عیرفان و سۆز و باوەڕە دینییەکان چ کاریگەرییەکیان هەبووە و لە کام قۆناغی مێژووییدا توخمـە هزری و مەعریفییـەکان لـە زمـانی کوردیـدا دەرکەوتوون، ئاخۆ زمانی کوردی پێی ناوەتە ئەو قۆناغەوە و بەگشتی پێوەندیی نێوان مەعریفە و زمان چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

دین و سۆفیگەری و عێرفان یەکەم پرسیاری فەلسـەفییان هێنایـە گـۆڕێ. ئەمـە وەڵامیان بۆ پرسیارە فەلسەفییانە چییە خۆی باسێکی دیکەیە، بەڵام فەلسـەفە بـەڕای من رۆڵەی لاساری دینە، چونکە وەڵامەکانی دین نەیتوانیوە رازیی بکـات و زۆرجـاران لە دین یاخی دەبێت یان ئەگـەر یـاخیش نـەبێت بـەدوای لـۆژیکی بەڵگەهێنانـەوەدا دەگەڕێت. ئاشکرا و دیارە عیرفانی کوردی زۆرترین پانتایی لە ئەدەب و وێژەی کوردیدا داگیرکردووە. ئەدەبی کلاسیکی کوردی لەم بارەیەوە نموونەی دیاری وەکو مەحوی هەیە. هەرچـەند شـاعیرانی دیکـەش هـەن کـە رەنگـە روانگـەی سـۆفیگەریی ئیسـلامیی مەحوییان نەبێت و زۆرتر بەدوای سۆفیگەریی پـەتی کـەوتوون. بـۆ نموونـە مەولـەوی ناتوانین بە نوێنەری سۆفیگەریی ئیسلامی بزانین. بۆیە عیرفانێکی سروشـتگەرا بـەدی دەکەین کە لەودا مرۆڤ و سروشت تێهەڵکێشی یەکـدین. کـەوابوو تایبەتمەندییـەکانی سۆفیگەریی کوردی هەرچەند ئیسلامیش کاری تێکردووە، بەڵام نەسکی رەسـەنایەتیی پێوە دیارە. کەوابوو ئەگەر زاراوە و دەستەواژەی فەلسەفی و فیکری هـەبن، دەبێـت لـەم ئەزموونانەدا بۆیان بگەڕێین و هەڵبەت نابێت دینە خۆماڵییەکانیش پشـتگوێ بخـەین کە هەرچییەك بن لە روانگەی فەلسەفی و پرسیاری فەلسەفی بەدەر نین.

ئاشکرا و دیارە ئێمە ئێستا درێژەی ئەو رێچکانەین و زمانی کوردیش دابـڕاو لـەو قۆناغانە نییە. هەڵبەت رۆحانیبوونی ئەو قۆناغانەی کەمتر پێوە دیارە.

**جوگرافیای زاراوەکانی زمانی کوردی لە رەوتی گەشەی زماندا چ رۆڵێکیان گێڕاوە، ئاخۆ بوون و گەشەکردنی زاراوەکان گرفتن یان دەرفەت؟**

رەنگە ئەم پرسیارەم بەشێوەیەك لـە شـێوەکان وەڵام دابێتـەوە. تـەنیا شـتێك کـە پێویستە باسی بکەین تێکەڵبوون و ئاوێتەکردنی وشە و زاراوەکانی هەرکام لـەو زار و زارۆچکانەن لە کرمانجیی خوارووداَ. بە راشکاوی بڵێم پرۆسەی وەرگـرتنی وشـە و زاراوە

لە زار و زارۆچکەکان لە کرمانجیی خوارووردا زیاتر و بە زەقی بەرچاو دەکەوێت، ئەویش لەبەر تێکەڵبوونی ئەم زارەیە لەگەڵ شارنشینی و بابەتە فیکری و سیاسییەکان و لە رەوتی گەشەی ئەم زارە دەگەین بەوەی کە خەریکە -ئەگەر سیاسەتبازان لێمان گەڕێن- تایبەتمەندیی زمانێکی یەکگرتوو وەردەگرێت.

**شیعر وەك گوتاری زاڵی کۆمەڵگای کوردی لەلایەك و ئەدەبی زارەکی لەلایەکی دیکەش، چ خەسارێکیان لە پێکهاتەی زمان و رەوتی مەعریفە داوە؟**

شیعر نابێتە ئاخێوی زاڵ (گفتمان مسلط)، بەڵام دەبێتە مۆرکی زاڵی ئەندێشە و خەیاڵی ئەدەبی. کۆمەڵگە لە دۆخی شاعیرانەدا ناژی، بەڵام دەشێ بکەوێتە دۆخێکی نۆستالیژیکەوە. دۆخی نۆستالیژیکیش بەشێك لە ئەدەب بەرهەم دێنێت کە رۆمانتیسیزمە. شیعر دەربڕینی رووتی هەست نییە هەر بەو چەشنەش دۆخی بەدەر لە عەقڵیش نییە، بەڵام نە شیعر فەلسەفەیە و نە فەلسەفەش شیعرە، بەڵام تیشڕیی فەلسەفی لە شیعردا بەدی دەکرێت و رەوایە. زمانی شیعر زمانێکی کۆبونیادی هەستەکی/ ئاوەزییە و هاتوچۆیە لەنێوان خەیاڵ و کەتوار (فانتزی). خەساری زمانی شیعری لەوەدایە کە گوتەزا فەلسەفییەکان لە توێکڵ و قاوخ و دەمامکی شیعردا دەشارێتەوە و بەدەر لە لۆژیك و بەڵگەهێنانەوە و تەکنیکەکانی راڤەی دیاردەیە. ئەگەر فەلسەفە زمانی ئاوەزی پەتی بێت شیعر ئەوە نییە.

بەداخەوە پێچەوانەی ئەم ئەگەرەش راست نییە. ئەگەر ئەو کتێبە فەلسەفی-دینیانەی کە شاعیرانی کورد بە عەرەبی یا فارسی... نووسیویانە بە پەخشانی کوردی نووسرابان، هەڵبەت کاریگەریی زمانی و فەلسەفییان زیاتر دەبوو و زمانی کوردیش زووتر دەکەوتە رێڕەوی زمانی فیکری و زانستییەوە.

**توخمی سروشتی و ناتۆراڵیزم چ کاریگەرییەکی لەسەر ژیانی کورد و زمانەکەی هەبووە، ئاخۆ زمانی کوردی توانیویەتی لە چەقی سروشت خۆی دەرباز بکات و لەگەڵ بەها و توخمەکانی شارنشینی و ژیانی برۆکراسیدا خۆی رێك بخات؟**

زمان خۆی توخمێکی ناتۆرالیستییە. ئەگەر بڕوامان بەوە هەبێت کە ئێمە لاسایی دەنگە سروشتییەکانمان کردووەتەوە، زمانیش لەو بەستێنەوە ئاخێزاوە، بەڵام کاتێك

ئێمە دەنگەکان لە دۆخی ئاگاییەوە دەخەینە ڕیزڕەوی واتاوە، زمان دروست دەبێت. کەوایە پرسیارەکە دەبێت بەشێوەیەکی دیکە بپرسین ئایا زمانی کوردی دەتوانێت خۆی لە دۆخی ناتۆرالیستیی پەتی ڕزگار بکات؟ ئایا نەیکردووە؟ زمانی کوردی زمانێکە لە چیاکان و داوێنی چیاکان و مێرگ و پێدەشتەکان. زمانێکە زۆرترین دەستەواژەی سروشتی و سیما و وێنای هەمەڕەنگی هەیە. دەتوانین بڵێین زمانی دەنگی ئاو و با رەنگی بەفر و کۆلکەزێڕینە و لە هەمان کاتدا ئێرۆتیکیشە، چونکە سیمای سروشتی ژیانی سروشتیش دەگرێتە خۆی.

عەقڵ ئەگەر لە چیا دابەزێت دەتوانێت زمانیش دابەزێنێتە خوارەوە. مەسەلەکە تێکەڵبوونە بە شار، ئێستاش خەریکە تێکەڵ بە شار دەبین و زمانیش دەستەمۆی شار دەبێت. درێژدادڕی ناوێت. هەر توخمێکی سروشتیش دەتوانێت لە پرۆسەی بەکارهێنانی زمانیدا واتایەکی دیکەش بگرێتە خۆی. ئەمەش تایبەتمەندیی هەموو زمانێکە. بۆرۆکراسیش ڕەوتی بەڕێوەبردنی شارەکان و دەوڵەتە و ئەویش بە هەمان ئاقاردا دەڕوات.

**گرفتەکانی دیکەی زمانی کوردی وەکو ڕێنووس و ئەلف و بێ چ زیانێکیان لە گشەی زمان داوە و هاتنەئارای ڕوانگەیەك بەناوی جووت ستاندارد بوون بۆ دۆخی ئەمڕۆی زمانی کوردی بەڕای جەنابت پێویستە، یان نا؟**

ڕێنووس سیمای نووسراوی زمانە. تۆماری تایبەتمەندیی نیشانە زمانییەکانە لە ئاخنەی هەندێ هێمای بەدیکراودا. توخمی بەرهەست و ماتریالیستی و دیدارییە لە هێڵی ئاسۆیی زماندا. ڕێنووس ماك و بونیادی ژیاری مرۆڤە و تۆماری مێژوویيە و لەو دەنگانە پێکدێت کە بڵاو دەبنەوە و ئەگەر ڕێنووس نەبێت، جارێکی دیکە نایانبیستینەوە. کەوابوو ڕێنووس تۆماری بیستنی دەنگە زمانییەکان و بیرکردنەوەی بێدەنگە. گرنگیی ڕێنووس بۆ مرۆڤ و ژیارەکەی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت.

گرفتەکانی ڕێنووسی کوردی زۆر و زەوەندن. کێشەی دەربڕینی جیاجیا و هەروەها کێشەی ڕێزمانیش تەنانەت گەلێ جار لە ڕێگەی ڕێنووسەوە تووشی دەبین. کێشەی ڕێنووسی کوردی بەداخەوە کێشەیەکی قووڵە. لەبەرئەوەی ئەو دەنگانەی کە لە زمانی کوردی و دیالکتەکاندان هێشتا زۆر بە نالەباری دەنووسرێن و ڕێنووسی دەسکاریکراوی

ئارامی - عەرەبیش هێشتا زۆر کێشەی چارەسەر نەکردووە کە لەتوانای ئەم باسەدا ناگونجێت. ڕێنووسی لاتین بۆ ئێستا بەڕای من باشترین چارەسەرە.

جووت ستاندارد هەرچەند وەکو بیرۆکەیەك هەیە، بەڵام بۆ نەتەوەیەك کە کۆڵەکەی ناسیونالیزمەکەی زمانە نابێت باسیش بکرێت، چونکە لێکترازانی زیاتری لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش پەسند نییە. لە وڵاتێکدا کە کایەی سیاسی لەسەر بنەمای ناکۆکی و زادەی ناکۆکییە، بەداخەوە ئەم کێشەیە هەر دەمێنێت. ئەگەر سیاسەتی چەواشەگەری کۆتایی پێ بێت ڕەنگە بتوانین هەنگاوەکانی سەرەتا هەڵگرین.

بەڵام نابێت جووت ستاندارد وەك ئالتەرناتیڤ لەبەرچاو بگرین. ئەم زەینییەتە ترسناکە دەبێت لەنێو بچێت.

**پێوەندیی نێوان دەسەڵات و زمان چۆن دەبینی و چ ڕۆڵێکی لە لاوازکردن و گەشەی یەکتردا هەیە و ئەم پرسە بە نیسبەت زمانی کوردی لە باشوور چۆن دەبینیت؟**

بەشی یەکەمی پرسیارەکە، بەڵێ، دەسەڵات لە ڕێگەی زمانەوە شوناسی نەتەوەیی-سیاسی بەرهەم دێنێت و بۆرۆکراسی و سیستمی نیشانەیی بەگوێرەی هەیکەلی بەڕێوەبەری و ئۆتۆریتەی دەوڵەت لە گوتەزا زمانییەکان کە کۆدەنگییان لەسەرە، دەڕەخسێنێت و ئەمە ئەرك و کارکردەی دەسەڵاتە و دەبێت وا بێت. بەشی دووەمی پرسیارەکە کە پێوەندیی بە ڕێکخستنی زمان لە باشوری کوردستانە، بەڕاستی بێ وەڵام دەمێنێتەوە.

**پێناسە:**

- مەسعوود بابایی لەدایکبووی ۱۳٥٥ی هەتاوی (۱۹۷٦ی زایینی) شارۆچکەی نەوسوودی سەر بە شاری پاوەیە لە ڕۆژهەلاتی کوردستان.
- خاوەن بڕوانامەی لیسانسی زمانی کوردییە لە زانکۆی سەلاحەدینی هەولێر.
- یەکێکە لە شارەزایانی بواری زمانی کوردی.

- هەتا ئێستا جیا لە لێکۆڵینەوە لە بواری زمانی کوردی، چەندین بەرهەمی زانستی و فکریی لە زمانی فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی وەك: ۱- پێکهاتە و ڕاڤەی دەق، (٤ کتێب). ۲- هەقیقەت و جوانی، ۳- ئافراندن و ئازادی. ٤- جەجاڵ، یان دژە مەسیح، ٥- نیچە و مەسیحییەت و...

## زمانی کوردی لە ئێران و ئاستەکانی
## دیمانەیەک لەگەڵ ڕەزا شەجیعی
## نووسەر و وەرگێڕ

سازدانی: شەریف فەلاح

**کورتە مێژووی زمانی کوردی چۆن پێناسە دەکەیت، ڕەگ و ڕەچەڵەکی دەچێتەوە سەر کام یەك لە بنەماڵە زمانییەکان، خاڵی جیاوازی و هاوبەشیان لەگەڵ زمانی فارسی کە لە ناوچەیەکی جوگرافیایی هاوبەشدان، کامانەن؟**

سەبارەت بە بەشی یەکەمی پرسیارەکەت:

کەونینەناسان، شارستانییەتێکی مرۆڤایەتیی هاوشێوەی دێرینیان بەرچاو کەوتووە، کە دوای تەواوبوونی چەرخی تازەی بەردین، لەسەر ڕووبەرێکی زۆر بەرفراوانی سەرزەمینەکانی جیهانی کۆندا بڵاوبووەتەوە. لێرەوە زانایان گەیشتوونەتە ئەوەی بڵێن هەبێ و نەبێ ئەم شارستانییەتە چۆن هاوشێوە و یەکە، دەسکردی یەك گەلە. لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی شوێنەوار و پاشماوەکانی ئەو شارستانییەتە هەر لە هیندستانەوە بگرە تا ئەورووپای بە جارێ گرتووەتەوە، ناوی ئەو گەلەیان بە هیند و ئەورووپایی دیاری کردووە. ئەو گەلە وەك دەڵێن لە گەلێ هۆز پێکهاتبوو، پێش ئەوەی ئەم هۆزانە بکەونە کۆچ و بڵاو ببنەوە، لە نیشتمانە کۆنەکەی خۆیاندا بە درێژایی دەشتەکانی خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵاتی دەریای قەزوین (خەزەر) نیشتەجێ ببوون. هەمووی ئەو هۆزانەش کە بەگشتی ئەو گەلەیان لێ پێکهاتبوو، بە یەك زمان دەئاخافتن. ئەم زمانەش کە گەلانی ئارییایی ئیمڕۆ پێی دەدوێن هەمووی لەو زمانە هاوبەشەی زوویانەوە، لقیان هاویشتووە و جیابوونەتەوە.

زمانی هیندۆئەورووپاییش لە زمانێکی کۆنتری پێش مێژووەوە پەیدابووە و پەرەی سەندووە کە بەپێی بەڵگە مێژووییەکان لە هەزارەی پێنجی پێش لەدایکبوونی مەسیحەوە پەرەی سەندووە، ئەم زمانەش بە زمانی بەرایی هیندۆئەورووپایی دەناسرێت.

زمانی کوردی بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زمانناسان و ئەو خۆرهەڵاتناسانەی وا لەسەر زمانی کوردی دواون، لقێکە لە بنەماڵەی زمانیی هیندۆئەورووپایی.

زانستی زمانەوانی هەموو ئەو زمانانەی کە ئیمڕۆ نەتەوەکانی دنیا قسەی پێدەکەن بەپێی خزمایەتی و نزیکایەتییان لە یەکتر، لە ڕووی ڕێزمان، فۆنیتیك و وشەسازییەوە، بەسەر چەند بنەماڵەی گەورەی زمانیدا، دابەش دەکەن.

یەکەم: هیندۆئەورووپایی:

کە ئەویش خۆی هەندێك لقی لێ جودا دەبێتەوە، وەك: هیندۆئێرانی، کوچی، ئەرمەنی و نیزی و...

لقی هیندۆئیرانی خوی دەبێتە دوو لقی دیکە، کە بریتین لە هیندۆئیرانی و لقی ئێرانیش سێ چاخی هەیە: چاخی کەونینە، نێوەڕاست و نوێ.

دووەم: خێزانی سامی:

ئەم خێزانە زمانییە، زمانی هەموو ئەو نەتەوانە دەگرێتەوە کە لە ولاتانی میزۆپۆتامیا، دوورگەی عەرەبی و ژوورەوەی ئەفریقادا نیشتەجێ ببوون. وەك: عەرەبیی کۆن و نوێ، ئارامی، سریانی، ئەکدی، بابلی، کەنعانی و فینیقی و...

سێیەم: خێزانی ئورالی:

وەك: فەنلەندی، ئەستۆنی، مەجەری، تورکی، مەنانشۆ.

چوارەم: خێزانی چینی:

وەك: چینی، تایلەندی، بورمایی.

وەك ئاماژەمان پێدا، زمانی هیندۆئەوروپایی لە چەند لقێك پێکهاتووە. یەکێك لەم لقانە ناونراوە خێزانی زمانی "ئاریایی" (هیندۆئەوروپایی) و ئەویشیان بەسەر دوو دەستەی گەورەی: "هیندی- ئێرانی"دا دابەش کردووە. سێ قۆناغی مێژووییشیان بۆ دووەمیان دیاری کردووە. لە چاخی کۆنی زمانە ئێرانییەکاندا، زمانی مادی، ئاڤێستایی و پارسیی کۆن دەبینین. لە چاخی نێوەڕاستدا، پارتی و پەهلەوی. لە چاخی تازەشدا زمانی فارسی و کوردی.

خێلاتی ئاری کە روویان کردووەتە رۆژهەلاتی ئەمرۆ، بۆئەوەی لێك جودا ببنەوە ماوەیەك لە شوێنێك پێکەوە نیشتەجێ بوون، کە پێی دەگوترا ئێران ویج (ئاریان واچ) -بەپێی وتەی ئاڤێستا-. پاشان هیندییەکان بەرەو هیند و ئەوانی دیش بەرەو ئێرانی ئێستا هاتوون. مادەکان بەشێك بوون لەو خێلاتەی بەرەو ئێرانی ئێستا هاتوون، (رۆژئاوا و نێوەڕاستی ئێران). لە سالی ۸۳۵ی بەر لە زایین لە بەردەنووسەکانی پاشایانی «ئاشووری»دا ناویان هاتووە و لە سەدەی حەوتەمی پێش عیساوە زمانەکەیان توانیویەتی ببێتە زمانی هاوبەشی هەموو هۆز و تیرە و خێلەکانی خاکی ماد.

بەپێی فەرهەنگی «موعین» هەندێك وشەی ئەم زمانە لە زمانی (یونانی)دا ماوەتەوە، بەلام سەرچاوەی سەرەکیی ئاگاداری ئێمە لەم زمانە بەردەنووسەکانی شاکانی هەخامەنشییە کە دوای مادەکان هاتوونەتە سەرکار.

زمانی ئاڤێستایی زمانی بەشێك لە خەلکی رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلاتی ئێران

بووه و کتێبی ئاڤێستا له چەرخە جۆربەجۆرەکاندا بەم زمانە نووسراوەتەوە.

بەشێك لە گاتەکان، واتە سروودەکان بە زاراوەیەکی کۆنتر لەم زاراوە نووسراوە. ئەمە لەبیر نەکەین گاتەکان کۆنترین بەشی ئاڤێستان. ئاڤێستا بە خەتی ئاڤێستایی یان (دین دەبیری) نووسراوەتەوە و پێدەچێت ئەم خەتە لە دەوروبەری سەدەی ٦ی پێش زاییندا لە خەتی پەهلەوییەوە وەرگیرابێت.

مەسەلەی مادی بوون و نەبوونی ئەو زمانەی کە ئێستا پێی دەڵێن ئاڤێستایی، شتێکە هەروا دەمێنێتەوە تا ئەو رۆژەی لەبارەی زمانی (مادی)یەوە زانیارییەکی ئەوەندە زۆر دەکەوێتە بەردەستی زانایان کە بتوانن لەگەڵ زمانی ئاڤێستایی بەراوردی بکەن و هەڵیسەنگێنن و رای خۆیانی لەسەر دەربڕن.

پارسیی کۆن (فُرس قدیم، فُرس هخامنشی) زمانی فەرمیی خەڵکی ئێران لە چاخی «هەخامەنشی»دا بووە. گەورەترین بەڵگە بۆ ئەم زمانە بەردەنووسەکانی پاشا هەخامەنشییەکانە لە دەوروبەری (٦١٠ -٥٨٠ پ ز). بەردەنووسی بێستوون گەورەترین بەردەنووسی ئەم زمانەیە.

مۆرفۆلۆژی و سینتاکسی پارسیی کۆن و ئاڤێستا، بە تەواوی نەناسراوە، بەڵام دەتوانین بە کۆنترین زمانی هیندۆئەورووپایی ناسراو، بیانناسین. لە پارسیی کۆندا (هەشت) شێوە بۆ ناو بینراوەتەوە و شێوەی گەردانکردنی کردار، شێوەیەکی زۆر گران و ئاڵۆز دیارە.

لەسەر قۆناغی نێوەڕاستی زمانی کوردی کە تا ئێستا لەلایەن هیچ زمانەوانێکەوە باس نەکراوە، هەڵوێستەیەك دەگرین، بە پشتبەستن بە هەندێ بەڵگەی نووسراوەی مێژوونووسانی عەرەب و جوگرافیازانانی کۆنی عەرەب کە سەردانی ئێرانیان کردووە و باسی نەژاد و زمانی گەلانی ئێران و کوردیشیان کردووە، بەم شێوەیە بۆ قۆناغی نێوەڕاستی زمانی کوردی دەڕوانم و ئەوەش بیر دەهێنمەوە کە لە پرۆسەی (ناوناندا) ئێمەی کورد دواکەوتووین، واتە لە کاتی خوێندنەوەی کەلەپووری کۆنی ناوچە و وڵاتی ئێرانیشدا لەلایەن رۆژهەڵاتناسەکانەوە ئێمە نە دەوڵەت بووین و نە دەسەڵات و هاوکاتیش خۆمان بەشێوەی زانستی و مەیدانیش خەریکی ناونسان نەبووین و گەلێك جار لەم پرۆسەیەدا دەسەڵات، نازانستیبوونی وەکو زانست و هەقیقەت چەسپاندووە، ئەوەتا کەسێکی وەك دکتۆر خانلەری قەت ئیعتراف بە بوونی نەژاد و بوونی زمانی

کوردان لە مێژوودا ناکات و کوردبوون زۆرتر وەکو پیشە و کار دەخوێنێتەوە.

لە دابەشکردنی قۆناغەکانی زمانە ئێرانییەکاندا، قۆناغی نێوەڕاست لە دامەزرانی دەسەڵاتی ئەشکانییەکانەوە دەست پێدەکات و بە هاتنی ئیسلام بۆ ئێران کۆتایی دێت. لەم قۆناغەدا دوو زمان لەلایەن زمانەوانانی ئێرانی و رۆژهەڵاتناسانەوە دیاری کراوە، زمانی فارسیی نێوەڕاست و زمانی پەهلەوی.

زمانی فارسیی نێوەڕاست کە مێژوو و ئەدەب و بەردەنووسەکانی دەرباری ساسانی پێ دەنووسرا و وەکی تریش زمانی پەهلەوی بە زمانی رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵاتی ئێران ناوزەرد کراوە، کەچی گەلێ بەڵگەی مێژوویی و بڕوای زانستی هەن کە بەرپەرچی ئەمە دەدەنەوە، سەرنجێکی دیکەش ئەمەیە کە ئاخۆ لە دابەشکردنی زمانە ئێرانییە نێوەڕاستەکاندا قۆناغی نێوەڕاستی زمانی کوردی لە کوێیە و بۆچی بزرە؟ ئێمە بزرێتییەکە دەبەستینەوە بە پرۆسەی ناونانەوە، کە باسمان کرد، بەڵام لەسەر زمانی پەهلەوی با هەندێك بدوێین: ئاخۆ زمانی پەهلەوی زمانی کوردییە؟

هەندێك لە زمانناسان، زمانی پەهلەوییان بە زمانی دەربار و گەلی پارت زانیوە و شوێنی سەرهەڵدانی بە رۆژهەڵاتی ئێران و خۆراسانی ئێستا دەزانن، بەڵام چەند خاڵێکی جێگەی سەرنج لەم بیرۆکە و بۆچوونەدا هەیە:

١- رۆژهەڵاتی ئێران دواتر بووەتە یەکەم جێگەی سەرهەڵدانی ئەدەبی (دەری)، کە قۆناغی تازەی زمانی فارسیی نێوەڕاستە، واتە "پان پارسك"، یان ئەوەی زمانی ئێرانیی باشووری رۆژئاوایی پێدەڵێن و ئەمە زیاتر لەوەمان نزیك دەکاتەوە کە زمانی خۆراسان لە دیالێکتەکانی زمانی فارسی بووە، هەر بۆیەش ئەدەبی فارسی، نە وەك پەهلەوی تێدا دەخولقێ.

٢- مەرج نییە زمانی قەبیلەی پارت زمانی هەموو رۆژهەڵاتی ئێستای سنووری ئێران، یان ئەوسای سنووری ئێران بووبێت. مەسعوودی لە (مروج الزهب) لاپەڕە ٢٢٨دا بەم شێوەیە باسی ئەشکانییەکان دەکات: «ئەوان دەسەڵاتی «جبال»یان بەدەستەوە بوو. جبال واتە: دینەوەر- نەهاوەند، هەمەدان، ماسبەزان و ئازەربایجان و هەر کامەیان دەسەڵاتی دەگرتە دەست نازناوی گشتیی ئەشکانی وەردەگرت».

هەڵبەت وەکو سەرنجێك ئەمەش باس بکەین کە سنوورەکانی جبال لەلای نووسەران هەندێ جیاوازییان هەیە، بۆ نموونە لە (احسن التقاسیم)دا بەم شێوەیە هاتووە:

شارەکانی کوێستان (واتە جبال، یان ڕۆژئاوای ئێران) بریتین لە: ڕەی- هەمەدان- ئەسفەهان- دینەوەر- کرماشان- نەهاوەند- قوم- کاشان- قەرچ و قەتران. پاشان دەڵێت: من ئەم وڵاتەم دابەشکردووە بەسەر سێ حەوزە و حەوت بەش و ئەسفەهانیشم لەگەڵ خستووە.

دواتر نووسەری (احسن التقاسیم) دەڵێت: لە هەندێ کتێبدا خوێندوومەتەوە کە ڕەی و ئەسفەهان لە شارەکانی ناوچەی (پەهلەوی) نین، بەڵکو پەهلەوی بریتییە لە هەمەدان، ماسبەزان و ماهی بەسرە کە نەهاوەند بێت و ماهی کوفە (دینەوەر). مێژوونووسان باسی دوو ماد یان ماه دەکەن، کە بریتین لە ماه، یان مادی گەورە و مادی بچووک کە ئاترۆپاتگان یان ئازەربایجانی ئێستایە.

(حمزە ابن صفهانی) لە زمانی زەردەشتییەکی هاوچەرخی خۆیەوە دەگێڕێتەوە: پەهلەوی زمانێك بووە کە شاکان لە دانیشتن و دەرباری خۆیاندا قسەیان پێکردووە و پێی دەڵێن فەلە (پەهلە) و ئەم ناوە پێنج شارە، واتە ئەسفەهان، ڕەی، هەمەدان و ماهی نەهاوەند و ئازەربایجان دەگرێتەوە. لە دابەشکردنی کۆندا وڵاتی ئێران بە سێ بەشی گەورە دابەشکراوە ١- عێراقی عەجەم. ٢- جبال. ٣- فارس.

(احسن التقاسیم) دانیشتووانی وڵاتی فارس بە کورد و فارس دادەنێت و سێ زمانیان بۆ دیاری دەکات. پەهلەوی، فارسی و عەرەبی کە دەخیلە.

(صورة الارض) لەبارەی کوردانی دانیشتووی فارسەوە دەڵێت: "ژمارەی ڕەشماڵی کوردەکانی دانیشتووی وڵاتی فارس پێنجسەد هەزار ڕەشماڵ تێدەپەڕێنێت". ئەم ئیشارەتانە بۆ کوردەکانی وڵاتی فارس لە (مسالك و ممالك)، (صورة الارض) و (احسن‌التقاسیم)یشدا دووبارە کراوەتەوە. لەم نموونانەدا بینیمان کە بەکارهێنانی زاراوەی پەهلەوی، واتە هەرئەوەی کە بەپێی بەڵگەنامەی دینی (مانەوی) پەهلەوانیك نێونراوە بۆ ناوچەیەکی فراوان کە بەرفراوانیی جوگرافیاییەکی جیاوازی لەلای هەر نووسەرێك جیاواز وتراوە، کەواتە ئێمە دەتوانین بڵێین:

١- زۆرجار لەلایەن نووسەرانەوە زمانی کوردی بە پەهلەوی ناوبراوە. ٢- زۆری ئەو زمانانەی کە جیاواز بوون لە زمانی فارسی بە پەهلەوی ناوبراون. ٣- ئەو زمانانەی کە لە باکووری ڕۆژئاواوە تا نێوەڕاستی ئێران بە پەهلەوی ناوبراون، زێدەتر نزیکییان لەگەڵ یەکتر هەیە تا لەگەڵ زمانی فارسی. کەواتە دەتوانین وێنەیەکی وەها بۆ

قۆناغی نێوەڕاستی زمانە ئێرانییەکان و زمانی کوردی دیاری بکەین.

**کوردیی کۆن (مادی) => پەهلەوی (پەهلەوانیك) => کوردیی نوێ**

سەبارەت بە بەشی دووەمی پرسیارەکەت دەبێت بڵێم پرسیارێکی بەربڵاو و گشتییە و بو وەڵامدانەوە پێویستە لەسەر لایەنەکانی زمانی فارسی و کوردی بدوێین، ئەمەش پێویستی بە توێژینەوەیەکی زانستییانە هەیە و باسکردن لەو بابەتە دەرفەت و مەجالی تایبەت بە خۆی پێویستە. ئەڵبەت ئەوەش بڵێین لەسەر ئەم بابەتەش کۆڵراوەتەوە و وەك نموونە دەتوانم ئاماژە بدەم بە وتارێکی زانستی لە نووسینی « یووسف شەریف سەعید» بە ناوی « پێوەندیی زمانی کوردی و فارسی و جیاوازی و لێکچوونیان» کە لە گۆڤاری زمانەوان ژمارە ۲ بڵاوکراوەتەوە.

**تایبەتمەندییە زانستییەکانی زمانی کوردی کامانەن، پێگەی زمانی کوردی لە ئاستی زمانە دەوڵەمەندەکانی جیهان چۆن لێك دەدەیتەوە؟**

دەربارەی تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردی وەك پرسیاری پێشوو دەگەڕێنمەوە بۆ کتێبێکی «د. شێرکۆ بابان» لەژێر ناوی «لە مۆرکە تایبەتییەکانی زمانی کوردی».

سەبارەت بە بەشی دووەمی پرسیارەکە:

ناتوانین زمانێك بە چاکتر یان خراپتر لەوی دیکە بزانین، چونکە زمان لەو جێگەیەدا کە دێتە سەر ئەوەی کەرەسەیەك بێت بۆ پێوەندی گرتن بە جیهانی

دەوروپشتەوە، لەلای هیچ گەلێك تووشی ناتوانایی نابێت، چونکە ئەو خەڵکە چەندەی بیریان کردووەتەوە و چەندەی جیهانیان ناسیوە و پشکنیویانە، ئەوەندە وشەیان داناوە. ئەمە پێوەندیی بێ بڕانەوە و نزیکی مرۆڤ و زمان پیشان دەدات. ئەوەی کە باسمان کرد پێوەندیی مرۆڤ و زمان بوو بەگشتی.

چۆمسکی وتەیەکی بەناوبانگی هەیە و دەڵێت ئەگەر زمانێك تەنانەتلا ٤٥٠ وشەی هەبێت و ٤٥٠ ئاخێوەر، ئەوا ئەو زمانە زمانێکی زیندووە. ئەم وتەیە لەنێو خۆماندا گەلێك لایەنگری هەیە و سەرەڕای ئەوەی راستە، لایەنی نێگەتیڤی زۆرە. بەڵێ، راستە ئەمڕۆکە زمانی کوردی زمانێکی زیندووە و ئاخێوەرێکی زۆر قسەی پێدەکەن و زمانەکە رەگی هەرە سەرەکیی شوناسی کوردیشە.

جیا لە هەموو ئەمانەش ئەوەی واقیعی زمانی کوردییە، ئەم راستییەیە کە زمانی کوردی بۆ نزیکی سەدەیەکیشە لەگەڵ کێشەیەکی گەورە رووبەڕووبووەتەوە و بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین ئەم کێشەیە بە کێشەی هاوچەرخبوون ناوزەد بکەین.

زمانی کوردی لەم جیهانە نوێیەدا لەگەڵ هەندێك دیاردە و بابەت رووبەڕووە کە تا ئێستا خۆی بەشێوەیەك لە شێوەکان ئەزموونی نەکردووە و ئاست و رادەی ئەم دیاردە و بابەتانەش ئەوەندە زۆر و زەبەندە نەبێتەوە و کێشەکە لێرەوە دیار دەکەوێت کە ناتوانێت خۆی لەو دیاردە و کێشانە بدزێتەوە و ناشتوانێت تەعبیریان بکات.

بە هەڵدانی دروشمی پاراستن و پاکڕاگرتنی زمان یان بەستنەوەی بە رۆحی نەتەوەیی و قەناعەتکردن بە ئەدەبیات و خۆبەستنەوە لە جەغزی چەند شیعر و بەدەگمەن چەند رۆمانێك و بابەتی لەو چەشنە و داشاردنی ئەم قەیرانە، نە خزمەت بە زمان دەکرێت و نە زمانی کوردیش دەپارێزرێت. بە رێژەی زمانانی دەوروبەریشی دۆخی ئێستای زمانی کوردی دۆخێکی باش و گونجاو نییە تا ئێستاش زۆر بەستێن هەن کە زمانی کوردی نەیتوانیوە خۆی بدا لە قەرەیان و خۆی دوور راگرتووە.

بە کورتی دەتوانم بڵێم تەمسیلی زمانی کوردی دەقاودەق لە ئێستایدا تەمسیلی کەسێکی نیوە زمانە کە خەونێکی دیوە و مەجبووری دەکەن بیگێڕێتەوە.

رەوت و قۆناغەکانی گەشەکردنی زمانی کوردی لە رۆژهەڵات چۆن پۆلێنبەندی دەکەیت، زمانی کوردی بەشێوەی یاسایی و فەرمی نەهێڵراوە بخوێنرێت، بەڵام

**گەشەشی کردووە و لە فەوتان رزگاری بووە، هۆکارەکانی گەشەکردنی لە چیدا دەبینیت؟**

گومان لەوەدا نییە دەستنیشانکردنی ئەو هۆکارانەی بوونەتە پالپشت و یاریدەر بۆ رزگارکردنی زمانی کوردی لە فەوتان، هەولێکی زۆر بەپێز و باشە، بەلام لە هەمان کاتدا کارێکی ئەستەمە. من وەك خۆم دوو هۆکار زۆر بە گرنگ دەزانم یەکەم ناسیۆنالیزم و دواتر هاتنی ئیسلام. وەك مامۆستا زەبیحی لە «قامووسی زمانی کوردی»دا ئاماژەی پێداوە هاتنی ئیسلام لەو کات و ساتە مێژووییەدا زۆر بە هانای زمانی کوردییەوە هاتووە.

سەبارەت بە رەوت و قۆناغەکانی گەشەسەنی زمانی کوردی لە رۆژهەلات دەتوانین بلێین زمانی کوردی تا سەردەمی کۆمار تاقە زمانی ئەدەبە و ئەم زمانە تەنها توانیویەتی بەشێوەیەك ئەدەب بەرهەم بهێنێت. هاوکات لەگەل هاتنە سەرکاری کۆماری کوردستان زمانی کوردی دەرفەتێکی تایبەتی بۆ دەرەخسێت و دەبێتە زمانی فەرمی. ئێرە سەرەتای دەسپێکردنی ئەزموونێکی تازەیە بۆ زمانی کوردی کە تا ئێستاش بەردەوامە.

لەگەل دامەزراندنی کۆمار، زمانی کوردی دەبێتە زمانی رەسمی و زمانی سیستمی پەروەردە و سیستمی ئیداریی هەرێمەکە. یەکەم هەنگاو، کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی ستالینیزم* ە زمانییەکەی دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی لە کۆمەلگەی کوردەواری - کوردستانی ئێران-دا دەبێت بسڕێتەوە، ئەمەش لەسەر دەستی کۆمار لە رێی شەرعییەت بەخشین بە رەوتی کۆمەلایەتیبوون لە رێگەی ئەم زمانەوە و دامەزراندنی سیستمێکی راگەیاندن بەم زمانە کرا. ئەم بزاڤەی کۆمار جیا لەوەی دامەزراوە و رێکخراوەکانی کۆماری گرتەوە، ناوەندە ئایینی و مەدەنییەکانیشی گرتەوە، بەشێوەیەکی وەها کە خوتبەی نوێژی هەینی لەپاش دامەزراندنی کۆمارەوە بە زمانی کوردی دەخوێنرا.

بۆ زمانی کوردی لە رۆژهەلاتدا یەکەم سەرەتاکانی هاوچەرخبوونی لە کۆمارەوە دەست پێدەکات و ئەم دەسپێکە ئەنجامی دەرکیی ئەو پێداویستە مێژووییە بوو بۆ

---

* بەو قوتابخانەو مەکتەبە فیکرییە دەوترێت کە پێڕەوی لە تیۆری و بۆچوونی ستالین دەکەن.

تەیارکردن و نوێکردنەوەی زمانی کوردی. ئەگەر ئەم دەسپێکە وەك قۆناغی یەکەمی گەشەی زمانی کوردی بناسین، قۆناغی دووەم دەبێتە ئەو بزاڤە فەرهەنگی و رۆشنبیرییە کە لەپاش شۆڕشی ٥٧ی گەلانی ئێرانەوە دەستی پێکردووە.

دەسکەوتەکانی ئەو دوو قوناغە بۆ زمانی کوردی زۆرن. بەتایبەت لە بواری: فەرهەنگنووسی، زمانی راگەیاندن، وەرگێڕان، هەوڵ بۆ ئەزموونکردنی چەشنێك زمانی زانستی.

**ئاخۆ بەربەستە فەرهەنگییەکان و هەروەها ئەو دوژمنکارییانەی کە لەلایەن دەوڵەتانەوە لەدژی زمانی کوردی پیادە کراون، دەتوانین وەکو جینۆسایدی فەرهەنگی و زمانی پێناسەیان بکەین؟**

«بنجامین لی ورف» بەپێی بیرۆکەیەکی «ساپیر»، زمان بە سیستمێکی هێمایین و سەربەخۆ دەزانێت کە بەردەوام سنووری ئەزموونەکانمان دەستنیشان دەکات و لە قەوارە و چوارچێوەیەکی تایبەتدا دایدەڕێژێت و دەڵێت: زمان چەشنێك لۆژیك و چوارچێوەی گشتیی گەڕاندنەوە ساز دەکات و لەم رێگەیەوە شێوەی بیرکردنەوەش دائەسەپێنێ. ئەگەر فەرهەنگ بەشێوەیەکی گشتی بەسەر نموونەی رەفتاری و شێوەی هەڵسوکەوت و پێوەندیی کەسەکان لە کۆمەڵگەدا بزانین، بێگومان دەوری زمان لە چوارچێوە داڕێژی و بیچماندنی سەرنموونە رەفتارییەکان و هەروەها بیچم بەخشی بەشێوەی هەڵسوکەوت و پێوەندییەکان، دەورێکی چالاکە و هاوکات کاریگەریی لەسەر لایەنەکانی فەرهەنگ دەنوێنێت و خۆیشی وەك سیستمێکی هێمایین و سەربەخۆ کاریگەری وەردەگرێت و زۆرجار لەبەر بنەڕەتی بوونی کاریگەرییەکانی -چ پۆزەتیف و چ نێگەتیف- ناچارە کاژ بخات و شێوەی هاتنەکایەی خۆی بگۆڕێت.

ئەگەر لەم روانگەیەوە و بەپێی پێوەندییەکانی زمان و کۆمەڵگا و فەرهەنگ بۆ ئەم دیاردانە بڕوانین، گومان لەوەدا نییە کە لەگەڵ «ورف» هاودەنگ دەبین کە جیا لەوەی زمان یەکەیەکی سەربەخۆیە، بەڵام کاریگەری وەرگرتنەکەی لە کۆمەڵگە و فەرهەنگ وای لێکردووە وەك توخمێکی بەرفرەهی فەرهەنگی بیناسین کە لەسەر یەك بە یەکی تاکەکان تا ئاستی چوارچێوەبەخشین بە ئەزموونەکانمان کاریگەری دادەنێت.

لێرەوەیە گرنگایەتیی توخمی زمان لەلای سیاسییەکان تا ئاستێکی بەرز بەرجەستە دەبێتەوە.

بۆ نموونە: بەرنامەی (English only) ئەمریکاییەکان لە ناوچە سوورپێست نشینەکانی ئەمریکادا نموونەیەکی بەرچاوی گرنگیدان بە زمانە لە بەڕێوەبردنی پلانی فەرهەنگی و سیاسیدا.

هەر نەتەوە و دەوڵەتێك بێگومان بۆ بەڕێوەبردنی کار و درێژەدان بە ژیانی سیاسی و فەرهەنگیی خۆیان، پێویستیان بە ئاوڕدانەوەیەکی جیدیی و بنەواشەیە لە پانتایی فەرهەنگدا. ئەم ئاوڕدانەوەیە چ بەشێوەی خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی لایەنێکی فەرهەنگ بێت، یان بەشێوەی سڕینەوەی هەندێك دیاردە و لایەن، یان بەستێن خۆشکردن بێت بۆ هەندێك لایەن و دیاردەی نوێتر، بەگشتی لەژێر پرۆسەی «فەرهەنگسازی»دا دەخوێنرێنەوە. لەڕاستیدا فەرهەنگسازی پرۆسەیەکی چەند ڕەهەندە و لە ڕێکخراوە و دامەزراوە فەرهەنگی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە بگرە تا کەسایەتی و ڕۆشنبیر و نووسەر و هونەرمەند و دەوڵەتەکان لەم پرۆسەدا، هەرکام دەوری تایبەتیی خۆیان دەگێڕن. لەو ڕووەوە کە فەرهەنگ هەم خاوەن پێوەندییە و هەم بە زمانەوە گرێدراوە، هەر چەشنە پلانێکی فەرهەنگی لە پرۆسەی گەورە و بەربڵاوی فەرهەنگسازییدا ناتوانێت، بێ ئاوڕدانەوە لە زمان وەك دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتی و سیستمێکی هێمایین لە فەرهەنگ، کارێکی تەواو سەرکەوتوو بێت، چونکە «سایێر» گوتەنی ئەمە زمانە، ئەزموونی فەرهەنگسازی لە چوارچێوە و قەوارەیەکی دیاریکراودا دەستنیشان دەکات. کەوابوو لە هەر چەشنە پڕۆژە و پرۆسەیەکی فەرهەنگسازیدا ناسینی زمان و بەرنامەڕێژیی زمانی یەکەمین پێویستی هەر چەشنە پرۆگرامێکی فەرهەنگی لەو چەشنەیە.

ئێستا پرسیارێك دێتە گۆڕێ، بۆچی بە «پرس»کردنی زمان تا ئەو ڕادەیە دەبێت بایەخی پێ بدرێت؟

بە باشی دەزانم، بە خێرایی بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە پێنج بۆنە کە «کریستاڵ» لە کتێبی "مەرگی زمان"دا دەستی خستووەتە سەری، ئاماژەی پێ بدرێت.

- بایەخداربوونی فرەچەشنی زمانی.

- بایەخداربوونی زمان وەك كەرەستەیەك بۆ دەربڕینی شوناس.
- بایەخداربوونی زمان وەك سەرچاوەیەكی زانیاریی مێژوویی.
- بایەخداربوونی زمان وەك بابەتێك كە لە خۆیدا جێی سەرنجە.
- بایەخداربوونی زمان وەك بەشێك لە زانستی مرۆیی.

ئەوەی لای سیستمە سیاسییەكان زۆر گرنگە بۆنەی دووەم و سێیەمە و كاردانەوەی ئەم دوو فاكتەرەیە ناچاریان دەكات توخمی زمان لە پرۆسەی نەتەوەسازی و فەرهەنگسازیدا تا رادەی پاراستنی نەتەوە و نیشتمان بەرجەستە بكەنەوە.

زمانی هەر تاك و نەتەوەیەك جگەلە كەرەستەی پێوەندی، كەرەستەیەكە بۆ دەربڕینی شوناس. هەر كوردێك ئەگەرچی لەگەڵ زمانانی دیكەدا ئاشناش بێت، بەلام بەردەوام شوناسی تاك و كۆمەڵایەتیی خۆی لە رێگەی زمانی دایكییەوە وەردەگرێت، زمانێك كە پڕە لە رەنگدانەوەی رووداوە مێژووییەكان و ئەو بەسەرهاتانەی بە درێژایی مێژوو ئەو گەلە دیویەتی. روونە پاراستن و پەرەپێدانی ئەو زمانە دەبێتە هۆی پاراستنی سنوورە فەرهەنگی و مێژووییەكانی و پاڵپشتێكی گران و قایمیشە بۆ كیان و شوناسی سیاسی.

**چۆن دەڕوانیتە پرسەكانی: (زمانی یەكگرتوو)، (زمانی ستاندارد) خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان، مەسەلەی جووت ستانداردبوون لە زمانی كوردیدا كە ئێستا هێندێ لە شارەزایانی زمان باسی لێ دەكەن چۆن پێناسە دەكەیت، بەربەستەكانی بەردەم پێكنەهاتنی زمانی یەكگرتوو بەلای بەڕێزتەوە كامانەن؟**

هەر وڵاتێكی سەربەخۆ پێویستی بە زمانێكی نەتەوەیی هەیە، دەستنیشانكردنی وەها زمانێك بۆ ئەو نەتەوانەی تازە بە سەربەخۆیی دەگەن، یان بانگەشەی سەربەخۆیی دەكەن، كارێكی سانا و بێ گیروگرفت نییە. هەر چەشنە بیركردنەوەیەك لەم بارەیەوە دەبێت بەپێی بەرنامەڕێژییەكی تەواو هوشیارانە بێت كە بتوانێت لەگەڵ دۆخە كۆمەڵایەتی و سیاسی و هاوكات خواستە فەرهەنگییەكانی هاوڵاتییاندا تەعامولێكی گونجاو بكات.

بەرنامەڕێژیی زمان لەسەر سێ رەهەندی «هێشتنەوە»، «بەردەوامی» و «دروستكردنەوە» وەستاوە. گرنگیی هێشتنەوە لەوەدایە دەتوانێت گەرەنتیكاری چەمكی

نەتەوە و نەتەوەخوازی بێت لای میللەت و بەردەوامی دەتوانێت پاڵپشتێکی هەرە گرنگ بێت بۆ دیسیپلینی کۆمەڵایەتی، هەڵبەت ئەو هۆکارەی دەتوانێت سیمایەکی جوان بۆ ئەو دوو ڕەهەندە بڕەخسێنێت دروستکردنەوەی بەردەوامە لە پانتایی زماندا. کەوابوو گرنگترین بەشی بەرنامەڕێژیی زمان هەمان ڕەهەندی دروستکردنەوە و دەوڵەمەندکردنی زمانە، کە ئەمەش چەند لایەنی بۆ دەستنیشانکراوە، وەك: ئافراندنی وشە، ڕێنووس، پێوەر دروستکردن، کارکردن لەسەر واریانسیی زمانی.

زمانی ستاندارد یان زمانی پێوەر هەمان زمانە کە نەتەوە و وڵاتی سەربەخۆ پێویستی پێیەتی، هەم وەك زمانی فەرمی، هەم وەك فاکتەرێك لە فاکتەرەکانی شوناس.

من وەك خۆم لەو قەناعەتەدام حکومەتی کوردی، لەمە زیاتر بۆی نییە ئەم ئەرك و بابەتە دوابخات. هەرچەند بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ تا ئێستا ئاگامان لە ڕاوبۆچوونیان سەبارەت بە زمانی پێوەر هەیە، بەڵام خۆ حکومەت و هەمووان ئاگادارین چ دۆخێکی ناشیاو سەبارەت بە زمانەکەمان خەریکە دێتە ئاراوە.

ڕاشکاوانە دووپاتی دەکەمەوە لە هیچ شوێنێکی دنیادا تۆ نابینی حکومەت هەبێت و سەبارەت بە دۆخی زمانیی خۆی سیاسەت و پلانی دیاریکراوی نەبێت. بیری نەکەین حکومەتی هەرێم تەنیا سەرچاوەی خاوەن شەرعییەتە بۆ ئەم بابەتە گرنگە.

جا ئێستا سەبارەت بە «جووت ستاندارد»:

بە بڕوای من لە زۆر شوێنی دنیادا کەم هەڵکەوتووە «یەك وڵات و یەك زمان» هاوکاتی یەك بن. ئێمەی کوردیش لەم دۆخە بەدەر نین. سەرەڕای ئەمانەش خۆ هەن ڕۆژهەڵاتناس و بیرمەندی وا کە دەڵێن کورد خاوەنی چەند زمانە...

بەڵام بە نیسبەت کوردستانی باشوور و ڕۆژهەڵات بەگومانم هیچ ڕێگەیەك جیا لە ناسینی «سۆرانی» وەك زمانی پێوەر بۆ کەس نەماوەتەوە. شایەتحاڵیشم ئەم خاڵەیە هەموو دانیشتووانی ئەم دوو بەشەی کوردستان بەبێ لەبەرچاوگرتنی زاراوەکانی خۆیان بەم زمانە دەنووسن.

بیرۆکە و پلانی «زمانی یەکگرتوو» بە بڕوای من پاش یەکلایی بوونی ئەم کێشەیە دەتوانێت لە خزمەت دەوڵەمەندکردن و بەهێزترکردنی زمانی پێوەردا بێت و ئەوکات

بیرۆکه و پلانێکی زۆر بەهێزە. ئەگەر قایل بەم دواکەوتنە، بۆ ئەم بیرۆکەیە نەبین، ئەوا تەنیا بیرۆکەیەك دەبێت و بەس وەك تا ئێستا بووە.

**مەسەلەی نووسین بە زاراوە لەناو زمانی کوردیدا چۆن لێك دەدەیتەوە، لە نەبوونی زمانی یەکگرتوودا ئاخۆ دەکرێت وەك خزمەت لە قەڵەم بدرێت، لە داهاتوودا گرفت ساز نابێت؟**

ئەگەر مەبەستتان نووسین بەو زاراوانەیە کە لە زمانی پێوەر جیان، بەگومانم هیچ کێشەیەك ساز ناکەن، بەمەرجێك سیستمی سیاسیی کوردی واتە حکومەتی هەرێم بەرنامە و سیاسەتەکانی خۆی سەبارەت بە زمانی پێوەر دیاری بکات. ئەگەر ئەو مەرجە بێتەدی، ئەوا نەك تەنیا خەساریان نییە، بەڵکو بگرە لە زۆر شوێندا لە رێگەی بە دیارخستنی توانا و پوتانسییلەکانی زاراوەکانەوە دەتوانن خزمەتیش بکەن.

ئەگەر حکومەتی هەرێم سیاسەتە زمانییەکانی خۆی زۆر بە روونی و راشکاوانە دەرنەبڕێت و لەبەر مەسڵەحەتی کاتی و حیزبی و بۆنە سیاسییەکان، ئەم پرس و بابەتە بگوازێتەوە بۆ کات و ساتێکی نادیار، جیا لەوەی هیچ مەبەستێکی سیاسیی پتەو و بگرە حیزبی ناپێکێت، بەڵکو زۆر لە دژی بەرژەوەندیی زمانی کوردی دەکەوێتەوە، وەك ئەوەی تا ئێستا بەسەر جەستەی نیوەگیانی ئەم بەستەزمانەی هێناوە.

**سەرهەڵدانی گۆڤاری سروە و ئەو شەپۆلە ئەدەبی و فەرهەنگییە بەگشتی چۆن دەبینیت و چ کاریگەرییەکی لە بووژانەوەی زمان و ئەدەبی کوردی لە رۆژهەڵات هەبوو؟**

ئەگەر بە چاوێکی بێلایەنانەوە بڕوانین سروە و گۆڤار و رۆژنامەکانی دیکە زۆر خزمەتێکی فەرهەنگییان کردووە، بەڵام گرنگیی سروە لێرەدایە لە دابڕانێکی مێژوویی تایبەتدا گەلێك دەوری بینیوە (لایەنە ئیجابییەکەی لێرەدا مەبەستە)، کە بەرهەمەکەی بەشێوەیەك نەپچڕانی جەماوەر بووە لە گوتاری ئەدەبی و ناسیۆنالیستی کوردی. لە پاش شۆڕش ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی (١٩٧٨ی زایینی)ەوە تا کۆتایی دەیەی ٦٠ی هەتاوی (١٩٨١ی زایینی) سروە وەك تاقە گۆڤاری کوردی خوێنەرێکی زۆر و تەنانەت لایەنگری زۆریشی هەبووە و لێرەوە کاریگەریی تەواوی نواندووە. من وەك خۆم

لانیکەم وا تێدەگەم سروە لە بواری دروستکردنی خوێنەر و پەروەردەکردنی بەرەیەکی کوردی خوێن و کوردی نووس دەورێکی زۆر باشی گێڕاوە، هەڵبەت تا نێوەڕاستی دەیەی ٦٠ی هەتاوی (١٩٨ی زایینی).

لە نێوەڕاستی دەیەی ٦٠ی هەتاوی (١٩٨ی زایینی)ەوە بەشێك لەم ئەرك و دەورە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەند و ئەنجومەنە فەرهەنگییەکان و دواتر لەگەڵ هاتنی رۆژنامە و گۆڤاری دیکە ئەو بەشە لە ئەرك و دەور و چاوەڕوانییانە کە لە سروە دەکرا بە تەواوی دەگۆڕدرێن و لێرەوە دابڕانێك لەنێوان سروە و خوێنەردا سەری هەڵدا و سروە نەیتوانی ئەم دابڕانە چارەسەر بکات و لەلایەن زۆربەی جەماوەرەکەیەوە درایە دەست فەرامۆشی.

**لە نیوەی دووەمی دەیەی ٧٠ی هەتاوی (١٩٩١ی زایینی)ەوە هەتا ئێستاش رەوت و هەوڵێکی بەربلاو چ لە ئاستی دەسەلات و چ لە ئاستی رووناکبیران و ئەدیبان بۆ جێگیرکردنی سیستمێك بۆ خوێندن بە زمانی کوردی لە رۆژهەلات دەستی پێکرد، ئەوانە چۆن سەریان هەڵدا و چییان لێکەوتەوە، کۆڕی زانستیی زمانی کوردی چۆن دامەزرا و چی بەسەر هات؟**

وەك جەنابیشتان ئاگادارن و ئاماژەتان پێکرد لە نیوەی دووەمی هەفتای هەتاوییەوە هەوڵێکی بەربلاو بۆ جێگیرکردنی سیستمێك بۆ خوێندن بە زمانی کوردی سەری هەڵدا و سەرەتا ئەم هەولانە لەلایەن و ناوەندە خوێندکاری و ئەدەبییەکانەوە دەستی پێکرد و ئەگەر بە هەڵەدا نەچووبێتم خوێندکارە کوردەکانی زانکۆکانی تاران لەم پێناوەدا رۆڵ و دەستپێشخەرییەکی تەواویان هەبوو، پاشان زانکۆکانی قەزوێن و هەمەدان و تەورێز و سنە... و دواتریش ئەنجومەنە ئەدەبییەکان دەستیان بە وانە گوتنەوەی زمانی کوردی کرد. گەلێك کاری باش و نامیلکەی تایبەت نووسران و بلاوکرانەوە و لەو دەرفەتە کە لەلایەن دەوڵەتی ئیسلاحاتەوە رەخسابوو تا رادەیەك سوود وەرگیرا، بەلام بەداخەوە لەبەر هۆکارگەلێکی زۆر کە هەم هۆکاری سیاسی بوون و هەم هۆکاری فەرهەنگی و کۆمەلایەتی بە رادەی پێویست ئەو دەرفەتە دەگوێزرایەوە بۆ دامەزراندنی سیستمێکی سەقامگرتوو.

هۆکارە سیاسییەکان تا رادەیەك بۆ ئەو کەسانەی ئاگاداری کەش و دۆخی سیاسی ئێرانن، روون و بەرچاوە. دەوڵەتی ئیسلاحات زۆر بە پێی ئەم خواستەی ئێمەی کورد و

نەتەوەکانی دیکەی ئێرانەوە هات و تەنانەت تا وەرگرتنی خوێندکار بۆ لیسانسی زمان و ئەدەبی کوردی لە زانکۆی سنە و دامەزراندنی رشتەی زمان و ئەدەبی کوردی لەو زانستگادا هەنگاوی هەڵگرت، بەڵام هەوڵەکە و ویستی دەوڵەت لەو کاتەدا سەری نەگرت و پووچەڵ کرایەوە. لەگەڵ هاتنە سەر کاری دەوڵەتی نۆیەم بەرەبەرە هەوڵە خوێندکارییەکانیش لەم بوارەدا مۆڵەتی یاساییان لێوەرگیرایەوە و داخران.

ئەگەر لەسەر دەوری ناوەندە مەدەنی و رووناکبیرییەکان بدوێین دەبێت بڵێین لەگەڵ کرانەوەی کەشی سیاسی و ئامادەیی مۆڵەتی یاسایی بۆ کردنەوەی خوێندنگەی غەیرە دەوڵەتی بۆ زمانی کوردی ئێمە لەگەڵ کۆمەڵێك گرفت و غیاب رووبەڕووبووینەوە کە تا ئێستاش ئەم غیابانە بەردەوام و ئامادەن، کە یەکەمیان غیابی زانستی بوو بۆ جێبەجێکردنی ئیشەکە و ئەم غیابانە گەورەترین گرفتیان بۆ بەردەوامبوونی ئەم پڕۆژەیە سازکرد. ئەگەر گەرەکمان بێت بە کورتی دەرکەوتی ئەم غیابە واتە غیابی زانستی دەستنیشان بکەین دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانە بدەین:

- نەبوونی پڕۆژەیەکی گونجاو، تۆکمە و پێناسەکراو و کۆنکرێت.
- نەبوونی (هێزی مرۆیی) خاوەن ئەزموون.
- نەبوونی (مادەی پەروەردەیی) تایبەت.
- بیرنەکردنەوە لە فێرخواز لە رووی تەمەن و ئاست و پلەی خوێندنەوە.

سەرەڕای ئەو خاڵانەی باسکران، زۆر شوێن و لایەن دەستیان دایە کارەکە و بەشێکیشیان تا ئێستا بەردەوامن، بەڵام بەداخەوە کە سەیری نامیلکە و میتۆدی کارەکان دەکەی پڕن لە هەڵەی زانستی و هیچ ئیرادەیەکیش نابینی بۆ گۆڕان و چاکسازی پڕۆژەکەیان. نازانم تا کەی دەتوانن ئەو جەماوەرەی کە تاك و تەرا هەیانە بە دروشم و هانەی نەتەوەییەوە رابگرن و خۆ نەبان کەن لە واقیع و زانست و ئەو کێشانەی لە هەناوی پڕۆژەکەماندا ئامادەن.

سەبارەت بە بەشی کۆتایی پرسیارەکەتان، وەك دەزانن "کۆڕی زانستیی زمانی کوردی" لە ئەنجامی بەڕێوەچوونی "کۆنگرەی زانستیی فێرکاریی زمانی کوردی" بە هەڵبژاردنی ٢٠ کەس لە نووسەر و رۆشنبیر و زمانزانانی کوردستانی ئێران، ساڵی ١٣٨١ی هەتاوی (٢٠٠٢ی زایینی) لە تاران دامەزرا و رەواییەتی خۆی لە کۆی دەنگی نووسەران و ئەدیبان و رۆشنبیرانی کوردستانی ئێران وەرگرتووە. پێشتر لەلایەن

«ئەنستیتۆی کوردستان» لە تاران و لەلایەن ئەندامانی «ئەنجوومەنی پەیڤ»ەوە کاتی خۆی ئامانجەکانی بەستنی کۆنگرە و پێکهێنانی ئەم کۆڕە روونکراوەتەوە، بەلام وەك وەلامێك بۆ پرسیارەکەی بەڕێزتان پێویستە ئاماژە بەم چەند خالەی خوارەوە بکەین:

بەستنی کۆنگرەی فێرکاریی زمانی کوردی لە تاران، سەرەتا بە مەبەستی تاوتوێکردن و لێکدانەوە و شیکاریی رەوتی فێرکاریی زمانی کوردی بوو کە لە گەلێك شوێن و ناوەند لە ناوچە و شارە جۆراوجۆرەکانی کوردستانی ئێران و تەنانەت ناوەندی زانستگە و فێرگەکانی شارە فارس نشینەکانیش لەلایەن کەسایەتیی رەسمی و نارەسمییەوە، دەستی پێکردبوو و ئومێدیش ئەخوازرا ئەم مەبەستانە بپێکێت:

١- دیاریکردنی مێتۆدێکی یەکگرتوو بۆ فێرکردنی زمان.

٢- دیاریکردنی لیژنەیەکی زانستی بۆ:

چاوەدێریکردنی رەوتی فێرکردنی زمانی کوردی لە هەموو قۆناغەکاندا.

دیاریکردنی سەرچاوەی تایبەت و زانستییانە بۆ خوێندکارانی زمانی کوردی.

دیاریکردنی سەرچاوەیەکی یەکگرتوو بۆ فێرکردن یان دامەزراندنی لیژنەیەکی تایبەت بۆ ئەم ئەرکە.

رێککەوتن لەسەر چۆنییەتیی بەڕێوەبردنی ئەزموونی قۆناغە تایبەتەکان.

رێککەوتن لەسەر چۆنییەتیی بەخشینی بڕوانامە بە دەرچووانی ئەزموونەکان.

٣- دیاریکردنی ناوەندێك بۆ کۆبوونەوەی لیژنەی زانستی و مامۆستایانی فێرگەکان بەشێوەی مانگانە، وەرزانە یان سالانە. (بەپێی پێداویستی).

دواتر کە لەگەل زۆر لایەن و کەس و تاقم و ناوەندە ئەدەبی و رووناکبیرییەکان قسە کرا و بیروڕا ئالوگۆڕ کرا، بەشێوەیەکی گشتی هاتینە سەر ئەو قەناعەتە ئەو مەبەستانە دەتوانرێت بەشێك بێت لە پرۆژەیەکی گەورەتر و دەتوانین هەندێك مەبەست و ئەنجامی دیکەش بە بەستنی کۆنگرەکە بپێکین و لەم رێگەیەوە لیژنەیەك دیاری بکەین بۆ دامەزراندنی کۆڕێك کە بتوانێت کاری زانستییانە و بابەتییانە لەسەر زمانی کوردی بکات.

بەداخەوە ئەو کۆڕە تا ئێستا نەیتوانیوە مۆلەتی یاسایی بۆ خۆی جێبەجێ بکات و لەبەر نەبوونی مۆلەتی یاسایی و شوێنی تایبەت و گرفتی باری مالی و رێکنەخستنی ئیدارە و پێکهاتەی خۆی وەك ناوێك ماوەتەوە. هەلبەت بلێم ئەم ناوە تا ئێستا ئەم

کارانەی کردووە: چاپ و بڵاوکردنەوەی ٣ ژمارەی زمانەوان، چاپی کتێبی «بنەماکانی وشەسازی» نووسینی "کامران رەحیمی" کە هەموو ئەندامان وەك ویراستاری کارەکە دەوریان بینیوە و ئامادەکردنی دوو ژمارەی ٤ و ٥ی زمانەوان (لەبەر گرفتی باری ماڵی و ئیداری چاپ و بڵاو نەبوونەتەوە).

ئەمانە وەك پێویستیی بنچینەیی چالاکیی فەرهەنگی و رۆشنبیریی ئەوکاتە و تەنانەت ئێستاش لەو زەرووڕەتانە بوونە ئێمە وەك خۆمان هەستمان پێکرد و بەرەو پێشوازی چووین و مەبەست لەو هەنگاوەش چارەسەرکردنی هەندێك کێشەی سەرەکی و زەمینە خۆشکردن و دەستپێشخەرییەك بووە بۆ کارکردن و ئاوڕدانەوەیەکی جیدیی و سەردەمییانە لە زمانی کوردی.

هەڵبەت لە بیری نەکەین مێژووی کورد و خەباتی سیاسی -فەرهەنگیی کورد بە درێژایی تەمەنی خۆی لە سەرنج و گرنگیدان بە زمانی کوردی بێبەری نەبووە و هەرکات دەرفەتێك هەڵکەوتبێت و دەسەڵاتێکی کوردی ساز بووبێت یان بووژابێتەوە، یەکەم فاکتەری بنەڕەتیی، زمان بووە، کە کەوتووەتە گەڕ و بەرجەستە بووەتەوە. وەك وترا ئامانجی سەرەکیی لە دامەزران و بەڕێوەبردنی ئەو کۆڕە و زنجیرە دانیشتنەکانی کۆڕی زانستیی زمان لای من و تا ئەو جێگەیەی ئاگادارم لای ئەندامانی کۆڕەکەش، وەڵامدانەوەیەکە بەو عەشق و شەوقەی لە دەروونماندا بۆ زمانی نەتەوەکەمان هەمانە و بەپێی توانا هەوڵێکە بۆ چارەسەرکردنی هەندێك کێشەی سەرەکیی زمانی کوردی لەم بەشەدا.

# مێژووی دیالێکت و ئەدەبی گۆران (هەورامی)

## لە دیمانەیەک لەگەڵ نووسەر و شارەزای مێژوو سدیق بابایی-پاوە

**هەروەك دەزانین كۆنترین و لەمێژینەترین دەقی نووسراوی كوردی لەبارەی مێژوو و فەرهەنگەوە لەناو شێوەزاری هەورامیدایە، بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوە، لەم بارەیەوە چ زانیاریگەلێك لەبەر دەستدان؟**

ئەگەر بۆ ساتێك ئاوڕ لە هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی هەنووكەی ئێران (كۆماری ئێسلامی) لە هەمبەر زمانی كوردی بەگشتی وەك نەیاری مێژوویی بدرێتەوە، كوشتار و قڕانی زمانی بووە و لە بەرامبەریشدا خوازیارانی پاراستنی زمان، وێژە و تۆماری مێژوو هەر لەم ساڵانەی دواییدا بخرێتە بەرچاو، رەنگە ئاسانتر بتوانین قبووڵی كەین لە سەردەمانی كۆندا چ كێشمەكێشێك لەم ئاستەدا بەرۆكی لایەنی كوردی، یان خەڵكانی كەم دەسەڵات و لە دەسەڵاتكەوتوو بۆ خاوەنداریتی وێژە و زمان و پارێزگاری بەرهەمەكانیان لەئارادا بووبێت؟

دەكرێت بەپێی كورتە ئاماژەی سەرەوە بەو ئاكامە بگەین كورد لە رۆژگاری هەرەكۆنی مێژووی ناوچەكەدا چ ئاستەنگێك لەسەر رێگای بووە هەتا توانیبێتی خاوەنی زۆر دەسكەوت و خولقاندنی بەرهەمی بەرچاو بێت. دژایەتیی نەیاران و كێبڕكێی پاشكەوتووانە و هەتا رادەیەكی بەرچاو و ئاسایی پێش سەردەمی زایین، بەتایبەت پاش سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام و كاردانەوەی قورئان ئیتر هەموو هزر و رامانێك بەتاڵ لە نێوەرۆك و بە دوور لە پێویست بۆ داهاتووی كۆمەڵگا لێك دەدرایەوە. تێڕامانێكی وەها بە جارێك رێگای لە گەشە و سەرهەڵدانی وێژەی جیاواز لە زمانی قورئان بەتەواوەتی گرت و خەباتكارانی ئەم رێبازە بە كوفر و ئێلحاد سەركۆنە كران. وێنەی زیندووی ساڵەكانی سەرەتای پەرەسەندنی دەسەڵاتی كۆماری ئیسلامی، پاش لانیكەم زیاتر لە هەزار ساڵ لەم بەسەرهاتە دەتوانێت ئاوێنەیەك بێت لە ژیانی پڕ لە كێشەی وێژەی نووسراوی خۆماڵی لە رۆژگارانی كۆن بە پانتاییەكی بەرینتر و بێ رەحمانەی ئەو سەردەمانە.

بۆ وێنە رێژەی هەڵبژاردنی نێوی منداڵانی تازە لەدایكبوو لە شارێكی وەك پاوە دەتوانێت ئاوێنەی بالانوێنی دەور و كاریگەریی دەسەڵات یان بیر و فەرهەنگی نۆژەنكراوی لەلاوە هاتووی زاڵكراو بەسەر كۆمەڵگا دەستنیشان بكەین. هەڵبژاردنی ناوگەلێكی وەك: عەمار، زەكەریا، عوبەیدوڵڵا، شوعیب، كولسووم، ماجد، عەبدوسەلام، سومەیە، روقیە، یاسر و... كە نامۆیی تەواویان لەگەڵ فەرهەنگ و

وێژەی کوردی هەیە و ئاوڕدانەوەی ئاشکرای بەرەو پاشگەزبوونەوە بۆ سەردەمی داگیرکردنی ناوچەکە لەلایەن لەشکری عەرەبەوە پێوە دیارە، خۆی پانتایی کارەساتەکان لە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا بۆ ئێمە دەستنیشان دەکات.

وێڕای ئەو کەند و کۆسپە مەزنانە، کورد بە درێژایی مێژوو لە هەر دەرفەتێک بۆ تۆماری ئاسەواری شێوازی ژیان و گەیاندنی سروشتی خۆی بە نەسڵەکانی دواتر لەپێ نەوەستاوە.

هەورامان بەپێی پاشماوە پارێزراوەکان یەك لەو دەڤەرە پڕکار و تێکۆشەرانەی ئەم بوارە دەژمێردرێت کە ئەگەر نەسڵی نوێ خۆی تۆزێك پێوە ماندوو بکات، رەنگە مرۆی کورد بتوانێت سەر و گەردنی خۆی لەنێو هەرا و هوریای ئاگراندیسمان کراوی رەگەزەکانی دەوروبەر بۆ داتاشینی پێشینەی پەڕ و باڵ پێدراویان دوو بالا بەرزتر بنوێنێ.

قەباڵەکانی هەورامان، ئاڤێستا و سەرلەنوێ پێداچوونەوەکانی درەخت ئاسووریك، تۆمارکراوە مێژوویی ئایینییەکانی یارسان (ئەهلی حەق)، شانامەی هەورامی کە جیاوازی تەواوی لەگەڵ شانامەی فیردەوسی تووسی پێوە دیارە. شیرین و خوسرەوەکەی خانای قوبادی کە لە ناوەرۆك و باسەکانیدا دەوڵەمەندیی بیری کەسایەتیی نەتەوەی کورد شانبەشانی کەسایەتییە ناودارەکانی شۆڕشی فەڕانسا چ لە هێنانە رۆژەڤی باسە فەلسەفییەکان هاوکات و چ شرۆڤەی کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان و زۆر نموونەی تر هەرکامە بە نۆرەی خۆیان سەردەستی وێژەی کورد لە دەورانە جیاوازەکانی ژیانی خەڵکی ناوچەکە دوور لە تۆزقاڵێك خۆ هەڵکێشانی پڕۆپاگەندەیی دەسەلمێنن.

### قەباڵەکانی هەورامان:

ئیجارەدانی باغە رەز لە هەورامان دەوروبەری ٢٠٩٧-٢٠٩٨ ساڵ بەر لە ئێستا (٢٢٥ی سلووکی ٨٨ و ٨٧ی پێش زایین سەروبەندی دەسەلاتی مێردادی دووەمی ئەشکانی) و تۆماری بەڵگەنامەیەك لە دووتوێی یەکێك لە قەباڵە کۆنەکانی هەورامان بە زمانی ئاخاوتنی ئەوکات خۆی لەخۆیدا بە یەك لە بەڵگە حاشاهەڵنەگرەکانی سەرهەڵدانی مێژووی وێژەی گۆران (هەورامی) پێش لە زایین دەژمێردرێت[1].

قەباڵەکانی هەورامان ساڵی ١٩١٣ بەهۆی کەسێك بەنێوی دکتۆر سەعیدخان گەیشتوونەتە ئەورووپا و لە گۆڤاری Journal of the Royal Asiatic (society1919-1915) لەلایەن پرۆفیسۆر ئێلیس مینس و مێستر کاولی لێکدراونەتەوە.

زۆرێك لە مێژوونوسانی ئێرانی، بیانی و کورد لەوانە: A. ⁄E.H. Minn A. Ghilain⁄ Cowley, فەرەنسی لە کتێبی Essai sur la langue parthe.1939 زماناسی روسی ئارانسکی⁄ خۆرهەلاتناسی روسی، پیگولوسکایا، حسن پیرنیا، تاریخ ایران باستان، خانلری تاریخ زبان فارسی (کە هەوڵی داوە ئەمەشمان لێ داگیر بکات؟)، ژالە اموزگار، احمد تفضلی... و لە مێژوونووسانی کورد دکتۆر جەمال رەشید مامۆستای زانکۆ- بەغدا، محەمەد ئەمین هەورامانی، موزەفەر بەهمەن سوڵتانی هەورامانی. دکتۆر بۆرەکەیی، دۆکتۆر بەهمەن فەریور و... خراونەتە بەرباس.

دکتۆر فەریوەر ناسراو بە سۆران کوردستانی لە پێوەندی قەباڵە مێژووییەکانی هەوراماندا دەڵێت:

"لە دەسپێکی ساڵەکانی سەدەی بیستەم، یەك لە گرنگترین رووداوە فەرهەنگییەکانی جیهان رووی دا کە لە چەشنی خۆیدا وەك گەورەترین دۆزینەوە لە بواری مێژووی وێژە و زمانی نەتەوەی کورد دێتە ئەژمار. سێیەمین قەباڵەی ناوبراو کە بە خەتی ئارامی دەسکاریکراو نووسراوە، دەبێت وەك کۆنترین بەڵگەنامەی نووسراو و کەشفکراوی زمانی نەتەوەی کورد بناسێنرێت". (مێژووی هەورامان، بەهمەن سوڵتانی، ص١٠٩١).

بەپێی وتەکانی دکتۆر جەمال رەشید، پرۆفیسۆر مینس لەو بڕوایەدا بووە، کە زمانی قەباڵەی سێیەم بە زمانی ئەمڕۆی کوردی نزیکترە. ئەو بەتایبەت ئاماژە بەو مەسەلەیە دەکات، پیتەکانی نووسراوی قەباڵەی سێیەم لە هیچکام لە قەباڵە دۆزراوە مێژووییەکان لە جیهان نەدیتراوە. هەروەها پیتەکان دەستی تێوەردراوە و بە نیشانەگەلی تایبەتی ئاڵوگۆڕی تێداکراوە هەتا زمانی کوردەکانی ئەو سەردەمە لەو ناوچە دیاریکراوە بنووسرێت". (مێژووی هەورامان. موزەفەر بەهەمەن سوڵتانی. ص١٠٩٩).

**ئاڤێستا و وێژەی کوردی:**

بە دڵنیاییەوە دەکرێت پێداگری لەسەر ئەو راستییە بکرێت، کەمتر کەسی نەختێك شارەزا بە وێژەی گۆران (هەورامی) هەیە ئەگەر سەرنج بداتە وشەگەلی ئاڤێستایی شتێکی لێ تێ نەگات. دیارە هەرچی شارەزایی و باڵادەستی لە وێژەوانی گۆراندا زیاتر بێت، بەم پێیە تێگەیشتن لە ئاڤێستا و بەشێکی بەرچاوی وشەکانی زیاتر دەبێت.

پێداچوونەوەی ئاڤێستا بە زەینی کوردی و دووبارە وەرد دانەوەی، ئەمجارە لەلایەن بەرێز، نەمر "عیمادەدین دەولەتشایی" خەڵکی کرماشان و چاپی کتێبێك لەو پێوەندییەدا لەژێر نێوی "جغرافیای غرب ایران یا کوەهای ناشناختە اوستا، ١٣٦٣"، گەلێك بابەتی نوێ هەتا ئێستا کەمتر هەڵێنجراو لە دەقە پێشووە وەرگێڕدراو و تۆمارکراوەکان بەدەستەوە دەدات.

حەمەدەمین هەورامانی لە کتێبی گوڵزاری هەورامان، زمانناسی و ئەدەبیات، لە لاپەڕە ٤٩دا دەڵێت: "دایکزادی زەردەشت کوردستانە و مەڵبەندی زمانی ئاڤێستاش زۆرتر جەوهەری کوردی کوردستانی دێرینە و شارستانییەتی کوردەکانی دێرینیش لە خەڵکی دێرینی ناوچەکانی دیکەی ئێران پێشکەوتووتر و سەرلەبەرتر بووە". ناوبراو پێداگری دەکات هەتا پێش حەفتا ساڵ وێژە و گوتاری نووسین و خوێندن لەسەر ئەساسی ئاسەواری بەجێماوی ئاڤێستایی- هەوورامی (گۆرانی) بووە.

م. هورامانی بۆ سەلماندنی وتەکەی چەند وێنەیەك لە وێژەی ناوچەکانی ئێران بۆ نیشاندانی جەوهەری کوردی (هورامانی- گۆرانی) و وتەی زمانناسە بیرمەندە ئەوروپاییەکانی کردووە بە پشتبەندی بۆچوونەکەی.

جیا لە چەند دەقی مێژوویی، وەك: درەخت ئاسووریك و حەوت خانی رۆسەم، رۆسەم و زەردەهەنگ، رۆسەم و زۆراو، فەرهاد و شیرین، کولە و ئاینەمەل، حەمەحەنیفە، رۆسەم و ئەسفەندیار، یوسف و زولێخا و... بەڵگەنامە و دەفتەرە مێژووییەکانی زانایانی ئایینی کوردی "یارسان" هەرکامەیان بە گەنجینەیەکی پڕ بایەخ و دەوڵەمەندی مێژووی وێژەی کوردی (گۆران- هورامی) دەژمێردرێن، کە بەداخەوە وێژەوان و رۆشنبیری کورد لەلایەك و دەسەڵاتی کوردی (هەرێم) لەلایەکی تر هەم بەهۆی تایبەت کە ئێرە جێگای باسکردنی نییە، ئامادە نەبوون بۆ تەرخانکردنی کات

و شـارەزابوون و بەسـەرکردنـەوەی شـیاوی ئاسـەواری پـرژ و بـڵاوی خۆمـاڵی داخ و کەسەرمان زیاتر دەکات.

کەمتر خۆلێدان لەم بەرپرسایەتییە لێکەوتنەوەی بەرەنجامێکـە کـە بەشـی هـەرە زۆری دەقەکان هەر وا لەپەنا و پەسێوان ماونەتەوە یان بەرە و فەوتـانی یـەکجارەکـی پاڵی پێوە دەنرێت!

لە سەدەی دووی کۆچی بـەدواوە تۆمـارکراوەکـان لـە چوارچـێوەی ئـاییینی یاریـدا رێکوپێکتر پارێزراون. کورد دەبێت قەدری باوەڕمەندانی ئـەم ئاییینـە لانیکـەم لـەبـەر پاراسـتنی وێـژە و کـەلـەپـوورەکـەمـان بـەرز بنرخێنرێـت، هـەرچـەند لـە بـواری نیشتمانپەروەری یەکەم شانازیی هێنانەگۆڕی ئەم چـەمکە دیسـان بـەهۆی ئـەوانـەوە هاتووەتە ئاراوە.

لە سەدەی دووەمی کۆچی بە دواوە، دەورەی باڵوول. دەورەی بابە سەرهـەنـگ هـەتا دەورەی شاخوشین، بابەناووس و بابەجەلیل دەودانی... و لە سـەرەنجـامی ئـەم پرۆسـەیە سوڵتان ئیسحاق هەرکامەیان خاوەنی ئاسەوار و شوێن دەستی نرخدار و تاییـەت لـەم بوارەدا سەرژمێر دەکرێن.

ئاسەوارە پرژ و بڵاوەکانی پیری مەزن پیرشالیار لەژێر ناوی "ماریفەت و پیری" ئەوە بۆ خۆی هەر تامەزرۆیی بزوێن و زەوق و شەوق بەخشی ژینی مرۆڤایەتییە.

شیرین و خۆسرەو (خانای قوبادی)، دەوڵەت نامـە (مـەلا خـدری روار) هـەروەهـا شانامە بە هەورامی کە جیاوازیی بەرچاوی لەگەڵ شانامەی فیـردەوسـی تیـدا بـەدی دەکرێت، هەرکامەیان بە نۆرەی خۆی ئەگەر ئاوڕی پێویسـتیان لـێ بدرێتـەوە توانـا و جەوهەری پڕ نێوەرۆکی ئەوەیان هەیە سەر و گەردنی وێژەی کوردی دوو باڵا لە جیهانی وێژەی گەلاندا بەرزکاتەوە.

**هەروەك دەزانین ئەدەبی زارەکـی و نەنووسـراو (ادبیـات شـفاهی) لـەناو کـوردان بەشێکی گرنگی رەسـەنایەتی و پاشـخانی فەرهـەنگی و کۆمـەڵایـەتیی کۆمـەڵگای کوردەواری پێك دەهێنن، ئەدەبی زارەکی لە هەورامان خاوەنی چ تایبەتمەندیگـەلێکن، لە چ ئاستێکدایە و چ کارێك بۆ کۆکردنەوە و رزگارکردنیان لە فەوتان، کراوە؟**

ئـەدەبـی زارەکـی و نەنووسـراو (سـینگ بـە سـینگ) یـەك لـە گۆشـە پـڕ لـە سەرفرازییەکانی کورد لەم پارچە لە خاکی نیشتمان بەحیساب دێت. دەوڵەمەندیی ئەم بەشە تەنێ لە پاراسـتنی وێـژەی سـاکاردا کـۆ ناکرێتـەوە. یـەك لـە تایبەتمـەندییـە بەرچاوەکانی ئەم بەشە ئەوەیە لە مێـژووی ئایینیـەوە بگـرە هـەتـا دەستنیشـانکردنی بەسەرهات و کارەساتی سیاسی و سروشتی و کۆمـەڵایـەتـی بـە شـێوەیەکی هونـەری رازێنراوەتەوەو بە چەشنێکی جوان و هونەرییانە وێنەیان گرتووەو پارێزراون.

بیستنی بەیتێکی سیاچەمانە لە هەمان کاتدا بۆ تـاکی هـەڵـوەدای حـەسـانەوەی رۆحی دڵنەواز و وەحەسێنی ماندوویەتی بیر و لەشـە، هاوکـات سـەربـوردەی مێـژووی کارەساتێك چ سیاسـی و چ سروشـتی یـان بیرهێنانـەوەی گـەنجینەیـەکـی یاگـەوانـی (جوغرافی) لە دووتوێی گۆرانییەکەدا پێشکەشی بیسەر دەکات.

ئارۆ رام کەوتەن کۆنە هەواران نە دەنگی بڵبڵ نە سەدای یاران
شاهۆ مەگرەوۆ، ئاتەژگا ماتەن وێمیر، بەتەمای شنیای باڵاتەن

شاهۆ مۆبد، هێما، یان کەسایەتیی پایەبەرز، خەم و ماتەم دایگرتـووە. ئاتـەشـگا (ئاورگەی پیرۆز) بێدەنگ و کڕ و کپ و دامرکێنراوە، کوژاوەتەوە، گـڕ و تـینی جـارانی نەماوە! "وێمیر" (ئێمیریا -خوای میـەر- خـوای دەسـەڵاتـی خـۆجێی)، هێشـتا ورەی بەرنەداوە. ئەو بەتەمای سەرلەنوێ بووژانەوە، سەرهـەڵـدان و گـەڕانـەوەی دەسـەڵاتـی خۆماڵی و جێگیرکردنەوەی دۆخی جاران و رەواندنـەوەی خـەم و ماتـەمـە. (بـەیتێکی سیاچەمانەی عوسمان هەورامی ساڵی ١٩٧٢).

ئاتەژگا: ئاتەشگا- ئاورگەی فرووزان لەسەر لووتکەی شاخێك، باکووری رۆژئاوای پاوە.

هی سەردەمی پێش ئیسلام .

وێمیر: ناوی سەیرانگایەك لە بناری شـاهۆ، هەڵکـەوتوو لـە رۆژهـەڵاتـی شـاری (پاوە).

لە دووتوێی بەیتی سەرەوە چەند ناوی مێژوویی و یاگەوانـی (جـوغرافی) ناوچـەکە وەك: شاهۆ، ئاتەشگا، وێمیر و شیکاریی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی- سیاسی، مێژوویی و چڕینی پەیامی خۆڕاگری تۆمارکراوە.

مەخابن هەنگاوێکی ئەرینی بۆ بەرگری لە فەوتانی یەکجارەکیی ئەم بەشە لە ئەدەبی کورد (گۆرانی)، وەك سەرپاکی سامانی دیکەمان هەڵبەت سەرەڕای هەوڵی تاك و تەرا و سەربەخۆی چەند قەڵەم بەدەستێکی دڵسۆز بە فەرمی هەڵنەگیراوە.

ڕێکەوتی ١٠/٥/٢٠٠٤ی زایینی لە دووتوێی نامەیەکی سەرئاوەڵا بۆ بەڕێزان: مام جەلال تاڵەبانی و کاك مەسعود بارزانی لەلایەن نووسەری ئەم دێڕانەوە رجای ئەوە هاتە ئاراوە کە سەرنج بدرێتە گەنجینەی مێژوویی هەورامان و چەند پێشنیارێك خرایە بەردەستی بڕێزیان و بیروڕای گشتی. داخەکەم چ ئەوکات و چ ئێستا هەورامان تەنێ بە بڵاوکردنەوەی چەند ئاهەنگ و هەڵپەڕکێ ئاوڕی لێ دەدرێتەوە.

لەم دواییانەدا چەند بەرنامەیەکی ساڵانە بۆ نیشاندانی کەلەپووری هەورامان چێ کراوە، بەڵام ئەمە ناتوانێت کەلێنی بوونی ناوەندێکی لێکۆڵینەوەی زانستی پسپۆڕان بەپێی پلان و لەبەرچاوگرتنی پرۆژە و دابینکردنی خەرجی پێویست بە بریاری یاسایی لەسەر دراو بگاتە ئەنجامی خۆی.

**تایبەتمەندییە زانستی و ڕێزمانییەکانی شێوەزاری هەورامی بەڕای بەڕێزت کامانەن، لە کوێی زمانی کوردیدا جێگای گرتووە، کەموکورتییەکانی چین؟**

لە کۆنەوە، ڕەنگە زیاتر لە کوردەکان گەڕۆك و بیرمەندی پسپۆڕی بیانی نووکێ پێنووسیان لەمەڕ ڕێزمانی گۆران (هەورامانی) بۆ ئاوڕدانەوە لە تایبەتمەندییە جیاواز و دەوڵەمەندەکانی دەکار کردبێت.

لەم بوارەدا مەکنزی (MacKenzi)، ئۆسکارمان (Oskarmann)، مینورسکی (Minorskiy)، هادانگ (Hadank)، (Peter Lerch)، ریچ (Rich)، ئێدمۆندز (Edmonds)، دیاکۆنۆف (Diakonov) و زۆر تاکیتر هەوڵیان داوە تایبەتمەندیی ڕێزمانی بە شێوازی زانستی کەم و زۆر شی بکەنەوە و بەشێك لە گۆشە تاقانەکانی ئەم شێوە زارە دەستنیشان بکەن.

ڕێزمانی کوردی گۆران (هەورامی) لە بەراوردکاری لەگەڵ سۆرانی و کرمانجی لەگەڵ ئەوەی نزیك بە هەشتا ساڵی دوایی بەگشتی پەراوێزخراوە و تاك و تەرا نەبێت، هیچ لایەنێکی کوردی مەیلی بووژاندنەوەی نەداوە، بەڵام سەرەڕای ئەو کەموکورتییانەش لە چەند لایەنێکەوە باڵادەستیی خۆی پاراستووە.

ڕەگەزی نێر و مێ و بێ ڕۆح لە ئاخاوتنی هەورامیدا لێك جیا دەکرێتەوە و بیسەر، بەردەنگ و ئاخێوەر لێك تێدەگەن بەرامبەرەکەیان لە چ ڕەگەزێکە، هەروەها حاڵەتەکان زۆر بابەتی ڕێزمانی تێدا بەدی دەکرێت. سادە و ئاهەنگین و پڕ لە مێلۆدی گوێ نەواز و چێژبەخش و ورووژێنەرە. چەند دەنگێکی تایبەت بە گۆکردنی پیتگەلێکی وەك (د، ڤ، ێ، و...) لە نووسین و گوتنی هەورامیدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت کە لە شێوە زارەکانی دیکەی کوردیدا وێنەی نایابە.

بۆ وێنە: لە کرمانجیی سەروو و خواروو بۆ خەبەردان لە نووستن یان هاتنی نێر و مێ جیاوازیی ڕەگەزی تەنیا لە رووی نێوەکانەوە دەردەکەوێت و ئەوە ئەو ناوانە ناگرێتەوە کە هەم بۆ نێر و هەم بۆ مێ کەڵکیان لێ وەردەگیرێت. وەك (عیسمەت، خورشید،...)، بەڵام لە وتنی هەورامیدا بەجیا لە چەشنی ناوی کەسەکان ڕێزمان بە وردی شی دەکاتەوە کە ئەو کەسە نوستووە یان هاتووە کێیە. بۆ وێنە: (سۆرانی)، خورشید لە ماڵێ نوستووە: ئەم دەقە هەم بۆ مێرد و هەم بۆ ژن گۆ دەکرێت. لەبەر ئەوەی خورشید لە کوردەواریدا هەم بۆ نێوی ژن و هەم بۆ پیاو بەکاردێت، مرۆ نازانێت ئەم نوستووە پیاوە یان ژن، مەگەر ئەوەی کە ناسیاری بێت.

(هەورامی)، خورشید یانەنە وتەن. ئەوە بۆ خەبەردان لەسەر نوستنی خورشید کە پیاوە، بەڵام بۆ ژن: (هەورامی)، خورشید هوتێنە. لێرەدا بۆ جیاکردنەوە پاشبەندی (ە) بە خورشید ناوی ژن زێدە کراوە. سەرەڕای ئەوە بۆ نوستن لە ڕەگەزی نێردا (وتەن) و بۆ ڕەگەزی مێ (وتێنە) کەڵك وەرگیراوە کە بە تەواوی هەم لەناو و هەم تەواوکەردا جیاوازییەکە دەستنیشانکراوە. وێنە بۆ (هاتن)، (سۆرانی)، دڵسۆز، لە هەولێرەوە هاتووە مژدەی بەهارمان بداتێ. ئەوە دەکرێت هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ژن بەکار بهێنرێت!

بۆ ژن: (هەورامی)، دڵسۆزە، هەولێرۆ ئامێنە مزانی وەهاریان، دۆپەنە. لێرەدا دڵسۆز ە بە واتای ژن هاتووە. ئامێنە بە واتای، (ژنێك هاتووە).

بۆ پیاو: (هەورامی)، دڵسۆز، هۆلێرۆ ئامان مزانی ئامای وەهاریان دۆ پەنە. لێرەدا دڵسۆز ئامان، واتە پیاوێك بەنێوی دڵسۆز هاتووە.

دیارە لە نووسینی وێنە بۆ نیشاندانی بابەتە جیاوازەکانی تر کە هەرکامەیان گۆشەیەك لە وردەکاریی ڕێزمان لە وتنی هەورامیدا ئاشکرا دەکەن، لەبەر خۆ پاراستن بۆ درێژتر نەبوونی وەڵامەکان چاوپۆشییان لێدەکەم.

گەشە و سەرهەڵدانی هەر زمانێ وێڕای ئەوەی بە دەسەڵاتی سیاسی ئاخێوەرانی ئەم زمانە، یان هەبوونی ئازادی و گۆڕەپانێك بەبێ بەرگری لە خولقاندنی تەنگەبەری لەسەر ڕێی خوێندن و نووسین لە قوتابخانە و دامەزراندنی کۆڕ و کۆمەڵی پسپۆڕ بۆ پێداچوونەوە و وشەسازی بەگوێرەی پێشچوونی زەمان و تێکنیك و پیشەسازی نوێوە گرێدراوە.

بەداخەوە ئەم هەلومەرجە بۆ زمانی کوردی لە زۆرێك لە بەشەکانی کوردستان باشووری لێ دەرچێت جارێ ئاستەنگی زۆری لەسەرە. سەرباری ئەوە لەو بەشە لە وڵاتی ئازادیی کوردان وەك لەسەرەوە باسی لەبارەوە کرا وشەی گۆرانی پشتگوێخرانی بەرچاوی پێوە دیارە!

وێژەی هەورامی تا دەورانی دەسەڵاتی ئەردەڵانەکان و پاشتریش، تێکچوونی ئاخرین پێگەی دەسەڵاتی بەگزادە و شێخەکانی هەورامان (١٣٢٤ی کۆچی خۆری) بڕەوی تایبەتی هەبوو لە دیوەخانەکان مشتومڕی باسی قورسی فەلسەفی، سۆفیگەری و شەڕە شیعری گەرموگوڕی نێوان زانایان لە مەکتەبخانە، خانەقا، حوجرەی فەقێیان، مزگەوت و دەروازەی جووڵاندنی زەوقی مەلا و فەقێکانیان بۆ چوونە نێو قوتابخانەی دەوڵەمەندی بەیاز، یان دەسنووسە پڕ نێوەڕۆکەکان بوو. ئەوە بە ڕادەیەکی دیار پێگە و توانای ئەم شێوازە لە ئاخاوتنی کوردی جیا لە بەهێزترکردن پاراستبوو.

بەگشتی لە ئەگەری کۆکردنەوە و هێنانەسەر ڕێنووسی نوێ، ئەدەبی نووسراوی هەورامی توانا بەخشی دەسەڵاتی وشەی کوردی و پڕکەرەوەی زۆر کەلێن و کەموکوڕی لە پێداویستی ڕۆژانەی تامەزرۆی ئاخاوتنی کوردی پەتی و بێ نیاز لە بەکارهێنانی زۆرێك لە وشەگەلی نامۆ کە خۆیان خزاندووەتە ناو زمانی کوردییەوە بەهێزتر دەبێت.

بێگومان هەرچەند وێژەی هەورامی لە دەورانێکدا لەسەر هێڵی بەرەو پێشچوون و شارستانییەتی سەردەم ڕێگای دەپێوا، بە هەمان ڕێژە پشتگوێخرانی دوایی و نەبوونی پەروەردە ڕەوتەکەی تووشی ئاڵۆزی، وەستان و بەتایبەت لە چەند دەیەی دواییدا بەهۆی تێکەڵاویی زیاتری کۆمەڵگە جیاوازەکان، خولقانی دەرەتانی هاتوچۆی بەرفراوان، نەمانی مەودای نێوان گوند و شارە مەزنەکان، نەبوونی دەرەتانی خوێندن بۆ منداڵان لە قوتابخانە، ناچار بەقاڵبوون لەنێو کۆمەڵگە جیاوازەکان بۆ درێژەی ژیان، پلانی دزێوی دەزگای ئیداری و سیاسی بۆ پاکتاوی زمانی و ڕەگەزی (لە ئێران) و هتد...،

هەر نەبێ بە بەراوردی سی ساڵ لەمەوپێش کاردانەوەی ئاشکرای لەسەر ئاخاوتنی ڕەسەن و خۆماڵی پێوە دیارەو ئەگەر شارەزایان هەڵسەنگاندنێکی سەرپێیی لەبارەوە بکەن تێکەوتنی کەلێن و زیانی مەزنی ئەم بوارە لەنێوان دوو شێوە ئاخاوتنی سێ دەیە پێش و ئێستا هەست پێدەکەن!

**هەروەك دەزانین تایبەتمەندییە سروشتی و پێکهاتەییەکانی شێوەزاری هەورامی جۆرێکن کە زیاتر لەگەڵ دەقی ڕەسەن و خۆماڵی بە تایبەت شیعردا دەگونجێن و زیاترین بەرهەمی نووسراویش لەم بارەیەوە هەر دەقی شیعر و نەزم بووە، بەڕای تۆ هۆکارەکانی بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

لەگەڵ ئەوەی گوتار و نووسراوی زۆر لەمەڕ دێرین بوونی زاراوەی هەورامی گومان لە دێرینبوونی ناهێڵێتەوە، دەبێت ئەو ڕاستییەشمان لا پەسند بێت کە هەتا ماوەیەکی نە زۆر دوور و درێژی ڕابردوو بەشی هەرە کەمی کۆمەڵگا توانای خوێندن و نووسینیان هەبوو.

لە هەر شارێك ڕەنگە یەك دوو کەس "میرزابنویس"، مەلا، یان کۆلکە مەلا هەبوون. لە لادێ زۆر کەمتر و کەسانی بلیمەت بە هێندەی قامکی دەست لێرە و لەوێ سەریان هەڵدەدا و دەبوون بە چرای ڕووناکیدەری سەرپاکی خوێندەوار و کۆمەڵگا. بەگشتی خوازیار و ئەویندارانی زانست دەبوو بە ساڵان پشت لە ماڵ و دیار و دڵسۆزانی خۆیان بکەن بۆ دەستخستنی زانیاری و زانست. زۆر وێنە هەیە پشتی کۆچی سەفەر کرد و لەڕێ ئاسەواری بەجێماوی کەسایەتییەکان لە وڵاتی غەریبی ناسراونەتەوە. لە حاڵ و دۆخێکی وەهادا خەڵك زۆرتر هەوڵیان داوە لە ڕێگەی بەمێشك سپاردنی بیسراوەکان لە کەسایەتیی زانا و خۆێندەوار بەرهەمەکان لە سینگی خۆیاندا تۆمار بکەن. هەتا بەڵکو بتوانن بەکەسان و نەوەکانی دواتری بسپێرن.

بۆ ئاسانکاری گەیشتن بەم ئەرکە گرنگە، مرۆڤ ڕێگەچارەی دۆزینەوەی فۆرماتێکی سەهل و لەبەردڵان و داهێنانی سەبکێك کردووە بە ڕێباز هەتا خەڵکی نەخوێندەوار بە کەمترین دژواری بتوانن وەریگرن. بۆ وێنە ڕەنگە هەڵبژاردنی سەبکی هێجایی کە زووتر بە مێشك دەسپێردرێت لەم ڕووەوە بووبێت، کە هەر لە کتێبی ئاڤێستاوە بگرە هەتا هەورامی پێش چەند دە ساڵێك هەر بەم ڕیتم و شێوازە لەسەر کێشێکی کەم و

زۆر وەك یەك و لە چوارچێوەی شیعر و گۆرانی چ ئایینی و چ کۆمەلایەتـی تێکۆشـاون. ئەگەر زۆر دوور نەچین تا سی چل ساڵ پێش زۆربەی گۆرانیبێژەکانمـان لـە هـەورامان نەخوێندەوار بوون. ئەوەی هەمانە بەشێکی لە رێگەی ئـەوانـەوە بـۆ رۆژگـاری ئـەمڕۆ گوێزراوەتەوە. نابێت ئەو راستییە دوور راگرین وەك من لەبیرم مابێـت لـە هـەورامان، بەتایبەت شەوانی زستان، خەڵك دەستە دەستە لە چەند ماڵێك کۆ دەبوونەوە هەتا دوو سێ کەس لە شارێکی وەك پاوە بە خوێندنەوەی دەقی بـەیازە کۆنـەکان لـە شـانامەی هەورامییەوە بگرە هەتا شیرین و خـاوەر و شـیرین و خوسـرەو و رۆڵـەبزانـێ* زانسـتی خۆماڵی بەگوێی خەڵك بگەیەنن.

هەڵبەت هەر ئەو دەقە دەستنووسانە لـەگـەڵ هاتنەسـەر دەوری رەزاشـا لـە ئێـران لەگەڵ دوژمنایەتییەکی توند بەرەورووو بوون. لـە کـون و کارێـژدا دەشـاردرانەوە. بـەم هۆیەوە زۆر بەڵگەی بەنرخی مێژووییمان بوون بە خۆراکی مشك و مۆریانە و لە کونـە دیواراندا رزین. لەبەر ئەوە دەکرێت بەشێکی مەزنی ئەم هۆکـارە بـۆ وەزعێکـی وەهـا بگوێزینەوە، نەك تەنیا لەو دەور و زەمانە دوورانەدا، بەڵکو ئێستاکەش لـەبـەرکردن و بە مێشك سپاردنی پارچە شیعرێك ساناتر لە تۆماری دەقە پەخشانێکی نووسراوە. لـە رۆژگاری ئەمڕۆدا کە ئەو کێشەیە مەیدانی بە تەواوی لێ لێژ بووە. بەرەبەرە خەڵك وەك لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا وێڕای نەبوونی پەروەردە و زۆر هۆکاری رێگری تر خەریکن بـە نووسینی پەخشان و دەقی وێژەیی خویان را دێنن. ئەوەتا لە چـەند سـاڵی دواییـدا بـە دەیان رۆژنامەی ئینترنێتی (مجازی) و گۆڤـاری هـەورامی کـە بەشـێکی زۆریـان بـە پەخشان رازێنراونەتەوە و چاپ و بڵاو دەبنەوە.

**سروشتی هەورامان وەك ناوچەیەکی (بکر) و دەسـت لـێ نـەدراو چ رۆڵێکـی لـە بزواندنی هەست و نەستی شاعیران و هۆنەرانی ئەو ناوچەدا گێڕاوە، بۆچی زیاتر توخمی سروشتتەگەرایی (ناتۆرالیزم) لە شـیعر و ئـەدەبی زاری هەورامیـدا زاڵـە، هۆکـاری کەمڕەنگیی هەستی نیشتمانپەروەری لە شیعری کلاسیکی هەورامیدا چییە؟**

---

* کتێب و دەقێکی شێعریی ئایینی- پەروەردەیی و فێرکارییە بە زاراوەی هەورامی لە دانانی مەلاخدری رواری (١٢١٠ – ١١٤٧).

بۆ خۆم لەو باوەڕەدام بنەمای ژیاری هورامان لەسەر سێ کۆڵەکە دامەزراوە، کە بریتین لە: ١- سروشت. ٢- ئایین. ٣- مۆسیقا. هەرکەس ناسیاری لە ژیانی تاك، کۆ یان کۆمەڵی هەورامی زمان هەبێت، ئەم راستییەی بۆ ئەزموون کراوە کە بیر و هۆشی هەر تاکێکی هەورامانی هەموو کاتێك لە دەورەی سروشتی هەورامان وەسفکردن، پێداهەڵکوتن، گێڕانەوە، گۆرانی بۆ وتن و لە وشەیەکدا شەیدایی سروشتی مەڵبەندەکەی لە جووڵەی لەشیدا خۆ دەنوێنێت. کەمتر هەورامییەك دژبەری ئایین دەردەکەوێت. یان بە واتەیەکی تر رەنگدانەوەی پێکهاتەی ئایینی نەك بە نێوەڕۆك سەلەفی و چەپڕەوانەکەی، بەڵکو وەك جۆرە گرێدراوەیەك بەودیوی سروشت لە جەوهەری بوونیدا رەنگدانەوەی نەبێت. لە هەورامان سەرەڕای ئەوەی زیاتر لە هەزار ساڵە بەشی هەرە زۆری خەڵك ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە، هەنووکە کەس ناتوانێت لەنێو بیر و کرداری توندئاژۆترین تاکی ئەم مەڵبەندەدا رەگگەلێکی بەرەوشت پارێزراو لە توخمی ئایینە کۆنەکانی ناوچەی نەپارێزرابێت. دیسان ئەوە هەر لە مەڵبەندی هەورامی ژیارە کە کۆنترین ئایینی رەسەنی کوردان بەبێ کێشە پارێزراوە. کەس ناتوانێت شاهێدی ئەوە بدات لە هەورامان، یان ناوچەی گۆران بەگشتی تاقەکەسێك وەك ئەو بەڵایە لە شەنگار بەسەر دوعا-دا هات ، یارسان پەروەر، مەڵبەندی جوو لە دەورەیەکدا و... تەنانەت لە سەردەمی کۆماری ئیسلامیدا قەومابێت. هەورامی لە هەمان کاتدا خواپەرستی، هاوشان خەڵکێکی کراوە، شایی پەروەر، شایی دۆست و ساتەکانی ژیانیان نوقمی سیاچەمانە، دەرەیی، دەمی و...ن. تەوفیر ناکات لە مووچە و مەزرا، لە شاخ و بەندەنان، لە کاری باخ و ئاو داشتن، یان بانگی نوێژان و خوێندنی ورد و تەراویح و زکری دەروێش و تەلیلەی سۆفیان هەتا رەوانەکردنی مردووەکان بۆ سەرقەبران و خوێندنی تەڵقین هەموو پڕە لە ئاهەنگ و سۆز و هەڵپەڕکێ دەروونی و جەستەیی چ ئارام و چ بەجۆش و خرۆش. "دەنگی کنالەیل هەر دوایی نایێ". (شیعری گەشتێك لە هەورامان، گۆران شاعیری گەورەی کورد).

جارێك ناسیاوێك پێی وتم: "هەورامی جنێوەکانیشیان لە گۆرانی دەچن". پیم وایە خەڵکی ئەم دەڤەرە دەبێت خولقاوی ئاو و خاکی نیشتمانەکەیان بن. دەنا ناکرێت ئینسان ئەوەندە ئاوێتەی سروشتێك بێت کە بە بەرزکردنەوەی دەنگی ئاوازی مرۆڤەکان باڵندەکانیشی هاوڕایی بکەن. لێرە خوڕەی ئاوەکانیش لەگەڵ لەرینەوەی لیزگەکانی

گەرووی مرۆڤەکانی، هاودەمـی و سـازگاری لێـك دانـەبڕاوی هـەیـە. ئـەوە جیـا لـە تێکەڵاویی بوونەوەر و سروشت نییە. لێرە خۆشەویشتیی خاك و مـرۆ جیـا ناکرێتـەوە. ناسکاریی ئەوان زۆر کۆنە لە هەڤدوو تێدەگەن. نامومکینە کەسێك دەسـت بـە وتـنی سیاچەمانە بەرزکاتەوە کەو یان بولبوولێك لەو نزیکـە هـەبێـت و هـاوڕایی لـەگـەڵ نەکات. ناکرێت لەنێو ئەو سێ پێکهاتەیەدا کە سەرجەم بوونی هـەورامان دەسـتەبـەر دەکەن، یەکیان لەویتر هەڵاوێردرێ. شاعیری هەورامی یان وێژەوانی ئەم بەشە لـە وڵات ئەگەر نیشتمانی لێ بستێنرێتەوە، وەك ئەوەیە لـەنێـو هـەوای بەتاڵـدا سـەرگـەردان بکرێت. تەنانەت ئەو تاك و بنەماڵانە کە بەهەر هۆیەك لە هەورامان دابـڕاون ڕۆژانـە بەبیر و بەبێ یادکردنێك لە هەورامان ناتوانن ڕۆژ بە ئێوارەوە گرێ بدەن.

شیعری کەمتر هەورامییەك هەیە وەسفی دار و بەرد، ئاو و خاك، شاخ و هەرد، دار و گیا، مەل و مۆر و باڵەندە و چەرەندەی ئەم خاکـە خۆشەویسـتە نـەکات. هـەورامی زمان یەکەم کەس بوون باسی کوردایەتییان کردووە. بابە سـەرهـەنگـی دەودان ٣٢٤ی کۆچی:

وەسەنەی سێ سەد بیست و چوار هێجری

هاتف نام ئەو جە شاهۆ چڕی

(سەرهەنگ دەودان، سەرهەنگ دەودان

ئەز کە نامەن سەرهەنگ دەودان

چەنی ئێرمانان، مەگێڵم هەردان

مەکۆشم پەرێ، ئایین کوردان)

ساڵەکانی ٣٢٤ی کۆچی کورد لە هەورامان تێکۆشانی خۆیان بۆ برەودان بە ئـایین و باوڕی ڕەسەنی کوردی بەبێ سڵکردنەوە لە فەرمـانڕەواکـانی دژبـەر و دەسـەڵاتـداری ملهوڕی ئەو دەور و زەمانە بانگەواز دەکەن.

خانای قوبادی (١٠٨٣- ١١٦٨) کۆچی:

جە لای عـاقلان ساحێب عـەقڵ و دین

دانا بزۆرگان کوردستان زەمین

راستەن مواچان فارسی شەکەرەن

کوردی جە فارسی بەڵ شێرین تەرەن

پەی چێش نە دەوران ئەی دونیای بەدکێش
مەحزووزەن هەرکەس بە زوبان وێش
مەعلوومەن هەرکەس بەهەر زوبانێ
بواچۆ نەزمێ جەهەر مەکانێ
وێنەی عەرووسان زیبای موشك چین
مەکەرۆش جە حوسن عێبارەت شیرین
عەیبەن پەرێ تۆ دانای زەڕشناش
دەمێ چوون سەڕاف یاقوت و ئەڵماس
جەی بازار عشق جەڕای پڕ هۆشی
مەشغووڵ بی بەکار جەوهەر فرۆشی
حەیفەن وێنەی تۆ جەواهێر بارێ
نەکەرۆ پەی وێش ڕەنگین بازارێ
خاترت جەم بۆ جەوهەری لاڵ سەنج
دانای دوڕشناس گەنجوور کۆی گەنج
هەرکەس وێنەی تۆ گەوهەر بارشەن
دانا و بزۆرگان خەریدارشەن
گوشێ دەر زوبان جەواهێر بارت
تا گەرم بۆ زەریف سەودای بازارت

هاوکات لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسا کورد لە هەورامان شانازی بە زمان و وێژەی خۆی کردووە. وا دەبینین خانای قوبادی بە راشکاوی ئەم روانگە نەتەوەییە دەورووژێنێت و دەڵێت زمانی من لە زمانی فارسی شیرینتر و هەر لەو کاتەدا بە پێچەوانەی بیرتەسکی رەگەزەکانی جیرانی کورد ئەو مافە بۆ هەمووان بە پارێزراو دەزانێت بۆ پەروەردە و ئاخاوتن بە زمانەکەیان تێبکۆشن. خانا خۆی لۆمە دەکات ئەگەر بێت و لەوە زیاتر بۆ خزمەت بە وێژەی کوردی کەمتەرخەم و خۆی بەکاری لاوەکی سەرقاڵ بکات. ئەم دڵسۆزە نیشتمانپەروەرە زمانی کوردی (هەورامی) بە دوڕ، گەوهەر و گەنج و کوردستان بەکۆی گەنج نێو دەبات. ئەو دەڵێت جەواهیر و دوڕ و گەنجی ئەوتۆ خەڵکانی

زانا و گەورەپیاوان قەدری دەزانن، بۆیە دەبێن نەترسانە هیمەت بە خەرج بدرێت هەتا ئەم کالاّ بەنرخە بازاڕی گەرم و بە راهێنان و گۆڕانی پێویست رەواجی زیاتری پێ بدرێت. (لێکدانەوەی سەرپێی نێوەرۆکی شیعرەکانی سەرەوە).

سەیدی هەورامی (٨٥٠ - ٩١٨ یەکەم، دووەم ١١٨٩- ١٢٧١کۆچی مانگی):

ئەز ئورۆموون مەکانم بێ وڵاتم

سەروپیری خودای گێرەن خەڵاتم

بەرۆ دەروێش لوۆ سەیر و وڵاتۆ

نەنیشتۆ هیچ وڵاتیونە نە ساتۆ

تاکی کورد لە هەورامان پێش هەر شتێك گرنگی بە زێد و وڵاتی خۆی دەدات. بەڵگە بۆ ئەوە زۆرن. وەك لە بەیتی سەرەوە هاتووە: بە گەڕان و سەیر و سلووك بۆی دەرکەوتووە کە کەسایەتیی تاقانە و پیرۆزی ئاییینی تایبەت بە خۆی هەیە. جوانی و خۆشەویستیی وڵات لە هەر شوێنێك ناچاری دەکات دیسان زووی خۆی بەرە و رووگەی دڵ بسوورێنێت. پابەندبوون بەم تایبەتمەندییانە دەورگێڕانی خۆی لە پارێزگاری سنوور یان بەرەنگاربوونەوەی هەر سنوورشکێنێك لە دەرەوەی ناوچەکە دەستنیشان دەکات. لە سەردەمی ئیمپراتۆریی عوسمانی و سەفەوی زمانی هەورامی لە قەراغ زمانی دەسەڵاتی سەرووی ئەوکات بەبێ شەڕ و هەرا و هوریا و بەربەرەکانێی سوننە و شیعە و تورك و فارس و عەرەب دەبێتە زمانی فەرمی وێژەیی و ناسنامەی کوردیی دەسەڵاتی ئەردەڵان تۆمار دەکات. وشەی وەتەن لە هەورامان لە وێژە و گۆرانییەکاندا رەنگ و بۆن و رەنگدانەوەی قووڵی ئەوتۆی چەسپاوە کە لە هەر بۆنەیەکدا سەرنجی هۆش و زەینی بیسەر رادەکێشێت. عوسمان و جەمیل دوو گۆرانیبێژی ئەم مەڵبەندە بە کەڵکوەرگرتن لە وێژەی سینگ بە سینگ سەڵا سەر دەدەن:

"ئاوارەی وەتەن خەیلێ ستەمەن

لەجیاتی شادی خۆراکم خەمەن

ئانە نەدیەنش ئازار دووری

پەوکەی مەنێنێش سەرگوڵم بە سووری"

لە جێگایەکی تر هەر لەم پێوەندییەدا:

"هەناسەیم کێشا دەروونم چیا
ئاوارەی وەتەن من زەوقم نیا
ئینە خەیلێوەن دڵ نە گێجاوەن
ئارەزووش وەتەن پاینی وەفراوەن"

نالین و دەربڕینی سۆزی بە پەرۆشی دڵ تەنیا لەبەر دوورکەوتنەوە بە مەودای نێو سەعاتەڕێ سەریهەڵداوە. گوند، شاخ، دۆڵ، بەرد، دار، ئەشکەوت و هەر پێکهاتەیەکی ئەم مەڵبەندە یەك بەیەك وەتەن و خۆشەویستی ئەو لە شیعر، گۆرانی، سیاچەمانە، موزیك، زکر و گۆرانیی شێخانە بانگەواز دەکرێت. بانگەوازی لە یەك قاڵ بوون و لە یەك لێك جیا نەکرانەوە.

مەلا حەسەن مەردۆخی- دزڵی (١٢٧٥- ١٣٦٥):

پێم خۆشە نانی رەشی جۆی عەبال
دۆینەی خەجیجە و فاتمە و حەمینە
کاڵە و کڵاشی کاری هەورامان
نادەم بە قۆنرەی چەرمی سەکینە
من هەڵۆی بەرزی لووتکەی (دالانیم)
هەرگیز وەك قالاو ناکەومە چینە

ئەگەر ئەم هەستی نیشتمانپەروەریە نەبێت، دەبێت کامە سۆز پاڵ بە تاکێکی وەك عوسمان هەورامی، جەمیل و... لە هەڵەبجەی هەڵکەوتوو لە بناری هەورامانەوە- وەبنێ تا بەهەموو تواناوە هاواری "ئاوارەی وەتەن خەیلێ ستەمەن..." هەڵبڕن. یان شاعیرێکی نیشتمانپەروەری وەك:

میرزا ئۆلقادر پاوەیی سەد ساڵ پێش بۆ دوورکەوتنەوە لە پاوە هاواری "هاوار مەتەرسوو هاوار بۆ زێدم ..." بەرزکاتەوە.

ئاخۆ شاعیرانی شێوەزاری هەورامی وەك: بێسارانی، کاردۆخی، سەیدی، مەولەوی، میرزا شەفیعی کولیایی، کۆماسی، میرزا عەبدولقادری پاوەیی و... توانیویانە ئەوەندە

**کاریگەییان هەبێت کە لە پۆلێنبەندیی ئەدەبیدا بکرێت وەك قوتابخانەی ئەدەبی گۆران، یان هەورامی ناودێر بکرێن؟**

با بۆ وێنە چەند گۆشە لە جۆری بیرکردنەوەی خانای قوبادی لەمەڕ مەسەلە فەلسەفی، سیاسی، ئابووری و کۆمەلآیەتییەکان وەك پێشوو ئاماژەی پێدرا لە ساتەوەختەکانی دەورووبەری شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا وێکڕا بەسەر بکەینەوە ئەوجار خوێنەر خۆی هەلّیسەنگێنێت ئایا ئەم مرۆڤە مەزنە ئەگەر سەرمایەی هەر نەتەوەیەکی تر جیا لە کوردبایە، دەیان پەیکەری زێڕینیان بۆ ساز نەدەکرد؟ بەڕێز محەمەد مەلا کەریم لە پێشەکی شیرین و خوسرەوەکەی خانا لاپەڕە پازدە نووسیویەتی: "ئەوەی ئەم داستانە دەخوێنێتەوە لە هەستی شانازیی خانا بەخۆی، بە کورد، بە کوردستان ئاگادار دەبێت. بە باوەڕی لەبارەی ستەم و دادپەروەری و جۆری حوکمڕانی و ڕێژیی کۆمەلآیەتی ئاشنا دەبێت، هەلّوێستی لەبارەی ئافرەت و خۆشەویستی و بەسەربردنی ژیان و گەلێ بابەتی دیکە کە لەو سەردەمەدا بووە دەردەکەوێت".

خانا وەك بەڕێز، م -مەلاکەریم بەڕاستی پەنجەی ئیشارەتی بۆ درێژکردووە. نەك تەنێ مامۆستا و وەستاکاری بینای وشەی کوردی ڕەسەنە، بەلّکو لە ناسینی فۆلکلۆری شەڕ، ڕابواردن وەك زانست، شارەزایی نەریتە کۆمەلآیەتییەکانی شایی و شیوەن، ڕەوشتی هەلّسوکەوتی چینەکانی سەرووی کۆمەلّی کوردەواری و تەنانەت جۆری پۆشینی جلوبەرگی کوردی بۆ هەر جیل و توێژێك بە جیاوازی تەمەنەوە لە مندالّەوە هەتا ژن و گەورە پیاوی بەسالآچوو بە وردی و وەك دوورمانێکی پسپۆڕ شارەزایە. خانا شارەزای مۆسیقا، دەزگا و مەقامەکان، کەرەسە و شوێنی بەکارهێنانیانە. حورمەت و ڕێزی کەرەسەی مۆسیقا و دەنگی بەسۆزی گۆرانیبێژێکی وەك نکیسا* دەباتە ریزی پێغەمبەر و نوێنەرانی خودا، بەم شێوەیە هونەر و هونەرمەندی کورد پەسن دەکات. ئەو خودا بە ساز، بە لەحن و ئاوازی نکیسا بە نەبیر ئاهەنگ و موعجزە (پەرجوو)ی عیسای پێغەمبەر سوێند دەدات، هەتاکوو بە ئیرادەوە

---

* نکیسا، هاوڕێ لەگەلّ باربود دوو گۆرانیبێژو مۆسیقادانی دەربای خوسرەو پەویز بوون لە سەردەمی ساسانییەکان و لە کرماشان ژیاون.

بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی نیشتمانپەروەریی سەرشانی بۆ نەتەوەی کورد بەزمانی کوردی لە دوو تویێی دەقی)و هەروەرها

"شیرین و خوسرەو"دا دایڕێژێت.

بە ساز و بە لەحن شۆخ نکیسا

بە نەبیر ئاهەنگ موعجزەی عیسا

وێنەی نیزامی سەیقەل دەر زەینم

بە سورمەی دانش ڕۆشن کەر عەینم

تاکە ماجەرای شیرین و خۆسرەو

سەنگ تاشی فەرهاد سەرگوزەشت ئەو

باوەروو وەنەزم خاستەر جە گەوهەر

بە ڕەشح خامەی شۆخ بۆ عەنبەر

بە لەفز کوردی کوردستان تەمام

پێش بوان مەحزووز باقی وەسەلام

هەموو خەمی خانا ئەوەیە ئەرکی خۆی بەڕادەیەك لە بێخەوشی و سەردەستیدا بۆ خزمەت فەرهەنگی کوردی لە چوارچێوەی ئەو داستانە تۆمار بکات هەتا خەڵکی سەرانسەری کوردستان لێی ڕازی و شادمان بن. شادمانییەکی وەها کە بۆ تۆرمەی کورد هەتا هەتایی بێت.

**داد و دادپەروەری لە شیعری خانا:**

خانا ڕای خۆی لەسەر عەدل و دادپەروەری بەشێوەی خوارەوە دەردەبڕێت. ئەگەر تێڕوانینەکەی خانا لەم بوارەدا لەگەڵ کردار و یاسا پەسندکراوەکانی دەسەڵاتدارانی هەنووکەی ئێران و ئەوانەی پێش ئەمان بە تورك، عەرەب و سەرجەم دەوروبەری کوردستانەوە کە هەرلایەکیان لە خۆهەڵکێشان و فەخر و شانازیکردن بە کەسایەتی و ڕابردوویان بانگەشەی بنۆ دەکەن، بەراورد بکەین، ئەوجار مەزنیی زیاتری کەسایەتییەکی گەورەی وەك خانا زیاتر فام دەکەین. خانا گەورە دەسەڵاتداران وەها ئامۆژگاری دەکات:

مەعلوم بۆ جەلای بوزرگان دەور
هەرکەس عادڵ بۆ چوون هورمز بەی تەور
بەرگوزیدەی زات حەی ئەکبەرەن
مەحفووزەن جەنار ئەر سەد کافەرەن

خانا هەتا ئەو رادەیە پلەوپایەی دادپەروەری بەرز هەڵدەسەنگێنێت کە لای وایە هەرکەس دادپەروەر بێت وەك چۆن کۆمەڵگای موسڵمان باوەڕیان هەیە "کەسێ موسڵمانی باش بێت بەهەشت جێگایەتی"، ئەو مافپارێزی باش و هەڵبژاردە و بەرزە مەقام لای خودا و لە ئەگەری بێ باوەڕی ئایینی، دیسان جێگای لە بەهەشت بەدڵنیایی بۆ تەرخان دەکات.

بلیمەتی دەوران، خانای قوبادی، داد و دادگوستەری بە ماکەی ریشەکێشکردنی گەلێك لە نەهامەتی و دواکەوتوییەکانی کۆمەڵگا دەناسێت. وەك لەم بەیتەدا:

بە سەمع شەریف بشنەو حێکایەت
ئەر قەسدش خێرەن والی ویلایەت
بەجای گۆڵ زەمین ماوەرۆ گەوهەر
سەنگ مەبۆ بەلاڵ خاکش بە عەنبەر

وڵاتێك دەسەڵاتداری مافپەروەر و خێرخوازی کۆمەڵ بەڕێوەی بەرێت، بەروبوومی پڕ بار، زەڕخێز و بەردی بێ قیمەتی نرخی لاڵ (لەعل) و خاکی پڕ حاسڵ و بە بۆن و بەرامەی ژیانبەخش و بەرەکەتدار دەبێت. پێچەوانەکەشی، لە ئەگەری وەك ئەمڕۆی ئێران و زاڵبوونی نادادپەروەری و وێرانی و نائارامی و پاشکەوتوویی بار دێنێت. هەر وابزانە خانا لەسەر بەرزاییەك دانیشتووە و هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی تاران وەك بزووتنی مێرووله لەژێر زەرەبینی وردبینی ئەودا بووە.

ئەر والی بێ عەدڵ شەرارەت پیشەن
بەدجنس بەدکار دوور جە ئەندێشەن
وەڵگەی مەملەکەت کەی مەعموور مەبۆ
ئیمەنی و راحەت جە خەڵك دوور مەبۆ

خەڵك بەهێند گرتن، راوێژ و دوور ئەندێشی بۆ راپەڕاندنی گرفتەکانی کۆمەڵ.

خانا دوور روانین و چارەئەندێشی لە تەنگانە و بوارە سەختەکانی ژیانی کۆمەڵگادا بە دادانی وانەی کورت و پڕ لە فێرکاری دەستەبەر دەکات.

بەڵێ دەستوورەن نە عەرسەی دەوران

وەختێ کار سەخت روودۆ نە ئینسان

ئەر چوون ئەفلاتوون موو شکاو مەبۆ

فرێ پێش خەریك هەم خەرکاو مەبۆ

خوسرەو، کەرد بە هۆش رۆشنی زەمیر

ئەی کارە بەدەست رجووع تەدبیر

پەی چێش؟ مەواچان یە پەند پیرەن

تەحلیل مۆشکڵ هەر بە تەدبیرەن

خانا ئاوڕ لە هەر چەمك و بابەتێك دەداتەوە وەك مێو لەبەر دەستیدا نەرموونیان بە مامۆستایەتییەکی زانستی و شێوازی راستەقینە گیان و رۆحی بە بەردا دێنێت.

ئابووری لەو باسە زانستییە چڕوپڕ دژوارانە پێناسە کراوە کە هەرکەس نەیتوانیوە خۆی لێ بدات، مەگەر تەمەنێك فێرکاری و پەروەردی تایبەتی بۆ تەرخانکرابێت، هەروەها تاکی رێبواری ئەم هەڵەمووتە دەبوو کەرەسەی باش و مێشك دەوڵەمەندییەکی لا چڕوپڕ بووبێت.

یاسای "عەرزە و تەقازا" لە زانستی ئابووریدا لەگەڵ پێشڤەچوون و گەشەی سەرمایەداری وەك بناغەیەك دانی پێدانراوە. هەر بۆیە خانا وەك ئەوەی بۆ خۆی ئەم بنەما ئابوورییەی داهێنابێت دەقاودەق ئەو پێگەیشتنە زانستییە لە رۆژگاری ئێمەدا لە خوێندنگەکان فێری خوێندکار دەکرێت بە جوانترین و کورتترین وشە تۆمار و شیکاری بۆ کردووە.

پەی چێش؟ کە دونیایە بازاڕشەن

هەر جنسێ دوو کەس خەریدارشەن

بەی تەورەن دەستوور جەلای سەوداگەر

بەهای ئەو جنسە مەبۆ گرانتەر
بەڵێ، جەلای ئەهل دانای دیاریی
خاس نیەن کەرۆ کەس تێر بازاڕی
مەتای، هەر کەسێ خەریدارشەن
ئەر زوو بورەشۆ سەرفەی کارشەن
دەوڵەمەند، ئەوەن کاڵای وێش دایم
چوون رەواجش بۆ نەکەرۆش قایم

بەدڵنیاییەوە دوور لە دڵەڕاوکێ و زێدە وتن، تۆمارکراوە مەزنەکەی خانا "شیرین و خوسرەو" لە ریزی سەرەوە یان هاوشانی ئەو تۆمارکراوانەی دەر و جیران کەمتر بە حیساب نایەت کە ساڵانە بە جاران ریزیان لێ دەگیردرێت و بەسەدان جار هەڵسەنگاندن، شرۆڤە و پێداچوونەوەی زانستی بۆ هەرچی بەناوبانگترکردنیان تێدەکۆشن و وەك دەسمایەی بیر و هزری نەتەوەی سەردەست لێرە و لەوێ بانگەشە دەکرێن. دیارە خانای قوبادی تەنێ وێنەیەك لە دەیان رەنگین پەنجە و قەڵەمی هەورامی نووسەکانی ئەم دەڤەرەیە. دەنا هەرکەس تۆزێك سەرنجی دابێتە قەسیدە پڕ نێوەرۆکە نیشتمانییەکەی میرزا ئەولقادری پاوەیی "کولە و ئاینەمەل" ئافەرین دەنێرێت بۆ بەرز روانین و هێزی بەهێزی فام و وردناسانەی سیاسی و جیهانبینی گشتیی ئەم کەسایەتییە بەنرخە کە بە خۆشییەوە وێنەیان لە گەنجینەی هەوراماندا زۆرە.

**ئەدەبی کلاسیکی هەورامان چ قۆناغ و رەوتگەلێکی بریوە و بەستێنە کۆمەڵایەتی، سیاسی و فەرهەنگییەکانی کامانە بوون؟**

تێڕوانین لە رابردووی بزاڤی ئەدەبی هەورامان بەپێی کەونینەبوونی رێچکەی ئەم بوارە، دیسان ئەگەر نێوەرۆکی زۆر نزیکی وشەی بەکارهێنراو لە ئاڤێستا بە حیساب نەهێنین و قەناعەت بە وتەی لێکۆڵەرەکانی قەباڵە مێژووییەکان بکەین، دەتوانین بەپێی هەڵێنجرانی خاوەن را و پسپۆڕان بەو ئاکامە بگەین.

قۆناغی یەکەم: ئەدەبی هەورامی لە دەسپێکی هەزارەی یەکەمی زایینی و بە رەنگدانەوەی نێوئاخنی کۆمەڵایەتی، ئابووری و مێژوویی دەستی پێکردووە. ئەمە وەك

یەکەم قۆناغ و لەڕاستیدا هەتا ئەوکاتە پشکنینی نوێ و ڕای جیاواز نەگاتە ئەنجامی پێچەوانە، بەقۆناغی یەکەم دەتوانین ناودێری بکەین.

قۆناغی دووەم: بە مەودایەکی زۆرەوە دەگاتە سەرەتای پەرە ئەستاندنی ئایینی ئیسلام لە ناوچەکە و دژکردەوە و هەڵوێستی تۆمارکراو، یان سینگ بە سینگ بەجێماو و گەیاندنی بەدەستی وەچەی هاوچەرخ بە بەرزکردنەوەی دەنگی باڵووڵی ماهی وەك سەرقافڵە مەیدانداری دەکات. هەڵبەت ئەم قۆناغە بە هێندێك جیاوازی و ڕۆشنگەری و تۆماری وردتری ڕووداوەکان وردەکاریی پتر بەدەستەوە دەدات. ئەوە ڕێی تێدەچێت بە قۆناغی بەرزبوونەوەی توانای تۆماری هەست و سۆزی پارێزگاری ژین، ژینگە، ئاڵوگۆڕە بنەڕەتییەکان بەتایبەت باوەڕی ئایینی و وێنەکێشکردنی بەسەرهاتەکان بە نەزمێکی نوێ و بەرفراوانتر. لە هەمانکاتدا نیشاندانی ڕەنج و پەرۆشیی مرۆڤی کورد و بەسەرهاتە تاڵەکانی لەم ناوچەیەدا. بە کورتی قۆناغی دووەم قۆناغی سەرهەڵدانی ڕەوشتی بەرپرسانە بۆ تێگەیاندنی ڕێکوپێکتری نەوەکانی دواتر لە ڕووداوەکان، هاندان و ڕێنوێنی لە پانتاییەکی بەرفراوانتردا بە داهێنانی نوێ دەژمێردرێت.

قۆناغی سێیەم: بە خۆرهەڵاتی هەست و سۆزی دەستنیشانکراوی نیشتمانی. ئاماژەی ڕاستەوخۆ و هێدی هێدی ڕاپەڕین بۆ دامەزراندنی سیستمی تایبەت بە باوەڕی خاوەن ڕا و شارەزایان لە دەورەی بابا سەرهەنگی دەوانی (سەدەی دووەمی کۆچی) خۆی دەناسێنێت. لە سەدەی هەشتەمدا بە هاتنە مەیدانی سوڵتان ئیسحاق دەگاتە چلەپۆپەی یەکەم دەزگای ئایینی کوردیی بەرفراوان و داهێنان بە پشتبەستن بە بنەمای مێژوویی و ئەزموون وەرگرتوو. دەوڵەمەندی وێژەی "گۆران- هەورامی" لێرەدا بنچینەی تۆماری ریشە دادەکوتێ و بەرهەمی باش بە گەنجینەی کورد دەبەخشێت.

قۆناغی چوارەم: دوای ئەم دەورانە بە هاتنە مەیدانی زانایانی نیشتمان خۆشەویست، بێسارانی، خانای قوبادی، مەولانا خالید نەقشبەندی، مەلا خدری ڕواری، سەیدی هەورامی، شێخی سەراجەدین- شێخ عوسمان نەقشبەندی (١١٩٥ کۆچی)، شێخ محەمەد بەهائەدین، شێخ حیسامەدین، مەولەوی و... هتد.

لە درێژەی ئەم ڕەوتەدا سەرهەڵدانی وێژەی گۆران لەژێر کارتێکەری و تەوژمی تەسەوف و جەدەلی فەلسەفەی ئایینی کۆمەڵایەتی شانبەشانی سەرهەڵدانی

مەکتەبەکان دەکەوێتە بواری خولقاندنی بەرهەمی بەپێزی وێژەییەوە. لەگەڵ ئەوەدا بەرزی و نزمی دەخاتە نێوان رۆژەڤی بیری دینداراتی خاوەن فکری کورد بەگشتی و رەکێشکردنی وزەی بیرمەندی کورد بۆ ئاقاری سۆفیگەری، مورید و مورشیدی ئایینی و... لەم نێوانەدا دوو ئیمپراتۆری زاڵی ئایینی (عوسمانی و سەفەوی)، لەسەر بیری باوەڕمەندان دەوری رێگری تەواویان بۆ پەرەسەندنی وێژەی رزگاریخوازانە (شۆڕشگێڕی) راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە رێگەی کارتێکەریی فەرمانڕەوایانەی ئایینی بەرچاوە.

هەرچەند بیری سۆفیگەریی پەرەسەندوو و سەرهەڵداوی سەدەکانی دووەم و سێیەمی ئێستا ئیتر لە کوردستان بەتایبەت بە بوونی بلیمەتێکی وەك شێخ شەهابەدینی سۆرەوەردی (٦٣٢) کە خۆی کورد بووە و لەلایەکی دیکەشەوە دەوری بە توانای کەسایەتییەکی وەکو مەولانا جەلالەدین کە ئەویش هەر نەبێت بە دوور لە خزمایەتی نەسەبی لانیکەم لە دایکەوە لەگەڵ کوردان بووە، شانبەشانی شێخ سەفی (٧٣٥) و نفوزی مەعنەویی ئەمانە و کەسایەتییە بەناوبانگەکانی ئەم بوارە لە دوور و نزیکەوە دەوری هەرە بەرچاویان لەم چاخە لە ژیانی کورد بۆ بەلاڕێدابردنی بیری نەتەوەیی و غەرق و تێکەڵاویی شاعیر و زانا و بیرمەندانی سەردەم لە دەریای مەند و قووڵی فەلسەفە فیکرییەکەی، هەرچەشنە مەجالێك لە ئاوڕدانەوە بە لایەکەی دیکەدا دەخاتە پەراوێزەوە.

پانتایی توانەوە لەنێو بگرە و بەردەی رۆژانەی باس و خواسی سۆفیگەری و ملکەچکردن بەرامبەر دەسەڵاتدارانی حاکم و شێخ و نوێنەرەکانیان کە پێوەندی نەپساویان لەگەڵ جەدەلەکان وێڕای هەوڵدان بۆ پاراستنی دەسەڵاتیان، تێکۆشانە باوەڕمەندانەکەی مەولانا خالید نەقشبەندی هەر نەبێت بۆ جیاکردنەوەی رێچکەی ئایینی کوردان وەك تورك و فارس و عەرەب و هەوڵدانی بۆ بەرگی کوردی بە بەرکردنی تووشی بێ ناکامیی دەکەن! نابەجێ نییە ئەگەر پێداگری بکەین بۆ بەرگریی نیشتمانی، دیسان هەوڵی لابەلا هەر لەئارادا بووە. باسکردن لە وێنەیەك رەنگە بێجێ نەبێت. ساڵی ١٢٨٦ کۆچی فەرهاد میرزا مامی نەسرەدین شای قاجار حاکمی کوردستان بە لەشکرێکی زۆرەوە بەرەو هەورامان هێرشێك دەست پێدەکات، بەڵکو بتوانێت هەورامییەکان بێ دەسەڵات بکات و هێزی تاران لەوێ بسەپێنێت.

بەگزادە، حاکمی خۆماڵی هەورامان داوا لە شێخ محەمەد بەهائەدین دەکەن بۆ بەرگری لە کوشتار و زیانی خەڵك لە فەرهاد میرزا بخوازێت لە هێرش چاوپۆشی بکات. سەرەتا شێخ بڕیار دەدات سەردانی فەرهاد میرزا بکات، پاشان بەو ئاکامە دەگات پێشەکی هەڵسەنگاندنێك لە بیروبۆچوونی شازادە بەدەست بێنێت، ئەگەر مەجالی ئەوە لە وەڵامەکان هاتە دەست بۆ دیدار هەنگاوی زیاتر بهاوێژێ.

لە وەڵامی یەکەم داخوازی شێخ بۆ وازهێنانی نوێنەری شای قاجار ئەم کورتە نووسراوە لە ناوبراو بەدەستی دەگات:

ما شیخ و زاهد نمی شناسیم

یا جام بادە، یا رووی ساقی

شێخ پاش دیتنی نووسراوەکەی فەرهاد میرزا، ئەم وەڵامە کورتەی بۆ رەوانە دەکات:

ما میر و سلگان نمی شناسیم

یا عدل و احسان، یا قهر باقی

هەڵبەتە پاش ئەوە هەورامییەکان بە شەو پەلاماری شوێنی فەرهاد میرزا دەدەن کە بە رەزالەت لە دەستیان نەجاتی دەبێ. (مێژووی هەورامان ٤٤٢-م. هەورامانی).

**لە چەند زەمەنێکی مێژووییدا هەورامان ناوەندی دەسەڵات بووە و هەروەك دەزانین دەسەڵاتیش پاڵپشتێکی سەرەکییە بۆ گەشەی زمان و ئەدەب و فەرهەنگ، ئەو قۆناغە مێژووییانە کامانە بوون و چ کاریگەرییەکیان هەبووە، وەك دەبینین تەنانەت شاعیران و ئەدیبانی غەیرە هەورامی و ناوچەکانی تر بەم زاراوەیە شیعریان داناوە، بەڕای تۆ هۆکارەکەی چی بووە؟**

لە کوردستان هەتا سەرهەڵدانی نالی، سالم، مەحوی و گۆران و هێنانەمەیدانی کالاّی وێژەی سۆرانی ئەگەر تێکۆشانە وێژەییە تاقانە ئێگجار مەزنەکەی خانی (دین و دەوڵەت)، تۆمارکراوەکەی لێ دەرچێت، هەر لە سەرەتای مێژووی ئەدەبی کوردییەوە تەنێ وێژەی گۆران (هەورامی) مەیدانداری بەدەستەوەگرتنی قەڵەمی کوردی بووە.

ئەم راستییە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ پێشینەی مێژوویی ناوچەکە. هەبوونی دەسەڵاتدارانی مەزنی ئایینی زەردەشت لەم ناوچەیە وەك مۆبدی ناودار (پیر شالیار)ی زەردەشتی کە لەوە دەچێت نەوە دوای نەوە بەردەوامیی ئەرکی نوێنەرایەتیی بەرزی ئەم ئایینە لە ئەستۆی کەسانێك بەم نێوە سپێردرابێت و هەتا سەرکەوتنی عەرەب هەر درێژەی هەبووە. دین و دەسەڵات زۆربەی کاتەکان یار و هاوتا و هاو بەسەرهات بوون. بە کورتی ئیدارەی کۆمەڵگا بە ئیرادەی هاوبەشی فەرمانڕەوایانی دینی و دونیایی (حاکمان) بەڕێوە چووە. هەورامانیش لەم ڕێوشوێنە بەدەر نەبووە. دەسەڵاتی بەهێزی دین لەم شوێنە ستراتێژیك و لەگیران نەهاتووە، هەموو کاتێك یار و یاوەر و پاڵپشتی دەسەلاتداران و لە کێشەکاندا ڕۆڵی ڕێگاچارەی گێڕاوە. لە پرسیاری حەوتدا وێنەیەك لەم پێوەندییەدا باسکرا.

درێژەکێشانی دەسەڵاتی پشتا و پشتی بەگزادەکانی هەورامان هەتا سەروبەندی ساڵەکانی ١٣٢٤ی کۆچی خۆری بەردەوامیی پیرۆزی ئاخاوتن بەم زمانە وەك زمانی دین، لە قۆناغگەلێکدا کە بەداخەوە دەرەتانی توێژینەوەی تەواوی بۆ سەلماندنی یەکجارەکیی نەڕەخساوە، هەرچەند لانیکەم جارێ بەپێی ئاسەواری بەنرخی جێماو لای یارسانەکان ئەم بەشە دەرەتانی مشتومڕی نەهێشتووەتەوە. ئاسەوار و بەرهەمی ڕووگە بوونی هەورامان بۆ باوەڕمەندانی ئایینی، ڕەکێشکردنی سەرنجی باوەڕمەندان بۆ لای وێژەی مەڵبەندی دەسەڵاتی ئایینی، خۆ خەریککردن بۆ فێربوونی زمانی پیرۆز و تۆماری بیروبۆچوونەکان بەم زمانەی لێکەوتووەتەوە. لە حاڵی حازردا ئەوەی توانرابێت لە فەوتان رزگاری بێت، لە شارێکی وەك دێزفوول لە پارێزگای "خووزستان" هەتا ئازەربایجانی ئەمڕۆ بەڵگەی نووسراو و بەرهەمی نرخدار لەبەردەستدان و هەتا دەچێ گەنجینەی زۆرتر بە کتێبخانەی سەرفراز و رزگار لە موسیبەتی فەوتان، دەوڵەمەندیی زیاتری لێ وەدەر دەکەوێت. لە سەریەك کاریگەریی دین و دەسەلات لە شام و ئانادۆڵ و بەغداوە بگرە هەتا هیندستان و ئازەربایجان قەڵەمی مرۆی شەیدای ڕاستی و هەقیقەتی هێناوەتە خزمەت وشەی گۆرانی، لە درێژەی ئەم ڕەوتەدا ئایینی زەردەشت، ئایینی یارسان، شێخایەتی و شەیدایی کەسایەتییە بلیمەتەکانی عارف و سۆفی و موسڵمانانی شەیدای خاکی پیرۆز هەرکامە دەوری تایبەت بە خۆیان لەم پرۆسەیەدا گێڕاوە.

**پاش نەمانی دەسەڵاتەکان، هەورامان لە بواری ئەدەبییەوە کز و لاواز دەبێت و ئەدەبیاتی هەورامان بۆ ماوەیەکی زۆر لە بەرهەمهێنانی شیعر رادەوەستێت، نموونەیەکی بەرچاوی ئەوتۆ نابینرێت و لەباتی نوێبوونەوە و تێکەڵبوون بە رەوتە نوێخوازییەکانی ئەدەب لە رۆژهەڵاتی کوردستان پاشەکشێ دەکات و هەر لە رابردوودا دەخولێتەوە، بەڕای جەنابت هۆکارە سەرەکییەکانی بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

لە دووتوێی پرسیارەکانی پێشوودا بەشێك لە هەڵەمووتی خولقێنراو و بەربەستەکانی سەرڕێی پێوانی ڕێچکەی مێژووی بەرەو سەرفەرازی زێدەتر و خۆپێگەیاندنی سەردەمییانەی ئەدەبی گۆران خرایە بەر را و چاوی وردبینی خوێنەر و ئاماژە کرا کە دەسەڵاتداریتی و بێدەسەڵاتی زیان و قازانج، پێشکەوتن و وەستان و پاشکەوتن لە بەرهەمە ئاساییەکانی سەرژمێر دەکرێن.

لە حاڵ و وەزعی ژێردەستی زاڵمانی دژ بە ویژەی کوردی نەك هەر منداڵ لە خوێندنی زمانی دایك بێبەش دەکرێت و یاسایەك نییە دەرکەی داخراو بخاتە سەرپشت، پەنابردنی گەورەساڵان بۆ بەرگری لە فەوتانی ئاسەواری نیوە و ناتەواو و پارێزراو بەرەورووی ئاستەنگی مەزن هەتا رادەی زیندان و قوربانیبوون دەبێتەوە، ئاسان نییە بتوانرێ هەنگاوی مەزن بۆ قەرەبووی پاشکەوتنەکان هەڵبگیردرێت.

سەرەڕای ئەوە هیمەتی پەروەردەکراوی پابەند لەنێو نەوەی رێشە دابەستوو لەسەر بنەمای دێرین توانیویەتی درِ بە بەربەست و بەشێك لە ئاستەنگەکان بەشێوەی ناڕاستەوخۆ بدات و هێندێ جێ پەنجەی دیار لە ساڵەکانی دواییدا بکات بە چرای هۆمێد و هیوا بۆ داهاتوو. هاوکات لە نووسینی دەقی ئەدەبی، مێژوویی، شیعر و رۆژنامەگەری هەورامیدا دەسپێشخەری هیوابەخش مژدەی داهاتووی باشتری پێیە.

**پێت وانییە هەڵکەوتەی جوگرافیایی و سروشتی سەرکێش و بیرۆکەی نەریتی رابردوو لەباری خۆبژێوی و بێمەنتی بە بێگانە و تێکەڵ نەبوون بە کولتورەکانی تر، چەند هۆکارێکی دواکەوتوویی فەرهەنگیی هەورامانە، رای بەڕێزت لەم بارەیەوە چییە؟**

هەورامان و هەورامی نە لە دەورانە دوورەکاندا کە پێوەندی مرۆیی هێندە ئاسان نەبوو و نە ئێستا حەز و ئارەزووی لەگەڵ خۆحەشاردان و خۆشاردنەوە لە دنیای دەرەوەی خۆی نەبووە. ئەوەی کە لەنێو ئەم شاخە هەزار بەهەزارانەدا توانیویەتی دەوام بێنێ و لەگەڵیان ببێتە خزم و کەس بە هیچ پێوانەیەك دژەبەرایەتیی مەیلی راکێشانی خەڵك لەوپەڕی دونیای دوورەوە بۆ زیارەتی دڵدارەکەی (هەورامانی ژینگە) وەك باسکرا لە هێندستانەوە خەڵکی هێناوەتە ئەوێ و فێری وشەی گۆرانی کردووە نەبووە، خۆی بەڵگەی ئەم راستییەیە.

وەك هێژا مەلا حەسەنی دزڵی (مەردۆخی) فەرموویەتی راستە کە هەورامانی:

"کاڵە و کڵاشی کاری هەورامان نا دا بە قۆنرەی چەرمی سەکینە"

بەڵام لە هەمان کاتدا هونەری تاکی هەورامی لەوەدایە لە بەرەبەری دەسپێکی مێژوودا و ئەوکاتانەی مرۆ فامی کردووە توانیویەتی پێوەندیی بازرگانی، کۆمەڵایەتی، زمانی، ئاییینی و... هتد لەگەڵ دوور و نزیکی خۆی بە رەچاوکردنی پاراستنی تایبەتمەندییە رەگەزییەکانی خۆی دابمەزرێنێت و ئەوە یەك لە خاڵە بەهێزەکانی رەمزی مانەوە و درێژەی ژیانییەتی. ئەمرۆ هەر هونەرمەندێکی کورد کە سەودای ناو و دەنگ و راکێشانی سەرنجی جەماوەر و خوڵقاندنی بەرهەمێکی بەپێز بێت، سەرەتا روو لە هەورامان دەکات و لە خەزێنەی دەوڵەمەند و پڕ لە دووڕی هونەر بە تۆماری گۆرانییەکی هەورامی، یان تازەکردنەوەی یەك لە ئاهەنگە هەورامییەکان بۆ خۆی سەر و گەردنێکی بەرز دەنوێنێت. ساڵانی دوایی نەك تەنیا لە کوردستان، بەڵکو لە سەرانسەری ئێران زۆر رۆژنامەوان، فیلمساز، کەسانی هەڵوەدای فەرهەنگ و کولتووری پارێزراوی بێخەوشی رەسەنی میللی رێگایان بەرەو هەورامان گرتووە، هەتا بتوانن بن بە خاوەنی دەسکەوتێکی کەسایەتی سازی پڕ بەرهەم چ مادی و چ مەعنەوی.

**چی بکرێت هەتا رەوت و شەپۆلە نوێیەکانی ئەدەب، وێڕای پاراستنی رەسەنایەتی، لە هەورامان سەقامگیر بکرێن و ئەم شێوە زارەش ببێتە کۆڵەکەیەکی گرنگ و زیندوو بۆ ئەدەبی نووسراو و دەوڵەمەندبوونی زمانی نەتەوەیی کوردی؟**

خۆ دوورخستنەوەی کاربەدەست، دەسەڵاتدار، ئەدیب، زانا و کەسایەتیی کورد بەگشتی لە ناوچەیی بیرکردنەوە و دەسەڵات تەوەرەی، هەوڵدان بۆ جێگیرکردنی بیر و کرداری کوردستانی، نەك لە چوارچێوەیەکی داخراو، بەڵکو بە پانتایی کوردستان و قازانجی سەرجەمی وڵاتی کوردان دەتوانێت دەوڵەمەندیمان دەوڵەمەندتر و سەربەرزیمان تاسەر و هێزی خۆڕاگریمان بەهێزتر بکا.

ئەگەر تاکی نیشەجێ فلانە شار بە پاساوی ئەوەی کە پێشینەی دوورودرێژی لە فیسارە بواردا هەبووە، ئەوە دەبێت خەڵکی شارەکانی دیکەی کوردستان ملکەچی ئیرادەی ئەو و ناچاری پەسندکردنی هەموو خواستێکی هەڵقوڵاو لە بازنەی بیری ناوچەکەی ئەودا بن، پشت لە رابردووی بەنرخی خۆیان بکەن، ئەوە نە مەیسەر دەبێت و نە قازانجی کورد و کوردستانی تێدایە.

تێفکرین و کردەوەی ئەوتۆ نە قازانجی تاك لە درێژخایەندا دەستەبەر دەکات، نە دەبێتە دەستمایەی بەهێزکردنی دەسەڵاتی هیچ بەشێك لە وڵاتی کوردان. میراتی کورد لە هەر گۆشەیەکی ئەم نیشتمانە بە سامان و ماڵی هەموو تاکێکی خۆ بە کوردزان دەژمێردرێت. ئەرکی هەموانە بۆ پاراستنی خاڵ بەخاڵ، پیت بە پیت و وشە بە وشەی زمان لە هەر گۆشەیەك و بست بەبستی شاخ و بەرد و هەردی ئەم نیشتمانە زوڵم لێکراوە تێ بکۆشن. هەرکام لەم پێکهاتانە زمانی نەتەوەیی تاك بە تاکی خەڵکی ئەم وڵاتەیە کە نیشتمانی کوردانە. بۆ پارێزگاریکردنی ئەوەی کە وترا رێگاچارەی گونجاو هەیە، مەرجە بە دڵێکی پڕ لە سۆزی نیشتمانی و بەرپرسانە و ئیرادەیەکی پتەو بۆ کەڵکوەرگرتن لە هەر سەروەت و سامانێك کە هەمانە بتوانین بەهاوکاری یەکترو بە دامەزرانی کۆڕ و ئەنجومەن و دەست نیشانکردنی پسپۆڕانی هەر بوارێك بە لەبەرچاوگرتنی قازانجی وڵات و خۆگری نەدان بە بیری خۆ فەرزکردن لە هەموو دەرفەت و پێکهاتەکان کەڵك وەرگرین. زاراوەی هەورامی زەرفییەتێکی باشی بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی تێدا حەشار دراوە. کەڵك وەرنەگرتن لەم گەنجینەیە ئەگەر دوژمنایەتی زمانی کوردی نەبێت، بە هیچ لەونێ پاساو نادرێتەوە. لە دونیای پێشکەوتوودا پارە و هێزێکی بەرچاو بۆ پاراستنی ئاخاوتنی تایبەتی خەڵکی تاقە گوندێك بە پەرۆشەوە تەرخان دەکرێت. گونجاو نییە لە کوردستان بۆ پارێزگاری و ئاوڕدانەوە لە سامانی هاوبەش، ئەو هەموو لاسارییە بەرامبەر بنچینەی زمانی

ڕەسەنی کوردی و بێ مەیلی هەتا ڕادەی لە هەمبەر وەستانی ئاشکرای ببێتە بەرنامەی دەسەڵاتێك کە هەر تاکێکی هەورامان وێڕای هاوخەباتی بۆ وەدیهاتنی ئەو دەسەڵاتە خۆماڵییە، لە ئاکامدا خەونی ڕۆژگارانی دوورودرێژی ببێتە تەوەرەزینی بڕین و سڕینەوەی یەکجارەکیی ڕیشە پارێزراوەکەی لێ بێتەدی.

کاتێك ئاسۆی بەرەوڕوو هەنگاوی جێگیرکردنی ئەویدی، واتە سڕینەوەی ئەوەی هەتا ئێرە بە زووخ و چەرەمەسەری پارێزراوە، ببێتە پێوەر و بە یاسا پشتی بگیرێت، بە کامە ئۆمێد کۆڵەکەی نوێ دەتوانێت ببێتە بناغە و ئەستووندەك بۆ پتەوکردنی هێزی لەسەرپێ وەستانی قایمترمان؟!

**پێناسە:**

- سدیق بابایی لەدایکبووی شاری پاوەیە.
- لە سەرەتای شۆڕشی گەلانی ئێراندا بەشداری چالاکییە سیاسییەکان بووە و بۆ ماوەی زیاتر لە ٢٠ ساڵ بەردەوام بووە.
- لە سەرەتای دەیەی ٧٠ی هەتاویدا پەڕیوەی هەندەران بووە و لە وڵاتی ئاڵمان نیشتەجێیە.
- ٢٠٠٧/٢٠٠٨ بڕوانامەی ڕۆژنامەوانی لە فەرەنسا وەرگرتووە.
- شارەزای بواری فەرهەنگ، مێژوو و ئەدەبی هەورامانە.
- ئێستا سەرقاڵی خوێندنەوەی مێژووی کوردستانە.

**ژێدەرەکان:**

١- قەباڵە کۆنەکانی هەورامان.
٢- دکتۆر جەمال ڕەشید.
٣- مێژووی هەورامان. م .هەورامانی.
٤- مێژووی وێژەی کوردی، د. سدیق بۆرەکەیی، بەرگی یەکەم.
٥- مێژووی هەورامان. موزەفەر بەهمەن سوڵتانی.

# شوناس و مێژووی زمانی کوردی

جەلال حاجی زادە- سەقز

**کورته باس:**

مەبەست لەم بابەتە شیکردنەوەی زمانی کوردی و خوێندنەوە و بەراوردێکی مێژووییە لەسەر زمان، کە لەپاڵ ئەوەشدا، وێڕای کورتەباسێك لەمەڕ زمان، زۆر بە کورتی سەرنج دەدەینە سەر پێوەندیی نێوان زمانی کوردی و بەراورد و پێکهەڵکێشانی لەتەك ژێدەرە دیرۆکییەکان.

**پێشەکی:**

نابێت لەبیر بکەین کە کاریتە و بنەمای چەمکی شوناس لەسەر بەردی بناغەی خودناسی، یاخود، ناسینی فاکتەکانی پێکهێنەری شوناس دادەمەزرێت، هەتا بەشەکانی ناوەرۆکداری بەرهەمهێنەری ئەو دیاردەیە نەناسین و لەباری گەشەپێدان و راهێنانەوە کاری پێویستیان لەسەر نەکرێت، لەڕاستیدا شوناسێکی شاردراوە سەر هەڵنادات، بەو پێیە لەسەر ئەو باوەڕە سوورم کە، دینی کۆن (زەردەشتی) و زمانی لەمێژینەی کوردی، دوو بناغە و دیرۆکی سەرەکی ناسنامەی کورد پێك دەهێنن، دیارە لەژێر پرۆسەی خودناسین، پێناسەکردن و توێکاریی توخم و بەشەکانی شوناسی کورد گرنگییەکی لەڕادەبەدەری بۆ کورد هەیە، یەك لەو بەشانە بریتییە لە زمانی کوردی، بۆیە ئەم وتارە بەو مەبەستە پێشکەش دەکرێت.

لەگەڵ ئەوەی کە زمان بەگشتی وەك دەروازەی چوونە ژووری بە جیهانیبوونی نەتەوەکانی تر لە قەڵەم دەدرێت، زمانی کوردی بەشی جیانەکراوی شوناس و فەرهەنگی خەڵکی کوردە و لەگەڵ ئەوەشدا وەك فاکتەری سەرەکیی جیاکەرەوەی نەژادی و نەتەوەیی لەگەڵ دراوسێیەکانی بە حسێب دێت. پێوەندیی نێوان شوناسی فەرهەنگی و مێژوویی کورد لەگەڵ زمانی کوردی هەتا رادەیەکی بەرچاو مسۆگەرە. لەم رووەوە لەو باوەڕەدام کە زمانی رەسەن و دێرینی کوردی، وەك کاریتە پشت (ستوونی فەقەرات)ی میللەتی کورد دێتە ئەژمار، شاراوە نییە کە رۆڵی زمانی هەر نەتەوەیەك لەسەر جەمسەر (مێحوەر)ی فەرهەنگی و ئامرازی شوناس پێدان بەو نەتەوەیە پەرە دەستێنێت.

زمان وەك گرنگترین ئامراز و هۆی پەیوەندی و زانیاری وەرگرتن و زانیاری پێدان، بەردەوام لە حاڵی گۆڕان و دۆنادۆنی و بزاوت دایە، هەروەك ئاڵوویر و پێوەندیی نێوان

فەرهەنگ و کولتوورەکان لەئارادایە، زمانیش ئەو قۆناغە تێپەڕ دەکات، بێگومان هۆی زیندووبوونی زمانیش هەر ئەوەیە، لەبەرئەوەی زمانی فەوتاو هیچ پێویستییەکی بەو کەرەسەیە نییە.

ئەوەش روونە کە زمان بەهۆی زەرورەتی پەیوەندیی نێوان خەڵك، هاتووەتە ئاراوە و لە ماوەی هەزاران ساڵدا بەم جۆرەی کە ئێستا هەیە پەرەی سەندووە. ئاشکرایە هەڵسوکەوتی نێوان گەلەکان لەباری شەڕ، فەرهەنگ، دین و ئایین، زانست و مامڵەی ئابووری و... دەبێتە هۆی گۆڕانکاری و گەشەکردنی دوولایەنەی زمانی گەلەکان (دکتر منیره احمد سلطانی، واژگان فارسی در زبانهای اروپایی).

زمان وەك کۆمەڵگا و بەپێی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، قۆناغەکانی ژیان تێپەڕ دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا تەواوی بەشەکانی زمان لەگەڵ تێپەڕینی کات، گەشە دەکەن، پەرە دەستێنێت و یان بەرەو نابووتی و مەرگ دەچێت. دیارە هۆی ئەوەش ئەمەیە کە زمان وەکو سیستمێکی دینامیکی و هاوکات لە تەك بێژەرانی دەجووڵێتەوە و پتەوتر دەبێت، یان بەرەو دامرکان هەنگاو دەنێتەوە.

بە چاوخشاندنێکی سووك بەسەر مێژوودا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زمانگەلی جۆراوجۆر وەکو، زمانەکانی سۆمێری، ئاڤێستایی، لاتینی، فریگی، سانسکریتی و... فەوتاون، ئەگەرچی ئەوەش شتێکی ئاساییە. دکتۆر کاشانی سەبارەت بەو دیاردەیە دەنووسێت: «زمانگەلی ئازەربایجان، ئاسیای بچووك و ناوەندی، چینی باختەری (هەرێمی سین کیانگ) لە رابردوودا، هیندۆئەورووپایی بوون، بەڵام پەلامار و هێرشی گەلی تورك زمان (نزیکەی سەدەی پێنجی زایین بەرەو ئەملا) بووەتە هۆی فەوتان و تێداچوونی زمانە خۆییەکان» . (فرهنگ ریشەهای هند و اروپایی زبان فارسی، دکتر منوچهر آریانپور کاشانی).

ئەوە لەلایەن زمانناسان و زانایان روونبووەتەوە کە هیچ یەك لە زمانەکانی زیندووی ئێستای دنیای مرۆڤ، لە هەمبەر زمانگەلی تر بەرزتر و نێوەرۆکدارتر نییە، واتە جیاوازیی نێوان زمانەکان هیچ پێوەندییەکی بە پڕبارتربوونی ئەو زمانە، یان کاکڵە و کەیفییەتی زمانەکانەوە نییە، بەڵکو بنەمای مەسەلەکە دەگەڕێتەوە سەر رادەی دەسەڵاتی فەرهەنگی و ئابووری، رامیاری و ژمارەی ئاخێوەرانی زمانەکە. (میشل مالرب، زبانهای مردم جهان).

ئەو دیاردەیەی کە بە زمانی فەرهەنگی، فەلسەفی، دینی، یان فەرمی ناودێر دەکرێت، بە هیچ شێوەیەك، زمانێکی پڕبارتر و بایەخدار و دەوڵەمەندتر لە زمانەکانی دیکە نییە، بەڵکو دەسەڵاتی سەنتەری و چڕکراوەیە کە بەڕای خەڵك، بۆ پێڕەوی و پەیڤین لەو زمانە هان دەدات، یاخود ناچاریان دەکات. بۆ وێنە دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە دەسەڵاتی ناوەندی ئیمپراتۆری رووم، زمانی لاتینی لە سەرانسەری ناوەندی خۆی بە زۆرەملێ داسەپاند، تەنانەت لە سەردەمی مەسیحییەکانیش بە ناوی زمانی دین ناساندیان، بەڵام لە کاتی ئێستادا هیچ نیشانەیەکی نەماوە و لەناو چووە. کەوایە بۆمان دەردەکەوێت کە رەواج و فەرمیبوونی زمانێکی تایبەتی لەمەڕ گەلەکانی تر، بە هیچ شێوەیەك بە پڕ بار بوونی زاتی و تایبەتمەندیی ناوەڕۆکی زمانەکە لێك نادرێتەوە، هەروەك لە پێشەوە باسمان لێ کرد، رۆڵی گرنگ و تایبەتی ئەم کەرەسەیە، بەندە بە ژمارەی ئاخێوەرانی ئەو زمانە و هەروەها جەغز و رادەی دەسەڵاتی بێژەرانی زمانەکە، لە بواری سیاسی، ئابوری، مەزهەبی و... لەگەڵ ئەوانەش داڵدە و پشتیوانیی سیاسی و ئابووری کاریگەرییەکی قورسی هەیە، جیا لەمەش، نرخ و بایەخی هەر زمانێك بەپێی رادەی کاریگەری و رۆڵێکە، کە ئەو زمانە لە بواری فەرهەنگی، دینی، فەلسەفە و جیهانبینی و... لە گۆڕەپانی مرۆییدا دەیخاتە گەڕ. (میشل مالرب، زبانهای مردم جهان).

### خزمایەتی و پێوەندیی زمانەکان:

لە مێژووی رابردووی مرۆڤ، ئەفسانەی برجی بابێل (لە ئینجیلی عیسا ئاماژەی پێدراوە) کە وەك هۆکاری سەرەکی لێك هەڵاواردن و دابڕانی زمانەکان سەلمێندرابوو، راستییەکی مێژوویی زمانناسی پشتڕاست دەکاتەوە کە لەلایەکەوە دووربوونی خەڵکانی هاوزمان، زاراوە و زمانگەلی جیاواز پێکدێنێت و لەلایەکی دیکەشەوە، زۆرێك لە زمانەکانی ئەوڕۆیی کە دەستەبەرکراون لە بنچینەدا هاوڕیشەن (COGNATE).

راستییەکی دیکەش هەیە کە هەرچی دەگەڕێینەوە دواوە، خزمایەتی و لێك نزیك بوونی زمانەکانی یەك بنەماڵە زیاتر دەبێت، بۆ نموونە: نزیکایەتیی زمانی فارسیی کۆن لەگەڵ کوردیی کۆن زۆر زیاتر و بەرچاوترە لە فارسیی نوێ لەگەڵ کوردی ئەوڕۆیی، هەمیسان پێوەندی و نزیکایەتیی نێوان ئەڵمانیی کۆن و زمانەکانی دیکەی

بنەماڵەی هیندۆئەورووپایی گەلێك زەقتر و سەرنجڕاکێشترە تا لێکچوون و پەیوەستیی زمانی ئەڵمانی ئەورۆ بەرامبەر بە زمانەکانی دیکەی سەردەم.

باوەڕی ئەفسانەی برجی بابێل تا نیوەی سەدەی هەژدە، لە برەودا بوو، بەڵام بەدوای کاری زانستییانە لەمەڕ زمانەکان، وێڕای ئەوەی کە ئەو چیرۆکە بەتاڵکرایەوە، هۆکاری سەرەکی و لۆژیکی جیاوازیی زمانەکان کە هەڵدەگەڕێتەوە سەر ریشە و بنەمای زمانەکە، تیشکی خرایەسەر. لە ساڵی ۱۸۵۹ی زایینی، روانگە و بۆچوونەکانی چارلز داروین شۆڕشێکی گەورەی بەرپا کرد، ناوبراو بەشێوەیەکی پوخت و شیاو، راوبۆچوونە کۆنەکانی لەمەڕ سەرچاوەی زمانەکان، لەگەڵ شك و گومان رووبەڕوو کردەوە و پایە و دیرەکی داستانی تاوەری بابێلی هەژاند. (منوچهر ا ریاپنور کاشانی، فرهنگ ریشەهای هند و اروپایی زبان فارسی: ۱۷-۱٦).

بەهۆی داگیرکردنی هیندستان لەلایەن بەریتانیاییەکان و تێکەڵاویی پێکهاتەی نێوانیان (سەدەی هەژدە) تاقمێك لە رۆشنبیرانی بەریتانی سەرنجیان بۆ نووسراوە کۆنەکانی هیندی راکێشرا، ئەو نووسراوانە کە بە زمانی سانسکریتی وەبەر دەستیان کەوتبوو، نزیکایەتی و وێکچوونێکی زۆریان لەگەڵ زمانە کۆنەکانی ئەورووپایی هەبوو، هەر ئەوەش بووە هۆی لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوانتر، بەتایبەتی دوای بەراوردکردنی سانسکریت لەگەڵ زمانی ئاڤێستایی و زمانەکانی پۆلی ئێرانی، بە جارێك سەریان سوورما. ئەوەش بووە هۆی توێژینەویەکی رێکوپێك و رێگەی بۆ کاری زانستییانە و ئەکادیمیکی تەخت و خۆش کرد.

یەکەم کەس کە بابەتی ئەگەری نزیکایەتیی زمانگەلی ئەورووپایی لەگەڵ ئاسیایی بە وردی خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە، جیمز پارسۆنزی بەریتانیایی، لە پەرتووکە بە قەبارە بەنرخەکەیدا (THE REMAINS OF JAPHET...,1767)، نەك تەنیا خزمایەتیی زمانەکانی نیشان دا، بەڵکو پێڕستێکی تێروتەسەلی لە واژەکانی هێندێك لە زمانەکان بە مەبەستی سەلماندن و تاپۆکردنی رای خۆی هێنایە کایەوە (کاشانی: ۱۸).

بیرۆکەی هاوسەنگی و پێوەندیداربوونی زمانەکانی هیندۆئەورووپایی بۆ جارێکی تر لەلایەن مافناسی بەریتانیایی، سێر ویلیام جۆنز، بە فەرمی دانی پێدانرا و بە روونی باسی لێکرا. زانای ناوبراو، لە وتاری پڕ ئاوازەی خۆی (دووەمی فیوریەی ۱۷۸٦) بەم

چەشنە هاتە ئاخافتن: «زمانی سانسکریت کە پێشینەکەی زۆر روون نییە، پێکهاتە و ستراکتۆرێکی سەرسوورهێنەری هەیە، لە زمانی یۆنانی پوخت و کاملتر و لە لاتینی دەوڵەمەندتر و پڕ واژەترە، بەشێوەیەکی زەقتر لە هەردووکیان رێکوپێك و پالێوراوترە، لە هەمان کاتیشدا لە بەرامبەر ئەو دوو زمانەدا لەباری ریشە و ماکی وشەکان و هەروەها رێزمانییەوە زیاتر لەوەیە کە بە شتێکی سوتفە و هەڵکەوت لێی بڕوانرێت،... هەرسێکیان لە سەرچاوەیەکی هاوبەشەوە رەگیان داکوتاوە و چەکەرەیان کردووە،... هەروەها دەتوانرێت زمانی پارسیی کۆن (مادی و ئاڤێستایی) لەو بنەماڵەیە بژمێردرێت». (کاشانی: ٢١).

گرنگترین کتێبی زماناسی، لەلایەن گریم (j.GRIMM)ەوە نووسراوە، ئەو زانایە بۆ یەکەم جار بە هێنانەوەی کۆمەڵێك نموونە، توانی وێکچوون و هاوریشەبوونی زمانی ئەڵمانی لەگەڵ زمانی سانسکریت مسۆگەر بکات (منیره احمد سلطانی، واژگان زبان فارسی در زبانهای اروپایی: ٥٢).

| سانسکریت | یۆنانی | لاتین | ئاڵمانی | وشە |
|---|---|---|---|---|
| Bharami | Phero | fero | Bear | بردن |
| Dva | Odon | Dens | Tooth | ددان |

- **تایبەتمەندیی زمانی کوردی**

ئەگەرچی بەشێوەیەکی ئاکادیمی و رێکوپێك لەسەر زمانی کوردی و مێژووی زمانەکەمان کاری پێویست نەکراوە، بەڵام توێژینەوە و شیکردنەوەی زمانی زگماکی یا خود ریشە و شوناسی زمانی نەتەوەییمان، لەگەڵ ئەوەشدا زانیاری و ناسینی زمانەکەمان، ئەرکی پێویستی سەرشانی هەموو لایەکە. لە دەسپێکی تەوەرەی زمانی کوردی و بەر لە هەموو شتێك، ئەم پرسیارانە زەق دەبنەوە کە پێویستە لەسەریان بدوێین، هەرچەند بڕینی ئەو رێگەیە گەلێك دژوارە و سنووری زمانی کوردی وا بە ئاسانی دەستنیشان و دیاری ناکرێت.

زمانی کوردی لەچی و لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە؟ ئاخۆ شوێن و خولگەیەکی بۆ سەرهەڵدان هەبووە؟ ئاخۆ زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە؟ ئاخۆ زمانی کوردی زاراوە و دیالێکتی ئاڵۆز و بێ قەوارەی زمانی دیکەی وەك فارسیی کۆن دێتە ئەژمار؟ ئاخۆ بۆ مسۆگەرکردنی کۆن بوون و ڕەسەنایەتیی زمانی کوردی هیچ بەڵگە و خوێندنەوەیەك لەئارادایە؟ یان ئەو زمانە لە ئاسمانەوە بەربووەتەوە؟ و گەلێك پرسیاری تر...

دیارە ئێمە دەبێت ئاگادار بین کە توێژینەوە و توێکاری لەسەر کەرەسە و مێژووی زمان، پرۆسەیەکی زۆر چەتوون و گەلێك گرنگە، بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەمە کە واز لە بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بێنین و بەو شێوەیە تەمەڵی و بێ توانایی، یاخود نەزانیی خۆمان لەژێر لێڵ و سەختبوونی ئەو ڕێگە و پێگەیەدا بشارینەوە، تا بەم جۆرە بۆ کەمتەرخەمی و نەزانیی خۆمان بڕوبیانوو و دەلیل دابتاشین. بۆ ڕوونکردنەوەی ئاخێزگە و شوناس و ڕەسەنایەتیی زمانی کوردی دەتوانین پشت بەو خاڵە بنەڕەتییانە ببەستین:

١- پاشماوە و ئاسەوارە دێرینەکان.

٢- پەرتووك و تۆمار و کتێبە کۆنەکان.

٣- کتێبە مێژووییە کۆنەکان.

٤- ئاوڕدانەوە لەسەر بەرهەم و بۆچوونەکانی گەڕۆك و ڕۆژهەڵاتناسەکان.

٥- کەڵکوەرگرتن لە زانستی زمانناسی و لێکسیکۆلۆژی لەمەڕ شیکردنەوەی ڕیشە و ستراکتۆر و بنچینەی زمانی کوردی.

٦- مێژووناسەکان و پسپۆڕانی زانستی زمان.

٧- شیکردنەوەی ماك و ڕیشەی وشەکان لە باری ئیتمۆلۆژییەوە.

بێگومان نەتەوەی کورد خاوەن زمانی تایبەتی و دێرینی خۆیەتی و هەزاران ساڵە بەو زمانە دەپەیڤێت. ئاشکرایە، هەرچەشنە باس و لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی مێژووی زمانی کوردییەوە پێوەندییەکی نزیکی بە چاوخشاندن و پێداچوونەوەیەکی وردبینانە بە مێژووی کورد و کوردستانەوە هەیە، هەربۆیە بە پێویستییەکی سەرەکی دەزانین، پێش هەر دوان و گریمانەیەك سووکە ئاوڕێك بدەینەوە سەر مێژووی کورد و جوگرافیای کوردستان و کورتەباسێك لەو بارەیەوە بێنینە ئاراوە. هەرچەندە، دنیای بەربڵاوی

ئێمەی مرۆڤ، گەلێك کۆنە و رابردوویەکی دێرین و نەزانراوی هەیە، بەلام بە لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنی شتومەك و ئاسەوارە سروشتی و ناسرووشتییەکان، هەروەها پشکنینی ئاسەوارناسی و گەلناسی، لەگەڵ ئەوانەشدا بەراوردکردنی قالبی ئێستانی بوونەوەر و ئینسانە دێرین و کەوناراکان و تەمەن و شوێنیان، زانایان و پسپۆڕان بە هێنانەئارای گریمانە و بەڵگە و دۆکیۆمێنت، زانیارییەکی بەرچاویان دەست خستووە و مێژووی نەتەوەی کورد و ئارییەکانیش هەڵگری ئەو شرۆڤە و بۆچوونەی سەرەوە دەبێت. بەپێی دەقەکانی ئاڤێستا و بەگوێرەی بەڵگە دۆزراوەکان و رادەربڕینی زانایانی مێژوو، لە سەردەمێکی نەزانراودا نەتەوەی ئارییەکان، لە ولاتێکی سارد و سەهۆڵبەندانەوە، بەرەو رۆژهەلاتی ناڤین، واتە کێوەکانی زاگرۆس کۆچیان کردووە. پاشان لە داوێنی زاگرۆسەوە بەرەو دەشت و بانی ئێران و گشت ناوچەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و جەمسەر و تاڤگەی رووبارەکانی دیجلە و فورات چەندین کۆچی تریشیان هەبووە. بەرە بەرە لە گۆڕەپانی میزۆپۆتامیادا لەژێر ناوی جیاوازدا بلاوبوونەتەوە. (دکتۆر کونتنا، نامیلکەی ڤێندیداد- عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٣٧١).

بەگشتی دەتوانین هۆزەکانی کورد، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان و مێژووزانەکانی بیانی و ناوخۆیی لەسەری ساغبوونەتەوە و لەسەری کۆکن، بەم جۆرە پۆلێن بکەین. هۆزەکانی کورد بریتی بوون لە حەوت هۆزی سەرەکی لەو نیشتمانەی کە بە کوردستان ناوزەد دەکرێت، بلاوبوونەتەوە.

یەکەم: گوتی (جودی) یان ئاراراتی.

دووەم: لۆلۆ.

سێیەم: میتانی.

چوارەم: سیرەتی یان کورتی، بە مانای درِندە و ئازاردانی خەڵکی ناویان دەرکردووە لە زاراوەی هەورامیدا سیرەت واتە درِك.

پێنجەم: کاردۆخی یان کاری.

شەشەم: هۆری.

حەوتەم: سۆبارتۆ یان کاسی.

هەشتەم: ماد.

زمانناسان، زمانی ئەو هۆز و گەلە ئارییانە کە بەرەو میزۆپۆتامیا و ئەورووپا کۆچیان کردووە، بە بنەماڵەی هیندۆئەورووپایی ناودێر دەکەن. پێویستە بڵێین کە زمانی هیندی- ئەورووپایی خۆی لە خۆیدا زمانێکی تایبەت و زاراوەیەکی پوخت و تاك و سەربەخۆ نییە، بەڵکو هەموو ئەو زمان و زاراوانە کە لە وڵاتانی ئێران، هیند، ئەورووپا و.... قسەیان پێ دەکرێت بە بنەماڵەی، هیندی ئەورووپایی دەناسن، دەگونجێت بڵێین، بنزمان و دایکی گشت زمانی ئارییایییەکان لە قەڵەمدراوە. توماس یۆنگ زمانی بنچینەیی و دایکی لەژێر ناوی هیندۆئەورووپایی دەستنیشان کردووە، پاشان ئێچ ماکس مولێر (١٨٦١) هەموو ئەو خەڵك و نەتەوانەی کە بە زمانی هیندۆئەورووپایی قسەیان دەکرد بە ئارییایی ناوزەدی کردوون.

ئەگەر زمانی هیندۆئەورووپایی وەك دیاردەیەك تەرخان بکەین و هەمیسان زمانی هیندۆئێرانی وەکو لقێکی بنەماڵەی هیندۆئەورووپایی دابنێین، دەتوانین بڵێین زمانی کوردی بە زمانێکی تایبەتی و سەربەخۆی لقی ئێرانی لە بنەماڵەی زمانە هیندوئەرووپاییەکان و لە دەستەی چەند هیجایی بە حیسێب دێت، لەوانەیە خاڵی ئەو رادەربڕینەش کۆمەڵێك خوێندنەوە و بەڵگە بێت کە لەو بابەتەدا بەشێوەی خوارەوە لەسەری دەدوێین.

بنەماڵەی هیندۆ ئەورووپایی وێنەی أ

زمانی کوردی رازاوە بە چەندین زاراوەیە، واتە لە چەند زاراوە و دیالێکتی لێك نزیك پێکهاتووە کە شرۆڤەی ئاماری جوگرافیاییان بەم چەشنە دابین دەکرێت: (مێژووی دێرینی کوردستان، کتێبی یەکەم- فازڵ قەرەداغی).

١- کوردەکانی سەروو (کرمانجی).

٢- زاراوەی زمانی کوردیی ناوەڕاست، کرمانجیی خواروو (سۆرانی).

٣- زاراوەی زمانی کوردی باشووری کوردستانی ئێران (کرماشانی، کەلهوڕی، فەیلی، لەکی و لوڕی).

٥- زاراوەی زمانی کوردی زازا (دملی).

٦- گۆرانی (گۆران، هەورامی، کاکەیی و شەبەك، زەنگەنە و باجەلان).

چەندین هۆکاری جۆراوجۆر هەیە کە هۆی جیاوازیی نێوان زاراوەکانی زمانی کوردی، یاخود شێوە و جۆری دەربڕینی زاراوەیی، پێکدێنێت، لەسەر ئەو ئاستە دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:

١- بەرفراوانیی بەرینایی خاك و جوگرافیای کوردستان و پرژ و بڵاوبوونی خەڵکی خۆجێی (بوومی) کوردستان.

٢- بەرفراوانیی پانتایی زمانی کوردی و کۆن و دەوڵەمەندبوونی زمانەکە.

٣- کۆچکردن لە ناوچەکانی کوردستانی کۆن، واتە، رۆژهەڵاتی ناڤین و بانی ئێران.

٤- کوێستانی بوونی زۆربەی دانیشتووان و لێکدابڕانیان بەهۆی سنووری سروشتی وەکو، کێو و رووبار و... هەروەها نەبوونی پێوەندییەکی پێویست.

٥- کەمکاری لە نووسینی پەرتووك و پێداویستییەکانی، وەك مێژوو، دەسکەوت و پێشکەوتنەکانیان، فەلسەفە و حیکمەت و بیروبۆچوونەکانیان.

٦- سنووری ناسروشتی وەك دژایەتی دوژمنان و نەیاران، قەڵاچۆکردن و راگواستن، ئاسیمیلاسیۆن و خاپوورکردن.

٧- سەرهەڵدانی زاراوەکان لەلای هۆز و گەلەکان، تەنیا ئاکامی جیابوونەوەیان لە یەکدی نەبووە، بەڵکو ئەو زاراوە و زمانانەش لە رێگەی تێکەڵبوونیان لەگەڵ زمانەکانی دیکەدا وەك زمانی قەوقازی، سامی و هی دیکەش هاتوونە ئاراوە.

٨- گۆڕانکاریی ئەنترۆپۆلۆژی کە لەناو زماندا رووی داوە.

٩- نەبوونی قەوارە و فۆرمێکی ستانداردی زمانی کوردی.

١٠- لەئارادا نەبوونی دەوڵەت و دەسەڵات و سەروەرییەکی سەربەخۆی کوردی بۆ پشتیوانیکردن و گەشەپێدانی زمانی کوردی.

١١- کاریگەریی خەتی بزماری (ئەلفوبێی نووسین) و ئاهەنگ و پیتە نامۆ و بیانییەکان، هەروەها جۆری دەربڕینیان لەمەڕ زمانی کوردی.

۱۲- چەند هیجایی بوونی زمانی کوردی و ئالوگۆڕی پێویست لەسەر ماکی ریشەی وشەکان.

بەدەگمەن دەبینین و دەبیستین کە هۆیەکانی جۆراوجۆری زارێکی کوردی بە خالێکی نێگەتیڤ لێك دەدەنەوە و لەو روانگەیەوە دەڕواننە زمانی کوردی، بەلام دەبێت سەرنج بدەینە سەر ئەوەی کە گەرچی زمانی کوردی بە چەندین زاراوە و دیالێکتی جیاواز دابەش بووە، بەلام هەموو زاراوەکانی زمانی کوردی لەسەر بەردی بناغەی زمانی کوردیی کۆن "مادی" دامەزراون و لە یەك ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە، دیارە ماکی وشەگەلی نێو زاراوەکان بەبێ زەحمەت ئەوە بۆ ئێمە دەسەلمێنێت، هەروەك زانای ناوبەدەر مینۆرسکی دەلێت: "زمانی کوردی لە چاخەکانی کۆن واتە بەر لە لێکدابڕانی کوردەکان لە یەکتر بەرهەم هاتووە".(حیدر بەتویی، کرد و پراکندگی او در گسترەی ایران زمین: ۲۳).

لە روویەکی دیکەوە زاراوەگەلی زمانی کوردی نیشاندەری دەولەمەند بوونی ئەو زمانە لێك دەدرێتەوە و پێداویستییە جۆراوجۆرەکان لە هەموو بوار و بەستێنێك (جگەلە شتومەکی تازە داهاتوو) دابین و دەستەبەر دەکات. ئوجەلان واتەنی، پاراستنی نێوان زاراوەکانی زمانی کوردی با ئەوەی کە ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، بە سەرکەوتنێکی گرنگ بۆ کوردان و زمانی کوردی دەنرخێندرێت. (از تمدن کاهنی سومر به سوی تمدن دمکراتیک - عەبدوللا ئۆجالان،۱۳۸۰).

## بەشی دووەم

### رەسەنایەتی و بنەمای زمانی کوردی:

بەپێی زانیاریی مێژووزان و ئاسەوارناسەکان پێشەنگ و پێشڕەوترین گەل لەناو ئارییەکاندا هۆزی لۆلۆیی و گۆتی بووە، ئەو هۆزانە بەتایبەتی گۆتییەکان بە داهێنەری کشتوکاڵ لە مێژوودا ناویان دەرکردووە و لۆلۆییەکانیش لەو سەردەمەدا زۆر پێشکەوتوو بوون (ئۆلمستێد- گریشمەن).

میهرداد ئیزەدی پرۆفیسۆری پێشووی مێژووی رۆژهەلاتی نزیك لە زانستگای هاروارد لە (The Kurds:A Concise Handbook)دا دەلێت: کوردەکان

یەکەم کەس بوون بۆ بەکارهێنانی ئاژەڵ لە کشتوکاڵدا، ئاسنکاری (فلزکاری) و دروستکردنی کۆمۆن (اجتماع) و ئاور بۆ گۆزەگەری.

دیاکۆنۆف دەنووسێت: «لە کۆتایی چاخی بابلییەکاندا، گشت دەشت و مۆڵگەی ئێران بە گوتیۆم ناسراوە و ناوی گەلی گوتیۆمی (کوردەکانی) لەسەر بووە. هەڵبەت ئەوەش زۆر ئاساییە لەبەرئەوەی کە ئارییەکان لە هەر شوێنێك بان نێوی خۆیان لەسەر دادەنا.» (میخائیل میخائیلویچ دیاکونوف، ترجمه روحی ارباب، تاریخ ایران باستان).

دکتۆر سپایزار بە کۆکردنەوە و بلاوکردنی کتێبی (هۆزەکانی میزوپۆتامیا) کە لە ساڵی (١٩٣٠)دا لە بۆستون بلاوکراوەتەوە، بە دەلیل و بەڵگەی زانستی و متمانەدار، پەیوەندیی کوردەکانی ئێستای لەگەڵ گەلی ‹‹گۆتی››ی کۆن تاپۆ کرد. (پرۆفیسۆر مەحەممەد ئەمین زەکی بەگ- ترجمه، حبیب الله تابان، کورد و کوردستان: ٦٢).

لە کەتیبە و تاشەبەردە نووسراوەکانی ئاشوریشدا (٣٠٠٠ پ.ز) ئاماژە بە رستەی "مات کورداکی" وەك کۆنترین وشەی کورد (بە واتای خاکی خۆجێی کوردەکان) کراوە. دکتۆر جەمال نەبەز، (فرهنگ کردستان، گیو مکریانی، کردستان مکریانی: مقدمه).

هەڵبەت ئەو بەڵگانە لەلایەن گزنفۆنیش لەناو پەرتووکەکەیدا (ئانابازیس) و گەڕانەوەی دە هەزار کەسی (٤٠١ پ.ز)، دانی پێدا نراوە. لەپاڵ ئەوانەشدا واژەی "کورتی" (گوتی-کورد) لەلایەن، ئەسترابۆن، مینۆرسکی، گزنفۆن، مار و... ئاماژەی پێدراوە و گەلێك شیکارییان لە بارەیدا هێناوەتە گۆڕێ. (تاریخ ریشەهانی نژادی کرد، احسان نوری پاشا: ١٤١-١٦٠).

«ئەو دیتانە، کە بۆ یەکەم جار لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناڤین گەلی هورییەکان بە رەسەنایەتی ئاریایی، نیشتەجێیان دەست پێکرد لە رووی کەرەستە و داتای مێژوویی، ئاسەوارناسی و ئیتنیك ناسی، شیاوی دەرك و«قابیلی فەهم»«، وێکچوونی نێوان ستراکتۆر و بنیاتی زمانی کوردیی ئەمڕۆیی لەگەڵ زمانی هورییەکان، ئەو راستییە دەدرکێنێت. بۆ نموونە: وشەی کۆنی کور بە مانای کێو دێت کە واژەی (کور) وشەیەکی گوتییە». (از تمدن کاهنی سومر بە سوی تمدن دمکراتیك، عەبدوڵڵا ئۆجالان، جلد ٢، ١٣٨٠).

بیهزاد خۆشحاڵی نووسەری کتێبی (زبانشناسی کرد و تاریخ کردستان: ٤٣) لەو بارەیەوە رای وایە کە وشەی "کور" بە واتای "کێو"ە. وشەی کور و کورتی لەناو کەتیبەکانی ئاشور (٦٠٠ پ. ز بنگلات پی لیسر) ئاماژەی پێدراوە و لەبارەی ئەو هۆزە، شامانە سەری یەکەم دواوە. (غلامرضا انلاف پور، تاریخ سیاسی و جغرافیایی مردم کرد، (از شرقی ترین تا غربی ترین)، انتشارات مغان، ١٣٧٩).

گۆتییەکان کە بە یەکێك لە هۆزەکانی ئاریایی زاگرۆس دەناسرێن، بە بۆچوونی تاقمێکی بەرچاو لە مێژووزان و ئاسەوارناسەکان رەچەڵەکی کوردانی ئەورۆیی پێکدێنن. بە وتەی نووسەری کتێبی (تاریخ قدیم شرق نزدیك، مستر هول: ٨٨-١٩٠) و تاقمێك لە رۆژهەڵاتناسەکان، ریشە و رەچەڵەکی هەوەڵییەی گەلی کورد، دەگەرێتەوە سەر گۆتییەکان.

زێدەباری ئەمانەش زانایانی وەك (هارتمان)، (نۆلدکە) و (وایسباخ) گەیشتوونە ئەو باوەڕەی کە هۆزی "کورتی" کە لە مێژووی یۆنانی کۆندا ناویان تۆمارکراوە، هەر ئەو کوردانەی ئەمڕۆیین. (مقدمهای بر کتاب تحفه نالری در تاریخ و جغرافیای کوردستان، دکتر حشمت الله طبیبی، ل: ٥-٧).

وشەی گۆتی بە زاراوەی فارسی هەمان گۆتۆ و کوردۆیە، کە ئەویش هەمیسان بە مانای پاڵەوان و ئازا لێك دەدرێتەوە کە مامۆستا مەردۆخ گوتەنی نازناوی مێژووی نەتەوەی کورد بەحیسێب دێت. (تاریخ کورد و کوردستان، محەمەد مەردۆخی کوردستانی).

لەو بارەیەوە (ئیحسان نوری پاشا) دەنووسێت: تاقمێك لە کۆنینە ناسەکان لەو بڕوایەدان کە "جودی" لە وشەی هۆزی "گوتی- GUTI) و ژوتی وەرگیراوە و لە سەدەکانی دوایی، واتە بەر لە (٥٠٠)ی پێش زایین نێوی گوتی بە کاردا، کورتی و کوسیی گۆڕدراوە. (تاریخ سیاسی و جغرافیایی مردم کرد، (از شرقی ترین تا غربی ترین)، غلامرضا انلاف پور، انتشارات مغان، ١٣٧٩- ل: ٣٣).

لە مێژووی هەورامانی کۆنیشدا گۆتۆ یا ژۆتۆ بە گۆدۆ یاخود کوردۆ نووسراوە. زانای زمانەوانی بەناوبانگی ئاڵمان و ئەورووپا پرۆفیسۆر تیۆدۆر نۆڵدکە لەسەر پێوەندی وشەی (کاردۆ) بە (کورد)ەوە، باسێکی زۆر گرنگی هێناوەتە ئاراوە و بەشێوەیەکی زانستی و بەڵگەدار، ئەوەی مسۆگەر کردووە. درایوێر، بەرەنجامی

تۆژینەوەکانی خۆی لەمەڕ وشەی کورد ئاوا دەردەبڕێت: ((کاردا، کاردۆخی، کورتۆخی، کارداك، مسیرتی، غوردیایی، غوردۆئی، کادا، کاردا، کارداویە و کاردایە، کارتاوایە و کوردائیا و گوتی... گشتیان یەکن، لە هەمان حاڵدا کە وەکو یەك ناچن، بەڵام بەپێی وشەی کاردۆخی گزنفۆن و کارای سۆمێرییەکان هەموویان ناوی یەك عەشیرەتن)). (پرۆفیسۆر مەحەممەد ئەمین زەکی بەگ- ترجمە، حبیب اللە تابان، کورد و کوردستان).

سەرەڕای ئەمانەش دکتۆر سپایزار (هۆزەکانی میزوپۆتامیا: ۱۷) جەختی کردووەتەوە کە، کارا، کادا، کاردۆخی، کورتی، گوتی و کوردی (لەسەر یەك) بە مانای کوردە. پرۆفیسۆر مەحەممەد ئەمین زەکی بەگ دەنووسێت: (... هێندە کە جیاکردنەوەی کورتی لە گوتی مومکین نییە، بەو رادەیەش لەوەی کە دانیشتووانی ئەمڕۆکەی کوردستان لە وەچەی هەمان گوتییەکانن گومانێك نابێت بخەینە دڵمان). (تحقیقی دربارە کرد و کردستان- پروفسور محمدامین زکی- ترجمە و توضیح- حبیباللە تابانی- انتشارات ئایدین- ۱۳۷۷- ل: ٦٤).

ئەستڕابۆن جوگرافیازانی یۆنانی لە ساڵی (٦٠)ی پێش زایین، نەخشەیەکی کێشاوەتەوە و لەسەر نەخشەکەی وشەی (کلادەك و کورتی) داناوە، کە هەمان (کارداك) و کوردە.

لەڕاستیدا وشەی کارداك، کاردۆك، کاردۆ، کوردۆ، و کورد بە واتای پاڵەوان دێت. (محەمەد مەردۆخ کوردستانی، تاریخ کورد و کوردستان).

بەو پێیە بۆ تۆمارکردنی مێژووی راستەقینەی نەتەوەی کورد، پێویستە مێژووی دێرینی دەوڵەتەکانی، گوتی، سوباری، لۆلۆیی، کاسی، میتانی، ناییری، موشکی، خالیدی، مانناییی و ماد، کە باب و باپیرانی نەتەوەی کورد بە دامەزرێنەریان دەناسرێن لە یەك جێ کۆبکرێتەوە و بنووسرێت. (تاریخ ریشەهای نژادی کورد، احسان نوری پاشا، ل: ١٤).

ئەوانە دوو خاڵی گرنگمان بۆ وەدەر دەخەن:

یەکەمیان ئەوەیە کە ئەمانە گشتیان ئاڵوگۆڕێکی ڕێزمانین و هەر هەموویان لە کۆتاییدا دەگەڕێنەوە سەر وشەی کورد، دووەمیان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت، کە ئەوانە هەرکامیان ناوی هۆزەکانی کوردن، کە لە وڵاتی میزۆپۆتامیادا، یاخود چیاکانی

ئارارات و کێوی گودی کە لە قورئاندا بە جودی (وستوت و علی الجودی) ناوی بـراوە، ژیانیان بەسەر بردووە. (اسرم لیرە) لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام، بەرگی یەکەم، لاپـەڕەی (١٠٦)دا بەو جۆرە رای خۆی دەنووسێت: «نووسەرانی نەمسـاوی بـە شـاخی جودیـان وتووە شاخی کوردان».

رەنگە بتوانین ئەوە دەربڕین، کە لە لایەکەوە مێژووی کورد تەمەنێکی زۆر درێـژ و دێرینی هەیە و لە لایەکی دیکەشەوە جوگرافیا و خاکی کوردستانی کۆن، بریتی بـووە لە ئێران، دەشتی "فەلاتی ئێـران" ئێـران و زۆربـەی ناوچـەکانی میزۆپۆتامیـا، واتـە سنوورەکانی دەوروبەری کەنداوی فـارس، دەریـای مازەنـدەران و دەریـای رەش. (حیـدر بەتویی - کرد و پراکندگی او در گسترەی ایران زمین- ل: ١) و (عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی،١٣٧١- ل: ٢١).

هەروەك ئاماژەی پێدرا، زماننـاسەکان، زمانی ئەو هۆز و گەلـە ئارياییانـەی کـە بەرەو رۆژهەلاتی ناڤین و رووبارەکانی دیجلە و فورات و ئـەورۆپا کۆچیـان کـردووە، بـە بنەماڵەی هیندۆئەوروپایی ناودێر دەکەن.

دیاکۆنۆف دەڵێت: "لە نیوەی هەزارەی دووەمـی پ.ز لـەناو زمانـەکانی ئاسـیادا، وشەگەلی هیندۆئەوروپایی بە چەشنێکی ئاشکرا وەبەر چاو دەکەویت، لـە سـەدەکانی (١٥- ١٦)ی پ.ز لە رۆژهەلاتی ناڤیندا، دەوڵەت و کیشوەرێك بەناوی میتانی هەبووە کە پاشاکانیان نێوی هیندۆئەوروپاییان لەسەر بووە (و.س. گویـوا، ترجمـە ولـی اللـه شادان، دستور زبان فارسی میانە)".

هەر دیاکۆنۆف دەبێژێت کە "...لەبارەی زمانەوە دەبێت بڵێین لـە نیـوەی هـەزارەی دووەم تا سەرەتای سەدەی نۆیەمی پ.ز، زانیاری و دۆکیۆمێنتی پێویست لەئارادا نییـە کە نیشان بدات هۆز و گەلێك هەبوون کە بە زمانەکانی هیندۆئەوروپایی قسەیان کرد بێت". (و.س. گوریوا، ترجمە ولی الله شادان، دستور زبان فارسی میانە).

دکتۆر سپایزار بەپێی لێکۆڵینەوەکانی، لەو باوەڕەدایە کە «هـەر چـوار هۆزەکـانی زاگرۆس واتە کوردە ئاراراتیەکان (لۆلـۆیی- گـوتی- کاسـی- سـۆباری) هـەرکامیان خاوەنی زمانی ئاخافتنی تایبەت بە خۆیان بوون، ئەگەرچی بـەهۆی لێکجیابوونـەوە و قەڵمڕەوی جوگرافیایی ژیانیان، هەندێك جیاوازییان تێـدا وەبەرچـاو دەکـەوێت، بـەڵام

هەموویان لەسەر یەك بنەمای زمانی، کە بە زمانی (کوردیی کۆن) دەناسرێت، پەیڤینیان بووە». (هۆزەکانی میزوپۆتامیا- پرۆفیسۆر سپایزار- ل: ۱۱۷-۱۲۰).

هەندێك لە رۆژهەڵاتناسەکانیش دەڵێن: هەر چوار بەشەکەی زاگرۆس بە زمانی ئاری (هیندۆئەوروپایی) قسەیان کردووە. زمانی لۆلۆییەکان لە نەتیجەی توێژینەوەکانی هۆسینگ (Housing)دا، بە لقی ئیلامی دەبەسترێتەوە، کە وێکچوونێکی زۆری ئەو زمانە لەگەڵ زمانی هۆریەکان بە دەستی سپایزار تیشکی خراوەتە سەر، هەروەها ئەلستێد و سپایزار لۆلۆییەکان بە باپیرە گەورەی لورەکان دەزانن. (تحقیقی درباره کرد و کردستان- پروفسور محمدامین زکی- ترجمه و توضیح- حبیبالله تابانی- انتشارات ایدین-۱۳۷۷- ل: ٦٢).

دیاکۆنۆف، رەنگاڵەیەکی رەگەز و پێکهاتەی مادەکانی بە گوتییەکان، لۆلۆبیەکان، میەرانییەکان، کاسییەکان، ئیلامی و هۆرییەکان ناوبردووە. (تاریخ ماد، دیاکونوف، ل: ۳۰).

هەرچەند لە زمانی پێشینەی ئارییەکان تا ئێستا بەڵگەیەکی ئەوتۆمان بەدەست نەگەیشتووە، بەڵام ئەو نموونە بەڵگانە، ئەو راستییە-سەرنج راکێشەرە بۆ ئێمە زەق دەکاتەوە و ئێمە لەو رایە نزیك دەکاتەوە کە یەکەمین نەتەوە، کە مێژوو ناوی تۆمارکردووە، لە رۆژهەڵاتی ناڤین و ئاسیای ناوەڕاست (بە وتەی سەرووی دیاکۆنۆف)، هەروەها دواییش لە خاکی ئێراندا، بە زمانی هیندۆئەوروپایی و لقی هیندۆئێرانی ئاخافتنی بووە، نەتەوەی رەسەن و ئاریایی رەگەزی کوردە، ئەمەش رێی تێدەچێت.

دیارە هۆزەکانی ئاریایی پێش کۆچکردن و بڵاوبوونەوەیان بەهۆی ئەوەی کە یەك گەل و نەتەوە بوون، بە یەك زمان قسەیان کردووە، هەر ئەو زمانە کە بەناوی زمانی ئاریایی دەناسرێت و ناوی لێ دەبەن. ئەوەش روونە کە دوای چەندین سەدە لێك جیابوونەوە لەبارەی بارودۆخی ناوچەیی و کەش و هەوای سروشتی و نەبوونی پێوەندیی نێوانیان، لەگەڵ ئەوانەش ئاوێتەبوونیان لەتەك خۆجێییەکان، ئاڵوگۆڕێکی بەرچاو لەنێوان زمانی دیالۆگیان بەدیهات کە بە دەستەگەلی جۆراوجۆری زمانی، واتە بنەماڵەی زمانەکانی هیندۆئەوروپایی و بنەماڵەی هیندۆئێرانی، پاشان گرووپی زمانەکانی ئێرانی دابەش بوون. بە دەستەواژەیەکی دیکە، کۆچەرانی بەرەو باشوور لەژێر دەستەی زمانی هیندۆئەوروپایی ناوبانگیان دەرکردووە، بنەماڵەی

هیندۆئەوروپاییەکانیش دوای لێکدابڕانیان بە گرووپی زمانەکانی هیند و گرووپی زمانەکانی ئێرانی ناویان لێ براوە.

لاپەڕە (٥)، کتێبی ئاریانپوور کاشانی

پەڕاگەندەبوونی زمان گەلی هیندۆ ئەوروپایی

ئەگەر زمانی هیندۆئەوروپاییەکان بە دیاردەیەك، تەرخان بکەین کە هەر بە هەموو ئەو زمان و زاراوانە دەگوترێت کە لەسەر بناغە و بنەمای زمانی ئاریایی داڕێژراون، دەگەینە سەر ئەو باوەڕەی کە واتای زمانێکی تایبەتی و بریتی لە تاکە زمانێکی سەربەخۆ نییە، هەمیسان ئەگەر هیندۆئێرانی وەك لقێك لە بنەماڵەی هیندۆئەوروپاییەکان دابنێین، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە "زمانی کوردیی ئێستا" بە زمانێکی تایبەتی و سەربەخۆی لقی ئێرانی لەناو بنەماڵەی زمانە هیندۆئەوروپاییەکان و دەستەی چەند هیجایی (تەوەرەی سێیەم) دێتە ئەژمار. هەروەك ئاماژەمان پێدا، هەموو گەلەکانی ئەوروپا (جگەلە باسك و گەلانی ئورال- واتە هەنگار و فنلەندی و...)، سەرجەم گەلانی ئێران (جگەلە عەرەب، تورکەمان و تورکەکان) و باکووری هیند، بە زمانی هیندۆئەوروپایی دەئاخڤن.

فازڵ قەرەداغی، لە پەرتووکی (مێژووی دێرینی کوردستان)دا دەنووسێت: (زمانەکانی هیندۆئەوروپایی بە دوو گرووپی، کۆمەڵەی رۆژهەڵاتی "ساتیم" (ئەرمەنی، ئێرانی، هیندی، ئیسلاوی*، باڵتین) و کۆمەڵی رۆژئاوایی "کینتوم"

---

* خەڵکی ئیسلاو گرووپێکی ئێتنیکی و زمانین کە زمانەکەیان یەکێك لە لقەکانی زمانی هیند و پەورووپاییە. هەرچەند ئەگەری زۆرە کە ئەورووپای رۆژهەڵات شوێنی ژیانیان بووبێت، بەڵام ئەمڕۆکە

(ژێرمەنی، لاتین، یۆنانی، سەڵتیك) دابەش دەکرێن. هەر لـەو ڕەهەندەشـەوە دەتـوانین بڵێین کە ڕەنگە ژینگە و ناوچەی خەڵکانی هیندۆئەورووپایی لە ئاڵقەی سنووری نێـوان ئەو دوو گرووپەدا بێت.

جیاوازیی سەرەکیی نێوان هەردوو گرووپەکە، دەربڕینی دەنگی پـیتی (س)یـە، لـە کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتیدا بە دەنگی (س) کرک دەکرێت و لەوەی تردا، هەروەك خۆی، یانی (ك) دەردەبڕدرێت. هەر بەو هۆیەشەوە بە "سایتمی و کینتومیی نێـوان" ناویـان لـێ براوە.

بنەماڵەی ڕۆژهەڵاتی:

| ئاڤێستایی | فارسی | کوردی |
|---|---|---|
| ساتیم | سەد | سەت |
| ئەسمەن | ئاسمان | ئاسمان |

بنەماڵەی ڕۆژئاوایی:

| یونانی | لاتینی | واتا |
|---|---|---|
| کاتون | کینتوم | سەت |
| ئاکمون | - - - | ئاسمان |

خاڵێکی زۆر گرنگ کە بە ڕاشکاوی دەبێت دەری بڕین، ئەوەیـە کـە خزمایـەتی و نزیکی و هەروەها لەیەك ڕەگەز و خێزان بوونی ئەم گەل و نەتەوانە، ئەو زمانەیـە کـە قسەی پێدەکەن و لەڕاستیدا بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، بە واتایەکی تر تاکە دەسـتاوێژ و بەڵگەی خزمایەتی و لەیەك بنەماڵەبوونی زمـان و ڕەگـەزی، گەلـەکانی ئێرانـی و هیندۆئەورووپاییەکان، ڕیشە و بنچینەی زمانی ئاخافتنیان بەدی دەکرێت.

---

جیا لەو ناوچە، ئیسلاوەکان لە بەشێك لە "بالکان" ئەورووپای ناوەندی، ئاسیای ناوەڕاست و سراسنەری سیبری" نیشتەجێن

بۆ تیشك خستنە سەر ئـەم وتەیـە دەتـوانین پەنجـە بـۆ تاقمێـك نموونــەی خــوارەوە رابكێشین و ئەم وشانەی خشتەی ژمارە (٢)ش وەك بەڵگە و نموونەیەك بهێنینەوە.

| ئاڤێستایی | پارسیی کۆن | پەهلەوی | فارسیی نوێ | ئاو | سانسكریت | لاتین | یۆنانی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەیەم | ئەیوس | ئاپ | ئاب | ئاو | ئایە | - | ئاپیا |
| ئاتێر | - - - | ئاتوور - ئاتەخش | آتش | ئاتر- ئاور | ئاتهەرڤەن | ئاتر | ئەیزووس |
| ئەسمەن | ئازەنگەنیا | ئەسمان | ئاسمان | ئاسمان - ئازمان | ئەشمەن | - | ئاكمون |
| ئەوە — ئیو | - | ئاسین | آهن | ئاسن | ئەیەس | ئێس | ئێسێن |
| ئەورە | - | ئەبر | ابر | هەور - ئەبر | ئەبهرا | ئیمبێر | ئەمزۆس |
| برەڤەت | - - - | بروگ - بروك | ابرو | برۆ | بەروس | --- | ---- |

| نموونە وشە فارسییەكان | مانگ | برادەر | ناو | پرسین |
|---|---|---|---|---|
| ئینگلیزی | Month | Brother | Name | Question |
| ویلزی | Mis | - | Newydd | - |
| سویدی | Manad | Bror | Nomn | - |
| فەرەنسی | Mois | | | |
| ئیسپانی | Mes | | | |
| پورتكالی | Mês | | | |
| ئەڵمانی | Monat | | | |
| رووسی | Mesyats | Brat | Nam | Prossit |
| فارسی | Mah | Baradar | Nam | Pors |
| كوردی لاتین | Mang | Bira | Naw | Pirs |
| لاتین | | Frater | Nameh | |
| سانسكریت | | Bhratar | Nama | |
| یۆنانی | | Phrater | Onoma | |

بەهەرحاڵ زانایانی زمان وێڕای ئەوەی کە وێکچوونی رواڵەتی و ریشەی زمانگەلی جۆراوجۆریان خستووەتە بەر لێکۆڵینەوە، وێکچوونی رێزمانیشیان لەبەرچاو گرتووە، چونکە هەمیشە هەروەك "ئەراسمۆس راسك" دەڵێت، تەنیا لەیەکچوونی رواڵەتیی وشەی زمانەکان نابێتە هۆکاری بێ ئەملاو ئەولای هاوریشەبوون.

بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەو مەبەستە کە زمانی کوردی و فارسی و هیندیی کۆن و ئاڤێستایی لە باری هاوبەشی تایبەتمەندیی فۆنەتیکی و ریشەی واژەکان و ستراکتۆری بنەمای وشەکان، هەر لەیەك بنەماڵەن، دەتوانین ئەم وشانە کە لە خشتەی ژمارە (٤)دا وەك مشتێ لە خەروار هاتوون، بخەینە روو.

| وشە | ئاڤێستایی | هندیی کۆن | کوردی | فارسی | کوردیی لاتین |
|---|---|---|---|---|---|
| من | Azəm | AhÁm | ئەز | من | EZ |
| دوو (٢) | Dvá | Dva | دوو | دو | Dû |
| سێ (٣) | Θri | Tri | سێ | سە | Sê |
| چوار (٤) | Eaθwar | Chtvar | چوار | چهار | chiwar |
| شەش(٦) | Xşmaşaş | Sas | شەش | شش | şeş |
| سەت (١٠٠) | Sata | Sata | سەت | سد | Set |
| رەورەوە | Raθa-rava | Raθa | Rava | عرابە | Rewrrewe |
| پرس<br>مار<br>کێو | Fras<br>MAIRYA<br>KUofa | Pras<br>MIARA<br>---------- | پرس<br>مار<br>کێو | پرس<br>مار<br>کوە | Pirs<br>MAR<br>Kêw |

زۆر ئاشکرایە و ئەوەش نابێت لەبیر بکەین کە بە درێژایی رۆژگار، گۆڕانکارییەکی قووڵ بەسەر ئەو زمانانەدا هاتووە، بە جۆرێك کە تەنیا لە ریشە و بنچینەدا دەتوانین

خزمایەتی و نزیکبوونیان نیشان بدەین، بۆ نموونە گۆڕانکاریی سروشتی وشەی (ئەژنۆ)ی ئاڤێستایی لەناو زمانی ئەڵمانی دەدەینە بەر لێکۆڵینەوە:

| ئاڤێستایی | هند و ئەورووپایی | ئەڵمانی | ئەڵمانیی نێونجی | ئەڵمانیی کۆن |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| SHNU | GENU | KNIE | KNEU | NNIU |

(منوچهر اریانپور کاشانی، فرهنگ ریشەهای هند و اروپایی زبان فارسی، - ل: ٢٢).

هەڵبەت ئەوە، بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە سەر ئەم مەسەلەیە کە زمانی هیندۆئەورووپایی لە دەستەی سێیەمدا جێگیر دەبن، ئەو تایبەتمەندییەش خۆی لە خۆیدا بە خاڵێکی پۆزیتیڤ دەژمێردرێت.

تۆژینەوە دۆزراوەکانی ئاڤێستایی و مادی (هەمان ئاسەواری دۆزراوەی سەردەمی هەخامەنەشی) لەلایەکەوە، هەروەها بابەتەکانی سانسکریت و هیندیی کۆن لەلایەکی دیکەوە، نیشان دەدەن کە ئەو دوو هۆزە لە خەڵکانی هیندۆئەورووپایی بەر لە کۆچکردنیان بە یەك زمانی وەك یەك و تاك قسەیان کردووە.

بە هەرحاڵ نزیکبوون و وێکچوونی کوردیی ئێستا بەتایبەتی کۆی زاراوەکانی زمانی کوردی لەگەڵ ئاڤێستایی و هیندیی کۆن تا رادەیەك خۆی دەنوێنێت کە دەتوانین بەشێوەیەکی رواڵەتی، ئاڤێستایی بە کوردی و بە پێچەوانە، پاچڤە بکەین، بەبێ ئەوەی کە وشە و رستەکە لە بناغەی رێزمان و پرەنسیپی خۆی بترازێت.

بەشی سێیەم:

**پێوەندیی نێوان زمانەکانی ئاڤێستایی، مادی و کوردی.**

دارمستتر، نووسەری کتێبی (تتُبعات ایران) دەنووسێت: ((زمانی مادەکان (کوردە رۆژهەڵاتییەکان) زمانی ئاڤێستا بووە)). (تاریخ ماد از دیدگاه باستان شناسی، عبدالرضا مهاجری نژاد- ل: ٤٥).

مامۆستا مەردووخ دەبێژێت: "بنچینەی زمانی کوردی ڕۆژهەڵات بەشێوەیەکی تەواو، بریتییە لە زمانی مادی ئاڤێستا، ریشە و بنچینەی زمانی ئاریایی کۆن، کە زمانی "ئانزان"یان پێ گوتووە، بە باوکی هەموو زمانەکانی (ماد، هیند، پارس و ...) دەژمێردرێن". دیاکۆنۆفیش ئەوەی سەلماندووە کە پەرتووکی پیرۆزی ئاڤێستا بە یەکێك لە زمانە کۆنەکانی ئێران نووسراوە، لەبارەی شێواز و ڕێزمان و پرەنیسپی زمان، لەگەڵ زمانی ئێرانی کۆن کە گلێنە و بەردەنووسی هەخامەنیشییەکانیشی پێ نووسراوە (هەروەها لە زمانی هیندیی کۆن) جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە. زمانی کوردی هەر ئەو زمانەیە کە ئاڤێستای پێ نووسراوە، دارمستتر بە تەواوەتی هەر گومانێك لا دەبات و دەنووسێت: (ئاڤێستا) بە زمانی (ماد)ی نووسراوەتەوە. (غلام رضا انلاف پور، انتشارات مغان، ١٣٧٩).

دارمستتری فەڕەنسایی لە درێژەی باسەکانی لەسەر ئەو باوەڕە سوورە کە زمانی ئاڤێستایی هەمان زمانی مادەکانە، کە کوردەکانی ئەوڕۆ بە ئەژمار دێن، یاخود زمانی کوردی ئێستا پاشماوەی زمانی مادییە. ئەو باوەڕە لەلایەن ئوستاد پورداودیش جەختی لەسەر کراوەتەوە. مامۆستا مەردوخ دەڵێت: "زەند و ئاڤێستا هەروەکو زمانی ماد، نووسراوەتەوە کە کوردیی ڕەسەنە و لە زمان و دیالێکتی موکری دەچێت، (هورات) و (درستەر) هاودەنگ لەگەڵ چەند زمانناسێکی تری جیهانیدا لەو بارەیشەوە هەمان ڕاڤەیان هەیە. (عەزیز ئالانی، لەپێناوی زمانەکەماندا- ساڵی ٢٠٠٥- ل: ١٠).

دیاکۆنۆف لە پەرتووکی مێژووی مادەدا دەنووسێت: خەڵکی ماد لە سەرەتاوە بە زمانی ئاڤێستای کتێبی پیرۆزی ئایینی زەردەشت کە یەکێ لە کۆنترین زمانەکانی ئێرانە، قسەیان کردووە. (تاریخ ماد، دیاکونوف، ل: ٦٢).

ئیبن خەلدوون، دەڵێت: (ماد) و (کورد) هەر یەکن. (حەسەن پیرنیا)ش دەنووسێت: (مادەکان) ئارین و باپیرەگەورەی ئەو کوردانەن کە بە موکریانی ناسراون، یاخود کوردی موکرین، زمانی دێرینی (ماد) هەمان زمانی (موکری)ی ئەمڕۆییە. (عەزیز ئالانی، لەپێناوی زمانەکەماندا-ساڵی ٢٠٠٥).

بۆ وێنە، دەتوانین ئاماژە بە وێکچوونی، تاقمێك لەم وشانەی خشتەی ژمارە (٥) کە بە وشەگەلی مادی ناسراون، لەگەڵ کوردیی ئێستا بکەین. (زبان کردی و

لەهجەهای ان، دکتر نامیق صفی زاده، مجلە ئاناهید، ل: ٨٥، شمارە چهارم، دیماه ١٣٨٣).

| فارسی | وشەی کوردیی ئەمڕۆ | وشەی مادیی کۆن |
| --- | --- | --- |
| اتش | ئاتر - ئاگر | ئەتر |
| اهن | ئاسن | ئاسەن |
| دندە | پەراسوو | پەراسوو |
| سگ | سیاك - سیلۆك - سەگ | سیاکۆ |

لەڕاستیدا پێوەندیی راستەوخۆی نێوان زمانی مادی و کوردیی ئەوڕۆ لە دوو لایەنەوە روونکراوەتەوە، لە لایەکەوە گومان لەوە ناکرێت کە کورد لە نەژاد و نەسڵی مادن، لە لایەکی دیکەشەوە زمانی کوردی کتومت بەزمانی مادەکان دەناسرێت. (سایس) لەم باوەڕەدا بووە کە، «گەلی ماد چەند هۆزێکی کورد بوون کە لە خۆرهەڵاتی ئاشوور تا خوارووی دەریای قەزوین، سنووری وڵاتەکەیان بووە، لە بنەڕەتدا یاخود رەگەزدا (ئاری)ن و لە رووی زمانیشەوە (هیندۆئەورووپایی)ن». (عەلائەددین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، ١٣٧١- ل: ٢١-٢٢).

| وشەی فارسی | وشەی کوردی | وشەی ئاڤێستایی |
| --- | --- | --- |
| بزرگ | مەزن - مازن | ماز |
| ماهی | ماسی | ماسیا |
| اشتر - شتر | حوشتر - ئوشتر | ئوسترا |
| پل | پرت - پرد | پەرەتا |
| خورشید | خۆر - رۆژ - هور | هور |
| گراز | بەراز - وەراز | ورازا |
| مگس | مێش | مەخشی |

| وراخا | بەرخ | برە |
| --- | --- | --- |
| خسا | قسە | سخن |
| واس | ویستن- خواستن | خواستن |
| زان | زان- زانین | دانستن |
| ئەزم | من- ئەز | من |
| زاماتر | زامات- زاوا | داماد |
| ورك | گورگ- گەرگ | گرگ |
| مازگا | مەژی- مێشك | مغز |
| ئەهور | ئاهیر | اتش |
| گئوشاوەر | گوارە | گوشوارە |
| ئەزدی | ئێسك- ئێزگ | استخوان |
| خوسور | خەسوو- خەزوور | پدر زن |
|ماونگە | مانگ | ماە |
| لیب | لێو | لب |
| بەرەزا | بەرزە - بەرز | بلند |

واسیلی نیکیتین وای بۆ دەچێت کە: "رەگەزی کورد، دیاردەی هۆزەکانی کۆنی گوتی، لولو، مانایی، سوباری، نایری، میتانی، کوردۆك و ئۆرارتۆیە، کە بێگومان هەموویان بە زمانی مادی، کە هەر یەکەیان زاراوەی جیاوازیان بووە، گفتگۆیان کردووە". (کورد و کردستان، واسیلی نیکیتین، ١٩٦٠- ل: ٨ - ١٢).

ئاسەوارناسی ناوبەدەر، ئوستاد سوون نووسیویەتی: "کوردەکان لە نەژاد و رەگەزی مادن، وە ئەشو زەردەشت کتێبی ئاڤێستای پێ نووسیوە". (دودمان اریایی کرد کردستان، موزەفر زنگنە- ل: ٢٦-٢٧).

بەو زانایانە دەتوانین (دۆمەرگان)، (کینز یاس)، (پلوتارك)، (هانس کۆنترینێز) و (لووشان)یشی پێوە زیادکەین کە هەر لەسەر ئەو بیروڕایە پێیان داگرتووە (هەمان

سەرچاوەی سەروو). (زبان کردی و لهجه‌های ان، دکتر نامیق صفی زاده، مجله اناهید، ل: ٨٥، شماره چهارم، دیماه ١٣٨٣).

پرۆفیسۆر ویلیام جاکسن کە زیاتر لە هەرکەس دەربارەی زەردەشت لێکۆڵینەوەی کردووە، لەسەر ئەو باوەڕە جەختی هەیە کە (... موکرییەکان نەوەی راستەقینەی مادەکانن، لەبەرئەوەی کە لەنێوان ئێرانییەکاندا زیاتر لە هەموویان بە زێد و مەڵبەندی لەدایکبوونی زەردەشت نزیکتر بوون و تەنانەت ناسراون، لەلایەکی دیکەشەوە بە زمانێك پەیڤینیان هەیە، کە زیاتر لە هەموو زاراوەکان و زمانەکانی تر، بە زمانی زەردەشت "ئاڤێستایی" نزیکترە). (تحقیقی درباره کرد و کردستان- پروفسور محمدامین زکی- ترجمه و توضیح- حبیبالله تابانی- انتشارات ایدین- ١٣٧٧).

میجرسۆن ئاوا رای خۆی دەردەبڕێت: "... هەر ئەو کوردۆئێنانە رەگەزی کوردی ئەورۆ و نەوەی مادەکانی بەناوبانگن".

پرۆفیسۆر مەحەمەد ئەمین زەکی لەسەر ئەو رایە پێی داگرتووە کە، ئیتر جێی هیچ گومانێك نییە کە زەردەشت لە باکووری ناوچەیەك پێی ناوەتە مەیدانی ژیان، کە ئەورۆ بە ناوچەی موکری دەناسرێت، زمانی ئەو ناوچەیەش نزیکترین زاراوەیە لە نووسراوەکانی زەند و ئاڤێستا، واتە دەتوانین بڵێین لە بنەڕەتدا زمانی کوردیی (ئەورۆیە). هەڵبەت ئەو بیروڕایە لەلایەن هوارت (Huwart) و دار مستتر و تاقمێکی دیکە کاری زۆر لەسەر کراوە، بەجۆرێك کە بە ئەو ئەنجامە گەیشتوون کە ئاڤێستای زەردەشت بە زمانی مادی و کوردیی ئەورۆ نووسراوە. هیچ هۆیەك نییە کە گومان لەو بۆچوونەی سەروو بکەین، دیارە وێکچوونی وشەگەلی ئاڤێستایی لەگەڵ کوردیی ئەورۆ و هەڵسەنگاندنی لەگەڵ فارسیی ئەورۆ لە خشتەی ژمارە (٦)دا بە روونی ئەو راستییە بۆ ئێمە دەسەلمێنێت. بەپێی ئەو خشتەیە دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە زمانی کوردیی ئەورۆ لە لایەکەوە، راستەوخۆ لە زمانی ئاڤێستایی کەوتووەتەوە و لە لایەکی دیکەشەوە لە هەڵسەنگاندن لەگەڵ فارسی رەسەنایەتی و پێوەندی خۆی زیاتر پاراستووە. بە تێبینی و هەندێك وردبوونەوە لەسەر ئەو بەڵگە حاشاهەڵنەگرانە و ناوەرۆکی بابەتەکە، دەتوانین ئەو خاڵانەی خوارەوە بە راشکاوی دەستنیشان بکەین:

١- بنەمای زمانی کوردی، هیندی، فارسی، ئەورووپایی و... گشتیان دەگەڕێنەوە سەر یەک ریشە و بنچینەی تاك، بە دەستەواژەیەکی تر، بنەماڵەی زمانی هیندۆئەورووپایی لەسەر یەك بنج و ریشەوە رووان و چەکەرەیان کردووە.

لە سەرەتای مێژووی کورد بەو جۆرە کە لە تایبەتمەندییەکانی ئارییەکان ناسراوە، بەهۆی ئەوەی کە لە ئەساسدا لە رێگەی راو و ئاژەڵداری دەژیان، بەتایبەتی بەهۆی دەستەمۆکردنی ئەسپ، توانایەکی زیاتریان بۆ هاتوچۆ پەیداکردووە و بەردەوام لە ناوچەکانی تر بڵاوبوونەتەوە، کەوایە بەپێی ئەسڵی زانستی زۆرینەی پانتایی رەوا (M.P. ARE) زمانی سەرەتایی ئەو هۆز و گەلانە لەگەڵ ئەوەی کە بەسەر زاراوە جۆراوجۆرەکان، بەڵام لێك نزیك دابەش بوون، زمانگەلی جیاوازی وەك فارسی، لاتینی، هیندی، ئەڵمانی و... لێ بووەتەوە. (و.س.گویوا، ترجمه ولی الله شادان، دستور زبان فارسی میانه).

پڕ ئاشکرایە، بەهۆی تێپەڕبوونی کات و جودایی نێوان نیشتەجێیەکانیان و هەروەها نەبوونی هاتوچۆ لە مابەینیان و بەرینایی وڵاتەکانیان، جیاوازی و دژایەتیی رواڵەتیی نێوان ئەو بنەماڵەیەی پێکهێناوە، بۆیە زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بگوترێ زمانی دایکی، واتە دایکی زمانی هیندۆئەورووپایی زمانی کوردیی کۆنە.

٢- لەنێوان بنەماڵەی زمانی هیندۆئەورووپاییدا، زمانی کوردیی کۆن (ئاڤێستایی) وەك تاکە زمانێکی کۆنی ئاری دەدرەوشێتەوە.

٣- کۆنترین زمانی ئاخافتن و نووسینی دەشتی ئێران و خاکی ئێران، زمانی ئاڤێستایی، یاخود مادیی کۆن بووە، هەر ئەو زمانە کە راستەوخۆ زمانی مادی و زمانی کوردی ئەوڕۆی لێ بەرهەمهاتووە.

٤- سەرچاوەی هەموو زمانەکانی ئاریایی ئێران و گشت دیالێکت و زاراوەکانی، زمانی ئاڤێستایی و مادی کۆنە.

ئەگەر ئەوە بسەلمێنین کە زمانەکانی هیندۆئەورووپایی وێڕای پرەنسیپێکی هاوبەشی رێزمانی لەیەك ریشەوە سەرچاوەیان گرتووە، بەشێوەی سروشتی رووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبینەوە، کە وڵات و لانکەی خەڵکانی هیندۆئەورووپایی کوێیە؟

لە ماوەی چەند دەیەی سەردەم، تاقمێکی بەرچاو لە زانایان بەتایبەتی زانایان و مێژووزانەکانی رۆمی (T.GAMKRELIDZE-V.IVANO) ئەو

گریمانەیان وە پێش خستووە کە لانکەی خەڵکانی هیندۆئەورووپایی کوردستان و دەوروبەری کوردستانە، چونکە هەر لەو دەڤەرە بووە کە نزیکەی دە هەزار ساڵ بەر لە ئێستا، کشتوکاڵ و راهێنان و رامکردنی ئاژەڵ و مەڕومالاَت هاتووەتە ئاراوە و لە سۆنگەی ئەو راهێنانە، شارستانییەت و زیادبوونی حەشیمەت و پێکهێنانی ئەرتەش و تەکنیك و تەوسەعە و پێشکەوتوویی مرۆڤ لەڕێگەی کۆچکردنەوە وەدیهاتووە. (فرهنگ ریشەهای هند و اروپایی زبان فارسی، دکتر منوچهر اریانپور کاشانی). دیارە ئاسەواری کۆنی دۆزراوە لە سەرتاسەری مێزۆپۆتامیای کوردستانی گەورە، لەوانە ئەشکەوتی شانەدەری هەولێر و هەزارمێردی سلێمانی، بێستوونی کرماشان و گردی حەسەنلوو... ئەو گریمانەیە پشتڕاست دەکاتەوە.

زمانی هیندۆئەورووپایی، زمانی تاکی خەڵکانێك بووە کە نزیکەی چوار تا شەش هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لە ناوچەیەکی سنووردار ژیانیان بەسەر بردووە، هەر بەو هۆیەشەوە زمانی ئەو گەلە بەدوور لە زاراوەگەلی جیاواز و جۆراوجۆر بووە، یاخود زاراوەی ئەم زمانە گەلێك لە یەکتر نزیك بوون. پایەی هۆکاری ئەو بۆچوونەش هەروەك باسی لێکرا ئەوەیە، کە بەپێی پرەنسیپی زۆرینەی پانتای رەوا (پیشینە گسترەی مجاز- MAXIMUM PERMISSIBLE AREA)، ئەگەر بێت و جەغزەی پەرەسەندنی زمانێك بەرینایی هەبێت، زاراوە و پەراوێزەکانی ئەو زمانە هەرکامیان بە زمانێکی جیاواز و سەربەخۆ (تەبدیل) دەبن، هەروەك زمانی لاتین بە زمانگەلی جیاوازی فەڕەنسی، ئیسپانیایی، ئیتاڵیایی و... دابەش بووە. بەبێ درِدۆنگی ئەوە شتێکی گەلێك ئاساییە کە گوڕانکاری و لێکسوانی زمان لەگەڵ ئەوانەش ئاڵوێر و هەڵسوکەوتی نێوان زمان و زاراوەکان، نیشاندەری زیندووبوونی زمانە، ئەگینا زمانی پووکاو کە گوڕانی بەسەردا نایەت.

### زمانی کوردی و زمانی سەردەمی هەخامەنشی:

گرنگترین زاراوەی زمانی ئێرانی، زمانی کوردیی کۆن، یاخود ئاڤێستاییە، دواییش زمانی مادی و ئەو زمانە کە هەخامەنشییەکان لەوان وەریانگرتووە و لە مێژوودا بەهەڵە، بە زمانی فارسیی کۆن، پارتی و... ناویان لێ دەبردرێت.

دەربـارەی زمـانی ئاڤێسـتایی بێجگەلـە پـەرتووکی ئاڤێسـتا، کـە ئـەویش لـە قۆناغەکانی تری مێژوودا نووسراوەتەوە، شتێکی دیکەمان لەبەر دەستدا نییە، وشـە و بەڵگە دۆزراوەکانی زمانی مادی و سکایی، لە چەند چەمکێك تێپەڕ نـابن (سـۆران).

لەبارەی هەخامەنشی (مادی) کۆن دەتوانین بڵێین کـە سەرچاوەی زمانـەکانی ئێـران، رۆژهەڵاتی (بەلووچی، ئۆردوو، سەغدی و...) و رۆژئـاوایی (فارسـیی کـۆن، فارسـیی نێونجی و ئەمڕۆیی، کوردیی نێونجی، پارتی، پەهلەوی و...)ن، کەوایـە هـەم فارسـی و هەم کوردی، راستەوخۆ لە زمانی هەخامەنشی (مادی) کۆن جیابوونەتەوە. دیاکۆنۆف لە زمان "ئەسترابۆن"ەوە دەنووسێت: "زمانی مادەکان لەگەڵ زمانی فارسی و پارتی و باکتەریا هەریەك بووە" و لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێت: "دەبێت زمانی ئاڤێستاش بـە زمانی مادی لە قەڵەم بدەین" (ل: ٨٥-٨٦)، تا دەگات بە فارسـیی کـۆن و فارسـیی نێونجی کە هەر کوردی ئەوڕۆیە (تاریخ سیاسی و جغرافیـایی مـردم کـرد، (از شـرقی ترین تا غربی ترین)، غلامرضا انصاف پور، انتشارات مغان، ١٣٧٩).

پێویستە بڵێین زمانی سەردەمی هەخامەنشی، کتومت پاشماوەی زمـانی مـادییـە، ئەگەرچی تاقمێك لە پیتی وشەکان بەپێی تێپـەڕبوونی کـات و ئـاڵوگۆڕی سروشـتیی زمان، هەروەها پرۆسەی (فراژوو) تەکامووڵ و سادەبوونەوەی زمان، گۆڕانکـاریی تێـدا کـراوە. مخـابن، فارسـەکانی دەمـارگیر و هەمەلایـەنخواز، لـە زمـانی بـاوی چـاخی هەخامەنشییەکان بەناوی فارسیی کۆن (فارسی باستان) نێوی لێ دەبەن، ئەو رستەیە (فارسی کۆن) کـە قەوارەیـەکی لێکـدراوی مـەنتیقی و قـابیلی قـەبووڵ نییـە، وەك هەڵەیەکی بە ئەنقەست لە مێژوودا جێ کەوتووە و تا رادەیـەکی زۆریـش جێـی خـۆی کردووەتەوە، بۆئەوەی کە رۆژئاواییەکان و رۆژهـەڵات ناسـەکانیش لـە زۆربـەی کاتـدا ئەوەیان کەوتووەتە ناو مێشك و کاوێژی دەکەنەوە.

بەهەرحاڵ، ئەسڵ و سەرچاوەی پارسـیی کـۆن و فارسـی ئـەوڕۆیی، بـەپێی وتـەی زۆربەی زانایانی زماناس و مێژووزانەکان وەك دیاکۆنۆف، مینۆرسـکی،... دەبێـت لـە وڵاتی ماد بدۆزرێتەوە، چونکە زمانی کەتیبەکانی هەخامەنشی، داگـری وشـەی زۆری مادین، تەنانەت تاقمێکی بەرچاو، لەو باوەڕەدان کە خەتی نووسینی کـۆنی سـەردەمی هەخامەنشییەکان، لە خەتی مـادیی کـۆن، یـاخود خـەتی مانایيەکانـەوە وەرگـیراوە،

لەبەرئەوەی  کە خەتی نووسینیان، واتە خەتی بزماری هەر بە تەواوی جیاوازی هەبووە (فرهنگ ریشەهای هند و اروپایی زبان فارسی، دکتر منوچهر اریانپور کاشانی).

بۆڵد کە رای خۆی بەم جۆرە تۆمار دەکات: ئەگەر کەتیبەیەك لە کورد بدۆزرێتەوە شیمانەی ئەوەی بۆ دەکرێت کە بە زمان و خەتەوە، کتومت هەمان نووسراوەی کەتیبەکانی پاشاکانی هەخامەنەشی بێت. (تتبعات تاریخی راجح به ایران، دارمستتر، به نقل از تاریخ سیاسی و جغرافیای کورد، غلامرضا انصاف پور، ل: ٧١).

لێکدانەوەی وشەگەلی خواروو، ئەو راستییە گومان لێ نەکراوەمان پێدەڵێت. پیتی (ژ)ی ئاڤێستایی لە زۆربەی هەرەزۆری وشەکانی فارسی ئەوڕۆدا بە (ز) و (د)، (د)ش بە (ز) و بەپێچەوانەوە، گۆڕدراوە و لە کوردی بەتایبەتی کرمانجی ژووروودا، هەروەك خۆی ماوەتەوە.

| کوردی | فارسی | ئاڤێستایی |
|---|---|---|
| دڵ - زوێڵ - زێڵ | دل | زەرەد - زەد |
| ژن | زن | ژەن |
| ژەنگ | زنگ | - |
| باژێر - بازاڕ | بازار | - |
| ژەندن | زدن | ئەناژن |
| ژین | زیستن | ژیە |
| زان | دان | زەن |

زۆربەی پیتەکانی (پ)ی ئاڤێستایی بە (ف) و (ڤ V)ش بە (F) گۆڕاوە. (س) بە (ش)ی گۆڕدراوە.

| کوردی | فارسی | ئاڤێستایی |
| --- | --- | --- |
| ئەنگوست- قامك | انگشت | - |
| ئەسرین- فرمێسك- رۆندك | اشك | ئەسرو |

| کوردی | فارسی | ئاڤێستایی |
| --- | --- | --- |
| خۆر-هەور | خورشید | هور |
| هوشك-هیشك-وشك- خوەیشك | خواهر-خشك | خوشکا |
| گیان | کیان-جان | گیە |
| مرت - مرد | مرد | مرتن |
| ئەژنۆ | زانو | شنوو |

(هـ) بە (خ) گۆڕدراوە.

(گ) بە (ك) و (ج) گۆڕدراوە.

(م) بە (د) گۆڕدراوە.

(ش)بە(ز) و(ز)ێش بە (ژ) گۆڕدراوە.

لەڕاستیدا ئەگەر زمانی چاخی هەخامەنەشی (بەهەڵە فارسیی کۆن) لەگەڵ زمان گەلی ئێستای کوردی و فارسی بەرانبەر یەکیان دابنێین، تێدەگەین کە زۆربەی هەرە

زۆری وشەکان، میناهی و وێکچوون و هاوسەنگەییەکی بەرچاوی لەگەڵ کوردی هەیە، بەبێ قسە ئەوە داگری چەند خاڵی گرنگە:

١- ئەوەی کە زمانی هەخامەنەشی، کوردی و فارسی هەرکامیان بنزمان و زاراوەی زمانی مادین.

٢- نزیکترین زاراوە بە زمانی هەخامەنەشی و مادی، زمانی کوردییە.

٣- ئەو دیاردەیەی کە ئێستا فارسەکان بە ناوی فارسیی کۆن، دەیناسن و دەیناسێنن، لەڕاستیدا بە هەندێك گۆڕانکاریی سروشتی، هەمان زمانی کوردیی کۆنە (زمانی سەردەمی مادەکانە).

## کۆتایی

### زمانی کوردی و زمانی پارتی:

زمانی پارتی کە بەنێو گەلی پەهلەوی، پەهلەوانی، پالەوی و پەهلەوی ئەشکانی و... ناوی لێ براوە، یەکێك لە زمانە نێونجییەکانی ئێرانە. زمانە ئێرانییەکان لەڕاستیدا بەو زمانانە دەگوترێت، کە دوای تێکچوون و هەڵوەشانەوەی هەخامەنەشییەکان (٣٣٠-پ.ز) لە ئێراندا برەوی هەبووە. لەو زمانە لەناو دەقەکانی (مانەوی)دا بەنێوی پەهلەوانێك، نێو براوە.

دەگوترێت لە سەرچاوەی کۆنی زمانی پارتی شوێنێك نەدۆزراوەتەوە. زۆربەی توێژەرەکان و زانایانی مێژوویی، ئاوا دەنووسن کە دوو پەرتووکی یادگاری زەریران (پاتکار- یادگار زریران) و داری ئاسووری (درخت اسوری) لە بنەمادا بە زمانی پارتی نووسراین، هەر دووی ئەو کتێبانە کە لە ساسانییەکانەوە بەجێماون، واژەگەلی "پارتی" تێیاندا وەبەرچاو دەکەوێت. (دکتر حسن رضایی باغ بیدی، راهنمای زبان پارتی "پهلوی اشکانی"، ص ٢٥).

تاقمێك لە زمانناسەکانی ئێرانی پێیان وایە کە پەخشانەکانی وەیس و رامین (فخرالدین اسعد گرگانی- قرن ٥ هجری) و هەندێك داستان و چیرۆکی ناو شانامەی فیردەوسی وەکو بیژەن و مەنیژە لە بنەمادا پارتی بن، ئێمە لەسەر بنەمای ئەو خاڵانەی

که له درێژایی بابەتەکەدا باسیان دەکەین، وای بۆ دەچین که زۆربەی ئەو چیرۆکانه و هەروەها کۆمەڵێك داستان و بەرهەمی وەك شیرین و فەرهاد، لەیلی و مەجنوون، ناسر و مالّمالّ، لاس و خەزالّ و ارتای ویرافنامه، کارنامەی ئەردەشیری پاپەکان و... له بنەڕەتدا به زمانی کۆنی کوردیی نێونجی نووسراون (فرهنگ فارسی-کردی، شکرالله بابان- ص ٨).

(مانی) شاگردی (ئاندراس) به هێنانەوەی شەش هۆکار و دەلیل، جیاوازی و ناکۆکیی نێوان زمانی فارسی (نێونجی) و پارتی تاپۆ کردووە. (و. س. گویوا، ترجمه ولی الله شادان، دستور زبان فارسی میانه- ص١٢).

ئەگەرچی ئەوەش ئینکار ناکەین که تەنیا بەڵگه و گەواهی بۆ ئەو بۆچوونه، له یەك ریشه و بنەما بوونی وشەگەلی پارتی لەگەڵ کوردیی کۆن و ئەمڕۆ، هەروەها بۆچوون و کۆکبوونی مانا و ناوەرۆکی داستانەکان لەگەڵ چوارچێوەی فەرهەنگ و جیهانبینیی کورد، لەسەر هێڵی تێکست و شێوازی (بازسازی) فەرهەنگی و پێکهەڵکێشانی بەشه وڕیکچووەکانی فەرهەنگی گەلان، ئێمه له دروستبوونی ئەو رایه نزیکتر دەکاتەوە.

بەگشتی مێژووناسان و ئاسەوارناسەکان لەسەر ئەو رایه کۆکن که دەسەڵاتدارانی سلسلەی پارتی له ئەساسدا ئێرانی و ئاریایی نین، بەڵکو له نەژادی زەرد (تورکەکانی مەغوول)ن، که له ڕێگەی باکووری ئێرانەوە پەلاماریان هێناوەته ناو خاکی ئێران. گومان لەوەدا نییه که زمانی تورکەکانی مەغوولی له ریشەی "ئالتایی - جغتایی"یەوە هاتووە و هیچ پێوەندیەکی لەگەڵ بنەماڵەی زمانگەلی هیندۆئەورووپایی بەگشتی و زمانەکانی ئێرانی بەتایبەتی، نییه. ئەوە دەمانباته سەر ئەو باوەڕەی که بنەماڵەی پاشایەتیی پارتەکان زمانی ئەو سەردەمەی ئێران که هەمان زمانی کوردی کۆن بووە به هەندێك ئالوگۆڕ و دەستێوەردان، پەسند کردووە و کاروباری خۆیان پێ ڕاپەڕاندووە. بۆ نموونه دەتوانین ئەو گۆڕانکارییانه له ئاڤێستایی بۆ فارسی کۆن! و پارتی به نموونه بێنینەوە.

| ئاڤێستایی | فارسیی کەونارا (کوردیی کۆن) | پارتی (کوردیی ناونجی) | کوردیی ئێستا |
|---|---|---|---|
| ئەسیا | ئەسیا | ئەسپ | ئەسپ |
| ئاسنگا | ئاینگا | ئاسەنگ | سەنگ-بەرد |
| دێئێنیا | - | دێن | دین-دێن |
| زێمە | | دمیستان | زستان |

١- a (ئا)ی سەرەتایی و ناوەڕاست لە پارتیدا ماوەتەوە، بەڵام لە کۆتایی وشەکاندا لابراوە، بەڵام ئەو پیتە لە کۆتایی زۆربەی وشەکانی کوردی هەروەك خۆی ماوەتەوە.

٢- (ب)ی کۆن لە پارتیدا ماوەتەوە، بەڵام لەنێوان دوو پیتی دەنگداردا بە (واو W) گۆڕدراوە.

٣- (Z)ی ئەڤێستایی لە پارتی و کوردیدا هەروەك خۆی ماوەتەوە.

٤- (س)ی ئاڤێستایی و پارسی کۆن بە (ه) گۆڕدراوە. وشەی ئاڤێستایی «ئاسو» بە واتای تووندوتیژ بە وشەی ئاهو بگۆڕ کراوە، بەڵام لە زمانی کوردی هەروەك خۆی «ئاسك» ماوەتەوە.

| پارتی | فارسی | کوردی |
|---|---|---|
| GAD | می رسد | دەگات |
| KAFT | افتاد | کەوت-کەفت |
| WAXT | گفت | گوتی-وتی-ئاخافتی |
| RosHN | روشن | رۆشن-روون |

(له باری دەربڕینەوە جێی سەرنجە)

لێرەدا بۆ روونبوونەوەی زیاتر ئاماژە بە کۆمەڵێك وشەی دیکە دەکەین.

| پارتی | کوردی | فارسی |
|---|---|---|
| kē | کێ | چە کسی |
| nēzanēd | نەزانێت | نداند |
| pēš | پێش | پیش |
| mihrban | مێهرەبان | مهربان |
| raz | رەز | تاکستان |
| zanin | زانا | دانا |
| barag | بەرگ-جل | لباس-پوشاک |
| bun | بون و بنەما | بن |
| bandistan | بن دەست | زندان |
| barz | بەرز | بلند |
| dār | دار | درخت |
| dūy | دۆ | دوغ |
| kumār | | جوان-پسر-شاهزاد |
| kišt | کشت و کاڵ | کشت |
| gyanēn | گیانی | معنوی |
| droy | درۆ | دروغ |
| dēw | دێو | دیو |
| rož | رۆژ | روز |

لە هەندێك بەڵگەی دۆزراوە لەو سەردەمەدا، دەقاودەق وشە کوردییەکانی ئەورۆ بەکاربراون، بەجۆرێك کە ئەگەر بە کەسێکی کورد و فارسی ئەورۆی نیشان بدەی، کوردەکە بەبێ ئەوەی کە هەست بەوە بکات کە ئەو رستە و واژانە هی زمانی پارتییە، وەك کوردی ئەورۆ دەیخوێنێتەوە و لێی تێدەگات، بەڵام فارسەکان، جگەلە سەر

راوەشاندن و سەرگێژە، هاڕەی لە بڕەی ناکاتەوە و بە قەولی پرۆفیسۆر جەمال نەبەز، هەر لە کوولەکەی تەڕیشدا چاویان پێ نەکەوتووە و نەیانبینیوە.

لەناو بونچاقیێکدا ئەو رستەیە بۆ نموونە دەتوانین بخەینە بەرچاو: (حسن رضایی باغ بیدی، راهنمای زبان پارتی "پهلوی اشکانی"- ص١٣٩)، (( Azh raz bardaan...)).

(ئەژ رەز بەردان...) واتە لە رەزی بەردان.

لاتین: Ej rej berdan...

وشەی رەز هەر بە مانای باغی ترێ لە بونچاقی ئەورامانیشدا هاتووە.

لە هەندێك لاپەڕە دۆزراوەی کاتی مانەوییەکاندا، کە باس لە داستانی بە سەلیب کێشانی عیسا دەکرێت، ئاوا نووسراوە:

((Hêb zaanêd kû...)).

... هەرکەسێك بزانێت کە...

بێگومان ئەو نیوە دێڕانە بە هەر کوردێك، کە ئاگادارییەکی ئەوتۆشی لەسەر زمانی رەسەن و دایکییدا نەبێت، نیشان بدەی بە سانایی لەوە تێدەگات، بەتایبەتی وشەگەلی هێب (هەر کەسێك)، زانێد (بزانێت)، کوو (کە)، ئەژ (ژ - ژێ) لە لای کوردەکانی تورکیا هەر ئێستاش بە هەندێك گۆڕان هەر لەسەر زمانانە.

نزیکی و وێکچوونی زمانی پارتی و کوردیی ئەمڕۆ تا رادەیەکە، کە دەتوانین ئەو دوو زمانە، وەك دوو زاراوەی تەواو نزیك لە یەك زمان کە هەمان مادییە، بزانین، ئەگەر قبووڵ بکەین کە کوردی و پارتی لە زمانی ئاڤێستایی و بە ئاشکرایی و رەبەق (مشخص) لە ئاڵوگۆڕی پیت و فۆنەتیکی زمانی پارتی بەرهەم هاتووە. هەر بۆیە دەڵێین، کە ئەو شتەی بەنێوی زمانی پارتی ئەشکانی دەیناسین، هەمان زمانی کوردییە کە خۆی لە خۆیدا لە زمانی کوردیی کۆن، (مادی)یەوە هەڵگیرساوە. لێکچوونی یەکجار زۆری وشە و ریشەی واژەکان لەگەڵ کوردیی ئەمڕۆیی ئەوە مسۆگەر دەکات و هەڵبەت ئەوەش دەتوانرێت لە کتێبی داری ئاسۆریك روونتر ببێتەوە.

**بەرەنجام:**

هەرچەند بزر ناکرێت کە پشکنین و دۆزینەوەی بەڵگە و دۆکیۆمێنتی بێ قڕە، بەمەبەستی پۆلێنکردن و دەستنیشانکردنی زمانی کوردی، لە هەمان حاڵدا کە زۆر ناسك و کەرەستەیەکی پێویستە، گەلێك چەتوون و دەریایەك دژوارە، بەلاّم لە بەرەنجامی ئەو بابەتەدا، بەوە دەگەین کە زمانی کوردیی کۆن و ئاڤێستایی (مادی) ماك و ریشە و سەرچاوەی زمانی کوردی بە ئەژمار دێت، ئەوەش خۆی لەخۆیدا پێوەندی و راپەرموونییەکی بێ ئینکار و لەپسان نەهاتووی بە شوناس و ناسنامەی نەتەوەی کوردەوە هەیە.

بێگومان مەبەستمان ئەوە نەبووە کە بە شان و باهۆی زمانی کوردیدا بێینە خوار، بەلاّم دیارە لە دەقی ناوەرۆکی ئەم وتارەدا هەوڵمان داوە، نیشان بدەین زمانی کۆنی ئاری (زمانی دایکی بنەماڵەی هیندۆئەورووپایی) و دواییش زمانی ئاڤێستایی و کوردیی کۆن تاکە زمانێك بووە کە لە میزوپۆتامیادا دەورێکی سەرەکیی گێڕاوە و وەك بنەمای هەموو زمانەکانی پۆلی هیندی و ئەورووپایی و لقی ئێرانی لەقەڵەم دەدرێت. بێ شك ئەو گریمانە راستییەمان کاتێك بۆ دەردەکەوێت، کە بە چاوێکی ژیرانە و دوور لە دەمارگرژی، سەرنج بدەینە سەر وشەگەلی کوردیی ئاڤێستایی و کوردیی نوێ و لەگەڵ ئەوانەشدا کێشان و بەرانبەر دانانیان لەگەڵ مادی، پارتی، پەهلەوی و فارسیی نوێ ئەو راستییەمان زیاتر بۆ دەسەلمێنێت.

# جووت ستانداردبوون بۆ زمانی پێوەر، دۆخی تێپەڕینە، نەک مانەوە.

د. ڕەهبەر مەحمودزادە- شنۆ

بەرلەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە کە زمانی کوردی زمانێکی تاك ستانداردە یا جووت ستاندارد، دەبێت پرسیارێکی تر بە روونی وەڵامی بدرێتەوە. پرسیارەکە ئەمەیە: مانای زاراوەی زمانی ستاندارد چییە و ئەم زاراوەیە چ جوداوازییەکی مانایی لەگەڵ زاراوەی وەك زمانی رەسمی هەیە؟ بە گوتەیەکی دیکە مەرجی وەڵامدانەوە بە پرسیاری لەم دەستە هێندێك هەنگاوی شیکارانە و لێکدانەوەی روونکەرەوەیە. (باسی شیکارانەی جوداوازیی نێوان زمانی ستاندارد و زمانی رەسمی هەتا بەشەکانی کۆتایی ئەم وتارە دوادەخەین، هەروەها لە بەشەکانی دواتری ئەم وتارەدا ئەوەش روون دەکەینەوە کە پرسیاری دروست لەمەڕ ستانداردی زمانی کوردی یا زمانی کوردیی ستاندارد ئەوە نییە بڵێین "زمانی کوردی تاك ستانداردە، یان جووت ستاندارد؟" بەڵکو پێویستە پرسیارەکە ئاوەها رێك بخرێت: "زمانی کوردی بۆ بە ستانداردبوونی زیاتر دەبێت تاك ستاندارد بێت، یان جووت ستاندارد؟"

هێندێك مەرج بۆ زمان، یان زاراوەی ستاندارد دەستنیشان کراون کە لەو مەرجانە هێندێکیان ئەو کۆپێوەندییە ناوەکییانەی زمان، یان زاراوەکە دەگرێتەوە و هێندێکیشیان پێوەندییان بە هاوپێوەندییە دەرەکییەکانی زمان، یان زاراوەکەوە هەیە. بۆ نموونە لە پێناسەیەکدا گوتراوە: زمانی ستاندارد زمانێکە کە رێساکانی کۆکراوەتەوە و نووسراوەتەوە و لە قۆناغەکانی دواتریشدا ئەو رێسا کۆکراو و نووسراوانە لەلایەن کۆمەڵگایەکی زمانییەوە وەرگیراو و دەکار کراوە. لەم پێناسەیەدا، باسی کۆکرانەوەی رێساکان و نووسرانەوەیان باسێکی رێزمانی و زمانەوانییە و پێوەندی بە ساغکردنەوەی رێساکانی ئەو زمانەوە هەیە کە زمانناسان دەیکەن، بەڵام وەرگیرانی ئەو رێسایانە و ئاستی دەکارکرانیان باسێکی کۆمەڵایەتی و سیاسییە کە لە بوارەکانی زمانناسیی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵناسیی زماندا باسی لێ دەکرێت. زۆر پێناسەی تریش بۆ زمانی ستاندارد بە دەستەوە دراوە. زاراوەی زمانی ستاندارد یان پێوەر هێندێك جار بە مانایەکی بەربلاو و هێندێك جاریش بە مانایەکی بەرتەسك کەڵکی لێ وەردەگیرێت. (لە بەشەکانی دوایی ئەم وتارەدا ئەم جوداوازییە بە وردی باسی لێوە دەکرێت) لەناو پێناسەکانی زاراوەی "زمانی پێوەر" -بە مانای بەرتەسك- دا ئەم پێناسەیە رەچاو دەکەین: "پێوەربوونی زمان بەستراوەتەوە بە رێسامەندبوونی

شێوەی بەکارهێنانی ئەو زمانە و ڕێژەی پێوەربوونی زمان زیاتر دەبەسرێتەوە بە ڕادەی گەڕانەوەی بەکارهێنەرانی ئەو زمانە بۆ ڕێسا دیاریکراوەکانی زمان، بە مەبەستی چارەسەرکردنی گرفت و کێشە زمانییەکان".

ئەم پێناسەیە پێویستی بە چەند ڕوونکردنەوەیەکی کورت هەیە:

یەکەم: لە بنەڕەتدا وا نییە زمانێك تەواو ستاندارد بێت، یان تەواو ناستاندارد، چونکە هەمسوو زمانێك کۆمەڵە ڕێسایەکی تایبەت بە خۆی هەیە و ئێمەش ستانداردبوونمان زیاتر بەستەوە بە ڕێسامەندبوونی شێوەی بەکارهێنانی زمان، کەوایە هێندێك زمان کەمتر ستانداردن و هێندێك زمان زیاتر ستانداردن.

دووەم: جاری وایە لە دەربڕینەکان و نووسینەکاندا دەڵێین فلان زمانە یان فلانە زاراوە، زمان یان زاراوەیەکی ستاندارد نییە، مەبەست ئەوەیە کە بەکارهێنەرانی ئەو زمان، یات زاراوەیە بۆ یەکلاییکردنەوەی گرفت و کێشە و ناکۆکیی زمانیی، ئەو کۆدەنگییە لە ناویاندا نییە کە پەنا ببەنە بەر ڕێسا داڕێژراو و پەسندکراوەکان، بەڵکو بۆ سەرخستنی شێوە نووسینێکی تایبەت هێندێك پێوەری تر وەك گرنگیدان بە "بن زاراوە"ی ناوچەیەکی تایبەت، یان گرنگیدان بە ئۆتۆریتەی فلانە کەسایەتی ڕەچاو دەکرێت. هەرکاتێك لە کۆمەڵگایەکی زمانیدا لەجیاتی ڕێساکان و باسە زمانەوانییەکان، بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەی زمانی و گرفتەکانی نووسین، ئۆتۆریتە و مەرجەعییەت درا بە شتێکی تر، لەو پێودانەدا بەشێوەیەکی تەسامحی دەگوترێ ئەو زمانەی لەو کۆمەڵگا زمانییەدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت، زمانێکی ستاندارد نییە، ستاندار نییە، نەك بەو مانایەی ڕێسای نییە و بێ قاعیدەیە، بەڵکو بەو مانایەی ڕێساکان مەرجەعی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە زمانییەکان نین.

بۆ نموونە ئاماژە بە هێندێك کێشە دەکەم کە لە کوردیی ناوەڕاستدا لە شێوەی نووسین لەگۆڕێدا هەیە:

- بۆ نووسینی کرداری ڕانەبردوو جاری وایە "ئە" وەکو نیشانەی کرداری ڕانەبردوو دەکار دەکرێت، جاری وایە"دە": ئەنووسم/ دەنووسم.

- بۆ نووسینی کردار لە هێندێك ڕێژەی تایبەتدا، لە سێ یا چوار شێوەی جوداواز کەڵك وەردەگیرێت: خۆزگە بمنووسیایە/ نووسیبام/ بمنووسیبا/ بمنووسیبایە.

- هێندێك ناوی بەرکار بە دوو شێوە دەنووسرێن: شاراوە/ شاردراوە.

- کرداری کارا نادیار (مجهول) بە دوو شێوە دەنووسرێت: دادەنرێ/ دادەندرێ. رفێنرا/ رفێندرا.

- بۆ گەردانکردنی هێندێك کردار بەتایبەتی ئەگەر کردارەکە پێشگری هەبێت، دوو شێوەی گەردانکردن دەکار دەکرێت، کە تێیاندا، پێشگرەکان، پاش و پێشیان پێ دەکرێت: راوەدەستم/ رادەوەستم.

- بۆ نووسینی دوو وردە واژە یا پێشگری "دە" و "لە" لە هێندێك شوێندا ناکۆکیی هەیە: نەختێك لەو دیمەنە رامام/ نەختێك دە ئەو دیمەنە رامام.

- زۆرجار بزوێنی "-ە" جێگای بزوێنی "ێ" دەگرێتەوە. نایە/ نایێ. دەڵەم/ دەڵێم.

- هێندێك پێکهاتە زۆرتر بەشێوەی سواو و جاری واشە بەشێوەی تەواو و نەسواو دەکار دەکرێن: بەم شێوەیە/ بە ئەم شێوەیە، لەم شوێنەوە/ لە ئەم شوێنەوە.

ئەوانە هێندێك نموونەن لەئەو کێشانەی بۆ نووسین دەگۆڕێدا هەن. نە ئەو نموونانە هەموو کێشە و گرفتەکان دەگرنەوە و نە من لەم نووسینەدا مەبەستی چارەسەرکردنیانم هەیە. تەنیا دەمەوێت ئەوەندە بڵێم تاك تاکی ئەو گرفتانەی ئاماژەم پێکردن بە باسی وردی رێزمانیی چارەیان دێ، بەڵام ئێستا کە گرفتەکان هەر ماونەتەوە و کێشەکان چارەسەر نەکراون لەبەر ئەوەیە لە کۆمەڵگای زمانیی کوردیدا مەرجەع و ئۆتۆریتەی چارەسەرکردنی کێشەکان باسی زانستی لە بواری رێزمان و زمانەوانی نییە. ئا لێرەدایە کە هێندێك زمانناس دەڵێن زمانی کوردی دەبێت زیاتر بۆ گەیشتن بە ئاستی بە پێوەربوون مشووری بۆ بخورێت. ئەو نموونانەی هێنامنەوە بەشێك لە کێشەکانی زاراوەی کوردیی ناوەڕاست بوون. عەینی ئەم پێودانە بۆ شێوەزاری کوردیی سەرووش لە گۆڕێدا هەیە و دەکرێت نموونەی لە ئەو چەشنە بۆ ئەم زاراوەیەش بهێنینەوە.

سێیەم: کاتێك پرسی ستانداردبوونمان بە پرسی رێساداربوون بەستەوە، یەکەم تێبینی و وەبیرخستنەوەمان هەڵگری ئەو خاڵە بوو کە هەموو زمانێك رێسادارە و ئێمە زمانی بێ رێسامان نییە، هەر بۆیە گوتمان کاتێك بەشێوەی مەجازی دەگوترێت فلانە زمانە ستاندارد نییە، مەبەست ئەوە نییە رێسای نییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە رێساکانی بۆ بەلاداخستنی کێشەکان مەرجەع و سەرچاوە نین. ئێستا تێبینییەکی لە جۆری دیکە دەخەینە روو.

ئەگەر زمانی بێ ڕێسامان نەبێت، زمانی ئاوەهاشمان نییە کە هیچ بابەتێکی بێ ڕێسای تێدا نەبێت. هەموو زمانێك نموونەی بەلێشاوی ئەوتۆی تێدا هەیە کە لە چوارچێوەی ڕێسادا دەستەمۆ نابن. لێرەشدا ئەو ڕوونکردنەوەیە پێویستە کە لە ڕوانگەی ئێمەوە زمانی ستاندارد ئەو زمانە نییە کە نموونەی بێ ڕێسای نەبێت، بەڵکو ئەو زمانەیە کە بەشە ڕێسادارەکەی و بەشە بێ ڕێساکەی ئەوەندەی کرابێت جوداکرابنەوە و دیار کرابێت کامە باس لە چوارچێوەی گوتەزا، واتە مەقوولەی قیاسی، یان ڕێسادارادایە و کامە باس لە چوارچێوەی گوتەزای سەماعی، یان بێ ڕێسادایە. بە دەربڕینێکی تر جوداکردنەوەی ڕێسادار و بێ ڕێساکەشی هەتا ڕادەیەکی زۆر لە چوارچێوەی پۆلێنکردنێکدا ڕێسادارکرابێت و لە خشتەی ئەو پۆلێنکردنەدا ڕێسادارەکان لە هەواری خۆیان و بێ ڕێساکانیش لە دەواری خۆیاندا جێگیر بووبن.

گرفتی زمانی ناستاندارد لەوەدایە کە تەنانەت لەو جێگایانەشدا کە زمانەکە بەڕاستی ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە، ئەو ڕێسایانە ڕەچاو ناکرێن و بێ ڕێسایی تەنگ بە ڕێسادارەبوون هەڵدەچنێت. هۆی ئەو دۆخەش ئەوەیە کە ئەو ڕێسایانە، یان کۆ نەکراونەتەوە و سەقامگیر نەبوونە و نەنووسراونەتەوە (واتە تەدوین نەکراون)، یان ڕێساکان نووسراونەتەوە، بەڵام دەکار ناکرێن (واتە نەچەسپاون)، هەر بۆیە هێندێك زماناس بۆ پێناسەکردنی زمانی پێوەر دەڵێن زمانێکە کە لە هەنگاوی یەکەمدا ڕێساکانی تەدوین کرابن و لە هەنگاوی دووەمیشدا ئەو ڕێسایانە چەسپابن.

نووسەرێك لە جێگایەکدا نووسیویە[1] لە زمانێکی هەرە پێشکەوتوو و ستانداردی وەك ئینگلیزیشدا بۆ بەکارهێنانی هێندێك نموونە جوداوازیی هەیە. بۆ نموونە ڕابردووی کرداری Light بەشێوەی Lighted دەنووسرێت و بەشێوەی Lit-یش دەنووسرێت، کەوایە ئەوە بەرد بە ماڵە خودا دادان نییە ئەگەر لە زمانی کوردیشدا بۆ نموونە کرداری ڕانەبردوو، هێندێك جار بەشێوەی ئەڕۆم بنووسرێت و هێندێك جاریش بەشێوەی دەڕۆم. یان کرداری ڕاوەستان هێندێك جار بەشێوەی ڕاوەدەستم بنووسرێت و هێندێك جاریش بەشێوەی ڕادەوەستم.

بە بڕوای من ئەوە تێکەڵکردنی دوو باسی جودایە. لە ئینگلیزی و لە هەموو زمانە ستاندارد و پێشکەوتووەکاندا هێندێك جودا دەکارکردن و جوداواز نووسین و بێ ڕێسایی ئیجازەی پێ دراوە وەك Lit و Lighted. هێندێك جوداواز دەکارکردنیش بە

ئاشكرا گێڕدراوەتەوە بۆئەوەی شێوە دەکارکردنێك راستە و ئەوی تریان هەڵەیە. بۆ نموونە کتێبێکی سەرەتایی، بەڵام بەکەڵك هەیە بەناوی Common mistakes in English، ئەو کتێبە باسی هێندێك هەڵەی دووپاتکراوە دەکات کە لە نووسینی ئینگلیزیدا هەیە. لە زمانی کوردیشدا ئێمە دەبێت سنووری ئەو دوو بابەتە دەستنیشان بکەین. هێندێك جوداواز نووسین هەیە لە زمانی کوردیدا ئیجازە پێدراوە وەك ئەوەی دەتوانیت بنووسیت "کەسێکی تر" و هەروەها دەتوانیت بنووسیت "کەسێکی دیکە" و جوداوازیی لە ئەم چەشنەش زەبر لە رەوتی بە ستانداردبوونی زمان ناوەشێنێت، بەڵام بۆ نموونە کاتێك دەنووسیت راوەدەستم، ئەو شێوە نووسینە دەچێتە خانەی Common mistakes in kurdish، واتە هەڵەی باو لە زمانی کوردیدا، چونکە لە کوردیی ناوەڕاستدا رێسایەك هەیە دەڵێت (دە)ی نیشانەی رانەبردوو هێزی ئەوەی نییە کردارێك بقەڵێشێنێ و بیکات بە دوو پاژ، کەوایە بۆ گەردانکردنی چاوگی راوەستان فۆرمۆلەکە ئەمەیە:

پێشگر + دە + کردار + جێناوی لکاو

را + دە + وەست + م : رادەوەستم

ئەگەر فۆرمۆلەکە بە ئەم شێوەیەی خوارەوە دەکار بکەین:

را + وە + دە + ست + م

ئەو گرفتە ساز دەبێت کە "دە"ی نیشانەی رانەبردوو رەگی کردار، واتە "وەست"ی کردووە بە دوو پاژ و خۆی لەنێوانیاندا چەقیوە:... وە + دە + ست...

ئێمە نابێت سڵ لەوە بکەینەوە و لەسەر بنەمای باسێکی زانستیی هەڵەبوونی شێوە بەکارهێنانێکی هەڵە نیشان بدەین. هێندێك لە دۆستان بۆ بەکارهێنانی زاراوەی "دیمۆکراسیی زمانی" دەبێت نەختێك زیاتر دەست پێوە بگرن. ئەوە دۆخێکی نائاساییە تۆ لەسەر بناغەی باسێکی زانستی هەڵەبوونی شێوە بەکارهێنانێك نیشان بدەیت، بەڵام هێندێك کەس بە ئەوە تاوانبار بکەن کە سنوورەکانی دیمۆکراسیی زمانیت بەزاندووە.

هەڵبەت ئەم شێوە هەڵوێستە لە بواری زمانناسیدا، هەڵوێستێکی بێ بنەما نییە و لە سەرچاوەیەکی تایبەتەوە تێراو دەبێت. ئەو زمانناسانەی دژی دیاریکردنی راست و هەڵە لەناو بەکارهێنانە زمانییەکاندان و لایەنگری بە راست زانینی هەموو ئەو

بەکارهێنانانەن کە لەناو بەکارهێنەرانی زماندا رمێنیان هەیە لە تاقمی تەوسیف باوەڕەکانن. تەوسیف باوەڕی (descriptivism) لە زمانناسیدا لە بەرانبەر ئاراستەی تەجویز باوەڕی (prescriptivism)دا رادەوەستێت. (ئەگەر پشت بە هەنبانەبۆرینەی مامۆستا هەژار ببەستین، دەتوانین "بەرایی دان" بە هاوسەنگی تەجویز هەڵبژێرین: بەرایی "٢- ئیجازە، ڕەوا دیتن") کەوایە دەکرێت بڵێین لە زمانناسیدا لەگەڵ دوو لێڕوانین (رویکرد)ی تەوسیفکارانە و بەرایی دەرانەدا بەرەوڕووین. بە هێنانە بەرباسی ئەم جوداوازییە دەرگای باسێکی زۆر بەربڵاو و زێدە گرنگمان بۆ دەکرێتەوە.

دەمەوێت لێرەدا راستەوخۆ بچمە ناو ئەو باسانەی لەم دواییانەدا لەمەڕ زمانی ستاندارد و زمانی ڕەسمی و دۆخی زمانی کوردیی لەم بوارانەدا هاروژاون و بەشێوەیەکی تایبەتی تریش ئاوڕێك لە بۆچوونەکانی بەڕێز دکتۆر ئەمیر حەسەن پوور بدەمەوە.

-٢-

جێگای خۆیەتی لە سەرەتای ئەم بەشە لەم وتارەدا بەشێوەیەکی بێ پێچ و پەنا تێزێکی زمانی کە بڕوام پێ هەیە و بە تەمام داکۆکیی لەسەر بکەم، دەربڕم. تێزەکە بە دەربڕینێکی زۆر ساکار و ئاشکرا ئەمەیە:

لەم دواییانەدا لەناو کوردیزانان و زمانناسانی کورددا ئاراستەی تەوسیفکارانە تەواو بەسەر ئاراستەی بەرایی دەرانەدا زاڵ بووە، بەڵام بۆ بە ستانداردکردنی زمانی کوردی هیچ دەرەتانێك جگەلە گرنگیدان و سەرخستنی ئاراستەی بەرایی دەرانە لەگۆڕێدا نییە.

سەبارەت بە ئەم تێزە ئاماژەکردنێکی کورت بە دوو خاڵ بە پێویست دەزانم. خاڵی یەکەم: ئەم تێزە هەڵگری باسێکی مێژوویی و باسێکی تیۆرییە. لە ئەو جێگایەدا کە دەڵێین لەناو زمانناسانی کورددا ئاراستەی تەوسیفکارانە بەسەر ئاراستەی بەرایی دەرانەدا زاڵ بووە، باسی دۆخێکی مێژوویی دەکەین. لە ئەو جێگایەشدا کە دەڵێین بۆ بە پێوەرکردنی زمانی کوردی دەبێت ئاراستەی بەرایی دەرانە بەسەر ئاراستەی تەوسیفکارانەدا سەر بخەین، باسەکەمان لە بنەڕەتدا تیۆریکە. خاڵی دووەم: کاتێك

باسی سەرخستن و سەرەتیدان بە یەکێك لە ئاراستەکان دەکەین، مەبەستمان وەلانانی تەواوی ئاراستەکەی تر نییە. ئێمە وێڕای گرنگیدان بە ئاراستەی بەرایی دەرانە، جەخت لەسەر بەکارهێنانی ئاراستەی تەوسیفکارانەش هەڵبەت لە جێگای خۆیدا دەکەین.
کەوایە باس، باسی سەرخستنی یەکێك لە ئاراستەکانە، نەك وەلانانی ئاراستەکەی تر.
جێگای خۆیەتی هەر لە سەرەتای ئەم بەشەی باسەکەماندا تەنانەت هەنگاوێك بۆ دواوە هەڵبهێنینەوە و زیاتر لە ریشەکان و رەچەڵەکەکان بکۆڵینەوە. لە زمانناسیدا بەگشتی باسی ئەوە دەکرێت کە سەرکەوتنی روانگەی تەوسیفکارانە بەسەر روانگەی بەرایی دەرانەدا دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوە و سەقامگیربوونی بۆچوونەکانی زمانناسانەی "فێردینان دۆ سۆسۆر" و قوتابخانەی زمانناسیی پێکهاتەخواز (structuralism) کە ئەو زمانناسە دایمەزراند. پێکهاتەخوازەکان بەگشتیی شێوە لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ناوزەمانیی (diachronic) وەلا دەنێن و شێوە لێکۆڵینەوەی هاوزەمانیی (synchronic) بۆ توێژینەوە لەمەڕ بابەتە زمانییەکان هەڵدەبژێرن. دیارە دکتۆر ئەمیر باسی ئەوەی نەکردووە کە بۆچوونەکانی دەگەڕێتەوە بۆ شێوە روانینی پێکهاتەخوازانە. تەنانەت رەنگە حاشا لەم پێوەندییەش بکات و ئاگاداری ئەو شوێن وەرگرتنەش نەبێت، بەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین نموونەکانی ئەو شوێن وەرگرتنە نیشان بدەین.
دکتۆر ئەمیر لە بەندی دووەمی نامەکەی بۆ کۆنفڕانسی ئەکادیمیای کوردیی لە هەولێر دەنووسێت:
"لە راونگەی زانستی زمانەوە (زمانناسی، کۆمەڵناسیی زمان، زمانناسیی کۆمەڵایەتی) رەسمی کردنی سۆرانی بە بیانووی "پێشکەوتوو بوون" هەڵەیە"[٢].
کێشەی من لەگەڵ ئەم قسەیەی دکتۆر ئەمیر لەسەر ئەوە نییە کە پێم وایە کوردیی ناوەڕاست لە کوردیی سەروو پێپێشکەوتووترە، تەنانەت رەنگە بتوانم لەگەڵ زمانناسێك کە پێی وایە بەپێچەوانە، کوردیی سەروو لە کوردیی ناوەڕاست دەوڵەمەندتر و پێشکەوتووترە، رێك بکەوم، بەڵام رێککەوتن لەگەڵ قسەکەی دکتۆر ئەمیر دەبەسترێتەوە بە قبوولکردنی پێش گریمانەیەکی ئەو قسەیە، کە ئەو پێش گریمانەیە راستەوخۆ لە زمانناسیی پێکهاتەخوازەوە وەرگیراوە. لێمان تێك نەچێت قسەی سەرەکیی دکتۆر ئەمیر ئەوە نییە کە ناکرێت بڵێین کوردیی ناوەڕاست لە

کـوردیی سـەروو پێشـکەوتووترە (گـەرچـی ئـەو قسـەیـەش دەکـات، بـەڵام قسـە سەرەکییەکەی ئەوە نییە) بۆچوونی سەرەکیی دکتۆر ئەمیر ئەوەیـە کـە لـە روانگـەی زمانناسییەوە هەر لە بنەڕەتدا ناکرێت بڵێین زمانێك لە زمانێکی دیکە، یان زاراوەیەك لە زاراوەیەکی تر پێشکەوتووترە. کاتێـك دکتـۆر ئـەمیر هـەر لـە سـەرەتـای رسـتەی سەرەوەدا داکۆکیی لەسەر دەستەواژەی "لـە روانگـەی زانسـتی زمانـەوە..." دەکـات، مەبەستی ئەو بۆچوونەیە کـە باسـمـان کـرد. ئـەو کەسـانەی شـارەزاییان لـە مێـژووی زمانناسیدا هەیە دەزانن کە ئەم بۆچوونە باسکراوە یەکێکە لە ناسراوترین تێـزەکـانی زمانناسیی پێکهاتەخواز. بابەتی بەرباس لە زمانناسیی پێکهاتەخوازدا نیزامی زمـان واتە لانگە. نیزامی زمان، چەمکێکی مەیلەو دەرهـەسـتە، چـەمکێك نییـە مـەیلی ئەوەی هەبێت لێکۆڵینەوەی زمان بکێشێتە بوارەکانی پێوەندیی زمان لەگـەڵ زەمینـە کۆمەڵایەتی و مێژوویەکانەوە. ئەگەر شێوە لێکۆڵینـەوەی هاوزەمـانیی و سـەرەتیـی پێدانی لە روانگەی پێکهاتەخوازەکانەوە بەسەر شێوە لێکۆڵینەوەی نـاوزەمـانیی واتـە مێژوویی بهێننەوە بیر خۆتان، ئەودەم دەزانن کە مەبەستی پێکهاتەخوازان لـە نیزامـی زمان، هەموو پتانسیەل و دەرەتانە دۆزراوە یـان نـەدۆزراوەکـانی زمانێکـە. ئاشـکرایە کاتێك پتانسیەل و دەرەتـانی شـاردراوە و کەشـف نـەکراو و دەکـار نـەکراوی زمانێـك دەخەینە پاڵ پتانسیەل و دەرەتانە دیار و دۆزراوە و دەکـارکراوەکـانی زمانێـك، ئـەودەم دەرەتانی ئەم زمانە بەرباسە و هەموو زمانەکانی تریش دەگاتـە ئاسـتی دەرەتـانی بـێ کۆتایی و هەر بۆیەش زمانناسیی پێکهاتەخواز هـەمـوو زمانـەکان لـەیـەك ئاسـتدا دەبینێت و بە هیچ شێوەیەك ئیزنمان پێ نادات باسی پێشکەوتووتر بوونی زمانێك یـان زاراوەیەك لەچاو زمان یان زاراوەیەکی تر بکەین، بەڵام لێرەدا دەمەوێت داوا لە خوێنەر بکەم ساتێك بگەڕێتەوە بۆ تێگـەیشـتنی بـاو یـان عـەقڵـی سـەلیم ( common sense) و بە کەڵکوەرگرتن لە ئەو تێگەیشتنە، ئەم پرسیارە ساکارە لە خۆی بکـات کە ئایا بەڕاستی هەموو زمانەکان بە یەك رێژە پێشکەوتوون و ناکرێت بڵێین زمانێـك لـە زمـانێکی تـر پێشـکەوتووترە؟ ئایـا کـوردی یـان فارسـی هێنـدەی ئینگلیـزی پێشکەوتوون؟ ئەگەر وایە بۆچی ئێمەی کـورد -بـۆ نموونـە- تـا ئـەو رادەیـە خـەمی زمانەکەمانە و داکۆکیی لەسەر ئەوە دەکەین کە هەموو لایەکمان دەبێت مشووری بـۆ بخۆین؟ ئەگـەر بەڕاسـتی ئـەوە بـەرد بـە کابـە دادانـە بڵـێین ئینگلیـزی لـە کـوردی

پێشکەوتووترە، ئەدی بێجگە لە پاڵدانەوە و لاق ڕاکێشان و فیکەی سمێڵ هاتن و شایی لەدڵدا گەڕان بەهۆی ئەو هەموو پێشکەوتوویییەی زمانەکەمان چ ئەرکێکی ترمان بۆ دەمێنێتەوە؟

هەڵبەت زمانناسە پێکهاتەخوازەکان ڕێگای گازندە و بناشت و بەسەر ڕۆیشتن لە ڕەخنەگران دەگرن و دەڵێن ئێمە باسی لانگ واتە نیزامی زمان دەکەین. لە ئاستی نیزامی زمانیشدا، هەموو زمانەکان خاوەنی دەرەتانی بێ کۆتایین و ئەگەر زەمینە و هەلکەوتی مێژوویی و کۆمەڵایەتیش نەیهێشتووە لە زمانێکدا ئەو دەرەتانانە چاک هەڵبهێنجێنرێن، ئەوە هەر لە سەرەتاوە ڕوونمانکردەوە کە ئێمە کارمان بە هەلکەوت و زەمینەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی زمانەکان نییە و ئەو جۆرە سەرنج و تێڕوانینانە، لەژێر ناوی لێکۆڵینەوەی ناوزەمانیی، لە پارادایمی زمانناسانەی خۆمان شاربەدەر دەکەین و لای لێ ناکەینەوە.

بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو زمان، یان زاراوەی لایەنی بەرانبەری دکتۆر ئەمیر - واتە لایەنی لایەنگری تاك ستانداردبوونی زمانی کوردی -باسی لێدەکات، زمان یان زاراوەیەکە کە بە زەمینەیەکی تایبەتی کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە گرێدراوە. ناکرێت وەڵامی بۆچوونێك کە زمان بە دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بزۆز و بزۆك و بگۆڕ دەبینێت، بە بۆچوونێك بدرێتەوە کە زمان بە نیزامێکی دەرهەست و سەروو مێژوویی دەبینێت. ئەمە وەك ئەوە وایە من باسی تایبەتمەندییەکی ئاسن بکەم و کەسێکی تریش بەرپەرچی ئەو قسەیەم بداتەوە و بڵێت، نەخێر زیو ئەو تایبەتمەندییەی نییە کە تۆ باسی دەکەیت.

ڕەنگە دکتۆر ئەمیر نموونەی ئەوتۆ لە نووسراوەکانی تازە و پێشووتری خۆی بهێنێتەوە کە تێیاندا ڕوانگەیەکی مێژوویی لەمەڕ زمانەوە ڕەچاو کراون. ئەوە ڕاستە و ئێمەش لەم نووسراوەیەدا هێندێك لەئەو نموونانە دەهێنینەوە. مەسەلە ئەوەیە لەناو بۆچوونەکانی دکتۆر ئەمیردا بەبێ ئەوەی بۆ خۆی هەستی پێ بکات، ڕەگەزی دژبەیەك و ناتەبا بەدی دەکرێن. ڕەنگە دکتۆر ئەمیر یا هەر زمانناسێکی تر ئەو ڕەخنەیەی نەیێتەوە سەر کە لە هێندێك شوێندا بۆچوونی پێکهاتەخوازانە لەناو نووسینەکانیدا بەدی دەکرێت. دەکرێت ڕەخنە لەم بارەیەدا بگیرێ کە دوو ڕەگەزی فیکریی دژبەیەك، وەکو یەك لەناو بۆچوونەکانی نووسەرێکدا ئامادە بن.

حەز دەکەم بۆ زیاتر روونبوونەوەی باسەکەمان نموونەیەکی تر لە نووسراوەیەکی تری دکتۆر ئەمیر بهێنمەوە. سەردێڕی ئەو نووسراوە بەرباسە فەرهەنگی زارەکیی لە خولی تێکنۆلۆژی زمان-دایە کە وەکو پێشەکی بۆ "فەرهەنگی زارەکیی موکریان"ی بەڕێز سەلاح پایانیانی نووسراوە. نووسەر لەم پێشەکییەدا بەرپەرچی تیۆرییەك دەداتەوە بەناوی تیۆریی دابڕانی گەورە. بەگوێرەی ئەم تیۆرییە لەئەو کاتەوە مرۆڤ نووسینی داهێنا، دابڕانێکی زۆر گەورە لە ژیان و شارستانییەتیدا پێکهات. دکتۆر ئەمیر پێی وایە ئەگەر ئەو تیۆرییە بسەلمێنین، دەبێت ئەوەش بسەلمێنین کە "زمانی نووسراو بەرزە و زمانی زارەکی نزمە. زمانی نووسراو بەهێزە، زمانی زارەکی لاوازە. زمانی نووسراو راستە، زمانی زارەکی چەوتە. زمانی نووسراو پێشکەوتووە، زمانی زارەکی دواکەوتووە. زمانی نووسراو دەوڵەمەندە، زمانی زارەکی هەژارە"[٣].

بۆچوونی دکتۆر ئەمیر لێرەدا زۆر هاوشێوەی بۆچوونی ئەوە لەمەڕ بەرەسمیکردنی یەکێك لە شێوەزارە کوردییەکان. نووسەر لە بەشی یەکەمی وتاری "شۆڤینیسمی سۆرانی و ئەفسانەکانی"دا دەنووسێت:

شۆڤینیسمی سۆرانیی- لەهجە کوردییەکان هەڵدەسەنگێنێت، نرخیان بۆ دادەنێت، پلەبەندییان دەکات و نەزمێکی بەرزی و نزمێتی (هیرارشی)یان پێ ساز دەکات و وای دادەنێت کە ئەو پلەبەندییە، سروشتی و پێویست و نەگۆڕە و دەبێت بپارێزرێت... دەڵێن بەرزەنشینی سۆرانی لەبەر ئەوەیە کە لە لەهجەکانی دی باشتر، پێشکەوتووتر، دەوڵەمەندتر، رەسەنتر و رێکوپێکترە[٤].

دەبینین لێرەشدا نووسەر هەبوونی هەرچەشنە زنجیرە پلەیەك (هیرارشی) لە جێگە و پێگەی زمان و زاراوەکاندا بە توندی رەت دەکاتەوە و بڕوا هەبوون بە پەرەگرتوویی زیاتری زاراوەیەك رێك بە مانای بڕوا هەبوون بە نزمی و دواکەوتوویی زاراوەکەی تر دادەنێت. وەك ئەوەی ئەگەر هاتییە سەر ئەو بڕوایەی زاراوەیەك بە هەر هۆیەك پەرەگرتووتر لە زاراوەکەی ترە، هیچ عیلاجت بۆ نامێنێت جگەلە ئەوەی بێیە سەر ئەو قەناعەتە کە زاراوەکەی تر زاراوەی خەڵکانێکی یەکجار دواکەوتوو و بێبەری لە فەرهەنگە.

بەڵام دکتۆر ئەمیر خۆی چ ئاگادار بێ و چ ئاگادار نەبێت، چ ددانی پێدا بهێنێت و چ ددانی پێدا نەهێنێت، سەرچاوەی ئەو بۆچوونەی لەگەڵ دانانی هەرچەشنە زنجیرە

پلەیەك لەناو زمـان و زاراوەکـانـدا دژایـەتی دەکـات، دەگـەڕێتـەوە بـۆ زمـانناسـیی پێکهاتەخواز. بە شیاوی دەزانم لێرەدا باسی هێندێك خاڵی پێویست بکەم.

یەکەم: بە بڕوای من دکتۆر ئەمیر دوو باس و گوتەزای جوداوازی تێکـەڵ کـردووە و نەیتوانیوە لە یەکیان هەڵاوێرێ. ئەم دوو باسە لـە ئـەم دوو رسـتـەیەی خـوارەوەدا چـڕ دەبنەوە.

ئەلف: ئەو زنجیرە پلەیە بە هێندێك هۆی مێژوویی و سیاسی و کۆمەڵایەتی لـەنـاو زمان و زاراوەکاندا هەیە و هێندێك لـە زمـان و زاراوەکـان دەرفـەتێکی زیاتریـان بـۆ پێشکەوتن بۆ رەخسـاوە. ئەگـەر هـەلـومەرجەکـە پێچـەوانە بکرێتـەوە، دۆخەکـەش دەگۆڕدرێت.

ب: ئەگەر بڕوامان وەها بێت لەناو زمان و زاراوەکاندا پلەبەندییەك هەیـە، دەبێـت بڕوا بە ئەوەش بهێنین کە ئەو پلەبەندییە سروشتی و پێویست و نەگۆڕە.

لە حاڵێکدا دەکرێت بڕوامان بە "ئەلف" هەبێت، بەڵام بڕوامان بـە "ب" نـەبێت. دکتۆر ئەمیر بەئاگایانە یان نائاگایانە، کەم و زۆر بە لای ئەو ئیمکانەدا نەڕۆیشتووە و وەهای نواندووە ئەوەی بڕوای بە "ئەلف" هەیە ناچارەکیی بڕوای بە "ب"ش هەیە.

دووەم: دکتۆر ئەمیر شایەدی بۆ ئەوە نەهێناوەتەوە کە لایەنی بەرانبەری زاراوەکـانی تریان بە دواکەوتوو دانابێت، بەڵکو شایەدی بۆ ئەوە هێناوەتەوە کە لایەنە خەنیمەکەی زاراوەی خۆیان بە پێشکەوتووتر داناوە. لە ئەوەشەوە بۆخۆی ئەو مەبەستەی هەڵهێنجاوە کە مادام فلانە زاراوەمان پێ پێشکەوتوو بێت، ناچارەکیی دەبێـت ئـەوەی ترمـان پـێ دواکەوتوو بێت، کەچی دەکرێت جوداوازییەکە نەك لەنێوان پێشکەوتوو و دواکەوتوودا بێت، بەڵکو لەنێوان زیاتر پێشکەوتوو و کەمتر پێشکەوتوو، یان لەنێوان پێشـکەوتوو و پێشکەوتووتردا بێت. ئەو قسەیە نە موجامەلەیە و نە زێدەڕۆیی. ئەگەرچی ناکرێـت زاراوەکانی کوردیی سەروو و کوردیی ناوەڕاست لە بارودۆخی ئێسـتادا لـەگـەڵ زمانـە بەهێز و بەدەسەڵاتەکانی جیهاندا هەڵبسەنگێنرێن، بەڵام ئەمانە چیدی زاراوەگەلی بێ دەسەڵات و گردەنشین نین و ئێستا دوای نزیك بە سەدەیەك پێ نووسران لە چاپەمەنی و میـدیا نوێیـاوەکانـدا، پشـوویەکیان هـاتووەتـە بـەر خۆیـان و قەڵافـەتیان ئەوەنـدە بەرزبووەتەوە کە سووك و سانا ساتمە نەبەن و سەرەنگرێ نەبن. کەوایە ئەگەرچی رەنگە مەودایەکیان لەنێواندا هەبێت و یەکێکیان لە ئەویتر چەند شەقاوێك لەپێشـتر بێـت،

بەڵام بەڕاستی هیچیان لەو دۆخەدا نین کە ڕەوا بێ وەسفی دواکەوتوو و بەدووی و سەرەتاییان پێوە بنووسێنین. ئەوەش کە دەڵێم ڕەنگە یەکێکیان لە ئەوەیتر لەپێشتر بێت، مەبەستم لەپێشتربوونی کوردیی ناوەڕاست نییە. ئەوەی من پێداگریی لەسەر دەکەم سەردەستکردنی کوردیی ناوەڕاست نییە. دواتر باسی ئەوە دەکەم کە من لایەنگری دانانی زاراوەی هاوبەشم بۆ کوردان، ئینجا ئەو زاراوە هاوبەشە چ کوردیی سەروو بێت، چ کوردیی ناوەڕاست، یان هەر زاراوەیەکی تری کوردی.

بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە دکتۆر ئەمیر، وا دە بەردەنگەکەی دەگەیەنێت کە ئەگەر بڕوامان بە پەرەگرتووتربوونی زاراوەیەك هەبێت ناچارەکی دەبێت، زاراوەکانی ترمان پێ نەقوستان و ئیفلیج بێت. ئەو بۆچوونەی بەڕێزیان، لە دانانی هاوسەنگی کوردی بۆ وشەی هیرارشی (hierarchy) زۆر جوان بەدیار دەکەوێت. هاوسەنگی پێشنیارکراوی دکتۆر ئەمیر بۆ ئەم وشەیە "بەرزی و نزمیتی"یە. وەك ئەوەی هەرچی لە لووتکەی بەرزییدا نەبێ ئەوە لە بنەبانی نزمیدایە، بەڵام ئێمە بۆ ئەم وشەیە "زنجیرەپلە"مان داناوە و پێمان وایە ئەم هاوتایە پلەکانی فرەچەشن و فراوان، بەڵام لەیەك نزیکی نیزامێکی هیرارشی ئاسامان باشتر پێشان دەدات.

ئەو هەڵوێستگرتنە بەرانبەر بە ئەو بۆچوونەی کە گوایە هێندێك لایەن بە سەرەتایی و ناشارستانی دادەنێت، جارێکی دیکە گەڕانەوەی بە ئاگایانە یان نابەئاگایانەی دکتۆر ئەمیر بۆ نەریتی پێکهاتەخوازمان پێشان دەدات. ئەو کەسانەی ئاگاداری مێژووی پێکهاتەخوازین، دەزانن دوای سۆسۆر یەکێك لە گەورەترین بیرداڕێژانی پێکهاتەخوازی کە ئەو قوتابخانەیەی بۆ پانتایی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ-ناسانە "ڕاگواست کلۆد لیڤی ستڕۆس" بوو. یەکێك لە بەناوبانگترین تێزەکانی ئەو مرۆڤناسە پێکهاتەخوازە ئەوەیە کە فەرهەنگی دواکەوتووترین هۆزەکان (دواکەوتوو لە ڕوانگەی ڕۆژئاواییەکانەوە) لەگەڵ فەرهەنگی مۆدێرنترین خەڵکی ڕۆژئاوایی لە ڕووی پێکهاتە و نیزامەوە و بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی پێکهاتەخوازانە لە یەك ئاستدان و ناکرێت بڵێین فەرهەنگە مۆدێرنەکە پێشکەوتووە و فەرهەنگە نەریتییەکە دواکەوتووە، چونکە داڕشتی فەرهەنگە نەریتییەکەش هێندەی داڕشتی فەرهەنگە مۆدێرنەکە تێکچندراو و خاوەنی هاوپێوەندیی بەناویەکداچوو و بەربڵاوە. دیارە ئەم تێزە، وەختی خۆی بۆ خاوکردنەوەی فڕی سواری ئەورووپاییە خۆبەزلزانەکان دەورێکی خراپی نەبوو،

بەلآم نابێت دوو خاڵمان لەو بارەیەوە لەبیر بچێت، یەکەم خاڵ ئەمەیە کە ئەو تێزە لە کەش و هەوای ئیستعماریی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دەربڕدراوە کە خۆبەزلزانیی ئەورووپاییەکان، تەنانەت هەتا رادەی بەرهەمهێنانی ئایدیۆلۆژیی نازیسمیش تووشی ئاوسانی شێرپەنجەیی بووبوو، بەلآم ئەوەی کوردی هەژار ئەوڕۆ دەستی داوەتێ تا دوای چەند سەدە وەدواکەوتن جێبەجێی بکات، نە ئیستعماری جەماعەتێکی دیکەیە و نە برەوپێدانی فاشیزمە و نە بەرزکردنەوەی ئالآی شۆڤینیزمە، وەك دکتۆر ئەمیر بەداخەوە بە هەڵە بۆی چووە، بەڵکو کوردیش دەخوازێ وەکو هەموو میللەتانی گەورە و چکۆڵەی سەر گۆی زەوی زاراوەیەکی رەسمیی، یان هاوبەش بۆ خۆی هەڵبژێرێت. خاڵی دووەم ئەمەیە کە ئەو تێزەی ستڕۆس، بۆی هەیە شوێنی خراپ و تێکدەریش لەسەر فەرهەنگە نەریتییەکان دابنێت. داخوا ئەو تیۆرییەی ستڕۆس باوی هەنگاوی هێندێك چالاکی چاکخواز کە دەیانەوێت هێندێك رەگەزی وەدواکەوتوو و کاتبەسەرچوو و نائینسانی لەناو فەرهەنگە نەریتییەکاندا وەلابنێن، شل ناکاتەوە؟ ئایا ئەو تێزە ناتوانێت ببێتە داردەستێك دە دەستی بناژۆ توندڕەوەکاندا هەتا بڵێن فلآنە فەرهەنگە کۆنە، هەر بەو شێوەیەش بەرانبەریی دەکات لەگەڵ گشت کولتوورە مۆدێرنەکان؟

بەداخەوە ئەو تێزە چاوپۆشیی لە زەمینەیەکی لەباری مێژوویی و سیاسی و کۆمەلآیەتی بۆ فەرهەنگە مۆدێرنەکان و زەمینەیەکی نالەبار بۆ فەرهەنگە داخراوترەکان دەکات و بەگشتی دیاردەکان بەشێوەیەکی راوەستاو و داوەستاو و پەنگخواردوو و قەتیسماو دەبینێت، نەك بەشێوەیەکی بگۆڕ و بزۆز و بزۆك و لە گەشە و نەشە. کورتەی باسەکە و پێوەندیی ئەم باسە لەگەڵ کێشەی ئێمە ئەوەیە، کە ستڕۆس چونکە دۆخێکی دوو جەمسەریی، مۆدێرن - نەریتی، پێشکەوتوو - وەدواکەوتوو، خاوەن ئاوەز - بێ ئاوەزی دیت، وەکو هەڵوێستێك لە بەرانبەر ئەو دۆخەدا هەر لە بنەڕەتەوە حاشای لە هەموو جوداوازییەکان کرد و وێرغەی ئەسپ و غارپێدانی لەگەڵ وە کەشکەلآن خستنی مانگیلە دەستکردەکان بە دوو بەرهەمی هاوئاست لە دوو فەرهەنگی هاوشاندا زانی، کەچی ئەگەر لەجیاتی ئەو روانینە دوو جەمسەرییە، کۆمەڵەی فەرهەنگەکانی مرۆڤی لەناو شەبەنگی زنجیرەپلەیەکدا بدیتبایە کە زەمینە و هەلکەوتی مێژوویی و کۆمەلآیەتی هەلی پێشکەوتنی هێندێك زیاتر بۆ هێندێکیان

و برێك كەمتر بۆ برێكی تریانی ڕەخساندووە، ڕەنگ بوو گرد و شیوەڵەی بە هاوئاست دانەنابایە و دوند و تیرەشانی بە هاوشان نەدیتبایە. دکتۆر ئەمیریش هەر بەم شێوەیە کەش و هەواکەی ئاوا دوو جەمسەر دیوە و پێی وایە ئەو کەسەی بە هەر دەلیلێك زاراوەیەکی کوردی بە پێشکەوتووتر زانیوە، ناچارەکی زاراوەکەی تری بە ئەیاغ و بنژیل زانیوە و بە قوڕیدا بردووەتە خوار. من شاهیدیی ئەوە دەدەم - و دڵنیام لەناو خوێنەرانیشدا کەسانێك هەن کە وەباڵ بۆ ئەو شاهیدییە بکێشن- کە زۆر کەس هەیە بۆچوونی وایە، چاك ئەوەیە فلاّنە زاراوەی کوردی ببێتە زاراوەیەکی هاوبەش بۆ هەموو کوردان، بەلاّم هەر لەو کاتەشدا زۆر بە تامەزرۆییەوە خەریکی خوێندنەوە و کارکردن لەسەر زاراوەکانی تری زمانی کوردییە. ئەوەی کە ئێمەش وەکو گەلانی تر زاراوەیەکی هاوبەشمان هەبێت کە ببێتە زامنی یەکگرتوویی نەتەوەییمان، شۆڤینیزم نییە، بەڵکو ئارەزوویەکی ڕەوا و ئینسانییە و ئەو هەموو شانتاژ و دژوەستان و بەرانبەرکێیەی لە بەرانبەردا پێویست نییە. دژوازیی و ناتەبایی ناوەکیی بۆچوونەکانی دکتۆر ئەمیر ئەو کاتە خۆیان دەنوێنن کە ئەو داگەڕانە پەنامەکییانە بۆ ئاراستەی پێکهاتەخوازانە لەگەڵ هێندێك بۆچوونی مێژوو باوەڕانە و دژە پێکهاتەخوازانە کۆ دەبنەوە. دکتۆر ئەمیر بەڵگەی بۆ بەرپەرچدانەوەی تێزی دابڕانی گەورە بەم شێوەیە دەردەبڕێت:

"تیۆریی دابڕانی گەورە پێوەندی و دیالێکتیکی نێوان عیللەت و مەعلوول (هۆ و بەرهۆ) دەکاتە پێوەندییەکی یەك لایەنە: نووسین دەبێتە عیللەتی گشت گۆڕانێك، بەلاّم خۆی بەرهەمی هیچ عیللەتێك نییە"[٥].

شێوە ڕوانینی دیالێکتیکی، ڕوانینێکی مێژووییە و لەگەڵ ڕوانینی دژە مێژوویی پێکهاتەخوازانە ناتەبایە.

ڕوانگەی تەوسیفکارانە و دژی بەرایی دەرانەی دکتۆر ئەمیر لەو جێگایەدا بە ئاشکراترین شێوە خۆی دەنوێنێت، کە هەڵدەکوتێتە سەر ئەو تێزەی دەڵێت: زمانی نووسراو بەهێزە، زمانی زارەکیی لاوازە، زمانی نووسراو ڕاستە و زمانی زارەکیی چەوتە. دیارە لە ڕوانگەی بەراییدەرانەوە زمانی نووسراو لە زمانی زارەکیی بە بەهێزتر دەژمێردرێت، لەبارەی ڕاستی و چەوتیشەوە وا نییە ڕوانگەی تەجویزباوەڕانە پێی وابێت زمانی نووسراو هەمیشە ڕاستە و زمانی زارەکیش هەموو کات چەوتە، بەلاّم پێی وایە زمانی زارەکیی لەبەرئەوەی بۆ ڕەچاوکردنی ڕێساکان هێندەی زمانی نووسین پێداگر

نییه و زۆرجار لەم بارەیەدا خەمسارده، هەر بۆیە زۆر جار چەوتییەکانی زمانی زارەکیی بە گەڕانەوە بۆ سەر نۆرمەکانی زمانی ستانداردی نووسین چارەسەر دەکرێن. ئەم پێودانەش بە دوو مەرج روو دەدات، یەکەم: نۆرم و رێساکانی زمان کۆکرابنەوە و نووسرابنەوە. دووەم: بەکارهێنەرانی زمان خۆیان پێمل بەم گەڕانەوەیە بزانن. کەوایە زمانی ستاندارد رێك کاتێك زەمینەی بۆ خۆش دەبێت کە خۆمان لە روانینی بەراییدەرانە نەبان نەکەین. هەر لە بنەڕەتدا باسی ستانداردبوون و ستانداردکردن لە هەناوی خۆیدا هەڵگری روانینی نۆرماتیڤە. بەبێ هەبوونی روانینی نۆرماتیڤ باسی ستانداردبوون و ستانداردکردنیش دەبێتە پرسێکی هەڵپەسێردراو. دکتۆر ئەمیر لە حاڵێکدا باسی زمانی ستاندارد دەکات کە روانگەی نۆرماتیڤیش رەت دەکاتەوە. رمێنی ئەم روانینە دژە بەراییدەرانەیە هەر وەکو پێشتر ئاماژەم پێکرد، کەش و هەوای نووسینی ئێمەی تا رادەیەکی زۆر تەنیوەتەوە. بێجگەلە دکتۆر ئەمیر، نووسەر و زماننناسی دیکەش هەن کە هەر بەم شێوەیە لە روانینی بەراییدەرانە دڕدۆنگ و بێزارن. نووسەرێك دەڵێت:

"زمانی ستاندارد، یان زمانی رەسمیی، ناکرێت بە موهەندیسی ساز بکرێت، زمانی ئینگلیزی یەك لە هەرە زمانە ستانداردکراوەکان، هەتا ئێستاش هیچ جۆرە ئەکادیمیایەکی زمانی نییە"[٦].

لەمەڕ بۆچوونی ئەم نووسەرە بەڕێزە دەتوانین ئاماژە بە ئەم تێبینییانەی خوارەوە بکەین.

یەکەم: نووسەر دەڵێت، زمانی ئینگلیزی هیچ جۆرە ئەکادیمیایەکی زمانی نییە. من عەرزی دەکەم بە دەیان ئەکادیمیای زمانی هەیە. پێویست نییە دامەزراوەکان حەتمەن نێویان ئەکادیمی زمان بێت تا ئێمە پێمان ئەکادیمی زمان بن. ئێوە بزانن کارکردی ئەکادیمیای زمان چییە، ئینجا بزانن سازی و دامەزراوەی بەئەم کارکردە لە وڵاتانی ئینگلیزی زمان و تەنانەت لە دەرەوەی وڵاتانی ئینگلیزی زمانیش هەیە، یان نییە.

دووەم: نووسەر بەشێوەیەکی تەمومژاویی وشەی موهەندیسی بەکار دەهێنێت و بە ناپێویستی دادەنێت. مەبەست لە موهەندیسیکردن چییە؟ ئەگەر مەبەست سازکردنی زمانێکە لە بناغەوە، وەك زمانی سپرانتۆ، منیش لەگەڵیدا تەبام، بەڵام ئەگەر

مەبەستی هەرچەشنە بەرنامە بۆ داڕشتنێکی زمانی و سیاسییە، ئەوە دەمەوێت دڵنیای بکەمەوە پڕۆژەی زمانی ستاندارد بەبێ موهەندیسیکردن سەر ناگرێت. لانیکەمی جێبەجێبوونی ئەم پڕۆژەیە ئەوەیە کە زمانناسەکان هەر نەبێت ڕێساکانی ڕێزمان کۆ بکەنەوە و بینووسنەوە و بەکارهێنەرانی زمانیش ڕێککەوتنێکیان بۆ بەکارهێنانی ئەو ڕێسا کۆکراوانە (چ بەشێوەی کۆدەنگییەکی ڕێژەیی و نافەرمیی نێوان خۆیان و چ بەشێوەی بڕیارێکی ڕەسمیی حکومەت) لە نێواندا هەبێت.

سێیەم: نووسەر خۆی دەڵێت "ستانداردکردن"، ستانداردکردن کردارێکی تێپەڕە (متعدی)، واتە کەسانێك کۆببنەوە و بەگوێرەی هێندێك تیۆری و بەرنامە زمانەکە ستاندارد بکەن. زمان بە پشتبەستن بە گەشەی ڕەمەکی ستاندارد نابێت. هەروەك گوتمان زمانی زارەکیی بۆ بژارکردنی هەڵە و پەڵەکان خەمساردە. ئینجا دژایەتیکردن لەگەڵ ڕوانینی بەراییدەرانە بە ناوی وەلانانی هەرچەشنە موهەندیسییەك بگاتە هەر ئەنجامێك، ناگاتە ئەنجامی خۆگرتنی زمانی ستاندارد. هەر لەجێدا ڕستەیەکی ناو خودی ئەو قسانەی نووسەری گۆڕین، هەڵەیەکی تێدایە کە نووسەر لە زمانی زارەکی قۆستوویەتییەوە. نووسەر دەڵێت: "ئینگلیزی یەك لە هەرە زمانە ستانداردکراوەکان"ە.

بەگوێرەی ڕێزمانی کوردی "هەرە" بەر لە ئاوەڵناو دێت و ئاوەڵناوی بەرز (صفت عالی) ساز دەکات. زۆرجار بە هەڵە "هەرە" لەجیاتی ئەوەی بکەوێتە پێش ئاوەڵناو، دەکەوێتە پێش ناو و ئاوەڵناو و دوای ناو دێت. ئەم چەشنە بەکارهێنانە لە زمانی قسەکردنی ڕۆژانەدا ڕەنگە بە هەڵە نەژمێردرێت، بەڵام لە نووسیندا هەڵەیە. زمانێك کە بە خەمساردی باوەش بۆ ئەو چەشنە هەڵانە بکاتەوە ستاندارد نییە. بژارکردنی ئەو هەڵانە و ساغکردنەوەی ڕێساکانی زمانیش بەهۆی ڕوانینێکی بەراییدەرانە، یان بڵێین بەهۆی چەشنێك موهەندیسییەوە دەکرێت. جگەلە ئەو نووسەرە کە کورتەیەك لە بۆچوونەکانیمان بە نموونە هێناوە، نووسەری کوردی تریش هەبوون کە هەرچەشنە پلاندانانێکیان لە بواری زماندا بە کردەوەیەکی تێکدەر و ناپێویست زانیوە. ئەو بۆچوونەی کە ئێمە لە ئەم وتارەدا داکۆکیی لەسەر دەکەین، ئەوەیە کە ئەگەر ڕوانگەی بەراییدەرانە بۆ زمانەکانی تر ڕەوا بێت، بۆ زمانی کوردی بەشێوەیەکی دووقات ڕەوا و پێویستە. با بزانین بۆ؟

زمانی کوردی هەتا ئەم یەك دوو سەدەیەی دوایی پێی نەنووسراوە، یان ئەگەر لە سەردەمی زۆر کۆن پێی نووسراوە، ئەو شوێنەوارە نووسراوانە هەر لەوێ سەردەمی کەونارادا، یان نەختێك دواتر فەوتاون و تێداچوون. نووسین چ لە سەردەمی کۆندا و چ لە چاخی مۆدێرندا وەهای لە زمان کردووە کۆنسێرڤاتیڤ و خۆپارێز بێت، بەڵام کاتێك نووسین لە گۆڕێدا نەبوو زمان پێشی ئاوەڵا دەبێت و زمانی بەرهەڵدا لە کۆت و بەندی زێرەڤانیی بەردەوامی نووسین، لە پێودانی بەرهەڵدراوییدا لەوانەیە بەشە خێریشی پێ بڕێت، بەڵام جاری وا هەیە قاچ و قولیشی تێك بشالێت و هەڵدێرێت و لینگ و لەتەریشی بریندار و تەنانەت جاری وایە نەقوستان بێت. شارەزایانی بواری زمانناسی پێیان وایە زمانی ئازاد لە چاوەدێریی نووسین بۆ تووش بوون بە سێ تایبەتمەندی، زۆر بەیدەست و خۆبەدەستەوەدەرە. ئەو تایبەتمەندییانە بریتین لە: ١- گۆڕان. ٢- جۆراوجۆری. ٣- لادان لە نۆرمەکان. لەبیرمان نەچێت گۆڕان و جۆراوجۆری لە زاتی خۆیاندا بۆ زمان پەتا و نەخۆشی نین، بەڵام ئەگەر خێراییەکەیان لە رادەیەکی ماقووڵ لای دا، ئەوە زمان تووشی کەلابوون بووە و ئاهۆیەکی پیسی گرتووە. لادان لە نۆرمەکانیش بێگومان سەرلێشێواویی ساز دەکا و جێگای تەکووزیی و کۆدەنگیی بە پاشاگەردانی و پێکهەڵپڕژان دەگۆڕێتەوە، ئینجا چونکە نووسینی کوردی بۆ چەندین سەدە تووشی راوەستان بوو، بەرەبەرە زۆریەك لە نۆرمەکانی لە زمانی زارەکیدا تێکدران. ئێستا کە رەوتی نووسین بە کوردی دەستی پێکراوەتەوە، ئەوەندەی پێویستە مشووری قۆستنەوەی دەوڵەمەندییەکانی زمانی زارەکیی بخۆین، ئەوەندەش پێویستە تا ئەو جێگایەی دەکرێت و زمان ناشێوێت، زمانەکەمان ساغ بکەینەوە و لەپاڵ وێنەی رەوتێکی بەراییدەرانەوە تێی بپەڕێنین. بەرلەوەی میکانیزمی تێپەڕاندنی زمانی زارەکیی لەپاڵ وێنەی باسکراو بهێنینە گۆڕێ و تاوتوێی بکەین، با لەم بارەیەوە باسی نموونەیەکی مێژوویی بکەین. مامۆستا قزڵجی لە وتارێکدا باسی رێساکانی گۆڕانی دەنگەکانی لە زمانی کوردیدا کردووە. لەناو ئەو نموونانەی مامۆستا قزڵجی هێناونی نموونەی ئەوتۆ هەن کە نیشاندەدەن هێندێك وشە لەبەرئەوەی نەنووسراونەتەوە و شکڵی وشە بەشێوەی نووسراو نەپارێزراوە، تەواو سەراوبن کراون و ئێستا لە زاراوە جۆراوجۆرەکاندا، هەردووك شێوە- هەم شێوە سەرەکییەکە و هەم شێوە سەراوبنکراوەکە

دەکار دەکرێن. یەکێک لەم نموونانە وشەی "خەڵووز"ە. قزڵجی دەڵێت "خەڵووز" گۆڕدراوی وشەی "زووخاڵ"ە[٧].

ئەوە نموونەیەکی زۆر چکۆلە لە تەئسیرەکانی غیابی زمانی نووسین و بێ داشدار، مانەوەی زمانی زارەکییە. ئێوە خۆتان دەتوانن مەزەندەی ئەوە بکەن کاتێک نموونەی ئەوتۆ لە ئاستی ناوەوە گەیشتووە بە ئاستی کردار و لەوێشدا نەوەستاوە و تەشەنەی کردووە بۆ ئاستی رێساکان و شێوەی دەربڕینەکانی لە گرێژەنە بردووە، چ سەرلێشێواوییەك ساز بووە. بۆیە گوتمان ئەگەر روانگەی بەرایی- دەرانە بۆ زمانەکانی تر رەوا بێت، ئەم ئاراستەیە بۆ زمانی کوردی بەشێوەیەکی دووقات رەوا و پێویستە.

با بێینەوە سەر باسی میکانیزمی ساغکردنەوەی زمانی نووسین. ئێستاکە چیتر پێودانی غیابی نووسین نەماوە و کوردی بۆ نووسین کەڵکی لێ وەردەگیرێت، بۆچی کێشە و گرفتی لەو چەشنە هێشتا بەربینگمان پێدەگرن و هێندێك جار ناهێڵن زمانی نووسینمان پاکژ و پاڵاوتە بێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە روانگەی منەوە روونە: چونکە روانگەی تەوسیفکارانە لەناو کوردیزانان و زمانناسانی کورددا برەوی هەیە و کەللایە، بەڵام روانینی بەراییدەرانە گردەنشین و کەلەلایە.

یەکەمین هەنگاو بۆ ساغکردنەوەی زمانی نووسین و بە دەربڕینێکی تر یەکەمین هەنگاو بۆ بە پێوەرکردنی زیاتری زمانی نووسینمان، سڵ نەکردنەوە و قوشقی نەبوون لە بەرانبەر رەچاوکردنی روانگەیەکی بەراییدەرانەیە. ئەو قسەیەش بە مانای لابردنی روانگەی تەوسیفکارانە و دژایەتیکردن لەگەڵی نییە. هەر لەجێدا، چونکە کوردی بۆ ماوەی چەندین سەدە پێی نەنووسراوە بۆ راگواستنی سامان و میراتی بەربڵاوی زمانیمان روانگەی تەوسیفکارانە چەندی بڵێی دەستی دەڕوا و بەکار و هەڵسوورە، بەڵام دوای کۆکردنەوەی ئەو سامان و کەلەپوورە بە پێزو رەسەنە، بۆ راستەوپاستە کردنی زمانی نووسین، سووکە شەنوکەوکردنێکی زمان و بەکارهێنانە زمانییەکان پێویستە. کەوایە لە هەنگاوی دووەمدا رەچاوکردنی روانگەیەکی بەراییدەرانەش دەستمان دەگرێت و بۆ تۆکمەترکردنی زمانی نووسین یاریدەمان دەدات. هەر درێژەی مەنتیقی ئەم روانگەیەیە کە دەگا بە قۆناغی پلانداڕشتن و موهەندیسیکردن. موهەندیسیکردن ئەگەر بەڕاستی موهەندیسیکردن بێت، نابێت لێی بترسێین. بە پێچەوانە، ئەوەی دەبێت لێی بترسێین کاری بێ بەرنامە و رەمەکییە.

با هێندێك نموونه لــه ئــەو هەڵانــەی لــه نووســینی کوردیــدا رمێنیــان هــەیــه و راستکردنەوەیان پێویستی بە رەچاوکردنی روانگەیەکی بەراییدەرانە هەیە، بهێنینــەوە. (ئەو نموونانە لە زاراوەی کوردیی ناوەڕاست هەڵبژێردراون. دەکرێت نموونەی ئاوەهــا لــه زاراوەکانی تری زمانی کوردیش دەستنیشان بکەین).

لەناو ئەو نموونانەی لە سەرەتای ئەم وتارەدا باسمان کردن، با ســووکە لــەنگــەرێــك لەسەر نموونەی جێگۆڕکێی بزوێنی "-ە" لــە گــەڵ بــزوێنی "ێ" بگــرین. گوتبوومــان زۆرجار ئەو جێگۆڕکێیە بە هەڵە روو دەدا و بۆ نموونــه "نایــێ (نایێــت) " دەبــێ بــه "نایە (نایەت)". بەڕاستی بەڵگەمان چییە بۆ ئەوەی بڵێین "نــایێ" راســتە و"نایــە" هەڵەیە؟ لەگەڵمدابن با لە نووکەوە لە گرفتەکە بکۆڵینەوە. با لەو رســتانەی خــوارەوە ورد بینەوە:

- لە هەولێرێ بووم دەچمە کۆیە.

- لە شنۆیە بووم دەچمە مەهابادێ.

قەت بیرتان لەوە کردووەتەوە لەو رســتانەی ســەرەوە بۆچــی بــزوێنی (ێ) بــە نــاوی هەولێر و مەهابادەوە زیادکراوە، بەڵام دواتر لەجیاتی ئەوەی هەمــان ئــەو رێســایە بــۆ ناوی وەك شنۆش دەکار بکەین و بۆ نموونە بنووسین شنۆیێ دەنووسین شنۆیە؟

هیچ گومان لەوەدا نییە هۆی ئــەم شــێوە نووســینە ئەوەیــە کاتێــك ئێمــه زمــانی زارەکیمان بەشێوەی نووسراو دەکار کردووە، لەوە ورد نەبووینەتــەوە ئــەو بزوێنــەی لــەو شێوە دەربڕینانەدا بەدوای وشەی وەك شنۆ زیاد دەکرێت، هەمان ئەو بزوێنەیــە کــه بــه وشەی وەك مەهابادی زیاد دەکەین، چونکە لە زمانی زارەکیی هێندێك ناوچەدا رستەی دەچمە شنۆیێ وەك دەچمە شنۆیە بێژ دەکرێت، ئەو رێسا یەکدەست و ساکارە شــێواوە و بەرە بەرە شێوەیەك لە لە رێسالادان رمێنی پەیداکردووە.

رەنگە خوێنەری ئەم وتارە دوای خوێندنەوەی ئــەم دێڕانــە، چــەند رەخنەیــەکی بــە مێشکدا بێت.

یەکێك لە رەخنەکان رەنگە هەڵگری ئەو بۆچوونە بێت: بۆچی ئێمــه لــەســەر ئــەم "ێ"یە کێشە دروست بکەین، خۆ لە زمانی پێوەری نووسیندا زۆر لەمێژە ئەو "ێ"یــە دەکار ناکرێت و بۆ نموونە دەنووسین لە شنۆ بووم دەچم بۆ مەهاباد.

ئەم قسەیە تەواو راستە و منیش بە هیچ شێوەیەك لایەنگری ئەوە نیم ئەو شێوە بەکارهێنانە لە زمانی پێوەردا بژیێتەوە، چونکە ئەم کارە بەڕاستی پێویست نییە. (هەڵبەت تەواو لایەنگری ئەوەم رێزمانی وردی ئەم شێوە دەکارکردنە بنووسرێتەوە و بپارێزرێت و لە کاتی خۆیدا بۆ لێکۆڵینەوە پێوەندیدارەکان کەڵکیان لێ وەربگیرێت)، بەڵام بەبیرهێنانەوەی دوو خاڵی زۆر گرنگ لەم بارەیەوە بە پێویست دەزانم.

یەکەم. ئەم "ێ"یە لە هێندێك وشەدا بووە بە بەشێك لە دارشتی وشەکە و تەنانەت لەو ناوچانەشدا کە ئەو "ێ"یە لە شێوەزارەیاندا دەکار ناکرێت، ئەم وشانە هەر بەم "ێ"وە کەڵکیان لێ وەردەگیرێت و هاتوونەتە ناو زمانی نووسینیش. ئەوجار لە ئەم نموونانەی خوارەوە ورد بنەوە:

- بەیانی رۆیشتم - دوایە هاتمەوە.

رەنگە تا ئێستا بیرمان لەوە نەکردبێتەوە لە وشەکانی بەیانی و دوایە، یان دوایی دا کە هەر بەم شێوەیە هاتوونەتە ناو زمانی نووسینمان، رەچەڵەکی وشەکان بریتین لە بەیان و دوا، ئەو "ێ" یا "ی" یا "ە"یەی بووە بە بەشێك لە وشەکە، هەمان ئەو بزوێنەیە کە لە وشەکانی مەهابادیێ و هەولێرێدا بە کۆتایی وشەوە زیاد بووە. (ئەو بزوێنە بە هەر دوو شێوەی "ێ" و "ی" بەگوێرەی شوێن راستە)، بەڵام بۆچی دیسان رێساکەمان شێواندووە و جارێك دەڵێین بەیانی -کە راستە- و جارێکیش دەڵێین دوایە -کە ناڕاستە- روانگەی بەراییدەرانە پێمان دەڵێت دوایە هەڵەیە و دوایێ راستە. هەتاهەتایە هەڵەیە و هەتاهەتایێ راستە.

دووەم: ئەو لە رێسا لادانە خۆ هەر لەو ئاستەدا نەماوەتەوە. لە زۆر وشەی تردا باسی ئەم "ێ"یەش کە لە زمانی نووسیندا وەلانراوە، دە گۆڕێدا نییە، "-ە" بە هەڵە، جێگای "ێ"ی گرتووەتەوە. بڕوانە ئەم نموونانە:

- ناڵەم، لەجیاتی ناڵێم.
- نایەم، لەجیاتی نایێم.
- دەیگەیەنمەوە، لەجیاتی دەیگەیێنمەوە.

بە گەردانکردن و شیکاریی ئەم کردارانە و لێوردبوونەوەیان، بە ئاسانی دەزانین کامەیان راستە و کامەیان هەڵەیە.

سێیەم: ئەم هەڵانە هەر لە جێگۆڕکێی "ێ" و "-ە"دا کورت نابنەوە، دەیان نموونەی تر هەن پێشان دەدەن کە هەڵەی زۆر سەیر و سەمەرە بەهۆی بە هێند نەگرتن و وەلانانی روانگەی بەراییدەرانە هاتوونەتە ناو زمانی نووسینمان و خەریکن رمێن پەیدا دەکەن. قسەی ئێمە ئەوەیە کە ئەم شێوە لە رێسالادانانە زەبر لە رەوتی بە ستانداردبوونی زمان دەوەشێنن و پاشاگەردانی و بێ رێسایی بەسەر زماندا زاڵ دەکەن و سیمای زمانێك کە دەتوانێت پالاوتە و پاکژ بێ بەرە بەرە کرێت و کرێژ دەکەن.

لەوانەیە ئەم رەخنەیەمان بێتەوە سەر کە ساغکردنەوەی زمانی زارەکیی و رێسامەندکردنی ئەم زمانە لە چوارچێوەی زمانی نووسیندا، رەنگە دار و پەردووی زمان تێك بدا و تەشەنە بکات بۆ وشەی ئەوتۆ کە هەر بەئەو شێوەیە کە ئێستا دەکار دەکرێن، ئیتر شەقڵیان گرتووە و هەڵوەشاندنەوە و گێڕانەوەیان بۆ ریشەی پێشوویان، پشتگوێخستن و بەهێند نەگرتنی رەوتی مێژوویی گۆڕانە کە نەك هەر کوردی، بەڵکو هەموو زمانەکان دەگرێتەوە.

بە بڕوای من ئەو نیگەرانییە لە جێگای خۆیدایە و دەبێت گرنگیی پێ بدرێت. هەر بۆیە هەوڵ دەدەین میکانیزمێکی ساکار بۆ ساغکردنەوەی وشە و پێکهاتەکان پێشنیار بکەین کە بەر بە ئەو ئاژاوەیەش بگرێت. سەرنج بدەنە ئەم نموونەیە: وشەی ددان زۆر رێی تێدەچێت لە بنەڕەتدا دندان بووبێت و دوایی لە زمانی زارەکییدا "ن"ەکەی سوابێ و بووبێ بە ددان. رەخنەگرانی ئێمە رەنگە بڵێن ئەگەر ئەو تێزەی ئێمە دەکار بکرێت، دەبێت لەمە بەدواوە لە زمانی نووسینی کوردیدا وشەی ددان شاربەدەر بکەین و لەجیاتی ئەم وشەیە بنووسین دندان. دیارە ئەم پشێویی و ئاژاوەیەش هەر بەم سووك و هاسانییە کۆتایی پێ نایەت. بە دەیان و سەدان وشەی ئاوا دەکەونە بەر هێرشی ساغکەرەوەکان و سیمای ئێستای زمانی کوردی دادەڕووشێت، بەڵام پێشنیاری ساکاری ئێمە میکانیزمێك بەدەستەوە دەدا کە پێشی ئەم پشێوییە دەگرێت. پێشنیارەکە ئەوەیە: ئەو زاراوەی بۆ نووسین دەکاریٚ دەکەین هێندێك بن زاراوەی هەیە، ئەگەر شێوەی رەسەن و کامڵی وشەیەك لەناو یەکێك لە ئەو بن زاراوانەدا هەیە، حەق وایە شێوە کامڵەکە هەڵبژێرین و ئەوانی تر لە چوارچێوەی زمانی پێوەر وەلا بنێین. یا ئەگەر لە بەرهەمە نووسراوەکانی ئەم زاراوەیەدا وشە و زاراوە کامڵەکە پارێزراوە خۆمان بە پێمل بزانین نووسینی شێوە کامڵەکە رەچاو بکەین، بەڵام ئەگەر لە هیچکام

لەبن زاراوەکاندا- چ لە شێوە ئاخافتنی خەڵکدا و چ لە بەرهەمە نووسراوەکاندا- ئەو وشە و پێکهاتانەی کە کەسانێك پێیان کامڵترە نەدۆزراوە، کەس بۆی نییە ئەو وشە و پێکهاتانە بگۆڕێت. ئەو شیکرنەوەیە بە میکانیزمەکەمانەوە زیاد دەکەین ئەگەر لە بن زاراوەیەکدا یا لە دەقێکی نووسراودا نموونەی هەڵەمان دۆزییەوە بە مەرجێك بتوانین لە بن زاراوە یا دەقێکی نووسراوی تردا نموونەی راست ببینینەوە، ئەوا دەبێت بەهۆی نموونە راستەکەوە نموونە ناڕاستەکە وەلابنێین. بە دەربڕینێکی تر نموونە راستەکان لە شێوە ئاخافتنی ناوچەیەك یا لە دەقێکی نووسراودا بۆمان دەبێتە سەرچاوە، بەڵام مادام لە ناوچەی تر یا لە دەقێکی تردا نموونەی راستمان پێ شك بێت، نموونەی ناڕاست لە هەمان دەق، یا شێوە ئاخافتنی پێشوودا ناکەین بە سەرچاوە.

با هەر بگەڕێینەوە بۆ وشەی ددان. لە هیچکام لە بن زاراوەکانی زاراوەی کوردیی ناوەڕاستدا وشەی دندان وەبەر چاو ناکەوێت. کەوایە کەس حەقی نییە ئەو وشەیە بگۆڕێت و بیگێڕێتەوە بۆ وشەیەکی تر کە بۆخۆی پێی رەسەنترە، بەڵام با ئەو نموونەیە بەشێوەیەکی تر بهێنینە مەیدانەوە. لە هێندێك بن زاراوەی کوردیی ناوەڕاستدا وشەی ددان بووە بە دیان یان دان، واتە تیپی دالی دووەمی سواوە و سووك بووەتەوە. پرسیاری سەرەکیی ئەمەیە ئێستا کە لە کوردیی ناوەڕاستدا هەم ددان دەکار دەکرێت و هەم دان (بۆ نموونە ددان پێداهێنان هەیە و دان پێداهێنانیش هەیە)، حەق وایە لە زمانی پێوەردا کامە شێوە بۆ نووسین هەڵبژێرین؟ بە بروای من بێ سێ و دوو لێکردن دەبێ وشە کامڵەکە هەڵبژێرین (واتە ددان) و ئەویتر وەلا بنێین.

نموونەیەکی تر. پێشتر ئاماژەمان بە ئەو راستییە کرد کە بە شیکارییەکی زمانی - کە سەرێکی بە مۆرفۆلۆژییەوە پەیوەستە و سەرێکی بە فۆنێتیك دەبەسترێتەوە- بۆمان روون دەبێتەوە کە نووسین بەشێوەی نایە و هەتاهەتایە هەڵەیە و ئەم وشانە دەبێت بەشێوەی نایێ و هەتاهەتایێ بنووسرێنەوە. دوای ئەم شیکارییە زمانییە گەشتێك بەناو دەقە نووسراوەکانی کوردیدا دەکەین. عەبدوڵڵا پەشێو لە شیعرێکیدا دەنووسێت:

لەگەڵ منا گەورە نابیت/ منالی لێت نابێتەوە/ لەگەڵ منا/ تاهەتایێ/ بێ بووکۆکە خەوت نایێ.

دەبینین دوای ئەم شیکارییە زمانییە نموونەشمان لەناو دەقی نووسراودا بۆ دۆزییەوە. هەر لەم دەقەدا دەبینین لەپاڵ نموونەی ستانداردی وەك نایێ و هەتاهەتایێ نموونەی

ناڕاستی وەك لەگەڵ منا -لەجیاتی لەگەڵ مندا- و منالّی -لەجیاتی منداڵی- هاتوون. بەگوێرەی ئەو شیکردنەوەیەش کە بە میکانیزمەکەمانەوە زیادکرد، ئێمە لە ئەو دەقەدا نموونە راستەکان وەردەگرین، بەڵام نموونە ناڕاستەکان وەرناگرین، چونکە بۆمان هەیە لە دەقی تردا یان لە شێوە ئاخافتنی خەڵکی ناوچەیەك لە ئەو ناوچانەی بە زاراوەی کوردیی ناوەڕاست دەدوێن، نموونە راستەکانی تر بدۆزینەوە.

بەکورتی، ئەم میکانیزمە یاریدەمان دەدات زۆر کێشە و گرفت و ناتەبایی لە زمانی نووسیندا چارەسەر بکەین. بە رەچاوکردنی ئەم رێسا ساکارە ئیتر ئیزنی ئەوەمان نییە بڵێین بۆ هێندێك بەکارهێنانی زمانی، دوو ستانداردمان هەیە. بۆ نموونە بەگوێرەی ستانداردێك "بابەت دەنووسم" دەکار دەکرێت و بەگوێرەی ستانداردەکەی تر "بابەت ئەنووسم". لەسەر بنەمای روانگەی بەراییدەرانە ئەنووسم هەر لەجێدا ستاندارد نییە، چونکە شێوەی سووکەڵەکراوی دەنووسم-ە و لەبەرئەوەی شکڵە کامڵەکەش هێشتا لەبن زاراوەکانی کوردیی ناوەڕاستدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت، کەواتە زمانی پێوەر -ئەگەر قەرارە پێوەر بێ- نووسینی کرداری رانەبردوو بە "ئە" لەجیاتی "دە" هەڵناگرێت.

-٣-

هەتا ئێرە زۆربەی بابەتەکانی ئەم وتارە تەرخانکرابوو بۆ داکۆکیکردن لەسەر گرنگی و پێویستیی روانگەی بەراییدەرانە بۆ بەڕێوەبردنی پرۆژەی زمانی پێوەر. ئێستا دەمانەوێت بەشێوەیەکی تایبەت لەسەر بە پێوەرکردنی زمانی کوردی و بۆچوونی دکتۆر ئەمیر لەم بارەیەدا بدوێین.

دکتۆر ئەمیر لە وتارێکدا دەنووسێت:

"... زمانی رەسمیی "حکوومەتی هەرێمی کوردستان" دەبێت بە کام لەهجە بێت؟ تا ئێستا دوو وەڵام بەو پرسیارە دراوەتەوە: ١- سۆرانی تەنیا لەهجەی ستانداردە و دەبێت ببێتە زمانی رەسمی. ٢- کوردی وەك زمانی نۆرویژی دوو لەهجەی ستانداردی هەیە و دەبێت هەردوو لەهجە سەرەکییەکە رەسمی بکرێن"[(٨)].

دیارە دکتۆر ئەمیر لەم دوو وەڵامانە بە گژ یەکەمیاندا دێتەوە و ناوی "شۆڤینیسمی سۆرانی" لەسەر دادەنێت و وەڵامی دووەم وەکو رێگاچارەیەك بۆ پرسی

بە پێوەرکردنی زمانی کوردی پەسند دەکات و سەرجەمی بۆچوونەکانی وەکو بەڵگەهێنانەوە بۆ پێ سەلماندنی راستیی وەڵامی دووەم و چەوتیی وەڵامی یەکەم ئاراستە دەکات. ئێمەش بۆچوونی خۆمان لەمەڕ ئەم وەڵامەی بەڕێزیان بەئەم شێوەیە دەردەبڕین:

یەکەم: دکتۆر ئەمیر لە وەڵامی دووەمدا کە بۆخۆی لاگریەتی، دەڵێت: کوردی دوو لەهجەی (مەبەستی دیالێکت، یان زاراوەیە) ستانداردی هەیە و ئەم دوو شێوەزارە بە شێوەزاری "سەرەکی" ناو دەهێنێت. دیارە بە ستانداردزانین و بە سەرەکی دانانی ئەم دوو زاراوەیە ناچارەکی بە مانای بە ناستاندارد و ناسەرەکی دانانی شێوەزارەکانی تری زمانی کوردییە. ئەمە ئاراستەیەکە کە دکتۆر ئەمیر بەهۆیەوە لایەنە بەرانبەرەکەی بە توندی پێ تاوانبار دەکات و هەتا ئاستی بە شۆڤێنیست دانانی دەچێتە پێش، کەچی خۆی لێرەدا بەئاگایانە، یان نائاگایانە رەچاوی کردووە و پەرەی پێداوە. هەر خودی زاراوەی نارێکی جووت ستاندارد کە بووە بە دروشمی سەرەکیی دکتۆر ئەمیر و هاوبیرانی لە هەناوی خۆیدا هەڵگری ئەم تێزەیە کە لەناو زاراوەکانی زمانی کوردیدا دووانیان ستانداردن و ئەوانی تر هەر نەبێ هێندەی ئەم دووە ستاندارد نین، دووانیان سەرەکین، ئەوانی دیکە هێندەی ئەوانە سەرەکی نین. کەوایە ئەگەر دکتۆر ئەمیر مافی ئەوەی هەبێت لایەنە بەرانبەرەکەی بە "شۆڤینیستی سۆرانی" ناودێر بکات، ئەوا دەکرێت هەر لە سەر بنەمای بۆچوون و بەڵگەکانی دکتۆر ئەمیر خۆی، ئەو هەڵوێستەی خۆیشی بە جووت شۆڤینیزمی سۆرانی- بادینی ناودێر بکرێت. ئەگینا چ مانایەکی هەیە بە سەرەکی زانینی یەکێك لە زاراوەکان بە شۆڤینیزم بزانین، بەڵام بە سەرەکی دانانی دووانیان بە هەڵوێستێکی زێدە دیموکراتیك بزانین؟ هەڵبەت دکتۆر ئەمیر لە هێندێك جێگەدا کە هەمان ئەم رەخنەیەی رووبەڕوو بووەتەوە لایەنگری لە بە رەسمیکردنی هەموو زاراوەکانی زمانی کوردی کردووە. پرسیاری من ئەوەیە ئەگەر هەموو زاراوەکان دەبێت رەسمیی و ستاندارد بکرێن، بۆچی هێندە لەسەر زاراوەی "جووت ستاندارد" داکۆکیی دەکرێت؟ بۆچی نالێین چوار ستاندارد، یان پێنج ستاندارد؟

دووەم: دکتۆر ئەمیر دەڵێت تائێستا دوو وەڵام بەو پرسیارە دراوەتەوە. ئەم بۆچوونە، بۆچوونێکی وردبینانە و تەواو نییە. واقیعبینانەتر ئەوەیە بڵێین تائێستا چوار وەڵام بەم

پرسیاره دراوەتەوە. نازانم بۆچی نووسەر باسی ئەم دوو وەڵامەی تری نەکردووە. ئەم دوو وەڵامەی تر ئەمانەن:

وەڵامی سێیەم: لەناو زاراوەکانی زمانی کوردیدا کوردیی سەروو لە هەموویان زیاتر شیاوی بە ستانداردبوون و بە رەسمی بوونە.

وەڵامی چوارەم: گرنگ نییە کامە زاراوە بۆ بە رەسمی بوون- یان بۆ هەڵبژاردن وەکو زاراوەی هاوبەش- پەسند دەکرێت، هیچ دەمارگرژییەك لەم بارەیەوە دە گۆڕێدا نییە، بەڵام بۆ سەرخستنی پرۆژەی بە ستانداردکردنی زمانی کوردی یەکێك لەم زاراوانە هەر دەبێت هەڵبژێردرێت.

ئەم دوو وەڵامەی دواییش وەکو دوو وەڵامەکەی پێشوو زەمینەی عەینی و زەینی بۆ هاتنەئارایان هەبووە و بەکردەوەش هاتوونە گۆڕێ. دکتۆر ئەمیر خۆی دەڵێت لەناو زاراوەکاندا دووانیان سەرەکین. لەم دوو زاراوانە ئەگەر یەکێکیان داوای بە رەسمیبوونی هەبێت، بێگومان ئەوەی تریش -هەر بەئەو بەڵگەیە کە ئەویش یەکێك لە زاراوە سەرەکییەکانە- ئەو داوایەی هەبووە و بەم شێوەیە وەڵامی سێیەم گۆڕاوە. وەڵامی چوارەمیش بەم شێوەیە جێگە و پێگەی خۆی دۆزیوەتەوە: کەسانێك هەبوونە، زیاتر لەوەی هەستیارییان لەسەر فلانە زاراوەیە و تواناییەکان و پتانسیەلەکانی هەبێت، هەستیارییان لەسەر هەڵبژاردنی یەك زاراوە بۆ بە رەسمیبوون بووە، واتە خەمی فلانە دیالێکتەیان نەبووە، بەڵکو خەمی زمانی ستانداردی کوردی و لەم رێگایەوە خەمی یەکیەتیی نەتەوەیی کوردیان لەبەر بووە. دیارە ئێمە وەڵامی لایەنگری چەند ستانداردبوونیشمان هەر وێڕای ئەو وەڵامەی لایەنگری دوو ستانداردبوونە، لە خانەی دووەمدا جێگیر کرد، هۆیەکەشی ئەوەیە کە دکتۆر ئەمیر هێندێك جار لە ئەمەیانەوە باز دەدا بۆئەوەی تر و هێندێك جاریش دەبێتەوە بە لایەنگری دوو ستاندارد. کەوایە ئەگەر بمانەوێت شیکارانەتر بۆ وەڵامەکان بچین و دوو ستاندارد و چەند ستاندارد بە دوو وەڵامی جوداواز بزانین، ئەوکات سەرجەم پێنج وەڵامان دەبێت. بە پێویستی دەزانم هەر لە ئێرەدا زۆر بە ئاشکرا و بە روونی رایبگەیەنم کە من لایەنگری وەڵامی چوارەمم و بەشیاوترین ئاراستەی دەزانم.

بەر لەئەوەی بەرنامە و گەلاڵەکانی پێشنیارکراوی خۆم بۆ بە ستانداردکردنی زمانی کوردی، هەروەها بەرگرتن لە پێشێلبوونی مافی زمانیی بەشێك لە خەڵکی

کورد بە هەڵبژاردنی یەکێك لە زاراوەکان بهێنمە ئاراوە، بە پێویستی دەزانم شایەتێکی مێژوویی و تیۆریك بۆ بە ناڕاست زانینی ئاراستەی دوو ستاندارد، یان چەند ستاندارد بهێنمەوە.

"سی. ئەی. فێرگۆسۆن" زمانناسێکی ناسراو و جێگای باوەڕە کە لە ساڵی ١٩٦٢دا وتارێکی بە ناوی هۆکاری زمان لە پێشکەوتنی نەتەوەییدا بلاوکردەوە[٩]. فێرگۆسۆن لەم وتارەدا باسی سێ ئاستی جوداوازی زمانی ستانداردی کرد. ئەم ئاستانە بریتین لە ستانداردی سیفر (st 0)، ستانداردی یەك (st 1)، و ستانداردی دوو (st 2). ستانداردی سیفر لە روانگەی فێرگۆسۆن-ەوە تایبەتمەندیی زمانێکە کە لە بنەڕەتدا پرۆژەی بە ستانداردبوونی تێنەپەڕاندووە. گۆڕان و جۆراوجۆریی زاراوەکان لەم جۆرە زمانانەدا، دۆخی زمانەکەیان ئاڵۆز و پلۆز کردووە و زمانەکەیان تووشی پرژی و پشێوی کردووە. ستانداردی یەك خۆی بە چەند توێژی جوداواز دابەش دەبێت. توێژی یەکەم ستانداردی تاك مۆداڵە (unimodal)، توێژی دووەم ستانداردی دوومۆداڵە (bimodal) و توێژی سێیەم ستانداردی چەندمۆداڵە (multimodal). زمانی ستانداردی ئاستی یەکی تاك مۆداڵ، زمانێکە یەك نۆرمی هەیە، بەڵام ئەو نۆرمە بە تەواوی و لە گشت لایەنەکانی کۆمەڵگادا وەرنەگیراوە، بەڵکو بەشێوەیەکی رێژەیی وەرگیراوە. زمانی ستانداردی ئاستی یەکی دوومۆداڵ زمانێکە دوو نۆرمی هەیە کە ئەم دوو نۆرمانە لەباری جوگرافیاییەوە یا لەباری دەوری فەرهەنگی و ئایینییانەوە لەیەك جودا بوونەتەوە.

زمانی ستانداردی ئاستی یەکی چەندمۆداڵیش هەر دۆخێکی هاوشێوەی دۆخی ئەوەی پێشووی هەیە، ئەوەندە نەبێت کە چەندین نۆرم جێگای دوو نۆرمەکە دەگرنەوە.

ستانداردی دوو لە روانگەی فێرگۆسۆنەوە، زمانی ستانداردی نموونەییە. لەم ئاستەی زمانی ستاندارددا نۆرمێکی تاك هەیە و ئەو نۆرمە لەلایەن کۆمەڵگاشەوە وەرگیراوە. لەم ئاستەدا جوداوازیی نێوان زاراوەکان و جۆرەکانی جوگرافیایی و کۆمەلایەتی و زمانی زارەکیی و زمانی نقیساریی زۆر کەمە. فێرگۆسۆن بۆ ئەم ئاستانە نموونەشی هێناوەتەوە. باسی زمانی کوردیشی کردووە. مەزەندەی ئەوە بکەن ئەو زمانناسە ناسراوە، زمانی کوردی لەکام ئاستدا جێگیر کردووە.

نموونەی باسکراوی فێرگۆسۆن بۆ ستانداردی دوو، زمانی سویدییە. فێرگۆسۆن دەڵێت لە زمانی سویدیدا جوداوازییەك لەنێوان زمانی نووسین و زمانی زارەکیدا هەیە، بەڵام زۆر کەمە و خەریکە کەمتریش دەبێتەوە. لەم زمانەدا هیچکام لە زاراوە جوگرافیاییەکان جوداوازییەکی زۆریان لەگەڵ ستانداردەکە نییە. نموونە بۆ زمانی ستانداردی ئاستی یەکی دوو مۆداڵ بریتییە لە هەرمەنی. ئەم زمانە دوو نۆرمی جوداوازی جوگرافیایی هەیە کە بریتین لە هەرمەنیی رۆژهەڵات و هەرمەنیی رۆژئاوا. نموونەیەکی تر زمانی یۆنانییە، بەڵام یۆنانی بەشێوەیەك دوومۆداڵە و هەرمەنی بەشێوەیەکی تر. گوتمان بنچینەی جوداوازییەکە لە زمانی هەرمەنیدا هەڵکەوتی جوگرافیاییە، بەڵام بنچینەی ئەم جوداوازییە لە زمانی یۆنانیدا ئەو دەورە فەرهەنگییەیە کە هەرکام لەئەو نۆرمانە هەیانە. یەکێك لە نۆرمەکان لە گوتوبێژ و ئاخافتنی رۆژانەدا کەڵکی لێ وەردەگیرێت و یەکێکیشیان بۆ نووسین. زمانی کوردی لە روانگەی فێرگۆسۆن-ەوە نموونەیەکە بۆ ستانداردی سیفر. گوتمان ستانداردی سیفر لەجێدا زمانێکی ناستانداردە. فێرگۆسۆن دەڵێت جۆروجۆریی زاراوەکان لە زمانی کوردیدا زۆرە و سەرباری ئەوەش هیچکام لە زاراوەکانی زمانی کوردی لەناو کوردەکاندا وەکو زاراوەی رەسمی یان هاوبەش بەگشتی وەرنەگیراوە.

حەزدەکەم هەموومان سەرنجی ئەو خاڵە بدەین کە فێرگۆسۆن دەوری نیو سەدە لەمەوبەر ئەم بابەتەی نووسی. ئەم کتێبە لە هەومەرجێکدا نووسراوە کە لە وڵاتی عێراق حکومەتی عەبدولکەریم قاسم تازە بە دەسەڵات گەیشتبوو و مەلا مستەفا بارزانی تازە گەڕابووەوە بۆ باشووری کوردستان و دەستگاکانی ئۆتۆنۆمی هێشتا بە تەواوی لە کوردستاندا جێگیر نەببوون. ئەو بۆچوونەی فێرگۆسۆن، تەعبیرێکی ناڕاست بۆ دۆخی ئەو سەردەمەی زمانی کوردی نەبووە، بەڵام دواتر ئەو دۆخە چەند جار گۆڕانکاریی بەسەردا هات. دوای سەقامگیر بوونی ڕێژەیی دەستگاکانی ئۆتۆنۆمی لە باشووری کوردستاندا، بنەماڵەی بارزانی ئەگەرچی خۆیان بە کوردیی سەروو دەدوان، بەڵام بەرچاو روونیی بارزانیی نەمر هانی دا هەتا داکۆکیی لەئەو نەریتە بکات کە بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە زەمانی شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمرەوە لە باشووری کوردستاندا بە رەسمی ناسرابوو. بەگوێرەی هێندێك بەڵگە کە لەبەردەستدا هەن، دوای بە دەسەڵات گەیشتنی حیزبی بەعس لە عێراق بەعسییەکان بە هەر دەلیلێك کە

بۆخۆیان پێی گەیشتبوون، ویستیان هێندێك کەسایەتی لەناو شۆڕشی کورددا بێننە سەر ئەو قەناعەتە کە هەردوو زاراوەی کوردیی سەروو و کوردیی ناوەڕاست لە کوردستانی عێراق بە رەسمی بناسرێت. مەلا مستەفا زۆر بە توندی بە گژ ئەو بەرنامەیەدا چووبووەوە و نەیهێشتبوو ئەو پرۆژەیە سەر بگرێت. ئەم دۆخە بۆ زمانی کوردی لەناو هێزە سیاسییەکانی باشووری کوردستاندا هەتا راپەڕینی ساڵی ۱۹۹۱، کەم و زۆر چەسپابوو. دوای ساڵی ۱۹۹۱ کە پارێزگای دهۆکیش تێکەڵ بە ناوچە ئازادەکانی کوردستان بوو، لەبەر ویستی خەڵکی ئەم ناوچەیە و هەروەها لەبەر ئەوەش کە هێژمۆنیی سیاسیی هێزەکانی کوردی باکوور ماوەیەك بوو رووی لە زیادبوون بوو، دۆخی زمانی کوردی لە دۆخی ستانداردێکی ئاستی یەکی تاك مۆداڵەوە نەختێك بۆ لای ستانداردی ئاستی یەکی دوو مۆداڵ چوو، بەبێ ئەوەی ئەو گوێزرانەوەیە بۆ لای دوومۆداڵییەتی بە تەواوی روو بدات، چونکە ئێستاشی لەگەڵدا بێت لە باشووری کوردستاندا جێگە و پێگەی کوردیی ناوەڕاست لە گشت زاراوە کوردییەکان بەهێزترە، بەڵام بەم گوێزرانەوەیە دۆخی زمانی کوردی لەباری ستانداردبوونەوە بەرەو پێش نەچوو، بەڵکو بەرەو دواوە چوو، چونکە بەگوێرەی ریزبەندییەکەی فێرگوسۆن، ئاستەکانی زمانی ستاندارد لە زیاتر پێشکەوتووەوە بۆ کەمتر پێشکەوتوو بەریز بریتین لە: ۱- ستانداردی دوو. ۲- ستانداردی ئاستی یەکی تاك مۆداڵ. ۳- ستانداردی ئاستی یەکی دوومۆداڵ. ٤- ستانداردی ئاستی یەکی چەندمۆداڵ. ٥- ستانداردی سیفر.

قسەی من ئەوەیە ئەگەر ئەو دۆخەی دکتۆر ئەمیر پروپاگەندەی بۆ دەکات، بچەسپێ، ئەوا بەگوێرەی ریزبەندییەکەی فێرگوسۆن زمانی کوردی بەرەو زیاتر ستانداردبوون ناچێت، بەڵکو بۆ لای کەمتر ستانداردبوون، یان تەنانەت دیسان بۆ لای دۆخی ستانداردی سیفر دەچێتەوە.

ئەو راستییەش جێگای ئاماژەپێکردنە ئەو قسەیەی دکتۆر ئەمیر کە دەڵێت زمانی کوردی ئێستا زمانێکی دوو ستانداردە -وەکو تەوسیف- ئەگەر دۆخی زمانی کوردی لە هەموو بەشەکان لەبەرچاو بگرین، نەك هەر لە باشوری کوردستاندا، قسەیەکی راستە. چەوتیی هەڵوێستی دکتۆر ئەمیر لەو جێگایەدایە کە داکۆکیی لەسەر ئەوە دەکات ئەو دۆخە هەر دەبێت ئاوا بمێنێتەوە و نابێت بۆلای تاك ستانداردبوون بچێت، یان بڵێین نابێت بۆ لای تاك ستانداردبوونی ببەین، بەڵام ئێمە لەسەر ئەم بڕوایەین کە

دەبێت لەسەر بنەمای پرۆژەیەکی زانستی و ئوسوولی -بەبێ ئەوەی مافی ئاخێوەران بە زاراوە جۆراوجۆرەکانی زمانی کوردی پێشێل بکەین- زمانی کوردی بەرەو دۆخی تاك ستانداردی ببەین. هەر لەسەر بنەمای ئەم راستییە بوو کە لە سەرەتای ئەم وتارەدا گوتمان پرسیاری دروست لەمەڕ ستانداردی زمانی کوردی، یان زمانی کوردیی ستاندارد ئەوە نییە بڵێین "زمانی کوردی تاك ستانداردە، یان جووت ستاندارد؟" بەڵکو پێویستە پرسیارەکە ئاوەها رێکبخرێت: "زمانی کوردی بۆ بە ستانداردبوونی زیاتر دەبێت تاك ستاندارد بێت، یان جووت ستاندارد؟ ئەو "دەبێ"یە پێویستیی هەڵوێستێکی نۆرماتیڤ و بەراییدەرانەمان پێشان دەدات، کە بۆ بەڕێوەبردنی پرۆژەی زمانی پێوەر لازمە و کەسانێکی وەك دکتۆر ئەمیر خۆیانی لێ نەبان دەکەن.

دیارە زمانی کوردی ئەوەی دە باراندا نییە ببێت بە ستانداردی دوو، چونکە گوتمان لە ستانداردی دوودا مەودای نێوان ستانداردی هەڵبژێردراو لەگەڵ باقی زاراوەکان، هەروەها لەگەڵ زمانی زارەکیی زۆر کەمە. ئەمەش دەزانین زاراوەکانی زمانی کوردی ئەوەندە لەیەك نزیك نین، بەڵام هەوڵی گشتیی ئێمە دەبێت لەو ئاراستەیەدا بێت کە زمانی کوردی بگەیەنین بە هەواری ستانداردی ئاستی یەکی تاك مۆداڵ. ئەم کارە کارێکی لە توانابەدەر و نەگونجاو نییە. جگە لەوەی گونجاوە یەکجار زۆریش پێویستە.

ئەو تێزە کە دەڵێت یەکێك لە هۆکارەکانی یەکیەتیی نەتەوەیی، یەکیەتی زمانە و هێندێك لە نووسەرانی کورد رەتی دەکەنەوە، تێزێکی راستە و بەناحەق کەوتووەتە بەر تەوس و پلاری ئەم نووسەرانە.

فێرگۆسۆن ئەگەر ئێستا بمابایە، رەنگ بوو ئیتر زمانی کوردیی لەناو خانەی ستانداردی سیفردا جێگیر نەکردبایە. زمانی کوردی لەو سەردەمەوە تائێستا پێشکەوتووە. هەڵبەت وا هەبووە دوای ئەو پێشکەوتنە نەختێك گەڕاوەتەوە بۆ دواوە، بەڵام دیسان نەگەڕاوەتەوە سەر حوللەمەرەسێ، یان ئەو ستانداردە سیفرەی فێرگۆسۆن باسی لێدەکات. ئەوە جێگای خۆشحاڵییە، بەڵام وەك چۆن زمانی کوردی بۆی هەبووە بۆ دواوە یان بۆ پێشەوە بچێت، ئاوەهاش بۆی هەیە هێندەی دیکەش بەرەوپێش بچێت. لێرەدایە کە دەڵێین دۆخی جووت ستاندارد بۆ زمانی پێوەر دۆخی تێپەڕینە، نەك مانەوە.

ئەو جووت ستانداردەی دکتۆر ئەمیر باسی دەکات، هەمان ئەو دوو مۆدالّەیە کە فێرگۆسۆن لێی دەدوێت. ئەگەر بێت و هاودەنگییەك لەسەر ئەوە ساز نەبێت کە یەکێك لە زاراوە کوردییەکان بۆ بە رەسمیبوون (یا بۆ بە هاوبەش بوون) هەڵبژێردرێت، بەڵکو بەپێچەوانەوە لەسەر ئەوە مکورِ و پێداگر بن کە هەموو زاراوەکان خاوەنی جێگە و پێگەیەکی هاوئاست و هاوشان بن، ئەوا دیسان دەگەڕێینەوە بۆ ستانداردە سیفرەکەی فێرگۆسۆن، واتە بێ ستانداردی. زۆر سەیرە ئێمە باسی ستاندارد بکەین و خۆمانی بۆ بکوتین، بەلاّم ئاکامی بەکردەوەی خۆکوتانەکەمان گەیشتن بە دۆخێکی ناستاندارد بێت.

پرسیارێك کە رەنگە بێتە گۆڕ و زەینی خوێنەر ختووکە بدات، ئەوەیە کە چ جوداوازییەك لەنێوان ستانداردی سیفر و ستانداردی ئاستی یەکی چەندمۆداڵ لە باسەکەی فێرگۆسۆن-دا هەیە؟ چونکە لە هەردووکیاندا هیچ کۆدەنگییەك لەسەر یەکێك لە زاراوەکان نییە. ئەوەی راستی بێ فێرگۆسۆن زۆر بە روونی بە بنج و بناوانی ئەم باسەدا نەچووەتە خوار و بە وردی شەنوکەوی نەکردووە. من حەزدەکەم مەزندەیەك بۆ دیاریکردنی ئەو جوداوازییە بکەین و باسەکە لەباری تیۆرییەوە نەختێك پەرە پێ بدەین.

دەستەواژەی زمان یان زاراوەی ستاندارد (جگە لەو پۆلێنکردنەی فێرگۆسۆن) لە دوو مانای بەربلاو و بەرتەسکدا دەکار دەکرێت. لە مانا بەرتەسکەکەیدا زمان یان زاراوەی ستاندارد، واتە زمان یان زاراوەیەك کە رێساکانی کۆکراونەتەوە و باسە رێزمانییەکانی پێوەندیدار بەو زمان، یان زاراوەیە بە وردی شەنوکەو کراون و بەشی بێ رێسا و بەشی رێساداری لە یەك جوداکراونەتەوە و بەکارهێنەرانی ئەو زمان، یان زاراوەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە زمانییەکان بۆ سەر ئەو رێسا کۆکراوانە دەگەڕێننەوە. ئەوانەی گوتمان هەر بەتەنیا پێوەندیی بە دیوی ناوەوەی زمان یان زاراوەیەکەوە هەیە، بەلاّم زمان یان زاراوەی ستاندارد لە مانا بەربلاّوەکەیدا زمان یان زاراوەیەکە کە هەم ستاندارد بێت (بە مانا بەرتەسکەکەی) و هەم بەشێوەیەکی رێژەیی، لەناو سیستمێکی چەندزمانی یان چەند زاراوەییشدا رەسمی یا رەسمیتر بێت. واتە لێرەدا مەرجێك بە مەرجەکانی زمانی ستانداردەوە زیاد دەکرێت کە پێوەندیی بە دیوی دەرەوەی زمان واتە لایەنە کۆمەلاّیەتی و سیاسییەکانییەوە هەیە.

ئێستا وای دابنێین زمانێك بۆ نموونە خاوەنی چوار زاراوەیە. ئەو چوار زاراوەیە دەتوانن ئەو دۆخانەی خوارەوەیان هەبێت:

یەکەم: هەر چواریان بە مانا بەرتەسکەکەی زاراوەی ستاندارد، ستاندارد بن، واتە رێسای هەموویان کۆکرابێتەوە و بەشێوەیەکی شیکارانە لێکدرابێتەوە، بەڵام هیچکامیان بە مانا بەربڵاوەکەی ستاندارد نەبن، واتە هیچکامیان بۆ دەکار کران، بەشێوەیەکی رەسمی سەرەتیی بەسەر ئەوانی تردا نەبێت.

دووەم: ئەو چوار زاراوەیە بە مانای بەرتەسك ستاندارد بن و یەکێکیشیان لەچاو ئەوانی تر رەسمی بێت. واتە یەکێکیان بە مانا بەربڵاوەکەی ستاندارد بێت.

سێیەم: ئەو چوار زاراوەیە تەنانەت بە مانا بەرتەسکەکەش ستاندارد نەبن.

فێرگۆسۆن بە راشکاوی ئاماژەی بەئەم بابەتە نەکردووە، بەڵام ئێمە وەکو پەرەپێدان و زیادە خستنە سەرێك بۆ تیۆریی فێرگۆسۆن دەتوانین بڵێین دۆخی یەکەم: دۆخی زمانێکی ستانداردی ئاستی یەکی چەندمۆداڵە. دۆخی دووەم: دۆخی زمانێکی ستانداردی ئاستی یەکی تاك مۆداڵە و دۆخی سێیەم: دۆخی زمانێکە بە ستانداردی سیفر.

ئەو زیادکردنە بە تیۆریی فێرگۆسۆن-مان بۆیە بە پێویستزانی هەتا لەسەر ئەو خاڵە داکۆکی بکەین کە تەنانەت ئەگەر جارێ بۆ بە ستانداردکردنی یەکێك لە زاراوەکانی زمانی کوردیش بە مانا بەربڵاوەکەی پێك نەهاتووین، هەتا ئەو پرسە چارەسەرییەکی زانستی و بێ قڕەی بۆ دەدۆزرێتەوە هەموو لایەك هەر نەبێ بۆ ستانداردکردنی زاراوەکانی زمانی کوردی بە مانا بەرتەسکەکەی هەوڵ بدەین و ئەو هەوڵە بکەین بە پێشەکییەك بۆ ستانداردکردنی دواتر و زیاتری زمانەکەمان بە مانا بەربڵاوەکەی. جگەلە ئەمە بە هێنانە گۆڕی ئەم باسە پرسێکی سەرەتای ئەم وتارەش واتە پرسی جوداوازیی نێوان زمانی ستاندارد و زمانی رەسمیش وەڵامی پێ دەدرێتەوە. ئەگەر بە مانا بەرتەسکەکەی باسی زمانی ستاندارد بکەین، ئەوا زمانی ستاندارد و زمانی رەسمی جوداوازییان هەیە. لەم روانگەیەوە زمانێك بۆی هەیە ستاندارد بێت، واتە رێساکانی کۆکرابێتنەوە و لایەنە نادیارە رێزمانییەکانی لێکدرابێتنەوە، بەڵام رەسمی نەبێت و بە پێچەوانەوە بۆی هەیە رەسمی بێت (واتە لەلایەن سیستمێکی سیاسییەوە بۆ راپەڕاندنی کاروباری ئیداری هەڵبژێردرابێت و لەچاو زمان یان

زاراوەکانی تر قان و سەرەتی پێدرابێت) بەبێ ئەوەی ستاندارد بێت، (واتە کاری وردی ڕێزمانی و زمانەوانی لەسەر ئەو زمانە کرابێت)، بەڵام بەگوێرەی مانا بەربلاوەکە ناکرێت بڵێین زمانێك ستانداردە، بەڵام ڕەسمی نییە.

دکتۆر ئەمیر جگەلە زمانی کوردی کە پێی جووت ستانداردە، چەند نموونەی تریش دەهێنێتەوە کە گوایە تاك ستاندارد نین و دەخوازێ بڵێت زمانی کوردیش ئەگەر تاك ستاندارد نەبوو، ئەوا سەیر نییە و نموونەی تریش لە گوێن ئەمە لە وڵاتانی تر دەگۆڕێدا هەن. بەگشتی دەکرێت ئەو نموونانەی دکتۆر ئەمیر وەکو نموونەی ترازاو لە دۆخی تاك ستاندارد دەیانهێنێتەوە بە چوار بەش پۆلێن بکەین:

یەکەم: وڵاتی وەك سویس کە چەندین زمان تێیدا ڕەسمییە.

دووەم. نموونەی وەك عەرەبی کە گوایە یەك زمانە و چەندین ستانداردی هەیە.

سێیەم: نموونەی وەك فارسی کە گوایە سێ زاراوەی ستانداردی هەیە. فارسیی دەری (لە ئەفغانستان) فارسی تاجیکی (لە تاجیکستان) و فارسی ئێرانی (لە ئێران).

چوارەم: نموونەی وەکو ئەرمەنستان و نۆروێژ و ئاڵبانی کە زمانەکەیان جووت ستانداردە.

پێویستە ئەو نموونانە بە ریز بخەینە بەرباس:

یەکەم: دۆخی چەند ستانداردبوونی زمان لە وڵاتێکی وەك سویس و بەراوردکردنی زمانی کوردی لەگەڵ ئەم دۆخە (قياس مع الفارق)ە. لەم وڵاتانەدا چەندین زمانی جودا ڕەسمین، بەڵام ئەوەی لە کوردستاندا جێگای مشتومڕە چۆنییەتی پەیوەندیی سازکردنی ڕەسمی لەنێوان زاراوەکانی یەك زمانە، نەك لەنێوان چەندین زماندا. ئەگەر لە سویس کاربەدەستان هاتبان و لەناو زمانە ڕەسمییەکانیشدا لە هەر کامەیان چەندین زاراوەیان بە ڕەسمی بناسیبایە ئەوکات دکتۆر ئەمیر دەیتوانی دۆخی زمان لەو وڵاتە وەکو سەرمەشق بۆ کوردستان هەڵبژێرێت. سویس نموونەیەکی ئیجابی بۆ دانانی سیاسەتێکی چەند زمانییە کە دکتۆر ئەمیر و هاوبیرانی باسی لێدەکەن. نموونەی سەلبیش لە بواری دانانی سیاسەتی زمانیی هەڵە لە وڵاتانی چەندزمان لە روانگەی ئەو بەرێزانەوە ئێرانی زەمانی ڕەزا خان و تورکیای زەمانی مستەفا کەمالە. دیسان لە ئێرەشدا ئەو بەرێزانە نەیانتوانیوە دوو گوتەزا لەیەك جودا بکەنەوە. سیاسەتی زمانیی ئەو دوو کەسە خاوەنی دوو بەش بوو. بەشی یەکەم: سەقامگیرکردن و خزمەتکردنی

زیاتری زاراوەی ستاندارد لەناو زاراوەکانی زمانی خۆیان بوو. واتە رەزا شا لە ئێراندا جۆرێك لە فارسی، واتە فارسیی ستانداردی لە بەرانبەر جۆرەکانی تری هەر ئەو زمانە پەرە پێدا و مستەفا کەمالیش جۆرێك تورکی، واتە تورکیی ستانداردی لە بەرامبەر جۆرەکانی تری زمانی تورکی برەو پێدا. بەشی دووەمی سیاسەتەکەیان ئەوە بوو زمانەکانی تریان جگەلە فارسی و تورکی سەرکوت و یاساغ کرد. هەڵەی ئەو دوو کەسایەتییە بەشی یەکەمی سیاسەتەکەیان نەبوو، بەڵکو بەشی دووەمی بوو. ئەگەر ئەوانە بۆ زمانەکانی تریش هاتبان لەناو جۆرە جۆراوجۆرەکانی هەر زمانێکدا یەکێکان بکردبا بە ستانداردی ئەو زمانە (بە فەرزی مەحاڵ)، ئەو کارەیان نەك هەر جێگەی رەخنە و لۆمە نەدەبوو، بگرە شیاوی پێ هەڵگوتنیش بوو، بەڵام بەپێچەوانەوە مێژوو پێی سەلماندووین ئەو شێوە حکومەتانە بۆ زمانی خۆیان هەمیشە هۆگر و برەوپێدەری تاك ستاندارد بوونە، بەڵام ئەو کاتەی بە هەر هۆکار و دەلیلێك ناچار بوون دان بە زمانەکانی تریش دابهێنن لە بەرامبەر ئەو زمانانە زۆر تامەزرۆیانە هۆگری دۆخی جووت ستاندارد، یان چەند ستاندارد بوونە. نموونەی هەرە بەرچاویان سەدام بوو کە خەریك بوو دۆخی جووت ستاندارد بەسەر سەرکردایەتیی ئەو سەردەمەی شۆڕشی کورددا بسەپێنێت کە سەرکردایەتیی شۆڕش زۆر راشکاوانە و وشیارانە ئەو مەراقەی لێ پووچەڵ کردەوە.

دووەم: دکتۆر ئەمیر لەمەڕ زمانی عەرەبی و ستانداردەکانییەوە دەڵێت:

"عەرەبی چەند لەهجەی ستانداردی هەیە. ستانداردی بەغدایی هەیە، قاهیرەی هەیە، مەراکیشی هەیە، لوبنانی هەیە، دیمەشقی هەیە"(١٠).

نموونەی زمانی عەرەبی کە دکتۆر ئەمیر باسی لێدەکات، تەواو بەپێچەوانەیە، بەدژی بۆچوونی ئەو و بە قازانجی بۆچوونی لایەنی بەرانبەریەتی. عەرەبی قاهیرە و مەراکیش و لوبنان و دیمەشق و بەغدا کە رەنگە لە قسەکردنی رۆژانەدا هیچکامیان لە یەك حاڵی نەبن گشتیان بۆ نووسین یەك زمانی ستانداردیان هەیە. ئەگەر مەبەستی دکتۆر ئەمیر لە ستانداردی بەغدا و قاهیرە و... ستانداردی نووسینە، ئەوا بە هەڵەدا چووە. بە شاهیدیی ئەو کەسانەی شارەزای زمانی عەرەبین ئەو بیست و چەند وڵاتە عەرەبییە، گشتیان یەك زمانی نووسینی ستانداردیان هەیە. جۆراوجۆریی زاراوەکان لە زمانی کوردیدا زیاتر لە جۆراوجۆریی زاراوەکانی زمانی عەرەبی نییە.

جوگرافیای کوردستانیش هێندەی جوگرافیای وڵاتە عەرەبییەکان هەراو نییە. چۆنە عەرەبەکان بە ئەو هەموو بەربڵاوییە لە زاراوە و لە جوگرافیادا توانیویانە لەسەر ستانداردێك پێك بێن، بەڵام ئێمەی کورد ناتوانین؟

سێیەم: ئەگەر جوداوازیی ستانداردی فارسیی ئەفغانستان و ستانداردی فارسیی ئێرانمان لەبەرچاو بێت، ئەوا ناتوانین لەگەڵ دوو ستانداردی کوردی، واتە کوردیی سەروو و کوردیی ناوەڕاست هەڵیسەنگێنین. جوداوازیی ستانداردی فارسیی ئەفغانستان و ستانداردی فارسیی ئێران وەکو جوداوازیی نێوان بن زاراوەکانی موکریان و سلێمانی لە چوارچێوەی یەك زاراوەدایە. لە جێگایەکی تر کەسێکی تر نموونەی ستانداردەکانی ئینگلیزیی بەریتانیایی و ئەمریکایی و ئوسترالیایی هێناوەتەوە و لەگەڵ دۆخی دوو ستانداردبوونی زمانی کوردی هەڵیسەنگاندووە، لە ئێرەشدا وەکو نموونەی فارسی، دۆخی جووت ستانداردبوون، یان چەند ستانداردبوونی ئینگلیزی لەگەڵ هی کوردی جوداوازیی هەیە. ئەو دۆستانەی بەشێوەی پسۆڕانە کار لەسەر بابەتی زمان و زمانناسیی دەکەن، نابێت فریوی (اشتراك لەفزی) هێندێك لە وشە و زاراوەکان بخۆن. ئەو دوو یان چەند ستانداردبوونەی لە فارسی یان لە ئینگلیزیدا هەیە، جوداوازیی ستانداردەکانیان وەکو جوداوازیی ئەو کوردیی سەرووە وایە کە لە باکووری کوردستان هەیە لەگەڵ ئەو کوردیی سەرووەی لە باشووری کوردستان هەیە. یا وەکو جوداوازیی ئەو کوردییە ناوەڕاستە وایە کە لە کوردستانی باشوور هەیە لەگەڵ ئەو کوردیی ناوەڕاستەی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەیە.

چوارەم: بەهێزترین بەشی بەڵگەی دکتۆر ئەمیر باسکردنی نموونەی وەك زمانەکانی هەرمەنی و نۆرویژییە کە بەڕاستی دوو ستانداردیان هەیە. ئەگەر لەسەر ئەم زمانانە لێکۆڵینەوە بکەین، بەم ئاکامە دەگەین کە ڕاستە ئەو زمانانە هەتا ئێستا تاك ستاندارد نین، بەڵام ئەگەر لێکۆڵینەوەکەمان نەختێك وردتر و بەربڵاوتر بکەین، بە ڕاستییەکی دیکەش دەگەین، کە بەداخەوە دکتۆر ئەمیر کەم و زۆر باسی نەکردووە و بەلایدا نەڕۆیشتووە. ئەویش ئەمەیە کە لە هەموو ئەو سێ چوار وڵاتەی ئەو دۆخە لەگۆڕێدا هەیە، لە ئەم چەند ساڵەی دواییدا، پاش ئەوەی خەڵکی ئەم وڵاتانە سەرنجیان بۆ ئەم ڕاستییە ڕاکێشراوە کە ئەم دۆخە دۆخێکی لەبار نییە و خەرج و زەحمەتێکی زیادیی تێدەچێت، ئیرادەیەکی بەهێز هەم لەناو خەڵکەکە و هەم لەناو

دەوڵەتەکانیان ساز بووە کە زمانەکەیان بەرەو تاك ستانداردکردن ببەن. هەر لـە جێـدا کاتێك دکتۆر ئەمیر لەناو ئەم هەموو وڵاتەی جیهاندا دوو سێ نموونە دەهێنێتـەوە کـە زمانەکەیان دوو ستانداردە، ئەمە بە ئەو مانایەیە کە گشت وڵاتەکانی تر زمانەکەیان تاك ستانداردە. بۆچی ئێمەی کورد دەبێت پشت لە ئەزموونی سەرکەوتووی ئەو هەموو نەتەوەیە بکەین و ئەزموونی دوو سێ وڵاتێـك دەکـار بکـەین، کـە خەڵکەکـەی لێـی پەشیمانن و شایەتیی بۆ ناسەرکەوتووبوونەکەی دەدەن؟

ئەم باسە دەتوانێت دەروویەکی لەبار بێت بۆ هێنانە بەرباسی ئەو گەلاڵانەی قـەرارە بۆ چارەسەرکردنی پرسی بە ستانداردکردنی زمانی کوردی پێشنیاریان بکەین.

-٤-

با جارێکی تر ئەم زاراوانە لە لای خۆمان دووپـات بکەینـەوە: زمـانی سـتاندارد، زمانی ستاندارد بە مانا بەرتەسکەکەی، زمانی ستاندارد بە مانا بەربلاوەکەی، زمانی رەسمی. (لەم وشانەدا دەتوانین جێگای زمان لەگەڵ زاراوەش بگۆڕینەوە) تا ئێـستا ئـەم وشـە و زاراوانـەمان بـە وردی لێکداوەتـەوە، بـەڵام بـۆ وێنـاکردنی گەلاڵـەکـەمان پێویستیمان بە دەستەواژە یا ئیستیلاحێکی تریش هەیە: زاراوە یان دیالێکتی هاوبەش. بەر لە هەر لێکدانەوە و روونکردنەوەیـەك بـا نـەختێك لایـەنگرانـە و هاوڕێیانـە بـۆ بۆچوونەکانی دکتۆر ئەمیر و هاوبیرانی بڕوانین. تائێستا ئێمە رەخنـەمان لـە بۆچـوونی ئەو دۆستانە گرتووە. ئێستا دەمانەوێت گەلاڵەیەك پێشنیار بکەین کە داواکارییەکانی ئەوانیش بە هێند بگرێت و بە خەمساردی بـەلای دڵـەڕاوکـێ و نیگەرانییـەکانیانـدا تێنەپەڕێت. دڵەڕاوکێی سەرەکیی کەسانی وەك دکتۆر ئەمیر پێشێلبوونی مافی بەشێك لە ئاخێوەرانی کوردی زمانە. ئێمە رێز بۆ ئەو دڵەڕاوکێ و نیگەرانییە دادەنـێین، هـەر بۆیە پرسیار لەم بەرێزانە دەکەین کە ئەگەر ئێمە گەلاڵەیەك پێشنیار بکـەین کـە بـە کردەوە هێندەی گەلاڵـەی ئـەوان و بگـرە زیـاتریش رێـز لـە مـافی ئـاخێوەرانی زاراوە جۆراوجۆرەکانی زمانی کوردی بگرێت و هەر لەو کاتەشدا زمانی کوردی تووشی دۆخی ستانداردی سیفر، یان بێ ستانداردی نەکات، ئایا ئەوان لایەنگری لە گەلاڵەکەی ئێمە دەکەن؟ ئایا ئەگـەر ئـەو گەلاڵـەیـە بـۆ پاراسـتنی مـافی ئـاخێوەرانی هـەموو زاراوە کوردییەکان چەند هەنگاویش لە پێشـتر بـوو و راسـپاردەی قـەڵـت و بڕکـردن و بـێ

ڕێزیکردن بە زاراوە جۆراوجۆرەکانی ڕەتکردەوە، ئەوان ئامادەن بیکەن بە پرۆژەیەکی نەتەوەیی و بۆ دابەزاندن و دامەزراندنی یاریدەمان بکەن؟

لەبەرئەوەی هەتا ئێستا لەم وتارەدا بە تێرو تەسەلی جەختمان لەسەر تیۆریکی باسە کردو لێرە بەدواوە بەشێوەیەکی زۆر ساکار و ڕاستەوخۆ بە ئاراستەیەکی ئیجرایی و کردەکیی پێشنیارەکانمان لە چەند خالێکدا دەنووسینەوە.

خالی یەکەم: لە سەرەتای ئەم وتارەدا ئاماژەمان بە هەندێك کێشەی چارەسەر نەکراوی ڕێزمانیی لە زاراوەی کوردیی ناوەڕاستدا کرد. هەروەها گوتمان لەناو زاراوەکانی تری زمانی کوردیشدا کێشەی لە گوێن ئەمانە کەم نین. ئەم نموونانە ئاماژە بە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر دەکەن: ئەم ڕاستییە کە ئەگەرچی ڕێزمانی زاراوە کوردییەکان لەچاو جاران زۆر زیاتر کەوتووەتە بەر سەرنج و لێکۆڵینەوە، بەلام هێشتا کەلێنی تاریکی ئەوتۆ لە هەموو زاراوەکاندا هەن کە کێشە ساز دەکەن. کەوایە ئەگەر ستانداردبوون بە مانا بەرتەسکەکەی، بە مانای تەکووزی و ڕێکوپێکی و ڕێساداربوونی هەرکام لە زاراوەکان لە چوارچێوەی خۆیاندا و جودا لە پێوەندییان لەگەل زاراوەکانی تری زمانی کوردی بزانین، ئەوا پسپۆڕانی هەموو زاراوەکان دەبێت بۆ ستانداردکردنی زیاتری زاراوەی خۆیان هەنگاو هەلگرن. بەگوێرەی ئەم مانایەی ستانداردکردن، ستانداردکردنی هیچ زاراوەیەك بەر بە ستانداردکردنی زاراوەکانی تر ناگرێت. بە دەربڕینێکی تر بەگوێرەی ئەم مانایەی ستانداردکردن، پرۆژەی بە ستانداردکردنی زاراوە جۆراوجۆرەکان پرۆژەی بەیەکەوە کۆنەکراوە (مانعە الجمع) نین. با لە ئەم بوارەدا پێشبڕکێیەکی ئازاد و ئیجابی لەنێوان زاراوەکاندا دروست ببێت. هەر پسپۆڕێك کە بە هەر دەلیلێك دڵسۆزی یەکێك لە زاراوەکانە با لەجیاتی شێواندنی کەشەکە و بە تاوانبار زانینی ئەم و ئەو، بە کردەوە بۆ توێژینەوەی زانستی لەسەر زاراوەی دڵخوازی خۆی هەنگاو هەڵبهێنێتەوە. حکومەتی هەرێمیش با هەم بە ڕاگەیاندن و هەم بە کردەوە، پشتیوانیی خۆی لەم توێژینەوانە نیشان بدات.

خالی دووەم: کاتێك دەڵێین لەناو زاراوە کوردییەکاندا فلانە زاراوە بە ڕەسمی هەڵدەبژێرین دەلالەتی ناڕاستەوخۆی ئەم گوتەیە ئەوەیە کە زاراوەکانی تر نافەرمین. ئەو بە نافەرمیکردنە دەنگدانەوە و ڕەنگدانەوەیەکی زۆر ناخۆشی لە زەین و لە ژیانی

ئاخێوەرانی ئەم زاراوانەدا دەبێت. بۆ ئەو خەڵکە کوردەی بەم زاراوانە دەپەیڤن دەورەی حکومەتی بەعس و حکومەتەکانی بەر لە بەعسیش سیمبۆلی پێشێلکرانی مافە نەتەوایەتییەکانیان و یەك لەوان مافی زمانیانە و لە بەرانبەریشدا حکومەتی هەرێمی کوردستان سیمبۆلی دابینبوونی مافەکانیان و یەك لەوان مافی زمانییانە. هەر لە جێدا ترسێکی زۆر گەورەی حکومەتی هەرێمیش ئەوەیە کە بە رەسمی راگەیاندنی یەکێك لە زاراوەکان، ئاخێوەرانی زاراوەکانی تر (یان بە لانی کەمەوە ئاخێوەرانی زاراوە سەرەکییەکەی تر) بتۆرێن و لە ئەم هەلومەرجە ناسکەدا زەبرێکی گورچکبڕ لە یەکیەتیی نەتەوەیی خەڵکی کورد بوەشێنرێت. زۆر نووسەر و زماناسی کوردیش ئەو ترسە چەند قات دەکەنەوە و خورپە دەخەنە دڵی کاربەدەستانەوە. هەر بۆیە حکومەتی هەرێم بەکردەوە جارێ خۆی لەو پرسە دزیوەتەوە.

لێرەدا زۆر راشکاوانە کاربەدەستانی دڵسۆزی حکومەتی هەرێم دڵنیا دەکەینەوە کە بەگوێرەی ئەو گەلاڵە بەرباسە بە هیچ شێوەیەك پێویست نییە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ یەکێك یان هەندێك لە زاراوە کوردییەکان بە نافەرمی رابگەیەنرێن. با لە دەستووری هەرێم، یان هەر بەڵگەنامەیەکی فەرمیی تر، هەر هەموو زاراوە کوردییەکان بە هێنانی راشکاوانەی ناویانەوە بە رەسمی رابگەیەنرێن.

خاڵی سێیەم: پرسیارێك کە دێتە گۆڕێ ئەوەیە، کە بەم شێوەیە ئێمە چۆن بانگەواز بۆ پرۆژەی بە ستانداردکردنی زمانی کوردی دەکەین؟ بۆچوونی ئێمە لە کوێ لەگەڵ بۆچوونی کەسانی وەك دکتۆر ئەمیر جوداوازی دەبێت؟

وەڵامەکەی ئەمەیە گەلاڵەی ئێمە لەجیاتی ئەوەی بە ئاراستەی وەلانان و یاساغکردندا بچێتە پێش، بە ئاراستەی زیادکردن و جێگیرترکردندا کار دەکات. ئێستا لە بادینان خوێندن بە زاراوەی کوردیی سەرووە. لە هەولێر و سلێمانیش بە زاراوەی کوردیی ناوەڕاستە. ئەگەر پرۆژەی بە ستانداردکردنی زمانی کوردی بە ئاراستەی وەلاناندا کار بکات، ئەوکات ئەگەر کوردیی ناوەڕاست بە زاراوەی رەسمی هەڵبژێردرێت، دەبێت لە بادینان خوێندن بە کوردیی سەروو هەڵبگیرێت و ئەگەریش کوردیی سەروو بە زاراوەی رەسمیی هەڵبژێردرێت، دەبێت لە هەولێر و سلێمانی خوێندن بە کوردیی ناوەڕاست هەڵبگیرێت. هەرکام لەو دوو بڕیارانە بدرێن و جێبەجێ بکرێن، خەڵکێکی زۆر ناڕازی دەبن و حکومەتی هەرێم ئەو ناڕەزامەندییە لە بەرژەوەندیی نەتەوەیی

کورددا نابینێت. پێشنیاری ئێمە ئەوەیە دۆخی زاراوەی کوردیی سەروو لە بادینان وەك خۆی بمێنێتەوە و دەستی لێ نەدرێت و بە لابردن و نافەرمی راگەیاندنی ئەم زاراوەیە مافی کەس پێشێل نەکرێت. دۆخی زاراوەی کوردیی ناوەڕاستیش لە هەولێر و سلێمانی دەستی تێوەر نەدرێت. لەوەش زیاتر ئەگەر بەشێك لە خەڵك کە لە ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێم دەژین و بە زاراوەیەکی جگەلە کوردیی سەروو، یان کوردیی ناوەڕاست قسە دەکەن (بۆنموونە هەورامییەکان) و بۆخۆیان داوا دەکەن خوێندنیان بە زاراوەی خۆیان بێت، با حکومەتی هەرێم زەمینەی جێبەجێکردنی ئەم داوایە ئامادە بکات.

بەڵام هەموو ئەو ئاسانکارییانە تەنیا بەمەرجێك لە بەرژەوەندی بە ستانداردبوونی زمانی کوردیدایە. ئەگەر ئەم مەرجە وەدی نەیەت، ئاکامی بە کردەوەی ئەم هەنگاوانە پەرتەوازەیی و لەیەکترازان دەبێت، نەك یەکانگیری. مەرجەکە ئەمەیە یەکێك لە زاراوەکان لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە وەکو زاراوەی هاوبەش هەڵبژێردرێت. ئینجا سەقامگیرکردنی ئەو زاراوەیە لە قۆناغی یەکەم، لە ناوەندەکانی رەسمیی خوێندن، غەیری ناوچەی رمێنی خودی ئەم زاراوەیەدا دەستی پێ بکرێت. واتە بۆ نموونە ئەگەر کوردیی سەروو وەکو زاراوەی هاوبەش هەڵدەبژێردرێت، سیستمی خوێندن لە بادینان وەکو خۆی بمێنێتەوە. لە هەولێر و سلێمانیش ئەو سیستمە دەستی لێ نەدرێت، بەڵام لەو دوو پارێزگایە بۆ هەر پۆلێك لە پۆلەکانی خوێندن لە یەکەمی سەرەتاییەوە هەتا دوایین پۆلی خوێندن کتێبێك بە زاراوەی هەڵبژێردراو، واتە زاراوەی هاوبەش بە کۆمەڵەی کتێبەکانی قوتابییان زیاد بکرێت. یان بە پێچەوانە ئەگەر کوردیی ناوەڕاست وەکو زاراوەی هاوبەش هەڵدەبژێردرێت، خوێندن لە هەولێر و سلێمانی وەك خۆی بمێنێتەوە و کتێبێك بە زاراوەی کوردیی ناوەڕاست بۆ هەر پۆلێك لە پۆلەکانی خوێندن لە ناوچەی بادینان دیاری بکرێت. لەبەر ئەوە بوو کە گوتمان پرۆژەکەی ئێمە بە ئاراستەی وەلانان‌دا کار ناکات، بەڵکو بە ئاراستەی زیاد کردندا کار دەکات. جوداوازیی ئەو دوو پرۆژەیە لەچیدایە؟ جوداوازییەکە لێرەدایە، ئەگەر بە ئاراستەی وەلانان و یاساغکردندا کار بکرێت، هەر زاراوەیەك کە وەلا بنرێت، ئەوا زیانی پێگەیشتووە و زەبری وێکەوتووە و زاراوەکەی تر کە هەڵدەبژێردرێت، سوودی پێگەیشتووە، بەڵام بەپێچەوانە ئەگەر بە ئاراستەی زیادکردندا کار بکرێت، ئەودەم هەر

زاراوەیەك بە زاراوەی هاوبەش هەڵبژێردرێت ئاخێوەرانی زاراوەکەی تر زیاتر سوود دەکەن، چونکە بەبێ ئەوەی زاراوەی ئەوان لابردرێت و لە خوێندن بە زاراوەی خۆیان بێبەش بن و بەبێ ئەوەی خزمەتی زانستی بە زاراوەکەیان پشتگوێ بخرێت و بە هێند نەگیرێت، ئەوان لەسەر خەرجی حکومەت و بەرە بەرە و ساڵ بە ساڵ بەشێوەیەکی سیستماتیك و بەرنامە بۆ دارێژراو زۆر بە رێکوپێکی فێری زاراوەیەکی تری زمانی کوردی دەبن.

بێجگە لەو پێشنیارە، دەکرێت قسە لە دوو پێشنیاری دیکەش بکەین. یەکێك لەو پێشنیارانە ئەوەیە کە لەجیاتی ئەوەی هەموو کتێبەکان بە زاراوەی ناوچەیی بن و تاقە کتێبێك بە زاراوەی هاوبەش بێت، بەپێچەوانەوە هەموو کتێبەکان بە زاراوەی هاوبەش بنووسرێن و کتێبێکیش لە هەر پۆلێکدا بە زاراوەی ناوچەیی ئامادە بکرێت و لەم کتێبەدا زمان و ئەدەبی ئەم زاراوە تایبەتە رانرابێت. ئەم پێشنیارەی دوایی تا رادەیەکی زیاتر لە خزمەتی پرۆژەی بەستانداردکردنی زمان (بەمانا بەربلاوەکەی)دایە. پێشنیارێکی دیکە ئەوەیە سەرەتا هەتا چەند ساڵان پێشنیاری یەکەم جێبەجێ بکرێت و بەرە بەرە بوار بۆ جێبەجێبوونی پێشنیاری دووەم برەخسێت.

خاڵی چوارەم: رەنگە ئەم پرسیارە بێتە گۆڕێ کە ئێمە باسی جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیەمان هەر بە تەنیا لە بواری خوێندندا کرد. ئەدی لە بوارەکانی تردا، بۆ نموونە لە دایرە دەوڵەتییەکان و هەروەها لە دەزگا رەسمییەکانی راگەیاندندا، دوای هەڵبژێردرانی زاراوەی هاوبەش دەبێت چ گۆڕانکارییەك بکرێت؟ وەڵام ئەوەیە کە با لەم بەشانەدا جارێ هیچ گۆڕانکارییەك نەکرێت. کارەکان هەتا ئێستا بە چ شێوازێك راپەڕیون، لەمەو بەدواش هەر بەم شێوەیە جێبەجێ بکرێن. هەتا ئەوکاتەی وەچەیەك بە جوانی و بە رێکوپێکی بە زارەوەی هاوبەش رادێن. ئەوەدەم ئەگەر تەنانەت وەکو ئێستا بۆ نموونە لە بەرنامەیەکی خوێندنەوەی هەواڵدا، هەواڵەکان بە هەردوو زاراوەش بخوێندرێنەوە، ئەوا هیچ نیگەرانییەك لە گۆڕێدا نییە، چونکە ئەوا لە چاو ئێستا زۆر زیاتر لە راستەرێی بە ستانداردکردنی زمانەکەماندا چووینەتە پێش. ئەوەدەم لە سەرانسەری هەرێمی کوردستاندا وەچەیەکمان دەبێت کە لە خوێندن بە زمان و زاراوەی زگماکی خۆیان بێبەش نەبوون، بەڵام هەموو خەڵکەکەش یان زۆربەیان، بە هەموو

جوداوازییەك كە لە زاراوەكانیاندا هەیە، بە كرمانج و سۆران و هەورامی و كەلهوڕ و هی ترەوە، هەموو شارەزای زاراوەیەكن و بەبێ گرێ و گۆڵ لە یەكتر دەگەن.

بەم شێوەیە راتڵەكانێكی سیاسی و كۆمەڵایەتی لەناو جەماوەردا وەدی نایە هەتا حكومەتی هەرێم سڵی لێ بكاتەوە و هەر بۆیەش جێبەجێكردنی ئەو پرۆژە ژیانەكییە وەدوا بخات. تەنانەت ئەگەر خۆڕاگری و دژایەتییەكیش ساز ببێت بە سەدان قات كەمتر لەو دژایەتییەیە كە بەهۆی پرۆژەی وەلانان و یاساغكردن ساز دەبێت. ئەگەریش ئەم خۆڕاگرییە كزە ساز بوو، قەرار نییە حكومەت هێندە بێ دەستەڵات و لاواز بكرێتەوە، كە حەقی ئەوەی نەبێت نەهێڵێت ئەم دژایەتییانە كاردانەوەی بەكردەوەی دژ بە بەرژەوەندیی نەتەوەیی لێ بكەوێتەوە.

من بە دوو دەلیل هیوادارم پسپۆڕانێكی وەك دكتۆر ئەمیر و باقی زانایانی ئەم بوارە پشتگیری لەم گەلاڵەیە بكەن. بەڵگەی یەكەم ئەوەیە، چونكە بە جێبەجێبوونی ئەم پرۆژەیە مافی كەس پێشێل نابێت و بگرە زیاتر لە پرۆژەی جووت ستاندارد، خاتری ئاخێوەرانی زاراوە جۆراوجۆرەكان رادەگیرێت، كەوایە پێش بە دڵەڕاوكێ و نیگەرانیی ئەوان دەگیرێت.

دووەم: خودی دكتۆر ئەمیر لە شوێنێكدا، بە ئاماژە و بەشێوەیەكی راگوزاری باسی بابەتێك دەكات كە لەگەڵ بۆچوونەكانی ئێمە تەبا و هاوئاهەنگە. دكتۆر ئەمیر لە وتارێكیدا دەنووسێت:

"لەگەڵ ئەوەشدا لە كۆمەڵی فرە لەهجەییدا لەهجەكان نابەرابەرن، هەر لە چوارچێوەی ئەو سیستمەدا دەكرێت پێوەندیی زمانیی بەتایبەت پێوەندی لەهجەكان وا دابڕێژرێت و رێك بخرێت كە هەڵاواردنی زمانیی كەمتر بكرێت و ئاخێوەرانی لەهجە نافەرمییەكان مافی زمانی و مرۆڤییان پێشێل نەكرێت. دیارە لە چوارچێوەی فرە زماندا پێویستە زمانێكی هاوبەش هەبێت كە خەڵكی فرەزمان بتوانن دەكاری بێنن و پێی بدوێن..."[11].

دكتۆر ئەمیر دەڵێت پرۆژەیەك دابڕێژرێت ئاخێودرانی زاراوە نافەرمییەكان مافی زمانی و مرۆڤییان پێشێل نەكرێت. واتە تەنانەت ئەوەشی قبووڵ كردووە هەندێك لە زاراوەكان نافەرمیی بن بەو مەرجەی هەتا رادەیەكی گونجاو خزمەتیان بكرێت و حەقیان بدرێت. بۆیە دەڵێین گەلاڵەی ئێمە لەباری پاراستنی مافی ئاخێوەرە

جۆراوجۆرەکان، تەنانەت چەند هەنگاو لەپێشترە، ئەو گەلاڵەیە تەنانەت ئیزنی ئەوە نادات زاراوەکانی تر راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ بە نافەرمیش دابنێن.

لە ئەو قسەیەی دکتۆر ئەمیردا راستە باسی پێویستیی هەبوونی زمانێکی هاوبەش لەناو وڵاتێکی فرە زماندا دەکرێت، چونکە هەر بۆخۆی لە زۆر شوێندا دۆخی وڵاتانی فرە زمان بۆ وڵاتێکی فرە زاراوەی وەك کوردستانیش بە نموونە دەهێنێتەوە، کەوایە ئێمەش دەتوانین هیواداربین کە بەڕێزیان و هەموو دۆستانی تر کە بۆچوونیان لەو نزیکە بۆ پێویستیی هەبوونی زاراوەیەکی هاوبەشیش لە وڵاتێکی فرە زاراوەدا دەنگی ئەرێ بدەن.

## پەراوێزەکان:

١- (نقل به مزمون) شێخولئیسلامی، جەعفەر، دیالۆگێك لەگەڵ ملمۆستا جەمال نەبەز، گۆڤاری مەهاباد ژ ٨٨، ل١٦-١٤.

٢- وەرگیراو لە وێبلاگی بەڕێز حەسەن قازی http://ruwange.blogspot.com

٣- حەسەنپوور، ئەمیر، "فەرهەنگی زارەکی" لە خولی تەکنۆلۆژیی زماندا، وەرگیراو لە: پایانیانی، سەلاح، فەرهەنگی زارەکیی موکریان، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رەهەند، مەهاباد، ١٣٨٥.

٤- حەسەنپوور، ئەمیر، شۆڤینیزمی سۆرانی و ئەفسانەکانی، بەشی یەکەم:
http://ruwange.blogspot.com

5- حەسەنپوور، ئەمیر، "فەرهەنگی زارەکی" لە خولی تێکنۆلۆژیی زماندا، وەرگیراو لە: پایانیانی، سەلاح، فەرهەنگی زارەکیی موکریان، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی رەهەند، مەهاباد، ١٣٨٥.

6- شێخولئیسلامی، جەعفەر، وەرگیراو لە:
http://ruwange.blogspot.com

٧- قزڵجی، موحسین، سەرجەمی بەرهەمی حەسەن قزڵجی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٢٢٨-١٩٤.

٨- حەسەن پوور، ئەمیر، شۆڤینیسمی سۆرانی و ئەفسانەکانی. بەشی یەکەم وەرگیراو لە:
http://ruwange.blogspot.com

٩- بڕوانە بۆ: سارلی، ناصر قلی، زبان فارسی معیار، انتشارات هرمس، تهران، ١٣٨٧، ص٩٧-٩٣. ناو و نیشانی وتاری فێرگۆسۆن بەم چەشنەیە:

C.A.Ferguson,The Language Factor in National Development,1962,pp 267-71, Sociolinguistics Perspectives

١٠- گوتوبێژی ناسری سینا لەگەڵ ئەمیری حەسەن پوور، نەوزادی هرۆری و حەسەنی قازی. وەرگیراو لە:

http://ruwange.blogspot.com

١١- بڕوانە:

http://ruwange.blogspot.com/2010/03/blog-post.html

## پێناسە:

- دکتۆر ڕەهبەر مەحموودزادە،ساڵی ١٣٥٤ی هەتاوی لە شاری شنۆ لەدایك بووە.
- خاوەن بڕوانامەی دکتۆرای فەلسەفەی زانست، لقی "فەلسەفەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان"ە.
- جگەلە ڕشتەی دەرسیی خۆی، لە بوارەکانی زمان و ئەدەب و بەتایبەت زمان و ئەدەبی کوردی خەریکی لێکۆڵینەوەیە.
- لە ساڵی ١٣٨٢ کتێبێکی بەناوی "پێکهاتەی بەیتی کوردی" لەلایەن ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە بڵاوبووەتەوە و تائێستا چەندین وتاری، ڕەخنەیی، لێکۆڵینەوە و زانستی و هەروەها لە بواری زمانەوانیی کوردیی لە گۆڤارە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان بڵاوبوونەتەوە و مامۆستای زانکۆی شنۆیە.

## خەسارناسیی وشەسازی لە زمانی کوردیدا.

## لێکۆڵینەوەیەکی شیکاریی و ڕەخنەیی دەربارەی کێشەکانی وشەسازی

کامەران رەحیمی- ئیلام

زمانی کوردی بەتایبەت لە کوردستانی ئێران هەنووکە دەرفەتی فێرکاریی گشتی بۆ نەڕەخساوە... شیاوترین و لۆژیکترین ستراتیێژی بۆ ئەم کێشەیە ئەوەیە، کە پرۆژەی وشەسازی هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ فێرکاریی گشتیدا بەرەوپێش بڕوات.

کورد، وەك نەتەوەیەکی خاوەن زمان و ئەزموون هەرچەند بە ئاستەم و وردە وردە چووەتە بازنەی شارستانییەتی مۆدێرنەوە، بەڵام تەنیا زانستی چەند لایەن و راپەڕینی زمانی دەتوانێت لەم گێژاوە رزگاری بێت. بێگومان هەر بوونەوەرێك تەنیا لە رێگەی "زاوزێ"وە، دەتوانێت نەسڵ و رەگەزی خۆی لە فەوتان رزگار بکات. زمانیش وەکو هەر بوونەوەرێك تەنیا لە رێگای وشەسازییەوە دەتوانێت خۆی بپارێزێت. درسلر (dressler) دەڵێت: "کەڵك وەرنەگرتن لە پرۆسەی وشەسازیدا، یەکێکە لە نیشانەکانی مەرگی زمان" (بخارا، ش٦٣:٢٢٤).

لەم سەردەمەدا ئەگەر هەر نەتەوەیەك بەشێوەی زانستییانە و چالاکانە لەسەر زمانی بەتایبەت لە بواری وشەسازیدا کار نەکات. رەنگە لە داهاتوودا زمانەکەی نەزۆك بکەوێتەوە. وردە وردە پرۆسەی نەمان و فەوتانی دەست پێ بکات. ئەم مەترسییە تایبەتترە بۆ ئەو نەتەوانە کە سنوور و دەسەڵاتی سیاسییان نییە، هەروەها خاوەن پەروەردە و فێرکاریی گشتی نین و لەگەڵ گەلانی تردا تێکەڵن.

بەلای منەوە پرۆژەی وشەسازی لە کوردیدا بەردەوام رووبەڕووی سێ گرفت بووەتەوە: یەکەم، نەبوونی بەرنامە و پلانێکی تایبەت لەم زەمینەدا. دووەم، ئامادەبوونی روانگەیەکی سەلەفییانە بۆ زمان کە دژ بە وشەسازی دەوەستێت.

سێیەم، ئەو بۆچوونە کە دەڵێت چاکترین شێوە کەڵکوەرگرتن و کارهێنانی خودی وشە بیانییەکانە. لەڕاستیدا ئەو کەسانەی دژ بە وشەسازین بە کارێکی پێویست نازانن بە گومانم تا رادەیەکی زۆر ئاگایان لە واقیعی زمانی کوردی نییە و خۆیان و زمانەکەیان داوەتەپاڵ دروشمێکی رەسەنایەتیخوازانە.

ئێمە وەك کورد لە چوار وڵاتدا دەژین و زمانەکەمان لەگەڵ سێ زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی لە دانوستاندایە و بەردەوام وشە و دەستەوشەی ئەو زمانانە دەکەوێتە سەر زاری ئاخێوەرانی زمانی کوردی و ئەگەر بڕیار بێت ئێمە ئەمە وەك دۆخێکی ئاسایی چاو لێبکەین و لە زمانی نووسینیشدا ئەم دۆخە بچەسپێت، ماوەیەکی زۆری

پیێ ناچێت بۆ فێربوونی زمانی کوردی ناچار دەبین ئەو سێ زمانەی تریش فێربین و لە واقیعدا دۆڕاندنی ڕەسەنایەتی زمانەکەشی لێ دەکەوێتەوە.

هەڵبەت پێویستە ڕووناکبیران و نووسەران سەرنج بۆ ئەم خاڵە گرنگە ڕابکێشن ئەگەر ئەم کۆمەڵە وشە نوێ و داتاشراوانە، کە ئێستا هەمانە، نەبوایە، زمانی کوردی ئێستا لەم ئاستەدا نەدەبوو، بەڵکو دواکەوتووانە وەکو ڕابردوو و تەنیا زمانی شیعر و گۆرانی بوو.

بە کورتی پرۆژەی وشەسازی لای ئێمەی کورد کەمتر لە نیو سەدەیە دەستی پێکردووە و دەبێت وەکو هەر بزووتنەوەیەك، بە جیدی بخوێنرێتەوە و خەسارناسی بکرێت و لایەنە باش و خراپەکانی دەستنیشان بکرێت، تا لە داهاتوودا بەشێوەیەکی باشتر و پسپۆڕانەتر ئەم بزووتنەوەیە ڕێبەری بکرێت.

### ١- ناسیۆنالیزم و فرە وشەسازی:

وشەسازی و هاوتاسازی بە ئامانجی گەیشتن بە زمانێکی پەتی و ڕەسەن لە کوردی نویساریدا زۆر بەرچاوە. تا ڕادەیەك ئەگەر چەند دێڕێکی کتێب، یان ڕۆژنامەیەکی ئەم چەند ساڵەی دوایی هەڵسەنگێنیت. تێدەگەی دەقەکان زیاتر ٩٠٪ بە کوردیی پەتی نووسراون. بێگومان بیری پەتی نووسین ڕەنگدانەوەی ڕوانگەی ناسیۆنالیستییە بۆ زمان.

ڕۆشنبیری کورد تێکۆشاوە تا بە پێکهێنانی زمانێکی ڕەسەن، سنوورێك بۆ خۆی دیاری بکات. پاشان بۆئەوەی سنووری وڵاتەکەی پتەوتر و بەرچاوتر بکاتەوە، زمانەکەی پەتیتر و کوردیتر کردووە، لە کاتێکدا پێویست نییە زمانێك ئەوەندە پەتی بکرێتەوە. ئێستا لە جیهاندا هیچ زمانێك نەدۆزراوەتەوە کە ١٠٠٪ پەتی بێت. هەڵبەت ڕەنگە تەنیا زمانی خێڵە دواکەوتووەکانی ئامازۆن و ئەفریقا و... بەهۆی نەبوونی دانوستان و پێوەندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەیان ڕەسەن مابن.

بۆ نموونە زمانناسان لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەو ئەنجامە گەیشتوون لە ٩٩٠٣ وشەی ڕۆمانی ٣٥٦٦ وشە بیانین (احمدی گیوی، ١٣:١٣٧٢). یان زمانی فارسی بەو دەسەڵات و مێژوو کۆنەوە پڕە لە وشەی عەرەبی و مەغوولی و تورکی و ئینگلیزی و فەڕەنسی و کوردی و تەبەری و مازەندەرانی و سوغدی و... لەم بارەیەوە مامۆستا بەهار لە کتێبی "سبك شناسی"دا دەنووسێت: "لە سەدەکانی شەشەم، حەوتەم و هەشتەم

پەخشانی فارسی ٨٠% عەرەبییە..."(بهار، ١٣٤٩: ١٢١). هەر ئێستاش هەر دەقێکی فارسی لێکبدرێتەوە، نزیك بە ٦٠%ی تەنیا عەرەبییە... کەچی لە هەموو جیهان فارسی وەك زمان ناسراوە و لە هەموو بوارێکدا توانایی و چالاکی هەیە.

پێویست بە وتنە بیری پەتی نووسین لە فارسیدا کە لە سەردەمی ڕەزاخان دەستی پێکرد، ئێستا برەوێکی وای نەماوە.

ڕوانگەی ناسیۆنالیستی بە زمانی کوردی لایەنی باشیشی هەبووە کە لێرەدا بە کورتی ئاماژەی پێدەکەین:

١- زمانی کوردی بووەتە زمانی نووسین و ڕۆژنامەگەری و سیاسەت و وەرگێڕان و...

٢- هەزاران وشەی نوێ و جوان و ڕێکوپێك هاتوونەتە نێو زمانی کوردییەوە و بوونەتە مایەی بووژانەوەی زمانی کوردی.

٣- دەرفەتێکی بۆ زمانی کوردی ڕەخساندووە، ئەگەرەکان و تواناکانی خۆی بنوێنێت.

٤- پڕۆژەی وشەسازیی، زمانی کوردیی لە نەزۆکایەتی دەرباز کرد.

٥- ڕەسەنایەتیی زمانی نووسین تا ڕادەیەك لەسەر زمانی قسەکردنی خەڵك کاریگەری هەبووە.

بەڵام لایەنی خراپی ئەم ڕوانگەیە بۆ زمان ئەوەیە کە زمانی کوردی بەهۆی نەبوونی باڵانس و هاوسەنگی لەنێوان فێرکاریی گشتیی و فرە وشەسازیدا بووەتە زمانێکی دەستکرد و تا ڕادەیەك پێوەندیی لەگەڵ خەڵك دوڕاندووە. بۆ وێنە لە کوردستانی ئێران زۆربەی حەوتەنامەکان، گۆڤارەکان، وەرزنامەکان جیا لە "سروە" بەشێك لە وتارەکانیان بۆ زمانی فارسی تەرخانکردووە. ئەم کارە ناتوانێت بەشێوەیەکی پاڵەکی نیشاندەری ئەوە بێت. زۆربەی خەڵك لەم زمانە تێناگەن و نایزانن، ڕەنگە هەندێك بڵێن ئەم کارە بۆ دروستکردنی پردێکە لەنێوان نەتەوەکانی تر، بەتایبەت فارس. بەڵام ئەم تێڕوانینە کاتێك ڕاستە کە چاپەمەنییەکان بەشێوەی ڕۆژنامەی سەرانسەری بڵاوبنەوە، نەك ناوچەیی.

ئەم دەستکردی بوونەی زمان بە ڕادەیەك لای نووسەران و شاعیران باو بووە، کە ڕستەی "کابرا کوردی نازانێ..." لەگەڵ خۆی هێناوەتە نێو گەمەکە. خودی ئەم ڕستە

تا ڕادەیەك نیشاندەری دەستکردی بوونی و نەك سروشتی ئەم زمانەیە، ئەگینا چۆن دەبێت کوردێکی خوێندەوار، زمانی دایکی خۆی نەزانێت، بێگومان مەبەستی نووسەرانی کوردیزان، نەزانینی زمانی نووسینە و فامکردنی وشە داتاشراوەکانە، چونکە هەرکەسێك بەشێوەی سروشتی ئاگاداربیەکی تەواوی هەیە بەسەر هەموو بەشەکانی زمانی دایکی خۆیدا. وەك: ڕێزمان، دەربڕینی وشە، دەزگای واچی و مانایی.

فرە وشەسازی لە زمانی کوردیدا بەو قۆناخە گەیشتووە کە بۆ وشەگەلێك هاوتاسازی کراوە کە نموونەی لە دیکەی زمانە ئێرانییەکان لە ئێران و ئەفغانستان و تاجیکستان و پاکستان نەبینراون، بۆ وێنە: کۆمار، سەرۆك، نەتەوە، گەل، گۆڤار، بنەما، سەرچاوە، لاپەڕە، ئەندازیار، ڕێنووس، بەرکار، کۆمەڵ، هۆنراوە، دەق، وێژە، دەنگ (vote)، تومار،...

ئایا هاوتای ئەو وشانە لە زمانی فارسیدا نییە، یان فارس بەو هەموو دەسەڵاتەوە ناتوانن بۆ زۆربەی ئەو وشانە کە سەدان ساڵە لەسەر زاری خەڵکن، واتاسازی بکەن؟

وەڵامی ئەم پرسیارانە روونە، چونکە بە وردە سەرنجێك لە زمانی فارسی و گەڕانێك لەنێو قامووسەکاندا سەدان وشە دەبینین کە دەتوانن بۆ هاوتاسازی بە کاریان ببەن بۆ وێنە:

چنگار (لە بەرامبەری سەرەتان)، خدو (بزاق)، اخشیج (تناقض، عنصر)، اهنجیده (انتزاعی)، ایشنە (جاسووس)، پالوغ (مقایسە)، بیوسیدن (طمع داشتن)، وچر (فتوا)، وچرگر (مفتی).

بوسە و نظرت حلال باش باری

حجت دارم بر ای سخن ز وچرگر

(لبیبی سەدەی ٤)

(لبیبی سەدەی ٤)

بەڵام قەت ئەم وشانە کاربردیان نەبووە، چونکە دەوری سەرەکیی زمان پێوەندی لەگەڵ خەڵکە، هەروەها گواستنەوەی پەیامە بە یارمەتی وشە، ئەگەر لە بواری وشەسازیدا فرەکاری (ئیفرات) بکرێت پێوەندیی زمان لەگەڵ خەڵك هەڵدەپچڕێت، پاشان لە ئەنجامدا زمانێکی دەستکرد و ڕەمزی پێکدێت کە تەنیا نووسەران تێدەگەن و پێی دەنووسن، لەکاتێکدا زمان بۆ تێگەیشتنە نەك بۆ تێکدان...

بێگومان گرنگترین ئەرکی وەرگێڕان و زمانەوانانی کورد لە هەنگاوی یەکەمدا کۆکردنەوە و دەستەبەندیی وشە بیانییەکانە، پاشان هاوتاسازییە بۆ ئەو وشانە، کە پڕ کاربردن، چونکە پێویست نییە بۆ هەموو وشە بیانییەکان کە لەسەر زاری خەڵکن، هاوتاسازییان بۆ بکرێت.

لە لایەکی ترەوە گەلێك وشە هەن کە نێونەتەوەیین و لە هەموو زمانانی جیهاندا جێگر بوون، ئیتر زۆر پێویست نییە، ئێمە خۆمان بۆ هاوتاسازیی ئەو وشانە ماندوو بکەین، بۆ وێنە: ئۆکسیژن، ئیدرۆژن، ئینرژی، تەلەفزیۆن، تەلەفۆن، رادیۆ، کۆنگرە، گرافیك، ترافیك، سینەما، فیلم، کراوات، پیتزا، سالاد، سوپ و...

هەڵبەت هاوتاسازی و وشەسازی وێڕای نواندنی توانایییەکانی زمان، زەخیرەی زمانیش چالاك دەکات کە ئەمە زۆر باشە، بەڵام هەروەك ئاماژەمان کرد فرەکاری لەم بوارەدا دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی ئاسایی و تەنانەت خوێنەری ئەدەبیاتی کوردی لە زمانی خۆی دوور بکەوێتەوە، پاشان نووسینی دەق بێ مانا دەبێت. رۆشنبیرانی کورد دەبێت ئەم خاڵە گرنگە لەبەرچاو بگرن کە زمانی کوردی، بەتایبەت لە کوردستانی ئێران هەنووکە دەرفەتی فێرکاریی گشتی بۆ نەڕەخساوە...

شیاوترین و لۆژیکترین ستراتیژی بۆ ئەم کێشەیە ئەوەیە، کە پرۆژەی وشەسازی هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ فێرکاریی گشتیدا بەرەوپێش بڕوات، یان بۆ وشە بیانییەکان هاوتاسازی بکەین، بەڵام هەر خودی وشە بیانییەکان ماوەیەکی تایبەت بەکاربهێنن پاشان کاتی خۆی جێگریان بکەین. هەر ئەو کارە کە ئاکادیمی ئێران، یان تورکەکانی ئێران دەیکەن.

هەڵبەت لە دانوستاندن و قەرزکردنی وشەدا رەنگە بە رێکەوت دۆخێك سەرهەڵبدات کە وشە بیانییەکان لە ماوەیەکی دوورودرێژدا لەنێو زمانەکەدا بە جلوبەرگی تازە و مانای جیاواز و دەربڕینی تایبەتی کوردییەوە ببن بە وشەیەکی خۆماڵی وەکو ئەم وشە عەرەبییانە کە لە فارسیدا مانایان گۆڕدراوە و ئێستا بوونەتە موڵکی زمانی فارسی:

| کوردی | فارسی-عەرەبی | عەرەبی |
| --- | --- | --- |
| نەتەوە | ملت | شعبه |
| نیشتمانی | ملی | قومی |
| کۆمەڵگا | جامعه | مجتمع |
| دانوستان | مزاکره | مفاوضة |
| جەماوەر | جمعیت | سکان |
| تۆڕ | شبکه | قناة |

لە زمانی کوردیشدا دەتوانین بەم وشانە ئاماژە بکەین کە لە ماوەیەکی دووروودرێژدا رەنگ و بۆنی کوردی بەخۆیان گرتووە، بۆ وێنە:

هەوەجە (حاجت)، بوسڵمان (مسلمان)، هەڵە/خەڵەت (غلط)، فام (فهم)، سپڵە (سفله)، یانێ (یعنی)، مانا (معنی)، سوژدە (سجده)، گیروگرفت (هەرەگیر و گرفتی فارسییە لە چاوگی "گرفتن" کەلە کوردیدا چاوگی بەرامبەرەکەی دەبێتە گرتن)، خزمەت (خدمت)، هەواڵ (احوال)، باس (بحث)، زامەت (زحمت)، خەڵك (خلق)، خوڵك (خلق)، شلوق (شلوغ)، متمانە (مطمئن) و...

## ٢- جیابوونەوەی زمانی نووسین لە زمانی قسەکردن:

لە هەر زمانێکدا چەند چەشنە زمان (variety) وەك نووسین، ئیداری، وەرگێڕان، شیعر، وێژە و ئەدەب، ئاخافتن و... هەیە. لە رابردوودا ئەدیبە سەلەفییەکان، زمانی ئەدەبیان بە بناغەی هەموو چەشنەکانی زمان دەزانێت، بەڵام دوای پێشکەوتن و گۆڕانکاری زانستی زمانناسی، ئێستا ئەم بابەتە، بابەتێکی سەلمێندراوە کە زمانی ئاخافتن زمانی سەرەکی و بناغەییە. هەروەها زمانناسان و رەخنەکارانی گەورەی ئەم سەردەمە لەسەر ئەوە جەخت دەکەن کە باشترین و شیاوترین و بەهێزترین زمان، زمانێکە کە پێوەندی لەگەڵ زمانی قسەکردنی خەڵك پتەوتر و نزیکتر بێت، چونکە سەرچاوەی زمانی نووسین لە بناغەدا زمانی ئاخافتنە، هەر ئەوەندە زمانی نووسین شانبەشانی زمانی قسەکردن بەرەوپێش بچێت. فێربوونی بۆ هەموو خەڵك لە هەموو سەردەمێکدا ئاسانترە، چونکە زمانی قسەکردن بەهۆی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی لە

هەموو ئاستێکدا وەك: وشە و واچ و مانا و ڕێزمان دەگۆڕێت، لەکاتێکدا زمانی نووسین بەهۆی نووسین و تۆمارکردن تا ڕادەیەك زمانێکی نەگۆڕترە.

هەڵبەت مەبەست ئەوە نییە کە زمانی نووسین و زمانی زانستی لەگەڵ زمانی لادێیەکان و کۆچەرەکان، یان کوچە و کۆڵانەکان یەکێك بن، بەڵکو مەبەست ئەوەیە گۆڕانکاری و بوژانەوەی زمانی نووسین دەبێت لە سێبەری زمانی ئاخافتندا بێت. ئەگینا جیابوونەوەی زمانی نووسین لە داهاتوودا قەیرانی تێگەیشتن بەهێزتر دەکات. هەر ئەو کێشەیە کە ئێستا زمانە فەرمییەکانی وەکو: فارسی، ئینگلیزی و فەڕەنسی و عەرەبی و... تووشی بوون. بۆ وێنە خوێندەوارانی ئینگلیزی بە سەختی لە زمانی چاسر و شکسپیر تێدەگەن، لە فارسیشدا هەروایە، بۆ نموونە لە کاتی ڕەسمیبوونی "فارسیی دەری" لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا هەموو دەقەکان بەتایبەت شیعر بە زمانی قسەکردن نزیك بوون، هەربۆیە ئێستا یەکەمین کتێبی پەخشانی فارسی یانی "شانامەی ئەبوو مەنسووری" یان "تاریخی بەلعەمی" بۆ زۆربەی خەڵك تەنانەت قوتابییانی سەرەتاییش کەم تا زۆر فام دەکرێت.

بەڵام لە سەدەی شەشەمەوە تا پەنجا ساڵی ڕابردوو- کە سادە نووسین لەلایەنی نووسەرانی نوێخوازی وەکو عەلامی، قائم مەقامی فەراهانی، موحەممەد عەلی جەمالزادە، سادق هیدایەت و... گرنگییەکی ئەوتۆ پێدرا - زمانی فارسی دەری بە وتەی "داریووش ئاشووری" بووەتە "زمانی دەری وەری" (واتا: زمانی لاژەلاژ). هەر ئەم ڕۆشنبیرە دەنووسێت: "گەورەترین گیروگرفتی پەخشانی فارسی جیابوونەوەی وردە وردەی زمانی نووسینە لە زمانی قسەکردنی خەڵك کە لە ئەنجامدا گەیشتەوە ئاستێك کە ئێستا دەتوانین بێژین بوونەتە دوو زمانی جیا لە یەك. بێگومان لە هەر زمانێکدا ئەم جیابوونەوەیە تا ڕادەیەك سروشتییە، بەڵام لە زمانی فارسیدا ئەمە بووەتە قەیران، جا ئەم کێشەیە بەباشی نیشان دەدات کە خەڵکی ئاسایی ئەگەر بخوازن دێڕێك بنووسن، سادەترین و سروشتیترین ڕستەکان کە لە بەردەستیاندایە فەرامۆشی دەکەن و لە شوێنی ڕستەگەلێکی ئاڵۆز دەگەڕێن، کە ئەنجامی وەها نووسینێك، نووسینێکی گەمە و قەشمەرییە (ئاشووری ١٣٧٥: ١٤)".

ئەمڕۆژە سادەنووسین بەهۆی چاپەمەنیی زۆر و فێرکاریی گشتی، وەرگێڕان، ڕۆژنامەوانی، کاریگەریی زمانناسی و... لە زۆربەی زمانەکانی جیهان گرنگی

پێدەدرێت تا رادەیەك كە ئێستا لە دەزگاكانی راگەیاندن وەكو رادیۆ و تەلەفزیۆن لە جێگەی هەواڵەكان بە زمانی رەسمی، هەواڵەكان بە زمانی خەڵكی ئاسایی بڵاو دەكەنەوە، بەڵام بەداخەوە لە زمانی كوردی تا ئێستا بیر لەم دۆخە نەكراوەتەوە كە رەنگە لە داهاتوودا ئەو كێشەیەی كە باسمان كرد، ببێتە یەكێك لە گەورەترین كێشەكانی زمانی كوردی.

بۆ ئەنجام گەیشتنی باسەكە پێویستە ئاوڕ بدەینەوە لە دەقەكانی رابردوو، بۆ وێنە زمانی نووسراوەكانی مەحوی و نالی و فایەق بێكەس و مامۆستا هەژار و شوكور مستەفا و عەلائەدین سەجادی و... لە دەیەكانی پێشوودا ئەوەندە سادە و بە زمانی خەڵك نزیكن، كە نەك تەنیا بۆ كوردە سۆرانییەكان، بەڵكو بۆ زاراوەكانی تریش وەك كوردی باشووریش لە ئیلام، كرماشان و خانەقین... فام دەكرێت.

لێرەدا وەكو بەڵگە، چەند دەقی سادە دەخوێنینەوە تا بە باشی بزانین ئەوانە كە هەمووی تەمەنیان لەگەڵ زمانی كوردی ژیاون دوای پەنجا ساڵ نووسەری بە چ شێوەیەك نووسیویانە:

شوكر موستەفای رەحمەتی لە گۆڤاری ئەكادیمی دەنووسێت:

"ئەوەت لەبیر نەچێت كە سیفەتی كارایی ئەگەر "ندە"ی لە پاشەوە پێوە بلكێ".

"راستیت گەرەكە، ناكرێ لێرەدا من هەرچی دەسەڵاتی زمانی كوردی هەس گشتی لەم وتارەدا وەسەر كەمەوە، دیارە مەرامم لە وەبیر هاوردنەوەی ئی قاڵب و میسالەیلە ئەوەیە كە كەسێ خۆی ئەڕای زاراوە دارِژترین خرِهاڵ داوێ تەنیا زمان زانی بەش كارەكە نێكا..." (مستەفا شوكور، ئاكادیمی، ژا، ٢٠٠٢: ١٢٥)

یان مامۆستا هەژار لە پێشەكی هەنبانەبۆرینەدا دەنووسێت:

"هەر وشەیەك بۆنی عارەبییەكی كۆنی یان فارسییەكی مردووی هەزار ساڵەی لێ بێت ئەو زانا كوردپەروەرانە پێ شێت دەبن وەك دزێكیان لەناو كادێندا گرتبێ... دەیدەنە بەر پلار و جوێن، كارێكی بەسەر دەهێنن دۆم بە ژنێ خۆی نەكردبێ ئاوڕووی ویژەری وشەكەش بە مەردی كاورای پیوازفرۆش ئەوەن! مەڵێ قەڵەم، بێژە پێنووس، مەیژە كاغەز! بویشە تێنووس. نەبیژە دەفتەر بڵێ پەڕاو".

- ئێمە ئەبێ زوانەكەمان لە وشەگەلی بیانی و نامۆ هەڵوەژێرین.

- خێرە ئیشاڵڵا، دەی خودا موبارەكی كات.

- "مبارەك" و "خێر" و "ئیشاڵڵاش" لەوانەن کە دەبێت شاربەدەر کەین، کەسیش نییە پەنامەکی دە گوێی یەکێك لەم تازە بابەتانەدا بسرکێنێ: کاکی هەڵەی پڕ لە پەڵە! کامە گەلی هەرزەلی هەرە دارا و هەرە رزگاری سەرزەوی گومان ئەبەی، زمانەکەی وشەی نامۆی تێدا نەبێ؟ ئینگلیز؟ ئەڵمانیا؟ فەرەنسا؟ رووسیا؟ کەست دیون، لێت پرسیون؟ تا پێت بڵێن لە سەتا چەندی زمانیان لە یەکتری خواستووەتەوە؟ لە رێزمانەکانی ئۆردی، دەری، فارسی و بەنگالی شارەزای؟ تورکی ئەستەنبۆل دەزانی؟ کە تا ملان لە عارەبی ئاخنیاون. رەنگە مەبەستت زمانی عەرەبی بان بێت؟ داخی گران کە عارەبیش وەك پێویست نازانێت، تا بزانێت ئەو زمانە وا پان و پۆڕ و بەربلاو بووە کە هەزار و چوارسەد ساڵە، پێنجسەد ملیۆن موسوڵمان خزمەتی دەکات، بە هەزاران وشەی نامۆی لەناو خۆیدا پەنا داوە. تەنانەت قورئانی پیرۆز- کە لە پاکی و رەوانیدا مۆجیزاتە- دەیان وشەی نەژادی رۆمی، سانسکریتی، پەهلەوی، یۆنانی، کوردی و ئارامی تێدایە، وەکو: برهان، دین، ملکوت، گوبی، رضوان، فردوس، رائك، زرابی، نمارق، کافور، کاس، قواریر، زنجبیل، سندس، استبرق، مائدە، رزق، زخرف، سراج، صراط، رهبان، قسطاس..." (هەژار، ١٣٦٩:٢٤).

رەنگە هەندێك بێژن زمانی نووسینی ئەم نووسەرانە زۆرتر زمانی ئەدەبی و شیعری بووە، نەك زمانی زانستی و فەلسەفی و فەنی؟

لە وەڵامدا دەبێت ئاماژە بە کتێبی زانستی "زمانی یەکگرتووی کوردی" د. جەمال نەبەز بکەین. کە زۆر شارەزایانە دەقێکی تایبەتی و زانستی لە بواری زمانناسی لە ساڵی ١٩٧٦ بە زمانی سادە و پاراو نووسیوە.

کەچی لەم سەردەمەدا تێگەیشتن لە هەموو دەقەکان بەهۆی دژوار نووسین، فرە وشەسازی و جیابوونەوە لە زمانی خەڵك نەك تەنیا بۆ کوردەکانی باشوور (ئیلام، کرماشان، خانەقین)، بەڵکو بۆ کوردەکانی ناوەڕاستیش تا رادەیەك ئەستەمە و خوێنەر دەبێت هاوکات لەگەڵ خوێندنی دەق لە فەرهەنگی وشەی نوێ -کە بەداخەوە نیمانە- کەڵك وەربگرێت.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم لە توێژەران و کۆمەڵناسان بخوازم لە لێکۆڵینەوەیەکدا ئاست و رێژەی تێگەیشتنی جەماوەر لە زمانی نووسینی کوردی لەم سەردەمەدا دیاری

بکەن، تا ببێت بە سەرچاوەیەکی جێ متمانە بۆ میزانی کەڵکوەرگرتن لە وشە داتاشراوەکان لە زمانی نووسیندا.

خەسارناسیی وشەسازی لە زمانی کوردیدا[٢].

لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری و ڕەخنەیی دەربارەی کێشەکانی وشەسازی.

لەکاتێکدا زۆربەی نووسەرانی کورد لە شوێنی ڕەسەنایەتیی زمان دەگەڕێن بۆ پاڵاوتنی زمانی نووسین تێدەکۆشن، دەبێت ئەم خاڵە سەرەکییە لەبەرچاو بگرن لە هیچ زاراوەیەکدا ڕەسەنایەتی کۆ نابێتەوە، بەڵکو هەموو زاراوەکانی زمانی کوردی بەقەد توانای خۆیان بەشێکیان لە ڕەسەنایەتیی زمانی کوردیی کۆن، پاراستووە.

### ٣- ژمارەی بڕگەی وشە:

زۆربەی زمانەکانی هیندۆئەورووپایی کۆن، کار و جێناوی مێ و نێر هەروەها دۆخەکانی بەرکاری و ئیزافەیان هەبووە، بەڵام ئێستا ئەم تایبەتمەندییانە لەنێو زمانانەدا نەماوە. بە وتەی زمانناسان هۆی سەرەکی ئەم گۆڕانکارییە کە هەموو زمانەکان وردە وردە سادەتر بن، بەتایبەت بڕگەکانی وشە، ڕۆژ بەڕۆژ کورتتر دەبنەوە.

لە زمانی کوردیدا هەندێك وشە داتاشراون کە ژمارەی بڕگەکانیان لە هاوتاکەیان فرەترە. وەکو "لێکۆڵینەوە" کە پێنج بڕگەیە، لەکاتێکدا هاوتاکەی لە عەرەبی (تحقیق) دوو بڕگە، لە فارسیدا (پژوهش) سێ بڕگەیە. لە هەموو سەیرتر، وشەی "ئاوەڵکردار" کە چوار بڕگەیە، لەکاتێکدا هاوتاکەی (قەید) یەك بڕگەیە. ئەگەر بخوازی بنووسی قەیدقەید، دەبێت بێژی ئاوەڵکرداری ئاوەڵکردار، کە ٩ بڕگەیە. بەلای منەوە ئەم شێوازە، واتە درێژبوونی ژمارەی بڕگە، لە داهاتوودا زمانی کوردی بە یەکێك لە زمانە کۆنەکان و دواکەوتووەکان نێزیك دەکاتەوە. نموونەگەلێکی تر کە دەتوانین ئاماژەی پێ بکەین، ئەمانەن: بزووتنەوە (٥ بڕگە)، پیتی دەنگدار(٤ بڕگە- هاوتاکەی لە فارسیدا ٢ بڕگە: همخوان)، ئاوەڵناو (٣ بڕگە- هاوتاکەی ٢ بڕگە: صفت) و...

چەندە بڕگەی وشەی داتاشراو، فرەتر بێت، هەر ئەوەندەش زمان بەشێوەی کۆنی خۆی نێزیکتر دەبێتەوە.

برگەی وشەکانی ئاکادیمی ئێرانیش لە دەیەکانی رابردوودا کە پێشنیاری کراون، درێژ بوون، بەلاّم بە دارشتنی بەرنامەی شیاو، توانییان ئەم کێشەیە چارەسەر بکەن بۆ وێنە یەکەم هاوتاسازییەك کە بۆ "کۆمپیوتەر" کرا وشەی "حسابگر الکترونی" بوو (باطني، ١٣٧١:٢٦) کە ئێستا بووەتە "رایانە"، یان بۆ "ریفراندۆم" "مراجعە بە آرا"، کە ئێستا بووەتە "همە پرسی".

ئێمەش دەتوانین لە جێگەی "بە جیهانی بوونەوە"، جیهانی بوون دابنێین هەروەها لە جێگەی "بزووتنەوە" کە پێنج برگەیە لە وشەی "جمشت" کەلك وەربگرین کە سەرەرای ئەوە ئیشتقاقیە (جم+شت)، دوو برگەی هەیە.

دەخوازم بێژم ئەگەر لە بواری وشەسازیدا نەمانتوای وشەیەك پێشنیار بکەین کە بواری برگە لە بەرامبەری بیانییەکەی کورتتر بێت، لانیکەم تێکۆشین درێژتر نەبێت، سوودی تری ئەم یاسایە ئەوەیە کە دەربرینی وشەکان، ساکارتر و لەسەرزار سووکترن. هەڵبەت دەبێت بەم خاڵە گرنگە ئاماژە بکەین کە یەکێك لە هۆیەکانی درێژبوونی برگەی ئەو وشانە کە "کۆری زانیاری" کاتی خۆی کردوویەتی. کارکردنی بووە بە میتۆدی وەرگێرانی دەقاودەق لە عەرەبییەوە کە لە جێگەی چاوگی عەرەبی، چاوگی کوردییان داناوە، بۆ وێنە: ساغکردنەوە، لێکدانەوە، پێداچوونەوە، بزووتنەوە، بووژاندنەوە، لێکۆڵینەوە و... لەکاتێکدا شیاوتر ئەوەیە بەرامبەری چاوگی بیانی لە ناوی چاوگ (اسم مصدر) کەلك وەربگرین.

هەروەك ئەم هاوتاسازییە شیاوە کە بۆ وشەی بیانی "مقالە" لە ناوی چاوگی "وتار" (وت+ار) کەلك وەرگیراوە.

### ٤- وشەی بیانی لە بەرامبەر وشەی بیانی:

هەروەك ئاگادارن ناسیۆنالیزمی کوردی بەهۆی نەبوونی کیان و دەسەلاّتی سیاسی، سەررێژ بووەتە ناو زمان، پاشان زمان پارێزانی کورد هەوڵی ئەوەیان داوە بەرامبەر سازییەکانیان لەگەڵ دراوسێکانیان جیاواز بێت. تا لە رێگای بەرجەستەکردنی سنووری زمانی، سنوورێك بۆ ولاّتی کورد دیاری بکرێت. هەر بەم بۆنەیەش زمانەوانان لە بواری وشەسازیدا بەشێوەیەك کاریان کردووە کە لەگەڵ فارس و عەرەب و تورك جیاواز بن بۆ نموونە وشەی "یاسا"یان -کە لە بنەرەتدا تورکییە، ئەویش تورکی

موغولی- له بەرانبەر وشەی "قانون" کە لە نێوی فارس و عەرەبدا باوە، هەڵبژاردووە. لەکاتێکدا زۆربەی زۆری خەڵك لە زمانی ئاخافتندا وشەی "قانون" بەکار دەهێنن. یان وشەی "قوتابخانە" کە وشەیەکی فارسی -عەرەبییە و لە قوتاب، واتە: کتاب + خانە پێکهاتووە و لە جێگەی "مکتب" بە کاری دەبەن لەکاتێکدا هەموو ئەو وشانە بیانین، ئیتر چ فەرقی هەیە کە لە زمانی نووسیندا کامیان بەکاربهێنین.

نموونەکانی تر لەم وشانە لەنێو زمانی نووسیندا زۆرن. کە رەنگە هەندێکیان کوردی نەبن و لەلایەکی ترەوە دەربڕینیشیان سەختە، بۆ وێنە: ئابلۆقە، قازانج، بایەخ، قەمچی، ئاڵتوون و...

### ٥- وشەسازانی سەربەخۆ:

وشەسازی و وشەڕۆنان موڵکی تەرخانکراوی ئاکادیمییەکان نییە. لە زۆربەی وڵاتان هاوکات لەگەڵ ئاکادیمییەکان، رۆشنبیران، وەرگێڕان، زمانناسان بەشێوەی سەربەخۆ خەریکی وشەسازین و زۆرجاریش رێکەوتووە، وشەی پێشنیارکراوی نووسەرێك لە کاری کۆڕە زانستییەکانی زمانی وڵاتێك باشتر و شیاوترە. هەربۆیە لە هەندێك لە وڵاتانی پێشکەوتوو، ئاکادیمییەکان لە هەموو ئاخێوەرانی زاراوەگەلی زمانەکە، دەخوازن بۆ هاوتاسازی هەر مانا و دیاردە و چەمك و وشەیەك، چالاکانە بەشداری بکەن و پێشنیار بدەن، چۆنکە بڕیارە خەڵك وشەکە بەکاربهێنن.

ئەگەر بخوازین هەر دوو شێوەکە، لەگەڵ یەك بەراورد بکەین، لەڕاستیدا وشەسازی بەشێوەی تاکەکەسی ئەگەری بە هەڵەداچوونی زۆرترە، بەڵام لە شێوەی دووەمدا ئەم ئەگەرە کەمترە بەهۆی ئەوەی کە چەندین کەس بە زانستی جۆراوجۆرە لەم پرۆسەدا بەشدارن. دەرفەتی رەخنەگرتن و پاشان ساغکردنەوە زۆرترە و هەوڵەکان تۆکمەتر و تەواوتر دەبن.

کورد بەگشتی، لە کوردستانی ئێران بەتایبەتی، بەهۆی نەبوونی ئاکادیمی دەسەڵاتدار و هەروەها پسپۆڕانی بوارەکە، پرۆژەی وشەسازی تووشی غیابی مەرجەعییەت بووە، بەم هۆیە و چەند هۆکارێکی تر، ئێستا زۆربەی نووسەران، وەرگێڕان بەشێوەی تاکەکەسی خەریکی وشەسازین کە ئەمە بە نۆرەی خۆی کێشەیەکی بۆ زمانی کوردی دروستکردووە، بۆ نموونە جاران بۆ یەك مانا چەند جۆر وشە

سازکراوە، بۆ وێنە لە بەرامبەری وشەی psychology دەروونناسی و ڕەوانناسی دروست بووە. یان بۆ "تەرکیب" سازدان (ئەحمەد قازی، ١٣٦٧: ١٢٢)، ڕێکەوەند (د.ڕخزادی، ١٣٧٩: ٣٠٧) و پێکهاتە، هەروەها بۆ وشەی "فعل": کردار (خرم دل، ١٣٤٧: ٧٨)، کار (نەبەز، ١٩٧٦: ٣١) و فرمان، واتاسازی بووە.

لە لایەکی ترەوە، وشەسازانی سەربەخۆ هەرچەند شارەزان و لە زانستگا دەرسیان خوێندووە، یان دەرس دەڵێنەوە، بەڵام وەکو مامۆستایانی ڕابردوو لەباری زمانەوە کاری بنیاتییان وەکو نووسینی ڕێزمان و فەرهەنگی وشە و... نەکردووە، هەروەها بەهۆی کەمتەمەنی و خەریکبوون بە زانستەکانی تر، لەگەڵ زاراوەکانی تری کوردی و زانستی وشەسازی ئاشنایی ئەوتۆیان نییە. بەم هۆیە و هۆیەکانی تر بە باشی ڕۆحی زمانی کوردی (نەك زاراوەی خۆیان) ناناسن، لێرەدا پێویستە وەکو نموونە لە چەند وشە ڕەخنە بگرین:

**- شۆناس لە جێگەی "هویت":**

شوناس لە بنەڕەتدا ڕەگی ئێستای "شناخت"ە. لە چاوگی "شناختن"ی فارسییە. هاوتاکەی لە کوردیدا دەبێتە: ناسین (چاوگ)، ناسی (ڕەگی ڕابردوو)، ناس (ڕەگی ئێستا). پاشان هەر ئەم شوناسی فارسییە کە هاتووەتەوە نێو کوردییەوە بە مانای ئاشنایە، جا چ پێوەندی لەنێوان ئاشنا و هوویت هەیە؟ لە ڕوانگەیەکی ترەوە مەگەر هەر دوو وشەکە، بیانی نین جا چ جیاوازییەکی هەیە کامیان لە زمانی نووسیندا بەکاربهێنین (بڕوانە خاڵی چوارەمی بەشی خەسارناسی).

**- توخم لە جێگەی "عنصر":**

توخم وشەیەکی هاوبەشە لەنێوانی زمانی فارسی و کوردیدا لە قامووسە فارسییەکاندا ئەجۆرە مانا کراوەتەوە: ١- نتفە ٢- بیزەی ماکیان ٣- اصل و نژاد ٤- دانە و بزر ٥- غدە جنسی (معین، ١٣٧٥: ١٠٥٢).

لە قامووسە کوردییەکانیشدا مانای وایە: ١- تۆخم ٢- خا، هێلکە، هێك ٣- ڕەچەڵەك ٤- تۆم، تۆوم، تۆو ٥- دانە، بەرز ٦- گون (ابراهیم پوور، ١٣٧٣: ١١٧).

مامۆستا هەژاریش نووسیویەتی کە توخم لە کوردیدا دوو مانای هەیە: ١- تـوم ٢- رەچەڵەك (شرفکندی، ١٣٧٦: ٣٤٢) وەك دیمان لە کوردیدا توخم قەت بە مانـای "عنصر" نییە؟ مەگەر ئەوەی لە فارسییەوە وەرمانگرتبێت کە ئەگەر وابێـت دووبـارە رەخنەی چوارەمی بەشی خەسارناسی لەسەر ئەم خاڵەش راست دەردەچێت.

### - گوتار لە جێگەی "گفتمان/ discorse":

ئەم وشەیە لە رووی رێزمانەوە قسەی لەسەرە، چونکە لە بـواری پێکهـاتن، گوتـار لەگەڵ وتار (مقاله- گفتار) هیچ جیاوازییەکی نییە.

گوت + ار- وت + ار

بە واتایەکی تر "گوت" رەگی رابردووی کـاری "گـوتن" لـە کـوردی ناوەڕاسـتە و "وت" رەگی رابردووی کاری "وتـن" لـە کـوردی باشـوورە. مانـای هـەردووکیان لـە فارسیدا دەبێتە "گفتن"، بەم هۆیەوە قەت وشەی "گوتار" ناتوانێـت هـەڵگری مانـای "گفتمان" بێت.

### - روخسار لە جێگەی "شکل/ قالب":

ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا فارسییە و لـە "روخ+ رخ+ سـار" پێکهـاتووە بەرامبـەری "رخ" لە کوردیدا دەبێتە "روو، روومەت". هەروەها هەردووکیان بیانین (بڕوانە بەشـی چوارەمی خەسارناسی). هەرچەند ئێستا ئەم زاراوانە تا رادەیەك لە زمـانی نووسـیندا خۆیان چەسپاندووە، بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە رەخنە لـە وشـەی لـەم چەشـنە نـەگرین، چـونکە لەڕاسـتیدا ئـەرکی سـەرەکیی زمانـەوان، چـاودێری و ویراشـتنی (پێداچوونەوە)ی پرۆسەی وشەسازی و وشەڕۆنانە لە زماندا.

### ٦- کوردی لە بەرامبەری کوردی:

لە رابردوودا زمانانی دراوسێ هەڕەشەی جیدی بوونە بۆ مانەوەی زمـانی کـوردی، بەڵام ئێستا بەهۆی بزووتنەوەی کـاری فەرهـەنگی لـەناو و دەرەوەی وڵات و بەتایبـەت میدیاکان و بەهێزبوونی دەسـەڵاتێکی کـوردی لـە کوردسـتانی عێـراق، دوو زاراوەی سۆرانی و کرمانجی بۆ پەرەپێدانی خۆ لە بەرامبەر یەکدا وەستاون و شانبەشـانی یـەك

جیاواز نه وشەسازی دەکەن، هەڵبەت ئەمە هەمووی کێشەکە نییە، ئەگەر ئاوڕدانەوەی رابردووش بکەین، دەبینین زاراوەی گۆرانی لانیکەم نزیک بە هەشتسەد ساڵ زمانی ئەدەبی بەشی ناوەڕاست و باشووری کوردستان بووە، (تەنانەت هێشتاش شیعر بەم زاراوەیە دەوترێت) و ئێستاش زمانی ئایینی ئەهلی حەقەکانە و هەروەها لە باشووری کوردستان (ئیلام، کرماشان، بیجار، لەکستان، خانەقین، مەندەلی، بەغدا) بە کرمانجیی خوارو دەیان دەفتەری شیعری و کتێب بڵاوبووەتەوە و دەبێت و تەنانەت هەندێك لە کوردە فەیلییەکان و کوردە کرماشانییەکان، سەربەخۆ بۆ زاراوەی خۆیان وشەسازی دەکەن. ئیتر باسی زازاکان ناکەم کە زۆر ئاگاداریان نیم. لە ئەنجامدا کوردی سێ زاراوەی سەرەکی و یەك زاراوەی مێژوویی هەیە، کە ئەمە یەکێك لە مەترسییەکان و کێشە گەورەکانی کوردە بۆ نەگەیشتن بە زمانی یەکگرتوو.

کورد بە دەیان هۆ (کە پێویست نییە لێرە ئاماژەی پێ بکەم)، نەیتوانی لە سەدەکانی نۆزدە و بیستەمدا یەکێك لە دوو زاراوەی سەرەکی، بکاتە زاراوەی رەسمی. ئێستاش لە جێگەی ئەوە دڵسۆزانە تێ بکۆشرێت، لانیکەم لە بواری وشە و وشەسازیدا ئەم دوو زاراوە لە یەك نزیك بکرێنەوە، بەداخەوە هەردوو زاراوەکە لە بەرامبەر یەکدا وەستاون و هەر یەك خەریکی وشەسازین، بۆ وێنە:

| کرمانجی | سۆرانی |
|---|---|
| گۆڤار | کووار |
| هەڤپەیڤین | وت و وێژ |
| ساخلەمی | تەندروستی |
| جڤات | کۆبوونەوە |

بەڵام پرسیار ئەمەیە، ئایا ئێمە لە سەردەمی پێوەندی و هاموشووی فەرهەنگی و جیهانی بوونەوەدا ناتوانین ئەم هەڕەشەیە بکەین بە دەرفەت؟ وەڵامی ئەم پرسیارە روونە؟ ئێمە لە رابردوودا، ئەزموونێکی سەرکەوتوومان بەناوی زمانی ئەدەبی گۆرانی هەیە، بەشێوەیەك کە جاف، ئەردەڵانی و هەورامی و فەیلی و کەلهوڕ و کرماشانی و

زەنگەنە و لوڕ و لەك و... وازیان لە زاراوەكانی خۆیان هێناوە و بە یەك زاراوە شیعریان وتووە. هەڵبەت زۆر جێگەی سەرسووڕمانە كە باوك و باپیرانی ئێمە، لە سەردەمی نەخوێندەواریی گشتی و نەبوونی پێوەندی وەك ئێستا بەو ئەنجامە گەیشتوون كە دەبێت وەكو گەلانی تر یەك زاراوەی ئەدەبییان هەبێت، چونكە نابێت هەر هۆز و خێڵێكی كورد بە زاراوەی خۆی بنووسێت و ... لەلایەكی ترەوە زانستی ئەمڕۆ ڕێگاچارەی بۆ چەند زاراوەیی دۆزیوەتەوە، ئەوەش پەنابردنە بەر داڕشتنی بەرنامەیەكی زمانییە، (language planning)، لام وایە تەنیا بەرنامەڕێژی زمانییە، كە بە باشی دەتوانێت كێشەی چەند زاراوەیی لە زمانی كوردیدا لە ڕێگای چەند بەرنامەی درێژماوەوە چارەسەر بكات (بۆ ئاگاداری زیاتر بڕوانە جامعەشناسی زبان، مدرسی، ۲۰۶:۱۳٦۸).

### ۷- چاونووقاندن لە كوردیی خواروو:

بەداخەوە لە پڕۆژەی وشەسازیدا ئاوڕێكی وایان لە زاراوە كوردییەكانی باشوور وەكو فەیلی، كەڵهوری، لەكی، گەڕووسی و... نەداوەتەوە، كە ئەوەش ڕەنگە، ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی بیری بەرتەسكی ناوچەگەری و مەزهەبی بێت.

لەكاتێكدا زاراوە كوردییەكانی باشوور، لانیكەم لە بواری دەزگای واچی و وشە، زۆر ڕەسەنایەتیی خۆیان پاراستووە، دكتۆر ئیبراهیمی پوور كە هەموو زاراوەكانی زمانی كوردی لێكداوەتەوە لە كتێبی "دستور جامع زبان كردی"دا دەنووسێت: "بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین كە زۆربەی دانیشتووانی مەهاباد دەتوانن بە زمانی توركی وەك زمانی دایكی خۆیان قسە بكەن... لەكاتێكدا لە هەموو ئیلام ناتوانیت سێ كەس بدۆزیتەوە كە توركی بزانن... هەربۆیە كاتێك لە ئیلام دەگەڕێیت، لە بواری زمانناسی هەست دەكەیت لە كوردستانی دوور و كۆنەوە هاتوویت". (ابراهیم پور، ٤۲:۱۳۷۸ و ٤۱).

پێویست بە وتنە لەكاتێكدا زۆربەی نووسەرانی كورد لە شوێنی ڕەسەنایەتی زمان دەگەڕێن، بۆ پالاوتنی زمانی نووسین تێدەكۆشن، دەبێت ئەم خاڵە سەرەكییە لەبەرچاو بگرن لە هیچ زاراوەیەكدا ڕەسەنایەتی كۆ نابێتەوە، بەڵكو هەموو زاراوەكانی زمانی كوردی بە قەد توانایی خۆیان بەشێكیان لە ڕەسەنایەتیی زمانی كوردی كۆن،

پاراستووه، که لێرەدا پێویسته به کورتی بۆ نموونه ڕەسەنایەتیی دوو وشه لێك بدەینەوه: له کوردیی سۆرانی "بەپێی، ماڵ و ئوسووڵ" بنەما دەوترێت، بەڵام له کوردیی فەیلی (ئیلامی) "بنەوا" دەڵێن که ئەمه ڕاسته، چونکه ئەم وشه له (بن+ ەوا) پێکهاتووه و پاشگری (ەوا) له وشەکانی تریش دووپات بووه، وەکو: نانەوا (نان+ ەوا)، پێشەوا (پێش+ وا). یان له کوردیی سۆرانی به وەرزی چوارەم، "زستان"دەوترێت، لەکاتێکدا له سەقز و سنه و ئیلام و کرماشان و ... "زمسان" دەڵێن، که لام وایه ئەمەیان دروستتر بێت، چونکه ئەم وشه له (زم+ سان) پێکهاتووه "زم" به مانای سارده و "سان/ستان" پاشگری شوێنه. وێڕای ئەوه له ئیلام به کەپەری زستانی لادێکان که له چێو و بەرد دروست دەبێت، دەڵێن: زمگه (زم+گه) (فەرهەنگی کوردی ئیلامی، نووسەر، چاپ نەکراو).

له "گۆرانی"ی کۆنیشدا هەروا بووه:

وەهار و هامن، خەزان و زەمێ

وێنەی زندەگی مەشو چۆن تەمێ

(پیر بنیامین شاهۆیی سەدەی حەوتەم)

هەروەها "زەم" به مانای سارد و بای سارد له فارسیش وشەی زەمهەریر که له (زەم+ هەریر) پێکهاتووه به مانای جێگەی زۆر سارده (معین، ۱۳۷۵:۱۷٤۷)، کەچی نووسەران و زمانەوانانی کوردی ناوەڕاست به هەر هۆیەك بێت، له وشه ڕەسەنەکانی کوردی جنووبی کەڵکیان وەرنەگرتووه ئەگەریش ڕێکەوتبێت له چەند وشه زۆرتر نییه، بۆ وێنه: زانست، وشه و...

بەڵام بەپێچەوانەوه، ئاکادیمی ئێران باوەشی بۆ وشەکانی ئیلام و کرماشان کردووەتەوه بۆ وێنه: "دکتۆر مستەفا موقەربی" ئەندامی چالاکی ئاکادیمی ئێران پێشنیاری داوه له جێگەی وشەی ئینگلیزی cover له وشەی ئیلامی "پووشەن" کەڵك وەربگرن (مقربی، ۱۳۷۲:۱۲۳) و (واژەهای مصوب فرهنگستان زبان و ادب فارسی ۱۳۷۸:۳۲).

کەڵکوەرگرتن له زاراوەکانی باشوور بۆ پێکهێنانی زمانی یەکگرتوو دوو ئەنجامی یەکگرتوو، دوو ئەنجامی شیاوی هەیه:

یەکەم: زمانی یەکگرتوو بەهێز دەکات و زۆر لە ناتەواوییەکانی زمانی نووسین چارەسەر دەکرێت.

دووەم: دەبێتە هۆی ئەوەی کە زمانی سۆرانی لە ناوچەکانی باشووریش پەرە بستێنێت و جا خەڵکیش بەهۆی کارکردنی عاتفیی زمان، زۆرتر دەتوانن لەگەڵ زمانی رەسمی پێوەندی بگرن، چۆنکە ئەم ئەزموونە (مەبەست کەڵکوەرگرتنە لە وشەی زاراوەکانی تری کوردی)، جارێکی تر لە مێژووی کورد لە سەردەمی رەسمیبوونی زمانی ئەدەبی گۆرانی تاقی بووەتەوە، بەشێوەیەك کە هۆنراوەکانی کوردی گۆرانی ١٠٠٪ سەر بە کوردی گۆرانی، یان هەورامی نەبووە، بەڵکو شاعیرانی هەر ناوچەیەك لە وشەکانی زاراوەی خۆیشیان کەڵکیان وەرگرتووە.

بۆ نموونە وشەکانی چەند بەیتێکی لێك دەدەینەوە:

ئەر وە عداڵەت بازخواز بکەی لێم

ئومێدوار نیم وە ئەفعاڵ وێم

(ئەرکەوازی)

کە وشەکانی بکەی، لێم، نیم (کوردی یەکگرتوو)، ئەر، وە، ئومیدوار (کوردی باشووری)، عداڵەت و ئەفعاڵ (عەرەبی) بازخواز (کوردی فەیلی)، وێم (هەورامی).

یان:

شەوقش بە وێنەی سپی شەم مەبۆ

پەروانەش خەریك خار خەم مەبۆ

(وەلی دیوانە)

هەرگز نەنیشی زاهد نە لاشان

ناما نە گووشت دەنگ هەلاشان

(سەی یاقوو مایدەشتی)

کە وشەکانی سپی، خەریك، بە وێنە "کوردی ناوەڕاست"، شەم، خەم، دەنگ، "کوردی یەکگرتوو"، نەنیشی، گووش "کوردی باشووری"، جێناوی "ش" و "شان" و کاری ناما و مەبو "هەورامی".

لە ئێرانیش هەروا بووە، بۆ وێنە کاتێك فارسی دەری لە خوراسان رەسمی بوو لە ناوچەکانی تری فارس نشین، وەکو ناوەڕاست و باشووری رۆژهەڵاتی ئێران، بەهۆی

تێنەگەیشتن برەوی نەبوو، بەڵام کاتێ توانی لەم ناوچانە پەرە بستێنێت کە هەزاران وشە و زاراوە و تەنانەت تایبەتمەندیی ڕێزمانی قەرز بکات (یاحقی، ۱۳۸۰: ۸۹).

ئەم گۆڕانکارییانە تا ڕادەیەك بووە کە فارسی دەری لە سەدەی شەشەمدا لە سەبکی خوراسانی گواستەوە بۆ سەبکی عێراقی، بۆیە دەبینین زمانی شیعری "حافیز و نیزامی و سەعدی و خاجو" لەگەڵ شاعیرانی بەر لە خۆیان وەکو "فردەوسی و روودەکی و فەرۆخی یەزدی و..." لە بواری وشە و تەنانەت ڕێزمانی جیاوازە، بۆ وێنە: هەمی رفتمی (واتا: دەچووم) خوراسانی، بوو بە "می رفتم" لە سەدەکانی تردا".

لێرەدا بە کورتی چەند وشەی کوردیی فەیلی دەخەینە بەر چاوانی زمانەوانان تاکو ئەگەر بخوازن و بیری بەرتەسکی ناوچەگەری ئیجازە بدات بۆ پاشەڕۆژ کەڵکی لێ وەربگیردرێت، بۆ وێنە:

شلاڵ (Relaction)، کنشت (اصطحکاك/ Friction)، لاخت (بافت/ Context)، وەیشت (فرط، شدت)، جمشت (بزووتنەوە/ Motion)، تاوشت (حرارت/ Temperature)، ئاڵشت (دانوستاندن، تبادل/ Exchange)، گەرمێشت (heat)، خوازگەر (داخواز)، خواسکەر (گدا)، گسزم (فرگ/ Duaneter)، نووسمان (literature)، دوچاوەکی (تبعیض)، پرسا (پرسندە)، لاینگر (گرف دار، حامی)، رۆژیەتی (مانگی رەمەزان)، پەیجۆر (پیگیر)، شێرەکە (استیلا، زاڵ)، دەمی (شفاهی oral)، ئاگرواچ (بخاری، شومینە)، رێ و رەوەن (راه و روش)، سەرانی (صدر)، بەزانی (انتها) و... (رەحیمی، کامران، فەرهەنگی کوردی ئیلامی، چاپ نەکراو).

### ۸- لەبەرچاو نەگرتنی زمانە کۆنە ئێرانییەکان:

پالەوی رۆژئاوایی بەهۆی هەبوونی وشەنامە و دەق، دەتوانێت ببێت بە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ وشەسازی لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا، تا ئێمەش وەکو گەلانی تر کە پێشینەی کۆنیای هەیە، بتوانین لە زمانی مێژووییمان کەڵك وەربگرین.

بۆ نموونە زمانە بەهێزەکانی جیهان وەکو ئەڵمانی، ئینگلیزی، فەرەنسی دوای رێنسانس زۆر لە وشەی یۆنانی کۆن و لاتین کەڵکیان وەرگرتووە، بۆ وێنە: ئۆرگان لە organon، ئاکادیمی لە akademeia، پان لە pantos، جوگرافیا لە

jedgrafiya یۆنانی، هەروەها ئانتیك لە entiqus، ئەكواریوم لە aquarium لاتینی و... وەرگیراوە.

ئێمەش دەتوانین لە زمانە كۆنەكانی ئێرانی وەكو ئاڤێستایی و پالەوی، بەتایبەت پالەویی رۆژئاوایی -كە میراتی هەموو گەلانی ئێرانییە- كەڵك وەربگرین، بەڵام پێویستە ئەم مەرجانە رەچاو بكرێن:

١- لەكاتێكدا لەم شێوەیە كەڵك وەربگرین كە هیچكام لە زاراوە كوردییەكان، نەتوانن یارمەتیدەر بن.

٢- زۆرتر بۆ هاوتاسازی و بەرابەرسازیی زاراوە زانستییەكان لەم شێوەیە كەڵك وەربگرین.

٣- وشەیەك هەڵبژێرن كە دەربڕینی سەخت نەبێت و لەگەڵ دەنگ و بڕگەكانی زمانی ئەمڕۆیی كوردی تەبا بێت.

ئاكادیمیی ئێرانیش هەر ئەم شێوەیان بەكار هێناوە. بۆ وێنە: لە ئاڤێستایی "تەرا+بەری" یان بۆ transportation، پەردیزە بۆ campus، واكە بۆ vowel، واج بۆ phoneme و... داناوە.

هەروەها ئەم وشانە لە پالەوییەوە وەرگیراون، بۆ وێنە: ئامار لە amar، ئەرز لە arž، ئوستان لە esatan، پەرەستار لە parastar، وەزیر لە vičir، پزشك لە bačačk، رایانە لە چاوگی رایاندەن بۆ كۆمپیوتەر، ویراستار لە چاوگی ویراستەن بۆ editor.

هەڵبەت زمانەوانانی كوردیش لە پالەوەی كەڵك وەربگرن، بۆ وێنە: بنیات لە bun-dât، دژ لە duš، ئەندام لە handam، پێرست لە pehrest، شارستان، ئەنجومەن و...

بەڵام بەهۆی نەبوونی روانگەی تیۆریك و هەروەها هاوڕابوون لەگەڵ ئەم بڕە كە دەڵێت فارسی دەری، درێژەی پالەوییە. ئەم پرۆسە لەلایە وەرگێڕان و نووسەران و كۆڕە زانستییەكان بەشێوەیەكی شیاو و بەرفرە سوودی لێ وەرنەگیراوە.

## مادی ناوەڕاست زاراوەیەکی نەناسراو:

شیکارییەکی زمانناسانە لە بارەی ئەڵقەی ونکراوی زمانی کوردی لە هەزارەی یەکەمی زایینیدا.

زۆربەی نووسەرانی کورد، زمانی کوردی بە خاوەن پێشینەیەکی چەند هەزار ساڵە دەزانن و بەردەوام ئاماژە بە هۆزە ئارياييەکان، وەك: لولوبی، کاسیت، گووتی، میتانی، سووبار، کاردۆخی و... دەکەن، کە تەنانەت وشەیەك لێیان نەدۆزراوەتەوە. لەکاتێکدا باوەڕ بە یەکبوونی کوردی لەگەڵ پالەوی ڕۆژئاوایی، یان مادیی ناوەڕاست، تا ڕادەیەك دەتوانێت دووەمین بازنەی ونبووی زمانی کوردی لە سەردەمی ساسانییەکانەوە هەتا سەدەی شەشەمی کۆچی ڕوونکاتەوە.

سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر، زمانی ئاڤێستایی زمانی ئایینی ئێرانییەکان بووە، نزیك بەو سەردەمە، زمانی مادی و پارسیی کۆنیش برەویان هەبووە.

هەرچەند زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسان وەکو: دارمستر، نولدکە، مینۆرسکی و... وا بیردەکەنەوە کە کوردی و مادی هەر یەکن، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە تائێستا لە زمانی مادی بێجگەلە چەند وشە هیچ دەقێك نەدۆزراوەتەوە، لۆژیکی تر و زانستیتر ئەوەیە لەم باسە واز بهێنین و ڕوونبوونەوەی کێشەکە بە داهاتوو بسپێرین.

زۆربەی نووسەرانی ئێرانی دەنووسن زمانی فارسی چەند قۆناغی هەبووە، کە بریتین لە: پارسی، پارسیی ناوەڕاست، یان پالەوی، فارسیی نوێ، یان دەری، بە واتایەکی تر ئەم بیرۆکەیە، زۆربەی زمانە کۆنە ئێرانییەکانی بە موڵکی زمانی فارسی زانیوە، لەکاتێکدا ئێستا بەهۆی خوێندنەوەی بەڵگە مێژووییەکان و زمانناسیی نوێوە، ڕوون بووەتەوە کە فارسی دەری نەك تەنیا بەر لە ئیسلامیش برەوی هەبووە، بەڵکو درێژەی پالەوی نییە و هەروەها زمانی پالەوی دوای ڕووخاندنی دەسەڵاتی ساسانییەکان و هاتنی ئیسلام بۆ ئێران برەوی پەیداکردووە. (جهانبخش، ١٣٨٣: ٧٥-٧٤).

"زەبیحوڵڵا سەفا" لەم بارەیەوە دەنووسێت: "زمانی ئاخافتنی خەڵکی ناوچەکانی ڕۆژئاوا و باکووری ئێران لە سەدەی یەکەمی ئیسلامیدا، پالەوی، یان شێوەزاری نزیك بەو زمانە بووە..." (صفا، ١٣٨٣: ٧٥).

هەروەها دکتۆر ناتڵ خانلەری دەبێژێ: "دوای ئیسلام، شێوەزاری پالەوی یان فالەوی (فهلوی) بەو زمان و شێوە زارانە دەگوترا کە لەگەڵ زمانی رەسمی و ئەدەبیی فارسی دەری جیاوازییان هەبووە و لە ناوەڕاست و رۆژئاوای ئێران برەویان هەبووە". (خانلری، ١٣٦٩: ٢٠٦-٢٠٥).

"ئیبنولنەدیم " لە کتێبی "ئەلفیهرست"دا دەنووسێت: "عەبدوڵڵا ئیبنو مۆقەفەع" گوتوویەتی: "زمانە کۆنە ئێرانییەکان بریتین لە: فالەوی، دەری، فارسی، خوزی، سوریانی" هەروەها "یاقووتی حەمەوی" لە کتێبی "موعجەمولبەلەدان" بەگوێرەی وتەی حەمزە ئیسفەهانی لە کتێبی "ئەلتەنبیە" ئەم بۆچوونە دووپات دەکاتەوە. (الفهرست، ١٩- معجم البلدان، ٧- ٤٠٦- دکتر صفا، ٧٧).

کەچی لە هەموو کتێبی قوتابخانە و زانستگاکاندا دەنووسرێت فارسی دەری درێژەی پالەوییە. لەکاتێکدا ئەم بەڵگانە، روونی دەکەنەوە کە فارسی و پالەوی وەکو دوو زمانی ئێرانی بەر لە ئیسلامی، دوو زمانی جیاواز بوون. پرسیار ئەمەیە، فارسی دەری چۆن دەتوانێت هاوکات، جیاواز و درێژەی پالەوی بێت؟

لە هەموو گرنگتر، پالەوی دوای هاتنی ئیسلام -هەر وەك ئاماژە کرا- تێك نەچووە، بەڵکو لە رۆژئاوای ئێران قسەی پێکراوە، بەشێوەیەك کە زانای بەناوبانگ "دێهخودا" دەبێژێ: تا سەدەی شەشەم بەم زمانە نووسراوە هەیە. (دهخدا، ١٣٧٣: ٥٠٠٩٣). هەروەها "شەمسی قەیسی رازی" لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا دەنووسێت: "بەیتە فالەوینەکان لەلای خەڵکی عێراقی عەجەم ((واتا: قرمیسین "کرماشان"))، هەمەدان، رەی و ئیسفەهان، لای خوێندەوار و نەخوێندەوار برەوی هەبووە". (بڕوانە لوغەتنامەی دهخدا: ١٣٨٣).

هەر ئەو نووسەرە لە جێگەیەکی تردا، پالەوی و هەورامی لە یەك ریز داناوە.

"لحن اورامن و بیت پهلوی

زخمه رود و سماع خسروی"

- خۆشترین کیش، فەهلەویاتە. کە هەواکەی بە ئەورامنان دەخوێنن... -(شمس قیس رازی، ١٣٧٣:١١٢).

"ئایەتوڵڵا مەردووخ"یش وابیر دەکاتەوە و دەنووسێت: "لە نێوان شێوە زارە کوردییەکان، یەکەم لوڕی، دووەم کەلهوڕی، سێیەم گۆرانی بە زمانی پالەوی و شارە پالەوییەکان نزیکن". (مەردووخ، ۱۳۷۹:٥۷).

لەم دوابیەدا زمانناسێك (١٤٥٠) وشەی پالەویی ساسانی لەگەڵ کوردی بەدرەیی -کە بن زارێکە لە کوردیی فەیلی- بەراورد کردووە، پاشان بەو ئەنجامە گەیشتووە کە ئەم دوو زاراوەیە لە بواری وشەدا ٧١٪ لە یەك نزیکن (کەریمی، ۱۳۸۰:۲۸۹).

پێویست بە وتنە، جەماوەری بیست هەزار کەسی بەدرەیی سەر بە پارێزگای ئیلام، ڕێژەیەکی ٦٪ لە نفووس و حەشیمەتی هەموو کوردان پێکدێنن. ئەگەر لە لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا زمانی پالەوی لەگەڵ هەموو زاراوە کوردییەکان بەراورد بکرێت، بێگومان ئەنجامەکەی لەمە کە هەیە، فرەتر دەبێت.

بەڵام ئێستا، ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە. کە مەبەستی مێژوونووسانی سەردەمی ئیسلامی، لە ڕۆژئاوای ئێران چ شوێنێك بووە؟ هەروەها شارە پالەوییەکان (فەهلە) کامانەن؟

"شیروویە ئیبنی شەهرەدار" حەوت شاری بە پالەوی زانیوە کە بریتین لە "هەمەدان، ماسەبزان (کە بەشێکی دەبێتە ئیلام)، قوم، ماهبەسەر (نەهاوەند: شارێکە لە هەمەدان)، سەیمەڕە (دەڕەشەهر: ناوی شارێکە لە پارێزگای ئیلامی ئێستا)، ماەکوفە (دینەوەر) و کرماشان. هەروەها ئەم نووسەرە ئەم شارانە وەك: "ڕەی، ئیسفەهان، کومش، تەبەرستان، خوراسان، سەگەستان، کرمان، قەزوین، دەیلەم، تاڵەقان" بە شاری پالەوی نەزانیوە (دهخدا: ٥٠٠٩٣).

"ئیبنی فەقیەی هەمەدانی" نووسەری کتێبی "ئەلبەلەدان" لە سەدەی سێیەمی کۆچی هەر ئەم شارانەی بێ کەمی و کورتی، بە پالەوی نشین لە قەڵەم دەدات. هەروەها نووسەری "قامووس ئەعلام تورکی" ڕاستەوخۆ دەنووسێت: "زمانی پالەوی لە کوردستان و عێراقی سەر بە ئێران (مەبەست کوردستانی عێراقە) قسەی پێدەکەن (دهخدا، ۱۳۷۳:٥٠٠٩٤).

ئێستاش هەمووی ئەم شارانە جیا لە قوم و هەمەدان، کوردنشین و بەشێوەزاری کوردی باشووری قسە دەکەن. هەر بۆیە ڕەنگە وشەی فەیلی گۆڕدراوی وشەی پالەوی بێت، چونکە پڕۆسەی واچی (phonemic process) ئەمە دەچەسپێنێت:

پاڵەوی- فالەوی، فەیلی

پێویست بە وتنە کە دەنگی /P/ زۆرجار دەبێتە دەنگی /f/ بۆ وێنە:

پارسی - فارسی،

پێڕست - فهرست

هەروەها دەنگی /a/ لە ناوەڕاستی وشە لە کوردیی سۆرانیدا دەبێتە دەنگی /ye/ لە کوردی فەیلیدا بۆ وێنە:

کانی - کیەنی،/ پان - پیەن،/ مارە - میەرە،/ نازانم - نیەزانم...

بەڵام باسێك، کە لە هەموو ئەو باسانە گرنگترە، باسی لقێکی نامۆ و نەناسراوی زمانی پاڵەوییە، کە تائێستا ئاماژەی پێ نەکراوە. پێویست بە وتنە کە هەر لەمێژە زمانی پاڵەوی بە دوو لق دابەشکراون، کە ئەم دوو لقە بریتین لە: پاڵەویی باکووری، یان پارتی (دەقە مانەوییەکان "تورفانی") و لقی پاڵەویی باشووری، یان پارسی (بەردەنووسەکانی سەردەمی ساسانی)، ئەم دابەشکردنە راستە، چونکە ئەم زاراوانە، زمانی رەسمی بوون، بەڵام لقێکی تر لە زمانی پاڵەوی واتە "پاڵەوی رۆژئاوایی" لە مادستان برەوی هەبووە، هەر لەبەرئەوەی رەنگە ئەم زمانە درێژەی مادی کۆن بێت، مێژوونووسانی سەردەمی ئیسلامیش بەردەوام بەم زاراوەیە کە جیاواز لەگەڵ پارتی و پارسی بووە، وتوویانە، فالەوی.

رۆژهەڵاتناسانی بەناوبانگی ئەم سەردەمەش، وەك: ئیشتالکبرگ، ویکتۆر رۆزن، لسچینسکی و هەروەها زمانناسانی گەورەی ئێرانی پرۆفسۆر ئیحسانی یارشاتر (دانەری زانستنامەی مەزنی ئێرانیکا لە کەنەدا)، زاراوەی "مادیی ناوەڕاستی" بۆ ئەم شێوازانە هەڵبژاردووە و دکتۆر "ئەزکاری"ش کە دوای سی ساڵ لەسەر شێوەزارە جۆراوجۆرەکانی رۆژئاوای ئێران و هەروەها ساغکردنەوەی هۆنراوەکانی باباتاهیر، لێکۆڵینەوەی کردووە، لەم بارەیەوە دەنووسێت: "پاڵەویی رۆژئاوایی، گۆڕدراوی زمانی مادییە. ئەم ناولێنانە بەهۆی جۆگرافیای زمانی (بڵاو بوون لە مادستان) لۆژیکییە. سەرەڕای ئەوەی ئەم زاراوە پێشنیارییە (مادی ناوەڕاست) ستەمێکە بەهۆی ژێردەستەبوون، یان نامۆبوونی زمانەکە لێی کراوە". (ازکایی، ١٣٧٥:١٦٧).

هەر ئەم نووسەرە لە جێگەیەکی تردا دەنووسێت: "قەت نابێ زمانی کوردی و شێوە زارەکانی جیا لە "فهلوی" و بنیاتی زمانی کوردی جیا لە زمانی مادی بزانین". (ازکایی، ۱۳۷٥:۲۰٤).

زۆربەی نووسەرانی کورد، زمانی کوردی بە خاوەن پێشینەیەکی چەند هەزار ساڵە دەزانن و بەردەوام ئاماژە بە هۆزە ئارياييەکان، وەك: لوولووبی، کاسیت، گوتی، میتانی، سووبار، کاردۆخی و... دەکەن، کە تەنانەت وشەیەك لێیان نەدۆزراوەتەوە. لەکاتێکدا ئەم بۆچوونە تازەیە -کە رەنگە یەکەم جارە، ئاماژەی پێدەکرێت- تا رادەیەك دووەمین بازنەی ونبووی زمانی کوردی لە سەردەمی ساسانییەکانەوە هەتا سەدەی شەشەمی کۆچی (واتا یەکبوونی کوردی لەگەڵ پالەویی رۆژئاوایی، یان مادی ناوەڕاست) روون دەکاتەوە.

بە کورتی ئەنجامی باسەکە ئەوەیە کە پالەویی رۆژئاوایی بەهۆی هەبوونی وشەنامە و دەق، دەتوانێت ببێت بە سەرچاوەیەکی گەورە بۆ وشەسازی لە زمانی کوردیی ئەمڕۆدا، تا ئێمەش وەکو گەلانی تر کە پێشینەی کۆنیان هەیە، بتوانین لە زمانی مێژوويیمان کەڵك وەربگرین.

سەرچاوەکان:

- آموزگار، ژاله وتفضلی، احمد (۱۳۸۲) زبان پهلوی ادبیات و دستور آن، تهران، انتشارات معین.

-ارانسکی، ای، م (۱۳۸٥) مقدمه فقه اللغه ایرانی، ترجمەی، کریم کشاورز، تهران، انتشارات پیام.

-ازکایی، برویز (۱۳۷٥) باباطاهرنامه، تهران، انتشارات توس.

-اکوپوف، گ.ب، حلارف، م.ش (۱۳۷٦) کردهای گوران و مسئلەی کردهای ترکیه، ترجمەی، سیروس ایزدی، تهران، انتشارات هیرمند.

-جهانبخش، فرهنگ (۱۳۸۳) تاریخ زبان فارسی، تهران، انتشارات جامی و فرهنگ.

-دهخدا، علی اکبر(۱۳۷۳) لغت نامه، مؤسسه انتشارات و چاپ دانشگاه تهران، با همکاری انتشارات روزنه.

-صفا، ذبیح الله (١٣٨٣)، سیری در تاریخ و زبانها و ادب ایرانی، تهران، شورای عالی فرهنگ و هنر مرکز مطالعات و هماهنگی فرهنگی.
-کریمی، غلامحسین (١٣٨٠) کردی ایلامی، بررسی گویش بدره، سنندج، دانشگاه کردستان.
-مردوخ، آیت الله محمد (١٣٧٩) تاریخ مردوخ، تهران، نشر کارنگ.
-معین، محمد (١٣٧٥) فرهنگ فارسی، تهران، امیرکبیر، چاپ دهم.
-ناتل خانلری (١٣٧٩) پرویز، تاریخ زبان فارسی، تهران، نشر نو، چاپ چهارم.

پێناسە:

- کامران ڕەحیمی، لەدایکبووی ١٣٥٢ی شاری ئیلامە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
- خاوەن بڕوانامەی لیسانسی زمان و ئەدەبی فارسیی زانستگای مەشهەد و مامۆستای قوتابخانە دواناوەندییەکانی شاری ئیلامە.
- ئەندامی کۆڕی زانسیتی زمانی کوردی لە تاران و ئەندامی ئەنجومەنی توێژەرانی ئیلام، هەروەها ئەنجومەنی زانستیی زمان و ئەدەبی فارسی.
- بەرهەمەکانی بریتین لە:

١- ڕێزمانی پوختەی زمانی کوردی (بەراوردی، مێژوویی، ڕاڤەیی) لەژێر چاپدایە.

٢- مێژووی ئەدەبیاتی کوردیی ئیلام بە هاوکاریی زاهیر سارایی.

٣- ڕۆڵی عەشیرەکان لە پاراستنی سنوورەکان (لە دەورانی عوسمانییەوە هەتا ساڵی ١٣٦٧).

٤- خەسارناسیی وشەسازی لە زمانی کوردیدا.

٥- فەرهەنگی کوردیی ئیلامی کە زیاتر لە ٢٠ هەزار وشەی لەخۆ گرتووە.

- خاوەنی دەیان وتاری لێکۆڵینەوەیی دیکە لەبارەی زمان و فەرهەنگی کوردەوە بە زمانەکانی کوردی و فارسی.

## "زاراوەکانی زمانی کوردی- گرفت، یان دەرفەت"

رەئووف مەحموودپوور- مەریوان

پێگەی زمان لە بوون و پێناسەی مرۆڤدا بەرز و جەخت لەسەرکراوە. بە وتەی هێگل: زمان رۆحی نەتەوەیە.

لە روانگەی کۆمەڵناسانیشەوە سەرەکیترین ناسەیە. سەعدی شیرازیش بە کلیلی بوون و ئاوەزی مرۆڤ لێکی دەداتەوە:

زبان در دهان ای خردمند چیست کلید در گنج صاحب هنر

چو دربسته باشد چه داند کسی که گوهر فروش است یا پیلەور

ئەگەر بمانەوێت راوبۆچوونی زانایان و پسپۆڕانی بوارەکانی زانستی مرۆڤانی لەسەر زمان پولێن بکەین، ئەوا کات و دەرفەتی زۆرمان پێویستە و مەبەستی سەرەکیی وتارەکەش لەم پێوەندەدا راگوزەرە.

نابێت حاشای لێ بکەین کە زمان لای تاك و کۆ، وەك بوونمای بوون لێك دەدرێتەوە و لە رەهەندی عاتیفەوە بەرسەرنج و خۆشەویستە. ئەم خوشەویستییە بەر لە بە ئامرازبوونی زمانە و بەکارگرتنی بۆ پۆڕاندنی کاروبار و گەشەی ژیانە. کەواتە باری عاتیفیی زمان، بارسەنگترە لەباری کومەلایەتی و ئامرازبوونی زمان، وەك ئەوەی هەندێ پسپۆڕ جەختی لەسەر دەکەن.

بۆیە پاراستن و گەشەپێدانی زمان لای پسپۆڕان، زانایان و دەسەلاتدارانی بەدەربەست، وەك ئەرکی مەزن و سەبەبی شانازی دەخوێنرێتەوە.

مرۆڤی کوردیش وەك باقی مرۆڤەکانی سەر گۆی زەوی خودان زمانی خۆیەتی. زمانێك بە دێرینی مێژووی زێدەکەی، هۆکارە سروشتی و کۆمەلایەتییەکان بوونەتە هۆ تا ئەم زمانە ببێتە خاوەن چەند زاراوەیەکی سەرەکی. زاراوەگەلێك کە نەبوونی ئامرازی راگەیاندن و دەسەلاتی خۆیی تا رادەیەك لێکی تەریك کردوون.

مرۆڤی کورد لەگەڵ ئەوەیدا کە دایکی بەیەك لەو زاراوانە لاواندوویەتی و بنەماکانی بوونی بنجیان بەستووە، کەچی لەژێر رەحمەتی پەروەردەیەکدا گەشەی کردووە کە (نەکەی و بڤە و قەدەغەیە) سەوقاتی بوونە. کولتوورگەلێکی زاڵ (تورکی، فارسی، عەرەبی) کە بەپێی تایبەتی رۆژهەلاتیی خۆیان سەرکوتکەر و داپلۆسێنەر و قەدەغەچی بوون. زلترین هێڵی ئەو قەدەغەیەش زمانە دایکییەکەی تاکی کوردی گرتووەتەوە و لێی حەرام کردووە. تاکی کورد لە قوتابخانەکاندا ئەگەر عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی و... باش نەخوێنێت، لێی دەدرێت و تەمێ دەکرێت، کەچی ئەگەر باسی زمانی دایکی خۆی بکات دەکەوێتە بەر بەزەبرترین تەمێکاری. مرۆڤیش ئەو شتەیە کە فێری دەبێت و پێی رادێت. هەر بۆیە کاتێك ئەم تاکە پێدەگا و چاو دەکاتەوە و لەپڕ دەگاتە دەسەلات (دەسەلاتی سیاسی- کۆمەلایەتی- زانستی و...) نیشانەکانی پەروەردەکەی بەدیار دەکەون، هەر بۆیە کەڵکەڵەی (نابێ و قەدەغەیە) و... لە هزریدا سەوز دەبێت و گەشە دەکات. بەداخەوە ئەم شێوازە بە سیمای دەسەلاتدارانی کوردەوە دیارە. (دەسەلات بە هەموو جۆرەکانییەوە). زۆربەیان زاراوەی خۆیان وەك بالادەست

دەبینن و دەکەونە قەدەغەکاری بۆ باقی زاراوەکان. ئەم پەتایە بەتایبەت لە رۆژهەلات و باشوور بە زەقی دیارە. چ لە ئاستی رایەڵە و راگەیاندن و چ لە ئاستی خوێندن و پەروەردە و چ لە گۆڕەپانی چاپەمەنییەکاندا. مەخابن هەمان نەخۆشیی دیکتاتۆریەتی فێرکراو، لێرەش دووبارە دەبێتەوە. واتە ئەوان بەکردەوە وای پیشان دەدەن کە زمانی پیرۆز و تاقانە لای مرۆڤی کورد سۆرانی بێت، یان لە بادینان لەژێر رەحمەتی خیزبایەتیدا بادینی. باقی زاراوەکان دەبنە قوربانی و وەلا دەخرێن.

ئەم وەلاخستنەش بۆ خوێندنەوەیەك دەگەڕێتەوە کە لەلایەن دەسەلاتەوە جەختی لەسەر دەکرێتەوە. خوێندنەوەیەك کە تایبەت بە دیکتاتۆرییەت و کۆیلە پەروەرییە. ئەمجۆرە خوێندنەوانەش بۆ کۆمەڵگا سەرەتاییەکان دەگەڕێتەوە، خوێندنەوەیەك کە هۆکار، ویست و خواستە نابەدڵەکان بۆ رۆحە ناپاك و تێکدەرەکان دەگەڕێتەوە و لەپشت هەر خواستێکی نابەدڵەوە، دەستی دەرەکی دەبینێت.

مستەفا رەحیمی، لای وایە ئەم خۆ ونکردووییە لە هەرکارێکدا دەستی دیتری بینینە، بۆ تەمەڵیی زەین و گەڕانەوە بۆ ئاستی سەرەتایی کۆمەڵگا ئەوساییەکان دەگەڕێتەوە. ئەو کۆمەڵگایانەی کە هەرکارێك کە تۆسقاڵێ دەردیسەری و ناحەزی بۆ بهێنێتە پێش، بە رۆحە ناپاك و شەریرەکانەوە دەیبەستێتەوە.

مەخابن هەندێ لە دەسەلاتدارانی کورد لە سیاسەت و رۆژنامەوان و رۆشنبیریدا، هەر جۆرە خۆدەرخستن و خواستێکی زاراوەکان بە تێکدەر و پلانی دەرەکی لە قەڵەم دەدەن و لایان وایە بۆ بەرژەوندیی کورد ناباشە؟! ئەمەش هەر ئەو دەربڕینەیە کە لەلایەن ژەنەراڵە دەڕەندەکانی تورکیا و هەندێ شۆڤێنیی فارس و عەرەبەوە دووپات دەبێتەوە و دەکرێتە گورز بۆ کپکردنەوەی هەر ویستێکی بەهەق.

ئاخۆ کۆمەڵگای ئێمە بە فەرمانبەری و ئیتاعەکەری راهاتووە و بەردەوام دەبێت لەسەر ئەوەی دیکتاتۆر بە سەرییەوە حاکم بێت؟! ئاخۆ بە واتای (ئەریك فروم): "ئێمە کۆیلایەتی دەکەین، چونکە پێی راهاتووین". (گریز از ئازادی).

نابێت فەرامۆشی بکەین کە هەوڵدان بۆ سوڵتەی زۆرەملێ و ناچارکردنی دیتران بە فەرمانبەرداری و ئیتاعەکردن، بە واتای زانای ناودار (برتراند راسل) تاك بە کۆیلە، یان بە سەرپێچیکەر و شۆڕشاوەی پەروەردە دەکات.

بە باوەڕی من دەبێت ئەو جۆرە خوێندنەوانە لەسەر زاراوەکان کۆتاییان پێ بێت و ڕەهەندێکی تر بکرێتەوە. ڕەهەندێك کە زاراوەکان نە بە کۆسپ و بەرگر، بەڵکو بە دەرفەت بخوێنێتەوە. دەرفەتێك کە گەشە و پەرەسەندوویی بەدواوەیە، چونکە زاراوەکان خۆیان وەك (کوردی) دەبینن. ئەمەش لە ڕەوتی مێژوودا بەگەڕ بووە. ئەگەر سەرنجی دەقەکانی خۆمان بدەین، دەبینین هەموو شاعیرانمان خۆیان بە کورد زانیوە و زمانی نووسینەکەیان بە کوردی هەڵسەنگاندووە.

چوون فارسی بێ پەند حەکیمان
بە لەفز کوردی کەردم تەرجومان
چونکە من ئەسڵم سنیف ئەکرادەن
هەر کەس بە زوبان وێش شادەن
«فەقی قادری هەمەوەند»

سەرهەنگ دەودان سەرهەنگ دەودان
ئەز کە نامەن سەرهەنگ دەودان
چەنی ئێرمانان مەگێڵم هەردان
مەکۆشم پەرێ ئایین کوردان
«بابا سەرهەنگ دەودانی»

هەرچەن مەواچان فارسی شەکەرەن
کوردی جەلای من بەس شیرینتەرەن
مەعلوومەن جە دەرد دونیای بەد ئەندێش
مەحروزەن هەر کەس بە زوبانی وێش
«خانایقوبادی»

زۆر جار دەقەکان وەك هاوار هاتوونەتە پەیڤ:
گەردی هەبوویا مەژی خودانەك
عالی کەرەمەك، لەتیفەدانەك

عیلم و هونەر و کەماڵ و ئزعان
شعر و غەزەل و کتاب و دیان
یان:
گەردی هەبوا مە پادشاهەك
لایەق بدیا خودی کولاهەك
غالب نەدەبوو لەسەر ئەڤ رووم
نەدەبوونە خەرابەی لە دەست بووم
«ئەحمەدی خانی»

ئەسڵەن جە کورد، ئەسڵەن جە کورد
بابۆم کوردەنان، ئەسڵەن جە کورد
من ئەو شێرەنان چەنی دەستەی گورد
سلسەی سپای زەحاك کەردم هورد
«شاوەیس قولی»

ئەمانە و زۆریتریش جەختکەرەوەن لەسەر ئەو بۆچوونە. دەقە شیعرییەکەی (هورموزگان) بە زاراوەی جیا لە سۆرانی نووسراوە.
(کی.زربۆ)، لە پسپۆڕانی پەروەردەی ئەفریقی، بۆ جەختکردن لەسەر زمانە خۆییەکانی ئەفریقییەکان دەڵێت: "ناتوانین چش لە زمانەکانی خۆمان بکەین. ئەمە کارێکی نەلواوە. ناتوانین بەدەستی خۆمان ئەو ناوکەی کە ئێمە بە هەموو باپیرانمانەوە دەبەستێتەوە، ببڕین. روونە کە هیچ نەتەوەیەك ناکەوێتە گەشە و پەرەسێنی، مەگەر ئەوەی لە چوارچێوەی زمانی دایکی خۆیدا بکەوێتە پەروەردە".
کەواتە کوردیش نابێت بە کوێراندنەوەی زاراوەکان، خەرمانەیەك لە مێژوو و کولتووری رەسەن و مێژوویی خۆی فەرامۆش بکات. ئەمە وێڕای خیانەت بەخۆ، خیانەت بە کولتووری مرۆڤانییە بەگشتی.

وێڕای ئەم خاڵە مێژووییانـە، خوێندنـەوەی ئـەرێنی خـۆم بـۆ سـەر زاراوەکـان بـە پاڵپشتی چەپکێ فاکت، لە چەند خاڵێکـدا دەخەمـە بەردەسـتی خوێنـەر. بـاوەڕم بـە خوێندنەوەی دیکەش هەیە. ئەوەی خۆم بە تاقانە خوێندنەوە نازانم.

یەکەم: خوێندنەوەی عاتیفی- مرۆڤانی:

ئەگەر لە هەموو شتێك بگـەڕێین خـاڵێکی گـرنگ هەیـە کـە نابێـت فـەرامۆش بکرێت، ئەویش روانگەی عاتیفییە بۆ زمان. ئاسـایی و رەوایـە تـاك ئـەو زمانـەی لا خۆشەویست بێت کە پێی لاوێنراوە و لای لایە ئەڕای کرییایـە. زمانێـك کـە بەهۆیـەوە لەگەڵ خۆشەویستەکانی پێوەندی گرتووە. زمانێك کە توانیویەتی ببێتە دەربڕی چـرۆی حەز و نیازەکانی، زمانێك کە هی باپیرانییەتی و بە هەزاران ساڵ نـەوە بـە نـەوە، وەك میرات بۆی ماوەتەوە. چۆن دەبێت بە ئاسانی لەو زمانە چاوپۆشی بکرێت و بخرێتە نـاو هەوانەی فەرامۆشی؟! "زربو" واتەنی چۆن دەکرێت مرۆڤ بەدەسـتی خـۆی ئـەو ناوکـە ببڕێـت کـە بەهۆیـەوە بـە پێشـینیان و هـەزاران سـاڵ مێـژووی تـاڵ و شـیرینییەوە بەسراوەتەوە؟! تـاك مـافی رەوای خۆیـەتی کـە وەهـا زوانێکـی خـۆش بوێـت. گـرنگ خۆشەویستییەکەیە، جا گریمان ئەو زمانە بە زمان پێناسە بکرێت، یان بە زاراوە!

لە رووی مرۆڤانیشەوە، دەبێت بایەخ بە وەها زمانێك بدرێت، تەنانەت ئەگەر یـەك کەسیش پێـی بئاخفێـت. هـەر هـەوڵ و کۆششـێکی راسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆ ئـەڕا کوێراندنەوە و مراندنی هەر زمانێك غەدر و خیانەتە بە کولتووری مرۆڤ بەگشتی.

**خوێندنەوەی پەروەردەیی:**

زاراوەکان تەنانەت ئەگەر نەبووبێتنە زمانی نووسینیش، لە رێگـەی جۆربـەجۆرەوە دەبنـە ئـامرازی پـەروەردە و کاریگـەری لەسـەر پێگەیانـدنی مـرۆڤ دەکـەن. روون و ئاشکرایە کە لای لایە و لاوانـدن، گـورانی، راز و ئەفسـانە، حەکایـەت و.... بـە زاراوە ئەتنیکییـەکان دێنـە چـڕین و گێڕانـەوە. ئەوانـەش کاریگـەریی زۆر لـە پـەروەردە و پێگەیاندنی کەسایەتیی تاك، بەتایبەت لـە سـەردەمی منداڵیـدا دادەنـێن. گەشـە و نەشەی زاراوەکان ئەو بـوارە پـەرداختر و کارامـەتر دەکـات و بـە پێچـەوانەوە کـزی و مراندنی، دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئەو دەرفەتە لەبارانە. هەر جۆرە کەموکوڕییەك لـە پەروەردە و پێگەیاندنی کەسایەتیی تاك ئاکامی خراپی لەسەر ژیانی کۆمەڵگا دەبێت.

**خوێندنەوەی ئابووری:**

هەبوونی زاراوەیل لە خۆیدا هەبوویەکی جیاوازی سروشتییە کە لە مەحاڵەکانی کوردەواریدا بەرچاوە. ئەم جۆرێکی تر بوون و جیاوازییەش سەرنجی هۆگران و گەشتگەران بەرەولای خۆی رادەکێشێت و دەبێتە هۆی گەشەسەندنی گەشتوگوزار لە دوو ئاستی ناوخۆیی و دەرەکیدا. لە ئاستی ناوخۆییدا خەڵکی سەر لە مەحاڵەکانی تر دەدەن. وێڕای ئاشنابوون و ناسینی زیاتر، دەبنە هۆی گەشەی پیشەی تووریسم. بۆ نموونە جیاوازییەکانی دەڤەریی هەورامان و لەیلاخ و موکریان و ماهیدەشت و... لەو هۆکارانەن کە دەبنە هاندەر بۆ گەشتکردن بۆ ئەو دەڤەرانە.

لە ئاستی دەرەکیشدا ئەو پیشەیە پەرەسەندووتر دەبێت و ئەگەر بەشێوەی زانستی و ئەمڕۆژیانە سەرنجی پێ بدرێت، خێروبێری زۆری بۆ مەحاڵەکان و وڵات هەیە، چونکە جیاوازییەکان هاندەرێکی سەرەکین بۆ راکێشانی تووریستە بیانییەکان.

**خوێندنەوەی کۆمەڵایەتی:**

لە سەردەمی هەنووکەدا شارستانیترین وڵات و گەل، ئەو گەل وڵاتەیە کە ئاپۆرەی جەماوەری بەشێوەیەکی دەروونی و بە شێوازی رێککەوتنی کۆمەڵایەتی و بەڵێنی مەدەنی و بەئاگا، پێکهاتبێت. بە وتەی (رۆسۆ) کومەڵگەی شارستانی رێککەوتنێکە لەلایەن دەستەیەك لە خەڵکی. بەجۆرێك کە هەریەك بتوانن ببنە بەشێك لە ئیرادەی گشتی.

کەواتە لەم کۆمەڵگەیەدا تاك خودان ئیرادە و بڕیارە و بەپێی ئیرادە و ویست و بڕیاری بەئاگا و خۆ ویست دەبێتە بەشێك لە کۆمەڵگا. ئەمەش بۆ ئەو راستییە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤ بە سروشت ئازادە. ئازادیش بە باوەڕی پسپۆڕان (بەهایەکە کە شایانی پێوانە نییە). ئەوەیە کە رۆسۆ جەخت دەکاتەوە کە لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەت و کۆمەڵگەی شارستانی، مرۆڤ لەجیاتی لەدەستدان و دۆڕاندنی (ئازادی)، بە ئازادییەکی باڵاتر دەگات. لەم کۆمەڵگەیەدا (ئازادی سروشتی)، دەبێتە (ئازادی شارستانی) و تاك لەگەڵ پارێزراوی کەرامەت و بەها مرۆڤانییەکانی، دەشبێتە بەرپرس و هەڵسووڕ لە پۆڕاندنی ئەرکە کۆمەڵایەتییەکاندا. تاك بە ویست و بە دڵ

دەبێتە بەشێك لە كۆمەڵ و بەها و قازانجەكانی بە هی خۆی دەزانێت و هەر بەو جۆرەش زیان و خەسارەكانی. ئەمەش سەدان سەد پێچەوانەی ئەو كومەڵگا دیكتاتۆرییانەیە كە بە رەحمەتی زەبر و زەنگ و بە یاریدەی هێز، تاكەكان بەشێوەی مكانیكی پێكەوە دەلكێنرێن و چ بەهایەك بە نرخ و بەها مرۆڤانییەكانیان نادات. رەزا شا و ئەتاتورك و بەعس، ئەو دەسپێكانە بوون كە لە رۆژهەلاتی ناڤیندا بوونە بنیاتنەری وەها كومەڵگایەك. ئەوەتا هەنووكەش شۆڤێنییەكان ناتوانن هەبوونی گەلانی تر باوەڕ بكەن.

كۆمەڵگەی مەدەنی بە پێچەوانەی كۆمەڵگە داخراو و داپڵۆسێنەرەكان، تێدەكوشێ مرۆڤ ئازاد و بە بەهرە پەروەردە بكات. پەروەردەیەك كە دەبێت لە خزمەتی مرۆڤ و بەها مرۆڤانییەكاندا بێت.

فەیلەسووفی ناودار (كانت) دەڵێت: (پەروەردەی ئاكاری وەها پەروەردەیەك، كە مرۆڤی ئازاد بپەروەرێنێ)، چونكە تاكی پێگەیشتوو بە بایەخترین ئەستوونە بۆ گەشە و خزمەتگوزاری.

كانت واتەنی: (هەر جۆرە كولتوورێك لە كەسەوە دەرِسكێ و پاشان تەشەنە دەكات).

ئەمەش بۆ ئەو راستییە دەگەرێتەوە كە تاكی داپڵۆسێنراو و بە كۆیلە بوو، كە بەها و كەرامەتی مرۆڤانیی لێ زەوت كرابێت، تاكێكی شێواو و شپرزە، نەك هەر ناتوانێت خزمەتگوزار و گەشەبەخش بێت، بەڵكو وێرانكەر و شێوێنەریشە.

زمانیش بەنرخترین بەهایە كە مرۆڤ لە بنەماڵەوە و لە چاوگەی پڕسۆزی دایكەوە پێی دەبەخشرێت. سەرەكیترین و بەنرخترین بەهایەكی مرۆڤانی و ئازادانەیە كە دەبێ رێزی لێ بگیرێت و پێگەی هەبێت. هەر بۆیە زەوتكردنی ئەم بەها مرۆڤانییە نەك هەر خزمەت بە كۆمەڵ نییە، بەڵكو خیانەتێكی قەرەبوو نەكراوەیە و چ خێر و بێرێكی بۆ گەل نابێت و خیانەتێكی گەورەشە بە مرۆڤ بەگشتی. لەم رەهەندەشەوە پێویستە بایەخ بە زاراوەكان بدرێت، چونكە بەهای مرۆڤانین و زمانی مرۆڤانێكن كە دەبێت خودان ویست و ئیرادە و رای خۆیان بن. پەنجەرەیەكی سەرەكیشە بۆ پەروەردە و پێگەیاندنی مرۆڤ .

ئەوانەی بە هەربیانوویەك پێیان وایە گەشانەوەی زاراوەكان نیگەتیڤە، بە ئەنقەست یان بێ ئاگا، لە خزمەت چەواشەگەری دان و دەچنە ریزی كەمالیست و رەزائیسم و بەعسیزمەوە و جەخت لەسەر كولتووری ئەوان دەكەنەوە.

**خوێندنەوەی كولتووری:**

(تی.اس.الیوت) دەڵێت: "ئەگەر كولتووری نەتەوەیی بیەوێت گەشە بكات، پێویستە پێكهاتەیەك بێت لە وردە كولتوور".

قازانجێك كە هەریەك بە پێكهاتە پێكهاتووەكەی دەگەیەنن، بەگشتی دەبێتە هۆكاری قازانجی پێكهاتەی كولتووری نەتەوەیی. (در بارە فرهنگ، ص ٦٨).

هەروەها ناوبراو جەخت دەكاتەوە كە "كولتووری نەتەوەیی پێكهاتووی ئەژمارێكی زۆر لە كولتوورە ناوچەییەكانە، كە ئەوانیش ئەگەر دابشكێنرێن، لە كولتوورگەلی بچووكتری ناوچەیی پێكهاتوون".

(در بارە فرهنگ، ص٧١).

ئلیوت، لێرەدا نەك لە روانگەی چینایەتی، یان رەگەزی یان باوەڕ، بەڵكو بە پێودانگی جوگرافیا و ئەتنیكی سەرنجی كولتوور دەدات و زۆر جوان و مامۆستایانە ئاماژە بە راستییەكانی كولتوور دەكات.

راستییەكی حاشاهەڵنەگرە كە كولتوور قاڵبێكی یەكدەست و هاوشێواز و دارێژراو نییە كە وەك قیمەی یەكدەستی لیهاتبێت. كولتوور میراتێكی مرۆڤانییە و مرۆڤەكان بەپێی سروشت و ژیان و دەڤەر و زۆر هۆكاری تر لەسەری كاریگەر و لێشی بەشدارن.

ئەو راستییە نەك هەر لە پشت هەورەوە نییە، بەڵكو بەهێزترین دەسەڵاتیش ناتوانێت بنبڕ و چەواشەی بكات. نموونەی ئەو هەوڵە چڕ و سامانبەرانە كە لەلایەن دەسەڵاتەكانەوە بۆ یەك دەستكردنی كولتوور، بێ ئاكام و فیڕۆ دەرچوون، زۆرن. هەبوونی وردە كولتوور لە خۆیدا هۆكار و سەرچاوەی زۆر خێر و سوودە كە ئەگەر بمانەوێت شرۆڤەی بكەین، بۆ خۆی پێویستی بە باسی زۆر هەیە. ئەڵبەت نابێت ئەو راستییەش فەرامۆش بكەین كە وردە كولتوورەكان نابێت وەك دوورگەیەكی تەریك، ئاوڕ لە دەورووبەر و كۆمەڵگەی بەرینتر نەدەنەوە، بەڵكو دەبێت باوەڕ بكەن كە لەگەڵ

هەبوونی راستینەی خۆیان، بەشێکن لە کولتووری بەرینتر کە دەبێت بۆ گەشە و پارێزگاری لەویش هەوڵ بدەن.

تی.اس.الیوت دەڵێت: "بۆ گەشانەوەی کولتووری گەلێك، خەڵکی نابێت نە زۆر یەکانگیر و یەك دەست بن و نە زۆریش تەریك و دوورەپەرێز. یەکانگیریی لە رادەبەدەر لە دیاردەکانی بەربەرییەتە و لەوانەیە بەرە و ئیستبداد و سەرکوتکەری بکشێت. دوورەپەرێزیی زیادە لە حەدیش مایەی دارمانە و ئەویش لەوانەیە بەرەو ئیستبداد و داپلۆسێنەری بکشێت".

هەر یەك لەو دوو شێوازە لە گەشەی کولتوور پێشگیری دەکەن، هەر بۆیە زێدەڕۆیی لە هەرکامیان خەتەرناکە. (در بارە فرهنگ، ص٥٧).

هەر بۆیە زانایانی کورد نابێت هەوڵی یەکدەستکردنی کولتووری کوردی بدەن. هەر بەو جۆرەش هەوڵدان بۆ تەریکخستن و دابڕانی زاراوەکان لە یەکدی خەتەرناکە و نابێت هەوڵی بۆ بدرێت.

دەبێت بۆ گەشەی کولتووری کوردی لە سەردەمی بە جیهانیبووندا، سەرنج بە زاراوەکان بدرێت تا ئەو زاراوانە وەك چاوگە بتوانن ئاودێریی زمانی یەکگرتوو بکەن. ئەڵبەت نابێت فەرامۆشی بکەین کە ئێمە هێشتا نەبووینەتە خاوەن زمانی یەکگرتووی ستاندارد، بەڵکو جاری ناوچەگەرایی و زاراوەگەرایی، تەنانەت لە باشووریش بەردەوامە. هەرچەند دەبێت لەگەڵ سەرنجدان بە زاراوەکان لە گشت لایەك بایەخ بە زمانی یەکگرتووش بدرێت و بۆ گەشەکردنی کۆشش بکرێت، ئەم هاودڵییە دوولایەنەیە، بەر لە هەر کەسێك دەبێت لەلایەن دەسەڵاتەوە بهەژێت و بکرێتە باو.

### خاوەنداریەتی و زمانپارێزی:

گەشەدان بە زاراوەکان، خاوەنداریەتی کە میراتێکی بەنرخی نەتەوەیی و لە هەمان کاتیشدا مرۆڤانییە. هەرکام لە زاراوەکان خەرمانەیەك سامانیان لە تۆشەدایە، کە بە فەوتانیان ئەو سامانەش دەمرێت. ئەمەش چ خەیرێك ئەڕا هیچکەس نەیری.

لەگەڵ ئەوەشدا، سەرنجدان بە زاراوەکان و بایەخ پێدانیان، هەوڵدانە بۆ ئاگاکردنەوەی جەماوەر و باوەڕکردنیان بە بایەخ و پێگەی خۆ، چونکە مرۆڤێك کە

خۆی به «بیٚ بایەخ و بیٚ پیٚگە» بزانیٚت، چەواشەیە و سەرگەردان. لە مرۆڤی چەواشە و سەرگەردانیش بیٚجگەلە ویٚرانی و چەواشەگەری هیچ چاوەنواڕییەك ناکریٚت.

زانای ناودار پستالوژی pestaloji، دەلیٚت: "بە سەدان مرۆڤ ئەگەر چەواشە دەبن و دیٚنە فەوتان، تەنیا لەبەرئەوەیە کە کەسیٚك نییە ئەوان لەگەلٚ نرخ و بایەخەکانیان ئاشنا بکات". (فلسفه اموزش و پرورش ص١٤٦).

نابیٚت خۆمان لەو راستییە گیٚل بکەین کە زۆربەی دەسەلاتە بەدەربەستەکان بۆ پاریٚزگاری لە کولتوور و زمانی خۆیان ئەوپەڕی هەولٚ و تەقەلایان داوە. بۆ نموونە: پیٚغەمبەری ئیسلام (س) هەلٚەی زمانی بە گومڕایی وەسف دەکات. ئەوکات کە عەرەبیٚك لە خزمەتیدا دووچاری دەبیٚت. (تاریخ ئاموزش در اسلام، ص٨٤).

هەروەها خەلیفەی دووەم نامەیەك کە هەلٚەی زمانیی تیٚدا بووە، بۆ حسیٚنی کوڕی دەگەڕیٚنیٚتەوە و داوای لیٚ دەکات تا میرزای نووسەری نامەکە تەمیٚ بکات. (تازیانەی لیٚبدات). (تاریخ اموزش در اسلام، ص ٨٤).

ئەمانە و زۆری دیکەش تەنانەت لە کۆمەلٚگەی عەرەبی ئەو سەردەمدا هەبوون. هەنووکەش ولاٚتان سامان و دەرفەتی زۆر بۆ گەشەی زمانەکەیان تەرخان دەکەن، کەچی بەداخەوە تازە بە تازە هەندیٚ باوەڕ لە کوردەواری لەسەر ئەو قەناعەتەن کە دەبیٚت زاراوەکان بیٚنە فەرامۆشکردن. غافلٚ لەوەی کەسیٚك کە هەولٚ بۆ قەدەغەکردنی زمانی دیتران بدات، گیٚچەلٚ و لەمپەر بۆ گەشەی زمانەکەی خۆشی دروست دەکات. بە واتەی (یەشار کەمال): "کە تۆ بتەویٚت زمانیٚك قەدەغە بکەیت، دلٚنیابە بەربەست و ئاستەنگ و قەدەغەکاریش لە زمانەکەی خۆتدا دەنیٚتەوە".

ئەوە راستییەکی جەخت لەسەرکراوە کە تەکامولٚ (فراژوو) و گەشەی کۆمەلٚگە لەوەدا نییە کە کولتووریٚکی هەبیٚت، بەلٚکو لەوەدایە کە چۆن سەرنجی کولتوورەکە بدریٚت و مامەلٚەی لەگەلٚ بکریٚت. ئیٚمەش پیٚویستە شیٚوازی دروست و زانستییانە بۆ مامەلٚەکردن لەگەلٚ کولتووری خۆیی، بەتایبەت زاراوەکان بدۆزینەوە و لە هەر چەشنە دەمارگرژییەك دووری بگرین، چونکە بە واتەی (برتراند راسل): "مامەلٚەی دروست نە مامەلٚەی بە پیرۆزکردنە و نە مامەلٚەی سووککردن، بەلٚکو مامەلٚەیەکی هاودلاٚنەی رەخنەگرانەیە". (مردم شناسی- سایمون کولمن وەلمن واتسن ترجمە محسن ثلاثی، ص١١٠).

ئەوەی بەرسەرنج و پێویستە لەسەر زاراوەکان بدرکێنرێت، پشت بەستنە بە واتەیەکی تی.اس.ئلیوت، کە دەڵێت: "مەبەست هەڵگێراندنەوەی کولتوورێکی کوژاوە نییە یان زیندووکردنەوەی کولتوورێکی لە مەرگەلان، بەڵکو مەبەست پەروەردەکردنی کولتوورێکی هاوچەرخە بەسەر بنەماکانی دێرینی خۆییەوە". (دربارەی فرهنگ، ص٦٢).

لە کۆتاییدا بەپێویستی دەزانم جەخت بکەمەوە تا بۆ گەشەدان بە زاراوەکان، ئەکتیڤ بکرێن. چ لە ئاستی چاپەمەنی و چ لە ئاستی رایەڵە تەلەفزیۆنییەکاندا. کە بەداخەوە لە تەلەفزیۆنییە ئاسمانییەکانی باشوور زاراوەکانی هەورامی و لەکی و کەلهوڕی پشتگوێخراون. ئەمەش کەلێنێکی گەورەیەوە و دەبێت قەرەبوو بکرێتەوە.

پێویستە ئێمەش بۆ بنیاتنانی هاودڵی و جمینی ئیرادی خۆویست، لە بنپالی گەشەی زمانی یەکگرتووی ستاندارد، زاراوەکانیش فەرامۆش نەکەین و لە مەرگ بیانپارێزین.

چونکە بە واتەی (پیرئەرنی): ئەگەر زاراوەکان بەکار نەگیرێن، لەگەڵ خەتەری فەوتان بەرەورِوو دەبن و بە فەوتانیشیان فەرِ و کولتوورێکی بەبایەخ دەسرِێتەوە: (اموزش درکشورهای فقیر، ص١٦٨).

**سەرچاوەکان:**

- دربارەی فرهنگ. تی.اس.الیوت، ترجمەی: حمید شاهرخ، چاپ دوم، ۱۳۷۵.
- فلسفه اموزش و پرورش، دکتر عبدالحسین نقیبزاده، چاپ پنجم، ۱۳۷۳.
- تراژدی قدرت درشاهنامەی فردوسی، مصطفی رحیمی.
- مردم شناسی، سایمون کولمن وەلن واتسن، ترجمەی: محسن ثلاثی.
- اموزش در کشورهای فقیر، پیارنی، ترجمه: فرنگیس حبیبی، چاپ اول، ۱۳٦۷.
- تاریخ أموزش در اسلام، دکتراحمدشبلی، ترجمه: محمد حسین ساکت، چاپ دوم، ۱۳۷۰.

**پێناسە:**

- رەئووف مەحمود پوور، شاعیر، رەخنەگر و لێکۆڵەر.
- لەدایکبووی ساڵی ۱۳٤٤ی هەتاویی (۱۹٦٤ی زایینی) گوندی "دزڵی"ی سەر بە شاری سەوڵاوا.
- یەکێک لە چالاکانی فەرهەنگیی پشوودرێژی شاری مەریوان و یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەنجومەنی ئەدەبیی ئەو شارە و دانەرانی گۆڤاری زرێبارە.
- خاوەن بڕوانامەی لیسانسە لە رشتەی بەڕێوەبەریی پەروەردە و یەکێك لە شاعیرانی جیدیی بیاڤی شیعری نوێی کوردی و بەتایبەت زاراوەی هەورامییە و جیا لە دەیان وتاری لێکۆڵینەیی و رەخنەیی، خاوەن هەشت بەرهەمی چاپکراوە، کە بریتین لە:

۱- "کاڵەبەی"، (کولتووری کوردی ۱)، چاپەمەنیی میهن نو هەمەدان ساڵی ۱۳۷۹(۲۰۰۰ی زایینی)

۲- "زەڕنەی ئاسۆی"، یەکەم کۆمەڵەشیعری کوردی، زاراوەی هەورامی، ۱۳۸۱ی هەتاوی (۲۰۰۲ی زایینی).

٣- "هۆرپڕای گەچ و تەختە"، دووەمین کۆمەڵەشیعری کوردی، زاراوەی هەورامی، ١٣٨٣ی هەتاوی (٢٠٠٤ی زایینی).

٤- خێزگەی سەیدی و خەرمانەی ئەدەب، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی، ١٣٨٧ (٢٠٠٩ی زایینی) چاپەمەنیی ئیحسان، چاپی دووەم، مەڵبەندی رۆشنبیریی هەورامان، سلێمانی، ساڵی ٢٠٠٩.

٥- جێژنێك بۆ پیر، بنەمایەك بۆ ئوستوورەی كوردی، چاپی وەزارەتی رۆشنبیریی هەورامان.

٦- بنەماكانی هزری نەتەوەیی و رەهەندی رۆشنبیری، بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوكردنەوەی سلێمانی، ٢٠١١.

چەندین بەرهەمی دیكەشی ئامادەی چاپن.

- بەرهەمە وتارییەكانی لە گۆڤار و نامیلكەكانی: سروە، ئاویەر، زرێبار، سیروان، ئاسۆ، تیشك، میراجی، ئەندێشە و چەندین گۆڤاری خوێندكاری لە ئێران و هەروەها لە بڵاڤۆكەكانی هەرێمی كوردستان، وەك: رامان، كاروان، ئاسۆی فۆلكلۆر، گوڵان، هەرێم، هەڵەبجە، هەنار، ئایندە و... چاپ و بڵابوونەتەوە.

- كەسێكی چالاكی بواری فەرهەنگییە و لە زۆرێك لە فێستیڤاڵ، كۆنفرانس و كۆنگرە ئەدەبی و فرەهەنگییەكان حزوورێكی چالاكی هەیە.

- ئێستا یەكێك لە ئەندامانی لیژنەی بەڕێوەبەریی ئەنجومەنی ئەدەبیی رۆجیارە لە شارەكانی سەولاوا و مەریوان و هەروەها سەرقاڵی پیشەی مامۆستایەتییە لە شاری مەریوان.

**کورتە:**

هەڵبژاردن و دەستەبەرکردنی زمانی پێوەر (یەکگرتوو) لەو بابەتە سەرنجڕاکێشانەیە کە لە زانستی زمانناسیی کۆمەڵایەتیدا کە بە زانستێکی "نێوان رشتەیی" دەزانرێت و شرۆڤە و لایەنە جۆراوجۆرەکانی شی دەکرێتەوە. باس لەم بابەتە لەنێوان لقەکانی زانستی زمانناسیی کۆمەڵایەتی، دارشتنی "دارشتنی پلانی زمان" خۆ دەدۆزێتەوە و دەگیرسێتەوە، لەم وتارەدا، دوای هێنانە ئارای ئەم پۆلێنبەندی و پێناسە جیاجیایانەی سەبارەت بە زمانی پێوەر لەئاراداں، پێناسەی دوو زمانناسی سەردەرچوو و ناسراو: "گاروین و ماتیو" کە لەوانی تر گشگیرتر و زانستیترە، بەتایبەتی باس دەکرێت، بە بڕوای ئەو دوو زمانناسە، زمانی پێوەر بەم "زمان وێنە"یە دەگوترێت کە هەڵگری دوو تایبەتمەندیی سەرەکی و گشتگیر: "دامەزراوێتی" و"سەقامگیرێتی"یە و لەلایەن بەشێك لە ئاخیوەرانی یەك زمان وەك زمانی پێوەر پارادایم پەسند کراوە، کەڵکی پێویست و هەمەلایەنەی لێ وەردەگیرێت، زمانی پێوەر خاوەنی هەندێك تایبەتمەندییە کە دەکرێت لەژێر دوو چەمکی ١- بگۆڕەکانی زمانی کە داگری "تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی"یە. ٢- بگۆڕەکانی غەیرە زمانی کە داگری هەڵوێستەکان و ئەرکەکانە، بخرێنە بەرباس و پۆلێنبەندی بکرێن، لەدوای تاوتوێکردنی بنج و بناوانی زمانی پێوەر تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی، ئەم بابەتە دێتە گۆڕێ، کە ئەو زمانە ئەدەبییەی کە ئێستا بووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان و ئەو کوردانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن بەو زمانە دەخوێنن و دەنووسن و زمانی ئەدەبیاتیانە، ئەو زمانە لە سەرەتاوە لە شاری سلێمانیدا بوو بە زمانی ئەدەبیات و بڵاوبۆوە و هەموو ئەو تێکەڵ بوون و تواندنەوە و رۆچوونەی بەسەردا هاتووە کە بەسەر زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو گەلاندا دێت، تا دەبێتە زمانی ئەدەبیی هەموو نەتەوەکە، هەروەها لەم وتارەدا باس لەوەیە کە ئەو دیالێکتە کوردییەکەی لە سەرەتاوە شیعری "نالی، سالم و کوردیی"ی پێ نووسرا، تەواو ئەو دیالێکتە نەبوو کە خەڵکی سلێمانی پێی دەپەیڤن، بەڵکو هەروەك خەڵکی سلێمانی خۆیان تێکەڵ بوون و گەر شێوەی قسەکردنیان کاریگەریی چەند دیالێکتی جیاوازی کوردیشی تیا دیار نەبووبێت، ئەوا چەند بەشە دیالێکتی هەر کاری تێکردووە، هەروەها ئەم تێکەڵییە لە زمانی ئەدەبییشدا هەر دیار بوو.

وشە سەرەکییەکان: زمانی پێوەر (یەکگرتوو)، زمانی یەکگرتووی ئەدەبی، شێوە زمانی سلێمانی، سێ دیالێکتی زمانی کوردی، کرمانجیی خواروو.

**دەسپێك:**

سووکە ئاوڕێك بەسەر لایەنی تیۆریکی زمانی یەکگرتوو:

سەقامگیربوونی زمانی یەکگرتوو، ڕەوتێکە کە بەپێی ئەو ڕەوتە یەك شێوەی تایبەتی لە زمان وەك زمانی یەکگرتوو دەستنیشان دەکرێت و دەبێتە نموونە و پارادایم و تایبەتمەندییەکانی فۆنتیك و گراماتیك و ڕێنووسی تایبەتی ئەم شێوەیە و ئەم پارادایمە زمانییە بەهۆی ئەوەی شێوەیەکی بەرزتر و گونجاوترە لەچاو شێوەکانی تری کۆمەڵایەتی و ناوچەیی، بە چەشنێکی بەربڵاو ڕەچاو دەکرێت و دەسەلمێنرێت و پەرەی پێ دەدرێت.

لە ڕوانگەی ڕەوتی سەقامگیربوونی زمانی یەکگرتوو، بەم چەشنەیە:

١- قۆناغی هەڵبژاردنی شێوەیەك لە شێوەکانی زمانی وەك وێنە و پارادایمێك بۆ چاولێکەری و گشتگیربوون.

٢- قۆناغی پەرەپێدان و گشتگیرکردنی ئەم شێوە هەڵبژاردەیە لە پانتایی کۆمەڵگای زمانیدا لە ئاکامدا دەبێتە هۆی بەرز نرخاندن و گرنگیدان ئەم شێوە هەڵبژاردەیە لە بەراورد لەگەڵ شێوە و وێنەکانی تری ئەم زمانە لەناو ئەم کۆمەڵگایەی وا ئەم زمانە لە برەودایە. (Ray، ١٩٦:٧٠).

زمانی یەکگرتوو خاوەنی هیندێك تایبەتمەندیی زمانی و غەیرە زمانییە کە دەکرێت لەژێر سێ چەمکی: تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی (structural features)، ئەرکەکان (Functions) و هەڵوێستەکان (Attitudes) بخرێنە بەرباس و پۆلێنبەندی بکرێن. تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی لەژێر سەردێڕی (بگۆڕەکانی زمانی) باس دەکرێن و ئەرکەکەن و هەڵوێستەکان لەژێر سەردێڕی (بگۆڕەکانی غەیرە زمانی).

ئەلف: بگۆڕە زمانییەکان (Linguisitic variables): داگری دوو تایبەتمەندیی پێکهاتەیی و بنەڕەتین، کە بریتین لە: سەقامگیریی شلك (Flexible stability) و لێهاتوویی ئاوەز تەوەرە (intellectualization) واتە، زمانی

یەکگرتوو بۆئەوەی لێهاتوویی و کارامەیی و توانستی چاوەڕوان نەکراو و پێویستی هەبێت، دەبێت لە لایەکەوە "نەگۆڕ" و "سەقامگیر"و "دامەزراو" و لە لایەکی ترەوە لەمەڕ گۆڕانکاریی کولتووری و زانستی هاوپەیوەند لەگەڵ بارودۆخی سەردەم و چوونەسەری رادەی رۆشنبیریی کۆمەڵگا کە هەموو ئەوانە پێویستییان بە دیاردەی وشەڕۆنان لە دەڤەری جیاجیادا هەیە، "شلك" و "بگۆڕ" بێ و دەوری کاریگەر و چالاك بەخۆیەوە ببینێت. کەوابوو زمانی یەکگرتوو توانایی ئافراندن و بەرهەمهێنان و رۆنانی وشە و رێکەوەند و ئیدیۆمی نوێباوی لەگەڵ چەمکە زانستی و کولتوورییەکانی سەر بە لق و دەڤەرە جیاجیاکانی زانست و ئەندێشە و رۆشنبیری باوی سەردەمی هەبێت.

ب- بگۆڕەکانی غەیرە زمانی (nonlinguistic variables): ئەو بگۆڕانە بریتین لە چوار ئەرك (Function) و سێ هەڵوێستە (attitude)ی پێوەندیدار لەنێوان سەرجەم ئەرکەکانی زمانی یەکگرتوودا، سێ ئەرکی: ١- رێکخەرەوە (unifyin). ٢- جیاکەرەوە (separiatist) و ٣- پلە و پایە بەخشی (prestige) پتر لایەنی (کۆنکرێت) و بەر جەستەی تێدا بەرچاوە.

ئەم ئەرکانەی پێشوو دەبنە هۆی پێکهاتنی سێ هەڵوێستەی ژێرەوە لەناو ئاخێوەرانی زمانی یەکگرتوودا: ١- خۆشەویستی و لایەنگرێتی (loyality)، ٢- شانازی (pride). ٣- ئاگاداری لە رێساکان (awareness of nurms). لەنێو ئەم سێ هەڵوێستەدا، هەڵوێستەی خۆشەویستی ((خۆشەویستی و لایەنگرێتی)) لەگەڵ ئەرکەکانی ((رێکخەرەوە))، ((جیاکەرەوە)) هاوپەیوەند و هەڵوێستەی ((شانازی)) لەگەڵ ئەرکی ((ژیدەرێتی و سەرچاوە بوون)) هاوپەیوەند و هاوڕەگەزن.

ئەم خاڵانەی باسکران، سەرجەم کورتەی بیروڕای دوو زمانناسی پسپۆڕ و شارەزای بواری زمانناسیی کۆمەڵایەتی (socialinguistics) لەمەڕ زمانی یەکگرتووە، کە بریتین لە "گاروین" و "ماتیو". پێناسە و پۆلێنبەندیی ئەم دوو زمانناسە لەوانی تر گشتگیرتر و زانستی ترە. (مدرسی- ١٣٦٨، ٢٣٥-٢٣٣).

جاری وا هەیە زمانی یەکگرتوو لە ئەنجامی تیکەڵبوونی چەند دیالێکتەوە پەیدا دەبێت، بەڵام دروستبوونی زمانی یەکگرتوو فەوتان و نەمانی دیالێکت ناگەیەنێت، چونکە زمانی یەکگرتوو شتێکە و دیالێکت شتێکی تر، لەگەڵ گەشەسەندنی زمانی

یەکگرتووشدا دیالێکتەکانی زمانیش هەریەکە بە ڕێگەیەکدا گەشە دەستێنێت و دەبنە گەنجی وشە وەرگرتن و دەوڵەمەندکردنی زمانەکە، پەیدابوونی زمانی یەکگرتوو زۆرتر بەستراوەتەوە بە پەیدابوونی ((نەتەوە))وە، مەبەست لە نەتەوەیە بە مانای زانستییەکەی، تا ئێستا زۆرێک لە زانایان تاریفی نەتەوەیان کردووە، بەڵام پوختەترینیان هەر ئەو تهاریفەی "یوسف شتالین"-ە کە دەڵێت: نەتەوە کۆمەڵێکی جێگیر بووە لە خەڵك کە لە بەرەوپێشچوونی مێژوودا دروست بووە و یەك زمان و یەك زەوی و وڵات و ژیانێکی ئابووریی یەکگرتوو و سایکۆلۆژییەتێکی ئەتۆیان هەیە کە بەشێك بێت لە کەلچەر و کولتووری هاوبەشیان (مستەفا رەسول، ١٩٧١: ٨ و ٩).

بەڵام زۆرجار پێش ئەوەش کە مەرجەکانی نەتەوە لەگەڵێکدا تەواو بێت کە زمان یەکێکیانە، زمانی یەکگرتوو پەیدا دەبێت، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە ئەو مەرجانە چین کە زمانێکیان پێ دەبێت بە زمانی یەکگرتوو، فیلۆلۆژەکانی هەموو جیهان ئێستا لەو باوەڕەدان کە یەك بوونی سێ شت لە چەند دیالێکتێکی زماندا ئەو زمانە دەکات بە زمانێکی یەکگرتوو: ئەم سێ شتەش ئەمانەن:

١- گراماتیکی زمان (مۆرفۆلۆژی+سینتاکس). ٢- فۆنەتیك. ٣- بنەڕەتی فەرهەنگی زمان. ٤- بیروڕای خودی نەتەوەکە (هەمان: ٩- ١٠).

### لایەنی پراکتیکیی زمانی یەکگرتوو:

بە بڕوای من، لایەنی "بە تۆپزی" (تجویزی prespective) ڕەوتی سەقامگیرکردنی زمانی یەکگرتوو بەسەر لایەنی "خۆبەخۆیی" (خودکار automatic) و سروشتی ڕەوتەدا زاڵە، بە واتایەکی تر وەدیهاتنی ئەم دیاردە گرنگە زمانا‌وییە، پشتیوانیی دەسەڵات و دەزگا حکومییە پێوەندیدارەکانی گەرەکە و بەبێ یارمەتی گشتگیر و فرەڕەهەندی دامودەزگا فەرهەنگی و ڕۆشنبیرییە هاوپەیوەندە دەوڵەتییەکان ڕەوتی "بە زمانی یەکگرتووکردنی" یەك یان دوو شێوەزار نابێت، یان ئەگەر مسۆگەریش بێت، ڕەوتەکە یەگجار درێژخایەن و یەگجار نادەر هەست (غیر محسوس) دەبێت و تەمەنی نووحی گەرەکە، هەر لەم پەیوەندییەدا بڕوام وایە ئەم ڕەوتە پتر لە چوارچێوەی تایبەتمەندییەکانی چەمکی "پرۆژە"دا دەگونجێت، نەك "پرۆسە".

ئەگەر بێت و بیرۆکەی پێشوو، واتـە "بـە تـۆبزیکردنی" ڕەوتـی سـەقامگیرکردنی زمانی یەکگرتوو وەك ڕاستییەك بسەلمێنین و باوەڕی پێ بهێنین، لە ئاکامدا دێینە سەر ئەم قەناعەتە کە هەلومەرجی ژێئۆپۆلیتیکی جیاوازی هەرکام لەو بەشەی کوردستان دەتوانێـت وەك فاکتـەرێکی سـەرەکی و یـەگجار گـرنگ و جیاکـەرەوەی ئـەم ڕەوت و میکانیزمە و ئەم پڕۆژەیە بێت، واتە هەرکام لەو چوار بەشە لەم بـوارەدا میکـانیزم و ڕەوت و پڕۆژەی تایبەتی خۆی گەرەکە، بەڵام کوردستانی تورکیا و سوریا دەتوانێـت زۆر لە یەك بچن، بە هەمان شێوە ئەم ڕەوتە، ئەم پڕۆژەیە لە کوردسـتانی ئێـران و عێـراق خـاوەنی گـەلێك لێکچـوون و خـاڵی هاوبەشـن. (ئەحمـەدیان، ١٣٨٧:٥ل، گۆڤـاری مەهاباد، ژمارە٩٠-٨٩).

بە بڕوای من، لەباری تیۆریك و لە "ئاسۆیەکی ئارمانخوازدا"بێـت و یـەك شـێواز "بەتۆپزی" (تجویزی) وەك زمانی یەکگرتووی کوردی بە سـەرجەم ئـەو چـوار بەشـەی کوردستان "ڕەوایی"ی پێ بدرێت و بچەسـپێنرێت و وەك زمـانی یـەکگرتووی تاقانـە بەهای پێویستی پێ بـدرێت و ببێتـە زمـانی نووسـین و زمـانی ڕاگەیانـدن و زمـانی پەروەردە لە هەرچوار بەشـی کوردسـتاندا، ئـەوا لەڕاسـتیدا پێشـنیاز و پێداویسـتیی سەرەکیی ئەم پڕۆژە ئارمانخوازانە ئەوەیە کـە پێشـەکی پڕۆژەیـەکی زمانـەوانی دیکـە سەقامگیر بکرێت و بێتە بەرهەم، ئـەویش بریتییـە لـە شـێوە ڕێنووسـی یـەکگرتوو. لەباری میتۆد ناسـییەوە (روش شناسـی methodology)یـەوە پێویسـتە پـڕۆژەی "شێوە ڕێنووسی یەکگرتوو" وەپێش "زمانی یەکگرتوو" بکەوێت، یـان بـە واتایـەکی تر: پڕۆژەی ئارمانخوازانەی زمانی یەکگرتووی تاقانە، بەرهەم نایە و سەقامگیر نابێت، مەگەر ئەوەی کە پڕۆژەی ئارمانخوازانەی شێوە ڕێنووسـی یـەکگرتووی تاقانـە وەپـێش بخرێت (ئەحمەدیان ١٣٨٧:٦- لە گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٩٠-٨٩).

لەباری زمانەوانییەوە و لە ڕوانگـەی ڕچەڵەکناسـیی زمانییـەوە ( Linguistic typology) چـەند زمـانی وەك عـەرەبی، یۆنـانی، چـیکی و هتـد... خـاوەنی تایبەتمەندییەکن بـە نـاوی "دوو شـێوە زمـان" (دوزبـان گونـە diglossia): ئـەم تایبەتمەندییە بەم چەشنەیە کـە لـەو زمانانـەدا دوو چەشـنە زمـان (شـێواز) بـەدی دەکرێت، یەکەم: "شێوە زمانی بەرز" (زبـان گونـەی عـالی H -Variety): دووەم: "شێوە زاری ڕشـۆکی، "(زبـان گونـەی عامیانـە L - Variety)، شـێوە زاری بـاڵا

لەڕاستیدا زمانی نووسینی وێژەیە و زمان وێنەی رشۆکی زمانی ئاخافتنە، لەو زمانانەی گۆڕیندا، ئەم دوو زمان وێنەیە (زمان وێنەی بەرز و زمان وێنەی رشۆکی) هێندە لێك جیاوازن کە بۆ وێنە ئاخێوەرێکی عەرەب زمان کە زمانی زگماکی عەرەبییە بەبێ فێرکاری توانایی حاڵیبوون و تێگەیشتن لە زمانی عەرەبی "بەرز"ی نییە.

پێچەوانەی ئەم دیاردەیەش بەدی دەکرێت: واتە خوێندەوارێکی غەیرە عەرەبی بەشی زمانی عەرەبی دەرچووی پلەی ماجیستێر و تەنانەت دکتۆرا لە زمانی رەشۆکیی عەرەبی تێناگات، یان زۆر کەم تێدەگات، وێدەچێت زمانی نووسین و ئاخافتنی کوردیش لەم دواییانەدا، بەرەبەرە بە چەشنێکی دەستکرد تووشی ئەم تایبەتمەندییە نەخوازراوە هاتووە، ئەم هەلومەرج و بارودۆخە بەو قاناعەتەمان دەگەیەنێت کە ئەگەر بێت و پرۆژەی زمانی کوردیش بێتە بەرهەم و سەقامگیر بێت، ئەم زمانە یەکگرتووە لەڕاستیدا "زمانی یەکگرتووی نووسین "دەبێت لەسەر بنچینەی "شێوە زاری باڵا" رۆ دەنرێت. ئەوە لە حاڵێکدایە کە زمانی یەکگرتوو دەبێت هاوکات زمانی یەکگرتووی نووسین و پەروەردە و راگەیەنەرە گشتییەکان بێت، هەڵبەت بەو تێبینییە کە لە بارودۆخی ئاساییدا زمانی نووسین و زمانی ئاخافتن لێك جیاوازن، نەك بەو رادەیەی کە ئاخیوەرێك کە زمانەکەی زمانی زگماکی یەکەمە، زمانی وێنەی بەرز (زمانی نووسین) بە رادەیەکی یەکجار کەم حاڵی بێت، یان خوێندکارێك کە دەرچووی قۆناغی ماجیستێر و دکتۆرای ئەم زمانەیە لە زمان وێنەی رەشۆکی (زمانی ئاخافتن) بە رێژەیەکی زۆر زۆر نزم و داکشاو تێبگات.

ئاشکرایە زمانی "نووسین" و "قسەکردن"ی هەموو نەتەوەیەك کەم و زۆر لێکتر جیاوازییان هەیە، خۆتان دەزانن ئەو "فارسی"یەی دەنووسرێت لەگەڵ ئەوەی قسەی پێدەکرێت، هێندێك جیاوازی هەیە، بەڵام ئەوەندە زۆر نییە و ئەوە وای لە من کردووە کە بۆ زمانی "کوردی"ش هەر سنوورێکی ئاوا رەچاو بکەم. کە دێینە سەر زمانی عەرەبی مەسەلەکە بە جارێکی دەگۆڕدرێ، چونکە ئەو "عەرەبی"یەی دەنووسرێت لەگەڵ ئەو "عەرەبی"یەی قسەی پێدەکرێت (لە هەر وڵاتێکی عەرەبیش بەشێوەیەکی تایبەتی قسەی پێ دەکرێت) زۆر لێك جیاوازن و ئەوە کاری کردووەتە سەر خوێندەواری کورد لە عێراق و لەلایان وایە زمانی نووسینی کوردی لەگەڵ هی قسەکردن ئەوەندەی

عەرەبی، یان نیزیك بەو دەبێ لێك جودا بن. من ئەوە بە راست نازانم و لام وایە کە زمانی عەرەبی بەهۆی شەرایەتێکی زۆر تایبەتی ئەو حاڵەتەی وەرگرتووە کە لە هیچ زمانێکی تردا دووپات نابێتەوە. (زەبیحی، ٢٠٠٥:٤٩١، لە: "کەریمی، ٢٠٠٥).

دەربارەی پرۆسەی هەڵبژاردنی وشە و پیتەکان و هەندێك وردەکاریی رێزمانیی زمانەکان، هەر لە سەرەتاکانی هەوڵی چەسپاندنی زمانێکی یەکگرتوودا لە ساڵی ١٩١٣ لەلایەن کۆمەڵی "هێڤی" لە ئەستەنبوڵ، هەتا پاش رووخانی کۆماری کوردستان، هەروەها لە پاشانیش، هەموو لایەك خەونیان بە زمانێکی یەکگرتووی کوردییەوە بینیوە و ئەم مەسەلەیە چ بۆ گەشەکردن چ بۆ بەرەوپێشڤەچوونی زمانەکەمان، چ بۆ یەکگرتنەوەی زمانی ئەدەبی کوردیمان، مەسەلەیەکی ئێجگار گرنگە. لەبەر ئەوەشە کە دەبێت ئەو پیتانە پەسند بکرێن کە لەگەڵ بارودۆخ و تایبەتمەندییەکانی زمان و نووسینی کوردیدا دەگونجێن (پیر باڵ:١٠٠).

لە کوردستانی باشوور ئەلفوبێی عەرەبی هەتا ئاستێکی ئێجگار پێشکەوتووە و شوێن پێی خۆی کردووەتەوە و بەشێوەیەکی بەربڵاو پەرەی پێدراوە. بنکە زانستییەکانی خۆی وەکو زمانێکی یەکگرتوو، رەگ و ریشەی خۆی چەسپاندووە. لەبەر ئەوەشە کە هەرگیز ناکرێت ئەو هەوڵ و کۆششە لەبەرچاو نەگرین.

ئەلفوبێی عەرەبی باشترین بڕیار و چارەسەرە و لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لە قوتابخانەکان و لە پۆلەکانی ناوەندی خوێندن لەتەك ئەلفوبێی عەرەبی قوتابیان شارەزاییان لەبارەی ئەلفوبێی لاتینیش هەبێت.

دیارە بەداخەوە، دەسەڵاتی کوردی لە کوردستانی باشووردا، ناتوانێت داوای چەسپاندنی بڕیارەکانی بکات لە بەشەکانی تری کوردستاندا: واتە تورکیا، سوریا، ئێران و ئەرمەنستان، ئەم مەسەلەیەش زۆر ئاشکرایە و دەبێت بەشێوەیەکی واقیعبینانە سەیری بارودۆخی ئەمرۆکەی گەلی کورد لە کوردستان بکەین.

لەبەرئەوەشە ناکرێت ئەلفوبێی عەرەبی بسەپێنرێت بەسەر ئەو وڵاتانەی باسمانکردن و دەبێت ئەوەش بڵێین کە بڕیاردان بەدەست کورد خۆیەتی، بەڵام جێبەجێکردنەکەی بەدەستی خۆی نییە. گەر بڕیاردان و جێبەجێکردن هەردووکی لە دەستی کورد خۆیدا بوایە، ئەوکاتە باسێکی دیکە بوو (محەمەد عەزیز: ١٩٩٩: ٣٧٣).

ئێمە نەك هەر ئەلفوبێیەکی یەکگرتوومان نییە، بەڵکو هەتا ئێستا زمانێکی وێژەی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوەشمان نییە، چونکە زمانی کوردی لە چەند دیالێکت و شێوەزار و بن زاراوەی جیاواز پێکهاتووە. هەر دیالێکتێکیش بە جۆرە پیتێکی تایبەتی دەنووسرێت. هێندێ جیاوازیی دیکەش، لە نێوان رێزمانی هێندێ لە دیالێکتەکاندا هەیە، لەبەر ئەوە، گەر بیر لە زمانێکی ستاندارد بکەینەوە، پێشەکی دەبێت هەوڵێکی زۆر بدەین، ئەلفوبێی کوردی یەك بخەین. هەرچەندە ئەو کوردانەی بە بەشە دیالێکتی کرمانجیی خواروو دەدوێن، بە پیتی عەرەبی دەنووسن، هەتارادەیەك زمانێکی نیمچە ستانداریان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە و چەسپیوە. ئەو زمانەش پتر خۆی لە لقە دیالێکتەکانی "سلێمانی- موکری"دا دەنوێنێت. (هەمان سەرچاوە: ٣٦٨).

هەرچەندە زمانێکی یەکگرتووی کوردیی نووسینمان نییە، بەڵام هەتارادەیەکی زۆر زمانی یەکگرتووی کوردیی نووسین، لە بەشێکی گەورەی هەر دوو پارچەی رۆژهەڵات و باشووری کوردستان، لەمێژە بەشە دیالێکتی کرمانجیی خواروو (سلێمانی- موکری) چەسپیوە، کەچی هێندێ لە نووسەران هەر بەو لقە دیالێکتە دەنووسن کە لە سنووری ناوچەی ژیانی خۆیاندا وەك ئاخاوتن بەکاری دێنن. جار گەر بێت و هەر نووسەرێك بەو شێوە زمانەی قسەی پێدەکات، بنووسێت، دەبێت چ جۆرە گەرە لاوژەیەکی زمانەوانی و ماڵوێرانییەکی نەتەوەیی و پاشاگەردانییەکی سەیری لێ دەرچێت؟! کاریش بەو شێوەیە بڕوا، هەرگیز زمانێکی تۆکمە و سفت و سۆڵی نووسین، لەنێو کورددا سەر هەڵنادات، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین نکۆڵی لەوە بکەین، بەشێوەیەکی بەردەوام نووسەر و شارەزاکانمان هەوڵیان داوە و هەوڵیش دەدەن بەردی بنچینەی زمانێکی ستاندارد دانێن، بەڵام ئەو هەوڵانە هەتا ئێستا سەریان نەگرتووە. هەرچی مەسەلەی زمانە یەکگرتووە ئەدەبییەکەشە، ئەوا دەبێت بزانین کە هەرچەندە ئەم ناتەواوییە وەك کەلێنێك لە سەدەی رابردووەوە هەستی پێکراوە، بەڵام هەتا ئێستا بایەخێکی زانستییانە بە دروستکردنی نەدراوە.

### دیالێکتی یەکگرتووی سۆرانی:

فەرمیبوونی زمانی کوردی لە سالانی دوای ١٩١٨ لە دەوڵەتی تازە پێکهاتووی عێراق، هەتا رادەیەکی ئێجگار زۆر لە سۆنگەی چوونە سەری دەسەلاتی نەتەوەخوازیی

کوردی و دەوری بەرچاو و سەلمێنراوی کوردی لەم وتارەدا بووە. بزاڤی نەتەوەخوازی لە عێراق دوای هەرەسهێنان لەمەڕ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی توانی لە سۆنگەی چالاکیی بەردەوام و بە هاریکاریی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی زمانی خۆی لە پانتاییەکی دیاریکراو و سنوورداردا دەستەبەر بکات (کەڵکوەرگرتن لە زمانی کوردی لە خوێندنگاکان، دایرە دەوڵەتی و دادگاکان). کە بە پێچەوانەی ویستی دەسەڵاتە جۆرەبەجۆرەکانی یەك لەدوای یەکی عێراق لە بەشێك لە ناوچەکانی کوردستان (باشوور) هاتە ئاراوە (٤٩٥، ٤٥٨، ١٩٩٢: Hassanpur).

لەنێوان ئاخێوەرانی کورمانجی و سۆرانیدا، هەڵبژاردنێك لە پانتایی نێوان زمانیدا شکڵی گرتووە. ئەگەرچی لە ساڵی ١٩١٨ دیالێکتی کرمانجی لە تەواوی رووبەری کوردستاندا لە پێوەندی لەگەڵ رێژەی ئاخێوەران، پەرتووکی نووسراو و بڵاوکراوە و چاپەمەنیدا لە پلەی یەکەمدا بووە، بەڵام لە عێراقدا، ئاخێوەرانی کرمانجی لە بواری رۆشنبیری و کولتووریدا لە پلەیەکی نزمدا بوون، هەرچەند لە بزاڤی سیاسی و نەتەوەخوازیدا چالاکانە بەشدارییان هەبووە.

کۆمەڵگای ئاخێوەرانی دیالێکتی سۆرانی لە عێراق لە رووی چەندایەتی و چۆنییەتییەوە لە پلەی یەکەمدا بوون: رێژەی ئاخێوەران و رادەی رۆشنبیری و کولتووریی سۆرانی زمانانی عێراق لە بەراورد لەگەڵ ئاخێوەرانی کرمانجی لە پلەیەکی سەرتردا بووە، هەروەها لە بواری بزاڤی نەتەوەخوازیدا چالاکتر و پێشڕەوتر بوون. ناوەندی سەرەکیی رامیاری و رۆشنبیریی عێراق شاری سلێمانی، پایتەختی پێشووی ئەمارەتی بابان بووە و یەکێك لەو چەند ناوەندە عەسکەرییە بووە کە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ئاخرئۆخری سەدەی نۆزدەدا، بایەخ و گرنگیی تایبەتیی پێدراوە. سلێمانی دوای هەرەسهێنانی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵانی (١٧- ١٩١٨)، بۆ جارێکی تر لەژێر دەسەڵاتی ناوچەیی زمانی کوردیدا خۆی دیتەوە. سلێمانی بەردەوام خاوەندی چەندین کۆمەڵە و گرووپی رۆشنبیری بووە لەناو چینە جیاجیاکانی کۆمەڵگا، کە بریتین لە: چینی رۆشنبیری خوێنەوار، نیزامی، مامۆستایان، فەرمانبەران، مامۆستایانی ئایینی، چینی مام ناوەندی و خوارووی کۆمەڵگا و... کە ئەم بارودۆخە بووەتە هۆی شانازی و جیاوازیی ئەم شارە لەگەڵ شارەکانی دیکە بە درێژایی مێژوو. ئەم خاڵانە دەکرێت وەك کۆمەڵێك هۆکاری بەرجەستە لە دەرەوەی پانتای دەڤەری زمانی

پۆلێن بکرێن، کە لەمەڕ هەڵبژاردنی ژێر دیالێکتی سۆرانی وەك زمانی پێوەری کوردی کاریگەری و دەوری تایبەتیان هەبوو. (Hassanpur : ۱۹۲، ٤٥۹).

لە ڕێکەوتی ۲۰۰۸/٤/۱٥دا داخوازینامەیەك لەژێر ناوی: "پەیامی کۆمەڵێك نووسەر و ئەدیب و ئاکادیمیستی کورد لە بابەت: ستانداردرایزکردنی زمانی کوردی" گەڵاڵە کراوە و بۆئەوەی داوا لە حکومەتی هەرێم بکات کە دیالێکتی "کرمانجیی خواروو" (سۆرانی) وەك زمانی ستانداردی کوردی بە ڕەسمیی بناسن.

لەو داخوازینامەیەدا، داواکراوە، یەکەم: بە یاسایەك بڕیار بدرێت لەسەر بە فەرمیی ناسینی شێوەزاری کرمانجی خواروو، وەك بناغەی زمانی ستاندار کوردیی لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا. دووەم: بەیاسەیەکی هاوپێچ (مرفق) بڕیار بدرێت، لەسەر دامەزراندنی ئەنیستیتوتێکی نەتەوەیی لە کوردستاندا، بۆ لێکۆڵینەوە و ساخکردنەوە و ئارشیڤکردنی هەموو شێوازەکانی زمانی کوردی و پێشکەشکردنی پێشنیار و لێکۆڵینەوەی بەردەوام بۆ موتووربە کردنی زمانی فەرمی بە وشە و فرەییز و زاراوەی هەموو شێوازەکانی تر.

ئەم داخوازییە دەیەوێت یەکێك لە سێ لەهجە ئەدەبییەکانی کوردی، ئەوەی کە ناوی "سۆرانی"، "کوردی ناوەڕاست" یان "کرمانجی خواروو"ی لێنراوە، بە زبری قانوون و دەسەڵاتی دەوڵەتی، بکرێت بە زمانی ڕەسمی و ستانداری کوردی دەوری لەهجەکانی تریش (کرمانجی ژوروو، هەورامی ...) ئەوە بێت کە خزمەت بکەین بە دەوڵەمەندکردنی ئەو زمانە ستانداردە.

لە ڕوانگەی دکتۆر "ئەمیر حەسەنپوور"ەوە، کە مامۆستای زانستگای تۆرنتۆی کەنەدایە، ئەو داخوازییە، ئەگەر بە پێوانە زانستییەکانی زمان هەڵیبسەنگێنین، بە هەڵە دووە و لە باری سیاسییەوە تووشی هەڵەیەکی گەورەتر بووە.

بیروڕای تایبەتیی دکتۆر "ئەمیر حەسەنپوور" لەم بارەیەوە ئاوایە:

۱- زمانی کوردی، وەك زمانی ئەرمەنی، ئاڵبانی و نۆروێژی، زمای جووت- ستانداردە: دوو ستانداردی هەیە، کرمانجی و سۆرانی. لەگەڵ ئەوەشدا هەورامی ئەدەبیاتێکی کۆنی هەیە، وەك دوو لەهجەکەی تر پرۆسەی ستانداردبوونی دەست پێ نەکردووە. لەهجەی دملی یات زازایش بۆ نووسین زۆر کەم بەکارهێنراوە.

٢- زۆربەی گەلی کورد بە کرمانجی قسە دەکەن: تەواوی کوردەکانی سوریا، تەواوی کوردەکانی ئەرمەنستان، زۆربەی کوردی تورکیا، بەشێك لە کوردەکانی ئێران و عێراق کرمانجی زمانن. سۆرانی تەنیا لە کوردستانی عێراق و ئێران، ئەویش تەنیا لە ناوچەکانی ناوەڕاست قسەی پێدەکرێت.

٣- لە روانگەی زمانناسییەوە هیچ لەهجەیەکی لە لەهجەیەکی تر باشتر نییە، هەر لەهجەیەك دەتوانێت ببێتە زمانی ستاندارد. ستانداردبوون پێوەندی بەو بارودۆخی غەیری زمانی (واتە ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و ...) هەیە. نووسین و ئەدەبیات لەپێشدا بە هەورامی و کرمانجی دەستی پێکرد. سۆرانی زۆر درەنگتر، نزیکەی سێ سەدە دوایە، بۆ نووسین بەکارهات، بەڵام لە بارودۆخی شەڕی یەکەمی جیهانیی هەلی بۆ رەخسا کە ستاندارد بکرێت.

٤- پرۆژەی ستانداردبوونی زمانی کوردی، لەبەر دابەشکرانی کوردستان لەناو چەند دەوڵەتدا و بەهۆی سیاسەتی زمانکوژی، بەشێوەیەکی ئاسایی وەڕێ نەکەوت و درێژەی نەبوو. ئەو پرۆسەیە کاتێك دەستی پێکرد کە گەلی کورد لەنێوان ئێران و عوسمانیدا بوو، هەروەها رێژەیەکی کەمیش لە رووسیا بوون.

ستانداردکردن لە سەرەتاوە خۆڕسك بوو، واتە بەبێ بەرنامەیەکی لەپێشدا گەڵاڵەکراو و بەبێ تیۆری و زانستی زمانناسی. ئەو پرۆژەیە بە بڵاوبوونەوەی رۆژنامەی کوردستان لە ١٨٩٨ دەستی پێکرد، کاتێك کە دەسەڵاتی دەوڵەتی کورد لەئارادا نەبوو. کوردستان زۆرتر بە کرمانجی بوو، لەبەرئەوەی بڵاوکەرەوەی (بەدرخانییەکان) کرمانجی زاڵ بوون. رۆژنامەگەری دوای ١٩٠٨ هەم بە کرمانجی هەم بە سۆرانی پەرەی سەند، بەڵام کرمانجی زاڵتر بوو. لەبەرئەوەی خوێندەوار و رۆشنبیر و خوێنەر زۆرتر کرمانجی زمان بوون.

٥- دوای شەڕی یەکەمی جیهانیی، بەشی عوسمانیی کوردستان، کە بەشی هەرە گەورە بوو، دیسان دابەشکرا و ئەو دابەشکردنە پێوەندیی نێوان لەهجەکانی گۆڕی. بە رووخانی دەوڵەتی عوسمانی (١٩٢٢-١٩١٨) و دامەزرانی کۆماری تورکیا (١٩٢٢)، بەتایبەتی دوای ١٩٢٥، کرمانجی بەشێوەیەکی دڕندانە سەرکوت کرا. لە سوریاش کە فەڕەنسا دایمەزراند (١٩٤٦-١٩١٨)، رێگە نەدرا کرمانجی لە خوێندندا بەکاربێت و لە رۆژنامەگەریش تەنیا لە ١٩٢٣ هەتا ١٩٣٥ و لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانیی

(١٩١٤-١٩١٨) تەنیا لە عێراق لەژێر دەسەڵاتی ئینگلیز و یەکێتی سۆڤیەت (١٩٢١ بەولاوە) زمانی کوردی کە خوێندن و نووسین و چاپەمەنی رادیۆ بەکارهات و پرۆژەی ستانداردکردنی هاتە گۆڕێ.

لە عێراقدا ستانداردکردن بێ بەرنامە بووە، واتە رۆژنامەنووس و نووسەر و بڵاوکەرەوەی کتێب و وەرگێڕەکان بۆچوونی جیاوازییان هەبوو، بەڵام لەو بێ بەرنامەییەشدا، یەکدەنگی بەدی کرا (بۆ وێنە لە وشە رۆنان، پەتی کردن، گۆڕین یان چاککردنی ئەلفوبێ). پرۆژەی ستاندارکردنی زمانی کوردی بە سۆرانی، ئەویش لەسەر لەهجەی سلێمانی، بەرێوە دەچوو، نەك لەبەرئەوەی ئەو بن لەهجەیە لەوانیتر باشتر بوو، بەڵکو لەبەرئەوەی شاری سلێمانی ناوەندی بزووتنەوەی نەتەوەیی بوو، خوێندەوار و رۆشنبیری زیاتر بوو و ناوچەی بادینان زۆرتر عەشیرەتی بوو و شاری گەورەی نەبوو، تەنیا لە یەکێتی سۆڤیەت تەنیا بۆ ستانداردکردنی زمانی کوردی رێباز و بەرنامە دیاری کرا (کۆنگرەی ١٩٣٤ ئیروان)، بەڵام کوردی سۆڤیەت بە ژمارە زۆر کەم بوون و لە قەفقاز و ئاسیای ناوەندی بڵاو ببوونەوە و لە ١٩٣٧ هەتا دوا شەڕی دووەمی جیهانیی سەرکوت کران و دەوڵەتان رێگەیان نەدا لەنێوان ئەوان و پارچەکانی تری کوردستاندا پێوەندی هەبێت. لەو بارووددۆخەدا بن لەهجەی سلێمانی لە کوردستانی عێراق پرۆسەی ستانداردبوونی بەردەوام بوو، تا رادەیەکیش لە کوردستانی ئێران، سەرباقی ئەوەی کە زمانی کوردی لە ئێران سەرکوت دەکرا، هێزی پێ دەدرا (بەتایبەت بە درێژایی تەمەنی کورتی کۆماری کوردستان).

٦- ئەم داخوازینامەیە داوا دەکات کە سۆرانی "لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا" بە رەسمیی بناسرێت، بەڵام ئەگەر شتێکی وا بکرێت (جوێکردنەوە، یان دابڕانی لەهجەکان، لەتوکوتترکردنی پرۆسەی ستانداربوون و سەپاندنی هەر کوتەی لەناو سنووری دەوڵەتێکدا)، دیسان بەرنامەیەکی وا سەر ناکەوێ و زیانێکی سیاسی زۆری دەبێت. ئەگەر لە رابردوودا سۆرانی لە عێراقدا و کرمانجی لە سۆڤیەت دەیانتوانی، بێ خۆ هەڵقورتاندن لە یەکتر، ستاندارد بن، ئێستا ئەو پەیوەندییانە گۆڕاون، پەرژینی سنوورەکان نزمتر بوون، پارچەکان تێکەڵاوتر بوون، تەکنۆلۆژی راگەیاندن (تەلەفزیۆن، سەتەلایت، تەلەفۆن و هتد ...) سنوورەکانی شێواندووە. قورسایی لەهجەکانیش وەك جاران نەماوە، هەر بۆیە هەوەڵ تەلەفزیۆن و سەتەلایتی کرمانجی زمانەکان

دایانمەزراند و زۆرتر بە کرمانجی بووە تا سۆرانی. کرمانجی زمانەکان لە تورکیا، بە خەباتی خۆیان، مافی بڵاوکردنەوە بە زمانی خۆیان ئەستاندووە و دەوڵەتی تورکیایان وا لێکردووە کە بەو زمانە رادیۆ و تەلەفیزیۆنی سەتەلایت بە کرمانجی دەست پێ بکات. لە کوردستانی عێراقیش، بادینان چیتر مەڵبەندی عەشیرەت و وردە شاران نییە.

٧- دوای لاچوونی دەسەڵاتی رژێمی بەعس لەسەر بەشێك لە کوردستان لە ١٩٩١ کرمانجی زمانەکان لە کووچە و کۆڵانان و لە دوکان و لە ئیدارەکاندا بە نووسین و بە ئاخاوتن کرمانجییان بەکارهێنا و سۆرانی زمانەکانیش وەك جاران بەکارهێنانی لەهجەی خۆیان درێژە پێدا. دیارە سۆرانی هێشتا دەسەڵاتی زۆرترە، ئەوەش لەبەر پێوەندیی نابەرابەری نێوان دوو لەهجەکەیە لە کوردستانی عێراقدا، نەك لەبەرئەوەی کە سۆرانی لە کرمانجی پێشکەوتووترە، یان سۆرانی ستاندارد بووە و کرمانجی نەبووە. راستە کە چاپەمەنی زۆرتر بە سۆرانی بووە، بەڵام هیچ بابەتێك نییە کە بکرێت بە سۆرانی باسی بکرێت و بە کرمانجی نەکرێت. بەرەسمیکردنی لەهجەیەك دەسەڵات دەدا بە لەهجەکە و ئەوانەی بەو لەهجەیە قسە دەکەن و لە هەمان کاتدا ئاخێوەرانی لەهجەکانی تر لەو دەسەڵاتە بێبەش دەکات. ئەوەش کێشەکە دەکات بە کێشەی ماف و دیمۆکراسی.

٨- کوردی زمانێکی "جووت- ستاندارد"ە و ئەگەر قەرارە بکرێتە تاقە ستاندارد، بەبێ زەبر و زەنگی دەوڵەتی سەر ناگرێت و ئەو زەبر و زەنگەش بە ئامانجی خۆی ناگات و ناکۆکی قووڵتر و بەرینتر دەکات.

ئەگەر مەبەستی ئەو داخوازینامەیە ئەوەیە کە نەتەوە یەك بگرێت و جیاوازی دوو لەهجەکە نەبێتە سەرچاوەی لێکدابڕان، رەسمیکردنی سۆرانی پرۆسەی جیابوونەوە خێراتر دەکات. ئەگەر مەبەست ئەوەیە کە نەتەوەی کورد وەك"سێربستان" و "کروات"یان "چیك" و "سلۆواك" لێك هەڵنەبڕێن، رەسمیکردنی سۆرانی بەرنامەیەکی وا وەدی دێنێت.

٩- جیاوازیی زمان و لەهجە وەك نوقسان و دواکەوتووی لێقەومان چاوی لێکراوە، بەڵام دەکرێت وەك دەوڵەمەندی و جوانی و هەڵکەوتوویی دابنرێت. ئەو بۆچوونانەش لە بواری دوو جیهانبینی و دوو ئایدیۆلۆژی و دوو سیاسەتی لێك جیاواز سەریان

هەڵێناوە. کێشەی مـاف و دیمۆکراسـی لـە نـاخی ئـەو ناکۆکییـەدا زیـادی کـردووە. (حەسەنپوور، ١٣٨٧: ١٠و١١، گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ٨٦).

### زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی:

پرسیار ئێستا دەربارەی "زمانی ئەدەبی یەکگرتوو"ە، کە ئەمە شتێکی جیاوازە لـە "زمانی یەکگرتوو". هەندێ کەس لای وایە زمـانی ئـەدەبی یـەکگرتوومان نییـە. وا دەزانم زۆرتری شارەزایان، ئەوەی زانست دەکەن بە چرای بیـنین لەسـەر ئـەو رایـەن کـە زمـانی ئـەدەبی یـەکگرتووی کـوردی لـە سـەدەی نۆزدەیەمـەوە دەسـتی کـردووە بـە دروستبوون و رێگـەی خـۆی گرتووەتـە بـەر و لـە گەشەسـەندندایە. زمـانی ئـەدەبی یەکگرتوو شتێك نییە کە ئارەزووی ئەم پادشا، یان ئەو زانا دروستی بکـات، هـەر وەك شتێکیش نییە کە چەند زانایەك بەپێی نەخشە، یـان کەتـەلۆگێکی ئامـادە دروسـتی بکەن، بەڵکو مێژووی نەتەوە خۆی زمانی ئەدەبی یـەکگرتوو دروسـت دەکـات و هـەر نەتەوەیـەکیش رێبـازی تایبـەتیی خـۆی هەیـە لـە دروسـتکردنی زمـانی ئـەدەبیی یەکگرتوودا. ئادەمیزاد دروستکەری مێژووە، بەڵام مێژووی گەلانیش رێڕەوێکـی هەیـە بەرەو پێشەوە کە بە ئادەمیزاد ناگۆڕدرێت، با بۆ ماوەیەکیش کۆسپی بهێنرێتە رێگـە. لە دروستبوونی زمانی ئـەدەبی یەکگرتووشـدا، زانایـانی نەتەوەیـەك بـەوەی کـە لـە مێژووش دەگەن و زاناشن دەتـوانن "پێشـبین" و بـزانن مێـژوو بـەرەو کـوێ دەڕوات و ئەوانیش لەگەڵ بەرەوپێشچووندا بن و نەبنە کۆسپی سەرەڕێ.

زانایانی کوردیش دەتوانن لەگەڵ ئەو رێڕەوەدا بن کە زمانی ئەدەبیی یـەکگرتووی ئەم سەدەیەمان لە سەدەی نۆزدەیەمەوە گرتوویەتە بەر و خێراتر بەرەو پێشەوەی بەرن.

کەواتە دەمێکە زمانی یـەکگرتووی کـوردی پەیـدابووە کـە زمـانی کوردییـە و خاسییەتی تایبەتی خـۆی هەیـە لـە رووی گرامـاتیـك (مۆرفۆلـۆژی و سـینتاکس) و فۆنەتیك و بنەڕەتی فەرهەنگەوە و هەموو نەتەوەی کورد بـە زمـانی خۆیـانی دەزانـن. لەگەڵ ئەوەشدا کە زمانی کوردی چەند دیالێکتی جیاوازە هەر دیالێکتە چەند بەشـە دیالێکتیان لێ دەبێتـەوە- ئـەوەی زانـای پایەبـەرز "تۆفیـق وەهبـی" بـە "بێچـووە دیالێکت" (لەهجە) یان دادەنێت، بەڵام خاسییەتە یەکگرتووەکانی ئەو زمانە کوردییە لە هەموو دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانـدا دەبینرێـت و هەریەکـە لـەم دیالێکـت و

بەشە دیالێکتانە خاسییەتی جیاوازی خۆی هەیە، لە زمانەکەی جیا ناکاتەوە و نایکات بە زمانی جیاواز، بەڵکو شەقڵی تایبەتی دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیای دەداتێ و سامانی وشەی دەڕژێتە ناو زمانە یەکگرتووەکەوە و دەبێتە سەرچاوەی وشەی هاوجۆر، کە زمانی ئەدەبی یەکگرتوو سوودی لێ دەبینێت و پێی دەوڵەمەند دەبێت. کەواتە دەمێکە گومان لەوەدا نییە کە زمانی یەکگرتووی کوردی هەیە، بەڵام ئەوەی تا ئێستا لەسەر دوان و لێکۆڵینەوەی دەوێت، ئەوە زمانی ئەدەبی یەکگرتووە. (مستەفا رەسول، ١٢،١٣-١٩٧١).

زمانی ئەدەبی یەکگرتوو بەو زمانە دەگوترێت کە لە زمانی یەکگرتووە بە هەموو دیالێکتەکانەوە وەردەگیرێت، یان بناغەی لە یەکێك لە دیالێکتەکانەوە وەردەگیرێت و زۆرجار پوختەکراوێکی زمانە یەکگرتووەکە یان دیالێکتیکییەتی، یان بڵێین پوختەکراوێکی زمانی قسەکردنە. ئەم زمانە دەبێتە زمانی نووسین و خوێندنەوە و ئەدەبیات و پشت بە هەموو سەرچاوەکانی بەرەوپێشچوون و دەوڵەمەندبوونی زمان، دەوڵەمەند دەبێت و بەرەوپێش دەڕوات. زمانی یەکگرتوو و دیالێکتەکانی زمان و ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوە و زمانی نەتەوە دراوسێکان و ئیستیلاحی زانستی جیهانی گەورەترین سەرچاوەی ئەو دەوڵەمەندبوونەن.

### هۆیەکانی دروستبوونی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی:

ئەو هۆیانەی کە دەبنە هەوێنی پەیداکردنی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی بۆ گەلێك، ئەمانەن:

ئەلف- ڕێی سەپاندنی شێوەیەك بەسەر گەلێکدا: ئەمە بەتایبەتی بۆ ئەو گەلانەیە کە هێشتا زمانێکی یەکگرتوویان نییە، بەڵام قەوارەیەکی سەربەخۆی یەکگرتوویان هەیە. ئەوکاتە بۆ چارەسەرکردنی ئەمەیان بە جۆرێکی دیموکراتیانە، بیروڕای گشتی خەڵکەکە وەردەگیرێت، تا بزانرێت چ شێوەیەکیان بەدڵە، یان ئەوەتە کاربەدەستانی خۆیان شێوەیەك لە شێوەکانی زمانەکە دەکەنە زمانی رەسمی و بەو چەشنە دەیسەپێنن بەسەر گەلەکەدا و بەرەبەرە دەبێتە زمانی ئەدەبییان.

ب- له خۆوه دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی: هێندێ جار شێوەیەکی ئەدەبی لە خۆیەوە، واتە بەبێ سەپاندنی راستەوخۆ، دروست دەبێت بۆ ئەمەش هێندێ هۆ هەن کە لەم کارەدا دەور دەگێڕن، وەك:

١- ئەوەی کتێبێکی ئایینی پیرۆز بەو شێوەیە بنووسرێتەوە. بۆ وێنە شێوەی هۆزی قورەیش بوو بەشێوەی ئەدەبی عەرەبەکان، تەنیا لەبەرئەوەی قورئان بەو شێوەیە هاتە خوارەوە.

"مارتین لۆتەر" (١٤٨٣-١٥٤٦)ی ئەڵمانیش کە داهێنەری ئایترای پرۆتستان و پێشەوای بزووتنەوەی چاکسازیی ئایینی دیانێتی (واتە کاتۆلیکی)یە، پاش ئەوەی ئینجیلی لە لاتینەوە وەرگێڕایە سەر شێوەی ئەڵمانی ساکسی، کە هەتا ئەوکاتە تەنیا لە دیوەخانەکانی ئەمیرەکانی ساکسدا بەکاردەهێنرا، توانی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بۆ لای ئەو ئینجیلە رابکێشێت و هەر بەو هۆیەوە شێوەی ساکسی بوو بەشێوەی زمانی هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ بە ئەڵمانی دەدوێن، هەر لە ئەڵمانیا خۆیەوە بگرە تا دەگاتە سوویس و نەمسا و گشت لایەکی دی.

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئایین دەورێکی مەزن دەگێڕێت لە دروستکردنی زمانێکی ئەدەبیدا. پێچەوانەی ئەمەش هەر راستە. واتە، ئایین دەورێکی مەزن دەگێڕێت لە دەوڵەتکردنی زمانێکی ئەدەبیدا. بۆ وێنە: سریانەکان هەتا سەدەی پێنجی زایینی، زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوویان هەبوو. لەم سەدەیەدا، ئاژاوە کەوتە کڵێسەی دینەکانی رۆژهەڵاتەوە و بەوە خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە و هەر لەوەشەوە ئایترای یاقووبی و ئایترای نستووری پەیدا بوون. ئەمجا وردە وردە، هەر لایەك شێوەی تایبەتیی خۆی پاراست و پێی نووسی و رق و کینە و دووبەرەکیش دەورێکی ئاگر خۆشکەرانەی نواند بۆ دوورخستنەوەی هەردوو شێوەکە لە یەکتر، بەجۆرێك کە سریانەکان ئێستا دوو شێوە زمانی ئەدەبییان هەیە، ئارییە کۆنەکانیش (واتە هیند و ئێرانییە کۆنەکان) لە سەرەتاوە بە یەك زمان دەدوان و یەك ئایینیشیان هەبوو، بەڵام پاش ئەوەی ئەوانەی هیندستان ئایینی خۆیان جیاکردەوە و لە دەوروبەری ٣٠٠٠ی پ.ز-دا کتێبی پیرۆزی "ڤیدا"یان بەشێوەی سانسکرێت بۆ نووسرایەوە، ئەمجار کە دوای ئەوانیش ئارییەکانی ئێران، ئایینی زەردەشتیان پەسند کرد و کتێبەکەیان بە زمانی "ئاڤێستا" بڵاوکردەوە،

ئەودەمە زمانی ئاریایی بەرەبەرە بوو بە دوو زمان: هیندی و ئێرانی، کە هەریەکەشیان لەسەرخۆ بوو بە چەند زمانێکی سەربەخۆ.

٢- ژیاندنەوەی ئەدەبیات بە تاقە شێوەیەکی زمانێك و لە سنوورێکی یەکجار فراواندا، دەبێتە هۆی دروستکردنی زمانێکی ئەدەبی. بۆ وێنە: زمانی فارسیی تازە لەو کاتەوە دروستبووە کە "روودەکی" و "فیردەوسی" دەستیان بە هۆنراوە هۆنینەوە کردووە بەشێوەی دەری (شێوەی ژووررووی رۆژهەلاتی ئێران). بەتایبەتی شانامەی "فیردەوسی" دەورێکی کاریگەری گێراوە لەم رووەوە و توانی هەموو شێوەزارەکانی دی رامالّ بدا و جێگەی خۆی بکاتەوە.

٣- خزمەتکردنی زانست بە تەنیا شێوەیەك، بەتایبەتی لە ولاتێکدا کە زانستگە و کتێبی زانستییانە و رۆژنامەی زۆر و زەوەندی هەر بە یەك شێوە بێت و بەشێوەکانی دی نەبێت، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو شێوەیە بکاتە زمانێکی ئەدەبی.

٤- هێندێ جار جۆری ژیانی کۆمەلایەتی و پێوەندیی بازرگانی و ئابووری دەبنە هۆی دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی. شارێکی زۆر گەورە، یان پایتەختی ولاتێك کە ببێتە ناوچەی هاتوچۆ و بازرگانی و نان پەیداکردن و خەلّك رووی تێبکەن، شێوەی ئەو شارە دەسەلات پەیدا دەکات و برەو دەستێنێت و لە ئەنجامدا دەبێتە شێوەیەکی ئەدەبی.

ج- هەولّدانی رێکخراوێکی زانستییانە لەسەرخۆ بۆ بەرهەمهێنانی زمانیکی ئەدەبیی یەکگرتوو، ئەو رێگەیە ئەو گەلانە دەیگرن کە هەردوو رێگەی باسکراوی پێشوویان بۆ دەست نادا. بە رای من، ئەمەیان باشترین و تەنیا رێگەیە کە کورد بتوانێت پێیدا بڕوات لەم بارەیەوە، واتە ئێمە دەبێت شێوەیەکی ئەدەبی بۆ خۆمان دروست بکەین، بەلّام ئایا دروستکردنی ئەم شێوەیە لەکوێوە دەست پێ بکات و چۆن دەست پێ بکرێت، ئەوە پێویستی بە شیکردنەوە و لەسەر رۆیشتن هەیە (نەبەز: ١٩٧٦-١٢،٨).

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە بەو چەشنە کە پێوەندیی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی لەگەلّ ئەو لەهجانەی دی چییە؟ کە دەکرێت ئاوا وەلّام بدرێتەوە:

ئەوەی راست بێت لە سەرەتای کارەوە بن لەهجەی سلێمانی کە دەزانین تەنیا هی شاری "سلێمانی"یە وەکو زمانی پێنووسین هاتووەتە مەیدانەوە، ئەمە ماوەیەك درێژەی

کێشاوه، ئەم ڕووداوەش کە بێگومان بارودۆخی سیاسی و مێژوویی پێکهێناوه، خۆی بووەتە هۆی ئەوەی نیمچە تەعەسوبێك لەلای هەندێ خوێندەواری کوردی خەڵکی سلێمانی پەیدا ببێت و هەر بن لەهجەی سلێمانی بە نۆرمی زمانی یەکگرتوو بزانن کە جێگەی خۆی نییه، بەڵام چەند ساڵێکە ئێشەکە ڕووی لەوەیە کە ئەم زمانە ئەدەبییە دەبێت بە وشەی لەهجەکانی دی دەوڵەمەند بکرێت، بەتایبەتی بن لەهجەی موکریانی زۆر تەئسیری کردووه و بەرەبەرە ئەو ڕێبازە ئاوەڵا بووە کە لە هەموو لەهجەکان کەڵك وەر بگیرێت و ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەم ئێشە پەرە دەستێنێت. تکایە تەماشای "شەرەفنامە" وەرگێڕانی "هەژار"، "ئەفسانەی چیای ئاگری و قەڵای دمدم" تەرجومەی "شوکور مستەفا" بکەن. (زەبیحی ٢٠٠٥:٤٧٥).

"عەبدوڕەحمان زەبیحی" باس لە هەندێك لەم پێشکەوتنانە دەکات کە زمانی کوردی لە سەرەتای چەرخی سەدەی بیستەمدا بەدەستی هێناوە لەمەڕ زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتوودا دەڵێت: "زمانی کوردی لە شێوەی نووسینی "فارسی" و "تورکیی عوسمانی"، یانی ئاخنینەوەی وتار بە ڕستەی درێژ درێژی ڕەق و زەق و زاراوەی غەیرە کوردی تا ئەندازەیەك پاك بووەتەوە و شێوەیەکی تایبەتیی "کوردی نووسین"ی بە خۆیەوە گرتووه، ئەگەرچی هێشتا زۆری پێدەوێت تا فێر دەبین بە کوردی بیر بکەینەوە و ئینجا بیخەینە سەر کاغەز. سەرەڕای ئەوەش مرۆڤ بە ئاشکرا هەست بەوە دەکات کە زمانی کوردی کەوتووەتە سەر ڕچەی "زمانی ئەدەبی" و بەرەوپێش دەچێت، کورت و کرمانجی بڵێین: نەمامی "زمانی کوردی یەکگرتوو" گۆڕاوە و شین بووه، بەڵام هێشتا پێدەچێت تا دەبێتە درەختێکی خاوەن سێبەر و لق و پۆپی داری ئەوتۆ کە پیاو ماندوویی ڕێگای سەختی لەژێردا لە جەستە دەرکات و لەبن سێبەریدا بحەسێتەوه. (زەبیحی، ١٣٦٧:٩).

گزنگ و مەشخەڵی پەیڕەوێکی ئەدەبی تازە لە "سلێمانی"یەوە سەری دەرهێنابوو، بە ڕووناکییەك کە تائێستا بەردەوامە و بەشی زۆری کوردستانی گرتووەتەوە. یان ڕاستتر ئەوەیە کە لە ڕووی زمانەوە بوو بە ئەدەبیاتی ئەوانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن.

قوتابخانەی شیعری بابان کە هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەب بە قوتابخانەی نالیی دادەنێن و هەندێکیش لە باسیدا ناوی "نالی، سالم و کوردی" پێکەوە تۆمار دەکەن،

ئەو قوتابخانەیە گەر لە رووی ناوەرۆکیشەوە گەلێك دیمەنی لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆدا نەمابێت، ئەوا فۆرمی ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان هەر بەرەوپێشچوونی مێژوویی فۆرمی ئەدەبی ئەو قوتابخانەیە، بەتایبەتی ئەو زمانە کە ئەدەبیاتەکەی پێ دەنووسرێت، هەر ئەو زمانە تازە پتەوەیە کە ئەو قوتابخانەیە کردبووی بە کەرەسەی دەربڕینی ناوەرۆکەکەی و بەهۆی دارشتنی فۆرمی تایبەتی خۆی. گەر گۆڕینێکیش لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان و ئەو قوتابخانەیەدا ببینین، ئەوە هەر ئەو گۆڕانەیە کە مێژوو و سروشتی پێشکەوتن دروستی کردووە و دەبێت روو بدات و سەرچاوەی یەکەمی ئەو پێشکەوتن و بەرەوپێشچوونەشی لە زمانی ئەدەبیاتی ئەمڕۆماندا هەر ئەو رۆشنی و تازەگەری و دینامیکییەتەیە کە لە زمانی ئەدەبیاتی دەوری باباندا هەبوو دەستی پێکرد.

ئەو زمانە کوردییە، یان وردتر ئەوە ببێژین ئەو دیالێکتە کوردییەی لە سەرەتاوە شیعری "نالی" و "سالم" و "کوردی" پێ نووسرا، تەواو ئەو دیالێکتە نەبوو کە خەڵکی سلێمانی پێی دەپەیڤن، بەڵکو هەروەك خەڵکی سلێمانی خۆیان تێکەڵ بوون و گەر شێوەی قسەکردنیان تەئسیری چەند دیالێکتی جیاوازی کوردیشی تیا دیار نەبووبێت، ئەوا چەند بەشە دیالێکتێك هەر کاری تێکردووە، هەروەها ئەم تێکەڵییە لە زمانە ئەدەبییەکەشدا هەر دیاربووە.

هونەرمەندی و وەستایی دامەزرێنەرانی ئەو قوتابخانە ئەدەبییە، توانایەکی وای بەخشی بە ئەدەبەکەیان کە زۆر بڵاو ببێتەوە و باش بچێتە دڵەوە و کار بکاتە سەر شاعیرانی تری ناوچەی کوردستان و ئەو دەنگەی لە سلێمانییەوە بەرز بۆوە، دەنگیدایەوە و دەنگدانەوەکەشی لە یەکەم پلەدا لە ناوچەی سۆران بوو. هەر لەو سەردەمەدا شیعری "حاجی قادری کۆیی"، (١٨١٥-١٨٩٧) و "ئەختەر"، (١٨٣٦-١٨٨٦) و "کەیفی جوانڕۆیی" لە خاکی سۆرانەوە و "مەجدی"، (١٨٤٩-١٩٩٥) لە ئەردەڵانەوە و کۆمەڵێ شاعیری تری ناوچەکانی سنە و موکریان هەر بەو چەشنەیان نووسیوە کە "نالی" و هاوەڵەکانی نووسیویانە، واتە: بە پشتبەستن بە گەلێك بەڵگەی ئەدەبی دەتوانین بڵێین ئەو زمانە ئەدەبییەی لە سلێمانییەوە هەڵقوڵی، هەر لە سەرەتای دروستبوونیدا زمانی ئەدەبی هەر چوار بەشە دیالێکتەکەی کرمانجیی خواروو بوون، واتە سلێمانی و سنە و سۆران و موکریان. ئەوساش و ئێستاش لە ئاخافتنی رۆژانەیاندا ئەوەندە جیان کە هەر یەکێك لەوان ناو بنێین بەشە "دیالێکت"، بەڵام ئەوساش و

ئێستاش هەر بە یەك زمان و بە یەك چەشن نووسیویانە (مستەفا رەسوڵ، ١٩٧١-٣٣و٣٢).

"عیزەدین مستەفا رەسوڵ" لەمەڕ پێوەندی نێوان شێوەزاری سنە و موکریان لەگەڵ زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، ئاوا رای خۆی دەردەبڕێت:

"بۆ ناوچەی سنە و موکریانیش، هەروەك لەوێش هەر لە سەردەمی بابانەوە و پاش کزبوونی شیعری دیالێکتی گۆران هەر لەسەر پێڕەوەکەی (نالی و سالم و کوردی) شیعر دەستی پێکرد، هەر لەو کاتەوە تائێستاش ئەم پەیڕەوە هەر بەردەوام بووە. ئەو شتانەی لە ناوچەی سنە دەنووسرێن و دەگەنە ئێمە، یان ئەو نووسەرانەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کە لە گۆڤار یان رۆژنامەدا دەنووسن، کە لە ئێراندا رێگەی پێدەدرێت، یان جاروبار کوردی ئێران لە دەرەوەی وڵات دەری دەکەن، هەر بەو شێوە یەکگرتووە دەنووسن. ئەم بڕیارە زۆر قووڵتر و فراوانتر بەسەر خاکی موکریاندا دێتە رێ، چونکە ناوچەی موکریان لەپاڵ ئەوەدا کە مێژووی ئەدەبیاتەکەی ئەم دوو سەدەیە لەگەڵ ناوچەی سۆران و سلێمانی و سنەدا جیا ناکرێتەوە، ئەوێش وەك سلێمانی ساڵێکی گەشەدار و زێڕین لە مێژووی نیشتمانپەروەری و رامیارییدا هەیە، کە کاری تەواوی کردە سەر بزووتنەوەی رۆشنبیری و ئەدەبیات، کە تائێستا تەئسیری هەر ماوە". (مستەفا رەسوڵ ١٩٧١-٤١و٤٠).

کەواتە ئەم شێوە نووسینەی ئێستا لە بەشی زۆری کوردستانی عێراق و ئێراندا پێی دەخوێنرێت و دەنووسرێت و زمانی ئەدەبیاتە، شێوە نووسینێکی یەکگرتووی کوردییە کە هەموو خاوەنانی کرمانجیی خواروو (سنە، سلێمانی، سۆران و موکریان) و نووسەرانی کوردی "گۆران" و هەندێ نووسەری کوردی کەلهوڕ بەکاری دەهێنن (دیارترین نووسەر "دکتۆر کامیل حەسەن بەسیر"ە، کە نووسینە کوردییەکانی هەر بەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەیە.

ئێمە ناتوانین بە هیچ جۆرێك بەم شێوە ئەدەبییە بڵێین: شێوەی سلێمانی، چونکە هەروەك نووسینەکە خۆی تەنانەت نووسینی شاعیران و نووسەرانی شاری سلێمانیش لەگەڵ قسەکردنی ناو ماڵیاندا جیاوازییەکی بچووکی هەر هەیە، هەروەها وردە وردە گەلێك وشەی ئەم بەشە دیالێکت و دیالێکتەکانەی تری تێکەڵ بوو هەروەك هەندێ

بنەڕەتی گراماتیکی ئەوانیش جێی خۆی تێدا دۆزیوەتەوە و هەندێ لە جیاوازییەکانی فۆنەتیکی خەڵکی سلێمانیش لێرەدا جێگای نەبووەتەوە.

زمانی ئەدەبی یەکگرتوو لێرەدا لە سەرچاوەیەك دەچێت: کە لە سەرەتاکەیدا، واتە لەژێر زەمیندا، چ لە دیمەن و تام و پێکهاتنیدا هەر ئاوی روونە و بریتییە لە دوو بەش هایدرۆجین و بەشێك ئۆکسجین، بەڵام کە ماوەیەك بەژێر زەمیندا دەڕوا زۆر رەگەزی تری تێکەڵ دەبێت و تا لووتکەی تێربوون لە ئاوەکەدا دەتوێتەوە، کە بە رەگەزی تر گەیشت هەندێ لە تواوەکەی پێشوودا دەنێ و هەندێ شتی تر دەتوێتەوە تا لە ئەنجامدا و لەو کاتەدا کە هەڵدەقوڵێت لە ئەنجامی ئانالیزدا هەر"$H_2O$" دەر ناچێت، بەڵکو شتێکی تر دەردەچێت کە رەگەزی یەکەمی ئاوە، هەرچەندە دیمەنی دەرەوە و رواڵەتی هەر لە ئاوی سادە، یان لە ئاوێکی پەتیی روون دەچێت. (هەمان سەرچاوە: ٤٤).

بەم چەشنە ئەو زمانە ئەدەبییەی ئێستا بووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستان و ئەو کوردانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن بەو زمانە دەخوێنن و دەنووسن و زمانی نووسینی ئەدەبیاتیانە، ئەو زمانە لە سەرەتاوە لە شاری سلێمانیدا بوو بە زمانی ئەدەبیات و بڵاوبووەوە و هەموو ئەو تێکەڵبوون و تواندنەوە و رۆچوونەی بەسەردا هاتووە کە بەسەر زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو گەلاندا دێت، تا دەبێتە زمانی ئەدەبی هەموو نەتەوەکە. ئەم زمانە لەگەڵ شێوەی قسەکردنی شاری سلێمانی جیایی هەیە، هەرچەند رواڵەتەکەی هەر شێوەی ئەو شارەی پێوە دیارە.

بەڵام ئایا ئەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە، بووە بە زمانی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد؟ گەر نەبووە دەبێت بپرسین: ئایا نەتەوەی کورد ئەمڕۆ دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەیە، یان یەك؟ ئایا زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی کردن بە دوو، لەگەڵ ڕێڕەوی مێژووی نەتەوەی کورد دەگونجێت، یا نا؟

ئایا پەیداکردنی دوو زمانی ئەدەبی لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەمڕۆی نەتەوەی کورد دەگونجێت، یان نا؟ ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەی ئێستا ئایا لە قاڵبی ئێستادا وای لێدێت و دەتوانێت ببێت بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوە؟ چۆن دەتوانین ئەو ڕێبازە بدۆزینەوە کە مێژوو بۆ دروستبوونی زمانی ئەدەبیی

یەکگرتووی هەموو نەتەوەی داناوە و چۆن ئەمەی ئێستا وا لێ دەکرێت کە ببێت بە بنکەی پەیدابوونی ئەو زمانە؟

وەك وتمان ئەم زمانە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەوانەن کە بە هەموو بەشەکانی کرمانجیی خواروو دەدوێن، بەڵام ئەم شێوە نووسینە ئەدەبییە هێشتا نەبووە بەشێوەی نووسینی ئەوانەی کە بە کرمانجیی ژووروو دەدوێن، کە ئەمان لە رووی ژمارەوە بەشی زۆرتری کوردن. هەرچەندە هەندێ شاعیر و نووسەری ناوداری ئەوتۆشمان هەیە کە شێوەی ئاخافتنی ماڵەوەیان یەکێکە لە بەشەکانی کرمانجیی ژووروو، بەڵام نووسینیان هەر بەم زمانەیە کە لای ئێمە بووە بە زمانی نووسین و خوێندن و ئەدەبیات.

کەواتە ئەو زمانە نەبووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد، بەڵام هەروەك نەبووە بەو زمانە یەکگرتووە، هەروەها ناتوانین بڵێین ئێستا ئێمەی کورد دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان هەیە، چونکە هەر لەو کاتەدا کە ئەم زمانە لە دەوری بابانەوە تائێستا زمانی ئەدەبیی ناوچەیەکی گەورەی کوردستانە و لە ساڵی ۱۹۲۲ەوە تائیستتا زمانی خوێندن و نووسینی بەشی زۆری ئەو ناوچەیە، هەر لەو کاتەدا شێوە زمانێکی تر نابینین کە لە دەوری بابانەوە تائێستا بەو شێوە فراوانە و بەو بەردەوامییە زمانی ئەدەبیات بێت و لە هیچ شوێنێکی تری کوردستاندا بە کوردی خوێندن نییە و زمانی کوردی بە رەسمی نەناسراوە تا شێوەیەکی تری لەمە ببێتە زمانی یەکگرتوو با لە ناوچەیەکی بەرتەسکیشدا بێت.

کەواتە پێش ئەوەی گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە دەبێت زمانی ئەدەبیی کوردی یەك بێت، نەك دووان، دەبێت بپرسین ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە کامەیە و دەبێت چۆن بێت؟

هەندێ لەوانەی هەوڵی ئەوەیانە کوردی بکەن بە دوو زمان و خۆیان بە کردەوە ئەو رێگەیان گرتووە، بەناوی ئەوەوە کە کرمانجی ژووروو زمانی ئاخافتنی بەشی زۆری کوردە، لایان وایە کە دەبێت هەموو کورد کرمانجیی ژووروو بکەن بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی خۆیان.

ئەم رایە -بەلای ئێمەوە- نە راستە و نە دێتەدی، چونکە گەر ئەو بنەما دیموکراتییەی باسی لە سەرشۆڕکردنی بەشی کەم بۆ بەشی زۆر دەکات، لە مەیدانی زماندا راستیش بێت، ئەوا لێرەدا پێچەوانە دەبێتەوە و ئەو ئەنجامە ناگەیەنێت کە

ئەوان دیانەوێت. هەرچەندە مەسەلەی زمان و بڵاوبوونەوەی و داچەسپاندنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو کاری مێژووە و ئەو شتی راست دەچەسپێنێت و هەوڵی ناڕاست ناهێڵێت، بەڵام گەر بڕیاردان بۆ ئێرە راستیش بێت و هەر لەسەر ئەو پەیڕەوە دیموکراتییە بڕیاریشمان دا کە کرمانجی ببێت بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو، ئەوا مەیدانی هێنانەدی بڕیارەکەمان بۆ ئێستا وا دیارە تا ماوەیەکیش هەر کوردستانی عێراق دەبێت، چونکە توانایەکی وامان نییە کە لە شوێنی تردا بڕیارەکەمان بەجێ بهێنین، کەواتە مەسەلەی زۆر و کەمەکە بۆ کوردستانی عێراق پێچەوانە دەبێتەوە: ئەوەی بە کرمانجیی ژووروو دەدوێن بەشی کەمن و ئەوەی بە دیالێکتی تر دەدوێن و زمانیکی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەیە، بەشی زۆرن.

**ئەنجام:**

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی نەتەوە، مێژوو دروستی دەکات و ئارەزووی تاقە کەسی و دەستەیەك رۆڵی کاریگەرییان لە بەرەوپێشچوونی مێژوودا نییە، بەڵام تاقە کەس دەتوانێت رێڕەوی راستەقینەی مێژوو بەدی بکات و لەگەڵی بڕوات و پاڵ بە خێرا رۆیشتنەوە بنێت و نەبێتە کۆسپ لە رێگەیدا و نەبێتە هۆی دواخستنی ئەو پێشچوونە.

لەم جۆرە هەڵوێست و تێگەشتن و تەجروبەیە لامان وایە، کە نەتەوەی کورد زوو، یان درەنگ زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی خۆی دروست دەکات، کە دەبێت بە زمانی رەسمی خوێندن و نووسین و ئەدەبیاتی هەموو کورد. کە ئەم زمانە هیچ یەکێك لەم شێوانەی ئێستا نییە، هەرچەند دیمەن و تەئسیری شێوەیەکیان لەو زمانەدا زیاتر دیار دەبێت.

کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووش پێکهات مانای وا نییە کە شێوەی ئاخافتنیش دەبێتە یەك، بەڵکو کوردی هەر لایە وەك خۆی دەدوێت، بەڵام هەموو کورد وەك یەك دەنووسن.

هەرچەندە شێوەیەك دیمەنی لەوانی تر زیاتر بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە، دیار دەبێت، بەڵام ئەو زمانە زۆر رەگەزی تێکەڵی شێوەکانی ئێستای تیادا دەبێت. واتە لە هەرشێوەیەك شتێك خۆی لەو زمانەدا دەچەسپێنێت. لەبەر ئەوەش زمانەکانی جیهان بەرەو ئەوە دەڕۆن کە خۆیان لە سەختی و ئاڵۆزی رزگار بکەن، لەبەر ئەوە دەتوانین

بڕیاری ئەوە بدەین کە پەیڕەوە ئاسانەکانی گراماتیک، ئیتر گەر گشتی بن، یان لە یەك دیالێکتدا بن، خۆیان لە زمانی ئەدەبیدا دەچەسپێن. لە رووی فۆنەتیکیشەوە زیاتر ئەو شتانە لە زمانی ئەدەبیدا جێگیر دەبن، کە لە هەموو دیالێکتەکاندا یەکن، یان لە زۆربەیاندا لە یەك دەچن.

* ماستەری زمانەوانی و مامۆستای زانکۆی ئازادی مەهاباد.

**سەرچاوەی ئەم بابەتە:**

کۆمەڵە وتاری یەکەمین کۆڕی نێونەتەوەیی ئەدەبی کوردی، زانسگای کوردستان-سنە توێژینگەی زمان و ئەدەبی کوردی.

**سەرچاوە کوردییەکان:**


١- دەستەی نووسەران (١٣٨١) زمانەوان، تایبەتنامەی یەکەمین کۆنگرەی زانستی، فێرکاریی زمانی کوردی لە ئێراندا، ژمارە ٢، تاران، ئەنستیتۆی فەرهەنگیی کوردستان.

٢- زەبیحی، عەبدوڕەحمان (١٣٦٧)، قامووسی زمانی کوردی، ورمێ، ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی.

٣- کەریمی، عەلی (٢٠٠٥) ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمانی زەبیحی، سلێمانی چاپی دووەم، لە چاپکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە لە وەزارەتی رۆشنبیری.

٤- محەمەد عەزیز، حوسێن (١٩٩٩)، سەلیقەی زمانەوانی و گرفتەکانی زمانی کوردی، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٥- مستەفا رەسوڵ، عێزەدین (١٩٧١)، زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی، بەغدا، چاپخانەی سەلمان ئەلئەعزەمی.

٦- مەحوی، محەمەد (٢٠٠١)، زمان و زانستی زمان، سەرەتایەك بۆ زانستی زمان، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٧- نەبەز، جەمال (١٩٧٦)، زمانی یەکگرتووی کوردی، بامبێرگ، یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا.

### سەرچاوە فارسییەکان:

١- ترادگیل، پیتر (١٣٧٦)، زبان شناسی اجتماعی، درامدی بر زبان جامعه، ترجمه دکتر محمد طباطبایی، تهران، نشر اگه.

٢- ژان کالوه، لویی (١٣٧٩)، درامدی بر زبان شناسی اجتماعی، ترجمه دکتر محمد علی پوینده، تهران انتشارات نقش جهان.

٣- مدرسی یحیی (١٣٧٩)، درامدی بر جامعه شناسی زبان، تهران موسسه مطالعات و تحقیقات فرهنگی.

٤- همایون هما دخت (١٣٧٩)، واژه نامه زبان شناسی و علوم وابسته، چاپ سوم، تهران پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی.

### گۆڤارەکان:

١- گۆڤاری مەهاباد، (١٣٨٧)، ژمارە ٨٦، بانەمەڕ.

٢- گۆڤاری مەهاباد، (١٣٨٧)، ژمارە (٨٩-٩٠)، گەلاوێژ و خەرمانان.

# زمانی کوردی و پێوەندی بە ناسنامەی کوردەوە

محەمەد کەریمی- مەریوان*

ئەم وتارە جەخت لەسەر چەند خاڵی سەرنجڕاکێش دەکات:

١- زمانی کوردی لە رووی مێژوویییەوە.

٢- زمان و پێوەندیی بە ناسنامەی مرۆڤەوە.

٣- زمانی کوردی و پەیوەستبوونی بە کەسایەتی کوردەوە.

## ١- زمانی کوردی لە ڕووی مێژوویییەوە:

زمانی کوردی لە دیدوبۆچوونی زمانناسی و مێژوویییەوە لە لقە بەهێزەکانی بنەماڵەی "هیندۆئەورووپایی"یە و لەسەر بنچینەی هیندۆئەورووپایی ڕوواوە. ئەم زمانە بەهۆی نزیکایەتییەکی زۆرەوە لەو دوو بنەماڵە نزیك دەبێتەوە و بە لقە گەورەکانی زمانی ئارییایی وەکو مادیی کۆن و پارسیی کۆن و تارادەیەك ئاڤێستایی و پەهلەوی چەندان بەڵگە و دۆکیۆمێنتی عەقڵی و زانستی هەن کە ڕاستەوخۆ ئاماژە بەوە دەکەن، کە زمانی کوردیی ئەمڕۆ پاشماوەی ئاڵوگۆڕەکانی زمانی مادییە. لەوەی کە زمانی کوردیی ئەمڕۆ دەقاودەق پاش هەندێك ئاڵوگۆڕ دەچێتەوە سەر زمانی مادی و لەوێوە سەرچاوە دەگرێت. گومانی تێدا نییە یەکێك لەو بەڵگە و دۆکیۆمێنتانەی کە ڕاستەوخۆ زمانی کوردیی ئەمڕۆ گرێدەدات بە زمانی مادیی کۆنەوە، حەوزەی جوگرافیایی و ژینگەی مادەکانە لەگەڵ تەواوی ئەو سەرزەوینانەی کە ئەمڕۆ لە خۆرهەڵاتی ناڤیندا جێگای ژینی کوردانە و بە کوردستان دەناسرێت. یەکێکی تر: هەبوونی ژمارەیەکی زۆر وشەی کۆن لە هەموو لق و دیالێکتەکانی زمانی کوردیی ئەمڕۆدا کە هیچ پێوەندیی و هاوبەشییەکی دەنگی و ڕواڵەتی و واتاییان لەگەڵ هیچکام لە لقی زمانەکانی (ئێرانی) ئەمڕۆدا نییە. ئەگەرچی زمانی کوردی بە بەراورد لەگەڵ زمانانی ناوچەکەدا وەکو عەرەبی، تورکی، فارسی و ئەوانی تر لە فارسییەوە نزیکترە و هاوبەشییەکی بەرچاو لە نێوانیاندا دەبینرێت. وەکو (گارتسۆنی) یەکەم کەس بوو کە ڕێزمانی کوردی لە ساڵی ١٧٨٧دا بڵاوکردەوە، زۆر جەخت لەسەر ئەم بابەتە (نزیکایەتیی زۆری زمانی کوردی بە فارسییەوە) دەکات. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو شت: یەکەمیان، زمانی کوردی و فارسی سەر بە هەمان چڵی زمانە ئێرانییەکانن و سەدان و بگرە هەزاران وشەی ئاوێتە و هاوبەشیان پێکەوە هەیە، بەڵام زمانانی تری ناوچەکە وەکو عەرەبی و تورکی بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ کوردیدا نایەنەوە. دووەمیان: چونکە کوردستان سەرچاوەی ئایینی زەردەشت و ئاڤێستا و گاتاکانە و ئایینی زەردەتشتیش ئایینی هاوبەشی نەتەوەکانی ئەو سەردەمە بوون بە کورد و فارسەوە. ئەم دوو خاڵە هاوبەشە کە لەنێوان کورد و فارسدا هەن و هاوهەستییەکی کولتووری لەنێوانیاندا پێکهێناوە کە لەنێوان کورد و نەتەوەکانی تردا نین. بەم پێیە زمانی کوردی لەناو لقە زمانەکانی ئارییاییدا زمانێکی تەواو سەربەخۆیە و لە هیچ یەك لە زمانەکانی تر وەرنەگیراوە. بەڵگەی لە هەموو زمانە کۆنە

ئێرانییەکان کۆنترە و پاڵپشتێکی بەهێزە بۆ زمانی فارسی و زمانەکانی‌تری ئێرانی، ئەمەش وای کردووە کە نەتەوەی کورد لەلایەن فارسەکانەوە بە (رەسەنترین قەومی ئێرانی) ناوی لێ ببەین. ئەگەرچی ئەم دەستەواژەیە بۆ سڕینەوەی نەتەوە و پێناسەکانییەتی لە کورد و بە رەسمی نەناسینی وەکو نەتەوەیەکە.

**٢- زمان و پێوەندیی بە ناسنامەی مرۆڤەوە:**

زمان بەشێکە لە ناسنامەی مرۆڤ و بناغەی گەشەسەندنی ئەو. زمان جگەلەوەی ئامرازی پێوەندی و راگەیاندنە بۆ زۆر شتی تر بەکاردەبرێت. لەوانە گوزارە لە ویست و هیوا و داخوازییەکان -دەربڕینی بیروبۆچوونەکان- بەدەستهێنانی زانیاریی هەمەجۆر و پێویست. بنیاتنانی پێوەندیی کۆمەڵایەتی کە مرۆڤ دەتوانێت بەهۆیەوە ناسنامەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ خۆی دەستەبەر بکات. گرنگیی زمان لە سەقامگیربوونی کەسایەتیی مرۆڤدا بێ وێنەیە. مەهاباد قەرەداغی دەڵێت: "هەبوونی زمانێکی گەشەسەندوو و هەبوونی دەسەڵاتێکی دەروونییە، بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێت بە باشترین شێوە گوزارە لە هەبوونی خۆی بکات، پێویستە خاوەنی ئەو هێزە دەروونییە بێت، کە زمانێکی پەرەسەندوو پێی دەبەخشێت". یان وەك (ئیمسن) دەڵێت: "گەشەدان بە زمان گەشەدانە بە بناغەکانی بیر و زەینی مرۆڤایەتی". زمان بەرهەمێکی کۆمەڵایەتییە مرۆ ناتوانێت لە تەنیاییدا گەشە بە زمانی خۆی بدات. ئەوە پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانن کە زەمینە بۆ گەشەسەندنی زمان خۆش دەکەن. زمان بەگشتی ئەو ئامرازەیە گوزارە لە (من)ی خاوەن زمان دەکات گوزارە لە بینین و بیستن و بیرکردنەوەکانم بۆ جیهان و دەوروبەرم دەکات. بەپێی وتەکەی (ڤیکۆتسکی) زمان بڕیاردەرە لەوەی تۆ چۆن لە جیهان دەگەیت و بیری لێ دەکەیتەوە. لە هاوکێشەی پەیوەندیی زمان و هزردا دەگەینە ئەنجامێك کە بەهۆی زمانەوە بیرکردنەوەکانمان دەردەبڕین، بەڵام هاوکێشەی نێوان زمان و ناسنامە بە وتە فەلسەفییەکەی دێکارت (من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم) خۆی دەسەلمێنێت. دێکارت دەڵێت: "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم". کلیلی ئەم بیرکردنەوەیەش زمانە. لەم وتەیەی دێکارت ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە زمان و ناسنامە پێوەندییەکی بەهێز و نەپساویان پێکەوە هەیە. بە چەشنێکی وەها بێ یەکتری ناتەواو دەردەچن و هەر یەکەیان تەواوکەری ئەوی دیکەیانە. ئەگەر بەشێوەیەکی لۆژیکی ئەم وتەیەی دێکارت شیکاری

بکەین، دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە بڵێین: من زمان دەزانم کەواتە: دەتوانم بیر بکەمەوە، من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم. ئاکامی ئەم سوغرا و کوبرا دەبێتە ئەوەی کە بڵێین: "من زمان دەزانم، کەواتە من هەم"، واتە زمان نەوەك هەر پێوەندیی بە ناسنامە و کەسایەتی مرۆڤەوەیە، بەڵکو پەیوەستە بە بوونی مرۆڤیشەوە بە هەموو وزە و تواناکانییەوە. بە چەشنێکی وا مرۆڤی بێ زمان مرۆڤێکی بێ ناسنامە و بێ ناوەڕۆکە و تەنیا فیزیکی و جەستەیی حیسابی مرۆڤی بۆ دەکرێت.

### ٣- زمانی کوردی و پەیوەستبوونی بە کەسایەتیی کوردەوە:

کە زمان و ناسنامە هەمان هاوکێشەی نێوان زمان و بیرکردنەوەیان هەبێت، بەو ئەنجامە دەگەین کە ناسنامە و کەسایەتیی بێ زمان بوونی نییە و (من)ی تاکی کورد ئەگەر لە زمانی زگماکی و نەتەوەییم شارەزا نەبم، خاوەنی هیچ جۆرە ناسنامەیەکی نەتەوەییش نیم. ئەوەش بزانین گرنگیی زمانی زگماك لەوەدایە کە مەرجی فێربوونی هەر زمانێکی تری (بیانی) زاڵبوونی تەواوە بەسەر زمانی زگماکیدا و پێچەوانەی ئەمەش راستە. کە مرۆڤ لە زمانی نەتەوەیی خۆی شارەزا نەبێت، ناتوانێت زمانانی دی بە باشی فێر بێت.

کە زمان ئەو پێوەندییە بناغەییەی هەبێت بە ناسنامەی تاکەوە و تاکەکانیش بنیاتنەری کۆمەڵگە و نەتەوە بن، ئیدی زمان رۆڵێکی مەزن و بڕیاردەر دەبینێت لە دروستبوونی ناسنامەی نەتەوەییدا. دەزانین کە زمانی کوردی چ لە رابردوو و چ لە ئێستا و لە داهاتووشدا زمانێکی سەربەخۆیە و مێژوو ئەمەی سەلماندووە و گومانی تێدا نییە، هەروەها خاوەنی کۆمەڵێ سیما و خەسڵەتی تایبەت بە خۆیەتی و سترۆکتۆری زمانی کوردی پێوەندی هەیە بە ستراکتۆری بونیادی کۆمەڵایەتیی کورد و کەسایەتی مرۆڤی کوردەوە. هەموو ئەمانە تایبەتمەندێتی خویان هەیە و جیامان دەکەنەوە لە نەتەوەکانی دراوسێ و دەوروبەری. وەکو (ڤیلێڤێسکی) دەبێژیت: "زمانی کوردی لە سەردەمی ساسانییەکانەوە زۆربەی ئەو سیما و تایبەتمەندییانەی خۆی کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا پێیەوە دیار بوون هەبوون و لە زمانانی تری ناوچەکەیان جیا دەکردەوە".

ئەگەر وایە لە سەدەکانی شەشەم و حەوتەمەوە ئێمە دەتوانین وەکو میللەتێکی خاوەن زمانی سەربەخۆ باس لە خۆمان بکەین. هەروەها (مینۆرسکیش) جەخت لەسەر

ئەو سەربەخۆییەی زمانی کوردی و تایبەتمەندی و خەسڵەتە تایبەتییەکانی دەکات و لەم بارەیەوە دەڵێت: "زمانی کوردی لە ئێستاکەیدا زمانێکی تەواو سەربەخۆیە و هەبوونی دیالێکتە زۆرەکانی ناو زمانی کوردی، نەك هیچ گرفتێك بۆ ئەم زمانە دروست ناکات، بەڵکو لە داهاتوودا و لەگەڵ ستانداردکردنی زمانی کوردیدا ئەو هەموو دیالێکتە دەبنە مایەی دەوڵەمەندیی زمانی کوردی، ئەمەش ئەو ناگەیەنێت کە زمانی کوردی لە ئێستادا زمانێکی پەککەوتە و هەژار و لاوازە".

ئەگەرچی هەندێك لە نووسەران و سیاسییەکان ئەو گومانەمان لا دروست دەکەن گوایە زمانی کوردی لەبەر ئەوەی زانستە مرۆییەکانی پێ نانووسرێتەوە، زمانێکی لاواز و پەککەوتە و هەژارە. ئەمە لەگەڵ ئەوەدا کە بیرۆکەیەکی هەڵە و نازانستییە، پێوەندیشی هەیە بە کۆمەڵێك فاکتەرەوە کە یەك لەوانە دەروونییە و ئەوی دیکەشیان سیاسی و هۆکاری کۆمەڵایەتیشی هەیە. ئێمە وەکو نەتەوەی بندەست لە ئاست نەتەوەی سەردەستدا هەمیشە خۆمان بەکەم دەزانین. ئەگەرچی ئەم دۆخە دۆخێکی نائاساییە، بەڵام بۆ هەر نەتەوەیەکیتر کە لە دۆخی کوردا بێت رووبەڕووی دەبێتەوە. ئەم (گرێی خۆ بەکەم زانین)ە. وەك حاڵەتێکی گشتی نەتەوەیەکی بندەست لە دەروونی تاکەکاندا جێگر دەبێت و لە ئاست نەتەوەکانی سەردەستدا ئەمان بە نووسەر و سەرکردە سیاسییەکانیشەوە خۆیان بە کەمتر دەبینن، زمانی خۆیان لە ئاست ئەواندا بە هەژار و لاوازتر دەبینن. کولتووری خۆیان بەدواکەوتووتر دەبینن و دەکەونە ژێر کاریگەریی فەرهەنگ و زمان و کەسایەتیی نەتەوەی سەردەستەوە. نموونەی ئەمەش هەیە و جاری وابووە سەرکردەیەکی سیاسیی کورد بۆ کۆمەڵێك ئینگلیزی زمان قسەی کردووە بە جێگای ئەوەی بە زمانەکەی خۆی بدوێت بە زمانی داگیرکەر دواوە. لە حاڵێکدا وەرگێڕەکەی کورد بووە و دەیتوانی بە کوردی بپەیڤێت. ئەگینا زمانی کوردی بە هەموو دۆك و دیالێکتەکانییەوە تا بڵێی دەوڵەمەندە و نەك هیچی لە زمانانیتری ناوچەکە (عەرەبی- تورکی و فارسی) کەم نییە، بەڵکو لە هەندێك لەو زمانانەش دەوڵەمەندترە، بەڵگە بۆ ئەمەش زۆرە، ئەگەر لەمەڕ زمانیتری ناوچەکە بکۆڵینەوە، بۆمان دەرکەوێت کە ئەو هەموو تێکەڵ و پێکەڵە لە یەکتری و وشەی بێگانە دەبینین، کەچی ئەو زمانانە هەموو زانستەکان دەنووسرێتەوە و تەنانەت لە هەر جێگایەك وشە یان دەستەواژەیەك دەست نەکەوت، ئەوا لە زمانە ئەوروپاییەکان و بەتایبەت لە لاتین قەرزی دەکەن و کێشەکە دەبڕێتەوە. مەسەلەی کێشەی زمانی کوردی لە خودی

زمانەکەوە سەرچاوە ناگرێت و پێوەندیی بە نەبوونی دامودەزگای فەرهەنگی و فەرهەنگستانەوەیە کە لە بێ دەسەلاتی و بێ دەولەتیی کوردەوە سەرچاوە دەگرێت. ئێمە لە سەردەمی گلۆبالیزاسیۆنی فەرهەنگیدا دەژین و پێویستە هەموو وزە و توانامان بۆ گەشەدان بە زمانی نەتەوەیی و هەرچی زۆرتر دەولەمەندکردنی ئەو زمانە و لە هەموو بنکە فەرهەنگییەکاندا لە دێ و لە شار بخەینەگەڕ. هەروەها پێویستە بۆ گلۆبالیزەکردنی کولتووری نەتەوەییمان هەولێکی جیدی و ئەکتیڤ بدەین، ئەگینا لێشاوی خەتەرەکانی گەردوونگەرایی و گلۆبالیزم وەکو خاشاک وردمان دەکەن و... ئەماندەنە دەست ئۆقیانووسی ونبوون و لەناو گەلانی پێشکەوتووی جیهاندا دەتوێینەوە، بەلام بە تەیارکردنی وزە و تواناکانمان بۆ گەشەدان بە زمان و ئەدەب و دەولەمەندکردنی کولتووری نەتەوەییمان، هاوکات لەگەل گەلانیتری جیهان و ناوچەکەدا دەڕۆینە پێشێ و لەم کاروانە بەرینەدا (گلۆبالیزاسیۆنی فەرهەنگی) دوا ناکەوین.

* حەمەی کەریمی: کارناسی ئیلاهیات و زانستە ئیسلامییەکان

**سەرچاوە:**

ماڵپەڕی فەرمیی کانوونی زانستی، فەرهەنگیی رۆنان-مەریوان.

**ژێدەرەکان:**

- رەهەندی ژمارە١١، سالی ٢٠٠٠، بەشی زمان و ناسنامە: مەهاباد قەرەداغی.
- شەرەفنامە: چاپی ٢٠٠٤، بەشی وتوویژ: مەهاباد قەرەداغی.
- سیروان، ژمارە٣١٤، سالی حەوتەم، جێگای زمانی کوردی لە... عەلی روخزادی.
- رەهەند، ژمارە١١، هەمان بەش، ل٨٦ و٨٧.
- هەمان سەرچاوە، ل٨٩ و٩٠.
- شەرەفنامە، ل١٨١و١٨٢.
- ئاسۆ، ژمارە ٨٦، استمرار محرومیت کُردها از زبان مادری، حمزە محەمەدی.

ئەدەبی زارەکی و تایبەتمەندییەکانی:

دیمانەیەک لەگەڵ رەسوڵ سوڵتانی- بۆکان

سازدانی: شەریف فەلاح

**ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی گشتی پێناسەیەکی ئەدەبی زارەکی بکەین، دەبێت لەسەر بنەمای چوار کۆڵەکەی گرنگی: ١- بەیت. ٢- لاوك. ٣- حەیران. ٤- پەندی پێشینیان لەنگەر بگرین، رای بەڕێزت لەم بارەیەوە چییە؟**

دیارە ئەوەی تۆ باسی دەکەیت، واتە ئەدەبی زارەکی، لەڕاستیدا تاوتوێکردنی ئەدەبی زارەکی بەبێ هەرکام لەو ژانر و لایەنانە، پڕ لە کەموکووڕی و نوقسان دەبێت. راستە ئەوانە کۆڵەکە و باشتر بڵێین بناغەی ئەدەبی ئێمەن. لە هەرکام لەو ژانرانەدا بەشێوەیەك روخسارەکانی ژیانی رابردووی کوردەوارییەکەی خۆمان بەدی دەکەین. پەندی پێشینیان پڕە لە روانینی فەلسەفیی کورد بۆ ژیان، حیکمەتی ژیان. ئێمە لە ئاوێنەی پەندەکاندا بۆمان دەردەکەوێت کە کورد چۆن لە مەسەلە گرنگەکانی پێوەندیدار بە ژیانەوە، وردبووەتەوە.

بەیتەکان لایەنی جۆراوجۆریان هەیە. حەیران لەگەڵ دەربڕینی سۆزی غوربەت و ئەڤینداری شتێکی شاراوەمان بۆ دەخاتە روو. ئەویش ئەوەیە کە لە کوردەواریی کۆندا، لەنێو ئێل و عەشیرەتاندا کە حەیران گرنگیی تایبەتی هەبووە لەوێ، تەنیا پیاوی حەیرانبێژ نەبووە، بەڵکو ژنە حەیرانبێژیش هەبوون. هەموو ئەو کۆپلە حەیرانانەی کە بەو شێوەیە دەست پێدەکەن: ئەمن دەڵێم/ دەرێم، هەتیوە حەیران... ئەوانە ژن گوتوونی. ژنی دەنگخۆش لە کوردەوارییەکەی خۆماندا زۆر بوون، بەڵام بەرهەم و شوێنەواریان لێ نەماوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا شێوازەکانی بیروڕا گۆڕینەوەی نێوان کوڕ و کچە ئەڤیندارەکانی سەردەمانی زوو، لە ئاوێنەی حەیرانەکاندا دەردەکەوێت. حەز و ویستەکانیان و شێوازەکانی روانینیان بۆ ژیانی هاوبەش و ئامادەبوونیان بۆ قوربانیدان لەپێناوی خۆشەویستیدا. بە هەرحاڵ ئەو ژانرە ئەدەبییە فۆلکلۆرییانە لە زۆر رووەوە دەتوانن ببنە بنەما. دەرونزان و کۆمەڵناسانیش هێندەی ئەدیبەکان دەتوانن بۆ ناسینی ئێستا و رابردووی کورد پشت بەوانە ببەستن. نموونە: کۆمەڵناسەکان دەتوانن بە تاوتوێکردنی هەموو ئەو بەسەرهاتانەی کە لە رشتەی مرواریدا هاتوون، لە شێوە و باری ژیانی کۆمەڵایەتیی کورد لە رابردوودا ئاگادار بن. دەتوانن لەوێوە باشتر بزانن کورد چۆن ژیاوە. بەڕای من تاوتوێکردنی چیرۆك و قسە نەستەقەکانی نێو رشتەی مرواریی (مامۆستا عەلادین سەجادی) زۆر لە خوێندنەوەی مێژووی ئەوکات باشتر دەتوانێت ژیانی کۆنی کوردەواریمان بۆ روون بکاتەوە.

دەروونزانێکیش ئەگەر بیەوێت لێکۆڵینەوەیەك لەسەر خاڵ و حاڵەتە گشتییەکانی کورد بکات و لە سەرچاوە و ئاخێزگەی ئەو حاڵەتانە بگەڕێ کە ڕەگ و بناوانیان لە رابردوودایە، باشترین و دەوڵەمەندترین سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەکانی، دەکرێت فۆلکلۆر بێت. بڕوا ناکەم گۆرانیی هیچ نەتەوەیەك هێندەی گۆرانیی کوردی باسی مەم و ماچ و قووڵکەی گەردن و نێوانی سینگ و مەمك و خاڵی لێو و... بکات. ئەوە پێویستی بە لێکدانەوە و خوێندنەوەی کۆمەڵناسانە و دەروونزانی هەیە. ئەگەر یەکێك چاك شارەزای فەرهەنگی ئێمە نەبێت و نەزانێت لە کوردەواریی کۆندا ئێستاش لە هەندێ ناوچەی کوردستان گەورە بە چووکە و ژن بە ژنە و بەزۆر بەشوودانی کچ هەبووە و هەیە، لە واتای گۆرانیی " لانك، لانك لانکۆڵێ، لانك لە دار هەناریێ..." ناگات و نازانێت بۆ دەبێت ژنێك منداڵەکەی بنوێنێت و پەلەی لە نووستنی منداڵەکەی بێت، بۆئەوەی بچێتە ژووان. بە دڵنیاییەوە ئەو ژنە بە نابەدڵی دراوەتە باوکی ئەو منداڵە و لە خۆشەویستە راستەقینەکانی خۆی بی مراد بووە و پێك نەگەیشتوون و ئێستاش دایکی منداڵەکە هەر دڵی لێ بەر نەداوە. یان گۆرانیی: (بە تفەنگی بڕنەو ببڕن حەیاتم... دایکی حەوت کوڕ بی هەر بەتەماتم).

بەگشتی فۆلکلۆری ئێمە دەریایەکە و مرواری و گەوهەری لە هەموو جۆرێك و بۆ هەموو کسێك تێدایە، بەڵام دەبێت راوچیی بێت، ئەوجا دەسکەوتت دەبێت، ئەگینا هەر لە لێواری دەریاکەوە رادەوەستی و لەخۆوە پێت وایە تەنکە و چیی تێدا نییە.

ئەگەر بمانەوێ لە بەیتەکانەوە دەست پێ بکەین، خاوەن چ تایبەتمەندی و توخمگەلێکن و بە چەند جۆر دابەش دەبن و چۆنیان پۆلێن بەندی دەکەی؟

ڕەسوڵ سوڵتانی بەیتەکان ئاوا دابەش کراون :(دڵداری - حەماسی)، (عیرفانی و ئایینی) و بەیتی مێژوویی.

بەیتەکان گێڕانەوەی ڕووداون. هەرکام بەپێی ناوەڕۆکیان دابەش کراون. بۆ وێنە: بەیتی شۆڕِ مەحمود و مەرزینگان بەیتێکی دڵداری و حەماسییە. هەم باسی دڵداریی نێوان شۆڕِ مەحمود و مەرزینگانە و هەمیش، باسی پاڵەوانێتی و قارەمانێتیی شۆڕِ مەحمودە. بەیتی لاس و خەزاڵ هێندەی باسی دڵداریی نێوان لاس و خزاڵە و شۆڕی مەلا

نەبی دەکا، زۆر لەوە تر باسی سوارچاکی و پاڵەوانیی لاس دەکا، ناسر و ماڵماڵیش هەر وا.

بەیتە مێژووییەکانی وەك: قەڵای دمدم و باپیرئاغای مەنگوڕ، گێڕانەوەکانی مێژوون. ئەوکاتمیرە کوردەکان بەیت بێژیان لەگەڵ خۆیان بردۆتە مەیدانی شەڕێ بۆ تۆمار کردنی رووداوەکان و گێڕانەوەیان لە قاڵبی بەیتدا. بۆیە باشترین حاڵەت ئەوە بووە بەیتبێژ خۆی دیمەنی شەڕگەی لە نزیکەوە دیتبایە. پتر لەوە ئەگەر بمانەوێ بەشێوەی زانستی باسی لایەنە جیاوازەکانی بەیت بکەین لێرەدا مەوداکەی زۆر بەرتەسکە. ئەگینا خۆی بەیت هەڵدەگرێ لە چەندین لایەنی زمانی و شێوازەکانی گێڕانەوە و دارشتنەوە ئاوڕیان لێ بدرێتەوە بە تایبەتی تەکنیکی گێڕانەوەی بەیتەکان شیاوی ئەوەن لێکۆڵەرانی بواری چیرۆك و رۆمان بەشێوەی زانستی بە مێتۆدەکانی گێڕانەوە بیانخوێننەوە. بەیتی سەیدەوان یەکێکە لەو بەیتانەی وەك بزانم زیاتر لە دە شێوە گێڕانەوەی هەیە. هەر جارەی لە گۆشە نیگایەکەوە گێڕدراوەتەوە. ئەوەش ئێستا لە چیرۆکنووسیی مۆدێرندا بەرچاو دەکەوێ. خۆی ئەگەر سەد کەس لە یەك کاتدا بینەری یەك رووداو بین و بمانەوێ تاریفی بکەین و بیگێڕینەوە لەگەڵ ئەوەدا کە رووداوەکە یەك شت بووە و کاتی دیتنەکەش هەر یەك کات بووە، دیسانیش هەر کەسە و بەشێوەیەك دەگیگێڕێتەوە. ئەوجار رەگەزەکانی دیکەی چیرۆك لەنێو بەیتەکاندا شیاوی لێ وردبوونەوەن و شاعیر گوتەنی لێرەدا (بەستەڵەکە گیانە هەرێمی وتار).

### جوگرافیا و شوێن چ کاریگەرییەکیان لە سەرهەڵدانی بەیتەکاندا هەیە؟

دیارە زۆرترینی بەیتەکان لە ناوچەی موکریاندا روویان داوە. بەیت هەیە شوێنی دیار نییە. بەیت هەیە لە شوێنێکی دیکە روویداوە، بەڵام لە مەڵبەند و شوێنێکی دیکە گێڕدراوەتەوە. بۆ وێنە سەیدەوان رووداوێکی تراژیدیی لای ئێزدییەکانە لە چیای مەغلووبی داسنی کە لەسەر رێگای هەولێر-دهۆکە. ئەو چیایەی کە نێچیروان لێی هەڵدەدێردرێ و عەبدولعەزیز لەوێ سەیدەوان دەکوژێت، بەڵام گێڕانەوەی بەیتەکە لە موکریانە و بە زاراوەی موکریانییە. ئەوەش هۆکاری خۆی هەیە، بەیتی قەڵای دمدم لە لای ورمێ بووە و لە موکریان و بە زاراوەی موکریانی گوتراوەتەوە. دیارە دیوەخانەکانی موکریان گرنگییەکی زۆریان بە بەیتبێژان داوە.

**سیستمی کۆمەڵایەتی و قۆناغی فیودالی و دەرەبەگایەتی چ ڕەنگدانەوەیەکی لە هەناوی ئەدەبی زارەکی بەگشتی و ناوەڕۆکی بەیتەکاندا هەبووە؟**

دیوەخانی ئاغا و دەرەبەگەکانی کوردستان ئەگەر هیچ خزمەتێکی لە دەست نەهاتبێ و چاوپۆشی لەو چەوساندنەوە و ئازار و ئەزیەتانەیان بکەین کە بەرامبەر خەڵکەکە هەیانبووە، ئەوەندە قازانجەی هەبووە کە گرنگیان بە بەیتبێژ و حەیرانبێژان داوە. دیارە ئەو کارەشیان لەپێناوی خزمەتکردن بە ئەدەب و هونەری کوردیدا نەبووە، بەڵکو بۆ ڕازاندنەوەی کۆڕ و مەجلیسەکانیان و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ خۆ هەڵکێشان و خۆنواندنەکانیان بووە، چونکە بەشێك لە کەسایەتییەکەیان بەسترابووەوە بەوەی ئاخۆ: حەیرانبێژ و بەیت بێژەکانیان چەندە بەتوانا و لێهاتوون.

لەباری سیستمی کۆمەڵایەتییەوە: بەیت و حەیران هی سەردەمی خێڵ و عەشیرە و هۆزەکان بووە، بەتایبەتی لە لادێیەکاندا. کەوابوو ئەو ژانرانە، داهێنانیان و هۆندنەوەیان و تەنانەت پەرەپێدانیشیان لە سەردەمی قۆناغی پێش مۆدێرنیتەدا بووە. کە دەشڵێم پێش مۆدێرنیتە هیچ بەو واتایە نییە کە کورد بە قۆناغی پێش مۆدێرنەدا بەرە و مۆدێرنیتە و دوای مۆدێرنەدا تێپەڕیبێت. باشترە بڵێم قۆناغی پێش هاتنی ئامێر و ئامرازەکانی مۆدێرنیتە. بەتایبەتی سەرهەڵدانی شارنشینی و کاڵبوونەوەی ژیانی گوندی.

**بۆچی ئاکامی هەموو بەیتەکان بە ناخۆشی، شکست و ناکامی کۆتاییان پێ دێت؟**

دیارە ئەگەر ئاکامەکەیان ئاکامێکی تراژیك نەبووایە نەدەبوونە بەیت و چیرۆك و نەدەکەوتنە سەر زار و زمانان. ئەگەر شۆڕ مەحمود و مەرزینگان لە گێژاوی ڕووبارەکەدا نەخنکابان و لاسە شۆڕ بە تیری چلکنان نەچووبایە و سەیدەوان بە دەستی باوکی نەکوژرابایە و خان سولەیمان خانی (بەیتی لەشکری) بە ساغ و سلامەتی لە سەفەرەکەی بەغدایە گەڕاباوە و سیامەند و خەج و سیامەند پێکگەیشتبایەن، کوا دەبوونە ئەو بەسەرهاتە سەرنجڕاکێشانە و دەکەوتنە سەر زار و زمانان. ناوەڵڵا ئەوانیش وەك من و تۆ ژیانی هاوسەرییان پێکدێنا و سەریان پێکەوە دەنا و لە ژیانێکی ئاساییدا دەتوانەوە.

**لەباری فۆرم و دارشتنەوە سەرەڕای ئەوەی کە هۆنەر و دانەرەکانیان خاوەن خوێندەوارییەکی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام توخمی شیعری نوێیان تێدا بەدی دەکرێت، رای بەڕێزت لەم بارەیەوە چییە؟**

بەشێکی هەرە زۆری ئەوەی ئێستا بە ناوی شیعری نوێی کوردی بڵاوکراونەتەوە، - پێشتریش باسم کرد- نەیتوانیوە لە رەوانبوون و ئاوازی ناوەکی و فۆرم و وێنەی شازدا سنووری هێندێ کۆپلەی بەیت و حەیرانەکان ببڕێت. ئەگەر بێین و نێوەرۆکەکەیان لەبەرچاو نەگرین و تەنیا بە پێوەری سەنعەتەکانی شیعر هەڵیانسەنگێنین، ئەوان بگرە سەنعەتکاری جوانتریشیان تێداکراوە. بۆیەش ناوەرۆك هەڵداوێرم، چونکە هەرکامیان باسی جیهانبینی و کەڵکەڵە و ویست و داخوازی سەردەمی خۆیانن. بۆ وێنە لە حەیران و بەیتدا نایە باسی گڵۆپ و فڕۆکە و شەمەندەفەر بکات، کاتێ بە پێوەری سەنعەتە شیعرییەکان لێکیان دەدەیتەوە، سەرت سوور دەمێنێت لەو لێزانی و وەستاییەی هۆنەرانی نەخوێندەواری بەیت و حەیران. سەیرێکی بەیتی "سوارۆ" بکە، کۆپلەی یەکەمی بەیتی سوارۆ با بزانین چییە:

کیژ دەڵێ:

دوێنێ سووکەڵە سوارەکەی من دەچۆوە سەفەری کاولە لەحسایێ

دەیگوت کیێ بێنە دوو ماچم دەیە

بە سەری بە قوڕ و بە ملی بە کوێنم هەی لاڵ بم نەمدە دایێ

لە دوایە دەچوومەوە پێش سوکەڵە سوارەکەی خۆم

ئەمن زولفی خۆمم لەبەر دەگێڕا و

مەمکی خۆمم لەبۆ دەبردەوە تکایێ

دەمگوت سوارۆ

شەرتە ئەگەر بگەڕێیتەوە، لەوێ شەڕ و هەرامەتی دە هەڵڵایێ

ئەمن سینگی خۆمت بۆ دەکەم بە کاغەزێکی مەرجان و

مەمکی خۆمت بۆ دەکەم بە قەڵەمێکی فەرەنگی

شەو هەتا رۆژێ لە سەری بکەیتەوە موتاڵایێ.

............

لێی ورد بەوە، ئەو هەموو وردەکاریی و جوانکارییەی لەو کۆپلەیەدایە، هەتا ئێستا دەگمەنن ئەو شیعر نوێیانەی هێندەی ئەو کۆپلەیە سەرسامی کردبێتم لە وردەکاریی ئەدەبیدا. ئەو کۆپلەیە هەڵدەگرێ بە پێوەرەکانی فۆرماڵیستەکان، بە پێوەرەکانی هێرمۆنتیك، بە پێوەری سەنعەتە شەرقییەکانی شیعر لێکیدەیتەوە. زۆری تێدایە...

**بۆچی مەکۆ و مەڵبەندی زۆرێك لە بەیتەکان و گێڕانەوەیان (موکریان)ە، ئەو هۆکارە سیاسی، کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییانە چین کە ئەو دەڤەرە بووەتە هەوێنی سەرهەڵدانی ئەدەبی زارەکی؟**

دەکرێت بڵێین مەکۆی هۆنینەوە و گوتنەوەی بەیتەکان دەڤەری موکریانە. نەك رووداونی بەیتەکان. ئەو بەیتانە زۆرەبەیان لە دەرەوەی هەرێمی موکریان روویان داوە. ئەوەتا سەیدەوان لە ناوچەی ئێزدییەکان بووە، بەیتی لەشکری بەسەرهاتی خان سولەیمان خانی سۆران مێردەکەی خانزادی سۆرانە و لە دەرەوەی هەرێمی موکریان بووە، کاکە میر و کاکە شێخ هی ناوچەی پشدەر و بێتوێنە، لاس و خەزاڵ لە ناوچەی باڵەکاتی بووە، قەر و گوڵزەر لە ناوچەی پشدەر و بێتوێن بووە، بەڵام هەموویان لە موکریان و بە لەهجەی موکریانی گوتراونەتەوە، چونکە لەوێ دیوەخانی ئاغاکان بەیتبێژ و خۆشخانیان راگرتووە. نەك لەبەرئەوەی ئەو ئاغایە ئەدەبپەروەر و ئەدیب بووبن، هەرچەند هێندێکیشیان مایەیان تێدا بووە، بەڵام زیاتر لەبەر کەیف و خۆشی و رابواردنی شەوانی دیوەخان بووە. راگرتنی بەیتبێژ و خۆشخوان و حەیرانبێژی کارامە جۆرێك لە دەسەڵات و هێزنواندن بووە. ئەوەش کۆپییەك بووە لە دۆخی دەرباری پاشاکانی ئێران و لەڕاستیدا بووەتە نەریتێك، ئەمەش بووەتە کولتوور و هەوێنێك بۆئەوەی دەڤەری موکریان ببێتە کانگای هۆنینەوە و گێڕانەوە و پاراستنی زۆرێك لە بەیت و حەیرانەکان و بەگشتی ئەدەبی زارەکی و نەنووسرا و پشتاوپشت و سینگ بە سینگ و نەوە بە نەوە گەیشتوونەتە بەردی ئەمڕۆ و ئێستاش جیا لە کۆکردنەوە و پاراستنیان خەریکن لەسەریان کاری لێکۆڵینەوەی زانستیی هەمەلایەن دەکرێت.

**رۆڵ و پێگەی ژنی کورد لە فۆلکلۆر و بەتایبەت بەیتە کوردییەکان چۆن دەبینیت؟**

پێگەی ژنی کورد لە فۆلکلۆریش و لە بەیتیشدا جیاوازە. جارێك لە دارە و جارێك لە خوارە. لە گۆرانیی کوردیدا جارێك خۆی بە قوربانی کراوە و جارێك بە بێوەفا ناوی براوە. لە بەیتەکاندا قسەی لەسەر بکرێت باشترە. لە بەیتەکانیشدا ژن چەند روخسارێکی جیاوازی هەیە. بۆ نموونە لە سەیدەواندا ژن کپ و بێدەنگە. سێ کوڕ لە یەك رۆژدا، سێ زاوا لە یەك رۆژدا دەمرن، لە سەرانسەری بەیتەکەدا نووزەی دایکێك لاواندنەوەی خوشکێك، هەنیسکی بووکیش تەنانەت نابیسرێت. بەیتی سوارۆ لە هەموان بەهێزترە لەو بوارەدا. تەنانەت لە بەیتی لاس و خەزاڵیش. بەیتی لاس و خەزاڵ و شۆڕ مەحمود و مەرزینگان و ناسر و ماڵماڵ و کاکەمیر و کاکە شێخ و... هەرکامەیان بەشێوەیەك رۆڵی ژنیان تێدا دەردەکەوێت. بۆ وێنە خەزاڵ سەرۆك ئێل و عەشیرەتە و قەرەواش و نۆکەرانی لەبەر دەرگان و لە هەمان کاتیشدا گەلە ئاشقێکی دڵسووتاوی شێت و شەیدای بە دەورەوەن هەتا لاس دێ و بڵاوەیان پێ دەکاو...

لە شۆڕ مەحمود و مەرزینگاندا، مەرزینگان لەسەر پشتی لانکی! دراوەتە شۆڕ مەحمود، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکتریان خۆشدەوێت و باوکی مەرزینگان لەمپەرە. مەرزینگان لەوێدا نموونەی ئەوپەڕی بێدەسەڵاتیی ئافرەتە. هەر ئەوکاتەی وەفادارنە بەدوای شۆڕ مەحموددا خۆی دەخاتە رووبارەکەوە.

لە کاکەمیر و کاکە شێخ-دا ئەستێ و بوغدان دوو خوشکن شینی دوو براکەیان دەگێڕن کە بە دەهۆ بردوویانن و کوشتوویانن.

بەڵام لە بەیتی سوارۆدا گراوی (معشوق) هەر ئەو کچەی بەیتەکە لە زمانی ئەوەوە گێڕدراوەتەوە، هەر لە سەرەتاوە مەرجی پێکگەیشتن و ئاوەڵاکردنی سینگ و مەمکی خۆی بۆ سووکەڵە سوارەکەی گرێدەداتەوە و بە گەڕانەوەی سوارۆ لە شەڕی کاولە لەحسایە. ئەویش لە کۆپلەکانی دواییدا ئەو مەرجە توندتر دەکات و دەڵێت تەنیا گەڕانەوەت مەرج نییە دەبێت سەرکەوتووانە بگەڕێیتەوە. تەنانەت دوعای لێدەکات. دوعای بۆ ناکات و دوعای لێ دەکات و دەڵێت:

... رەبی سوارۆ ئەمن خەبەری مەرگی تۆم بۆ بێ کە دراویتە بەر مەودای شیر و قەناران، نەوەك سەری کەحێلی خۆت وەربگێڕی و ئەمن شەرمەزار بکەی لەنێو

شەدەشل و خاڵ لە مل و ناسك و نازداران. لەوێدا کچە هاندەری سوارەکەیەتی. دەڵێت ئەگەر بە تێکشاوی بێیتەوە ناتدەمێ ماچی دە زەرد و هەناران...

بۆیە بە لای منەوە کچی نێو بەیتەکەی سوارۆ رۆڵی هاندەرێکی بە جەرگ دەبینێت و سوارۆ وا لێدەکات کە تەنانەت ئەگەر لەپێناوی ئەو خۆشەویستییەشدا بێت و قارەمانێتی بنوێنێت و شەڕەکە بەرێتەوە و دوژمن ببەزێنێت. بۆیە ئەگەر بمانەوێت لە فۆلکلۆری کوردیدا بۆ دەور و رۆڵی ژن بگەڕێین، دەبێت هەر بەشەی بە جودا تاوتوێ بکەین، وەك: پەندی پێشینیان، بەیت، حەیران، شیعری کلاسیك و نوێ...

**پێناسە:**

- رەسوڵ سوڵتانی، شاعیر و وەرگێڕ.
- ساڵی ١٩٧٦ لەدایکبووی گوندێك لە نزیك شاری بۆکانی رۆژهەڵاتی کوردستان.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆسی زمان و ئەدەبیاتی فارسیی زانستگای کەرەجی هەیە.
- لە ساڵی ١٩٩٥-ەوە سەرقاڵی چالاکیی ئەدەبییە. لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی رۆژهەڵاتی کوردستاندا وەك: سروە، مەهاباد، ویرا، سیروان، بابەتی ئەدەبی بڵاوکردووەتەوە.
- لە ساڵی ٢٠٠٤-ەوە لە باشووری کوردستان نیشتەجێیە و لە گۆڤارەکانی کاروان، رامان، ئایدیا، وێران، واتە، گۆڤاری ٢٣، ئاینندە و بیاڤ و رۆژنامەکانی خەبات و کوردستانی نوێ و چاودێر و ئاڵای ئازادی و کوردستان راپۆرتی جاران بابەتی ئەدەبی و فەرهەنگیی بڵاوبووەتەوە و ئێستاش لەگەڵ هەندێ لە گۆڤارەکان هەر لە پەیوەندیدایە.
- لە ساڵی ٢٠٠٩-وە بە فەرمی ئەندامی ستافی بەشی فەرهەنگیی رۆژنامەی هەولێرە.
- لە دەزگای چاپ و پەخشی موکریانی هەڵسەنگێنەری کتێبە وەك زمانەوان و شارەزا لە زمانەکانی کوردی و فارسیدا.

هەتا ئێستا نۆ کتێبـی لە زمانی فارسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کـوردی و چاپ و بڵاویش بوونەتەوە، کە بریتین:

١- رۆمانی ژان (نووسینی مارگریت دۆراس).

٢- پێشەوای رابوون (کتێبێکە لەسەر کۆماری کوردستان).

٣- ژن لە فەلسەفەی سیاسیی رۆژئاوادا.

٤- کۆیلەکردنی ژنان (نووسینی جۆن ستیوارت میل).

٥- ئێمیلی ژان ژاك رۆسۆ.

٦- تاعوونی ئەلبێر کامۆ.

٧- رۆمانی سێ بەرگیی یەشار کەمال (ئەودیوی کوێستان).

٨- سەفەر و ئاسکۆڵەکەی بەختم گوزەل (رۆمانێکی مەحمود دەوڵەت ئابادی).

٩- سێبەری هەڵۆ (رۆمانێکە ئاوڕی لە نهێنییەکانی ژیانی ناپلیۆن بوناپـارت داوەتەوە).

١٠- کۆی بەرهەمە شیعرەکانیشی بەناوی "زیارەتی مـاچ" کـە سیاسـەتوان و کوردیزانی بەتوانا مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە پێشەکییەکی بۆ نووسیوە و یەکێتیی نووسەرانی کورد لقی هەولێر چاپ و بڵاوی کردووەتەوە.

- ئێستاش خەریکی وەرگێڕانی رۆمانێکی دیکـەی یەشـار کەمالـە بـە نـاوی (ئاغاکانی ئاقچاساز).

**فۆلکلۆری کوردی و سێ ڕوانگە:**

**دیمانە لەگەڵ قادر فەتاحی قازی، ئەحمەد بەحری و دکتۆر ڕەهبەر مەحمودزادە**

**سازدانی: زانکۆ خەلیفە- مەهاباد**

ئەحمەد بەحری — دوکتور ڕەهبەر — قادر فەتاح قازی

**زانکۆ خەلیفە: پێناسەی بەڕێزتان بۆ "فۆلکلۆر" چییە؟**

**قادر فەتاحی قازی:** فۆلکلۆر، ئەدەبیات و زانستی نێو خەڵکە، چونکە زوو "نووسین" کەم بووە، ئەو ئەدەبیات و زانستە دە نێو خەڵکدا رووارە و پارێزراوە. ئەدەبیات وەکو بەیت و باو، پەند، گۆرانی و...

زانست وەکو کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، ئەستێرە ناسین، دواودەرمان، حیسابی مانگەکان و...

**ئەحمەد بەحری:** گەلێ شارەزا و لێزان، بە زمانی جۆربەجۆر و لە گەل و وڵاتی جۆربەجۆردا، لەسەر فۆلکلۆر دواون، ئەوەش دەگەڕێتەوە سەر ئەو راستییە کە فۆلکلۆر یەکێك لە گرنگترین و بەرچاوترینی ئەو دیاردانەیە کە لە ژیانی دوورودرێژی ئادەمیزاددا، بە رەنگ و شێوازی جۆربەجۆر ساز بووە. فۆلکلۆر هەروەك دیاردەکانی دیکەی فەرهەنگ لە رەنگدانەوەی پێوەندیی ئینسان و سروشت، ئینسان و ئینسان و ئینسان و خۆیدا هاتووەتە ئاراوە. ئەوەی فۆلکلۆر لە دیاردەکانی تری ئینسان جیا دەکاتەوە و بایەخی تایبەتی پێ دەدات، خاوەنداریتییەکەیەتی. هەر ئەوەی کە خاوەنداریی فۆلکلۆر خەڵکە، تۆ دەباتە نێو ئۆقیانووسێك بابەتی رەنگاوڕەنگ بە پانتایی مێژوو. هەر لەو رووەوە گەڕان بەنێو فۆلکلۆردا هەرگیز ناتوانێت گەڕانێکی ئاسایی و کاتی و سەرپیی بێت. بۆ؟ چونکە تۆ بەسەر ئەزموون و ئیحساسات و دڵەڕاوکە و خۆشیی ئادەمیزاددا دەکەوی، کە سەدان و بگرە هەزاران ساڵە بەسەر یەکدا کەڵەکە بوونە لێکدراون و سواون و بەرەو ژیانی ئێستای ئێمە شۆڕابەیان بەرداوەتەوە. ئێمە ئەمڕۆ لە فۆلکلۆردا ئەوەی لێی دەگەڕێین "خۆمان"ین. ئەو "خۆ"یەی لە دنیای مۆدێرنی ئێستا سەیر لەگەڵ خۆی نامۆیە. بەدوای دوێنێ و پێرێی خۆمانەوەین، بەدوای ئەو دابڕانە گەورەیەی کە لەگەڵ سروشت و منداڵیماندا وەدیهاتووە. بەدوای ئەو بەشە لە رابردووی ونبووی خۆمانین کە مێژوو بەسەریدا قەڵمبازی داوە، یان هەر ئەرك و کاری ئەو پاراستنی ئەمە نەبووە. لەسەر بەردەنووسەکان، لەسەر سواڵەت و دەفرە کۆنەکان، لەنێو وشە و دێڕی کتێبە مێژووییەکان لە کوێ ئەو بەشە رابردووە ون بووە وەك لە فۆلکلۆردا پارێزراوە، بە جوانی و بە روونی ماوەتەوە؟ لە بەراوردی مێژوو و فۆلکلۆردا، فۆلکلۆر ئەو گشت

بابەتە ورد و نادیارانەن کە شانبەشانی مێژوو زەمانێکی دووردرێژیان پێواوە و لەگەڵ خۆیان تام و بۆن و بەرامەی بەشە ونبووەکەیان بۆ ئەمڕۆی ئێمە پێیە.

**دکتۆر رەهبەر مەحمودزادە:** لە پۆلێنکردنێکی ناسراودا ئەدەب بۆ دوو خانەی سەرەکیی دابەش دەکرێت، یەکەمیان: ئەدەبی نڤیسارییە و ئەوی دیکە ئەدەبی زارەکییە. با هەر لە سەرەتای ئەو باسەدا بڵێم بازنەی فۆلکلۆر لە بازنەی ئەدەبیی زارەکی فراوانتر و گشتیترە. فۆلکلۆر جۆرێك سوننەتە کە هەم ئەدەبێکی تایبەتی دە هەنبانەیدا هەیە و هەم رەگەزی ئاوەها کە لە جۆری دابونەریت و شتی لەم چەشنەیە، نەك لە چەشنی ئەدەب. کەوایە باشترە بڵێین فۆلکلۆر دابەشکردنێکی لەم چەشنەی هەیە: ئەدەبی فۆلکلۆری، نەریتی فۆلکلۆری و... سەرنجی ئێستای ئێمە زیاتر لەسەر ئەدەبی فۆلکلۆرە. دەکرێت بڵێین ئەدەبی فۆلکلۆری تەقریبەن هەر ئەدەبی زارەکییە. بۆیە گوتم تەقریبەن، چونکە بەگوێرەی تێگەیشتن و بۆچوونی هێندێك کەس ئەدەبی فۆلکلۆری مۆرکێکی کۆن و رەسانەیەتیشی پێوەیە. ئەوانە فۆلکلۆر بەجۆرێك کەلەپوور دادەنێن، کەلەپوور واتە میراتی کۆن، بەڵام ئەدەبی زارەکی حوکم نییە کۆن بێت، بەڵکو بۆ نموونە ئەو نوکتە و قسە خۆشانەش کە خەڵك رۆژانە بۆ گاڵتە و جەفەنگ بۆ یەکتری دەگێڕنەوە، دەگرێتەوە. جارێ خۆمان لە قەرەی ئەو جوداوازییە وردانە نادەین. ئەدەبی فۆلکلۆری، یان ئەدەبی زارەکی لە بەراورد لەگەڵ ئەدەبی نڤیساریدا چاکتر پێناسەی بۆ دەکرێت. گوتوویانە ئەدەبی نڤیساری ئەدەبێکی بیرلێکراو، دەستکرد، تاکەکەسی و عالمانەیە لە بەرانبەردا ئەدەبی زارەکی ئەدەبێکی خۆوێژانە، سروشتی و هەرەمەکییە. لێرەدا وا باشە روونکردنەوەیەك لەسەر وشەی هەرەمەکی یا رەمەکی بدەم. لەوانەیە تائێستا بیرمان لەوە نەکردبێتەوە کە رەمەکی شێوەی سووکەڵەکراوی هەرەمەکییە. هەرەمەکی سیفەتێکە کە وەپاڵ هەرەمە دراوە، هەرەمە واتە زۆرینە و پڕایی خەڵك یانی (تودەی مردم). هەرەمەکی یانی جڤاکی. ئێستا بە ئاکامێکی سەرنجڕاکێش دەگەین: لە ئاخاوتنی رۆژانەشدا رەمەکی بە شتی بیر لێ نەکراو و بەرنامە بۆ دانەڕێژراو دەڵێین. لە باسی جوداوازییەکانی ئەدەبی نڤیساری و ئەدەبی زارەکیشدا گوتمان ئەدەبی نڤیساری بیرلێکراوە مانای لاوەکی و زیمنی ئەو قسەیە ئەوەیە کە ئەدەبی زارەکی بیر لێ نەکراوە. من ئەو بۆچوونەم ئاوا قبووڵ نییە، راسترەکەی ئەوەیە بڵێین ئەدەبی نڤیساری. لەچاو ئەدەبی زارەکی بیرلێکراوتر و بەرنامە

بۆ دارێژراوتره و ئەدەبی زارەکیش خۆویژانەتر و بژار نەکراوترە. کاتێك ئێمه بۆ نموونه حەقایەتێکی کۆن لەگەڵ کورتە چیرۆکێکی نوێ هەڵدەسەنگێنین، راستیی ئەو بۆچوونەمان بۆ روون دەبێتەوە. حەقایەتە کۆنەکە لەوانەیە کەمی و زیادی هەبێت، دووپاتکردنەوەی نابەجێی هەبێت، زیادە و تێهەڵاخنین واتە (حشو و زوائدی) هەبێت، تەنانەت رەنگە هەڵەی گێڕانەوەشی تێدا هەبێت، بەڵام کورتە چیرۆك پەرداخکراوتر و داتاشراوترە. ئەو کەسانەی لە توحفەی موزەففەرییەدا شەرحی مامۆستا هێمن لەسەر بەیتی برایمۆکیان خوێندووەتەوە، لەوانەیە لە بیریان مابێت لە جێگایەکدا مامۆستا ئاماژە بۆ هەڵەیەك دەکات کە رەحمان بەکری بەیتبێژ لە گێڕانەوەکەیدا کردوویە یان لە بەیتی کاکەمیر و کاکەشێخدا لە هێندێك گێڕانەوەدا ئەو دوو کەسە وەك دوو ئاغای غەددار و خوێنمژ ناسراون و حەیدەر گۆرانیش وەك قارەمانێکی هەڵقوڵاو لە دڵی جەماوەری خەڵکی چەوسێندراو باسی لێکراوە، کەچی هێندێك زانیاری لە کتێبی شەرەفنامەدا پێمان دەڵێن ئەو رەوایەتانە لە بەیتی کاکەمیر و کاکەشێخ کە ئەو دووانە بە دوو میری مێرخاسی کورد و حەیدەر گۆرانیش بە بەکرێگیراوێکی عوسمانییان دەناسێنن راستترە.

**زانکۆ خەلیفە: ئایا فۆلکلۆری کوردی لە باری فۆرم، ناوەرۆك، جوانیناسی و زمانییەوە توانیویەتی شێوازێکی تایبەت بەخۆیەوە بگرێت، بۆئەوەی کە بڵێین ئەوە سەبك و شێوازی فۆلکلۆری کوردییە؟**

**قادر فەتاحی قازی:** بەڵێ، فۆلکلۆری کوردی لەباری فۆرم، ناوەرۆك، جوانیناسییەوە توانیویەتی شێوازێکی تایبەت بەخۆیەوە بگرێت.

**ئەحمەد بەحری:** ئەوەی جیاوازی خستە نێو ئینسانەکان و وای کرد لێك تێ نەگەن و هەر دەستەیەك ببێتە خاوەن زمانێکی تایبەت، گیرسانەوەیان لەسەر گۆشەیەکی ئەو گۆی زەوییە بوو. شوێنی ژیان لەگەڵ خۆی زمانی تایبەتی خولقاند، جلوبەرگی تایبەتیی هێنایەوە ئاراوە، چیرۆك و ئەفسانەی جیاوازی لێکەوتەوە، دابونەریتی جیاواز و تەنانەت خوردوخۆراکی جیاوازیش.

زنجیرەکێوی زاگرۆس کە بەدرێژایی وڵاتی کوردانادا تێدەپەڕێت، دەورێکی بەرچاوی لە گووران و پێکەوە ژیان و سەرهەڵدانی ئەو گەلەدا گێڕاوە و هەندێ تایبەتمەندی لە

ژیانی ئەواندا وەدیهێناوە کە تۆ لەنێو گەلانی دراوسێدا نایبینی. ژیانی گەلانی چیانشین وێدەچێت زۆر وێك بچن، هەر ئەو جۆرەی ژیانی دەشتایی و کەنار بەحر و ئەقیانووسان وێك دەچن، کاتێك بەرهەمەکانی رەسوڵ هەمزاتۆف داستانی دەخوێنییەوە، هەر دەڵێی داغستان کوردستانە. هەر دەڵێی رەسوڵ هەمزاتۆف کوردە و لەسەری کوێستانی گەدە و و بناری سپی رێز و قەندیل ژیاوە. هەر دەڵێی گوڵە شلێرەی داغستانی ترۆپکی چیاکانی کوردستانی داپۆشیوە. وشەکانی رەسوڵ هەمزەتۆف بۆنی شاخیان لێدێت، هەر ئەو جۆرەی ناتوانی چیا لە نووسەری کورد بسڕییەوە و زمانی کوردیش لە چیا، چیایی خاوەنی ورە و ئیرادەی بەهێزن، ئازا و نەترس. سەریزێون لە ئاست هەر دیاردەیەکی رۆحیان لە کوولەکە بکات، لە ئاست هەر هێزێکی شنەی بەرەبەیانی شاخیان لێ زەوت بکات. فۆلکلۆری چیانشینان پڕیەتی لە ئازایەتی و راستی و کردەوەی ئینسانی، پڕیەتی لە جوانی و بۆن و بەرامە. فۆلکلۆری چیانشینان بەرزن بە بەرزیی دوندی کێوەکانیان و روون و رەوانن بە روونیی کانیاوەکانیان.

شوێنی ژیان بابەتەکان تایبەت دەکات، فۆلکلۆری کوردیش لەو چوارچێوەیە بەدەر نییە. بڕیار نییە میللەتێکی خاوەن زمانی تایبەت و دابونەریتی تایبەت، فۆلکلۆرەکەی لەسەر فۆرم و نێوەرۆکی یەکیتر دامەزرێت و سەربەخۆیی تایبەتی خۆی نەبێت. راست بەپێچەوانەوە، یەکێك لەو خاڵانەی وەك بەڵگەی شوناسی چاوی لێدەکەین، فۆلکلۆرەکەمانە بە فۆرم و نێوەرۆك و جوانیناسی و زمانی تایبەتەوە، سەبك و شێوازی کوردانەی بەیتەکان، مەتەڵ و مەتۆڵۆکەکان، چیرۆك و ئەفسانەکان، شیعری گۆرانییەکان و... تایبەت بە خۆمانن و رەنگ و بۆنی کوردانە تەواو بە سەریانەوە دیارە. فۆلکلۆر یەکێك لەو کەرەسە گرنگانەیە کە دەکرێت بە ئەودا بچییە نێو دنیای جوانیناسانەی کوردی و بەپێی بۆچوون و ئەو هەڵوێستانەی کۆمەڵی کوردەواری گرتوویەتی، لە نیگای جوانیناسی ئەو بکۆڵییەوە.

**دکتۆر رەهبەر مەحموودزادە:** بۆ وەڵامدانەوە بەم پرسیارە، دەبێت ئاوڕ لە لکێکی تیۆریی ئەدەب بەناوی "موتالعاتی ژانر" بدەینەوە. لەم لکە زیندوو و روو لە گەشەی تیۆریی ئەدەبدا باسی ئەوە دەکرێت کە چۆن جۆر یان ژانرێکی ئەدەبی لەدایك دەبێت و پەرە دەگرێت و دوایی ژانری تازەتر لە داوێنی ئەم ژانرە کۆنەوە سەرهەڵدەدا و لە کۆتاییدا چۆن ژانرێك دەمرێت و تەریك دەمێنێتەوە. من پێم وایە ژانرێکی تایبەت و

گرنگ کە توانیویە لە چوارچێوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا سەرهەڵبدا و ریشە دابکوتێ و گەشە بکات، بەیتە. بەیت ژانرێکی ئەدەبی فۆلکلۆرییە کە وەك ئێوە لە پرسیارەکەتاندا ئاماژەتان پێکردووە لەباری فۆرم و ناوەرۆك و جوانیناسی و زمانەوە بە درێژایی ساڵ و سەدان توانیویەتی شێوازی تایبەت بە خۆی بگرێت. من لەسەر ئەو بڕوایەم لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا بەیت، ژانری دایکە. واتە دوایی حەیران و لاوك و بەند و وردەبەندی جۆراوجۆر لە هەناوییەوە لەدایك بوون. هەوڵ دەدەم میکانیزمی ئەو لك و پۆ دەرکردنە بەشێوەیەکی ساکار روون بکەمەوە، بەڵام باشتر وایە لەپێشدا چۆنییەتی سەرهەڵدانی خودی بەیت تاوتوێ بکەم. بەیت لە پێکگەیشتن و پێکەوە کۆبوونەوەی سێ ژانری ئەدەبی و هونەری جوداواز خۆی گرتووە. ژانری یەکەمیان حەقایەتی فۆلکلۆرییە. لە مێژووی هەموو گەلاندا حەقایەت و گێڕانەوە کۆنترین شێوەی ئەدەبی فۆلکلۆرییە. حەقایەتی فۆلکلۆری ژانرێکی ئەدەبییە. ژانری دووەم کە ژانرێکی ئەدەبی- هونەرییە، گۆرانییە. بۆ گوتم ژانرێکی ئەدەبی- هونەری؟ چونکە لە گۆرانیدا ئەوە شیعرە کە بە دەنگ دێتە چڕین. شیعرەکە لایەنی ئەدەبی ئەم ژانرەیە و چڕین و سترانەکەش لایەنە هونەرییەکەیەتی. ژانری سێیەم، جۆرێك ئیجرای نمایشی و دراماتیکە، کە ئەمەش بەشێوەیەکی خاو یا نەختێك کامڵتر لە کۆنەوە لەناو گەلاندا هەبووە. سەرنج بدەن بەو خاڵە کە حەقایەت دەگوترێت، بەبێ چڕین و بەبێ جووڵەی نمایشی. گۆرانی دێتە چڕین. جووڵەی نمایشی ئیجرا دەکرێت. بەیت لە ئاکامی تێکەڵبوونی ئەمانە پێکدێت. بەیتبێژ لە بەشێك لە گوتنەکەیدا حەقایەت دەگێڕێتەوە بەبێ ئەوەی سترانێك بچڕێت، یا جووڵەیەکی نمایشی ئیجرا بکات. بەیتبێژەکان بەم بەشەیان دەگوت تەخت. لە بەشێکی تردا، بەیتبێژ هێندێك رستەی شێوە شیعر دەچڕێت. بەوانەیان دەگوت بەند. بۆ بەشی سێیەم ئەوەی راستی بێت تایبەتمەندییە دراماتیکەکانی بەیت زیادتر لەوەی بەشێوەی ئیجرای نمایشی دەربکەون، بەشێوەی تۆخبوونەوەی رەگەزە دراماتیکییەکانی ئەو رستانەی دەگوترێن، دەردەکەون. ئەو رستانە کە هەڵگری باری دراماتیکن لەناو بەشی بەند و لەناو بەشی تەخت و هەروەها لەبەشێکی تری بەیتدا بڵاون. مەزەندەی ئەوە بکەن ئەو بەشەی دیکەی بەیت چ بەشێکە؟ بەیت یان وەکو حەقایەت دەگێڕدرێتەوە یان وەکو بەند و گۆرانی دەخوێندرێت. بەیت لەو دوو بەشەی بەدەر خۆ نییە؟ راستە، بەڵام یەکێك لەو

شوێنانەی بەیت کە ڕەگەزی درامایی یەکجار زۆر تێیدا زەق دەبێتەوە، ئەو شوێنەیە کە بەشی گوتنی تەخت دەگوڕدرێت بۆ بەشی چڕینی بەند. واتە بەشی پێکگەیشتنی تەخت و بەند. سەرنج بدەنە بەیتەکان بۆ نموونە لە زۆربەی بەیتە دڵدارییەکاندا کاتێك تەخت بە بەند دەگۆڕدرێتەوە کە کەسایەتییە سەرەکییەکان پێکەوە دەکەونە قسەکردن و یەکتر دواندن. وەك ئەوەی بەیتبێژ ویستبێتی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رابگەیەنێ کە یەکتر دواندنی کەسایەتییەکانی ناو بەیت سەرەتایەکی گرنگ بۆ ڕووداوە گرنگەکانی بەیتە. بەیت بەم چەشنە هەڵی دا و شەقڵێکی تایبەتی بەخۆوە گرت. ئێستا پرسیار ئەوەیە: دوای ئەوەی بەیت خۆی گرت، چۆن ژانری چکۆڵەتری دی لە هەناوییەوە سەریان هەڵدا؟ وەڵامی ئەو پرسیارەش دژوار نییە. لە هەموو ئەو ژانرانەی لە هەناوی بەیتەوە سەریان هەڵدا، تێکەڵاویی ئەو سێ ڕەگەزەی باسم کرد، (چیرۆك و شیعر و دراما) هەر پارێزراوە، بەڵام هەر جارەی یەکێك لەم ڕەگەزانە لەوانەی دی بەهێزتر و تۆختر دەبوو و ئەوانی دی بەبێ ئەوەی بەجارێك نەدیو بن و مەیدان چۆڵکەن، تا ڕادەیەك بە قازانجی ئەو ڕەگەزە زاڵە دەکشانەوە. لە حەیراندا ڕەگەزی شیعری ڕەگەزی زاڵ و بە دەسەڵاتی مەیدانە. لە لاوکدا ئەو دەستڕۆیشتوویيە بە ڕەگەزی درامایی دەبڕێت. لە درامادا کێشە یا (tension) بۆ تێکچنینی کرۆك و پێکهاتەی بەرهەمەکە دەورێکی سەرەکی دەگێڕێت. لە دەقی لاوکیشدا دەبینین بەهۆی ئامادەبوونی تۆخی کێشە (بە مانا هونەرییەکەی) دەق تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر دراماتیزە بووە. من زۆرم پێ ناخۆشە کاتێك دەبیسم هێندێك لە فۆلکلۆرناسانی کورد بۆ نموونە دەڵێن حەیران ئەو بەشە لە فۆلکلۆری کوردییە کە بە زاراوەی کوردیی ناوەڕاست دەگوترێت و لاوکیش ئەو بەشە لە فۆلکلۆری نەتەوەییمانە کە بە زاراوەی کوردیی سەروو دەگوترێت. ئەو قسەیە هەڵە نییە، بەڵام ڕووکەشترین توێژی باسەکەمان پیشان دەدا. توێژێك کە هەموو کەس دەیبینێت و پێویستی بە پرس و ڕای خاوەنڕایانی بواری فۆلکلۆریش نییە. جوداوازیی ژانرناسانەی لاوك و حەیران دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بابەتەی عەرزم کردن، بەڵام سەرهەڵدانی حەیران، خۆی یەکێکە لە جوانترین چیرۆکەکانی مێژووی فۆلکلۆری کوردی. حەیران بەشێکی چکۆڵەی ناو بەیت بوو کە دواتر بەهۆی سەرنجڕاکێش بوون و ناسکیی لەڕادەبەر، بەرە بەرە لە بەیت جودابووەتەوە و خۆی کەسایەتی و پێناسەیەکی تایبەتی بۆخۆی دەستنیشان کرد. ئەو

بەشە کامە بەشی حەیران بوو؟ بەشی گوتوبێژی کوڕ و کچ لەناو بەیتە دڵدارییەکانـدا بوو. ئێوە بڕۆن وەکـو تاقیکردنەوەیـەك ئـەو بەشـە لـەناو بەیتـە دڵدارییـەکان جـودا بکەنەوە. ناوی تایبـەتی کەسـایەتییەکانیش (خـەج و سیامەند، لاس و خـەزاڵ و...) لاببەن و لەجیاتی ئەوان ناوی کچە حەیران و کوڕە حەیران دابنێن، ئـەوەی دەمێنێتـەوە حەیرانێکی خالسە کە رەگەزە شیعرییەکانی زۆر بەهێزە. رووداوێکی لەم چەشنە لـەناو ئەدەبی کلاسیکیشدا روویداوە. غەزەل بەشێکی کورت بوو لـە قەسـیدە. ئەدەبناسـانی کـۆن دەیـانگوت غـەزەل تەشبیبـی قەسـیدەیە، چـونکە غـەزەل، جـوانترین و سەرنجڕاکێشترین بەشی ناو قەسیدە بوو، بەرە بەرە لێی جودابووەتـەوە و خـۆی بـوو بـە لکێکی سـەربەخۆی ئـەدەبی کلاسـیك. ئـەو دوو رووداوەی باسـم کـردن، دوو رووداوی هاوشێوە بوون لەناو ئەدەبی فۆلکلۆری و ئەدەبی کلاسیکدا. حەیران شۆخی چاومەست و نەشمیلانی ناو خێوەتی ئـەدەبی فۆلکلۆرییـە. وەك چـۆن غـەزەلیش کیـژی نـازدار و تاقانەی ناو باڵەخانەی ئەدەبی کلاسیکە.

**زانکۆ خەلیفە: ئایا فۆلکلۆری کوردی بە بەراوردکردن لەگەڵ فۆلکلۆری گـەلانی تر لەباری زمانی و وشەناسی و هەروەها لەباری جوانی ناسییەوە، تا چەندە دەوڵەمەندە و بەگشتی لە چ ئاستێکدایە؟**

**قادر فەتاحی قازی:** فۆلکلۆری کوردی بە بەراوردکردن لەگەڵ فۆلکلـۆری گـەلانی دی لەباری زمانی و وشەناسی، هەروەها جوانیناسییەوە زۆر دەوڵەمەندە و لەمێژە خۆی بە دنیا ناساندووە، وەك کارەکانی ئۆسکارمانی ئەڵمانی و...

**ئەحمەد بەحری:** ئیزن دەخوازم ئەو بابەتە لە روانگەی "بـەراوردکردن"ەوە چـاو لـێ نەکەم. ئەگەر راستیتان بوێت زۆر لەگەڵ بەراوردکردنی ئەم لەگەڵ ئـەو نـیم، چـونکە جۆرێك هەڵکێشانی یەکیان و داکێشانی ئەوی تری بەدواوەیە. فۆلکلۆری هەر گـەلێك خاوەنی تایبەتمەندیی ئـەو گەلەیـە، بەشـێوە ژیـان، دابونەریتـە کۆمەڵایەتییـەکان و هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەنانەت رووداوە مێژووییەکانییەوە گرێدراوە.

سەرجەم ئەو بابەتانەی لە قاوغی فۆلکلۆری هەر گەلێکدا کۆدەبنەوە، وا باشترە بە تەرازوو و نیگا و ئایین و مەزەب و... "دەبێ" و "نـابێ"یـەکانی خـودی ئـەو گەلـەوە هەڵسەنگێنرێت.

گەلی کورد گەلێکی شادیخوازە و سەردوولکە و شینگێڕی لەچاو شایی گێڕان لە پلەیەکی زۆر نزمتردایە. لە فۆلکلۆری کوردیدا ئەو پلە نزمییە بە خاڵی سەلبی دانان هەڵەیە. بەپێچەوانە هەبوونی شینگێڕی زۆری نێو فۆلکلۆری گەلێکی تریش لە روانگەی خۆوە وەك خاڵێکی سەلبی چاو لێکردنی هەڵەیە. هەر بۆیە ئێزن دەخوازم فۆلکلۆری کوردی وەك فۆلکلۆری کورد چاو لێ بکەم و بڵێم. بەهۆی شێوە ژیان و ژیانی تایبەتی چیانشینی و مێژوویەکی پڕ کارەسات و جەماوەرێکی شادیویست و نەڕەخسانی هەلومەرجی نووسین، فۆلکلۆری ئێمە لە بواری جۆربەجۆردا دەوڵەمەندە و تۆ دەتوانی بۆ لێکۆڵینەوەی لایەنی وەك زمان، دابونەریت، رووداو، عەواتف و ئیحساساتی ئینسانی کورد، غەم و شادییەکانی، جوان پەرەستیی و... ئاوڕی وێ بدەیەوە.

**دکتۆر رەهبەر مەحموودزادە:** حەزدەکەم باسەکە بەشێوەیەکی تر بهێنینە گۆڕێ. واتە لەجیاتی ئەوەی باسی بەراوردی فۆلکلۆری کوردی لەگەڵ فۆلکلۆری گەلانی دیکە بکەین، باسی جێگە و پێگەی فۆلکلۆری کوردی لەناو ئەدەبی کوردی لەچاو جێگە و پێگەی فۆلکلۆری گەلانی تر لەناو ئەدەبی ئەو گەلانە بکەین. جوداوازیی ئەو دوو بەراوردە لەو تەمسیلەدا خۆی دەنوێنێت: لەوانەیە ئێمە بمانەوێت باری خوێندنی قوتابییەکی پۆلی یەکەمی ئێرانی لەگەڵ قوتابییەکی پۆلی یەکەمی بەریتانیایی پێکەوە هەڵسەنگێنین. دواتر رەنگە بەو ئاکامە بگەین، چونکە نۆرمەکانی خوێندن لە ئێران و بەریتانیا وەك یەك نییە، باشتر وایە ئاستی قوتابییە ئێرانییەکە لەناو پۆلی خۆیدا لەگەڵ ئاستی قوتابییە بەریتانیاییەکە لەناو پۆلی خۆیدا هەڵسەنگێنین. ئەگەر ئاوا بۆ باسەکە بچین، بە بڕوای من جێگە و پێگەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی لەناو ئەدەبی کوردی بەگشتی، لەچاو بۆ نموونە جێگە و پێگەی ئەدەبی فۆلکلۆری فارسی لەناو ئەدەبی فارسی جێگەیەکی بەرزترە. هۆیەکەشی تاڕادەیەك روونە. هەرچی ئەدەبی نووسراو و ئەدەبی کلاسیکی گەلێك بەهێزتر بێت، ئەدەبی فۆلکلۆریی ئەو گەلە کەشێکی کەمتری بۆ دەمێنێتەوە و بە پێچەوانە ئەگەر بە هێندێك هۆی کۆمەڵایەتی و سیاسی لەناو گەلێکدا ئەدەبی نووسراو لاواز بێت یا پێشینەکەی زۆر کۆن نەبێت، ئەوا ئەدەبی فۆلکلۆری ئەو گەلە زیاتر بەخۆیدا دێت و سەرنجی پێ دەدرێت. مێژووی ئەدەبی نووسراو و ئەدەبی کلاسیکی کوردی زۆر کۆن نییە، کەوایە

کورد بەشێك لە جێگای بەتاڵی ئەو ئەدەبەشی بە ئەدەبی فۆلکلۆری پڕکردەوە. بۆیە سەیر نییە ئەگەر شاعیرێکی وەك "حاجی قادری کۆیی" ناوی شاعیرانێکی وەك "عەلی حەریری" و "عەلی بەردەشانی" هاوئاستی ناوی شاعیرێکی وەك "نالی" دابنێت. دیسان دمەوێت لە تەمسیلێکی نەختێك ساکارکەرەوە بۆ روونکردنەوەی باسەکە کەڵك وەربگرم: ئەگەر بۆ نموونە لە ئەدەبی فارسیدا رێژەی گرنگیی ئەدەبی کلاسیك و ئەدەبی فۆلکلۆر مەسەلەن هەشتا بە بیست بێ، ئەو رێژەیە لە ئەدەبی کوردیدا دەبێت بە شێست بە چل یا تەنانەت پەنجا بە پەنجا. دەبێت ئەو بابەتەش بە باسەکەمانەوە زیاد بکەین کە بایەخی فۆلکلۆری کوردی هەر بەتەنیا بایەخێکی ئەدەبی و جوانیناسانەی رووت نییە، بەڵکو بایەخێکی زمانەوانیشی هەیە. زمانناسی فارس بۆ نموونە ئەگەر بیەوێت لە مێژووی چەند سەدە لەمەوبەری زمانی فارسی بکۆڵێتەوە، بۆ نموونە دەستەودامێنی دەقێکی نووسراوی وەك تاریخی تەبەری دەبێت، بەڵام زمانناسێکی کورد بۆ کۆڵینەوە لە پێشینەی زمانی کوردی، هیچ سەرچاوەیەکی باشتر لە فۆلکلۆر پێ شك نایێ. هەڵبەت ئەوەندەش بڵێم ئەو گرنگایەتییەی فۆلکلۆر هەتا هاتووە و کاتی بەسەردا تێپەڕیوە، کەمتر بووە. من وای بۆ دەچم گرنگیدان بە فۆلکلۆر لە زەمانی گۆراندا زۆر زیادتر لە گرنگیدانی بەرەی ئێمە بووە.

**زانکۆ خەلیفە: ئایا بەڕای بەڕێزتان فۆلکلۆر بەشێك لە ئەدەبیات لە ئەژمار دێ، یا سەربەخۆیە؟**

**قادر فەتاحی قازی:** وەکی کوتم فۆلکلۆر ئەدەبیاتی ناو خەڵکە کە زۆر لەسەر قەڵەم و زمانی شاعیرەکان و نووسەرەکان شوێنی داناوە و دیارە ئاسەواری ئەوان لەسەر خەڵك ئەسەر دادەنێت، بەڵام لەسەر خودی "فۆلکلۆر" ئەسەرێکی وا بەرچاو ناتوانێت دانێت.

**ئەحمەد بەحری:** ئەگەرچی ماکسیم گورکی دەڵێت: "بناغەی ئەدەبیات لە فۆلکلۆردایە"، بەڵام بێت و لە ئەدەبیاتدا خاوەندارەیتی وەك ئەسڵێك چاو لێ بکرێت، دیارە هیچ بابەتێکی فۆلکلۆری نایەتە نێو چوارچێوەی ئەدەبیاتەوە. لە ئەدەبیات هەموو شیعر و رۆمان و کورتەچیرۆك و ژانرەکانی تر مۆرکی تاکەکەسیان بەسەرەوە. خاڵی جیاوازیی فۆلکلۆر و ئەو چەشنە بابەتە ئەدەبییانە دەگەڕێتەوە سەر ئەوەی

خاوەنی فۆلکلۆر روون نییە و بە واتایەکی تر خەڵکە و موڵکی گشتییە. بابەتی فۆلکلۆری دوو تایبەتمەندیی سەرەکی هەیە: یەکەم، ئەگەر لە رابردووی دووریشدا بە دەستی تاکەکەس خوڵقابێت، لە درێژایی زەماندا، بەرهەمی بەپێز ناوی خوڵقێنەری لە مێشك و زەینی خەڵکدا سڕیوەتەوە، دووەم، وێناچێ هیچ بەرهەمێکی فۆلکلۆری بێ ئاڵوگۆڕ و دەستتێوەردان مەودای زەمانی بڕیبێت. ئەو تایبەتمەندییەی فۆلکلۆر ئەگەرچی ئەوی لە شکڵی سەرەتاییەکەی خۆی دوورخستووەتەوە و لەو دوور خستنەوەیەدا هەندێ لایەنی زمانی و فەرهەنگی لەنێو چووبن، بەڵام نزیکی خستووەتەوە لەو فکرەی خوازەر ویستوویەتی و پێی وایە دەبێت وابێت.

**دکتۆر رەهبەر مەحمودزادە:** ئەگەر لە زاراوەی مەنتیقی کەڵك وەربگرم دەڵێم پێوەندیی نێوان ئەدەبیات و فۆلکلۆر، (عموم و خصوص من وجه)ە. واتە ئەوانە پاژێکی هاوبەشیان هەیە کە دەبێتە ئەدەبی فۆلکلۆری، بەڵام هەم بەشێك لە ئەدەب هەیە کە فۆلکلۆری نییە، وەك ئەدەبی کلاسیك و ئەدەبی مۆدێرن، هەم بەشێك لە فۆلکلۆر هەیە کە ئەدەب نییە، وەك دابونەریتی فۆلکلۆری، بەڵام سەرەڕای سەربەخۆییەکی رێژەیی کە ئەم دوو بوارە هەیانە، هەر کامەیان بۆ توێژینەوەی ئەوەی تر باشترین رێنوێنە. بۆ نموونە بۆ توێژینەوەی بەیت کە بەشێکی ئەدەبی فۆلکلۆرییە، زۆرجار ئاگاداریی لە دابونەریتە کۆنەکان بۆ تێگەیشتنی قووڵی دەقی بەیت یاریدەدەرێکی باشە. هێندێك جاریش وەك گوتم ئەو دووانە تەواو لێك بەستراون. بۆ نموونە قەدیم کاتێك ئاغایەکی دەستڕۆیشتوو چووە بۆ راوە کەروێشك یەکێك لەو دەست و پێوەندانەی لەگەڵ خۆی بردووە بەندبێژ بووە هەتا لە کاتی راو و تەماڵ هەڵناندا پاییزەی بۆ بڵێت. پاییزە لەو زەمینە کۆمەڵایەتییەوە بەستراوەتەوە. کەوایە هەم بۆ لێکۆڵینەوەی نەریتی راوەکەروێشك ناسینی دەقی پاییزە پێویستە و هەم بۆ ناسینی دەقی پاییزە ناسیاریی لەگەڵ نەریتی راوە کەروێشك گرنگە.

**زانکۆ خەلیفە: ئایا فۆلکلۆر لەسەر ژانرەکانی ئەدەبیات وەکو شیعر، چیرۆك، رۆمان، رەخنە و... هتد کاریگەری هەیە، ئەگەر هەیەتی میکانیزمی شوێندانانەکەی چۆنە؟**

**فەتاحی قازی:** شاعیر و نووسەر لە باوەشی گەل دێنەدەر، فۆلکلۆریش ئەدەبیاتی گەلە، کەوابوو فۆلکلۆر لەسەر شیعر، چیرۆك، رۆمان، رەخنە کاریگەری تەواوی هەیە. ئەو ئاسەوارە لە بۆشاییدا ناتوانن وەدی بێن و هەڵقوڵێن.

**ئەحمەد بەحری:** بێگومان هەیەتی. ناکرێت تۆ شاعیر یان نووسەرێك جیا لە بەستێنی فەرهەنگی گەلێك چاو لێ بکەی. خوڵقێنەری بێ پشتیوانی فەرهەنگی لە خەیاڵدا ناگونجێت. تۆی شاعیر، یان نووسەر بە وەدیهێنانی بەرهەمی خۆت پێویستیت بە زمان بە وشە و عیبارەت و تایبەتمەندییەکانییەتی. پێویستت بە ئاگاداری لەسەر ئوستوورە و ئەفسانە و قارەمانەکانە. بەشێکی هەرە زۆری ئەوانە لە چوارچێوەی فۆلکلۆردا کۆبوونەتەوە. لە ئەدەبیاتی کوردیدا چ زۆرن نموونەی ئەو شاعیر و نووسەرانەی کە بەلێشاو بەرهەمەکانیان راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پڕییەتی لە بابەتی فۆلکلۆری.

کەڵکوەرگرتن لە فۆلکلۆر هەر تایبەت بە شاعیران و نووسەرانی کورد نییە، لەنێو هەموو گەلاندا ئەو کەڵکوەرگرتنە هەیە. بەپێی زانیارییەکی لەسەر زمانی تورکی ئازەربایجانیدا هەمە، تەنانەت بناغەی خوڵقانی "حەیدەر بابا"ی شەهریاریش دەچێتەوە سەر فۆلکلۆری ئەو گەلە. تورکەکان ژانرێکیان هەیە بە ناوی "بایاتی". بایاتی قاڵبە شیعرێکی شێوە چوارخشتەکییە. یەکێکە لە جوانترین و پڕ هەستترین بابەتەکانی فۆلکلۆری ئەو گەلە. شەهریار گۆشەچاوێکی لێی بووە.

**دکتۆر رەهبەر مەحمودزادە:** فۆلکلۆر دەتوانێت لەسەر ئەدەبیاتی هاوچەرخ کاریگەریی هەبێت، هەروەك بە کردەوەش هەیبووە، بەڵام پێم وا نییە ئەو شوێندانانە میکانیزم و ئالگۆریتمێکی دیاریکراوی هەبێت، ئەگەریش هەیەتی من نایزانم و ئاگاداریم لێ نییە. ئەوەندە دەتوانم بڵێم شوێندانانی ئەدەبی فۆلکلۆری لەسەر ئەدەبی هاوچەرخ، هێندێك جار لەباری فۆرمەوە بووە و هێندێك جاریش لەباری ناوەرۆکەوە. شیعری کوردی لە قۆناغی یەکەمدا بە گەڕانەوە بۆ فۆرمی شیعری فۆلکلۆری نوێبووەوە. نموونە بۆ شوێندانانی ئەدەبی فۆلکلۆری لەسەر ئەدەبی هاوچەرخی کوردی لەوە بەرچاوتر نابێت. لە ئەدەبیاتی هیچکام لە گەلانی دەر و جیرانماندا رووداوێکی لەم چەشنە رووی نەداوە. من بەشێوەیەکی بایەخدەرانە باسی ئەو بابەتە ناکەم و باسی چاك بوون، یان خراپ بوونەکەی ناکەم هەر ئەوەندە دەڵێم گەڕانەوەی کورد بۆ ئەدەبە

فۆلکلۆرییەکەی لەچاو گەلانی هاوسێی، سەرەتا چڕو بەرچاو بوو، بەڵام دوایی هەر بەو خەستییە لێی دابڕا. ئەمڕۆ زۆرێك لە خوێندەوارانی کورد ناسیارێکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیدا نییە. زمان و ناوەرۆکی ئەدەبی فۆلکلۆری بۆ رووناکبیر و خوێندەواری کورد نامۆیە. پتانسییەلە زمانییەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری لە زمانی نووسینی ئەمڕۆی کوردیدا زۆر کەم کەڵکی لیَ وەردەگیرێت.

**زانکۆ خەلیفە: بەسەرنجدان بەوەی کە گەلی کورد لە چەند وڵاتدا دەژین ئایا ئەو بەربڵاوبوونە لەسەر فۆرم و ناوەرۆك و... هتد فۆلکلۆری نەتەوەکەماندا شوێنی هەبووە، بۆ وێنە ئایا دەتوانین بڵێین فۆلکلۆری کوردەکانی ئێران لەگەڵ فۆلکلۆری کوردەکانی دانیشتووی تورکیا جیاوازی هەیە؟**

**قادر فەتاحی قازی:** بەڵیَ، کورد لە چەند وڵاتی دراوسێدا دەژین، ئەو هەڵکەوتە لەسەر فۆرم و ناوەرۆکی فۆلکلۆری نەتەوەکەمان شوێنی داناوە، لەگەڵ ئەوەش هێندێك لە بەیتەکان لە تەواوی کوردستاندا ناسراون وەك بەیتی مەم و زین و خەج و سیامەند. بەشێك لە دەقە فۆلکلۆرییەکان تایبەتی ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستانن و ئاسەرواری وڵاتانی دیکەشی وەرگرتووە وەك بەیتی شێخی سەنعان، یان داستاناکە کورد دایناوە، بەڵام قارەمانی داستان لە نەتەوەیەکی دیکە بووە وەك محەمەد حەنیفە.

**بەحری:** دیارە ماکەی ئەو پرسیارە دەگەڕێتەوە سەر ئەو مەبەستە کە بەدوور نییە فەرهەنگی نەتەوەکانی دراوسیَ کاری کردبێتە سەر فۆلکلۆری نەتەوەکەمان و لە ئاکامدا سنوورەکان جۆریَ جیاوازییان خستبێتە سەر فۆلکلۆری دانیشتووانی ئەم، یان ئەولای سنوورەکان.

ئاڵوگۆڕی فەرهەنگی و شوێندانانی زمانی گەلان لەسەر یەك، راستییەکی حاشا هەڵنەگرە. ئەم شوێندانانە لە مەودای زەماندا روودەدات و دەسەڵات خێرایی پیَ دەدا. ئەگەر بەرەنگاری هەمەلایانە لەلایەن گەلی ژێردەستەوە نەیەتە ئاراوە، دەتوانێت رەگ و ریشەی فەرهەنگی گەلی تێکشکاو هەڵتەکێنێت و لەسەر سەفحەی رۆژگار بسڕێتەوە. سەربەوردی "قبتی"یەکانی میسر نموونەیەکە لەو ئاسیمیلە و تێداچوونی هەمەلایەنە. لەو نێوەدا زمان دەوری سەرەکی دەگێڕێت. مانەوەی زمان و خۆڕاگری ئەو لە ئاست گوشاری زمانی دەسەڵات، شەرتی سەرەکی مانەوەی هەر میللەتێکە. تۆ بە

پاراستنی زمانەکەت، هەر وشە و عیبارەت و ئایدیۆمی خۆت ناپارێزێت، هەرکام لـەم کەرەسانەی زمان جیا لەباری ماناییانەوە تۆ بە رابردووتەوە گرێدەدەن و نایەڵن لەگـەڵ فەرهەنگەکەت نامۆ بێت. ئەو دوور نەبوونەوەیە گارانتی مانەوەی فەرهـەنگی تۆیـە و لە بنەمای ئەو هەوڵەدا جۆرێك شوناسپارێزی تێدا بەدی دەکرێت. ئەگـەر هەلومـەرج بەو جۆرەی گوترا بچێتە پێش، ئاڵوێری فەرهەنگی و تەنانەت زمانیش وەك خـاڵێکی ئیجابی چاوی لێدەکرێت و دەبێتە داڵدە و پشتیوانی گەشەی فەرهەنگی و زمانی هـەر میللەتێك.

من زەبروزەنگی فەرهەنگی ئەو و لایەنەکانی سنوور ئەوەندە شوێندانەر نابینم کـە خزینە نێو دەروون و هەناوی فەرهەنگی ئێمە و تەنانـەت فـۆرم و نێـوەرۆکی بابەتـە فۆلکلۆرییەکانمانیان گۆڕیبێت.

وێدەچـێ هۆیەکـەی لـە دوو خاڵـدا خـۆ بنوێنێـت: یەکـەم، بـەهێزبوونی بـاری فەرهەنگیمان بێ و ئەو باوەڕ هەمەگیر نەبووبێت کە هی ئـەوان باشتر و هـی خۆمـان نا... بە واتایەکی تر هەلومەرجی بەرەو ئاسیمیلە چوونی کورد لە هیچ لایەکـدا نـابینم. دووەم، کانالیزەبوونی بیر و باوەڕە سیاسییەکان -ئەوەی پێی دەڵێن کوردایـەتی- پلـەی تێگەیشتوویی جـەماوەری بردووەتـە سـەر و زۆربـەی خـەڵکی کوردسـتانی لەئاسـت ئاسیمیلە بوون واکسینە کردووە.

هەلومەرجی کوردستانی تورکیا پێویستی بە لێوردبوونەوەیەکی ورد و هەمەلایەنە هەیە. یاساغیی حەفتا ساڵەی زمانی زگماکی دەتوانێت گرێ بخاتە سەر رەوتی گەشەی نەتەوایـەتی، بـەڵام حـەوڵی وشـیارانەی فەرهـەنگی ئـەم سـی سـاڵەیە، مـزگێنی وەرچەرخانێکی بەرچاوی گەڕانەوەی سەر خۆتی پێیە.

**دکتۆر رەهبەر مەحمودزادە:** جۆراوجۆریی فۆلکلۆری کوردی هێندەی جۆراوجـۆریی جوگرافیاکەیەتی. پەڕاگەندەیی وڵات و جوگرافیـای کوردسـتان لەسـەر جۆراوجـۆریی فۆلکلۆرەکەی شوێنی هەبووە، بەڵام وا نییە بڵێین کوردی هەرکام لە وڵاتەکانی ئێران و عێراق و تورکیا و سوریا، فۆلکلۆری جودای خۆیان هەیـە. بـە دەربڕینێکـی تـر، ئـەو جوداوازییەی لە فۆلکلـۆری کوردیـدا بـەدی دەکرێـت، لەگـەڵ جـودایی سـنوورەکان هاوجووت نییە. لەبەر ئەوەی فۆلکلۆری ئێمە و بەگشتی زمان و فەرهەنگی ئێمـە زۆر کۆنترن لەو سنوورانە، لەپاڵ ئەو جوداوازیی و جۆراوجۆرییانە، هاوبەشـییەکی زۆر لـە

زمان و فەرهەنگ و فۆلکلۆری خەڵکی ئەمبەر و ئەوبەری سنوورەکان بەدی دەکرێت. با نموونەیەکتان عەرز بکەم. ساڵانێکە لەبواری فۆلکلۆرناسیی کوردیدا پرسیارێك هاروژاوە و وەڵامی زۆر جۆراوجۆری پێدراوەتەوە. پرسیارەکە ئەمەیە: حەیران لە موکریان سەری هەڵداوە، یان لە دەشتی هەولێر؟ جارێ با هەر لەسەرەتادا بڵێم لەبەرئەوەی حەیران ژانرێکی فۆلکلۆری چکۆلەتر و تازەترە کە لە داوێنی ژانری دایك، واتە بەیتەوە سەری هەڵداوە، کەوایە حەیران لەو شوێنە لەدایك بووە کە بەیت لەوێندەرێ سەری هەڵداوە. کەوایە وەڵامدانەوە بەم پرسیارە لە هەنگاوی یەکەمدا، پێویستی بە شیکارییەکی پێکهاتەخوازانەی پێکهاتەی بەیت و پێکهاتەی حەیران هەیە. دوای ئەم قۆناغە نۆرەی ئەوەیە بڵێم ئەو کەسانەی ئەم پرسیارەیان ئاوەها گەڵاڵە کردووە، پێش گریمانەیان ئەوە بووە لە سەردەمی پێشووشدا دەشتی هەولێر و موکریان لە دوو جوگرافیای سیاسی جودادا بوون. با زۆر دوور نەڕۆین هەر دەوری سەدەیەك لەمەوبەر ئەو خێڵە کوردە کۆچەرانەی زستانان لە دەشتی هەولێر ژیاون، لە وەرزی خێڵ بەرەوژووردا بەرە بەرە لە رێگای قەندیلی مامەکۆییان و سپی رێزی خەیلانییان و رەندۆڵی زەرزایان بۆ لای ناوچەکانی ناوەندی تری رۆژهەڵاتی کوردستان هەڵکشاون. دەمەوێت بڵێم راستە لە فەرهەنگی شارنشینی ئەمڕۆدا، بەتایبەت دوای ئەم دابەشکردنە سیاسییانە، مەهاباد و هەولێر بە دوو یەکەی جوگرافیایی جودا، حیساب دەکرێن، بەڵام لە فەرهەنگی کۆن و خێڵەکیدا، خەڵکانێك هەبوون کە سنووری ناوچەی ژیانیان بریتی بووە لە پێدەشتەکانی ناوچەی هەولێر هەتا بەرزاییەکانی ناوچەی موکریان، بەڵام سەرەڕای ئەم روونکردنەوەیە، دەبێت بڵێین، چونکە جوگرافیای کوردستان بەربڵاوە، فەرهەنگ و فۆلکلۆرەکەشی یەك دەست و هاوچەشن نییە. کاك "حەمەی حەمە باقی" لە کتێبی مێژووی مۆسیقای کوردیدا دەڵێت: هەرچی لە ناوچەکانی شاخاویی کوردستانەوە بۆ لای پێدەشتەکان بچین، ریتمی مۆسیقای رەسەن و فۆلکلۆری خاوتر دەبێتەوە و بە پێچەوانە هەرچی لە پێدەشتەکانەوە بۆ لای کوێستانەکان هەڵبکشێین، ریتمی مۆسیقا توندتر و کرژتر دەبێت. بۆ تاقیکردنەوەی ئەم تێزە دەتوانین ریتمی لاوك (کە لە باکوور، واتە لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستاندا باوە) لەگەڵ ریتمی هۆرە (کە لە باشووری کوردستان، واتە لە ناوچەی دەشتاییدا رمێنیان هەیە)، هەڵسەنگێنین.

**زانکۆ خەلیفە: ڕەنگدانەوەی "ژن" لە فۆلکلۆری کوردیدا چۆن دەبینیت؟**

**فەتاحی قازی:** بەڵێ، ژن بەتەواوی لە فۆلکلۆری کوردیدا جێگەی هەیە، دەکرێت بۆ ئەو مەبەستە سەرنج بدەنە بەیتەکانی: مەم و زین، خەج و سیامەند، شۆڕ مەحمود و مەرزینگان، لاس و خەزاڵ، بارام و گوڵندام و...

**ئەحمەد بەحری:** کەم تا کورت، هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی بیرۆکەی "پیاوسالاری" بەسەریاندا زاڵە، هەڵوێستیان لە ئاست ژن و مافی ئەو وێک دەچن. لەو جۆرە کۆمەڵگایانەدا ژن یەکێکە لە کەرەسەکانی ژیانی پیاو، ئەوە قسەی پیاوە دەبێت بچەقێ، ئەوە پیاوە بڕیاردەرە و ئەوە ژنە گوێ لەمست و فەرمانبەر.

بەپێی ئەو بابەتە فۆلکلۆرییانەی لە فەرهەنگی کوردەواریدا ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ دەچنەوە سەر ژن، دەکرێت بڵێین لەنێو ئێمەدا بیرۆکەی پیاوسالاری بەو زەبروزەنگییە نەبێت کە باسمانکرد. پێگەی دایک، هێزی کاری ژن و شان بەشانی پیاوان بۆ بژیو تێکۆشان، جارجار دەربڕینی ویست، ئیحساساتی ژنانە، کەیخودایی و سەرسپییاتی ژنانی بە وەج -بەتایبەت لە بنەماڵە گەورەکان و لەنێو ژیانی عەشیرەتیدا-، دیاردەی ڕەدواکەوتن وەك دواڕێگای چارەی بەزۆر بەشوودان، یان دەستتێوەردانی پیاو لە ئەشق و ئاشقی ژن، دەکرێت وەك نموونەی تێکۆشانی ژن بۆ گەیشتن بە ماف و پلەی ئینسانی خۆی چاو لێ بکەی. هەروەها دەکرێت وەك نموونەی بە گژی بیرۆکەی "پیاوسالاری"دا چوونەوەی ژن چاوی لێ بکەی. سەرەڕای ئەو شێوە حەول و تێکۆشانە مافخوازانەیە، سەرجەمی ئەو بابەتە فۆلکلۆرییانەی نیشانەی مافخوراوی ژنە گەلێ پتر لە ئەو حەولانەی بە یەك نیگا دەڕوانێتە دوو بەرەی نێر و مێ.

**دکتۆر ڕەهبەر مەحمودزادە:** ئەو پرسیارە دوو لکی لێ دەبێتەوە و بۆی هەیە دوو پرسیاری جودای لەسەر ساغ بێتەوە. یەکەم پرسیار ئەوەیە کە بڵێین لە ئەدەبی بەرهەمهاتووی فۆلکلۆردا، ژن چ دەورێکی پێدراوە؟ دووەم ئەوەیە بپرسین ژن لە بەرهەمهێنانی ئەدەبی فۆلکلۆریدا چ دەورێکی هەبووە؟ چ دەوری هەبووە لەگەڵ چ دەورێکی پێ دراوە، جوداوازی هەیە. لە پرسیاری یەکەمدا دەوری ژن بۆ نموونە وەکو کەسایەتی چیرۆك دەبێتە پرس، بەڵام لە پرسیاری دووەمدا پرسی سەرەکی بریتییە لە

دەوری ژن وەکو بەرهەمهێنی چیرۆک. پرسیاری یەکەم لە چۆنییەتی ئۆبژەبوونی ژن لەناو ئەدەبی فۆلکلۆری دەکۆڵێتەوە و پرسیاری دووەم لە چۆنییەتی سووژەبوونی ژن لە کۆمەڵگەی نەریتی کورد ورد دەبێتەوە. پرسیاری یەکەم وەکو فانتازیایەکی خوڵقاوی دەستی پیاو گرنگی بە ژن دەدات، بەڵام پرسیاری دووەم واقیعێك کە ژن بۆخۆی دروستی دەکات و بە ناوی ژن دەیناسێنێت، بەرجەستە دەکاتەوە. پێم وایە وەباڵ کێشان بۆ ئەو راستییە زۆر دژوار نییە کە لە کۆمەڵگایەکی نەریتیدا دەوری ژن وەکو ئۆبژە بەرچاوتر بووە هەتا وەکو سووژە. ژن فانتازیای پیاو بووە. راستە جوانترین و زۆرجاریش گرنگترین فانتازیای پیاو بووە، بەڵام کاتێك خودی ژن فانتازیایەکی هەبووە نەیتوانیوە بە ئازادی بیکات بە بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری، هەر نەبێت هێندەی پیاو ئەو ئازادییەی نەبووە. کەوایە سەیر نییە ئەگەر بڵێین لە کۆمەڵگای نەریتیدا سیمای ژن زیادتر لە چوارچێوەی ئۆبژەدا لەقاڵب دراوە و کەمتر لە چوارچێوەی سووژەدا خۆی نواندووە. لە ئەدەبی بەرهەمهاتووی فۆلکلۆریدا ژن دەوری هەیە و تەنانەت لەباری جوانیناسانەوە سیما و ئادگاری بەشێوەیەکی زۆر ناسك و مینیاتۆریش نەخشاوە (بۆ نموونە بڕواننە ئەو سیمایەی لە بەندی ئازیزەدا لە ژن دەکێشرێ)، بەڵام هەروەك ئاماژەم پێ کرد ئەو بوونەوەرە مینیاتۆری و یەکجار جوانە، دەوری بەرکاری هەبووە، نەك دەوری بکەر. تابلۆیەکی دڵڕفێن بووە هەستی جوانیناسانەی پیاوی پاراو کردووە و پێوەندییەکانی ناو کۆمەڵگا زۆر کەمتر بواری ئەوەیان پێداوە خۆی تابلۆیەك بنەخشێنێت، بەڵام دەستیشی تەواو نەبەستراوە. راستە سیمای ژن وەکو سووژە لەناو ئەدەبی فۆلکلۆریدا کاڵترە، بەڵام تەواو ون و نادیاریش نییە. بۆ نموونە لە ئەدەبی فۆلکلۆریدا حەیرانی ژنان و گۆرانیی ژنان هەیە. لەم بەرهەمانەدا تێم و گۆشەنیگا بەڕاستی لەگەڵ گۆشەنیگا و تیمە باوەکانی ناو ئەدەبی فۆلکلۆریدا جوداوازییان هەیە. لەو بەرهەمانەدا ژن دەورێکی کارا دەبینێت و خۆی تابلۆ دەنەخشێنێت و تا رادەیەك فانتازیاکانی لە کروتەونێکی هونەریدا دەچنێت. هەڵبەت با ئەو تێبینییەش بە قسەکانمەوە زیاد بکەم. لە ئەدەبی فۆلکلۆریدا هێندێك چیرۆك و بەیتمان هەیە کە وێ دەچێت لە چاخەکانی کۆنترەوە مابنەوە. لەو بەیتانەدا ژن هەڵسوورترە و دەوری بەرکار ناگێڕێ و دەورێکی هاوشانی هی پیاوی هەیە. مامۆستا هێمن دەڵێت: ئەوانە یادگاری ئەو سەردەمانەن کە لە کۆمەڵگای کوردیدا سیستمی مێ وەجاخی زاڵ بووە. (مێ وەجاخی و نێر وەجاخی دوو

هاوتان کە مامۆستا هێمن بۆ ژنسالاری پیاوسالاری داینـاون). بـەیتی لاس و خـەزاڵ نموونەیەکە بۆ ئەو بەیت و چیرۆکانە. لە گەلاڵەی چیرۆکی ئەم بەیتەدا تەنانەت بۆئەوەی ژن وەکو سەرۆك عەشیرەتێکیش دەور بگێڕێت، هیچ سڵەمینەوەیەك لە گۆڕێدا نییە.

- قادر فەتاحیقازی ساڵی ١٣١٤ی هەتاوی لە ئاوایی "قزڵجەی سەریێ" سـەر بـە شاری مەهاباد لەدایك بووە، کارناسیی باڵای بەشی "ئەدەبیاتی فارسی" لە زانستگای تـەورێز وەرگرتـووە (١٣٥٢)، پاشـان وەك مامۆسـتای قوتابخانـە و دواتـریش وەك مامۆستای زانستگا وەرگیراوە. قادر فەتاحی قازی تائێستا بە دەیان دەقی فۆلکلـۆری و وتار و لێکۆڵینەوەی سەبارەت بەم باسە لە گۆڤارە خوێندکارییەکاندا نووسیوە و خاوەن چەندین کتێبـی بەنرخە، کە بریتین لە:

میهر و وەفا، ساڵی ١٣٤٥ی هەتاوی، شێخی سـەنعان، سـاڵی ١٣٤٦ی هـەتاوی، بارام و گوڵندام، ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی، شۆر مەحمود و مـەرزینگان، سـاڵی ١٣٤٨ی هەتاوی، شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ ساڵی ١٣٥١ی هەتاوی، سـەعید و میرسـێوەدین بەگ، ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی، ئەمسال و حیکـەمی کـوردی (امثال و حکـم کـردی) بەشی یەکەم، سـاڵی ١٣٦٤ی هـەتاوی، ئەمسـال و حیکـەمی کـوردی بەشـی دووەم، ١٣٧٥ی هەتاوی، لاس و خەزاڵ، سـاڵی ١٣٧٩ی هـەتاوی، شـیرین و فـەرهاد، سـاڵی ١٣٨٤ (گشت ئەم بەرهەمانـە لـە زانکـۆی تـەورێز بەچـاپ گەیشـتوون)، هـەروەها کتێبـی گەنجینەی بەیتی کوردی کە بە سەرچـاوەیەکی مـەزنی بـەیتی کـوردی دێتـە ئەژمار لە چاپخانەی ئاراس بەچاپ گەیشتووە. قادر فەتاحی قـازی ئێسـتا لـە شـاری تەورێز دەژی و وانەی "فارسی و ئایینی نگارش" لە زانکۆ تەورێز دەڵێتەوە.

- ئەحمەد بەحری ساڵی ١٣٣٦ی هەتاوی لە گوندی "تەپـەڕەش"ی سـەر بەشـاری مەهاباد لەدایك بووە، کارناسیی بەشی ئەدەبیاتی فارسی هەیـە و دانیشـتووی شـاری مەهابادە، ماوەیەکی زۆر مامۆستای قوتابخانەکانی دواناوەندیی ئەم شارە بووە. "گەنجی سەربەمۆر" و "فەرهەنگی باڵندە" دوو بەرهەمی چاپکراوی ئەو بـەڕێزەن. بەرهـەمی سەرجەم بەیتەکانی ناوچەی موکریانی ئامادەی چاپە، کە زیاتر لـە ٥٠٠ دەق لـەخۆی دەگرێت، کاك ئەحمەد ئێستا خاوەن ئیمتیاز و مودیر مەسئوولی گۆڤاری "مەهاباد"ە.

- دکتۆر ڕەهبەر مەحمودزادە، ساڵی ١٣٥٤ی هەتاوی لە شاری شنۆ لـەدایک بـووە. دکتۆرای فەلسەفەی زانست، لکی "فەلسەفەی زانسـتە کۆمـەڵایەتییـەکان"ە. جگەلـە ڕشتەی دەرسیی خۆی، لە بوارەکانی زمان و ئەدەب بەتایبەت زمان و ئـەدەبی کـوردی خەریکی لێکۆڵینەوەیە. لە ساڵی ١٣٨٢ کتێبێکی بەناوی "پێکهاتەی بەیتی کوردی" لەلایەن ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە بڵاوبووەتەوە و تائێستا چـەندین وتـاری، ڕەخنەیی، لێکۆڵینەیی و زانستی و هەروەها بـواری زمانـەوانیی کـوردیی لـە گۆڤـارە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان بڵاوبوونەتەوە و مامۆسـتای زانکـۆی شنۆیە.

## ئەدەبی فۆلكلۆر لە شیعر و مۆسیقادا

## دیمانە لەگەڵ شاعیر و هونەرمەند حەمید شەریفی

سازدانی: شەریف فەلاح

**بەگشتی ڕۆحی یاخی و سەرکەشی کورد لە (شیعر و مۆسیقا) کە دوو ژانری تەواوکەری یەکن، چۆن دەبینی و لێکی دەدەیتەوە؟**

کورد ئەگەر زمانی ماوەتەوە و لە ڕێگای زمانەوە هەموو چتێك، یانێ هەستی ماوەتەوە، تەنیا و تەنیا بەهۆی شیعر و مۆسیقاوە بووە.

ئەگەر ڕۆحی یاخی مەبەستمان بەرەنگاری نەتەوەیی، یان داکۆکی لە مافی گەلە، کە خودی پەیبردن بە نەتەوە و مافی، تەمەنێکی درێژی نییە و چتێکی تازەی سەردەمییانەیە و زۆر شاعیر، بەتایبەت نیئۆکلاسیکی کورد ئاوڕیان لێ داوەتەوە و کار و شاکاریان پێ خولقاندووە. لە ژانری مۆسیقادا زایفتر هەڵسوکەوتی کردووە و زۆرتر کۆپی سروودەکانی بەتایبەت چەپگەرایانەی ئەو سەردەمەی سۆڤییەت و ئەورووپایە. هەرچەند لە برێ شوێندا چەند نموونەی باش دەبینین، بەڵام نەك بە قورسایی نموونە شیعرییەکان، بەڵام ئەگەر یاخیبوون وەك تاك لە بەرانبەر دەسەڵاتی سروشت و کۆمەڵ و ئایین و جیهانبینی و گرێبەستەکان و یاساکان و دوواکەوتوییەکان و تەنیایی مەبەستمان بێت، لە هەر دوو بواردا یانێ هەم شیعر و هەم مۆسیقا، حەقێکی گەورەیان بەسەر کوردەوە هەیە. لە زۆربەی شیعرە فۆلکلۆرییەکاندا بەرەنگاری ڕووبەڕووی دامودەزگای ئایینی و گرێبەستەکان و دواکەوتویی دەبێتەوە.

دار و پیرە دار، دار گەڵای بۆ چەس/ کچ خۆی مەیلی بێت، ماڵ مەلای بۆ چەس

خالێك ها وەبان پەنجەی پاتەوە/ قول هوو ئەڵلە لەبیر شێخ ئەباتەوە

هەرچی نوێژ ئەکەم، نوێژم بەتاڵە/ لەناو نوێژەکە، تۆم لە خەیاڵە

خۆزگەم بە مەلان هەر شادیشان هەن/ نە شێخ، نە مەلا، نە قازیشا هەن

لە بەیت و حەیران و لاوکدا فۆرمێکی بە یەکجاری جیا دەبینین، کە نزیکە لە شیعری ئازاد، یان نوێیەوە، لەوێش ئەم بەرەنگارییە بەرچاو دەکەوێت و دەبینین کە چۆن هەموو شتە زیادییەکانی سەر ڕێگای ژیانی یەك یان دوو یام چەند ئینسان دەگرێتە بەر پەلاماری پرسیار و ئاغاکان و دەسەڵاتدارەکانیش دەداتە بەر پەلاماری وشە تووڕەکان.

هەروەها لە بالۆرەشدا کە چۆن مۆنۆلۆگ دەکات و لە سروست تووڕەیە و لەبەر بردنەوەی ئازیزەکانی و لە چەپڵەشدا لە خەم ڕەخنە دەگرێت و هەروەها و بەردەوام...

**تۆ بەپێی ئەو پڕۆژەیە کە خەریکی ئەنجامی دەدەیت، هاتوویت لە ڕێگای (نۆستالۆژیا)وە و بە کەڵکوەرگرتن لە (شیعر و مۆسیقا)، داهێنانێک بخوڵقێنیت. ئامانجت لەم ستایلە چییە و توخم و پێکهاتەکانی کامانەن؟**

ئەمە هەمووی پڕۆژەکە نییە و بەشێك لە پڕۆژەکە دەگرێتەوە و بگرە ژێر کاریگەری بوون و بڕوای منە بە شیعری خەڵك، کە وای لێکردبێت.

یەکێك لە کۆنترین فۆرمە شیعرییەکانی جیهان، (لیریك)ە کە هەمان شیعری گۆرانییە و بە سازێك بە هەمان نێو لێ دراوە و بە شیعری کورت و ڕیتمیك خوێندراوە. بەدڵنیاییەوە لەنێو کوردیشدا ئەم فۆرمە یەکێك لە کۆنترین فۆرمەکانی شیعرە، کە زۆرتر بە شیعری فۆلکلۆریك ناسراوە و بەدەم گۆرانییەوە دەخوێندرێت و فۆرمێکی جیاوازی هەیە. گۆرانی، حەیران، بەیت، لاوك، بالۆرە، سیاچەمانە، چەپلە، هۆرە و... هتد. کەوایە خودی پڕۆژەکە بەستراوەتەوە بە نۆستالۆژیاوە. (وەك بەیت کە هەموو تراژیدییە حەماسییەکان و حەیرانیش درامە ئەویندارییەکان)ی لە فۆرمی مۆسیقادا گونجاندووە. ئەمە بەسراوەتەوە بە زمانێکەوە کە من پێم وایە بە هاتنی زۆر چت و سووڕی زەمەن، ئیتر نایت و بەو شێوەیە بنووسرێتە و فۆرم و زمانی گۆڕدراوە و من ویستوومە بە هێنانی ئەم ئاماژە نۆستالۆژییانە و بە کەڵکوەرگرتن لە ئالۆزیی زمانی مۆدێرنی ئەمڕۆ، ببم بە پردی پێوەندیی ئەم دوو ڕووداوە.

**لەبەرچی شیعری گۆرانی نەوەکانی پێشوو، بەستە و دەقە ریتم و ئاهەنگدارەکان و بە تایبەت (گۆرانی شایرەکان) زیاتر لە شیعری گۆرانی ئەمڕۆ لەگەڵ ڕۆح و هەناوی مرۆڤی کوردا گرێدراون و کاریگەری دادەنێن، هۆیەکەی چییە؟**

١- زمانحاڵی سەردەم و کاتی خۆی بووە.

٢- بە زمانی ئەوکات و ئەو خەڵکە قسەی کردووە.

٣- بیری لە داهاتوو و حەزی ئێستای من و تۆ کردووەتەوە.

٤- نۆستالۆژیابوونی بەشێکی گرنگی ئەو خۆشەویستییە.

٥- شیعر و گۆرانی خودی ژیان بووە. وەك ژنهێنان، بوون بە خاوەنی منداڵ، کار، مەرگ، دڵداری، ئایینی، سێکسی و تەنز.

٦- زۆر ئۆستادانە هۆنراوەتەوە.

٧- لە هیچکەس و هیچ چت نەترساوە.

٨- لە هەمان کات و ساتدا هۆنراوەی بە باڵای کەس، یان کەساندا هەڵبەستووە کە چێژێکی تایبەتی بە بیسەر بەخشیوە. وەك عەرەبەکان دەڵێن: فی البداهە.

من نازانم کێ ئەم پارامێترەی پێیە کە بزانێت ئەمان "شایەرن" و ئەوی تر "شاعیر". بێجگە لەوە نەبێت کە شاعیر خۆی بە گەورەتر زانیبێت و بە تەحقیرەوە بەوەی وتبێت شایەر، چونکە لە بۆنەکاندا، بەتایبەت لە زەماوەندەکاندا خوێندوویەتی و لە هەر زەماوەندێکدا یەك دیوان شیعریشان دەخوێندەوە!

بەڵام شیعری گۆرانی ئێستا کە دەبێت فۆرم و زمانی بگۆڕدرێت، نە کاری جیدی بۆ کراوە و نە زۆربەی شاعیران بە شیعری دەناسن و نە لە هیچ فێستیڤاڵێکدا بەشداره و نە خاوەن جێگە و پێگەیە و نە توانیویە زمانی خۆی و فۆرمی خۆی بدۆزێتەوە و نە خۆیشی لە قەرەی دەسەڵات و دواکەوتوویی و یاساو و گرێبەستەکان و... دەدات و نە ڕۆیشتووەتە نێو پانتایی ژیانەوە و نە ژێرخانەکەشی باش دەناسێت و نە ستایلە جیاوازەکانی مووزیکیش کە خۆی هەتیووە و کەس نایناسێت، دەناسێت، هاوکات زۆریش دەترسێت لە هێنانی زۆر وشە و زۆر نیگا و زۆر قسەی جیاواز. ئەوەیە کە شاعیری شیعری فۆلکلۆری ئەو سەردەمە کە کەس نایناسێت، جیا دەکاتەوە لەم شیعرە پەراوێزخراوەی کە هێشتا لەدایك نەبووە.

**بەو پێیەی کە من گوێم لە چەند شیعرت بووە کە خۆت خوێندووتەوە و هەروەها چەند دەقێك کە بڵاوت کردوونەتەوە، پڕن لە مۆسیقا و ریتم و هارمۆنی، بەستنەوە بە رابردوو، بەکارهێنانی وشەی رەسەن، لە هەمان حاڵیشدا تژی لە زمان، دەربڕین و ئەندێشەی نوێ و ئەمڕۆیی. لەم پرۆژەیەی تۆدا هەست بەوە دەکرێت لەناو بازنەی (نەریت و مۆدێرندا) کایە دەکەیت. تکایە زۆرتر روونی بکەرەوە؟**

ئەوە نییە کە من و تۆ و هەموو ئینسانەکان بە بیرەوەرییەکانمانەوە دەژین و لە کاتی ئێستادا دڵمان لێ دەدات و پلان بۆ داهاتوو دادەڕێژین؟ وایە لە زۆر شوێندا ئەو سەفەرە دەکەم، چونکە بەر لە خوێنەر، خۆم پێویستمە. باش یان خراپ. ئەوە ژێرخانی منە کە ئەگەر بمەوێت بە سەریەوە چتێك بۆنیاد بنێم، دەبێت بیناسم و سەردانی بکەم.

زۆر چتم لەوێ بەجێماوە. دەیان و سەدان و بگرە هەزاران پرسیاری بێ جوابم لەوێ لەپاڵ منداڵیدا و لە پاڵ نەوجەوانی و جەوانیمدا و لەژێر گریان و ماچ و کوتەك و بەگشتی لە پاڵ خۆشی و ناخۆشیدا بەجێهێشتووە، بەڵام لەئێستادا دەژیم یانێ زمانێك کە ساڵەها لەو زمانە دوورە، یانێ لە رابردوو. منیش دەبێت جوگرافیای خۆم و حەجمێنی خۆم لە زمان و زەمەندا بدۆزمەوە کە هیچ نەبێ لە رابردوودا ون نەبم و داهاتوویەك کە بە خێرایی نوور خەریکە دەڕواتە پێشەوە و کەس نازانێت داهاتووی هەست چی لێ دێت! و ئایا خوداش وایرلێس دەکرێتەوە؟ ئێمە بە زۆر مودێرن کراوین. مودێرنیتە هی ئێمە نییە. گۆشارێکی جیهانییە. زۆر لایەنی باشی هەیە، بەڵام تەنیاییەکەی رۆحت وێران دەکات. دەبیت بە ماشین. بە بەشێك لە ماشینی گەورەتر. کار بۆت دەبڕێتەوە کە کێیت، بەڵام ئازادی. مافت هەیە. دەبێت دیمۆکرات بیت و بژیت. یاسا سەروەرە. زۆر شت روونە. بەشداری، بەڵام ساردە... لەو لاشەوە نەریت کە مایەی دواکەوتوویمانە. خاوەنی خۆت نیت. کەس و کەسان و زۆر چتی کۆمەڵگا بۆتی دەبڕێتەوە. ئازاد نیت. دیمۆکرات نیت. مافت نییە... و زۆر چتی تر، بەڵام گەرمە. گەرم. دەزانیت؟ منیش لەوێم و لە هەر دوو لام. رەخنە لە هەردووشیان دەگرم، بەڵام مەمنوونی مودێرنیتەم.

لە قاڵبی شیعری ئازاد (نوێ)، ستایل و هەنگاوێکی جیاواز و نوێ، دەربڕین و زمانی نوێت هەڵبژاردووە. ئەم کارە چۆن دەبەستیتەوە بە ئەدەبی زارەکیی کورد بە هەموو لق و شاخەکانییەوە، زەروورەتەکەی لەچیدا دەبینیت؟

تەنیا و تەنیا ویستوومە قسەی پێ بکەم زۆر بە سادەیی و هیچ ئەنقەستێکم نەبووە، بەڵام بگرە بێزار بوویێتم لەو شیعرە کتێبخانەیانەی کە دەبێت قامووسێ لەپاڵ دەستدا بێت تا بزانی چی دەڵێیت. هەروەها کە لە سەرەوە باسم کردووە، فۆرم و قاڵبی بەیت و حەیران هەمان شیعری ئازاد و نوێیە. کەوایە دەکرێت بە زمانی زارەکیی خەڵك شیعر بڵێیت بێ ئەوەی کە زۆر لە خۆت بکەیت کە زۆر فازڵانە قسە بکەیت. شیعر دەبێت بە هەمان سادەیی، سادە بێت تا بە سادەیی بڕواتە نێو خەڵکەوە و پەیامەکەتی پێ بگەیەنیت. بۆ خوێنەری تەمەڵ نەنووسراوە و تەنیا بۆ رۆشنبیریش نەنووسراوە. وەك مەتەڵە کۆنەکان، تەنیا رازێکی تێدایە و کۆدێك کە دەبێت بیدۆزیتەوە. زەروورەتەکەشی ئەوەیە کە پێمان وا نەبێت شیعر زمان، یان فۆرمێکی تایبەتە و کەس

ناتوانێت دەست بۆ زمان و فۆرمێکی تر ببات. تەنانەت ئەو زمانەی کە ڕۆژانە قسەی پێ دەکەن بە سادەیی شیعرە. لەبیرمە جارێ دایکم وتی: ئەی ڕۆڵە! کاتێ ئێوە لەدایك بوون، هەوا هەوری بوو. هەر ئەوەندە. ئێمە عادەتمان کردووە کە زۆر قسە بکەین و کەم ببیستین. هی ئەوەیە کە تەنیا قەسیدە، بە شیعر دەزانین. وەك چۆن ئەگەر پیاوێك زۆر کەڵەگەت نەبێت بە پیاوی نازانین. چۆن عادەتمان نەکردووە بە یەکجار تێبگەین، دەبێت هەر دووپاتی بکەنەوە بۆمان. ئەدەبیاتیشمان پڕە لە دووپات بوونەوە. دەیان وێنەی وەکو یەك لە پاڵ یەکدا و دەیان وشەی وەکو یەك لە پاڵ یەکدا. من بێزارم لەم کولتوورە و لەم ئەدەبیاتە کە زادەی ئەم کولتوورەیە. لە حاڵێکدا لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆرماندا ئێمە ئەم شتە زۆر بە کەمی دەبینین و وەك قسەی باوەگەورەکانمان و دایەگەورەکانمان یەکجار و کورت و بەجێی و پڕ لە ڕەمز و ڕاز.

**غوربەت، تاراوگە و دووریی لە زێد و نیشتمان، چەندە لە بەرهەمی شیعری و گۆرانیی تۆدا ڕەنگیان داوەتەوە و چەندە هاندەرت بووە بۆ هەڵبژاردنی ئەم ڕێچکەیە؟**

بەدڵنیاییەوە هەموو ئەمانەی کە باست کرد باندۆر و دەورێکی زۆر گەورە و گرنگ دەگێڕن لە ژیانی مرۆڤدا. لە هەمان کاتدا کە خەمن، دوورین بێ یانەین و ئاوارەین و بڕێ جار خاپوور بوون و تا سنووری مەرگ چوون، بەڵام شتی تازە و نیگای تازە و دونیای تازەشن کە دەبێت تیکەڵاویان کەیت لەگەڵ هەست و نەستی خاوەن دەقدا، تا دەقێکی تازەت پێ بدات. بە سەرینی ئەوانەوە یەکێ لە تەنیا چتگەلێك کە زۆر یارمەتی داوم لە پەیداکردنی فۆرم، یان زمانی تازە! (هەڵبەت ئەگەر وابێت!)، دووری لە کۆپیکردن و لە دووپاتبوونەوەیە. تەنانەت لە ژیانی شەخسی خۆمیشدا.

**زەبر و زەنگ و سەرکوتکەریی دەسەڵاتداران لە دووتوێی شیعرەکاندا ڕەنگیان داوەتەوە. بە بەکارهێنانی تۆخمەکانی ئوستوورە، ئەفسانە، ڕاز و چیرۆك، ئەدەبی ڕەشۆکی و بەگشتی فۆلکلۆر لەناو شیعر و زمانی نوێدا، دەتەوێت چ پەیامێك بە نەوەی نوێ بگەیەنیت؟**

زۆربەی چیرۆك و داستان و مەتەڵ و فۆلکلۆرە کوردییەکان پڕن لە بەرەنگاری دژ بە زەبر و زەنگی دەسەڵاتداران بە فۆرم و زمانی جیا جیا بەتایبەت بە ئەدەبیاتی منداڵ و

چیرۆك و مەتەڵ. کە من هەر لە منداڵییەوە لەژێر کاریگەریی ئەم چیرۆك و داستانانەدا بووم. منداڵیی هەموومان پڕن لەم چیرۆکانە کە دایەگەورەکان و دایکانمان بۆمانیان گێڕاوەتەوە و لە کۆتاییشدا هەمیشە پەری و رزگار کەرەکەی، زاڵ دەبن بەسەر دێودا. تێکەڵاوکردنی دۆنیا لەگەڵ دونیای دەرەوەی چیرۆکەکان و داستانەکان، کە هەمیسان پڕە لە دێوی راستی راستی، دونیایەك فانتاستیك درۆست دەکات کە پەیامەکەت زۆرتر و زووتر دەباتە لای بیسەر کە بگرە تامەزرۆی بێت، چونکە بەشێکە لە خۆی، لە دەنگی دایکی و دایە گەورەی. هەمیسان پێی دەڵێی کە دێوی نێو چیرۆکەکە مرد، بەڵام ئەم دێوەزمە زیندووە و دەبێت بیرێکی لێ بکەینەوە و دەبێت بەردەوام کارمان دێوکوشتن بێت لە دێوی دەروون تا دێوی دەرەوەمان.

**زمان، شیعر، هونەری بەرەنگاری (ئەدەبیاتی مقاومەت) لەلای کورد خاون چ پێگەیەکە و چەنێك لە کارە هونەرییەکانی تۆ دەچنە خانەی ئەدەبی بەرگرییەوە، ئەم وشە و دەستەواژانە لە لای ئێمە قسە و باسی زۆریان لەسەرە. تۆ چۆنیان لێك دەدەیتەوە، (شاعیر و دەروەست بوون، ئەدەبییەتی دەق و لایەنی هونەری، هونەر بۆ خەڵك، هونەر بۆ هونەر؟**

ئەدەبیات کاری بە راستییەکانە و سیاست و بەرەنگاریش یەك راستین. ئەگەر ئەدەبیات و هونەر کاری بەم راستییە نەبێت، کە خەڵکی و نەتەوەیەك بووە بە سەرداری هەموو سەر بە دارەکانی دونیا، دەبێت کاری بەچی بێت! کاری هونەر و ئەدەبیات بە سەبت گەیاندن و تۆمارکردنی رووداوە مێژووییەکانە. کەمترین وتە و نووسراوەی "کارل مارکس" هەیە بە قەد سروودی ئەنترناسیۆناڵ جیهانی و خەڵکی بووبێتەوە. تیۆری بۆ رۆشنبیرە، بەڵام هونەر هی خەڵکە. جا ئیتر ئەوە چۆنییەتی هونەری هونەرمەندە کە چۆن خەڵك بەدوای خۆیدا دەهێنێت، نەك ئەوەی کە بکەوێتە شوێن خەڵك. کام شۆڕشی رەش پێستەکان بەقەدەر مووزیکی بلووز و جاز، ئەوانی جیهانی کردووە؟ ئەوەی بیەوێت راستی لە هونەر بگرێت، ئەویش بەم بیانووەی کە هونەر بۆ هونەرە، تەنیا دەیەوێت هونەر لە راستی بەتاڵکاتەوە. چۆن توانایی هونەر دەناسێت و دەزانێت چەندە کاریگەری هەیە و چەندەش دەستی لە شۆڕش و بەرەنگاریدا بووە و هەیە. کەوایە لێی دەترسێت. دەزانێت؟ لێی دەترسێت. باش دەزانێت کە

گەورەترین هەڵبژاردنەکان و گەمە سیاسییەکان، چەندە پێویستیان بە هونەر هەیە. بە داکۆکیکردنی "مایکل جەکسۆن" لە یەکێك لە پارتەکانی ئەمریکا، نەك تەنیا موعادەلەی ئامریکا، بەڵکو زۆر شوێنی دونیا دەگۆڕا. من پێم وایە ئەگەر هەر ئینسانێك بتوانێت گوێ لە مووزیکی نەتەوەکانی تر بگرێت، قەد حازر نابێت کە ئەو نەتەوە وەك بندەست سەیر بکات، چونکە دەزانێت کە دونیا پێکهاتووە لە هەموو نەتەوەکان و کولتوورە جیاکان و هەمووشیان جوانن و کەسیشیان نە بندەستن و نە سەردەست. کام رووداوی دونیا هەیە کە مووزیك و شیعر بە یەکەوە بەشداری تێدا نەکردبێت و نەیکەن؟ رووخانی دیواری بەرلین و گرووپی پینگ فلۆید! دیکتاتۆری تورك و ئەحمەدکایا! شەڕی ئەمریکا لەگەڵ ڤیتنام و گرووپی بیتێلز! کوودیتای نیزامیی لە شیلی و ویکتۆر خارا! کوردە هەژارەکەی خۆمان و شڤان پەروەر لە بەشی کرمانج و ناسر رەزازی لە بەشی سۆران! دونیا پێکهاتووە لە کۆمەڵێك شت کە گشتیان پێویستیان بە یەك هەیە و ئەمیان بێ ئەویان نایکرێ.

هەموو یارمەتیی یەك دەدەن کە چەرخی دونیا بچەرخێت. سیاسەت لای ئێمە تێگەیشتنی نابەجێی بۆ کراوە، لەبەرئەوەی کە خۆی نابەجێ کاری کردووە ئەگینا سیاسەت یانی توانایی و زانستی بەڕێوەبەریی یەك کۆمەڵگا. بەشێکی هەرە گرنگی من بە سیاسەتی غەڵەت لەناو چووە، چۆن بە هەموو کەرەستەیەکمەوە بەرانبەری راناوەستمەوە! تەنانەت کەمیشمان کردووە. تەنیا هونەر دەتوانێت ئەنفال و هەڵەبجە جیهانی کاتەوە، نەك دانیشتنی سیاسی و بڕیاری سیاسی. جا مەگەر دەکرێت باسی زیندەچاڵکردنی وڵاتێك و وشکبوونی شیری شاریێ بکەیت و باسی کەسێکی وەك سەدام نەکەیت؟! و ئەگەریش باست کرد بڵێین ئەمە هونەری بۆ هونەر نییە و ئاوێتەیە بە سیاسەت؟! هونەرێك ئەگەر بیەوێت تەنیا بۆ خۆی بێت، دەبێت بڕوات لە دەرەوەی ئەم کورە خاکیە ناشرینە پڕ لە شەڕ و یاسای دارستانە، ژیان بکات، ئەگینا دەبێت چاوی بگرێت و دەمی ببەستێ و لووتی بگرێت، لەبەرئەوەی هەست بەم ناشرینییە نەکات کە دونیای داگرتووە.

**وشەکانی:** قەفەس، شکاندن، تەلسیم، ژار، مین، سنوور، کوشتن، سووتان، داگیر، رشانەوە، دار و تەناف، تووڕەیی، یاخیگەری و رۆحی هەڵچوون لە دەقەکانتدا

**بەرجەستەن و هاوکات وشەکانی: عەشق و ئەوین، ژیان، گوڵ، مرۆڤ، شادی، بۆچی ئەم دەستەواژانە هاوشانی یەك هێندە لەلای تۆ دووپات دەبنەوە؟**

وایە، بەداخەوە یان خۆشبەختانە، لە جوگرافیایەك لەدایکبووم کە پڕن لەم وشانە. من پێکهاتوو لەمانەم. لەم وشانەی کە باری مانابییەکەیان ژیانی منی دروستکردووە و داگیریان کردووە. ئەگەر من بمەوێت خۆم بنووسمەوە، دەبێت بەم وشەگەلە کە باستکرد ئیتر... بەلاّم دوور نییە ماناشی ئەوە بێت کە هاوکات کە دەڕشێمەوە و بەدەست کوشتن و بڕینەوە وێران دەبم، هەموو دەتۆمەکانی گیانم پێیان خۆشە وەك مرۆڤ، شاد و ئەویندار بژیم.

**لە دووتوێی شیعرەکانتدا، دەستەواژە و رستەی فۆلکلۆر، دەربڕینی رۆژانە، خۆماڵی و ئاسایی لە گەڕان و هاتوچۆیەکی بەردەوام دان. ئەم سەفەرەت لە ئاقاری زمانی یەکگرتوو بۆ شۆڕبوونەوە بۆ ناخی زاراوە و بن زاراوە و دیالێکتە جۆراوجۆرەکانی زمانی کوردی بۆ چییە؟**

ئەو خۆماڵیبوون و ئاساییبوونە بگرە لە کولتووری ژیانی مۆدێرن و ئالۆزی خۆمەوە نزیکە و لە خوێندنەوەم. لە نیگام سەبارەت بە شیعر و ئەدەبیاتی کورد و ناکورد و نیگام بەگشتی سەبارەت بە دونیا. منداڵ، ژن، ژیان، سروشت، ئایین و... ئەمەش سەدان و هەزارەها وشەی پێویستە کە تا ئێستا لەبەر هەر هۆکارێك بووبێت نەهاتووەتە نێو زمانی شیعر و ئەدبیات و بەتایبەت زمانی مووزیك و گۆرانییەوە. من هیچ وشەیەك بە ناشاعیرانە نازانم. تەنیا شوێنی دانیشتنەکەیە کە گرنگە. وەك ئەحمەد شاملوو دەڵێت: نەبێ بە من و ژنەکەمەوە. هەڵبەت هی منیش کە نیمە.

سەبارەت بە دیالێکتەکان و زاراوەکانی تریش دەتوانم ئەوە بڵێم کە بەر لە هەموو شتێك بڕوام بە زمانی یەکگرتوو نییە کە ویستبێتم بۆ ئەوە ئەم کارەم کردبێت. نە، با ئەوەی کە بە هەورامی، کەلهوڕی، کرمانجی، سۆرانی و ئەردەڵانیش کە زاراوەی خۆمە، هەم دەخوێنمەوە و هەمیش قسە دەکەم، بەلاّم زۆریش کەڵکم لێیان وەرنەگرتووە لە شیعردا. لەبەرئەوەی کە نامەوێت خوێنەر گێج بکەم. دەمەوێت لێم تێبگات. ئەوە کاری فەرهەنگنووسە کە کۆیانکاتەوە و زمانی پێ رەنگین بکات. نەك کاری من. شاعیری پێشووی کورد دەبوایە بیرێکی لای هەستی خۆی و بیرێکی لای زمانەکەی و

بیرێکی لای کولتوورەکەی و بیرێکی لای وڵات و خاکەکەی و هەزار بیریش لای نان و...
ئەمە هەمووی بە شاعیری داماو ناکرێت. با هەر کەسە و کاری خۆی بکات. شاعیر فەرهەنگنووس نییە.

بەڵام برێ جار لە برێ شوێندا یەخەم پێ دەگرێت و هەست دەکەم تەنیا بەو زاراوە، یان بەو وشە لەو زاراوەیە، دەتوانم ئەوکات و ساتە بنووسمەوە. بە تایبەت زاراوەیەك کە گۆچم پێگرتووە. سنەیی یان وەك سنەییەکان ئەیژن: کورسانی.

**گۆرانی، بەستە، راز و چیرۆکەکان، ئوستوورە و حەماسەکان و بەیتە کوردییەکان چەندە توخمی نمایش و رەگەزی شانۆییان تێدایە و دەتوانین بێژین سەرەتای ئەدەبیاتی شانۆیی و سینەمای کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەدەبیاتی زارەکی؟**

سینەما کە خۆی چتێکی تازە و دادەی مۆدێرنە و پێکهاتووە لە هەموو بەشە جیاجیاکانی هونەر، کە بەشێکی شانۆ یان شانۆنامەیە. هەڵبەت بەشی هەرە گرنگی، بەڵام شانۆش هەر هەمان بەیت و باڵۆرەیە کە لە هەموو کولتوورێکدا هەیە و لە برێکیاندا هاوبەشە. زەمانێك ئەدەبیات و هونەر بۆ خەڵکانی خاس بوو و عەوام بۆیان نەبوو. عەوامیش هونەری تایبەت بە خۆی دروستکردبوو کە زۆربەی بەیت و باڵۆرەکان پڕن لەم هونەرانە کە زۆرتر بۆ سەرگەرمکردن و دەردی دڵ گێڕانەوە دروستکرابوو و دژ بەوانەیە کە دژ بە هەستی ئینسان وەستاونەتەوە، بەڵام رۆژ لەدوای رۆژ ئەم نیگاهە لە هونەر و ئەدەبیات بێڕەنگتر دەبێتەوە و دەبێ بەماڵی هەموو کەس. ئەمەش تێکەڵاوی ئەم دوو نیگاهەی دروستکرد، کە باسێکی جیاوازی دەوێت. سەرەتای هەموو چتەکان وشە بووە وەك چۆن تەنانەت لە سەرەتای ئینجیلیشدا هاتووە. سەرەتایترین وشەکانیش بە دڵنیاییەوە زارەکی و سەر زمانی بوون. تا کاتێ کە وشە دابەش بوو لەنێوان خاس و عام. بۆ کوردیش بە هەمان ئاست وشە و رستە و لایەنەکانی تر، کولتووریان پێکهێناوە. ئەم کولتوورەش پڕە لە چتی جیاواز و جوان، کە لەبەر هەر هۆکارێك بووبێت، نەیتوانیوە بەشێوەیەکی جیهانی بیهێنێتە کایەوە، ئەگینا رێك وایە و دایکی شانۆ، هەمان ئوستوورە و چیرۆك و حەماسە و رازانەن کە ئینسان لەگەڵ خۆیدا هێناویەتە ئەم دۆنیاوە. بەداخەوە نە سینەمای کوردی و نە شانۆی کوردیمان هەیە کە بزانین رەگەزی ئەم کولتوورەی تێدایە، یان نا، بەڵام بە سەیرکردنی کولتووری وڵاتانی

تر دەزانین کە ئەو توخمانە چەندە بەشدارن لە پێکهێنانی هونەری مۆدێرن و بەتایبەت پۆست مۆدێرنیاندا.

**رۆڵ و دەوری ژنی کورد لە دووتوێی دەق و ئەدەبی زارەکیی کورد و بەتایبەت گۆرانی، شیعر، بەستە و بەیتەکاندا چۆن دەبینیت. تۆ پێت وایە نەوەی هاوچەرخ دەتوانێت دەربڕین و بزاوتێکی تر و جیاواز لە ئەدەبی زارەکی بەرهەم بێنێت کە خەسڵەتی ژیانی شار و دونیای هاوچەرخی تێدابێت و چۆن؟**

خۆشبەختانە لەنێو کولتووری فۆلکلۆریکدا، یانێ هەمان بەیت و بالۆرە، ژن دەورێکی زۆر تایبەت دەگێڕێت. قارەمانی زۆربەی داستانەکان ژنە و بەڕێوەبەری زۆربەیان، ژنن. لە بەیتی "لاس و غەزاڵ"دا ئەوە غەزاڵە کە بەڕێوەبەری فەرمانی ئەوین و ئەیندارییە. لە زۆربەی بەیتەکاندا ئەوە ژنەکانن کە بەرەنگاری دەسەڵاتی باوك و باوکسالار دەبنەوە و بە باوکی دەڵێت: بشم کوژی هەر ئەچم... ژن لە ستایلی (فراوێژ)، کە ستایلێك خوێندنی ناوچەی کەلهوڕایەتی و خوێنەران کە ژنیشیان تێدایە و کەسی زۆر ناوداریشیان تێدایە، بەرانبەر بە یەك دادەنیشن و هەرچی بە زمانیاندا هات بە یەك دەڵێن، تا ئەوی تر دەبەزێت. کاتێك دەڵێم هەموو چتێك یانێ زۆر چت یانێ شەرمگای یەکتر بڕین و دڕین، بەڵام بەداخەوە لە گۆرانیدا ئەم رووداوە نییە و زۆربەی گۆرانییە کوردییەکان، پیاوانەن و بەداخەوە ژنانیش هەر ئەو شیعرە پیاوانانەیان وتووەتەوە، بەڵام لە زاراوەی کرمانجیدا تۆزێ جیاوازترە و گۆرانی ژنانە تاڕادەیەکی کەم، زۆرترە لە گۆرانیی سۆرانی. زۆربەی ئەو گۆرانییانەی کە لە کاتی کاردا دەخوێندرێت، بەشی گۆرانی ژنانەی جیاوازە و ژنان وەك ژن دەیخوێنن، بەڵام بەگشتی شیعری ژنانە لەنێو کورددا، یان نییە، یان ئەوندە کەمە کە بەرچاو نییە. چ فۆلکلۆریك و چ کلاسیك و چ نوێ. شیعرێك و ئەدەبیاتێ کە زمانحاڵی ژن و هەستی ژنانە بێت و ئەگەریش قامك لەسەر ناوەکەوە دابنێت و شیعرەکە بخوێنێتەوە، بزانی کە ئەم شیعرە، ژنانەیە.

هیچ نەتەوەیەك نییە کە بتوانێت خۆی لە جیهانیبوون دەرباز بکات. گەرەکمان بێت و گەرەکمان نەبێت، دەبێت لەم تونێلەوە بڕۆین، ئەمەش کاریگەری و باندۆڕی خۆی دەبێت بەسەر ژیان و زمانمانەوە. کەوایە نەوەی نوێ دەکەوێتە ژێر ئەم

کاریگەرییەوە و دەگۆڕدرێت. تا ئێستا کە کاریگەرییەکەی زۆرتر لە ڕواڵەتدا بووە، نەك ناوەڕۆك. کەرەستەی مۆدێرن زۆر زۆرترە لە فکر و ئەندێشەی مۆدێرن. تکایە با خۆمانمان زۆر پێ زل نەبێت. کورد زۆری ماوە کە شاری ببێتەوە. شاری بە مانای کولتووری شار و شارنشینی. یانێ فێری ماشین لێخوڕین بێت. مادام ئەمە نەهاتبێت، ئەدەبیاتەکەشی نەهاتووە. کوردە داماوەکەی من هێشتا نازنێت مودێرنیتە چییە، فێری پۆست مدێرنیتە بووە، هیچ، ئێستاش بیر لە مێتاپۆست مۆدێرنیزم دەکاتەوە. لە تاران و بەغدا گەورەتریشی نەبینیوە. بەرلەوەی کە چتێ بنووسێت، جارێ بیر لە ئیزمەکەی دەکاتەوە. بیر لەوەش ناکەینەوە کە هەرچی فێر بوویێتین، لەژێر وەرگێڕانی فارس و عەرەب و تورکدا بووە. دەبێت ئەمە لە کۆڵ خۆمان بکەینەوە. نە وەك ئەدەبیات، بەڵکو وەك سەروەریی زمان. چەپی ئێمە لە وەرگێڕانی ئەوانەوە، فێری ستالینیزم بوو لەجیاتی مارکسیزم. ئێمە ڕاستەخۆ پێوەندیمان بە دونیاوە نییە. ئێمە جەزیرەین. کام شار؟ کام مودێرنیتە؟! ئێمە لە سەردەمی دوعا و تەلیسم و چاوەزارداین. هێشتا نووشتە کار دەکات. یانێ سەردەمی بەر لە ئایین. زۆر نووسراوەمان هەیە هی کات و سات و شاری خۆیە، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەوە شار بووە؟! ئێستا با زۆریش نائومێد نەبین. وا دیارە کە خەریکە دێت. ئێمەش لەنێو تونێلی زەمەنداین.

**پێناسە:**

- لەدایکبووی ١٨/١١/١٣٥١ی هەتاوی (٧/٢/١٩٧٢ی زایینی)ی شاری سنەیە.

- ساڵی ١٩٩٦ بەهۆی کاری سیاسییەوە، پەڕیوەی کوردستانی باشوور بووە و لەوێ دەستی کردووە بە کاری سیاسی، فەرهەنگی و هونەری و هاوکات بووەتە پێشکەشکاری ڕادیۆ.

- ساڵی ٢٠٠٥ بووەتە بەڕێوەبەری گۆڤاری متمانە لە شاری سلێمانی و هاوکات لە چەند ڕۆژنامە چالاکیی نووسینی هەبووە و چەندین کۆڕی ڕۆشنبیری و فەرهەنگیی ڕێکخستووە.

- ساڵی ٢٠٠٦ دەستی کردووە بە هاوکاری لەگەڵ ڕۆژهەڵات تیڤی و لە بەشی دۆکیۆمێنتاری ئەو تیڤییەدا چەندین فیلمی دۆکیۆمێنتیان لەگەڵ هاوکاران دروستکردووە، کە بە دەنگی خۆی بڵاو بوونەتەوە.

- ساڵی ٢٠٠٨ لە وڵاتی سووید نیشتەجێ بووە و لەوێ خەریکی ژیان و کار و دەرس خوێندن و نووسینە و لەگەڵ چەندین هونەرمەندی گۆرانیبێژ خەریکی هاوکارییە لە بواری شیعری گۆرانیدا و هاوکاتیش خەریکی نووسینی کۆمەڵە شیعرێکە بە زمانی سویدی.

- چەندین وتووێژی فەرهەنگی و هونەریی لەگەڵ ئەنجامدراوە، کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوبوونەتەوە.

- خۆی بەرتەسك نەکردووەتەوە لە بەشێکی تایبەت لە هونەردا و توانای لە هەر بەشێکدا هەبووبێت، کاری تێدا کردووە، بۆ وێنە: بێژەری، پێشکەشکاری، شیعر، موزیك و... هتد.

## ئەدەبی فۆلكلۆر، دیمانە لەگەڵ ژنە شاعیری رۆژهەڵات بەیان عەلیڕەمایی

سازدانی: شەریف فەلاح- سنە

**ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی گشتی پێناسەیەکی ئەدەبی زارەکی بکەین، دەبێت لەسەر بنەمای چوار کۆڵەکەی گرنگی: ١- بەیت ٢- لاوك ٣- حەیران ٤- پەندی پێشینیان لەنگەر بگرین، رای بەڕێزت لەم بارەیەوە چییە؟**

ئەدەبی زارەکی کەلەپوور و مێژووی نەناسراوی خەڵکە کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ سینگ بە سینگ و دەم بەدەم بۆ نەوەی ئەمڕۆ و داهاتوو گوێزراوەتەوە.

بەیت و لاوك و حەیران سێ بەشن لە ئەدەبی زارەکی، کە دەربڕی هەست و ئەندێشە و بیروڕای خەڵکن و بەشێکی بەرچاو لە مۆسیقای فۆلکلۆر دەگرنەوە.

ئەگەرچی ستران و گۆرانییە کۆنەکان وێژەر و مێژووی لەدایکبوونیان دیار نییە، بەڵام لەکاتی لەدایکبوونی مرۆڤەوە ئەم سترانانە لە گیان و رۆحی خەڵکدا بووە و گەشەی کردووە. زۆربەی هۆنەرەکانیان جووتیار، ئاژەڵدار یان ئەویندارانی دڵپاك، تەنانەت خەڵکی نەخوێندەوار بوون، کە بێ هیچ راهێنانێك لەبارەی رەوتی شیعرەوە جوانترین بەرهەمیان خولقاندووە.

پەندی پێشینیانیش ئەو وتە بەنرخانەیە کە فەرموودەی رۆڵە ژیر و قسەزان و بەسەلیقەکانی ئەو گەلەیە، کە ئەمەش لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی دووروودرێژی ژیانی پڕ ئازار و ئەشکەنجە و برسێتی و نەداری هەڵقوڵاون.

**بەرای بەڕێزت چۆن دەکرێت لە دووتوێی پەندی پێشینیان، قسەی نەستەق و حیکایەت و نەزیلە و مەتەڵە خۆماڵییەکاندا ژیار و شارستانییەت و جیهانبینیی نەوەکانی رابردووی کۆمەڵگای کوردستان دەستنیشان بکەین؟**

بێگومان فۆلکلۆری هەر میللەتێك ئاوێنەی باڵاروانی پاك و بێگەردی ئەو گەلەیە، چونکە لە دڵ و دەروونێکی پاك و بێگەرد و بێ فروفێڵەوە هەڵقوڵاوە، جا لە هەر بەرگ و کاڵایەکدا بێت:

پەندی پێشینیان، گۆرانی، قسەی نەستەق یان چیرۆك و...

فۆلکلۆر داهاتی خولقانی بە تێکڕایی کۆمەڵگایە و خۆشی و ناخۆشییەکان، ئاوات و ئامانجەکان، شێوەی ژیان و بیروباوەڕی ئایینی ئەو کۆمەڵگایە پیشان دەدات.

**ئایا فۆلکلۆری کوردی بە بەراوردکردن لەگەڵ فۆلکلۆری گەلانی تر لەباری زمانی و وشەناسی و هەروەها لە باری جوانیناسییەوە تا چەندە دەوڵەمەندە، بەگشتی لە چ ئاستێکدایە؟**

گەلی کورد وەکو گەلانی تری رۆژهەلاتی ناڤین خاوەن کەلەپوورێکی دەوڵەمەندە. ئەگەر ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردی وەکو یەکێك لە ساماندارترین ئەدەبیاتی فۆلکلۆری جیهان دابنێین، بە هەڵەدا نەچووین، رەنگە هۆی ئەمە بگەڕێتەوە بەوەی کە کوردستان یەکێ لە یەکەمین شوێنگەلی شارستانییەت بووە، کە هەبوونی زاراوەگەلی فراوان لە زمانی کوردیدا شایەتێکن بۆ ئەم وتەیە.

**رەنگدانەوەی کەسایەتیی "ژن" و هەروەها دەور و رۆڵی لە فۆلکلۆری کوردیدا چۆن دەبینیت، بەتایبەت لە بەیت، گۆرانی و قسەی نەستەق و حەیراندا ئەم رۆڵە چۆنە؟**

لە کوردستاندا ژن و فۆلکلۆر پێوەندییەکی نزیکیان پێکەوە هەیە. ژنان لە بەیت و گۆرانییە کوردییەکاندا رۆڵێکی بەرچاویان هەیە و برێ جار قارەمانی چیرۆکانن.

جیا لەوەش زۆربەی چیرۆك و مەتەڵەکان بەدەم ژنانەوە دەوترێت و هەوڵ دەدرێت لەبیر نەچێتەوە. بۆ نموونە وتنی بەرتەونانە بەدەم تەونکردن و کار و فرمانەوە.

لە سەرانسەری کوردستاندا رێورەسمی پرسە و ئازیەتی بەدەنگی ژنان و لەلایەن ئەوانەوە بەرێوە دەچێت. منداڵی کورد تەواوی لایەلایە و گۆرانی و چیرۆکەکان لەدایك و دایەگەورە و پوورەکانییەوە دەبیسێت و فێر دەبێت، دەتوانین بڵێین بۆ بیستنی دەنگی راستەقینەی ژنی کورد دەبێت گوێ بۆ فۆلکلۆر و گۆرانییە کۆنەکان رابگرین.

بۆ نموونە:

قاڵییەکەی دەسم ماسی دەرهەمە پڕ زگ ماسییەکان زووخ و وەرهەمە

ماسی لە دەریا خۆراکی ئاوە — خوەیشك بۆ برا جەرگی کەواوە

ئەگەر بیەی پێم گەنج بە حەوانە — کەنیشکی خۆشە لە ماڵ باوانە

باخ بێ پەرچین زینەتی نییە — خوەیشك بێ برا قیمەتی نییە

یان:

دایك بوینە، دوختەر بخوازە.

خوا بکا بە گلۆڵەی موو

دارایی باوکم ئەمداتە شوو
کەنیشك هەوەی دایکە.
سفرەیەك دایك دایخا، ئەشێ کەنیشك بیاتە یەك.

**بەڕای جەنابت، ئەو ڕەهەند و لایەنە جیاواز و شاراوانەی ئەدەبی زارەکی و فۆلکلۆری کوردی کە هەتا ئێستا باسیان لەبارەوە نەکراوە، کامانەن؟**

بەڕای من چەند بەش لە ئەدەبی زارەکی و فۆلکلۆری کورددا هەن کە ئەگەر نەتوانم بڵێم قەت باسیان لێ نەکراوە، بەدڵنیاییەوە ئەیژم کەمتر سەرنجیان پێدراوە، وەك: مەتەڵە کوردییەکان و کایە و یارییەکان.

مەتەڵەکان کە پێشینەیەك بەدرێژایی مێژوویان هەیە، وەکو بەشێك لە ئەدەبی زارەکی پێویستیان بە سەرنجدانە. بەداخەوە نەناسینی ئەم میراتە بەبایەخە و گۆڕانی شێوازی ژیانی خەڵك بووەتە هۆی ئەوەی کە بەم بەشە لە کەلەپووری کورد سەرنج نەدرێت. بەشێوەیەك کە ئەمڕۆ بە مردنی هەرکام لە بەساڵاچووان ئەم خەزێنە بە بایەخە کە لە سینگیاندایە، دەنێژرێت و بە دەست بای فەرامۆشی دەسپێردرێت. ئەم مەتەڵەم لە سەردەمی منداڵییەوە لەبیرە کە دەمانگوت:

- ئەوە چییە؟

بانێکە و دووکانێکە، چوار بزن و شوانێکە... کە مەبەست دەست و قامکەکان بوون.

بەشی دووەم یارییەکانە کە لەبیرچوونەتەوە و ئێستا ئیتر لاوەکان و منداڵەکان ناویان نازانن وەکو: گورزان- چێوچە لەزرکێ- کاکلە شێران- قاوقاوان و...

**پێوەندی و لێکئاڵانی ئەدەبی هاوچەرخ و ئەدەبی زارەکی چۆن لێك دەدەیتەوە، نەوەی ئەمڕۆ چۆن دەتوانن ئەو ئامرازە خاو و خۆماڵییانەی دنیای فۆلکلۆر لە دەقی ئەمڕۆدا بەکاربهێنن؟**

بەپێچەوانەی بیروڕای هێندێك کە پێیان وایە فۆلکلۆر تەنیا سەبارەت بە پێشینیان و لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی ئەوانە، دەبێت بڵێم ئەگەرچی فۆلکلۆر میراتی پێشینیانمانە، بەڵام هەم ئێستا و لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا زیندووە و بەسەر پاوە وەستاوە.

فۆلکلۆری کورد بە دەوڵەمەندی و سامانێك کە هەیەتی، سەرچاوەی خورپە و ئیلهامن بۆ هونەرمەندانی لاو و داهێنەرانی ئەمڕۆ کە لە دووتوێی دەقە ئەدەبی و هونەرییەکانی ئەمڕۆدا بە جوانی بیانگونجێنن و بە ئەنجامدانی ئەم کارەش جیهانبینی و جیهانبینی نەوەکانی پێشوو لە هەناوی زمان و ئەدەب و هونەری هاوچەرخدا لەلایەن نەوەی ئەمڕۆوە بەرجەستە دەبنەوە، کە ئەمە خۆی پردی پێوەندی و درێژەدانی ڕەوتی ئەدەبیات و داهێنانە.

کەوایە پێویستە بە ڕوانینێکی وردبینانەوە بڕۆین بەدوای کەلەپوور و ئەدەبیاتی خۆماندا.

**جوگرافیا و شوێن چ کاریگەرییەکیان لە سەرهەڵدانی بەیت و باو و ئەدەبی شەفاهیدا هەیە؟**

بوونی سروشتی جوان بەتایبەت لە ناوچەی کودەواریدا و دیمەنی دڵڕفێنی بارودۆخێکی تایبەت بە خۆی خولقاندووە. هەرئەمەش بووەتە هۆی هەرچی دەوڵەمەندتربوونی فۆلکلۆری کورد، چونکە بەدرێژایی مێژوو لەبەرئەوەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی سروشتییە، هەم کاریگەریی لەسەر سروشت هەبووە و هەمیش کاریگەریی ڕاستەوخۆی لە سروشت وەرگرتووە. هەر لە کاتی پێگەیشتنی مرۆڤەوە و بەپێی قۆناغەکانی تەمەن فۆرم و قاڵبگرتنی زەین و بیری مرۆڤ لە ڕێگای سروشتەوە ناشاردرێتەوە، ئەمەش لە نووسین و گۆکردن و دەربڕیندا دیارە. بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەم وتەیە دەوڵەمەندیی لق و شاخە جیاجیاکانی فۆلکلۆرە لە بواری وشە و دەستەواژە سروشتییەکان و ئەم ڕەوتەش لە ئەدەبیاتی کلاسیك و بەتایبەت شیعردا بە جوانی ڕەنگیداوەتەوە و زمانی نووسین و ئاخاوتنی نەتەوەی کورد لەباری وشەی سروشتی کشتوکاڵییەوە هیچکات کەم ناهێنێت، ئەمەش سروشتی بوونی زمانەکەمان دەردەخات.

**هێندی لە دەقە فۆلکلۆرییەکان لەباری فۆرم و داڕشتنەوە سەرەڕای ئەوەی کە هۆنەر و دانەرەکانیان خاوەن خوێندەوارییەکی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام توخمی شیعری نوێیان تێدا بەدی دەکرێت، ڕای بەڕێزت لەم بارەیەوە چییە؟**

ڕۆژهەڵاتناس و ڕووناکبیری گەورەی ئەرمەنی (ئەبووڤیان) دەڵێت: "لەناو هەموو کوردان تەنانەت پیرە پیاوانی نەخوێندەواریش هەست و بەهرەی شاعیریی بەدی دەکرێت، بە چەشنێك کە زۆربەیان لە گۆرانی چڕیندا بەتوانان و لەوپەڕی سادەییەوە گۆرانی بەسەر دۆڵ و چیا و تاڤگە و ڕووبار و چەك و ئەسپ و قارەمانەتی و جوانیدا دەڵێن". هەروەك کە ئاماژەم پێکرد زۆربەی هۆنەرەکانی ئەم دەقە فۆلکلۆرییانە خەڵکی نەخوێندەوار بوون، کە هیچ زانستێکیان لەبارەی ڕەوت و چۆنییەتی نووسین و تۆخمەکانی شیعرەوە نەبووە، بەڵام جوانترین بەرهەمیان خولقاندووە، ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو، ژیار، ژیانی کۆمەڵایەتی و جیهانبینیی ئەم نەتەوەیە.

**ئەو بەربەست و گرفتانەی کە دێنە بەردەم لێکۆڵەران لە چێوارچێوەی شوێن کەوتنی ئەدەبی زارەکی فۆلکۆلۆردا، کامانەن و ئەزموونەکانی بەڕێزت چۆن بوون لەم بارەیەوە، چ پێشنیارێکت بۆ پۆلێنبەندی و کاری تۆکمە و زانستی لەسەر کۆکردنەوەی ئەدەبیاتی زارەکی هەیە؟**

هەر پەلێك لە بەشەکانی فۆلکلۆر پێویستی بە کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی تۆکمە و پۆلێنکراو هەیە، ئەمەش گەڕانێکی دوورودرێژی دەوێت بە هەموو کوردستاندا بەشێوەیەکی ئاکادیمی و مەیدانی.

لەم چەند ساڵەی دواییدا لە هەر دەرفەتێکدا کە بۆم ڕەخساوە خەریکی کۆکردنەوەی فۆلکلۆر بووم و هەرچەند وەخت جارێ لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا لە چاپ دراون، بەڵام هەر ئەمە ڕازیم ناکات و بەدوای دەرفەتێکەوەم کە بەشێوەیەکی زانستی لەسەریان کار بکەم.

ناوەندە زانیارییەکان، خوێندنگاکان، زانکۆکان، بەتایبەت چاپەمەنییەکان هەموویان دەتوانن لە پاراستن و ناساندنی ئەم بەشەدا دەستێکی باڵایان هەبێت.

## پێناسە:

- لەدایکبووی ١٨ی ڕەشەمەی ساڵی ١٣٥٧ی هەتاویە لە شاری سنە.
- هەر لە منداڵییەوە هۆگری بە شیعر و ئەدەب و خوێندنەوە پەیداکردووە و بە لەبەرکردنی شیعری شاعیران درێژەی بە کاری ئەدەبی داوە.
- ساڵی١٣٧٥ بۆ یەکەم جار بووەتە ئەندامی یەکێك لە ئەنجومەنە فەرهەنگی و ئەدەبییەکانی سنە و بە فەرمی دەستی داوەتە نووسینی شیعری فارسی و کوردی و هێندێ جاریش کاری وەرگێڕانی شیعری کردووە.
- لە ماوەی ١٥ ساڵی ڕابردوودا لە زۆرێك لە کۆڕ و کۆبوونەوە، فێستیڤاڵە فەرهەنگی و ئەدەبییەکانی شارەکانی کوردستاندا بابەت و شیعری پێشکەش کردووە.
- لە زۆربەی گۆڤار و حەفتەنامە کوردییەکانی وەك: ئاوێەر، سیروان، سروە، زرێبار و ڕۆژهەڵات بەرهەمەکانی بڵاوبوونەتەوە.
- لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا بەشێوەی جیدی و بەربڵاو دەستی کردووە بە کۆکردۆنەوە و فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکیی سنە و ناوچەکانی دەوروبەری، بەڵام هەتا ئێستا بە چاپی نەگەیاندوون.
- ئێستا فەرمانبەرە و دانیشتووی شاری سنەیە.

# ڕێوڕچەی یارسان و کاکەیی، سەرچاوەی زمان، فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی

دکتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی- کرماشان

ئەم بابەتەی کە من دەمەوێت ئەمڕۆ لەم کۆڕەدا باسی بکەم، ئەوەیە، کە ناوەرۆکی ئەم کۆڕەی کە من لەبارەیەوە دەدوێم، ئەوە نییە کە من کتێبێك هەڵگری بکەم و بێم لێرەدا باسی بکەم. هیوادارم ئەوەی کە من باسی لێوە دەکەم تازە بێت و جێگای سەرنج بێت، چونکە بەرهەمی رەنج و بەرەی سی ساڵ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی منە بەشێوەی مەیدانی و کتێبخانەیی، لەبارەی فەرهەنگ و ئەدەبیات و مێژووی یارسان و کاکەیی لە ناوچەدا، کە ئەگەر بەڕاستی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیش دەبەزێنی و بەرەو ئەورووپا دەڕوات، ئێمە سەبارەت بە مەسەلە و پرسەکانی لێکۆڵینەوەی کاکەیی و یارسان گرفت و کێشەی زۆرمان هەیە. دەگێڕنەوە: "کابرایەکی رێبوار باری شووشەی پێ بووە و گەیتشووەتە دەروازەی شارێك و پاسەوانەکە مشتێکی لەبارەکەی دا و وتوویە: بارەکەت چییە و ئەویش دەڵێت ئەگەر مشتێکی دیکەی لێ بدەیت هیچ".

ئێمە بەڕاستی بە نیسبەت ئەوەی کە بەناوی "سەرەنجام" و بەناوی "کاکەیی" و بەناوی فەرهەنگ و ئەدەبی ئەو مەکتەبەوە پشتمان پێ بەستووە. "هەروەك ئەدەبیاتی ئیسلامی بە قورئان دەست پێدەکات، ئەدەبیاتی کوردیش بە سەرەنجام دەست پێدەکات". لەو شەش حەوت بەرگەی کە نەمر "مارف خەزنەدار" لەمەڕ مێژووی ئەدەبیاتی کوردی نووسیویەتی، ئەگەر بەڕاستی لێی بڕوانین چوار بەرگی ئەدەبیاتی یارسانە، ئێمە لە سەدەی هەژدەیەمەوە بووینەتە خاوەن ئەدەبیات. بۆچی نابێت ئاوڕێك بدەینەوە لەو شتەی کە پشتمان پێ بەستووە و ئەدەبیاتی ئێمە گرێدەدات بە ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبییەوە، من کارم بە فۆرم و پێکهاتەی سەرەنجامەوە نییە و دەپەڕژێمە سەر ناوەرۆکەکەی. بەو شتەی کە ئەمڕۆ ئێمە لە کاکەیی دەڕوانین کە نزیك بە ٥٠٠ هەزار کەسێکن لە سنووری کەرکووك و شارەکانی دیکەی هەرێمی کوردستان دەژین و دەستمان ناوەتە ژێر سەری خۆمان و نزیك بە هەزار و چوارسەد ساڵیشە خزمەت بە ئەدەبیاتی عەرەب دەکەین، کە لە بواری خۆیدا هەنگاوێکی بۆ هەڵنەهێناڤینەتەوە، جیا لەوەی کە باوەڕمان پێیەتی و پیرۆزە لەلامان و بە شوێنیشیدا دەڕۆین و گرێبەستمان لەگەڵیشی هەیە، وەلێ ئەم پرسیارە بە قەولی لایەنگرانی فەلسەفە کە دەڵێن: "رەخساندنی پرسیار لە مێشك و زەینی مرۆڤدا لە وەڵامەکەی زۆر گرنگترە".

ئایا هیچکاتێ ئەم پرسیارەمان لە خۆمان کردووە کە کێ یەکەم جار، چ بابەتێك بۆ یەکەم جار و چ بوارێك یەکەم جار ئێمەی بە هەموو دونیا ناساند؟ پسپۆڕان،

مامۆستایان و ئەوانەی کە لە بواری زانستیدا شارەزایان هەیە، چاو لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلام و بەریتانیا بکەن و لە ئینسکلۆپیدیای ئەوانە بڕوانن کە لەسەر کورد نووسیویانە، وەك پسپۆڕێکی ڕۆژهەڵاتناس، "پترۆشفسکی"، "ژێکۆفسکی"، "ئاکۆپۆف"، "ئەیوانۆف" و ئەوانەی کە نووسیویانە و دواوین کەسیان کە "برووسن"ە و کتێبی دەوڵەت و میللەتی کوردی نووسیوە، ئەگەر بێت و لاپەڕەکانیان هەڵدەینەوە دەردەکەوێت نەك تەنیا لەبەر ئەدەبیاتی ئێمە نەهاتوون، بەڵکو بۆ ئەو کۆنە کولتوور و ئایینانە هاتوون کە کاکەیین و لە ناوچەی شارەزوور و لە کرماشان و ناوچەکانی دیکەدا بڵاوبوونەتەوە.

تەنیا مەزهەب و مەکتەبێك کە بەشێوەی سەربەخۆ لەناو نەتەوەی کورد بە زمانەکانی فەرانسەیی، ئینگلیزی و ئاڵمانی بابەت و وتاری لەبارەوە نووسراوە، تەنیا مەکتەبی کاکەیی و یارسانە.

یانی ئەگەر ئێمە ئەمڕۆکە لە دونیادا ناسراوین بەهۆی مەکتەبی یارسان و فەرهەنگی کاکەیی ناسراوین، کورد تەنیا نەتەوەیەکە وەك بازنەیەکی دەست لێ نەدراو ئایین، دابونەریت و ڕێورچەی ئایینی "خەتی" و "دەوری" ئایینی خۆی بە ناوی ئایینی "دەوری"یی کاکەیی و یارسان کۆکردووەتەوە. لە هەر کوێیەکی دونیا لە هەر دینێکی خەتیدا، دینی خەتی وەکو: "یەهوود، نەسارا و ئیسلام"، یان دینی دەوری وەکو دینی: "بوودیسم، شینتۆ، هیندی و سینك" و... ئەگەر ئێمە لاپەڕەکانی "سەرەنجام" هەڵدەینەوە، دەبینین توخم و پێکهاتەی ئەو دینانە لەناو "سەرەنجام"دا هەن، گەورەترین سەرچاوە و کتێبخانەی کوردی، کتێبخانەی سەرەنجامە. ئێوە لە کام کتێبی ئایینیدا بینیوتانە، جگەلە قورئانی پیرۆز و لەوانەیە جیا لە "ئینجیل" و "تەورات" تەنیا کتێبێك کە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و دەتوانم بە بوێرییەوە بڵێم لە تەواوی دونیادا زیاتر لە سەدان کتێبی ڕاڤەیی و شیکاری بە زمانی کوردە هەیە و لەبارەیەوە نووسراوە، تەنیا کتێبی سەرەنجامە. هەر قۆناغێکی سەرهەڵدان و بووژانەوە کە دێت، گەنجینە و سەرچاوەیەك بەناوی گەنجینەی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت. هەتا دوایین دەورەی، کە دەورەی "یەری تەنی و چل تەن"ی "سەید حەیدەر"ە، ئەگەر بە وردی لێی بڕوانین چل تەنەکە چل دەفتەریان هەیە، هەمووشی بە زمانی کوردییە. سەرەنجام و کەلامە سەرەکییە کە "دەفتەرە" ئەویش هەر بە زمانی

کوردی نووسراوە. ئایا ئێمە پرسیارمان لە خۆمان کردووە کە یەکەمین جار زمانی یەکگرتووی نەتەوەی کورد لە چ کتێبێکدا هاتووە؟ ئێوە چ کتێبێکتان دیوە کە کوردی بێت و بیکەنەوە و ببینن وشەی زازایی، کرمانجی، هەورامی، کەلهوڕی و سۆرانی تێدا بێت و کوردستان و بەشەکانی سوریا، تورکیا و عێراق و ئێران پێوەند بدات بە یەکەوە؟ هەمووشی وەکو وشەی زارەکی باس لێ بکات و لە ئەدەبیاتیشدا بەکاری بێنێت؟ ئاخۆ هەتا ئێستا چ کتێبێکتان بینیوە کە هەتا ئێستا لەو کتێبەدا جوگرافیای ئێران، عێراق، تورکیا و سوریا و هەموو ئەو ناوچانەی کە کوردیان تێدا نیشتەجێیە، وەکو نیشتمانێکی پیرۆز چاو لێ بکات؟ لە کام کتێبی ئایینیدا هاتووە کە نازلبوونی ئایاتی ئیلاهی بەسەر مرۆڤی کاملدا لە نیشتمانی کورداندا هاتووە؟ لە کام کتێبدا هاتووە کە دەبێت کڕنۆش بەرن بۆ خاکی شارەزوور؟ ئەو خاکی شارەزوورەیە کە ئێمە هەتا ئێستا ئاوڕمان لێ نەداوەتەوە. کە من نامەوێت لێرەدا بیکەمەوە و باسی لەبارەوە بکەم، چونکە باسەکەی من شتێکی دیکەیە. سەرەنجام هەموو راز و رەمزی پێوەندیدار بە فەلسەفەی تێدایە، هەرچەند ئیبن سینا یەك وشەی سەبارەت بە فەلسەفەی "مەشا و ئەرەستۆ" زیاد نەکرد، وەلێ هەر لەم شارەزوورەدا فەلسەفەیەکی تر پەیدا بوو، کە ئەمڕۆکە جیهانی رۆژهەلات و رۆژئاوا چاوەڕێی کرانەوەی ئەو فەلسەفەیەن.

ئێمەی کورد هەرچەند پێویستە و زەرووره لە جیهانی مۆدێرنی ئەمڕۆدا زمان و فەلسەفەی کەسانێکی وەك: هابرماس، ویتگن ئێشتاین و فۆکۆ و... بزانین و بیخوێنین، بەڵام ئێمە فەلسەفە لەلای خۆمانە و ئاوڕمان لێ نەداوەتەوە. بەڵگەنامەشمان بۆی هەیە وەك فارس دەڵێت: "گواه عاشق سادق در آستین باشد". یەکەم جار کە من کتێبی وەلایەتنامەم بینی، وەلایەتنامە کتێبێکە هی "حاج بەکتاش وەلی"یە، ١٧ هەتا ١٨ میلیۆن لەو بەکتاشیانەی کە بەستراوەیی فکری و بیروبۆچوونی نزیکیان بە کاکەییەوە هەیە، لە چەشنی، شافعی، مالکی، حەنەفی و حەنبەلی، بەڵام ئەوان لە یارسان و کاکەییەکانی تورکیان، کە من لە چەند کۆڕ و سیمینارردا لە زانستگای ئانکارا بە گوێی خۆم دەمبیست کە مامۆستا گەورەکان کە لە "کۆپورلۆ" و کەسانی تریان دەگێڕایەوە، دەردەکەوت کە هەموویان پشتیان بە وەلایەتنامە دەبەست. کەوتمە ئەو بیرەی کە ئاخۆ ئەم کتێبە و هەر سەرچاوەیەك کە لەبارەیەوە باس دەکەن سێبەرێکی لە زەینی مندا هەیە، خۆ ئەمە هەموو سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ

سەرەنجام، ئەم ١٨ ملیۆن کەسەی کە بەردەوام پەیجۆرەکان لە ئێمەیان دەپرسی کە ئاخۆ کاکەییەکان دابونەریت و ڕێورچەیان چییە و چی دەکەن؟ بەڵام ئێمە لێرە دەرگامان هەیە، ئێمە ١٨ ملیۆن کەسین بەپێی گێڕانەوەی دەوڵەت و ٢٤ ملیۆن کەسین بەپێی گێڕانەوەی خۆمان. ئێمە ئێستا ئیمکاناتی ڕاگەیاندن و میدیا و کاناڵی ماهوارەییمان هەیە، لەکاتێکدا دەبینین جەمخانەی ئەستەمبۆل ١٥٠٠ کەسی تێدایە کە بە تەموورە و زیکر و دوعا دابونەریتی خۆیان بەجێ دەگەیەنن. لە هەموو ئەو دابونەریتانەشدا مەسەلە ئیسلامییەکانی تێدا گونجێنراوە، پێوەندییان پێکەوە هەیە.

لە کۆڕێکدا لەگەڵ خوێندکارانی خوێندنی باڵا و دکتۆرا لە زانکۆی تاران و لەناو ئەوانەی کە تورکیی ئەستەمبۆڵییان دەزانی وەلایەت نامەیان هێنایە سەر زمانی فارسی کە بەخۆشییەوە دەزگای ئاراس بە کوردی چاپی کرد. کارێکی دیکە کە ئەنجامان دا بەرهەمێکە بەناوی "بۆیروق" کە هی "قزلباش و عەلەوی، عەلەوی-بەکتاشی و شەبەك"ەکانە، کە فەرمان و دەستوورەکانی "شێخ سەفی"یە، کە بەشێکی عەرەبی و بەشێکی دیکەشی تورکیی ئەستەمبۆڵییە، کە پێشتر زمانی تورکیی عوسمانی بووە و دواتر کراوە بە ئەستەمبۆڵی و ئەوەشمان کردە فارسی و لە کۆتاییشدا وەرمانگێڕایە سەر زمانی کوردی. کاتێك دەبینین دەردەکەوێت ئەوەی کە وەك تێکستێکی سەرەتایی لە وەلایەتنامەدا هەیە و ئەو ١٨ ملیۆن، یان ٢٤ ملیۆن کەسە ڕوویان تێکردووە، یان ئەوەی کە لە دووتوێی بۆیروقدا هەیە، هەموو سەرچاوەکانی بە تێروتەسەلی لەناو کتێبی "سەرەنجام"دا هەن. کە من لە کتێبی "بنەما هاوبەشەکان لەناو سەرەنجام (وەلایەتنامە و بۆیروق)" هەموو خاڵە هاوبەشەکانی ئەو سێ دەقە، واتە هەم تێکستەکانی سەرەنجام، بۆیروق و وەلایەتنامە بەشێوەی ئاماژە و هێماگەرانە کە کام داستان و کەسایەتی لە کام داستان و کەسایەتییەوە گێڕدراوەتەوە، هەمووی تێدا هاتووە و لێرەدا ئاماژە بە هێندێ لە خاڵە هاوبەشەکانیان دەکەم.

ئەگەر جوگرافیای عەلەوییەکانی ڕوو بە ڕۆژئاوا لەبەرچاو بگرین، لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەدا کە مانگی مارس (ڕەشەمە) لە ئەستەمبۆڵ کۆ دەبنەوە لە هەرێمەکانی: "مەقدوونیە، ئالبانی، بوسنی و هێرز گۆڤین، لە هیندوستان، پاکستان و ئەورووپا" بەگشتی لەوێ کۆ دەبنەوە، هەموویان لە چواردەوری وەلایەتنامەدا کە کۆپییەکی زۆر کەمڕەنگە لە سەرەنجام، کۆ دەبنەوە و بەو دەسەڵاتەی کە لەوێ هەیە

باسەکانیان لەو چوارچێوەیەدایە. من یەکەم جار کتێبی "بزووتنەوەی عەلەوییەکانی زاگروس" کە هەتا ئێستا لە ئێران و بە زمانی فارسی لە ئەژماری ۲۰ هەزار دانەدا لە ئێران چاپ بووە باسم لەوە کردووە، کە هەموو بزووتنەوە کوردییەکان لەژێر ئاڵا و چاودێریی رواڵەت و گەورەیی بیروباوەڕی کاکەیی و یارساندا بوون.

هەر لە سەردەمی "شاخۆشین موبارەکشا"وە هەتا سەردەمی "باباسەرهەنگ دەوان"، "بابا ناوفی سەرگەتی" و سەردەمی حەزرەتی "سوڵتان ئیسحاق" و هەتا ئەو بزووتنەوانەی کە لە دەورەی سەفەوییەدا وەکو: "نوقتەویە" و لە دەورەی موغوڵەکاندا وەکو "حرووفیە" و لەدوای ئەوەش هەتا دەگاتە دوایین سەردەم کە لە نیشتمانی کوردستانیش وەکو بزووتنەوەی "حەق"ەکان، بزووتنەوەی "سەید رەزا دێرسیم" لە تورکیا هەموویان لەژێر ئاڵا و کاریگەریی فکریی یارسان و کاکەییدا بوون کە بە شرۆڤە و بەشێوەی زانستی لە دوو بەرگدا و لەسەر بنەمای لێکۆڵینەوەی کتێبخانەیی و مەیدانی و لەسەر بنیادی کتێبی سەرەنجام کارم لەسەر کردوون و جیا لەوەی کە کراون بە کوردی، لە ئەستەمبۆڵیش کراون بە تورکیی ئەستەمبۆڵی و لە چاپ دراون.

کتێبی دیکەش کە دکتۆر "فوئاد بوزکورت" کە خۆی پرۆفیسۆری زانستگای ئانکارا و پێڕەوی یارسان و لە عەلەوییەکانی تورکیایە، شیکردنەوەیەکی بۆ فەرمانی "شێخ سەفی" کردووە کە شیکردنەوەیەکی تێروتەسەلە و بە زمانی تورکی چاپ کراوە.

دەبێت ئەم خاڵە گرنگە بزانین کە ئێمە لە کتێبی سەرەنجامدا هەر سەرچاوەیەك گوم بکەین، یان رووبەڕووی گرێ و راز بینەوە، یانی کلیلەکەیان بەدەستەوە نییە وەکو ئەو دەستەواژانەی کە هاتوون، مانا داستانە سادەکەی لە ویلایەتنامەدا هاتووە، چەمك و واتاکانی لە بۆیروق دایە، یانی کلیلەکانی دەبێت لە بۆیروقدا بدۆزینەوە، چونکە ئەوانە لە سەردەمێکدا بوون کە نەیانتوانیوە ئەسڵ و دەقە رەسەنەکە بپارێزن و لەبەرئەوەی کە زمانیان تورکی و عەرەبی بووە، بۆئەوەی کە بتوانن ئایینەکەی خۆیان ببەنە ناو نیشتمانی عەرەب و تورکەوە وەریان گێڕاوەتەوە بۆ ئەو زمانانە. بۆیروقی شێخ سەفی کراوەتە کوردی، وەلایەتنامە کراوەتە فارسی و هەروەها کتێبێشکیشم لەبارەی مێژووی بنەماڵەکانی هەقیقەت لە ئێران نووسیوە. من، لەبەرئەوەی کە بازنەی لێکۆڵینەوەکەم دەڤەری کرماشانە، کرماشان ناوەندی ئایینی یارسانە، ئەم کتێبە مێژووی هەموو بنەماڵەکانی "حەفتەوانە و شا مێهمان"، واتە هەر یازدە بنەماڵەکەی

لەخۆ گرتووە. هەروەها بنەماڵە مۆدێرن و پۆست مۆدێرنەکان (مۆدێرن و پێش مۆدێرن)ی ئەم ئایینە و هەروەها ڕۆشنبیرە فکرییەکانی یارسان لە کرماشان کۆ بوونەتەوە، ئەم کتێبە بە پشتبەستن بە بەڵگەی ورد و دروست بۆمان دەردەخات کە پێوەندیی قووڵ لەنێوان خانەدان و بنەماڵەکانی "ئالی حەق" لەگەڵ خانەدان و بنەماڵەکانی عەلەوی (بنەماڵە و خانەدانی حەزرەتی عەلی)دا هەبووە و بەڵگە و شەجەرەنامەیان هەیە و ئەم مەسەلەیەش شتێك نییە کە من یان کەسانێکی تر لەخۆیانەوە بیڵێن. لەخۆڕا نییە کە ناویان نراوەتە عەلەوی، بەڵگە و شەجەرەنامەی مۆرکراوی نەوەوە و پشتاوپشتی سەدەی هەشتەم بەدواوە لەبەر دەستدایە. ئەمانە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ڕەسوڵی خودا هەبووە، کە حاشایان لێ ناکرێت. ئێمە دوو مەسڵەکمان هەیە لە مەکتەبی ئیمام جەعفەری سادقدا، یەکیان مەکتەبی دەروونییە و ئەوی دیکەشیان مەکتەبی فەقێ و شەریعەتییە. ئەوەیان کە مەکتەبی فەقێ و شەریعەتییە دەڕواتە ناو بازنە و بیاڤی "حەوزەی علمیە" و لە چەشنی ئیسماعیلە کە لە چوارچێوەی بازنەی دەروونگەراییدا دەخولێتەوە. یارسان کە بە قەولی لایەنگرانی عەقلانییەت و لۆژیك "گشتییەت و تایبەتی من وجه"ە، یانی هەم لەناو ئەو بازنەیەدایە و هەم لەناویشیا نییە، لە هێندێ مەسەلەی بنەڕەتیدا کە من لە نامیلکەی "بنەوای باوەڕی یارسان"دا ئاماژەم پێکردووە، کە زۆربەی سەرچاوەکانی لایەنگرانی مەزهەبی شیعە و موفتییەکانی مەزهەبی سوننەش ئاماژەیان پێکردووە، ئەوانە لەناو بازنەی مەسەلەی بیروباوەڕ و ئەهلی کیتابدان و لە دەرەوەی مەسەلەکانی پێوەندیدار بە ئەهلی کیتابەوە نین. ئێمە دەزانین کە ئایینی یارسان چەندین جۆر پێوەندیی سەرەکیی و دەرونیی لەگەڵ یاسا و عورفە ئیسلامییەکان هەیە. ئێمە ئەگەر بڕوانینە مێژووی تەسەوفی ئیسلامی، بۆ وێنە مێژووی "نەقشبەندی"، ئەرێ هەتا ئێستا کەسێك لە کوردستاندا پرسیاری ئەوەی کردووە کە بۆچی دوای حەوتسەد ساڵ لە هاتنی ڕێوڕچەی نەقشبەندی بۆ کوردستان بە جارێ لە سەدەکانی سێزدە چواردەی هەتاویدا کۆمەڵێك لە ساداتی "سەرگەڵوو" ئایینەکەیان تێك دەچێت و لەو بازنەیەدا بە ئایینی یارسانەوە نزیك دەبنەوە؟ کە هەمان "هەق"ەکانن، کامە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونمان لەبارەیانەوە کرد؟ جگە لە ڕۆژهەڵاتناسەکان نەبێت.

دەبێت ئەو راستییە بزانین کە هیچ رۆژهەڵاتناسێك بەرادەیی کوردێك کورد ناناسێت، بەڵام جیاوازیی ئێمە لەگەڵ رۆژهەڵاتناسەکان چییە؟ جیاوازیمان ئەوەیە کە ئەوان سەرچاوەکە لەبەر دەستیاندایە و هەمووی دەخوێننەوە، بەڵام ئێمە هیچکامی ناخوێنینەوە. مەسەلەکە ئەوەیە کە ئێمە قسە و باس و پرسەکانی پێوەندیدار بە خۆمانمان پێ دەدەن و باریکەڵایان پێ دەڵێین. ئێستا لە زانستگای "هایدنبێرگ"ی ئاڵمان کورسییەکانی عەلەوی، کاکەیی و یارسان شناسی هەیە، لە حاڵێکدا لە هەموو زانستگاکانی کوردستاندا تاقە وانەیەکی یارسان شناسی نییە. ئەوان دێن سەرچاوە و بابەتەکە لە ئێمە وەردەگرن و دەیبەن لەوێ قوتابخانە و کتێبخانەی خۆیانی پێ دەوڵەمەند دەکەن، کاتێکیش دێنە ئێرە رێزیان لێ دەگرین و چەپکە گوڵیشیان پێدەدەین، هەڵبەتە هەقیشیانە، دەبێت رێزیشیان لێ بگرین.

ئاخۆ ئەو پرسیارەتان لە خۆتان کردووە کە یەکەمین جار کێ کتێبی قورئانی پیرۆزی بەو گەورەییەی رازاندەوە و ریزبەندی بۆ کردووە ژمارەی ئایە گوزاری کرد؟ هەمووی ئەو رۆژهەڵاتناسانە بۆمانیان کردووە. ئیتر ئەو قۆناغانە تێپەڕی، دەبێت بە خۆماندا بێینەوە، ئێمە با لانیکەم بۆ ئەم گەنجینە مەزن و سەرچاوە گەورەیەی کە بەناوی "کەلامی سەرەنجام"، "دەفتەر" و" وەلایەتنامە" لەبەر دەستمان دایە و سەرجەم ۵۰۰ کتێبە بیناسین و کاری لەسەر بکەیەن. ۱۸ ملیۆن لە دانیشتووی تورکیا سەر بە کتێبی وەلایەتنامەن، لە حاڵێکدا ئێمە ۵۰۰ کتێبی سەرچاو لەبەر دەستمان دان و لامان لێ نەکردوونەتەوە. لێکدانەوە، راڤە و شیکردنەوەیەکی پوخت و کامڵمان لەسەری نەنووسیوە و هەر کامەمان بە رێیەکدا بۆی دەڕۆین و هەکامەمان را و بۆچوونی لایەنێك قبووڵ دەکەین.

مەسەلیەکی تر کە دەمەوێت باسی بکەم ئەوەیە، کە با بزانین ئایین و رێوڕچەی یارسان لەباری جوگرافیاییەوە هەتا کوێ رۆیشتووە، ئێمە سیلسیلەیەکمان هەیە بەناوی "سیلسیلەی نیعمەتوڵڵاهی" کە سەر بە فکریەتی "شا نیعمەتوڵڵا وەلی"ن، کە یەکێکە لە گەورە سۆفیە گەورەکان سەدەی هەشتەم، کە هاوسەردەمی حافزە. دەڵێن وەك پێدا هەڵگوتن بەوی وتووە: "ما خاك راە را بە نظر كيميا كنيم/ صد درد را بە گوشی چشمی دوا کنیم". حافزیش بەوی وتووە: "انان کە خاك را بە نظر کیما کنند/ ایا بود کە گوشەی چشمی بما کنند"؟ یانی تەنانەت ئەگەر ئێوە دیوانی

حافزیش بگەڕێن، زۆر پرسە فکری و زەینییەکانی حافز یارسانییە، یانی دەتوانین لەگەڵ "سەرەنجام"دا بەراوردی بکەین. کە ئەمن لە کتێبی "مێژووی بزووتنەوەی عەلەوییەکانی زاگرووس"دا ئاماژەم پێکردووە، لە زۆربەی بەیتەکانیدا بۆ نموونە: "رە نبردیم بە مقصوود خود اندر شیراز/ خرم ان روز کە حافظ رە بغداد زند". هەر ئەو زەمانەی کە "سوڵتان ئیسحاق" لە ڕێگای بەغدا دا بووە: "ای صبا گر بگزری بر ساحل رود ارس/ بوسە زن بر خاك ان وادي و مشکین کن نفس". ئەرەس هەر ئەو نیشتمانەیە کە کە حەزرەتی "شا فەزڵی وەلی"یان تێدا سەربڕیوە. هەروەها بەرهەم و نووسراوەی جۆراوجۆری دیکە هەن کە ئەم مەسەلەیە بە ڕاشکاوی تێیاندا دیارە. "شا نیعمەتوڵڵا وەلی" لە "شام و حەڵەب"دوە هەستاوە هاتووە لە "ماهان"ی کرمان مەکتەبی نیعمەتوڵڵاهی دامەزراندووە.

**سەرچاوە:**

ئەم بابەتە بەشێوەی ئاخاوتن لە کۆڕی یەکیەتیی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر لە زستانی ساڵی ١٣٩٠دا پێشکەشکراوە، کە دواتر لەسەر ئیزنی دکتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی لەلایەن ئامادەکارەوە هێنراوەتە سەر کاغەز و لێرەدا گونجێنراوە.

**پێناسە:**

- دکتۆر محەمەد عەلی سوڵتانی، لە ساڵی ١٣٣٦ی هەتاویی شاری کرماشان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەدایك بووە.
- دکتۆر سوڵتانی یەك لەو کەسە پێشەنگ و ڕچەشکێنانەی کوردە کە پاش ساڵانێکی بێدەنگی لە بیاڤی فەرهەنگی و توێژینەوە لەبارەی ئەدەبی کوردی لە کرماشان دەستی داوەتە کار لەم بارەیەوە و جوغرافیای توێژینەوەکانیشی کرماشانە و بەتایبەت لە بوارەکانی ئەدەب، فەرهەنگ، مێژوو، زمان و ئایین گەلێك شاکاری خولقاندووە، کە بریتین لە:

- کۆمەڵەی جوغرافیای مێژوویی و مێژووی پوختەی کرماشان (یەکەم ئەنسکلۆپیدیای ناوچەیی لە ئێران(۲۰) بەرگ، کە هەر بەرگێکی تایبەتە بە بوارێك.

- ئەدەبی کوردی، (حەدیقەی سوڵتانی) کە مێژوو و ژیانی شاعیرانی کوردی کرماشانی لە سەردەمی تەیموورییەکان هەتا ئێستای تێدایە کە سەرجەمیان (۲۰) بەرگە.

- هونەر و ئەدەبیات، بەرهەمە وێنەییەکانی عەبدولحوسێن موحسنی کرماشانی.

- پەیامی ئاشناکان، کۆمەڵەی ئاخاوتنی مامۆستایانی زمانی فارسی لەبارەی پرسەکانی وانەوتنەوەی ئەدەبیاتی فارسی، چاپی یەکەم، ١٣٧٥، تاران.

- دیوانی حافز شیرازی بە خۆشنووسیی، فەریبا مەقسوودی (هاوسەری نووسەر) چاپی دووەم، ١٣٨٣، تاران.

- لێکدانەوە و بەرهەمەکانی میرعیمادەدین قەزوینی، نامیلکەی هونەری (توێژینەوە).

- لێکدانەوە، ژیان و بەرهەمەکانی میرزا محەمەدڕەزا کەلهوڕ، نامیلکەی هونەری (توێژینەوە).

- پێشەکیی دیوانی دیوانی مەلا مەنووچێهر خان کوولیوەند، ئامادەکردنی مەنووچێهر نوور محەمەدی، چاپی یەکەم، ١٣٨١- خوڕەم ئاباد.

- کەلەکی کەلهوڕ، کۆمەڵە ئاخاوتن و چالاکییەکانی یەکەم فێستیڤاڵی ژنانی خۆشنووسی ئێران- کرماشان، چاپی یەکەم، ١٣٧٩، تاران.

- کیمیای هەستی، ساغکردنەوەی ژیاننامەی مامۆستا نجوومی کرماشانی، چاپی یەکەم، ١٣٧٩، تاران.

- پێشەکی و ساغکردنەوەی سیحری موبین، بەشێك لە بەرهەمەکانی مامۆستا نجوومی کرماشانی، چاپی یەکەم، ١٣٧٩، تاران.

- دیوانی پەرتەو کرماشانی (کوچە باغی ها) چاپی دووەم، ١٣٧٧، تاران.

- دیوانی شامی کرماشانی (چەنانی) (کوردی- فارسی) چاپی دووەم، ١٣٨٢، چاپی سێیەم ١٣٨٥، تاران.

- دیوانی میر محەمەد سالّح ماهیدەشتی (حەیرانعەلی شا) چاپی یەکەم، ١٣٨٨، تاران.
- دیوانی تەهماسبقولی خان (وەحدەت)، فارسی چاپی یەکەم، ١٣٧٧، تاران.
- یوانی سەید یاقووب ماهیدەشتی (کوردی - فارسی)، سەها تاران ١٣٧٧.
- دیوانی ئوستاد کەیوان سەمیعی (رازی دلّ)، فارسی، چاپی یەکەم، ١٣٨٣، زەوار، تاران.
- یادنامەی میرزا ئەحمەد دێهباشی کرماشانی، چاپی یەکەم، ١٣٦٠، کرماشان.
- دیوانی ئەحمەد بەگ کۆماسی (کوردی)، چاپی یەکەم، ١٣٨٥، تاران.
- رۆڵی کوردەکان لە فەرهەنگ و شارستانییەتی ئێران، (توێژینەوە) چاپی یەکەم، ١٣٨٥، تاران.
- بارودۆخی مێژوویی، کۆمەڵایەتی و سیاسیی بنەماڵەی بارزان (توێژینەوە)، چاپی یەکەم، ١٣٨٣، تاران.

**لە بواری دیین و عیرفانەوە:**

- بزووتنەوە و سەرهەڵدانی عەلوییەکانی زاگرۆس، ٢ بەرگ (فارسی و کوردی).
- بنەوانی ئاییینی یارسان.
- گوتاری لێکۆڵینەوەیی لە ئاییینی ئەهلی حەقدا (پێداچوونەوە، بەراورد، وەرگێڕان لە ئینگلیزییەوە بە هاوکاریی مریەم رەزازیان.
- رەخنە و تێڕوانینێك بۆ کتێبی "توێژینەوەیەکی ورد لە ئەهەلی هەق، مێژووی فیقه، بیروباوەڕی ئەهەلی هەق.
- دەیان کتێب و نامیلکە و توێژینەوەی دیکە لە بواری جۆراوجۆردا.

# ڕەنگدانەوەی ئیسلام لە ئەدەب و فۆلکلۆری کوردیدا

محەمەد ئەحمەدیان- مەهاباد

ڕۆڵە مــن ئــەمرم، لەپێشا هۆشــی ئیمانــت ببــێ

بــیری هــۆز و نیشـــتمان و ژیــنی کوردانــت ببــێ

(قانع)

تەواوی گەلانی سەر ئەم عەرزە، بە ژمارە زۆر بن یان کەم، رەش بن یان سپی، لە دەشتا بژین یان لە کەژ و کێو، هەموو خاوەنی بیروباوەڕ و ئایین و ئەدەب و کولتووری خۆیانن. مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە نەتەوەی کورد سەرەتا رۆژ و مانگ و زەوی و ئەستێرە و ئاسمان و تەنانەت (با)یان ستایشکردووە و باوەڕیان بە خێوی ئاوی کانی و ئاو بووە. دوایی هاتوونەتە سەر ئایینی زەردەشت، دوای ماوەیەك ئەو ئایینە تێکەڵاوی گەندەڵی بووە و رێی خۆش کردووە دین و دەوڵەت بۆ کڕووزاندنەوەی رەش و رووتان لایەنگر و پشتیوانی یەك بن. شانامە دەڵێت: ئەردەشێر دامەزرێنەری دەسەڵاتی ساسانی کوڕەکەی بەم چەشنە ئامۆژگاری دەکرد:

| | |
|---|---|
| چنان دین و دولت به یکدیگرند | تو گویی که در زیر یك چادرند |
| نه بی تخت شاهی دین بود به پای | نه بی دین بود شهریاری به جای |

ئەو چەشنە بۆچوونانە بوونە هۆی ئەوەی سەرهەڵدانەکانی دژی زەردەشت، یانی "مانی و مەزدەك" لەلایەن جەماوەری خەڵکەوە بە گەمی پێشوازییان لێکرا (کۆمەڵناسیی دینەکان، ل: ٤٦٨). دەسەڵاتی بێ نێوەرۆکی ساسانی دەگاتە ئەو جێیەی کە لەگەڵ یەکەم پاڵپەستۆی ئیسلام تێکدەتەپێ، سەرەنجام ئیسلام دەبێتە ئایینی زۆربەی زۆری کوردان.

نەتەوەی کوردیش وەك هەر نەتەوەیەك لەسەر ئەم عەرزە لە موسڵمان و گاور و جوولەکە و بوودایی ئەو مافەی بۆ خۆی بە رەوا زانیوە و لەو دەزگا گەورە و گرانە کە ناوی زەوین و ئاسمانە وردبووەتەوە تێی روانیوە و زانیویە کە ئەم کردارە رەنگین و سەنگینە بەبێ وەستا نەکەوتووەتە گەڕ و دانەر و رانەرێکی هەر دەبێ هەبێت.

(پێشەکی خەیام، ل: ١١)

بەو پێیە بیروبڕوای ئیسلامەتی کردووەتەوە رێوشوێنی خۆی، لەو کاتەوە موسڵمانە و خاوەنی بڕوا بە قورعانە، دەستچیلەی پەرەپێدانی ئەو شارستانییەتەی بەدەستەوە بووە، هەر لەو رۆژەوە کە جابان (جاوان) گاوانێکی کورد چمچمەکەی هەڵکێشا و فەرەنجییەکەی لەبەر کرد و قەفی گۆچانەکەی بە قۆڵیدا کرد و لە کوردستانەوە بەرەو مەدینە وەرێکەوت و باوەڕی بەو ئایینە هێنا، لەو رۆژەوە مەرج و پەیمانی خزمەتگوزاریی نەتەوەی کورد بە ئایینی ئیسلام دامەزرا. (خەزێنە، ل: ٢٤٠)

دوای ئەوە شیر و تیر و پێنووس و لێنووسی کوردەکان کەوتە سەر هێڵی خزمەت بەو ئایینە ئاسمانییە، بەرنامە و پرۆگرامی ئەو ئایینە تێکەڵاوی زمان و ئەدەبی کوردی بوو، شوێنی لەسەر شیعر و پەخشان و پەندی پێشینیان، تەنانەت گۆرانی و دابونەریت و رێورەسم و بیروباوەڕ و مۆسیقا و جێژن و شینگێڕیی ئەو گەلە دانا.

لەو ماوەیەدا هەزاران پسپۆڕ و زانا و بلیمەت و کەسایەتیی خاوەن زمان و قەڵەم و دانەر و کتێب نووسی کورد بە تیشکی زانستی خۆیان خزمەتی ئەو ئایینەیان کردووە. دەور و بایەخی ئایین لە ژیانی رۆژانەی کورداندا لە هەموو بەشێکی کوردستان بەرچاوە، رێورەسمی ئایینیی بەشێکی زۆری ژیانی رۆژانەی خەڵکەکەی گرتۆتەوە، ئایین بووەتە بەشێکی زۆر لە ژیار و شێوەی ژیان و وشیاریی کۆمەڵایەتی، بووەتە پێوانەی دابونەریت و کولتوور و باوەڕی نەتەوەی کورد. فەرهەنگی نەتەوایەتی و دابونەریتی کۆمەڵایەتی لەگەڵ یاسا و داب و بڕیارەکانی ئسلام وا تێکەڵ بوون، کە ناسینەوەیان دژوارە.

هەر دێیەکی کوردستان تەنانەت ئەو دێیانەش کە چەند ماڵێکن، بە شان و شەپیلکی کاسبکار و زەحمەتکێش و دەست و پێ قەڵشیوەکان مزگەوتیان سازکردووە و لەسەر ویست و خواستی خۆیان تێیدا خەریکی خواپەرستین، واتە گوندێك نییە بێ مزگەوت بێت. لەسەر هەر کانیاوێك تاتە بەردێك بە وێنەی بەرماڵی سروشتی سروشتی دابینکراوە، تا رێورەسمی ئایینی بە ئاسانی بەڕێوەبەرن. هەروا لەنێو هەر ماڵێکدا تاقە و رەفحەی تایبەت بۆ کتێبی پیرۆز، واتە قورعان، ئامادەکراوە و لە بەرزترین شوێنی ماڵەکان نیگادێریان لێکردووە. رەنگدانەوەی ئایین لە کولتووری کورددا وەك شین و شایی و جێژن و پرسە و ژنهێنان و جلوبەرگ و تەنانەت خانوو و خوو و رەوشتەکان بەرچاوە، پێوەندیی کورد و ئایین لێك بەستراوە و پێك بەستراوە.

جا هەر ئەوە بووەتە هۆی ئەوەی کە زمان و پێنووس و لێنووسی نووسەر و هەستیاران و سینگی بەرفراوان و پڕ لە دوڕ و گەوهەری خۆشخانان بۆ نیشاندانی نەخش و وێنە جوانەکانی ئەو دینە کەوتنە رێ و بەپێی ویست و پێداویستیی مەڵبەند زۆربەی هۆنراوەکانیان کردە قاڵب و قوتووی مەبەستە ئایینییەکان و جوانکاریی ((تەلمیح و تەسنیف و تەمسیل و ئیقتباس و حەلل و تەحلیل)) یان خستیانە نێو دڵی هۆنراوەکانیان، ئەوە بووەتە بیانوویەك بۆ نیشاندانی وێنە جوانەکانی دەقی پیرۆزی

کەلامولڵلا و فەرمودەکانی رەسولڵلا و لە دووتوێی هەڵبەست و پەخشان و بەیت و باو و گۆرانی و پەندی پێشینیاندا رەنگی داوەتەوە.

**بەیت:**

بەیتەکان شێوەیەکی فۆلکلۆریی ئەدەبیاتی کوردین. ئاوێنەی بێگەرد و رووی راستەقینەی کورد لە خۆشی و ناخۆشی و ملاملانێی باری کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووری و بیروبۆچوونەکانی ئەو نەتەوەیە نیشان دەدەن. ئەو بەیتانە لەباری دارشتنی قاڵب و قاپوور و شێوەی هۆندنەوەوە یەکجار رەسەن و جێگای رێزن، بەڵام لەبەرئەوەی کە کاتی دارشتنی ئەو بەیتانە کورد لە خوێندەواریدا هێز و پێزێکی وای نەبووە، ئەو بەیتانە شاعیرانی نەناسراو و شایەر و نەخوێنەوارەکان دایاننناون و هۆنیویانننەتەوە و لە قاڵبی کورت و درێژی میسراعدا گونجاندوویانن و بە خشڵی خۆماڵی رازاندوویانننەوە. رەنگە لەلایەن رەخنەگرانەوە هێندێك جێی رەخنە بن کە ئەوە بابەتی وتاری ئێمە نییە.

لەو بەیتانەدا بابەت و نێوەرۆکەکان تەواو کوردین، لە شێوەی ژیانی کورد و ژیانی خێلایەتی و ئاژەڵداری، تا دەگاتە پەیدابوونی میر و بنەماڵە ناودارەکانی کورد، دەدوێن. جیا لە بابەتی دڵداری و حیماسی و تراژیدی و ئەخلاقی، بەشێکی زۆری ئەو بەیتانە بەشێوەیەکی بەرفراوان بابەتی ئایینی دەگرنە باوەش. بەیتەکانی ((زەنبیل فرۆش، محەمەد حەنیفە، عەبدولرحمان، جولڵندی، قەڵای خەیبەر و شێخی سەنعان))، هەرکام خەزێنەیەکن بۆ شێوە روانینی بیروباوەری کورد لە ئاست ئایین و رووداوە ئایینییەکان.

نەك تەنیا لەو بەیتانەدا ئایین رەنگدانەوەی هەیە، بەڵکو لە بەیتە ئوستوورەییەکانی وەك ((شێخ مەند و شێخ رەش، مەمی ئالان و مەم و زین)) و هەروەها لە بەیتە رەزمی و حیماسییەکانی وەك ((لەشکری و دەروێش عەبدی))، هەروەها بەیتە بەزمییەکانی وەك "شەم و شەمزین" ئایین شوێنی دیارە.

تەواوی ئەو بەیتە کوردییانە لێورێژن لە باس و ناوی ((پیر و پێغەمبەران و فریشتە و پەری و پیاوانی ئایینی و دەروێشەکانی وەك فەیلەقووس و خدری زیندە و حەزرەتی ئادەم و دایە حەوا و سولیمان پێغەمبەر و بلقیسا و عومری نوح و سەبری ئەیوب و یووسف و یاقووب و سەدان ناوی خودا وەك: حەننان و مەننان و حەییوم و

قەییوم و ڕەحیم و ڕەحمان و سەمیع و بەسیر و بینای چاوان و بینای بانی سەر و هەوری ڕەحمەت و قیبلەی موبارەك و كفلە یەكوون و كەلامی خودا و دەورە دوعا و مەلا بانگدان و نوێژی شێوان))، ئەوانە هەموو دەربڕی شێوازی ئایینیی نێوەڕۆكی بەیتەكانن.

بۆ وێنە لە دەقی بەیتی "سەیدەوان"دا ئاوامان گوێ لێ دەبێت: "ڕەبی خودایە ئەتۆ هەوری ڕەحمەتی بێنی لەلای قیبلەی موبارەك، لە داوێنی فەڕەنگییان، لەسەر قەبری پیر خدری هەڵبڕێژی، كێ دیویەتی لەسەر سێ كوڕان ڕا بووك بچنەوە ماڵی بابیان بە كیژی؟".

لێرەدا چەند وێنە لە دەقی ئەو بەیتانە كە جوانكاریی كێش و سەجع سەروا و دەستەواژەی خۆماڵییان تێدا گونجاوە و چێژ و تامی ئاینییان تێدا بەرچاوە و ئایدیۆمی تایبەت بە زمانی كوردییان تێدا بەكارهێنراوە، دێنینە بەرچاو:

لە بەیتی "میرسێوەدین"دا ئاوا دەبیسین:

"خالق تۆ بێ نەزیری/ ڕەبی تۆ بێ نەزیری/ ڕەبی هەر ئەتۆ هەوی/ كەس لێی وەسەر ناكەوی/ كەس پێی نەبردووە زەفەر/ پاشا، تا میر و بەگلەر/ دنیات وەها ڕۆناوە/ كێوت كردوونە لەنگەر/ گوڵ مێخە داكوتراوە/ نابزوێ ئەوبەرەوبەر". - (گەنجینە، ل: ٤٩٠)

"خالق تۆ بێ نەزیری: ئاماژەیە بە ئایەی ٤٢ لە سووڕەی شوورا: "لیس كمثل شی"، واتە هیچ شتێ وێنەی ئەو نییە.

تۆ بڵیندان دەكەی نەوی: ئاماژەیە بە ئایەی ٢٦ی سوورەی ئالی عیمران: "وە توعز و من تشا بیك الخیر عی كل شی قدیر"، (هەر كەسێكی وە قەدەری خەی و هەر كەسێ زەبوونی كەی خۆت دەیزانی، چاكە هەر بە دەست خۆتە و تۆ لەسەر هەموو شت توانای).

مردن هەورازی قەوی/ كەس لێی وەسەر ناكەوی/ ئاماژەیە بە ئایەی ٨ی سووڕی جومعە: "قول ان الموت الزی تفرون من فانە ملاقیكم" (بێژە ئەو مەرگەی كە ئێوە لێی رادەكەن هەر دەتانگاتێ).

گوڵمێخە داکوتراوە/ نابزێ ئەوبەرەوبەر/ ئاماژەیە بە ئایەی ٧ی سووڕی نەبە کە دەڵێت: (ئایا زەویمان وەك لانکە بۆ فەراهەم نەکردن، ئایا کێوەکانمان وەك گوڵمێخ بۆ دانەکوتاون؟)

لە بەیتی "لاس و خەزاڵ"دا دەبیسین: (گەنجینە، ل: ١٠٣-١٠٢).

"خالق هەر ئەتۆی لەسەر/ سەحەب جەوهەر، بێ جەوهەر/ دنیات دانا سەرانسەر/ کێوت لێ کردنە لەنگەر" ئاماژەیە بە ئایەی ٣١ی سووڕی ئەنبیا: وە جعلنا فی لارز رواسی ان تمید بهم جعلنا فیها فجاجا سبلا لعلهم یهتدون. (لەسەر زەویش کەژوکۆمان وەدیهێنا، نەوەکو وەیان لەرزێنێ، چەن ڕێبازمان لێ پێکەێنا بەڵکو ئەوان شارەزا بن.)

لە بەیتی "میهر و وفا"دا ئاوا دەبیسین:

"خودایەکی ئەزەلی و ئەدەبییە/ نە لە ڕەنگی کەسە و کەس لە ڕەنگی نییە".

ئاماژەیە بە ئایەی "لیس کمیسل شی"، هەر لەو بەیتەدا دەبیسین:

" کەونەکێ کەونە دنیایە، سەرەخۆرەی بێ بەقایە/ عاقیبەت دەچنە فەنایە/ هەر بۆ تۆ حەمد و سەنایە/ هەر ئەتۆی حەننان و مەننان/ حەییوم و قەییومم، ڕەحیم و ڕەحمان/ وێسپ نەجاتی بوو لە زیندان/ یاقووب شاد بوو لە کەنعان/ عەشمەتت دا بە سولەیمان".

حەییوم و قەیووم/ ڕەحیم و ڕەحمان/ ئاماژەیە بە ئایەی ٢٥٥ لە سورەی بەقەرە کە دەڵێت:" الله لا الا هو حی القیوم" (جگە لە خودا هیچ شتێك بۆ پەرستن نابێت، هەر ئەو هەمیشە زیندووە و بەسەر هەموو شتدا رادەگا).

لە کۆتایی بەیتی "شێخ سەنعان"دا دەبیسین:

"یاڕەب هەر ئەتۆی ڕۆحبەر و ڕۆحدەر/ زۆر پەشیمانم خودای بانی سەر/ بێبەشم نەکەی لە ناوی کەوسەر/ ڕوحمت زۆرترە لە دای و باوان/ هەر تۆ دەمێنی بینایی چاوان/ پەنام هەر ئەتۆی ئەی حەی دانا/ بە کفلە کونێك تۆ دنیات دان".

ئاماژەیە بە ئایەی ٨٢ی سورەی یاسین کە دەفەرموێت: "ان اراد شی ان یقول لە کن فیکون".

لە بەیتی "شێخ فەرخ و خاتوو ئەستێ"دا دەبیسین: (گەنجینە، ل: ٦٢٧)

"خالق هەر ئەتۆی سوبحان/ ڕەبی هەر ئەتۆی سوبحان

خالق هەر ئەتۆی غەفوور/ دنیات دانا جوور بە جوور
بە ئەرکان و بە دەستوور/ هەر ئەتۆش دەیکەی خاپوور

خالق هەر ئەتۆی سوبحان ئاماژەیە بە ئایەی ٨٢ی سوورەی زوخروف، کە دەڵێت: "سبحان رب السماوات والارز رب العرش عمایصفون"، واتە پەروەرینی ئاسمانان و زەمین و عەرش هیچ کەمایەسییەکی نییە.

لە بەیتی عەبدولڕەحمان پاشادا دەبیسین: (توحفە، ل: ٥٣٣)

"ڕەبی هەر ئەتۆی قادر/ تۆی عەرز و ئاسمان و ئاگر/ سوجدەی شوکریم لەسەر بوو/ نەتخولقاندووم بە کافر/ تۆی ئەوەڵ و تۆی ئاخر/ تۆی باتین و تۆی زاهیر/ چەند باران و چەند بەفر/ چەند رووبار و چەند بەحر/ چەند ئاسمان و چەند هەور/ چەند بەهەشت و چەند ئاور/ چەند قۆشەن و چەند لەشکر/ چی تۆ پێت ببێ ئەمر/ ئەشبێتن دەیکەی حازر".

تۆی ئەوەڵ و تۆی ئاخر/ تۆی باتین و تۆی زاهیر/ ئاماژەیە بە ئایەی ٣ی سوورەی حەدەیدە کە دەڵێت: "هو الاول و الاخر و الزاهر و والباتن و هو کل شی علیم". واتە، پێشوو ئەوە و دوای ئەوە و لەبەرچاوە و نادیارە، لە هەموو شت ئاگادارە.

لە بەیتی ئازیزەدا ئاوامان گوێ لێ دەبێت:

"ئازیزێ خۆ من دڵم دێشێ، سەرم هەڵنایە لەبەر بارستی دە غەمان/ ئەوەڵ بانگم وەبەر بینایی چاوان، ئەوی دیم وەبەر حەزرەتی رەسوڵەڵلایە/ ئازیزێ بانگی دیم وەبەر حەزرەتی مووسای/ هەزار و یەك کەلیمەی/ عەرزی بینای چاوان دەکرد/ لەسەر کێوی توورێ، کەلیمەی "لا الە الااللە"یە/ ئازیزێ بانگی دیم وەبەر عیسای رۆحوڵلایە/ وەبەر حەزرەتی داوودی/ ئەگەر سەحەبی زەبوور و ئینجیلێن هەر لەسەر ئەوێ کاولە دنیایە/ ئازیزێ بانگی دیم وەبەر حەزرەتی سولەیمانی حوکمی دەکرد لە تەیرێ لە توورێ لە باڵداری/ دەبا شەبەقی هەر بدات لە خات بلقیسایە".

لە سەرەتای بەیتی "دمدم"دا تەلمیحێکی جوان لەسەر ئایەی "کل نفس زائقەالموت" هەیە کە بەم چەشنەیە:

دنیایێ، کەونە دنیایێ، بێ مروەت و بێ وەفایێ، چەن جوانان دەستیان پێدەگرتی، چەن جوامێران دەستیان لێ بەردایە، دنیا نەدەما بە حەزرەتی ئادەم و بە دایکە وایێ،

دنیا نەدەما بە حەزرەتی نووح ئەگەر لە کەشتییەدا دەیخوێند دەرسی دە زەبووری، لەگەڵ کەلیمە " لا الە الاالله"یێ/ دنیا نەدەما بە ئیبراهیم خەلیلوڵلاییێ/ دنیا نەدەما بە حەزرەتی ئەسکەندەری ئەگەر دەیگرت هەر چوار قوڕنەی دنیایە/ دنیا نەدەما بە حەزرەتی یوسف، نە بە زولەیخاییێ/ دنیا نەدەما بە حەزرەتی سولەیمان نە بە بلقیسایە/ سەرم دێشێ، دڵم راناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ، لەبەر ئەوێ ژانێ، بانگێکم وەبەر خولای، ئەوی دیکەم پێغەمبەری ئاخر زەمانێ".

رەنگدانەوەی ئایین لە گۆرانیی کوردیدا:

گۆرانی و مۆسیقای کوردی دڵگر و سەرنجڕاکێشە، هەست بزوێن و شادیهێنەر و غەمڕەوێنە، لەگەڵ ئەوەی کە رەنگی ئایینی پێوە دیارە، بەڵام ئەگەر بڕوانینە چەند بەند لەو گۆرانییانە ئەو راستییە، بە باشی ئاشکرا دەبێت، لەنێو گۆرانییە فۆلکلۆرییەکاندا کەم کەس هەیە گوێی لێ نەبووبێت، کە دەڵێت:

"ئەو قورعانەی بتگرێ هێنات لێکت کردەوە/ حەوت جار دەستت پێدا دا/ بۆ مزگەوتت بردەوە/ ئەمنت سەرگەردان کردووە بە هەناسەی سەردەوە" (ناڵەشکێنە، ل: ١١٨)

قەسەم بە سووری وەلفەجری، فەسڵی دەمبەن بۆ گوێی قەبری/ تۆزێ لەمن بگرن سەبری/ بزانم لێوئاڵ چۆن بۆ من دەگری" (ناڵەشکێنە، ل: ٧٠). "بەو خودایەی بێ مەکانە/ ئەو دڵەم بەحری خەمانە/ بۆ دەست دەکرم بازنە/ بۆ ملی دێنم زەنگیانە" (کانی مرادان، ل: ١٠٦).

"سوێند بە وەڵلا و بیللایە/ زوڵفی هەودا هەودایە/ بەوەی بادی هەوایە" (ناڵەشکێنە، ل: ٩٢).

"بە قورعانی سەر پەڕ شین/ لێت بڕیون هێز و تین/ پێنج فەرزە نوێژم دوعایە/ ئەمن و تۆ بۆ یەك نابین" (ناڵەشکێنە، ل: ٦٤). "هانایەت وەبەر دێنم/ هانا وەبەر سوبحانی/ خالق تۆم تاق و تەنیا/ تۆم بێ جێگا و مەکانی/ مەقسوودان حاسڵ دەکەی/ خەمڕەوێنی دەردانی" (کانی مرادان، ل: ١٤٩).

هێندێك جار ئەو گۆرانییانە شریتی عومری رابردووی پڕ لە خەم و خەفەت دێننەوە بیر، زۆربەی هەرە زۆری ئاوازە رەسەنەکانی کوردی، وەك: لاوك، هۆرە و سیاچەمانە لە

خەم و پەژارە و لالانەوە و دەربڕینی ئاخ و ئۆف و ئای و ئۆی ئازار و ئێشە دەروونییەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە.

چەند بڕگەیەك لە دەقی حەیرانێك بۆ نموونە دێنینەوە:

"ئەمن دەڵێم براینە برادەرینە، ئەورۆکانە نەخۆشم/ زەحمەت بژیم بە وێ ژینێ/ چ بکەم بۆ برایەکی لە دای و بابان/ بنێرمەوە کن مەلا گچکەلانەکەی کۆیە/ بزانێ بەلای مردنێم دا یان بەلای ژینێ/ ئەمن دەڵێم براینە برادەرینە ئەگەر بەلای مردنێم دا بێ/ دە بلا بنێرمەوە لە دوای شەدە شلان، شل و ملان چاو بە کلان/ دەستە بە دەستە لەبۆم بگێڕن گەرمەشینێ/ فەقێیان مەلایانم بێننە سەرینێ/ بە دەنگی بەرز لەبۆ منی مالۆیران بخوێنن یاسینێ". (گەنجی سەر بەمۆر، ل: ٢٢١).

لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەی باسمان کردن، مۆر و شەقڵ و بیچمی ئایینی لە نێوەرۆکی ئەو گۆرانییانەدا بەرچاوە، سوێندخواردن و تۆك و نزا و هاوار و پاڕانەوە بۆ گەیشتن بە دلدارێکی جوان و قەشمەرە بابەتی زۆربەی ئاوازە رەسەنەکانی کوردی پێکدێنن.

ئەمەش چەند وێنەی دی:

"ئەوشۆ شەوی بەدر/ هەڵدێ لەیل و قەدرە/ لەخۆم دەگرم نەزرە". (ناڵەشکێنە، ل: ٦).

"سی رۆژەی رەمەزانێ/ فەڕزە لەسەر ئۆممەتێ/ سینگت قاقەزی مەرجان/ مەلا لێی دەدەن خەتێ/ لە دنیای روون بۆم نەبووی/ چت لێ بکەم لە قیامەتێ". (کانی مرادان، ل: ٨٥).

"خودایە گیان خودایە، هەڵتکردووە چرایە/ نەمخەیتە تاریکایە" (کانی مرادان، ل: ٣٠).

ئەوەش لایە لایە:

"هەی لایە لایە بۆ خەوت نایە/ دەردت لە بابم/ قەزات لە دایە"، هەی لایە لایە/ لائیلاهە ئیلەڵلایە/ بە دوور بی لە دەردێ بەڵلایە" (کانی مرادان، ل: ٣٠).

**پەندی پێشینیان:**

پەندی پێشینیان وتەیەکی کورتە و مانایەکی بەربڵاوی هەیە، ئەو وتە کورت و مانا قووڵانە بە بەشێك لە ئەدەبی کوردی دەژمێردرێن، ئەو وتانە زۆربەیان شەقڵی دەوری موسڵمانبوونیان پێوەیە، ئاوێنەی بڕوای ئیسلامەتین، روانگەی باوەڕ بە خودایەکی تاق و تەنیا کە ژیان و مردن و زیندووبوونەوە بەدەستی ئەوە، کورد دەڵێت:

"خودا بە زەبر و بە سەبرە/ خودا سەبری بچووکی چل ساڵە/ خودا لە سوڵتان مەحمود گەورەترە/ خودا کلاوی بۆ بەڕوو کردووە/ خودا حەقی بزنی کۆڵ لە شاخدار دەستێنێ/ زۆر کوتن قورعان خۆشە/ بانگی محەمەد بە ئاشکرا خۆشە" و دەیان پەندی دیکە. هێندێك لەو پەندانە دوای شیکردنەوە ماناکانیان ئاشکرا دەبێت. دەڵێن:

"دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە، مانای ئەو پەندە بە تەواوی ئاماژەیە بە ئایەتێکی قورعانی پیرۆز کە دەفەرموێت "وان لیس للانسان الا ماسعی" واتە، ئادەمیزاد بە هەوڵ نەبێت بەرهەمی چنگ ناکەوێت. یان دەڵێت "کە وتی تیژ، تیژ" دەڵێن کابرایەکی شارەزووری لەوی تر دەپرسێت، برا خودا چۆن ئەم دڕك و داڵانەی تیژ کردووە؟ ئەویش دەڵێت برا " کە وتی تیژ، تیژ" تەواو ئاماژەیە بەو ئایەتە کە دەفەرموێت "انما امره ازا راده شیئا ان یقول له کن فیکون" (سووری یاسین، ئایەی: ٨٢).

لە رشتەی مرواریدا گەلێك باسی هێندێ حیکایەتی ئەوتۆ دەبیسین، هەرچەند لە قاڵبی گاڵتە و پێکەنیندا دەگێڕدرێنەوە، لەودیو پەردەی پێکەنینەوە باوەڕکردنی قووڵ و راستەقینەیە بە خودایەکی تاق و تەنیا. لە رشتەی مرواریدا هاتووە:

"لە کابرایەکی کوردیان پرسی، بە چیدا ئەزانی خودا یەکە و دوو نییە؟ ئەویش وتی: "بە ئاشەکەی لالەمە" تا ئەو وەختەی کە هەر خۆی بوو، دایمە گەڕ بوو، ئێستا کە لەگەڵ "حەمەی شەفیێ" بوون بە شەریك رۆژێك ئەگەڕی و چوار رۆژ ئەوەستێ، خواش ئەگەر یەکێکی لەگەڵ بوایە ئیشەکەی وەکو ئاشەکەی لالەمەی لێ دەهات" (رشتەی مرواری، ب ١، ل: ١١ و ١٢).

**ڕەنگدانەوەی ئایینی ئیسلام لە شیعری کوردیدا:**

ئەگەر بە نیازی هەڵبەستی پڕ لە شانازی لە خۆمانی نەگۆڕین، کۆنترین بەڵگەی نووسراومان هەر ئەو شیعرە کوردییانەن کە مەلای وەك خانی و بێسارانی و جەزیری لە سووچی حوجرە و لە کاتی حەسانەوە و بێکاریدا و دایانناون و بە ڕێنووسی عەرەبی و فارسی نووسیویاننەوە. ئەو مەلایانە پێشەنگ و ڕچەشکێنی زمان و ئەدەب بوون، بناغە دانەری ئەدەبی نووسراومان مەلا بوون، گەورەترین شاعیرانمان یان مەلا بوون، یان پەروەردەی قوتابخانە زانسی و دینییەکان بوون، وەك: نالی، سالم، مەولەوی، حاجی قادر، وەفایی، حەریق و مەحوی. (گۆڤاری مەهاباد، ژ: ۱۰۱ عەزیز ئالی).

هەرچەند بابەتی "ئەدەبی ئایینی" بابەتی یەکەمی بەرهەمەکانیان نەبووە، زۆربەی هەرە زۆری بابەتی شیعرییان باسی دلداری، جوانیی سروشت، ژیانی کۆمەڵایەتی و خەم و مەراق بووە. لە هەمان کاتدا ئەم هەستیارە کوردانە تێکڕا بەشێك لە هۆنراوەکانیان بۆ پاڕانەوە و لالانەوە و پەسنی خودا بە مەبەستی دەربڕینی هەستی ئایینی و خوداناسی تەرخان کردووە.

دکتۆر مارف خەزنەدار دەڵێت: "ئەدەبی کوردی لە سەردەکانی ناوەڕاستەوە سەریهەڵداوە و بە ئەدەبی ئایینی، مەزهەبی و گیانی سۆفیزم دەستی پێکردووە. مەلای جەزیری (سەدەی پازدەی زایینی) هێندێ لە باوەڕەکانی سۆفیزمی، ئەوەی جەلالەدینی ڕۆمی بڵاوی کردبووەوە، وەرگرت و روخساری غەزەلدا بەشێوە زاری کرمانجیی سەروو بڵاوی کردەوە". (مێژووی ئەدەبی کوردی، ل: ۹۳).

مامۆستا هەژار دەڵێت: "چەندین چەرخە لە چوارقوڕنەی کوردستان شەوانی هەینی لە مزگەوت و لە کۆبوونەوەی دەروێشان، لە تەکیەکان، لە بەزمی مەولوودنامە شیعری مەلای جەزیری گوڵی سەرسەلەی جڤاتە، ئەو مەلایەی خەڵکی جەزیر و بۆتانە، ئەو شارەی کەوتووەتە بن چیای "جوودی"، جوودی ئەو شارەیە کە گەمییەکەی نووح پێغەمبەری لێ گیرسایەوە و ناوەکەی لە قورئاندایە، مەلا دەڵێت: "میننەت ژ خودایێ کو بعەبدی خۆ مەلایێ/ ئیکسیری غەمی عیشق لە دینار و دروەمدا".

مەلا دەڵێت:

"تعالی الله زهی حوسنا موبارەك/ تەبارە، سەد تەبارەك، سەد تەبارەك"، واتە: "جوانییەکەی خودای گەورە بە تۆی داوە، دەس ڕەنگینی هەر بۆ خوایە، هەی ماشەڵڵا، سەد ماشەڵڵا، سەد ماشەڵڵا". "تە جەرگی من ژ دل کر پارە پارە/ فجارك یا بدیع الحسن جارك"، واتە: "لەنێو دڵتدا دەتەویست جەرگم پارە پارە کەی، چۆن تۆ دەبێ گوێ بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر نەدەی کە فەرموویەتی: هاوسایەکەت، دیسان هاوسایەکەت".

هەروەها مەلا مستەفا بێسارانی دەڵێت: ئێمە پەپوولەی باڵ هەڵپڕووزاوی تاسەی ئەوین و خۆشەویستیی پێغەمبەرانین:

ئێمەیچ پەروانەی شەم شناسانیم/ پەڕ و باڵ سوفتەی دین خاسانیم

میللەت پاك دین، پێغەمبەرانیم/ نەك جە تایفەی کەم نەزەرانیم

بنەمانە جەمین، نوور پاکتەن/ ئەر تۆ پاکەنی، جە کێ باکتەن؟ (تاریخ مشاهیر کرد، ج ١، ل: ١٧٤).

خانی: بیروڕای ئایینی و نەتەوایەتی خانی لە تویێی داستانی مەم و زیندا دەردەکەوێت، دەبێت لە هەمبەر نیزامی گەنجەویدا رایگرین، شیعرە غەرامییەکانی لە هێندێ جیدا شان لە شانی غەزەلیاتی "مەولانا جەلالەدین ڕۆمی" دەدەن.

سەرنامەی نامە، نامی ئەڵڵا/ بێ نامی تە، ناتەمامە وەڵڵا

بێ نەقشی تە، نەقشی خامە خامە/ بێ نامی تە، ناتەمامە نامە

ئەمە وەبیرهێنەرەوەی شا بەیتەکەی نیزامییە کە دەڵێت:

"ای نام تو بهترین سر اغاز/ بی نام تو نامه کی کنم باز"

مامۆستا هەژار لە وەرگێڕانەکەی "مەم و زین"دا سەد هێندەی دەڕازێنێتەوە و دەڵێت:

سەر نامە بە ناوی تۆیە خودایە/ چی بێ ئەمە پیت و پێزی نایە

گیان بەخشی و ژین دەری گیانی/ ئاواتی دڵ و لەبەر دڵانی

تۆ تیشکی لە کوڵمی دڵبەران دا/ تینی لە دەروونی دڵتەڕان دا

ئەو لاشە گڵێنە و قوڕینە/ هۆی تۆیە کە جێی گیان و ژینە

ئەی خودایە بە دڵ نەزانە خانی/ خۆت فێری سپاسی کەی زمانی

دەنگی زەنگی وشەکانی گوێ دەزرنگێنێتەوە و بە تەرازووی قافیە هەڵبەستەکانی دەڕازێنێتەوە و "لافۆنتین"ی شاعیرمان وەبیر دێنێتەوە، ناسك خەیاڵی و ڕەوانی و سواریی شیعرەکانی تامی شیعرەکانی حافز دەدەن و لەباری وردەکاری و جیناس و ئیستیعارەوە لە شیعرەکانی سائیبی تەوریزی دەچن و لە دروستکردنی ئیستیعارە و پەیداکردنی مانای ورددا "ئەبوتەمام" وەبیر دێننەوە و دەڵێت:

نەفەس بگرە لە هاتوچۆیی خوڕایی هەتا ماوی

کە ئەم بایە هەتا ئێستاکە هەر عومری بە با داوی

شتێکە بێ شەبیهـ و جینس و فەسڵ و کەشف و تەقریرە

موبەڕایە لە تەقریر و حەدیس حادیس و ڕاوی

مەولەوی هەموو ئامانجێکی دەربڕینی مانا بووە و هەموو هەوڵێکی خستووەتە سەر مانا، تۆ بڵێی گەڕاییتەوە بۆ سەدەی هەژدە و بۆ لای "ڤۆڵتێر" شاعیری بەرزی پاریس، یان ئەو هاتووە بۆ تاوەگۆز، بۆ لای مەولەوی و بە زاراوەی عاریفان و وشەو مەبەستەکانی دەربڕێ، حافز شوێنی لەسەر مەولەویی کورد داناوە، چونکە لە دیوانەکەیدا دەڵێت:

عارف چ خاس پەی وە حەق بەردەن/ وەسیەت حافز وە جا ئاوەردەن

دەفنت نە پەهلووی مەیخانە کەردەن/ وەسەر خاکتا سەبووی مەی مەردەن

مەولەوی گرفتاری وێنەی سروشت و گێژەی جوانییە و هەڵبەستەکانی لە دەنگ، ڕەنگ، کێش و شێوازدا زۆر لە مەسنەوییەکەی پیرشالیار دەچن:

زیای بیناییم، نوور چەمانم/ سەرمایەی حەیات دین و ئیمانم

من وێم مزانوو بێ ئەمریم کەردەن/ ئیتاعەی فەرمان عەبدیم نەبەردەن

حاجی قادر لەژێر کاریگەریی ئەحمەدی خانی-دا وانەی شۆڕشگێڕی و نیشتمانپەروەری و خوداناسیی فێری هەموو شاعیرانی دوای خۆی کردووە. حەیفە لێرەدا بیروڕای مامۆستا هێمن سەبارەت بە حاجی قادر کۆیی باس نەکەین، کە دەڵێت: "حاجی قادری کۆیە، مەلایەکی زانا و شاعیرێکی هەست ناسك خەیاڵ بوو، ئەگەر

نیشتمانپەروەرێکی وا دڵسۆز و راست و تێکۆشەرێکی وا گەرموگوڕ و ئازادیخوازێکی وا کۆڵنەدەر و نەبەز و رەخنەگرێکی ئازا و بێ باکیش نەبوایە و لە گۆشەی مزگەوتێکدا دەرسی گوتبا و نوێژ و تاعەتی خۆی کردبایە و چەند غەزەلێکی کوردییشی لە پاش خۆی بەجێمابایە، دیسان رەنگ بوو لە ناو نەتەوەکەی خۆیدا ناوبانگی پەیدا کردبایە". (کۆڤاری تێکۆشەر، ژمارە ٥، ل: ٢ هەتا ١٨).

دەتوانین حاجی قادر لەگەڵ "میرزادەی عیشقی" و "عارف قەزوینی" دوو شاعیری نیشتمانیی فارس هەڵسەنگێنین، ئەوەش تابلۆی ئایینیی حاجی قادر:

ئەی بێ نەزیر و هەمتا هەر تۆی کە بێقەرای
بێدار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری
مەعلوومە بۆچی (حاجی) مەدحت دەکا بە کوردی
تاکەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری

وەفایی شاعیری دڵ و گوڵ، ئەوین و کوڵ، دڵی نەهاتووە گوڵزارەکانی کوردستان بەجێبهێڵێت و بچێتە هەندەران، جگە لە سێ جار، هەرسێك جار چووەتە گوڵزاری مەدینە.

رۆحم بە فیدات ئەی گوڵی گوڵزاری مەیدنە
لوتفت هەبێ روو وا بکە مەقسوودی مە، دینە
عومرێکە دەناڵم بە ئومێدی گوڵی زارت
جارێکی بفەرموو، کە چ هاوارە، چ شینە،

وەفایی لە خودا دەپاڕێتەوە و دەڵێت:

ئەی لە شەوقی جەنەتی رووت ئەنبیا و ئەولیا
رۆح لەسەر لێوان وەکو پەروانە بۆ دیداری شەم
بێ نەواو هیچم نیە هاتووم و مەحروومم مەکە
قەت لە دەرگای خۆی گەدا ناکاتە دەر ساحێب کەرەم

با بزانین مەلا مارف کۆکەیی چۆ یاد و بیری خودا دەکات:

هەرچی زەڕاتی عەرز و ئاسمانە کوراتی بەر هەتاوی، لانساری
لە دێڕ و رووپەڕی دەور و زەمانی بە هەر نەقشێ تەماشا کەم دیاری
عەزیزی تۆ لە هەرلا خۆشەویستە زەلیلی تۆ بە کەس نایە قوتاری
نەوا و نالّە و گریانی قومری فوغانی بولبولی سەر شاخساری
بە هەر نەزم و بە هەر وێنە و عیبارەت هەموو ئیقرار ئەکە پەروەردگاری

با چاوێك بە دیوانەکەی پیرەمێردی نیشتمان دۆستی خودا ویستدا بخشێنین:

| | |
|---|---|
| خوایە ، ئەم دڵەم هێزێکی بەرێ | کە غەم لەناو خۆی بکاتە دەرێ |
| پایەی تۆ ناسین ئەگەر دەرکەوێ | ئیتر کێ دونیا و دیناری دەوێ |
| دڵم هەمیشە یادی تۆ ئەکا | گیان لەڕێی تۆدا جستۆجۆ ئەکا |

قانع چەند تابلۆی لەژێر ناوی "خوداپەرستی و موناجات و تەلّقین"دا هەن و دەڵێت:

وەرە باوەڕ بکە کوردە، خودایە خالقی دانا
بە تەنیا لەفزی "کاف و نون" ماسیوای دانا (قانع، ل: ٥٠)
لە موناجاتێکدا دەڵێت:
ئەی خوەلّامی بارەگاهت قەیسەر و دارا و جەم
ئەی لە دیوانی جەزادا شافیعی جوملەی ئومەم
مەسنەدی ئەو رەنگی بەزمت کەوتە ژوور لەوحولقەدەم
ئینتزاری فەیزی لوتفی تۆن هەموو عورب و عەجەم (قانع، ل: ٢٢٧)

لە هەڵبەستێکدا بەناوی "تەلّقینەکەم" ئاوا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ئەڵێم مەرنەمووك: خوام خوایە | محەمەد گەورەی هەر دوو دونیایە |
| ژنی کورد خوشك و پیاوی برامە | کوردستان بەهەشت ئەوە دنیامە |
| زنجیری ژینم لەم کوردستانە | کرداری چاکە و پاکیی زمانە |

(قانع، ل: ٤٥٥)

ئەوەش وەسیەتی قانع:

رۆڵە من ئەمرم، لەپێشا هۆشی ئیمانت ببێ

بیری هۆز و نیشتمان و ژینی کوردانت ببێ

مامۆستا گۆران هەستی خواناسی و ئایینیی خۆی لە زۆر جێدا ئاشکرا دەکات، ئەگەر سەیری دیوانەکەی بکەین، ئەو راستییە بەجوانی دەردەکەوێت، کەس و هەوا و بارودۆخی ئایینیی کوردستان بە قەڵەمە سیحراوییەکەی دەنەخشێنێت، لەمەڕ پاڵەوانی ڕێی دین سەلاحەدین لە لاپەڕە ٢٣ی دیوانەکەیدا دەڵێت:

ئەی شێکۆ، سەلاحەدین/ پاڵەوانی غەزای ڕێی دین/ ئەوەی بۆ پاسی قەلای قوس/ وەك بەردی رووی شوورا بێ ترس/ لەبەر شێر و تیرا وەستا/ دا دەنگی "هەی ئامان" هەستا/ لە گرۆی خاچ/ کە خاچیان کردبوو بە پاچ/ بۆ رووخاندن/ بۆ ئاسیا و پڕ لە مردن/ پڕ لە کەلاوەی شار کردن.

مامۆستا گۆران لە وەرگێڕانی "تەرجیع بەند"ی هاتیفدا ڕێکوپێکی وشەکانی دەگاتە پەڕپەڕۆچکەی جوانی، هاتف دەڵێت:

ای فدای تو هم دل و هم جان وی نسار رهت هم این و هم ان

گۆران دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ئەی بە سەرگەردی تۆ بن دڵ و گیان | وەی بە شاباشی ڕێت بچن دڵ و گیان |
| دڵ بە سەرگەردی تۆ، کە تۆی دڵبەر گیان | بە شاباشی تۆ، کە هەر تۆی گیان |
| دڵ فڕاندن لە چنگی تۆ چ گران گیان | فڕێدانە ژێری پێت چ ئاسان |
| ڕێی ویساڵت شەقامەڕێی بێ ترس | دەردی عیشق پەتیی بێ دەرمان |
| نۆکەرین، گیان و دڵ لەسەر دەستین | چاوەڕێی حوکم و گوێ شلی فەرمان |
| کە یەکێکە و هەیە و ئەبێ و هەر بوو | وحدە لا الە الا هو |

زۆرکەس پێیان وایە مامۆستا هێمن ئاوڕی نەداوەتەوە سەر ئایین و بیروڕای ئایینی بە هێند نەگرتووە، بەڵکو هەر عاشقی کێو و تەلان بەندەن و بەرد بووە، بەڵام ئەگەر

چاو بە بەرهەمەکانیدا بخشێنین، گڕ و تین و ئەوین و خۆشەویستی ئایینی لەبیر نەچووە و لە لاپەڕە (٨٦)ی نالەی جودایی-دا دەڵێت:

بە قوربانت بم بینایی چاوان
قوبوولی بۆ دەکەی تۆ سووچ و تاوان؟

ئەگەر چاوێك بەو رۆژنامانەی کە لە کاتی کۆماری کوردستاندا بڵاوبوونەتەوە، بخشێنین، لە گۆڤاری "گڕوگاڵ" ژماری ٣، ساڵی یەکەم، پووشپەڕی ١٣٢٥، لاپەڕە پێنجدا ئەم پاڕانەوە جوانەی هێمن دەبینین:

هەر خودایە کە فەرد و بێ هاوتا  پاك و بێ چوون و گەورە و دانا
هەموو کارێك لە دەستی وی دایە  ئەوە بێباك و قادر و توانا
خالقی ئادەمی و حەیوانات  سانعی خاك و ئاو و ئەرز و سەما
هەموو موحتاجی دەرك و دەرگای وین  شێخ و دەروێش و پادەشا و گەدا
کاروباری تەواوی دونیایە هەر خودا جێبەجێی دەکا تەنها
رۆژی تەنگانە عەبدی بێچارە هیچ پەناهی نیە بە غەیری خودا
هێمنا تا هەبێ زمانت تۆ هەر بڵێ: لا اله الا الله

لە دواییدا ئەو تاقە بەیتە زۆر لەمێژە لەسەر زار و زمانمە، بڵێی هی کام "بێکەس" بێت کە دەڵێت:

مەڵێ بێکەس بێکەسە، بێکەس/ بێکەس تۆی هەیە بێکەس/ تۆ کێت هەیە بێکەس.

**رەنگدانەوەی ئایین لە پەخشانی کوردیدا:**

پەخشانی کوردی چەند لق و پۆپی جیاوازی هەیە، وەك: پەخشانی فۆلکلۆری (بەیت و حەیران)، وەرگێڕانی ئاسەوارە بیانییەکان بە تێکڕایی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر، یان (ئەدەبی ریالیزمی سۆسیالیستی) ئەدەبی رۆژنامەگەری، پەخشانی ئەدەبی (چەشنی نووسراوەکانی هەژار، هێمن و قزڵجی)، پەخشانی ئایینی کە مەبەستی ئێمەیە لەم بابەتەدا. ئەو چەشنە پەخشانە بە شێوازێکی روون، بە زمانێکی پاراو سەبارەت بە بابەتێك لە بابەتەکانی ئایین دەدوێت. لەو شێوازەدا سەرنجدان بە

ژیان و وردبوونەوە لە هاتن و چوونی ئادەمیزاد لەسەر ئەم عەرزە پان و بەرینە بەرچاوە.

ئەم چەشنە پەخشانە بابەتەکانی وەك مەولدنامە و میعراجنامە و عەقیدەنامە، وتاری ئایینی و خوتبە و خەتابە، چوار تەبعەی شەریعەت و راڤە و تەفسیری قورئان بە کوردی جێی سەرنجە، کوردەکان بەشبەحاڵی خۆیان لەم بوارەدا کەمتەرخەمییان نەکردووە، بە عەرەبی و فارسی و کوردی سەدان کتێب و وتار و شرۆڤە و تەعلیق و تەفسیریان لەسەر قورئان نووسیوە. هەر لە سەد ساڵی رابردوودا لەگەڵ ئەوەی بواری نووسین بە زمانی کوردی نالەبار بووە، دەیان تەفسیری وەك تەفسیری "خاڵ، نامی، رەوان و ئاسان و گوڵشەن و رامان و رۆژ"یان نووسیوە، خۆشەویستیی قورئان لەلای کورد هەتا ئەو رادەیە بووە کە ئەگەر نەیانتوانیبێت راڤەی بۆ بنووسن، لەبەریان کردووە و بە دەستنووسێکی جوان نوسیویانەتەوە. بە نەخش و نیگارێکی جوان سەرەتای سوورەتەکانیان رازاندووەتەوە، یان هەر نەبێسەر و ژێر و خاڵیان لێ ژماردووە و بە رەشخوێن خوێندوویانەتەوە و بەرگ و کیفی بە کۆبەیان بۆ سازکردووە، تاقە و رەفەیان بۆ ئامادە کردووە و لە بەرزترین شوێنی ماڵەکەیا رایان گرتووە.

لێرەدا وێنەیەك لە پەخشانی ئایینیی، واتە پاڕانەوەیەك لە مامۆستا حەسەن قزڵجی کە لە رۆژنامەی "هەڵاڵە" ژمارە ١، ساڵی یەکەم، رەشەمەی ١٣٢٤ بڵاوبووەتەوە، دێنینە بەرچاو.

"خودایە هەر ئەتۆی پەرستراو/ هەر بووی و هەر دەبی/ بێ نیازی لە هەموو شتێك و لە هەرچی شتە موحتاجی تۆیە/ خودایە بە ئەمری تۆ ئاسمان پڕە لە ئەستێرە/ بە فەرمانی تۆ هەور دەبارێنی باران و بەفر و گلێرە/ بە ئیرادەی تۆ باخ و چیمەن دەمێك رووت و قووتە، وەختێکیش زەنوێرە/ خودایە غەیری تۆ کەس دەسەڵاتی نیە/ کەسی چی، کاری چکۆلەت دروستکردنی بەشەر و زەوییە/ هۆش و بیر لە بارەگای تۆدا سەریان نەوییە/ ئێمە کە نازانین چۆن شت دەزانین و ئەسپایی زانینمان چیە/ دەم کوتانمان لە گەورەیی تۆ زیادییە".

وێنەی دووەم لە پەخشانی سەرواداری ئایینی "موناجاتی مەلا عەبدوڵڵا"ی ئەحمەدیانە لە دووتوێی کتێبێکی سەربەخۆدا، ئەوەش بەشێك لەو موناجاتە:

"خودایە لە تۆڕایە ماڵ و ژینم، هێز و تین، شادی و شینم، دنیا و دینم، لە تۆڕایە شیرینی و تاڵی، گەیوی و کاڵی، تەختی و چاڵی، ئاڵی و زاڵی، گێلی و حاڵی، پڕی و خاڵی، لە تۆڕایە قەدر و ڕێزم، تین و هێزم، هەڵسوکەوتم، مان و فەوتم، خێروبێرم، خۆشی و خێرم، چایکم، پاکیم، دڵ ڕووناکیم، تۆ مەیلت بێ سازم، ساغم، زۆر بۆشناغم، بەرچاو ڕوون و بەدەماغم، تێر و تەسەلم، دوور لە زەلم، سەرکەوتووی کەلم، ویستووی گەلم، تۆش مەیلت بێ کوێرم، شەلم، کەتم، کەلم، هەڵڕژاوە کەلوپەلم، بەفێڕۆ چووە کات و هەلم، تێك هالاوە دەست و پەلم، برسی و قڕم، شڕ و بڕم، سارد و سڕم، کاس و وڕم، بۆ بەر و پشتی خۆم زڕم. خوایە لە خوار و سەر، لە ژوور و دەر، لە دوا و بەر، لەنێو دڵی ئەتۆمەکان "ئەلەکترۆن"، "نوتونەکان"، تاگوێی مانگ و ڕۆژ و زەوی، لە گشت بەرزان و گشت نەوی، لە گیا و گژ و لە دارەکان، لە ئاژەڵ و گیاندارەکان، هەموو لات شارەزا کردووە، ڕێی ئامانجی خۆی داگرتووە".

لە کۆتایی ئەم وتارەدا بەو ئاکامە دەگەین، ئەدەبی کورد لە سەدەکانی نێوەڕاستەوە بە ئەدەبی ئایینی و مەزهەبی و گیانی سۆفیزم دەستی پێکردووە، بناغەدانەرانی ئەدەبی نووسراومان، مەلا بوون، گەورەترین شاعیرانمان مەلا بوون، ئەدەب و فۆلکلۆری کورد هەموو کات ڕێز و ڕەنگ و بۆن و تام و چێژی ئایینی پێوە دیارە، کورد هەموو کات ڕێز و حورمەتی ئایینی ئیسلامی پاراستووە و پوختە و پالاوتەی هەموو ئایینەکانی زانیوە، ئایینی بە خشڵ و جلوبەرگ و وشەی جوانی کوردی ڕازاندووەتەوە.

بەیت و باو و گۆرانی و پەخشانی کوردی لەو ڕەنگدانەوە ئاینییە بێبەش نییە. مەبەستی خوداناسی و چەمکی فەلسەفی خزیوەتە نێو بەیتەکان، زۆربەی پەندەکانیش شەقڵی دەوری موسڵمانبوونیان پێوە دیارە، پێویستە بۆ پێناسەکردنی ئەدەبی کورد، ئەو لایەنە لەبیر نەکەین و نەیسڕینەوە، ئەگەر بێت و ئەو کارە بکەین، ژێرخانی ئەدەبی کوردیمان هەڵتەکاندووە و بناغەی فەرهەنگ و کەلەپوور و تۆرەی ئەم گەلەمان ڕووخاندووە.

**سەرچاوەکان:**

١- ئۆسکارمان، توحفەی موزەفەرییە، بە زاراوەی موکری، ئاراس، ٢٠٠٦.

٢- ئەحمەدیان- عەبدوڵلا، مناجاتی مەلا عەبدوڵلا نەشری ئیسحان، ١٣٨٩.

٣- ئیلخـــانی زادە- ســـوارە، ســـەرجەمی بەرهەمـــەکانی (زەمزەمـــەی زولاڵ)، کۆکردنەوەی عەبدولخالق یەعقووبی، هەولێر، ئاراس، ٢٠٠٧.
٤- بەحری- ئەحمەد، گەنجی سەر بە مۆ، سەردەم، ٢٠٠٠.
٥- پایانیانی- سەلاح، کانی مرادان، ئینتشاراتی سەلاحەین ئەیووبی، ١٣٨١.
٦- خەزنەدار مارف، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی، بەغدا، ١٩٨٤.
٧- رۆحانی- بابامەردۆخ، تاریخ مەشاهیر کرد، جلد ١، تهان، سروش، ١٣٨٢.
٨- زیرەك- حەسەن، ناڵەشکێنە (سەرجەم گۆرانییەکان)، ٢٠٠٦.
٩- سەجادی- عەلائەدین، رشتەی مرواری، بەرگی ١، ژمارە ١٠.
١٠- شەرەفکەندی- عەبدولڕەحمان (هەژار)، وەرگێڕانی: قورئـانی پـیرۆز، نەشـری ئیحسان، تاران، ١٣٨٠.
١١- شەرەفکەندی- عەبدولڕەحمان (هەژار)، چوارینەکانی خـەییام، (وەرگێـڕان)، تاران، سرووش ١٣٦٩.
١٢- شەرەفکەندی- عەبدولڕەحمان (هەژار)، دیوانی عارفی رەببانی، شێخ ئەحمەدی جەزیری، تاران، ١٣٦١.
١٣- فەتاحی قازی- قادر، گەنجینەی بەیتی کوردی، هەولێر، ئاراس، ٢٠٠٦.
١٤- شێخولئیسلامی- محەمەد ئەمین (هێمن)، ناڵەی جـودایی، چـاپی پێنجـەم، سەیدیان مەهاباد.
١٥- قانع، دیوانی قانع، کۆکردنەوەی بورهان قانع، بڵاوکراوەی پانیز ١٣٨٦.
١٦- گۆران- عەبدوڵڵا، دیوانی گۆران، پانیز، ١٣٨٤.

**گۆڤارەکان:**

١- ((تێکۆشەر- رۆژنامە، سەر بە رێکخراوە کوردستانییەکان، ژمارە "٥")).
٢- (گڕوگاڵ- رۆژنامەی سەردەمی کۆمار، ژمارە ٣، ساڵی ١٣٢٥).
٣- مەهاباد، ژمارە ١٠١.
٤- هەڵاڵە- رۆژنامەی سەردەمی کۆمار، ژمارە ١، ساڵی یەکەم، بۆکان، ١٣٢٤.

تێبینی: ئەم بابەتە لە گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١١٢، چـاپ و بڵاوکراوەتـەوە و بـە ئیزنی نووسەر لەم کتێبەدا گونجێنراوە.

## پێشەکی

لام وایە گەورە پیاوان ئامادەبوون و بوونیان بەرەکەتە و یادیشیان هەر بەپیت و پێز و خێر و بەرەکەتە، ئەوەتانێ لە یادمان و ڕێزگرتنی گەورە ئەدیبی کورد و خوای پەخشانی کوردی (مەلا مەحمودی بایەزیدی)دا ئەم هەل و دەرفەتە دەقۆزمەوە و وێڕای ڕێز و کڕنۆشم بۆ یادی ئەو زیندەیادە، قسەوباسێك دەورووژێنم کە دەشێ باسی لێوە بکرێت و لە هیمەت و بەرەکەتی ئەم فێستیڤاڵە و مەلا مەحمودی بایەزیدی دەزانم. قسەوباسێك سەبارەت بە ئەرکی هونەرمەند و دەربارەی ئەفسانە و پۆست مۆدێرنیتە و مەلا مەحمودی بایەزیدی. ڕەنگە بە ڕواڵەت چەتوون بێ، بەڵام پێویستە و دەبێت ئەم باسە لێرەدا بکرێت.

ئەوە دەزانین کە نووسینی چیرۆك و ڕۆمان و کۆکردنەوەی حیکایەت و ئەفسانە و چیرۆك، دەسکەوت و داهاتی کۆمەڵگای "بۆرژوازی"ن و چیرۆك و ڕۆمانی ڕاستەقینە و سەرکەوتوو لەنێو جەماوەر و کۆمەڵگایەکدا دێتە بەرهەم و پەرە دەستێنن کە دامودەزگا و پێکهاتە و ڕێکخراوە تەکنیکی و مەدەنییەکان سەقامگیر بووبێتن و جێگە و پێگەیەکی باشیان بۆ خۆیان بەدەست هێنابێت و کاریگەری و شوێن پێیان بەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی و هەروەها بەسەر جەماوەردا بەرچاو بێت، چونکە ئەوە زیادەی داهات و هەل و دەرفەتی گونجاو و حەساوەبوونی مرۆڤ لەم فۆرماسیۆتە ئابووری-ڕامیارییەدایە کە دەبێتە هۆکاری ئافراندنی بەرهەم و دەق و ئاسەوارە ئەدەبی و هونەرییەکان.

ئەم تیۆر و بیرۆکەیە وایە و قسەی لەسەر نییە، بەڵام زۆر جار هەڵکەوتەیەك لە هەمبەر یاسا و ڕێساکاندا قوت دەبێتەوە کە لە گۆشەنیگایەکی گشتیدا یاسا و ڕێسا و چوارچێوە و قاوغەکان دەشکێنێت و وەکو شەمشیری فۆسفۆریی هەورە تریشقە دڵی شەوەزەنگ و تاریکەشەو شەقار شەقار دەکات، بۆ کات و ساتێك چەشنی گڵۆپە کارەبایەك هەڵدەگیرسێت و هەر ئەو ساتەوەختەش (هەر ئەو بڕگەیەش) خامۆش دەبێتەوە.

سەرهەڵدانی ئەحمەدی خانی و ئەفراندنی کەڵەکاری وەکو "مەم و زین"، سەرهەڵدانی مەلامەحمودی بایەزیدی و گردوکۆکردنی نیزیك بە ٤٠ حیکایەت و

ئەفسانە و نووسینی پەنجاوحەوت کتێب و مەلای جەزیری و مەلا پەرێشان و عەلی هەریری و عەلی بەردەشانی و... زۆر کەسانی دیکە، ئەمانە ئەو هەورە تریشقانەن کە دڵی شەوەزەنگ شەقار دەکەن و وڵات رۆشن دەکەن. ئەمانە هەڵکەوتە دەگمەنەکانی مێژوون، کە لە هەر سەدەیەکدا کەسێك و کەرەتێك هەڵدەکەوێت.

مێژوو سەلماندوویەتی گەورە پیاوان بە پێچەوانەی رەوتی داخوشینی ئاوی رووبار مەلە دەکەن، مەلا مەحمود بایەزیدی نەیدەتوانی کاربەدەستی کۆنسولگەری وڵاتێکی لاوەکی بێت، جیرە و مزە و مووچە و مواجب وەرگرێت و بێ خەیاڵ بیخوات و دەرخەمی فەرهەنگ و کولتوور و هونەر و ئەدەبی گەل و نەتەوەی خۆی نەبێت. مەلا مەحمود بایەزیدی بۆ خزمەت بەم سامانە نەتەوایەتییە هەڵدەستێت، ئەوی لە سامانی ئەدەب و فۆلکلۆر و کولتووری نەتەوایەتی وەگیری دەکەوێت، گردوکۆی دەکاتەوە، دەینووسێت و تۆماری دەکات و هەوڵی بە کتێب و پەرتووککردن و تۆمار و ئارشیفکردن و چاپ و بڵاوکردنەوەی بۆ دەدات. ئەم کارانە، ئەم چالاکی و تێکۆشان و خەباتە بەرزە فەرهەنگییە لە سەردەم و رۆژگارێکدا بووە کە فۆرماسیۆن بۆرژوای نەبووە، مرۆڤ تێروتەسەل و حەساوە و حەواوە نەبووە و بارودۆخ بۆ ئەم کارانە (کاری فەرهەنگی) هەر لەبار و شیاو نەبووە.

لە بارودۆخێکی ئاوادا کە لە سەدا نەوەدونۆی جەماوەری کۆمەڵگا بە خوێندەوار و نەخوێندەوارەوە تەنیا هەر لە فیکری زگی خۆیان و نانی ماڵ و منداڵ و خاوخێزانی خۆیاندا بوون، مەلا مەحمود بایەزیدی وێڕای کار و کوێرەوەریی رۆژانە لە خزمەتگوزاری بۆ گەل و نەتەوەکەشی خافڵ نییە و ئەم گشتە سامانی ئەدەب و فەرهەنگی نەتەوەکەی وەکۆ دەکات و بە ئاکامێکی دەگەیەنێت. بۆیە ئەوەتانێ نیزیك بە یەکسەد و چل- پەنجا ساڵ لە پاش کۆچی دوایی ئەو، ئێمە لەم شوێنە پیرۆزەدا کۆبووینەوەتەوە و سوپاسی دەکەین و رێزی لێ دەگرین.

پێشینیانی ئێمە بە دەیان و سەدان گەورە پیاو و کەڵە هونەرمەند، ئەوەندەی توانیویانە ئەرکی خۆیان بەجێهێناوە و تا ئێرەیان گەیاندووە. لێرە بەملاوە ئەرکی ئێمەیە. شاعیری فارس (حافز) دەڵێت:

اسمان بار امانت نتوانست کشید

قرعەی فال بە نام من دیوانە زدند

ئا لێرەدا دوو ئەرکی گەورەیان لەجیاتی بەردەکەی سەرشانی سیزیەف لەسەر شانمان داناوە، دوو بەرد لە هەمبەرمانە و گەیاندنی ئەم دوو بەردە بۆ ترۆپك و لووتکەی چیا ئەرکی ئێمەیە.

١- وەکۆکردنی کامڵ و تەواوی کولتوورمان لە پەند و قسەی نەستەق و ئەفسانە و مەتەڵۆکە و...

٢- کەڵکوەرگرتن لەم سامانە و ئەمڕۆییکردنی بڕێ لەمانە لەناو چیرۆك و ڕۆمان و شیعر و شانۆ و کاری فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی و سۆسیۆلۆژی و ئابووری و...دا.

سەبارەت بەوەی کاری من، منی حوسێن شێربەگی، وەك تاکێکی ناو ئەم کۆمەڵگا و جەماوەرە، چیرۆك و ڕۆمان نووسین و کاری تیۆریکی زانستییاتە و ئاکادیمی لە چوارچێوەی چیرۆك و ڕۆماندایە، بۆ ئەمڕۆییکردنی بەیت و ئەفسانەی کوردی و کەڵکوەرگرتن لەم سامانە وەك هەوێن و توخمی سەرەکی و بنچینەی نووسینی ئەم مژارە، دەمەوێت بزانم چی دەکرێت و چیم لە دەست دێت. دەسا بەم پێیە تیشکێکی بچووك دەخەمە سەر قسە و باسی بە ئەمڕۆییکردنی ئەفسانە و بەیت و باوەکان.

لەڕاستیدا من موعجیب بووم بە چیرۆك و ڕۆمانی ریالیزمی جادوویی ئەمریکای لاتین. من دەمزانی لەم ژانر و شێوازە ڕۆمان و چیرۆکەدا هاوکات لەگەڵ واقیع و ڕاستەقینە، لە فانتازیاش کەڵك وەرگیراوە، بەڵام بە باشی نەمدەزانی سەرچاوەی فانتازیاکە لە کوێدایە، تا کتێبێکم خوێندەوە لە نووسەر و کۆمەڵگاناسی ئەمریکایی ئۆسکار لیویس. ناوی کتێبەکە ئەمە بوو: (مەرگ لە بنەماڵەی سانچێزدا). هەروەها کتێبێکی دیکەی ئەم نووسەرە لەژێر سەردێڕی "منالانی سانچێز". لە پاش خوێندنەوەی ئەم دوو کتێبە کە لە مژاری کۆمەڵناسی و مرۆڤناسیدا نووسرابوون، بۆم دەرکەوت بەردی بناغەی ئەدەبی ریالیزمی جادوویی، کولتوور و خورافە باوەکانی ناو جەماوەر و کۆمەڵگای ئامریکای لاتینە و ئەم گشتە فانتازیایەی لەم ژانرەدا دەیخوێنینەوە، هەر هەموو خۆف و خورافەکانی ناو مرۆڤی ئەوێندەرێیە.

ئەمجار بۆم دەرکەوت کە ئەمە کەڵکوەرگرتنی ئیجابی و پۆزەتیڤە لە دابونەریت و خۆف و خەیالات و خۆزیاکانی ناو جەماوەری ئەو کۆمەڵگایە. ئەمەش بۆ خۆی گەڕانەوەیەکە لە ئەمڕۆوە بۆ ڕابردوو، ئەمڕۆییکردنی بەیت و باو و حیکایەت و

ئەفسانەکانی نەتەوەیی رابردووە. ئێمەش دەتوانین لە کۆمەڵگای کوردەواریدا لەو هەموو خۆف و مەترسی و ئاوات و هیوا و روئیا و کابووسی بیر و باوەڕ و ئەو خورافانەی کە لەناو جەماوەرماندا هەیە کەڵکوەرگرین و چیرۆك و رۆمانی ئەمرۆیی بنووسین. وەها چیرۆك و رۆمانێك کە باس لە ئەمرۆی کومەڵگامان بکات و چیرۆك خوێن و رۆمان خوێن و گەنج و لاوان بە چێژوەرگرتن و تاسە و عەشقەوە بیخوێننەوە. ئەمەش خۆی لە باسی تیۆری ئەدەبی ئەمرۆدا لە خاڵە سەرەکییەکانی بیر و باوەڕی پۆست مۆدێرنەیە. جا بۆ روونکردنەی لایەنی تیۆریك و زانستی ئەم خاڵە و ئەم باسە ئاوڕێك و وتەیەك لەسەر دوو مژار:

١- ئاوڕێك و وتەیەك لە بیروباوەڕەی پۆست مۆدێرنە و بزاڤی نوێخوازی لە نەریتەوە بەرەو مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە.

٢- ئەفسانە چییە و بۆچی؟

سەبارەت بەم قسە و باسە، وێرای دەربڕینی لایەنگری خۆم بۆ پۆست مۆدێرنە لە کار و چالاکیی داهێنانی ئەدەبی و هونەری و ئەفراندنی چیرۆك و رۆمان لەمرۆدا، رێز و کورنۆشم ئاراستەی ئەحمەدی خانی، مەلای جزیری، مەلا مەحمود بایەزیدی، عەلی هەریری، عەلی بەردەشانی، نالی و مەولەوی و حاجی قادری کۆیی و... ولاتی باسێك دەورووژێنم کە کورد وتەنی: ئەم هەویرە ئاوی زۆری گەرەکە.

لەپێشدا با بزانین پێشڕەیانی ئەمرۆی فەلسەفە و زانست و تیۆریی رۆژاوایی و رۆژهەلاتی لەسەر ئەم مژارە و لەسەر "نویێ"کردنەوەی سامانی رابردوومان چی دەڵێن؟

هۆرك هایمر: توێژەر و بیرمەندی گەورە و ناوداری قوتابخانەی فرانکفۆرت دەبێژێ: "لەبۆ بازدان و رۆیشتن و گەیشتن لە نەریتەوە بەرەو مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە دەبێت حەتمەن لاقمان لەسەر بەردەبازێکی نەریت بێت، یانی بەبێ پاڵپشتی فەرهەنگیی خودی و خۆمان ناتوانین بگەینە تازەگەری و نوێخوازی، چ لە باری نڤیساری و چ لە بواری شارستانییەتدا".

ژان فرانسوا لیۆتار، توێژەری پۆست مۆدێرنەی فەرەنسی لە کتێبی (بارودۆخی پۆست مۆدێرنە)دا دەبێژێ: "مرۆڤی مۆدێرن ناتوانێت حەوجێ و نیازی بە ئەفسانە و حیکایەتی میللی و نەتەوەیی نەبێت، لە دۆخێکدا کەلان ریوایەت فریومان دەدات وردە ریوایەتەکان وەخۆمان دێننەوە".

ئەحمەدی شاملوو، گەورە شاعیری ئێرانی و خاوەنی خەڵاتی "داگرمەن"ی سوید و خەڵاتی "داشیل هامت"ی ئەمریکا، باشترین و گەورەترین کتێبی توێژینەوە و کۆکردنەوەی ئەدەب و فەرهەنگ و هونەری زارەکی ئێرانی بە ناوی (کتاب کوچە) بە درێژایی تەواوی تەمەنی خۆی کۆکردەوە و لەناو هەموو شاکارە شیعری و چیرۆکی و وەرگێڕانەکانیدا کە هەیبوو، شانازی هەرە زۆری بە (کتاب کوچە) بوو.

لەلایەکی دیکەوە، دەبا سووکە ئاوڕێك لە شێوەی تێفکرین و گۆشەنیگای مۆدێرنە و پاش مۆدێرنە بدەینەوە. لەلای بیرمەندان و فەیلەسووفانی مۆدێرنە، لە ڕێنیسانسەوە بۆ کۆمەڵگای بۆرژوایی و تەکنیك و مەدەنییەت و فەلسەفەی ڕۆژئاوایی وەك کانت و دێکارت و بەیکۆن و هیگێل و... ئاوا بوو: فیکری باش و زانستی دروست و فەرهەنگ و مەدەنییەتی زانستی و پێشکەوتوو، هەر لە ڕۆژئاوا و لەلای ڕۆژئاواییەکان و وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی وەکو ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکای لاتین و هەر هەموو وڵات و فەرهەنگی باشووری و پەراوێزەکان (ڕۆژئاوا= ناوەندە) خاوەن فیکر و فەرهەنگ و شارستانییەتی بەکەڵك و زانستی و دروست نین و ناتوانن لە بەرەوپێشەوەچوونی فەلسەفە و زانست و تەکنیك و مەدەنییەتدا دەور و کاریگەرییان هەبێت. ڕۆژئاوا لەسەر ئەم باوەڕە (شارستانییەتی هیلێنی) دادەمەزرێنێت و فۆرماسیۆنی بۆرژوایی ڕۆژئاوایی پێکدێنێت، تا دەگاتە شەڕە گەردوونییەکانی یەکەم و دووەم و قەیرانی گەندەڵبوونی ئەم بیروباوەڕە تەواوەت خوازە یەخسیری گیر و گرفت و درم و خەسار دەبێت و بۆدومانی شاری (درێسدێن) -(شاری ئەڵمانیا و یەخسیرگای سەربازە ڕۆژئاواییەکانی فەڕەنسی و ڕووسی و ئینگلیزی و ئەورووپی لە بەندی هیتلەر و ئەڵمانیای نازیدا)- کە لەم بۆردوومانەدا ١٦٠ هەزار کەس لە کوڕانی فەڕەنگی بە دەست باوکانی خۆیان (لیدیرەکانی دەوڵەتانی یەکگرتوو) دەکوژرێن و... ئەم ساتەوەختە و ئەم کردەیە، شێوە تێڕامان و فەلسەفەی مۆدێرنەی ئەورووپایی گەندەڵ و پووچەڵ دەکات و لێرەوە بە جارێك شێوازی گۆشەنیگای پۆست مۆدێرنە سەر هەڵدەبڕێت و دەوری خێرا هەڵدەگرێت و خۆیا دەبێ.

هەڵبەت زۆر پێشتر لەم برگەیە (ساڵانی ١٩٤٥- ١٩٥٠) لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا لەلایەن مارکس و ئینگلسەوە و لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لەلایەن نیچەوە

ڕەفزی قوتابخانەی سەرمایەداری و بۆرژوایی (کاپیتالیزم) کرابوو، بەڵام باوەڕ و گۆشەنیگای پۆست مۆدێرنە لەسەر ئەم بناغە و بنچینەیەیە:

١- زانست و عەلمانییەت راست و دروستێکی ڕەها نییە و راستی و دروستی، شتێکی ڕێژەییە.

٢- هیچ عەقڵانییەتێك راست و دروستی ڕەها (موتڵەق) نییە، ئەمەش ڕێژەییە.

٣- فیکر و فەلسەفە و گۆشەنیگای ڕۆژئاوایی، تەنیا فیکر و فەلسەفە و گۆشەنیگای ڕەها نییە بۆ تێفکرین و لێکدانەوەی پرس و کێشەکانی جیهان، ئەمەش ڕێژەییە. دەبێت ئاوڕ بدرێتەوە لە فەرهەنگ و کولتووری ڕۆژهەڵات و باشوور، دەبێت بگەڕێینەوە سەر حیکایەت و ئەفسانە و دابونەریت و کولتووری ڕۆژهەڵات و وڵاتەکانی باشوور و خوێندنەوەی تازە و دووبارە و ئەمڕۆییمان لەسەر ئەو فەرهەنگ و کولتوورانە هەبێت و هەموو دابونەریت و فەرهەنگ و خورافەی ئەو وڵاتانە شەنوکەو بکرێنەوە. بەتایبەت لە ئەدەب و هونەر و شیعر و چیرۆك و لە ئەفسانە و ئایین و نەریتی میللیدا.

لە پاش ئەم بیروباوەڕە تازە و پۆست مۆدێرنە، شێوازی (ریالیزمی جادوویی) لە چیرۆك و ڕۆمانی ئەمریکای لاتیندا پەرەی گرت و خۆیا بووە. ئاستۆریاس و گابریل گارسیا مارکێز و خۆرخە ئامادۆ و ژۆزێ ساراماگۆ و دەیان کەڵە نووسەری دیکەی سەر بەم شێوازە چیرۆك و ڕۆمانە خەڵاتی نۆبێلیان وەرگرت و شێوازی ریالیزمی جادوویی هەموو شێوازەکانی دیکەی ڕۆمان نووسینی ڕۆژئاوایی وەدوا خست.

لە ئەفریقادا ناردین گۆردیمەر و لە میسردا نەجیب مەحفووز، لە تورکیا ئورهان پامۆك و لە قولەڕەشەی ئەمریکادا تۆنی ماریسۆن و چەندان کەسی دیکەی سەر بە دابونەریتی جیهانی پەراوێز و وڵاتانی باشوور کەڵەکاری ئەدەبی و هونەری دەنووسن و خەڵاتی نۆبێل و خەڵاتە گەورە و بایەخدار و نێودارەکانی ڕۆژئاوایی دەبەنەوە.

ئەمجار نۆرەی ئێمەی کوردە، تا جارێکی دیکە فەرهەنگ و دابونەریتی وڵاتی کوردان و ئەفسانە و بەیت و حیکایەتی نەتەوایەتی و فۆلکلۆریمان دووبارە بە گۆشەنیگای تازەوە بخوێنینەوە و دووبارە لە شەنوکەویان دەین. لە خوڕافەی جندۆکە و پەری و دێو و ئەژدیها و کورە کەچەڵە و مام ڕێوی و شایی پاشای جندۆکان و بەیت و ئەفسانەکانی توحفەی موزەفەرییە و ئەوانەی مەلا مەحمود بایەزیدی و عەلی هەریری و عەلی بەردەشانی و... دیتران وەکۆیان کردوون و لە ئەوانەی وا ماون و کۆ

نەکراونەتەوە، کۆیان بکەینەوە، بە گۆشەنیگای تازە بیانخوێنینەوە، وەکو وتمان لە شەنوکەویان دەینەوە و ئەمجار لەمانە چیرۆك و رۆمان و شیعر و شانۆ و شێوەکاری مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە بخولقێنین.

تەنانەت کەسانی بیانی وەکو ئۆسکارمان و ئالکساندر ژابا و مارگریت رۆدینکۆ و... خزمەتیان بە ئێمە کردووە، ئەمانەیان گردوکۆ کردووە و بڵاویان کردووەتەوە، وەریان گێڕاوەتە سەر زبانی فەڕەنسی و ئەڵمانی و رووسی و بگرە چەندان زبانی دیکەش، ئەی خۆمان چی؟ ئەی ئەرکی ئێمە چییە؟ یانی ئێمە ئەرکێکمان لە بەرامبەریاندا نییە؟

لەپێشدا وتم و لێرەشدا لەم کۆتایی و دوا وتەیەشدا دووپاتی دەکەمەوە، دوو ئەرکی زۆر گرانمان لەسەر شانە:

١- گردوکۆکردنەوەی ئەوەی گردوکۆ نەکراوەتەوە، بۆ دووبارە خوێندنەوە و بڵاوکردنەوە و بردنەوە ناو جەماوەر و کۆمەڵگامان (بەتایبەت بۆ ناو گەنج و لاو و منداڵ).

٢- کەڵکوەرگرتن لەم سامانە و ئەمڕۆییکردنی برێك لەمانە لەناو چیرۆك و رۆمان و شانۆنامە و شیعر و شێوەکاری و... دا. شاعیری ئێرانی مەلای رۆمی وتەنی:
"هرکسی کو دور ماند از اصل خویش/ باز جوید روزگار وصل خویش".

من رووی وتار و گوتار و قسەکەم دەکەمە گەنج و لاوە مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنەکان و دەڵێم بە خاترجەمییەوە ئەم کارە نەك کۆنە و سەلەفی نییە، بەڵکو عەینی کارەکانی گابریل گارسیا مارکێز و ساراماگۆ و ئاستۆریاس و ئورهان پامۆك و نەجیب مەحفووز و دیتراتە، یانی کارێکی مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە و زۆر زۆر بایەخدار و نوێیە، دەیجا هەموومان پێکەوە بۆ پێشەوە، بۆ زیندووکردنەوەی سامانی کولتووری و فۆلکلۆری و ئەمڕۆییکردنی ئەم سامانە بە هونەری نوێخوازانە.

جارێکی دیکەش درووود و سوپاسم بۆ یاد و رۆحی مەلامەحمودی بایەزیدی و خانی و...

**دەچینە سەر باسی ئەفسانە.**

**ئەفسانە؟ بۆچی؟**

لە خەزێنەی فۆلکلۆردا وەکو گەنجینەیەکی بێکۆتایی- ڕەنگە بەشی هەرە شیرین ئەفسانە بێت، چونکە ئەفسانە هەم ڕاستی و واقیعە، هەم خەون و خەیاڵ و فانتازیا. هەم قسە و باسی مێژوو و ڕابردووە و هەم باس و خواسی ئەمڕۆییە. هەم سەربوردی نەناسیاوان و نەدیتواتە و هەم سەرگوزەشتی دۆست و دیوناس و خزم و کەسانە. هەم گێڕانەوەی سەربوردانە، هەم لێکدانەوەی چارەنووسانە. هەم باسی دیترانە و هەم قسە و باسی خۆمانە! هەم و.... هەم...

دەیجا بەپێی ئەم بۆچوونانە ئەفسانە لە دێرزەمانەوە یانی لە ڕابردوویەکی دوورەوە تا هەنووکە شیرین و خۆش و لەبەردڵان بووە و هەروا خۆش و شیرین و لەبەردڵانیش ماوەتەوە.

ئەفسانە لە زاتی خۆیدا، خەون و خۆزیا و خەیاڵ و خولیای گەیشتن بە ڕزگاری و عەدالەت و یەکسانییە لەلایەن مرۆڤەوە، بەگشتی و لەلایەن خەڵکی ڕەشۆکییەوە بەتایبەتی. بایەخی ئەفسانە لەوەدایە کاتی ئەفسانە گێڕانەوە بۆ جەماوەرێك، یان کاتی گوێ شلکردن بۆ ئەفسانە و ئەفسانە خوانی، هەم کات و زەمەن بە خۆشی تێپەڕ دەبێت و هەم ڕاهێنان و ڕاهاتن و فێر بوون و زانست و زانیاری لە گۆڕێدایە.

ئەمە واتە و دەرسی مێژووە، ئەو نەتەوانەی وا دەوڵەتیان پێکهێناوە و خاوەن دامودەزگا و ڕێکخراوە و پێکهاتەی فەرمی و حکومی و نەتەوەیین زوو لە کولتوور و ئەدەب و هونەری زارەکی دوور دەکەونەوە و بەرەو فەرهەنگ و ئەدەب و هونەری نقیساری دەچن و لە ئاکامدا فۆلکلۆر و فەرهەنگی زارەکی ئەمانە زۆر بەربلاو و هەمەڕەنگ و دەوڵەمەند نییە، بەڵام نەتەوە ژێردەست و چەوساوەکان کە زۆربەشیان سێبەری دەوڵەتی نەتەوەییان بەسەرەوە نییە و بەستێن و بواری پێکهێنانی فەرهەنگ و ئەدەب و هونەری نقیسارییان بۆ نارەخسێت، ئەم چەشتە نەتەوانە دەبنە خاوەن کولتوور و فۆلکلۆر و ئەدەب و فەرهەنگی زارەکیی زۆر زۆر ڕەنگین و بەربلاو و بەهێز و دەوڵەمەندن.

دەسا گەل و نەتەوەی ژیر و هۆشیاری دەوێت هەتا هەل و دەرفەت بقۆزێتەوە و لە هەر هەلومەرجێکدا کە بۆی دەڕەخسێت، فەرهەنگ و کولتوور و فۆلکلۆری خۆی

گردوکۆبکاتەوە، لە قەوارەی کتێب و دیوانە شیعر و فیلم و سی دی (CD)دا تۆمار و ئەرشیفی کات، بلاوی کاتەوە، بیانباتە نێو جەماوەرەوە، بەتایبەت بیانباتە نێو بەرەی نویٚ و تەمەن ساوا و مێرمنالٚ و گەنجەوە، کە ئەم بەرە و جیلە لە پێشینە و فەرهەنگی خودی خۆیان دانەبڕێن.

نەتەوەی ئێمە (نەتەوەی کورد) لەو نەتەوانەیە کە بە درێژایی زەمەن، خاوەن مێژوویەکی پڕ هەوراز و نشێو و پڕ لە بەزم و رەزم و هەڵچوون و داچوون بووە. بەتایبەت ژیانی عەشایەری و خێلاتی و کێونشینی و گوندۆمەنی بەو هەموو هەلاّ و زەنا و شەڕ و بەربەرەکانیی لەگەلٚ دەرودراوسیٚ و نەیارانەوە، بۆ مانەوە، بۆ بژیو و نەفەوتان و رزگاری و زۆر بەلٚگە و فاکتۆری دیکەشی لەگەلٚدا بێت، ئێمەی کردووەتە خاوەن کولتوور و فۆلکلۆرێکی رەنگاوڕەنگ و دەولٚەمەند. هەزار مەخابن کە ئەم سەروەت و سامانە لە سەدا یەکی کۆ نەکراوەتەوە، تۆمار و ئەرشیف نەکراوە و تەنانەت بە کتێب و نووسراوە و فیلم و "CD"ی خاویش نەکراوە. دەیجا کە ئەم کارە نەکراوە، زۆر سروشتییە کە زانست و زانیاری و زانستیشمان لەسەر ئەم بابەتە کەم بێت، یان نەبێت!

بەداخەوە ئەوەندەی فەرهەنگی زارەکیی نەتەوەی کورد دەولٚەمەندە (بەتایبەت لە مژار و بوار و بەستێنی ئەفسانەدا)، هەزار ئەوەندە و بگرە زیاتر زانستی ئەفسانەناسینمان هەژار و لاوازە.

ویلادیمیر پراپ، ئەفسانەناسی رووسیا لە کتێبی (قەوارەناسینی ئەفسانەکانی پەری)دا دەبێژیٚ: "لە کەش و هەوایەکدا زانستی وەکو فیزیا و کیمیا و ماتماتیک، خاوەن کۆلێژ و ئاکادیمی و زانکۆ و کۆنگرە و فێستیڤالٚ و پۆلێنکردنی رێکوپێک و زاراوەی یەکگرتوون و لە کۆنفرانس و میهرەجان و کۆنگرە زانستی و پسپۆڕییەکاندا دەنووسرێنەوە و لەلایەن مامۆستایانەوە بۆ قوتابیان دەگوازرێنەوە، کارێکی ئاوامان نە لە چیرۆك و نە لە ئەفسانەکاندا نییە و جۆرانجۆری و ئالۆزبوونی کەرەسەی کار و بیچم و چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئەفسانە بە وردی هەر دیٚ و دژوارتر دەبێت".

ئەمە هاواری مامۆستایەکی گەورەی بوار و بەستێنی ئەفسانەناسین لە ولاتێکی پێشکەوتووی وەکو روسیا، جا ئێمەی کورد کە نە لە سەدا یەکی ئەفسانەکانمان وەکۆ کردووەتەوە و نە هیچ کارێکی پسپۆڕانەمان لەسەریان کردووە، دەبێت حالٚ و بالٚمان

لەم مژارەدا چۆن بێت؟ ئەوەتانێ هەر بە هۆکاری ئەم کەمتەرخەمییەوەیە کە چیرۆك و رۆمان نووسینی کوردی لە پاش نیزیکەی سەد ساڵ چالاکی و هەوڵ و تێکۆشانی نووسەرانمان ناچێتە ماڵپەڕ و قەوارەی هونەری پەسندەوە و مۆرکی کوردیبوونی پێوە نانووسێت.

گلەیی و بناشت و رەنج و خەفەت و هاوار و برۆ زۆرە و دەرفەت کەم. ئێرەش بابەتی وتار بۆ ئەفسانەیە و نەك بۆ رەنجنامە. کورتی دەبڕینەوە و با بمێنێت بۆ شوێنی خۆی و وتاری خۆی و کاتی خۆی.

مرۆڤی کۆمەڵگا نادیموکراسییەکان خەون و خۆزیا و خولیاکانیان لە قەوارەی ئەفسانەدا دەربڕیوە. ئەفسانە کەلاوڕێژن لە جوانی، هونەر، عەداڵەتپەروەری، یەکسانیخوازی و بگرە قوتابخانەیەکن بۆ گەشە و پەرەپێدانی راهێنانی هێزی ئەفراندن و داهێنانی جوانی و هونەر و فێرکاری و فێربوونی هزر و فیکری فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و یەکسانیخوازی و برایەتی.

لەناو ئەفسانەدا زۆرجار "پادشا" زاڵم و بەبێ کەڵك و بێ خێرەیە و جەماوەر لە ناخۆشەویستی شادا، شا بە وەجاخ کوێر دادەنێن و هەموو گێڕانەوەی ئەفسانە دەبێتە ئاواتخوازی بۆ لەدایکبوونی شازادەیەك کە پیاوچاك و مرۆڤپەروەر بێت و هەر کاتێکیش زوڵم و زۆری (میری- شا-حاکم) لە رادە و ئاستی تابشت هێنان تێپەڕ بوو، ئەوا جەماوەر، "پادشا، حاکم" بە ئەژدیها و دێو دەشوبهێنن و دەستەودوعای سەرهەڵدان و راپەڕینی سوارچاکێکی جوامێر و ئازا دەبن، تا راپەڕێ و ناحەزان (پادشا- حاکم- ئەژدیها- دێو- جادووگەر) لە دەسەڵات بخات و لەڕاستیدا شوێنەوارەکەی لە رووی زەوی بسڕێتەوە، بەڵام دەبا خۆمان یەخسیری راڤەی واتای ئەفسانە نەکەین، چونکە لەم کورتە وتارەدا کە زیاتر بۆ مژوولیایش و گوتار نووسراوە، ناکرێت و ناتوانین ئەم شیکارییە بە ئاکام و ئەنجام بگەیەنین.

لێ، بۆ ناسینی ئەفسانە دەچینە سەر وەسفێك و پۆلێنبەندییەك کە یەکێك لە ئەفسانەناسانی ئەورووپی "میلەر" بۆ سەرەوودەرەی واتای ئەفسانە کردوویە، "میلەر" ئەفسانە لە سێ چەشندا پۆلێن دەکات:

١- ئەفسانەی پەری و جنۆکە.

٢- ئەفسانەی ژیانی رۆژانە.

٣- ئەفسانەگەلی سەبارەت بە گیانلەبەرانی دیکەی جگە لە مرۆڤ وەکو باڵندە و ئاژەڵ و درەخت.

بەڵام ئەم پۆلێنکردنە لەلایەن کەسانێکی وەکو "ئافاناسیۆف "ی نووسەری وڵاتی روسیاوە کە زیاتر لە چوارسەد ئەفسانەی گردوکۆکردووەتەوە و لە قەوارەی کتێبدا بڵاوی کردوونەوە، رەفز کراوەتەوە. بۆچی؟ لەبەرئەوەی لەم پۆلێنکردنەدا تەنیا کەسێتی ناو ئەفسانە لەبەرچاو گیراوە، کەچی دەبایە پێکهاتە و بنەماش لەبەر چاو گیرابایە.

ناسینی ئەفسانە و سەرەوەدەرەیٔ پۆلێنکردن و واتاکان و چێژبردن لە جوانیی هونەری و جوانی زەین و خەیاڵات و خۆزیاکانی نێو ئەفسانە، ئەرکی نووسەران و دایک و باب و مامۆستایانە، چونکە گێڕانەوەی ئەفسانە وەك دیالۆگی ئەدەبی و هونەری بۆ جەماوەر و کۆمەڵگا -نەك هەر بە چەشنێکی زارەکی- بەڵکو بە نووسین و بڵاوکردنەوە و خوێندنەوە و راڤەکردن و مژولیایش و دیالۆگیش لەگەڵدا بێت، لە گۆڤار و رۆژنامە و بڵاڤۆکدا، بە واتای گوتنەوە لە یانەکاندا لە قەوارەی کتێب و فیلم و سیدیدا لە لایەن مامۆستایان و نووسەرانەوە، هەروەها ئەفسانە گێڕانەوە لەلایەن دایك و باب و داپیرە و باپیرە و خوشك و برا گەورەوە بۆ منداڵان و مێرمنداڵان، تێفکرین و تێڕامان و هێزی هەست و سۆزی ئەدەبی و هونەری و جوانیناسیی هونەر و ئەدەب و هەست و سۆزی جوامێری و رزگاریخوازی و ویستی یەکسانی و دیمۆکراسی و دادپەروەری لە جیل و نەوەی داهاتوودا بە توانا و پەروەردە دەکات و رایان دەهێنێت و منداڵ و مێرمنداڵ و گەنجەکانمان بەرەو کەلەپوور و کولتوور و فەرهەنگی نەتەوایەتی و بەرپرسایەتی و ئیش و ئەرکێکی بایەخدار دیونـاس و رێنوێنی دەکات و هەروەها توانای ئەدەبی و هونەری و خەیاڵات پەروەری منداڵ و گەنج بەم کارە بەهێز دەبێت.

ئەفسانەی نەتەوە جیاوازەکان لێك دەچن، زۆرجار ئەفسانەیەك لەنێوان چەند وڵاتدا هاوبەشە، رەنگە بەبێ ناوبردنی وڵاتێك، وڵاتی خاوەن ئەفسانە باش نەناسرێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە قسەی دڵی نەتەوە جیاوازەکان یەك قسەیە، ئاوات و هیوا و خۆزیاکانیش هەروەکو یەك وان. ئەرك و بەرپرسیایەتیی ئێمە گردوکۆکردنی ئەو ئەفسانانەیە کە کۆ نەکراونەتەوە، بڵاوکردنەوەیانە، کەڵکوەرگرتن لەم ئەفسانانە بۆ دارشتنی چیرۆکی نوێیە و پاراستنی ئەم سامانەیە لە فەوتان.

لێرەشدا جارێکی دیکە درووود و سڵاومان بۆ گیانی پاکی مەلا مەحمود بایەزیدی ئەحمەدی خانی و هەریری و بەردەشانی و فەقیێ تەیران و...

دەبا ئێمەش ئەرکی خۆمان لەم بەستێنەدا لە یادا بێت.

**سەرچاوەکان:**

١- ریخت شناسی قصه، ولادیمیر پراپ، ترجمه: م. کاشیگر، تهران، نشر روز، ١٣٦٨.

٢- وضعیت پست مدرن، ژان فرانسوا لیوتار، ترجمه حسینعلی نوژری، تەران، نشر گام نو، ١٣٨٠.

٣- کتاب کوچه، احمد شاملو، نشر مازیار، تەران، ١٣٧٥ تا ١٣٨٤.

٤- دابونەریتی کوردی و ٤٠ حیکایەتی مەلا مەحمود بایەزیدی، دکتۆر فەرهاد پیربالْ و پێداچوونەوەی عەزیز داشبەندی، وتارەکانی دکتۆر فەرهاد پیربالْ.

٥- ئەفسانە و ئەفسوون، برۆنۆ بێتلهایم، وەرگێڕانی: ئەختەر شەریعت زادە، انتشارات هرمس، تهران، ١٣٨١.

٦- توحفەی موزەفەرییە، ئۆسکارمان، وەرگێڕانی مامۆستا هێمن موکریانی، بڵاوکراوەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا.

# توێژینەوەیەک لەبارەی ئەدەبی زارەکی و خەسڵەتەکانی

شەریف فەلاح- سنە

**پوختە:**

ئەدەبی زارەکی بەشێگی گرنگە لە فۆلکلۆر و بۆ ئەوەی تێگەیشتن و فامێکی وردی بکەین، پێویستە لەپێشدا هێندێ شیکردنەوە و زانیاری لەبارەی فۆلکلۆرەوە بخەینە روو.

فۆلکلۆر (Folklore) بە واتای فەرهەنگی خەڵك، فەرهەنگی کۆمەڵ، فەرهەنگی جەماوەر و... مانا کراوەتەوە، بۆ یەکەم جار لەلایەن "ویلیام جان تامز"ی بەریتانیاییەوە لە ساڵی(١٨٤٦ی زایینی) داهێنراوە. بەڕای ئەو ئەم وشەیە سەرتۆپی ئەو توێژینەوانە بووە کە دەبوا لە بوارەکانی، خۆ و خدە، دابونەریت و روانین، خورافات و ئەو گۆرانی و ئاوازانەی کە لە سەردەمە کۆن و کەوناراییەکانەوە ماونەتەوە، لێکۆڵینەوە کرابا.

سەرەتا جێگرتن و قبوولکرانی ئەم دەستەواژەیە لەلایەن لێکۆڵەر و توێژەرانەوە مشتومڕی زۆری لەبارەوە کرا. ئەوەش لەو تاریف و پێناسانەوە سەرچاوەی دەگرت کە لەمەڕ ئەم وشەیە هێنابوویە گۆڕێ، سەرەڕای ئەو پێداگریی و دژایەتییە زۆرەی لێکۆڵەران، سەرەنجام ئەم دەستەواژەیە لەناو کۆمەڵی نووسەر و لایەنگرانی زانست و فەرهەنگدا جێگای گرت و کەوتە سەر زاران.

**پێشەکی:**

پێناسەی جۆراوجۆر لە فۆلکلۆر خراونەتە روو. ئەم پێناسانە هێندێ جار زۆر لە یەکەوە نزیك و هێندێ جاریش مەودایەکی هەتاڕادەیەك دووریان پێکەوە هەیە. پشکنین و روانینی وشەدان و ئینسکلۆپیدیا گرنگ و سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانی جیهان، دەربڕی ئەم جیاوازییانەن. لە فەرهەنگە تایبەتی و پسپۆڕییەکانیشدا لەگەڵ کێشە و جیاوازیی لەم چەشنە بەرەورووە دەبین. بۆ وێنە لە یەکێك لە فەرهەنگە پسپۆڕییەکان، بەناوی "فەرهەنگی ستانداردی فۆلکلۆر، ئوستوورە ناسی و ئەفسانە" نزیك بە بیستویەك پێناسەی جیاواز لە فۆلکلۆر خراوەتە روو. ئەم جیاوازییانە پتر لە هەر شتێك پێوەندیی بەو هەڵێنجانانەوە هەیە کە بەنیسبەت دوو بەشی ئەم دەستەواژەیە، واتە "Folk و Lore" لەلای توێژەران لە گۆڕێدایە. لەڕاستیدا مانای

ئەم دەستەواژەیە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەو پێناسەوە هەیە کەلە "Folk" (خەڵك یان کۆمەڵ) و"Lore" (فەرهەنگ) دەخرێتە ڕوو. بۆ وێنە لە یەکێك لە فەرهەنگە ئەدەبییەکاندا "Folk" بە واتای گشتی، یان جەماوەر لەبەرچاو گیراوە و بەپێی ئەم فامکردنە لەمەڕ" Folk Literature" کە بەشێك بووە لە فەرهەنگی گشتی، نووسراوە: (١)"ئەدەبی جەماوەر پەسند لەناو ئەو کۆمەڵانەی کە زۆربەی خەڵکەکەی توانایی خوێندن و نووسینیان نییە، برەوی هەیە". (٢) لە یەکێکی تر لە فەرهەنگە فارسییەکاندا دەستەواژەکانی "FolkLore و LiteraturFolk"، بە یەك واتا هاتوون کە نووسراوە: "ئەدەبیاتی گشتی یان جەماوەر پەسند، یان فەرهەنگی کۆمەڵ، یان فۆلکلۆر، لە بەرامبەر ئەدەبیاتی فەرمی کە بەرهەمی زەینی خەڵکی خوێندەوار و ئاکادیمییە، کۆمەڵێکە لە گۆرانی، حیکایەتی ناو کۆمەڵ، شانۆنامە، مەتەڵ، سیحر و جادوو و پزیشکیی ڕەشۆکی کە لەناو خەڵکی سەرەتایی و نەخوێندەواردا برەوی هەیە"، بەپێی ئەم دەرك و پێناسانە، ئەو کۆمەڵگایانەی کە زۆرینەی دانیشتووانی توانایی خوێندن و نووسینیان هەبێت، لە فۆلکلۆر بێبەش و بێبەرین. بەپێی ئەم پێناسانە، هەروەها دەکرێت بوترێت لەو کۆمەڵگایانەش کە خوێندنەوە و نووسین گشتگیر نەبووە، ئەو گرووپ و تاقمانەی کە خاوەنی خوێندەواریی خوێندن و نووسینن، خاوەنی فۆلکلۆر نین.

وەها پێناسەگەلێك تەنیا تایبەت بە نەتەوە و گەلان و وڵاتانی ڕۆژهەڵات نییە، بەڵکو لەلای نەتەوە و وڵاتە ڕۆژئاواییەکانیش دەکرێت لەگەڵ پێناسە و چەمکی لەو چەشنە بەرەوڕووبینەوە.

بەپێی ئەو پێناسانەی سەرەوە کە بە پشتبەستن بە پێناسەیەکی بەرتەسك لە دەستەواژەی FOLK خراونەتە ڕوو، ئەمڕۆکە فۆلکلۆرناسان لەناو کۆمەڵگا پیشەسازی و پێشکەوتووەکانیش شێواز (ژانرە) جۆراوجۆرەکانی ئەدەبیاتی زارەکی و جەماوەر پەسندیان دۆزیوەتەوە و بەپێی مێتۆد و ڕێکارە زانستیی و ئاکادیمییەکانی ئەمڕۆ توێژینەوەیان لەبارەوە دەکەن.

بۆ وێنە لەناو کرێکارانی کۆمەڵگا پیشەییەکان، یان تەنانەت لەناو کۆمەڵی خوێندەوارانی باڵای نەتەوە و گەلانی جۆراوجۆر، مەتەڵۆك، هەجو و تەنز، گۆرانی و

ئاوازی کۆن و ڕەسەن بەرەویان هەیە، کە بێگومان دەچنە چوارچێوە و خانەی پێناسەی فۆلکلۆرەوە.

لە پەنای ئەم هەڵێنجانە کە دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتن و فامی کۆمەڵێکی کەم لە "خەڵك" یان "گشت" (FOLK)ە، دەکرێت ئاماژە بە هێندێ دەرك و تاریف بکەین کە لە پێناسەی دەستەواژەی "فەرهەنگ" (LORE)یدا پێکەوە جیاوازییان هەیە. کۆمەڵێك تەنیا ئەدەبیات و هونەر و دەسکەوتە مەعنەوییەکانی دیکەی هاوشێوە بە فۆلکلۆر پێناسە دەکەن و هێندێکی دیکەش پێناسەیەکی گشتی و هەمەگیریان خستووەتە روو، واتە سەرچاوە مادییەکانی کۆمەڵگاشیان لە چوارچێوەی ئەو پێناسەیەدا گونجاندووە.

**وشە و دەستەواژە سەرەکییەکان:**

فۆلکلۆر، ئەدەبی زارەکی، فەرهەنگ، حیماسە، ئوستوورە، پێناسە و خەسڵەتەکان.

سەرەڕای ئەو هەموو جیاوازیی و جۆراوجۆرییەی کە لەو تێگەیشتن و تاریفانەی کە لە گۆڕێدان، هەتارادەیەك هەموویان لەسەر بابەتێك کۆکن، واتە لەمەڕ شێواز و جۆری گواستنەوەی فۆلکلۆر لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، بەپێی ئەم خاڵە هاوبەشە، فۆلکلۆر بەو بەشە لە زانست و هونەر دەوترێت کە بەشێوەی زارکی و زارە و زار، لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە دەگوازرێتەوە.

**مێتۆد و ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوە:**

مەبەست لەم باسە، دەستنیشانکردنی ڕەهەندێکی بەربڵاو و گشتییە لە فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی و دەستنیشانکردنی سەرباس و تەوەرەکان، خاڵی هاوبەش، لێکچوو و جیاوازییەکان و خەسڵەتەکانیانە.

ئەم خاڵە هاوبەشە، گەرچی دەربڕی بەشێك لەم کەتوار (واقیع)ەیە، بە تەنیا خۆی ناتوانێت پێناسەیەکی کامڵ و پوخت بێت، چونکە دەکرێت زۆرێك لە مادە و نموونە خاوەکانی فۆلکلۆر وەك نموونە بێنینەوە کە بەشێوەی زارکی ناگوازرێنەوە و پەرەش دەستێنن. هەڵبەت دەکرێت ناوی ئەم جۆرە لە فۆلکلۆر بنێینە فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکیی نوێ و نەوەی ئەمڕۆ کە بەپێی سیستم و پێکهاتە و چۆنییەتی بیرکردنەوەی

مرۆڤی هاوچەرخ دێنە بەرهەم و پەرە دەستێنن، بۆ وێنە، شیعرە زارەکییەکان، رستە و شێوە رستەکان کە لەسەر کامیۆن و ترەیلی و کەرەسەکانی دیکەی مرۆڤ دەنووسرێن و بەردەوام لەناو خەڵکدا دووپات دەبنەوە، ئەمانەش دەچنە خانەی فۆلکلۆرەوە. ئەو وشە و رستە بیرەوەرییانەی کە لەسەر دار و دیوار و بەرد دەنووسرێن، نووسراوەی سەر گڵکۆ و کێلی قەبرەکان، دۆعا، تەلیسم، گرێبەست، قەباڵەی کڕین و فرۆشتنی نەریتی و وەسیەتنامە بنەماڵەییەکان و دەیان نموونەی دیکە هەموویان بەشێکی بەرچاون لە فۆلکلۆر کە تەنیا لە رێگای نووسینەوە و لەبەرکردنەوە دەپارێزرێن و بۆ نەوەکانی تر دەگوازرێنەوە.

هەروەها دەکرێت لەبارەی هونەری رەسەنی خەڵکی ئاسایی و تایبەت سەما و هەڵپەڕکێ، ئەو پێناسەیەی سەرەوە بەبڵاوتر بکەینەوە و ئەمانەش بخەینە خانەی ئەو پێناسانەوە. هەڵپەڕکێ تەنیا لە رێگای روانین و فێربوون و راهێنان و تێکەڵبوونەوە دەکرێت پەرەی پێ بدرێت، نەك لە رێگای زمانەوە.

جیا لەو بابەتانەی کە باسکران، دەکرێت ئاماژە بەو زانست و زانیارییانە بکەین کە سەرەڕای ئەوەی بەشێوەی زارەکی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێنەوە، بەڵام ناچنە خانەی فۆلکلۆرەوە.

لەناو نەتەوەی کورددا وەك یەکێك لەو نەتەوە رۆژهەڵاتییانەی کە خاوەنی سامانێکی دەوڵەمەند و بەپێزە لەم بارەوە و گەلێك سەرچاوە و مادەی خاوی فۆلکلۆرێك و ئەفسانە و ئوستوورەی کۆن و رەسەن لە دووتوێی مێژوو و ژیار و شارستانییەتیدا حەشار دراوە، لە ماوەی نزیك بە سێسەد ساڵی رابردوودا کە نووسین و خوێندنەوە لەلای ئەم نەتەوەیە برەوی پەیداکردووە، تەنیا زار بە زار و لە رێگای زەین و لەبەرکردنەوەوە ئەم سامانە خۆماڵییانەیان پاراستوە. بەپێی دەقە مێژوویی و بەڵگەی فۆلکلۆری و بەتایبەت بەیت و باو حیکایەت و داستانە رەسەنەکان ئەم شێوازە، هەرچەند هەتا رادەیەکی زۆر دەقە خۆماڵییەکانی بۆ هێشتووینەتەوە، بەڵام هەر گێڕەرەوە و بەیتبێژ و حیکایەتخوانێك بەپێی بەرژەوەندیی ناوچەیی، کات، شوێن و زۆر جاریش سەلیقە و هەندێ جاریش نەزانی و لەبیرچوونەوە، دەستکاری دەقەکانیان کردووە، کە یان کەمی کردووە یان زیاد.

ئەم شێوازە زەربەی لە هێندێ دەقی کۆن و دانسقەی کورد داوە کە ئێستا لە بەیت، یان داستان و حیماسەیەکی میللی یان مێژوویی و دڵداری چەند گێڕانەوەیەکی جیا بەرچاو دەکەوێت کە جیاوازیی و لێڵییان تێدایە.

دڵسۆزان و پێشەنگانی ئەم بوارە لەبەر نەخوێندەواری و هەست نەکردن بە گرنگیی ئەم وێژە بەنرخە، بەردەوام درێژەیان بەو کارە داوە و نەبوونی دامودەزگا و ناوەند و سیستمی خوێندن و نووسینی تۆکمە، بوونی شەڕ و ئالۆزیی کوردستان، دابڕانی زاراوەکان لە یەکتر و نەبوونی پێوەندییەکی چڕوپڕ لەناو پێکهاتە کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکان زیاتر ئەم سەرچاوانەی لێڵ کردووە و کەسیش پێشی بەو ئالۆزییە نەگرتووە.

لە ماوەی نیو سەدەی رابردوودا مامۆستا، توێژەر و خوێندەوار و فۆلکلۆرناسانی کورد بۆ خۆیان شانیان داوەتە بەر کۆکردنەوە و نووسینەوەی دەقە فۆلکلۆرییەکان و بەشێك لە ئەدەبی زارەکیی ئەم نەتەوەیەیان لە فەوتان رزگار کردووە. ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە بەر لە نووسەرە خۆماڵییەکان هێندێ لە رۆژهەڵاتناسان بەشێکی بەرچاو لە ئەدەبی زارەکی، بەتایەت بەیت، حەیران، گۆرانی و شیعرە دڵدارییەکانی هێندێ ناوچەی کوردستانیان کۆکردووەتەوە و بە زمانی ئەڵمانی، فەڕەنسایی و ئینگلیزی و رووسی وەریان گێڕاوە، کە دیسان لەو زمانانەوە کراونەتە کوردی و دواتر کەوتوونەتەوە بەچاوی خوێنەری کورد.

لێکۆڵەرانی کورد لەبەر هەر هۆیەك بووبێت، تەنیا سەرچاوە و دەقە کۆنە خۆماڵی و فۆلکلۆرییەکانیان کۆکردوونەتەوە و لە فەوتان رزگاریان کردوون. ئەوان بیریان لەوە نەکردووەتەوە کە زانستیانە و بەپێی مێتۆدی رۆژ، بابەتیانە و مەیدانی توێژینەوە لەسەر ژانرە جۆراوجۆرەکانی فۆلکلۆری نەتەوەی کورد بکەن.

هەتا ئێستاش توێژەران و فۆلکلۆرناسان و شارەزایانی ئەم بوارە نەهاتوون لە هەوێن و سەرچاوە و چاوگ و سەرهەڵدان، چۆنییەتیی بەدیهاتن، پاراستن، قۆناغەکان، گواستنەوە، زمان و جوانیناسی، لایەنی پەروەردەیی و ئامۆژگاری، شوناس و عەقڵانییەتی کورد لە فۆلکلۆر، دەروونناسی، کۆمەڵناسی، کاریگەریی کۆمەڵگاکەی خێلەکی و دەرەبەگایەتی لەسەر ئەم جۆرە لە ئەدەب، کاریگەریی سروشتی کوردستان و

نەتـەوە و وڵاتـانی دراوسـێ و... توێژینەوەیـەك مەیـدانی و هەمەلایەنـە بكـەن و بـۆ نەوەكانی ئەمڕۆ و داهاتوو بیكەنە وانە.

كەوایە ئەم بەشە لە ئەدەبی ئێمە هێشـتا بـە سەرداپۆشـراوی ماوەتـەوە و نـازانین بەشێكی زۆریان لە هەوێن و ناوەرۆكیاندا چییان تێدا حەشار دراوە كە هێشـتا نـووكی پێنووس و شنەبای هزری بیرمەندان ڕێیان تێنەكەوتووە و بە شەقڵ نەكراوی ماونەتـەوە و تەنیا بۆ پێدا هەڵگوتن و تاریفكردنیان ئازاین. فۆلكلۆر بەشێكە لـە نوسـتالۆژیا و هـەرێمی گەڕانـەوەی كـورد بـۆ رابـردوو و پاشـخانی خـۆی، لـە دووتـوێی گـۆرانی، سیاچـەمانە، لاوك و حـەیران، بەسـتە و بـەیت و لایەلایـە و چـەمەری و بەسـتە دڵدارییەكاندا چ كسپە و هاوارێك پەنگیان خواردووە؟ ئـەو مرۆڤـە نەناسـراوانەی كـە دانەر و خولقێنەری ئەم ئەدەب و هونەرەن ویستوویانە چی بە ئێمە بڵێین، خولیاكانیان چی بووە، چۆن ژیاون؟ كە دەكرێـت بـە شـیتەڵكاری و توێژینـەوەی بابەتـەكانیان لـە رابردووی تاریكی مێژووی هزری نەتەوەكەمان بگەین.

لێرەدا بەپێی چوارچێوە و تایبەتمەندیی فۆلكلۆر و ئەدەبی زارەكیی هەر نەتەوەیەك كۆمەڵێك رەهەند و سەرباس دەخەینە روو و لە سەرچـاوە و چـۆنییەتیی پەیـدابوون و گواستنەوە و قۆناغی مێژوویی و كۆمەڵایەتییەكانی ئەدەبی فۆلكلۆر دەكۆڵینەوە، كـە زیاتر ئاراستەیەكی گشتی بەخۆیەوە دەگرێت، نەك تایبەتی:

ئەو بابەت و چەمكانەی كەلە توێژینەوەی فۆلكلۆردا دەبێت بخرێنە روو:

یەك لە بابەتە بەرباسەكانی فۆلكلۆر ئەدەبیاتی زارەكییە، كە خۆی بە چەند جۆری جیاواز دابەش دەبێت:

ئوستوورەكان، حیكایەتە ئوسـتوورەییەكان، ئەفسـانەكان، حیكایـەتی پاڵـەوانی، حیكایەتە راستەقینەكان، راز و چیرۆك، سـەربوردە، پەنـد، كـە هەركامـەیان خـاوەنی پێكهاتە، بابەتی دیاریكراو و جیاواز لە یەكترن. لە هەمان حاڵدا هەركام لـەو ژانرانـە بۆ خۆیان بەسەر چەندین بەش و لقی بچووكتردا دابەش دەبن. تایبەتمەنـدیی هاوبەشـی نێوان جۆرە جیاوازەكانی ئەدەبی زارەكی، دەبڕی رەوایی بوونیانە.

دەستەیەكی تر بریتیتن لە: ئاواز و گۆرانییەكان، هەڵبەست و هۆنراوە، دووبەیتی و تاكە بەیت، چەمەری و شین و شەپۆڕ، شیعری لاواندنەوە و تازیەباری و...

تایبەتمەندیی ئەم جۆرە لە فۆلکلۆر کێش و سەروادار بوونیانە.

دەستەیەکی دیکە بریتییە لە: مەتەڵەکان، پەند و ئامۆژگاری، مەتەڵ، تەتەڵەی زمان، یارییە زمانییەکان، قسەی سەرزاران. ئەوەی کە لەم بەشەدا باسیان لێوە کرا، هەرکامەیان لایەنگەلێك لە ئەدەبی جەماوەریان تێدایە.

بەشێکی دیکە لە فۆلکلۆر، بریتییە لەو دەستە لە دابونەریت و رێورچە مەزهەبی و ئایینییەی کە لەلای جەماوەر و خەڵکی ئاسایی باوە، بەبێ ئەوەی کە لە مەزهەبە فەرمییەکاندا هێما و نیشانەیەکیان هەبێت، وەکو جۆرە جیاوازەکانی سفرە رازاندنەوە، کە لەوانەیە هێندێ لەم دابانە تەنانەت لەلایەن بەشێك لە مەزهەبە فەرمییەکانەوە قەدەغەش کرابن. وەکو جۆرێکی دیاریکراو لە تازییەباری بۆ رێبەر و کەسایەتییە پیرۆزەکان (قەمە و تیغ وەشاندن) لەلای شیعەکان بۆ ئیمام عەلی و حەسەن و حوسێن و لەلای پێڕەوانی سوننەش تەریقەتەکانی نەقشبەندی و قادری و تاڵەبانی بۆنە و رێورەسمی لەم چەشنەیان هەیە.

جێژنە مەزهەبییەکان بۆ خۆیان جۆرێکن لە فۆلکلۆر و دابی کۆن، وەکو جێژنی رەمەزان و قوربان، لەدایکبوونی پێیغەمبەر، مەولوودی خوێندنەوە (مانگی مەولوود) و سەردان و بەسەرکردنەوەی دۆست و ئاشنا و خزمان لەم بۆنانەدا (هەرچەند لە بنەڕەتدا زۆرێك لەم بۆنە ئایینیانە موڵکی بەشێك لە نەتەوەکان نین، بەڵام بەهۆی تێکەڵاویی فەرهەنگی و پێکەوە ژیان و زۆر جاریش بە زەبر بەسەریاندا سەپاوە و بوونەتە بەشێك لە فەرهەنگ و پێوەندیی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگاکان).

بەشێکی تر لە فۆلکلۆر، بریتییە لە: دابونەریت و بۆنەی تایبەت بە زەماوەند و گۆڤەندەکان کە لەلای نەتەوەی کورد ئەمە زۆر رەسەن و خۆماڵی و خۆجێی ترە وەکو: خوازبێنی، قەتح و بڕ، دەست ماچکردن، دەزگیرانی و جۆرەکانی هەر ناوچەیەك بەپێی نەریتی خۆی، ناودێرکردنی کچ و کوڕ هەر بە منداڵی بۆ یەکتر، زەماوەندی زۆرەملێ کچە مام و کوڕە مام، خەتەنەکردن، جێژن گرتن، داوەت و شێوازەکانی، حەمام بردنی بووك و زاوا، برا زاوا، بەربووك، شەوگەڕی زەماوەند و یارییەکانی، دەلاکی و حەکیم باشی، دکتۆرە خۆماڵییەکان، کاری مامانی، ناوك بڕینی منداڵان، دۆعا و وێرد بۆ ئەو ژنانەی کە دێر لە منداڵ بوون دەبنەوە، یان نەزۆکن، شوشتنی منداڵ، ناونانی منداڵ و چۆنییەتیی هەڵبژاردنی ناو و بانگ بەگوێدا دان.

تەوافکردنی شوێنە و مەزارگە پیرۆزەکان، دابەکانی پێش لە سەفەر، ئاشتی و ئازا و حەلالکردنی یەکتر و لێبووردن.

- چوارشەممە سووری، نەورۆز، میری نەورۆزی، ڕێورەسمی کۆسە، سەردان و بەسەرکردنەوە، نەورۆزانە دان و نەورۆزانە وەرگرتن، سیزدەبەدەر، کردنەوەی گرێی بەخت.

- تازیەباری و بۆنەکانی، سێ ڕۆژە، حەفتە، چلە، ساڵوەگەڕ، جێژنانە، قوربانی و جۆرەکانی و دابەشکردنی گۆشتی قوربانی و خێر و خێرات، مەرگ و چۆنییەتیی تازیەباری بۆ لاو و جوانەمەرگەکان، وەکو: سەر رووت کردن، زولف و کەزیە و گۆنا رنین و لاواندنەوە و بالوورەی تایبەت بە لاوان و جوامێران، ڕێورەسمی تایبەت بە پیاوان و ژنان کە لەلای هێندێ لە هۆز و تایفە و خێڵەکان جیاوازیی هەیە.

- بەشێکی زۆر لەم بۆنە و دابونەریتانە تێکەڵن بە بیرکردنەوەی خورافە و نەگونج کە لەگەڵ عەقڵ و ئاوەزی مرۆڤدا ناگونجێت و عەقڵانییەت و لۆژیکێك لە پشتیانەوە نییە، بۆیە ئەمڕۆکە ئیدی لەلایەن نەوە و مرۆی ئەمڕۆوە زۆرێکیان وەلا نراون و ئەنجامدان و بەجێگەیاندنیان بە ڕەوا نازانن و جیاوازیی بیروڕا لەمەڕ دروست و هەڵە بوونیان لە گۆڕێدا هەیە، وەکو:

- سیحر و جادوو ڕەماڵی، فاڵ گرتنەوە، دۆعا و ویرد، شێوازەکانی نواندنی خۆشەویستی، خاك و تەبەڕەکی زیارتگا و شوێنە پیرۆزەکان، گەسك لێدان، ناخوێن گرتن، ترسان لە تاریکی و قەبرستان، دێو و درنج، نان و نمەك و حورمەت، خەون گێڕانەوە، گیانلەبەران و بیروباوەڕی جۆراوجۆر لەبارەیانەوە (سەگ بە وەفایە هەمیشە دۆعا دەکات خاوەنەکەی تەمەنی درێژ بیت، بەڵام پشیلە سپڵەیە و ئاواتی مەرگی ساحێب ماڵە).

- وەرزێری و جووتیاری، شێوەکانی داچاندن و وەشاندنی تۆو و هەڵگرتنەوەی بەرهەم، دابەشکردنی بەرهەم و دانەوێڵە، دۆعای تایبەت بە سەرخەرمان، جێژنی خەرمان، شێواز و دابەشکردنی نۆرەی ئاودێری، چۆنییەتیی دانی مزدی میراو، ناوە خۆماڵییەکانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان، ئایین و بۆنەکانی بارانبارین (بووکە بارانە) و بۆنە و ئایینی باران بڕینەوە.

- ئاژەڵداری، ناوی خۆماڵیی ئاژەڵەکان، لەوەڕاندنی ئاژەل و مێگەل، شوان گرتن، نۆرە مێگەل، خواردن و خۆراکە تایبەتە خۆماڵییەکان، مانگا و مەڕدۆشین، مەشکەژەندن، رانەبێرە، بێری و ئەوینی نێوان شوان و بێری کە لە بەیتە کوردییەکاندا زۆر باسیکراوە.

- جۆر و شێوازە جۆراوجۆرەکانی یاریی خۆماڵی و ناوچەیی، یاریی منداڵان و گەورە ساڵان، شیعر و هۆنراوەی کاتی یاری، یاریی و کایەکانی شەوانی زستان و شەوچەرە و دابونەریتەکانی تایبەت بە شەوی چلە، ئەفسانە و ئوستوورەکانی تایبەت بە دابەشکردنی وەرزی زستان، چلە گەورە، چلە بچکۆلە، خاتوو زمهەریر و...

هەرکام لەو بۆنە و ئایین و دابونەریتانە لە هەر ناوچەیەکی ئێران و کوردستان و وڵاتانی دیکە لێکدانەوە و پێناسەی جیاواز و تایبەتیان هەیە و زۆرێك لەو بۆنە و نەریتانە هێندە بەنرخ و دەوڵەمەندن کە دەکرێت نامیلکە و کتێبی تایبەتیان لەبارەوە بنووسرێت و توێژینەوەی سەربەخۆیان لەسەر ئەنجام بدرێت.

هەروەك لە ناوەرۆك و هەوێنی هەرکام لەو فۆلکلۆر و نەریتە تایبەتییانەدا دەردەکەوێت، دەکرێت فەرهەنگی گشتی و جەماوەر بە دوو بەشی سەرەکیی ١- زانستی گشتی. ٢- ئەدەبیاتی گشتی دابەش بکرێن. بە واتایەکی تر، فەرهەنگی جەماوەر لەلایەك لەگەڵ مرۆڤناسی و لەلایەکی دیکەشەوە لەگەڵ ئەدەب لە پێوەندیدایە. بۆ نموونە ئەو بەشانەی کە پێوەندییان بە دابونەریت، ئایین، بیروباوەڕەکان، جێژن و بابەتی لەم چەشنەوە هەیە، زیاتر لە گشت بە مرۆڤناسییەوە نزیکن و بەشگەلێکی وەکو: ئەفسانەکان، ئوستوورە، حیکایەت، گۆرانی، هۆنراوە، پەند و قسەی نەستەق و ئامۆژگاری و... دەچنە خانەی پێناسەی ئەدەبیاتەوە. هەر ئەم مەسەلەیە بووەتە هۆی هاتنەئارای باسی جیدی و چڕوپڕ لەلای بیرمەندان و تیۆری داڕێژانی فەرهەنگ و هونەر و ئەدەبیات و هەروەها لەمەڕ خاڵە هاوبەش و جیاوازییەکانیان توێژینەوە و بەرهەمی بەنرخ نووسراوە.

ئەمڕۆکە فەرهەنگی جەماوەر لە زۆرێك لە وڵاتانی ئەورووپا، ئەمریکا، هیند و وڵاتانی یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو، وەك زانستێکی سەربەخۆ کەوتووەتە بەر سەرنج و لە سیستمی خوێندنی زانستگاییدا شوێن و پێگەیەکی بەرزی هەیە و کۆلێژی تایبەتی بۆ تەرخانکراوە.

خالێکی دیکە کە دەکرێت لە پێکهاتە و بەشەکانی فۆلکلۆردا ئاماژەی پێ بکرێت، ئەوەیە کە ئەو بەش و لایەنە جۆراوجۆرانەی کە باسیان لێوە کرا، دەربڕی هەست و نەست، بیروباوەڕ، کردار و ئاوات و خۆزگەی هەر نەتەوەیەکن و لە هەناو و جەوهەری ئەو نەتەوە و گەلەوە سەرچاوەیان گرتووە، بە واتایەکی تر پێناسەی نەتەوەن.

## فەرهەنگی فەرمی و نافەرمی:

ئەو پرس و بابەتانەی کە لێڵن و بە ئاسانی لە فەرهەنگی فەرمیی نەتەوەدا دیار ناکەون، دەکرێت بە تاوتوێ و لێکدانەوە و شیتەڵکاریی فەرهەنگی گشتی، دەستمان پێیان رابگات. لەم رووەشەوە لێکدانەوەی (فەرهەنگی نافەرمی)یش بۆ فۆلکلۆر بەکار دەبرێت. هەر بەم بۆنەیەوە، دەبێت بڵێین کە خوێندنەوەی هەر کۆمەڵگایەك، ئەوکات رەوایە و دەگونجێت کە بەرەنجامی ئەرێنیی لێدەکەوێتەوە، کە جیا لە تاوتوێی فەرهەنگی فەرمی، بواری "فەرهەنگی نافەرمی"یش بگرێتەوە.

"یەکێك لە هۆکارەکانی پرۆسەی مەیدانی لە بواری توێژینەوە زانستییەکاندا، دەرك و فام و کردنی ئەم زەروورەتانەیە. ئەگەر فەرهەنگی کۆمەڵگایەك بە باڵندەیەك بچوێنین، فەرهەنگی فەرمی و فەرهەنگی گشتی (نافەرمی)، دوو باڵی ئەو باڵندەیەن. هەوڵدان بۆ ناساندنی هەر کۆمەڵگایەك، ئەگەر بێت و تەنیا پشت بە فەرهەنگی فەرمی ببەستێت، هیچ بەرەنجامێکی نابێت، تەنانەت ناسینی فەرهەنگی فەرمیی کۆمەڵگا کاتێ دەوێت کە فەرهەنگی گشتی (نافەرمی) ئەو کۆمەڵگایە، بە رێکوپێکی تاوتوێ بکرێت و بە وردی بناسرێت، چونکە فەرهەنگی گشتی دەق و هەیکەلی سەرەکیی ژیانی تاك پێك دەهێنێت، کەوایە لەسەر زۆربەی حاڵەت، رەفتار، ئاکار و ئەندێشە مرۆییەکان کاریگەری دادەنێت و و لەم سۆنگەیەشەوە فەرهەنگی نافەرمی بێ کاریگەر نامێنێتەوە.

## تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیاتی زارەکی:

ئایا دەکرێت باس لە تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئەدەبیاتی زارەکی بکرێت؟ ئەو تایبەتمەندییانەی کە بکرێت لە دەقە زارەکییەکانی نەتەوە و گەلانی جیاوازدا دەقی هاوچەشن و راستییەکانی بسەلمێنین؟ ئەگەر وەڵامی ئەم پرسیارە ئەرێ بێت، ئەم

تایبەتمەندییانە کامانەن و بۆ لێکۆڵەران و توێژینەوە زانستییەکان چ قازانجێکیان هەیە؟

ئەو خوێندنەوە و راڤە و توێژینەوانەی کە لە ماوەی یەك سەدەی رابردوودا، لەبارەی دەقە زارەکی و رەسەنەکانی نەتەوە و گەلانی جۆراوجۆرە ئەنجام دراون، لێکۆڵەرانی بەو ئەنجامە گەیاندووە و رێنوێنیی کردوون کە ئەدەبیاتی زارەکی هەڵگری تایبەتمەندیی زانستین، کە دەکرێت لە دووتوێی دەقە جۆراوجۆرەکاندا نموونەیان بهێنینەوە و بەرجەستەیان بکەین.

هێندێ لە تاوتوێ، توێژینە و خوێندنەوەکان لەبارەی ژانرێکی تایبەت و دیاریکراوی ئەدەبیاتی زارەکییەوە ئەنجامدراون و هێندێکی دیکەش بەگشتی بەرهەمە پەخشانی و شیعرییەکان دەگرنەوە. نموونەی یەکەم دەتوانین ئاماژە بەو خوێندنەوانە بکەین کە لەسەر ئەفسانە و پۆلێنبەندییان بە ئەنجام گەیشتوون. بەشی دووەم ئەو لێکۆڵینەوانەن کە لەمەڕ بەرهەمە شیعری، حیماسی و کێش و سەرواداوەکان جێبەجێ کراون.

ئەوەی کە هەتا ئێستا توێژەران لەبارەی تایبەتمەندیەکانی ئەدەبیاتی زارەکییەوە خستوویانەتە روو، بە ئاسانی دەکرێت لە ئەدەب و فەرهەنگی گەلاندا ئاماژەیان پێ بکرێت، ئێمە لێرەدا هێندێ لەم تایبەتمەندییانەی کە زیاتر بەرجەستەن، هێمایان پێ دەکەین:

**نادیاربوونی دانەر و هۆنەر:**

دەقە زارەکییەکان، پێچەوانەی بەرهەمە نووسراوەکان کە بەرهەمی داهێنانی فکر و زەینی تاکێکی دیاریکراون، دانەر و نووسەرێکی دیار و تایبەتیان نییە.

هیچکام لە حیکایەتە زارەکییەکان کە لەلای خەڵکی ئێمە، تەنانەت ئەو راز و سەربوردە و حیکایەتە کوردییانەش کە فۆرم و قەوارە و چۆنییەتی دارشتنیشیان دروستە، خاوەنی دانەر و نووسەرێکی دیار نین. لە کۆتایی هەر دەقێکدا دەبینین ناوی کۆکەرەوە، گێڕەرەوە، یان سەرچاوەی دەرهێنراو دەنووسرێت، نەك هۆنەر و نووسەرێکی دیاریکراو.

بۆ وێنە لە سەرەتای هەر حیکایەت و ڕاز و سەربوردەیەکی زارەکیدا چ لە کاتی گێڕانەوە، یان لە کاتی خوێندنەوە و نووسینیشدا ئەم ڕستە و دەستەواژانە بەکاردەهێنرێن: (دەگێڕنەوە، وا هاتووە، وایان گێڕاوەتەوە، وا باسە، وتوویانە، دەڵێن، وام بیستووە، دەڵێن کە، هەبوو نەبوو، و ...).

زۆری و بەرفراوانیی گێڕەرەوە و جەماوەریبوونی ئەدەبیاتی زارەکیی، دۆخێکی وای خولقاندووە کە زۆرێك لە دەقەکان لێڵ و ئاڵۆز و خاوەنی چەند گێڕانەوە بن.

ئەوی ڕاستی بێت، هیچ دەقێك لەخۆڕا نایەتە بەرهەم ئیلا ڕووداوێك، ئەفسانەیەك، شادی و خەم و سەربوردەیەکی لە پشتەوە نەبیت، بێگومان لەلایەن کەسێکیشەوە دانراوە، بەڵام هەتا ئێستا ڕوون نەبوونەتەوە کە ئەو کەسانە کێن و بێ ناو و نیشان ماونەتەوە، لە وەها دەقگەلێکدا، بەو هۆیەی کە چەندین سەدە لەدوای یەك لەناو خەڵك و لە ناوچەی جۆراوجۆر گێڕدراونەتەوە، گۆڕان و کەمی و زۆری بەرفراوانیان تێدا بەدیهاتووە و هەم لەباری فۆم و هەم لەباری ناوەڕۆکەوە دەستێوەردانی جێی سەرنجیان تێدا کراوە.

دەقە زارەکییەکان لە ماوەی سەدان ساڵدا، سینگ بە سینگ و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گوێزراونەتەوە، لە هەر قۆناغ و سەردەمێکدا بەپێی بارودۆخ و مەکان، برگە و بەشگەلێکیان لێ کەم کراوە، یان پێیان زیاد کراوە، ئەدەبی زارەکی بەردەوام لە حاڵی گۆڕان و فۆرم گۆڕیندا بوون و لەگەڵ چاخەکان گونجێنراون. ئەو بەشانەی کە لەگەڵ ڕۆحی زەمانەدا هاتوونەتەوە لەبەر کراون و ماونەتەوە و ئەو بەشانەش کە نەدەگونجان و ناتەبان بوون، لەناوچوون و لەبیر کراون.

گێڕانەوەی هەر دەورە و قۆناغێك، دەربڕی ڕۆح، ماریفەت و ویژدانی گشتیی هەمان چاخ و سەردەم بووە، دەکرێت ئەم بابەتە بەم چەشنە باس بکرێت کە حیکایەتخوان و گێڕەرەوەکان بەو هۆیەی کە حیکایەت، بەیت، ڕاز و سەربوردە و ئەفسانەی زۆریان لە زەین ڕاگرتووە، زۆرجار لەبیریان چووەتەوە، تێکەڵیان کردوون، یان بەپێی بارودۆخی تایبەت و لەکاتی گێڕانەوەی حیکایەتەکاندا، برگەگەلێکیان پێ زیادکردوون، یان لێیان پەڕاندوون کە بەپێی تێگەیشتنی خۆیان وایان پێ باش بووە کە لەگەڵ زەمانە و ئەو دۆخەدا دەگونجێت.

## جۆری گواستنەوە:

پێچەوانەی ئەدەبی نووسراو، بیچم و فۆرمی ئەدەبیاتی زارەکی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر لە ڕێگای زار، یان بەو چەشنەی کە باوە، واتە سینگ بە سینگ ئەنجام دەدرێت. ئەم بابەتە دەبیتە هۆی بەستێن و ڕەخسێنەری شکڵ و فۆرمگرتنی گێڕانەوەی جۆراوجۆر لە دەقێك، جا چ ئەفسانە، حیکایەت، پەند، مەتەڵ یان چیرۆکی درێژ بێت. کەم دەقی زارەکی لەناو ئەدەبی کوردیدا بەرچاو دەکەوێت کە لە دوو گێڕانەوەی جیادا بە تەواوەتی بەشەکانی پێکەوە هاوسەنگ و بە تەواوەتی لێك بچن.

ئەم بابەتە تەنانەت لەبارەی ئەو دەقە زارەکیانەشەوە کە نووسراونەتەوە، وەڕاست دەگەڕێ. فۆلکلۆرناسان و شارەزایانی ئەدەبی زارەکی لەو باوەڕەدان: "هۆی ئەم جیاوازییانە لەوەدایە کە لە گواستنەوەی هەر حیکایەت و دەقێکدا هەر حیکایەتخوان و بەیتبێژێك بەپێی مەیل و سەلیقەی خۆی و بەو چەشنەی کە لە مامۆستاکەیەوە فێر بووە، هێندێ بڕگە و دەستەواژە و ڕستەی لێ کەم یان زیاد کردووە و بۆ ڕازاندنەوەی ڕەوتی داستانەکە، دەستی داوەتە گێڕانەوە، یان نووسینەوەی دەقێکی تازە، کەوایە دەق لە نەوەیەکی دیکەدا هێندێ ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و بەم بۆنەیەوە، یەك دەق چەند گێڕانەوەی جیاواز و جیا لە یەکتری هەیە".

## هۆیەکانی جیاوازیی گێڕانەوە:

جیاوازیی گێڕانەوە لە دەقە زارەکییەکاندا بەستراوەتەوە بە چەند هۆی وەك: ڕەگەز، تەمەن، کار و پیشەی گێڕەرەوە، بەردەنگ و گوێگران و ئەو شوێن و زەمەنەی کە دەقەکەی تێدا دەگێڕدرێتەوە. هەرکام لەو هۆیانە کاریگەرییەکی بەرچاو لەسەر هەر گێڕانەوەیەك دادەنێن. بۆ وێنە لەو مەجلیس و دیواخانانەی کە منداڵ و مێرمنداڵی تێدا بوو بێت، گێڕەرەوە لە بەکارهێنانی وشەگەلی پەتی لەناو دەقەکە خۆ دەبوێرێت. حیکایەتە دڵداری (ئیرۆتیك)ەکان لەلایەن پیاوانەوە بۆ بەردەنگی پیاو و لەلایەن ژنانیشەوە بۆ بەردەنگانی ژن دەگێڕدرێنەوە.

تەمەنی حیکایەتخوان و گێڕدەوە، لە ڕەوتی گێڕانەوەدا کاریگەریی بەرچاوی لەسەر بەردەنگ و جێگیربوونی لەناو کۆمەڵدا دەبێت. بۆ وێنە ئەگەر حیکایەتێك تەنانەت لەناو یەك بنەماڵەدا کە سێ نەوەی تێدایە، واتە باپیر کە هەشتاد ساڵیەتی و

کوڕەکەی کە زیاتر لە پەنجا ساڵە و نەتیجەی ئەو دوو کەسەش کە زیاتر کە تەمەنی سی ساڵە بە جیا بگێڕدرێتەوە، بەپێی ئەزموون دەردەکەوێت کە جیاوازی لە گێڕانەوەی هەرسێکیاندا هەیە و ئەوەی باپیر لە هەموویان رەسەنتر و جێگیر ترە، چونکە لێکدانەوەکان، وەسفەکان، ئەو وشە و دەستەواژانەی کە هەرکام لەو گێڕەرەوانە کە هەرکامەیان سەر بە نەوەیەکی کۆمەڵن، پێکەوە جیاوازە.

تەکنیك و شارەزایی و چۆنییەتی گێڕانەوەی بەیت، حیکایەت و راز و سەربوردەکان، لەحن، سۆز و ئاواز، سیما و روخسار و ئەو حەرەکەتانە و تەنانەت گۆڕینی دەنگ بۆ هەر کاراکتێرێکی داستانەکە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر بەردەنگ و گواستنەوەی دەقەکان هەیە، ئەمانە ئەو هونەرانەن کە حیکایەتخوان و بەتبیژەکان دەبێت رەچاوی بکەن.

**سەرچاوە و هەوێنی دەقە زارەکی و فۆلکلۆرییەکان:**

ئەدەب وەك ژانرێکی هەمەگیری کۆمەڵایەتی هیچکاتێ لە سنوور و ناوچەیەکی دیاریکراودا قەتیس نەماوە و سنوورە دەستکردەکان و بیاڤە جوگرافیاییە جیاجیاکان نەیانتوانیوە پێش بە پەرەسەندنی بگرن. بەتایبەت ئەدەبی زارەکیش، چونکە لە رێگای هەموو مرۆڤێکی ئاسایی و بەتایبەت لە کاتی کار و بازاڕ و سەفەردا لەگەڵ خۆی گێڕاویە و بەکاری هێناوە و هاوکات دابونەریت، فۆلکلۆری ناوچەیەکی تریش فێر بووە.

لە رابردوودا وەکو ئەمڕۆ وڵات و ناوچەکان سنووربەندی نەکرابوون و هەرێمی جیاجیا نەبووە و دیاردەیەك بەناو کۆچ و رەوەند و فەرهەنگ و ژیانی لادێ و هاتوچۆ بۆ ناوچەی جیاجیا بووەتە هۆی بەربڵاویی ئەدەبی زارەکی و گواستنەوەی بۆ ناوچەیەکی بەربڵاوتر.

هەر بۆیە دەزانین لە رابردوودا جوگرافیا نەیتوانیوە پێش بە پەرەسەندنی ئەدەبی فۆلکلۆر بگرێت. بۆ نموونە: حیکایەت، ئەفسانە، پەند، مەتەڵ، حیکایەت، راز و مەسەلی وا هەیە نەك تەنیا لەناو یەك نەتەوەی هاوبەش و لە ناوچە و شارە جیاوازەکانی وەك یەکن، تەنانەت لەناو نەتەوەکانی دیکەش بە هێندێ جیاوازییەوە هەمان ئەو دەقانە هەن، کەوایە ناوچەیەکی تایبەتی جوگرافیایی بە تەنیا ناتوانێت سەرچاوە و هەوێنی ئەدەبی زارەکی بێت. فۆلکلۆرناسان لەو باوەڕەدان سەرچاوەی

ئەفسانە و حیکایەتەکان و ئەدەبیاتی زارەکی لە بیاڤی جوگرافیایی شارستانییەتێکدایە، یان هێندێ جار لەناو سنووری نەتەوەیی یەك وڵاتدان.

**دوو پاتبوونەوە:**

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی دەقە زارەکییەکان، مەسەلەی دووپات بوونەوەیە. لەناو پێکهاتەی ئەدەبیاتی زارەکیی هەر گەل و نەتەوەیەك و بە واتایەکی روونتر، لە سنووری جوگرافیایی شارستانییەتێکی تایبەتدا دەکرێت بنەما، هەوێن و سەرچاوەی یەکدەست و هاوشێوەی دیاریکراو دەستنیشان بکەین کە بەشێوەی پەیوەستە تێیدا دەقگەلێك دووپات دەبنەوە. بۆ وێنە لە بیاڤی شارستانییەتی رۆژهەڵاتی ناڤین، ئێران، ماد، میزۆپۆتامیا، سۆمێری و کوردستان، هێندێ دەقی زارەکیی دووپاتەکراوەی بەردەوام دەبینرێن، کە دەتوانین لەناو فارسەکاندا ئاماژە بە رۆستەم و سوهراب و لەناو کوردیشدا ئاماژە بە ئەفسانەی کاوەی ئاسنگەر، بەیت و چیرۆکە شیعری دلّداریی وەك: عەزیز و کوبرا، وەنەوش و بەرەزا، حیکایەتی کورە کەچەڵ، گۆرانیی لیریکی و... بکەین.

بەتایبەت لەناو ئوستوورە، ئەفسانە و حیکایەتەکان لە بیاڤی ئەدەب و دەقە زارەکییەکانی ئێران و کوردستان، دەکرێت ئاماژە بکەین بەم توخم و مۆتیڤانە، کە رەگی دووپاتبوونەوەیان تێدایە.

- سەرکەوتنی منداڵە بچووکەکان و بەخیلیی برا و خوشکی گەورە بەو سەرکەوتنانە و بوغز و قین و تۆڵە ئەستاندنەوە.
- عاشقبوونی قارەمان بە بیستنی وەسفی جوانییەکانی کچی پاشای وڵاتێکی تر.
- رووبەڕووبوونەوەی ماری سپی و رەشمار و رزگارکردنی ماری سپی لەلایەن رێبوارێکەوە کە زۆرجار هەژار و دەروێشە.
- بوونی پاشایەك کە سەرەڕای ئەوەی پیر بووە، منداڵ و (بەتایبەت کوڕ)ێکی نییە.
- دەروێشێك کە بە دانی میوەی شیفابەخش، گرفتی نەزۆکیی ژنی پاشا چارەسەر دەکات.
- بوونی پەری لە پێستی کۆتردا کە دەبێتە رێنوێن و رێ نیشاندەری قارەمانانی ئەفسانەکان.

- عاشقبوونی شازاده له خەوندا.

- عاشق و دڵبەستەبوونی قارەمانانی هەژار و دستەنگ بە کچی خان، میر و پاشا کە ئەمە لە بەیت و ئەفسانەکاندا زۆرە.

- لەو دەقانەی کە خاوەنی ریتم و کێش و سەروان، وەکو دوو بەیتییەکان دەکرێت ئاماژە بە هەوێن و توخمی هاوبەشی وەکو: "غوربەت، یاری بێ وەفا، دووری، دڵتەنگی و ..." بکەین.

رەگ و توخمی دووپاتبوونەوە نەك تەنیا لە دەقە زارەکییەکانی دەڤەر و شارستانیەتێکی کولتووریدا دەبینرێت، بەڵکو لە دەقێکی سەربەخۆشدا دووپاتبوونەوە بەرچاو دەکەوێت.

زۆرێك لە توێژەرانی ئەدەبی زارەکی، ئاماژەیان بە بابەتی دووپاتکردنەوە کردووە، بۆ وێنە "ئەیتالۆ کالوینۆ" کە چەندین ساڵ لەبارەی ئەفسانە ئیتاڵییەکانەوە توێژینەوەی کردووە، لەم بارەیەوە نووسیویە: "تەکنیك و تایبەتمەندیی نەریتی زارەکی لە دووپاتبوونەوەی مۆتیف و توخمەکانیدایە".

## زمان:

خەسڵەتێکی دیکەی ئەدەبیاتی زارەکی، زمانەکەیەتی. ئەم زمانە، هەمان زمانی رۆژانە و ئاسایی خەڵکە کە پێشینیان بە ناوی "زمانی سەوق" ناودێریان کردووە. هەمان ئەو زمانە زیندووەی کە خەڵك لەناو بازاڕ و شار، لەناو گوند و لە کاتی کار و تێکۆشاندا وەکو ئامرازی پێوەندی لەگەڵ بەرامبەر بەکاریان هێناوە.

"ئەم تایبەتمەندییە لە دووتوێی ئەو کۆمەڵە دەقە زارەکییانەی کە نووسراونەتەوە، بە تەواوەتی پارێزراوە. لەو دەقانەدا رستەکان سادە، کورت، بێ گرێ و گۆڵ و هێندێ جار پچڕ پچڕن. لەو رستانەدا واژەکان و هێندێ جار کردار دووپات دەبێتەوە. ئەو بیرۆکە و لێکدانەوە مەجازییانەی کە تێیدا بەکار دەهێنرێت، بەدوور لە زەین نییە و لەو ئاستەدایە کە خەڵکی ئاسایی، لە کاتی قسە و ئاخاوتندا زۆر بەشێوەی کینایە، مەتەڵ و تەتەڵەی زمان بەکاری دەهێنن".

### پەروەردە:

پەروەردە و بارهێنان و گواستنەوەی ئەزموونە مرۆییەکان بۆ دیتران و بەتایبەت مندالآن، یەکێکی ترە لە تایبەتمەندییەکانی ئەدەبیاتی زارەکی. ئەم تایبەتمەندییە لە ژانر و لقە جۆراوجۆرەکانی ئەم جۆرە لە ئەدەبدا، هەلّگری گرنگیی یەکسان نییە، لە هێندێکیاندا ئامانجی پەروەردە، بەشێوەی ئاشکرا بەرچاو دەکەوێت و لە هێندێ دەقی دیکەشدا ئەم ئامانجە شاراوەیە، وەکو پەندەکان کە بە روونی توخمی پەروەردە و بارهێنان بەسەریاندا زالّە و لەناو ئەدەبی زرەکی و فۆلکلۆری کورددا ئەم خالّە زەق و بەرچاوە.

### ئەنجام:

بەپێی ئەوەی کە لەم وتارەدا باسکرا، دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە فۆلکلۆ و ئەدەبی زارەکی و فەرهەنگی گشتی، هەلّگری بیروباوەر، داب و شارستانییەت و جیهانبینیی نەوەکانی پێشووی هەر گەل و نەتەوەیەکە و بە لێکۆلّینەوە و توێژینەوەی وردی کۆمەلّناسانە و دەروونناسانە لەسەر بنەمای مێتۆدی و زانستی باس و توێژینەوەی ئاکادیمی بەشێوەی پۆلێنکراو، دەتوانین لە عەقلّ و هزر، مێژوو و شارستانییەتی نەوەکانی پێشوو و پێشینیانی نەتەوەکەمان بگەین.

بە لێکۆلّینەوەی ئەمرۆییانە و بەکارهێنانەوەیان لە دەقی نوێ و هاوچەرخدا بیکەینە سەرچاوە بۆ پاشخانی رابردوو.

زانیاری لەمەڕ تایبەتمەندی و خەسلّەتی لق و ژانرە جیاوازەکانی فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی، دەبنە سەرچاوە بۆ توێژینەوە و لێکۆلّینەوە ئەدەبی و کۆمەلّناسییەکان و شارەزابوون لە پێکهاتەی کۆمەلآیەتی و مێژوویی رابردوومان.

### سەرچاوەکان:


١- داد، سیما، دەستەواژە و زاراوە ئەدەبییەکان، چاپەمەنیی مروارید، ١٣٧٧.

٢- میرسادقی، جەمال و مەیمەنەت، واژەنامەی هونەری چیرۆکنووسی، کتێبی مەهناز، ١٣٧٧.

٣- له چەند وتارێکی سادق هیدایەت، دکتۆر فەرەیدوون وەهمەن و نەجەوی شیرازی بۆ پێشبار و سەرباسی پێوەندی دار بە فۆلکلۆر کەڵك وەرگیراوە.
٤- جەعفەری قنواتی، محەمەد، وتار، لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە ئەدەبی زارەکی، ئینتەرنێت.
٥- وەرزنامەی فەرهەنگی خەڵك، ژمارەکانی ٢٥ و ٢٦ بەهار و هاوینی ١٣٧٥ی هەتاوی.
٦- پایانیانی، سەلاح، فەرهەنگی ئەدەبی زارەکیی موکریان بەرگی ١ و ٢، ١٣٨٥، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رەهرەوی مەهاباد.
٧- بەحری، ئەحمەد، گەنجی سەر بەمۆر، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.
٨- گۆڤارەکانی: سروە، ئاوێنە، مەهاباد و رامان.

## پێگەی ژن لە ئەدەبی زارەکیی کوردیدا

ن: کریستیەن ئالیسۆن
و. لە ئینگلیزییەوە بۆ فارسی: فەریدە فەتاحی قازی
و. لە فارسییەوە: کامیل نەجاری- بۆکان

بۆ توێژەری کورد، "فۆلکلۆر" رۆڵێکی گرنگی لە کولتووری نەریتیدا هەیە. لە پێناسەکردنی فۆلکلۆردا وەك کۆگایەك لە زانست و هزرین، ئاماژە بەوە کراوە کە فۆلکلۆر بەشێکی بەرچاو لە ژیانی کوردان لەخۆ دەگرێت و هێزێکە کە کۆمەڵگایەکی نەریتی پێکەوە دەبەستێتەوە. ئەگەرچی لەم رۆژگارەدا ژمارەی ئەو کەسانەی بەشێوەی نەریتی لە گوندەکان دەژین، رووی لە کەمی داوە، سەرەڕای ئەوەش رادەی خوێندەواری و زانست لەناو کورداندا زۆر بەرچاو نییە. هەر بۆیەش فۆلکلۆر گرنگایەتییەکی سیمبۆلیکی زۆر بەربڵاوی هەیە، نەك هەر یەکێك لە فاکتەرە سەرەکییەکانی کۆمەڵگای کوردی، بەڵکو پاشماوەکانی تاقە ئەدەبیاتی کوردیشە کە زۆربەی خەڵك زۆر بە باشی لێی ئاگادارن.

لە بەستێنی کولتووری کوردیدا، وشەی فۆلکلۆر رەهەندگەلێکی بەربڵاوی هەیە و شێوازە نەریتییەکان و نەریتەکانی تایبەتی کۆمەڵگا لە بوارەکانی هونەری و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی تر لەخۆ دەگرێت. لەم باسەدا زیاتر ئەدەبیاتی زارەکی و بە

واتایەکی وردتر "هونەری ویژەیی" دەخرێتە بەرباس، کە بابەتگەلێك لەمەڕ نەریتەکان و دابونەریت و باوەڕە کەونارایییەکان و هەروەها لەمەڕ شیعر و نووسراوە دەخرێتە بەرباس. هەموو ئەو بابەتانە لە رابردوودا بەشێوەی زارەکی پێشکەش دەکران، بەلاّم ئێستاکە زۆربەیان کۆکراونەتەوە و چاپ کراون.

فۆلکلۆر لە زمانی کوردیدا زۆربەی کات بە واتـای Hyperotrophy خراوەتە بەرباس ( Nikitine۱۹۵۰)، کە ئەورووپاییەکان پێی دەڵێن شیعری شەرگە، قەسیدە، تەرجیع بەند، پەندی پێشینیان، چیرۆکی فۆلکلۆر و چەمەری و شتی تری لەم شێوەیە. ئەو بەربلاوی و جیاوازییانە، دەتوانێت بەرەنجامی ولاّتێك بێت کە بەهۆی لەبار نەبوونی بارودۆخی ژیان، خەلّکەکەی ناچار کردووە بەشێوەی گرووپگەلی بچووك لە شوێنە لێکدابڕاوەکان بژین و ئەو ژیانە گرووپییە دابڕاوانە، بووەتە هۆی جیاوازییەکانی فۆلکلۆر و شێوازگەلێکی جۆراوجۆری لەودا بەدیهێناوە، ئەگەرچی گەلێك چیرۆك و ژانری هاوشێوە و هاوبەشییش لەنێو ئەماندا دەبینرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، گەلێك جیاوازیی کولتووری لەنێوان کوردەکان و دراوسێکانیان -وەك تورکمانەکان، مەسیحییەکان، عەرەبەکان، تورکەکان و فارسەکان-دا هەیە و تا کاتێك کە ئەم جیاوازییانە هەیە، فۆلکلۆر بەشێوەیەکی نەپساوە و بەردەوام لەحالّی گۆڕان و ئالّوگۆڕدایە. هەروەها گۆڕانکاری لە فۆلکلۆردا رەنگە لەلایەن بێژەر، وەگێڕ یا بیسەرەکانییەوە دروست بێت. سەرەڕای ئەوانە دەتوانین بڵێین، ئەوەی دەخوێنرێتەوە و پێشکەش دەکرێت، لەگەڵ بابەتی سەرەکیدا پەیوەندییەکی گونجاوی هەیە و بێژەرانی چیرۆکێکی فۆلکلۆر، هەر لە بنەڕەتدا بابەتێك هەڵدەبژێرن کە لەگەڵ بارودۆخەکە گونجاو بێت و بەدڵنیاییەوە بیسەرانیش هەر ئەو شتە هەڵدەبژێرن کە حەزیان لێیەتی و کاریگەریی لەسەریان دەبێت.

باوەڕی نەریتی و میراتی فۆلکلۆری هەر کۆمەڵگایەك، بە تێپەڕینی کات گۆڕانێکی زۆری بەسەردا دێت و دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو شتانەی وا باسکرا. ئەگەرچی ناتوانین بڵێین بەگشتی دەگۆڕێت، بەلاّم ئەگەر چاپ نەکرێت و نەگوازرێتەوە (بۆ بەرەکانی داهاتوو) بە تێپەڕینی کات لەبیر دەچێتەوە و لەناو دەچێت، یا لانیکەم ناتوانێت لە ژیانی تاکەکان و کۆمەڵگادا رۆڵێکی کاریگەر بگێڕێت.

لە کوردستان، فۆلکلۆر و ئافرەت، پەیوەندییەکی زۆر نزیکیان هەیە. لەڕاستیدا ئەوە ئافرەتەکانن کە لە گۆرانی و چیرۆکەکاندا قسەی یەکەم دەکەن، هەروەها بگێڕەوەی شێوەکانی تری فۆلکلۆریشن. ئەو رۆڵە بەرچاوەی ئافرەتان، بەتایبەت لە رابردوودا، دەربڕی زاڵبوونی ئافرەتە بەسەر دابونەریتەکانی پیاو و دەرخەری گرنگی و رۆڵی ئەوانە لە کۆمەڵگای کوردەواریدا.

راڤە و تێگەیشتنی ئەو بابەتە گەلێك پرسیار دێنێتە ئاراوە. بۆ وێنە ئەگەر ئێمە، یان لە کۆمەڵگادا رۆڵی ئافرەتان و پیاوان وەك یەك دانێین، یاخود دەنگی راستەقینەی ئافرەتان لە فۆلکلۆری کوردیدا ببینین، ئاخۆ ناتوانین قەبوولی بکەین کە ئەو وتانەی پیاوانیش دەریاندەبڕن، لەودا رۆڵێکی گرنگ دەگێڕن؟ ئەگەر وابێت، چۆنێتیی ئامادەیی پیاوان لەناو فۆلکلۆری کوردی دێتە بەرباس و پەیوەندیی نێوان فۆلکلۆر و کۆمەڵگا زۆر پێچەڵاوپێچ و ئاڵۆزە. فۆلکلۆر رەنگە باس لە کۆمەڵگایەکی راستەقینە، یاخود کۆمەڵگایەکی ئایدیال بکات. کاتێك ئێمە لە رۆڵی ئافرەتان دەکۆڵینەوە لەناو فۆلکلۆردا، بە پێویستی دەزانین ئەو پرسیارە بێنینە گۆڕێ: بە راستی فۆلکلۆر هی کێیە؟

نەریتە راستەقینە و بەرهەستەکان رەنگە لە سەرەتاوە بۆ کەڵکوەرگرتنی هەردوو رەگەزی ئافرەت و پیاو دروستبووبن و لەگەڵ ئەوەشدا نابێت رۆڵی خەیاڵ لە فۆلکلۆردا پشتگوێ بخەین. ناوبانگی جیهانیی ئەو چیرۆکانەی قارەمانەکەیان بەرێکەوت و بەشێوەیەکی زیدەوێژییانە بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵ دەبێت، ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن.

پەنابردن بۆ شا و شازادەکان و مەزن و میران، کە کەسایەتیی سەرەکیی چیرۆکەکانن و هەمیشە لە خۆشی و ژیانی پڕ زەرق و برقدا دەژین و ئەو بینەرانەی هیچکات ناتوانن تەنانەت بیر لە هەبوونی وەها سامان و ئاسوودەییەك بکەنەوە، وەك حەزی لەبن نەهاتووی چینی ناوەندیی ئەورووپایە بۆ خوێندنەوەی گۆڤار و سەیرکردنی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان، کە ئەوان دەخاتە ناو خولیای شیرینی سامان و ناوبانگ. جگە لەوەش نابێت لەبیرمان بچێت کە زۆربەی هەرە زۆری شێوازەکانی فۆلکلۆری دێرینی کوردان، باس لە شێوەگەلێك لە ژیان دەکات کە بۆ زۆربەی خەڵکی کوردستان بۆ هەمیشە لەناو چوون.

بەدڵنیاییەوە هێنانە ئارای باسێکی فرەلایەن و گشتگیر لەمەڕ هەموو ڕەهەندەکانی فۆلکلۆر، لەم وتارەدا ناگونجێت، بەڵام هەوڵدراوە تیشك بخرێتە سەر هێندێك لە لایەنەکانی. بۆ وێنە لەم وتارەدا، ڕۆڵی ئافرەتانی کورد و چۆنێتیی ئامادەیی ئەوان لە ناو فۆلکلۆردا دەخەینە بەرباس و پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە لەم وتارەدا پەیوەندیی نێوان فۆلکلۆر و کۆمەڵگا، لەنێوان گرووپە لێکدابڕاو و جیا لە یەکەکانی ناو کوردستان، ناخرێتە بەرباس، بەڵام بە ناچاریی لەو بابەت و ڕووداوانەی لە سەرانسەری ئەم وڵاتە بەرینەدا ڕوو دەدەن، کەڵکوەردەگرین و بەپێی ئەویش دەتوانین بە بە ئەنجامێکی گشتی بگەین. لەم وتارەدا سێ بابەت دەخرێتە بەر لێکۆڵینەوە. یەکەم: ڕۆڵی ئافرەتان لە گۆرانییەکاندا. دووەم و سێیەم: گۆڕانکارییەکان و هەستەکان لە فۆلکلۆری کوردیدا.

ئاواز و گۆرانیی فۆلکلۆر کە پێدەچێت لە هەموو ئەو ناوچانەی بە زاراوەی کرمانجی قسە دەکەن، بوونی هەبێت، نموونەیەکە لە چۆنێتیی خەیاڵسازی لەلای ئافرەتان و ئامادەبوونیان لە ژانرێکی تایبەتدا. ئەم شێوازە، باسی ڕووداوە ڕاستەقینەکان و خەڵك دەکات. ئەو بابەتانەی باسیان لێ کرا، لە پێشەوە و لە سەرووی هێندێك لایەنەکانی تری فۆلکلۆرن. پرسیارێك کە دێتە ئاراوە ئەوەیە، کە بەڕاستی ئێمە چۆن دەتوانین پێناسەیەك لە فۆلکلۆری زمانی کوردی بخەینە بەر دەستی بیسەرەکانی؟ خستنەڕووی پێناسەیەکی وردتر و گشتگیرتر، دەتوانێت هەم بۆ ئەورووپاییەکان و هەم بۆ ئەو کوردانەی لە شارەکان و دوور لە کۆمەڵگا بچووکە گوندییەکان -کە زۆربەی گۆرانی و چیرۆك و یەکەم دەربڕینەکان لەوێوە سەریان هەڵداوە- دەژین، بەهرە و قازانجی هەبێت.

ئێمە نەك هەر دەبێت خودی وشەکان و شێوەی دەربڕینیان لە ئاخاوتندا لەبەرچاو بگرین و سەرنج بدەینە واتا باوەکانی ئەم وشانە، بەڵکو پێویستە تەکنیکەکانی دەربڕین و بارودۆخی دەربڕین و شوناسی وەگێڕ و بێژەریش لەبەرچاو بگرین. بەرهەستترین و دروستترین و وردترین پێناسەیەك کە دەتوانین بۆ وشەی ژانر(شێواز) لە پێشکەشکردن و دەربڕینی فۆلکلۆر لە شێوەی زارەکیدا بیخەینە ڕوو، چۆنێتیی دەربڕین و بەڕێوەبردنییەتی. -ئەوەش خۆی کاریگەریی هۆکارە دەرەکییەکانی بەسەرەوەیە- کە شێوەی دەربڕینیشی دەبێت وەك ئەو دەقەی دەریدەبڕین بەهێز بێت. هەر بەو پێیەش

دەبینین خستنەڕووی پێناسەیەکی راستەقینە لە ژانری فۆلکلۆر نامسۆگەر نییە. ژمارەیەك لە کۆمەڵگا گوندییەکان، رەنگە بۆچوون و پێناسەگەلێکی زۆر شەفافیان لەمەڕ چۆنێتی و سنووری نێوان ژانرەکان هەبێت. ئەگەرچی ئەوان ژانر وەك دەستەواژەیەك لە هەناوی فۆلکلۆردا ناناسن. بۆ وێنە لە سەرانسەری کوردستاندا، شینگێڕی بۆ مردوو تەنیا لەلایەن ئافرەتانەوە بەڕێوە دەچێت، ئەگەرچی رەنگە یاساگەلی چاوەدێریی زۆر وردبینانە، کاریگەرییان لەسەر بەڕێوەچوونی رێوڕەسمەکە هەبێت.

شێواز و ژانرە جیاوازەکان، بەشێوەی جۆراوجۆر بەکاردەبرێن و پەیوەندیگەلێکی جیاوازیشیان لەگەڵ ژیانی راستەقینە هەیە. بۆ وێنە لە کوردستان ژمارەیەکی زۆر پەندی پێشینیان لەمەڕ کێشەی نێوان بووك و خەسوو هەیە و دەتوانین وای لێ تێبگەین کاتێك بووك دەبێتە یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی مێردەکەی، هەست بە بەختەوەریی و خۆشحاڵی ناکات. پەندێکی پێشینیان هەیە کە دەڵێت: "بوومە بووك، بوومە بەربووك". ئەو جۆرە قسانە، کلێشەیەکی ناسراون کە هەر کەسێك دەتوانێت کەڵکیان لێ وەربگرێت. بۆچوون و پەیامەکان لە هەناوی ئەو پەندانەدا حەشاردراون و مێشکی بیسەران، بە سەرنجدان بە ناسیاریی خۆی لەمەڕ کۆمەڵگا و لەژێر کاریگەریی هۆکارگەلێکی دیکەدا، پاژەکان دەخاتەوە سەر یەك و فراژوو (تەکمیل)ی دەکات.

هەڵبەت هەموو پەندێکی پێشینیان ناتوانێت دەربڕینێکی راستەقینە لە چوارچێوەی وشەکاندا بێت. بۆ وێنە زۆربەی کوردان پێیان وانییە کە بووك خەمبار و نابەختەوەرە. هێندێکیش لەم پەندانە، بۆچوونێکی کەسێنی بەشێوەیەکی ناڕوون و بە کەڵکوەرگرتن لە چەند وشەیەك، لە مێشکی خوێنەردا ساز دەکەن. ژمارەیەك پەندی پێشینیانیش هەن کە بەشێوەیەکی کلێشەیی باس لە کێشەکانی ئافرەتان دەکەن و لە ئەنجامدا دەبێت بڵێین هەبوونی کەسانی ئاگا و شارەزا بۆ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی ئەو پەندانە لە کوردستان، پێویستییەکی هەنووکەییە.

پەندی پێشینیان وەك شێوازێکی تایبەتی دەربڕینی راستی دێتە ئەژمار و هێندێك شێوازیش هەن کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ ناچنە خانەی شێوازی پێشڕەووە. کاتێك ئافرەتێك سیمبۆلی چیرۆك یا گۆرانییەکە، زۆربەی کات تێگەیشتن لەوەی ئەو هێمایەی

خراوەتە روو تا چەند دیمەنێکی روون لە تاکێکی ناو مێژوو دەخاتە بەردەست، دژوارە و هەروەها ئەو خاڵەش کە ئەو شتەی لەناو چیرۆك یا گۆرانییەکەدا پێشکەش دەکرێت، چەندە لەگەڵ شێوازی دەربڕینەکە تەبایە. ئەگەرچی زۆربەی شێوازە فۆلکلۆرییەکان لەلایەن فۆلکلۆریستەکانەوە پێشکەشکراون، بەڵام هێشتا بە رادەی پێویست روونکردنەوە و شیکردنەوەیان لەسەر نەکراوە و روونکردنەوەی شێوازە جۆراوجۆرەکان و بوارەکانی دەکارکردنیان، بۆ خەڵك، زۆر بەجێ و بە قازانج دەبێت.

### ئافرەت و فۆلکلۆر:

لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان، هۆکاری ئەوەی بۆچی ئافرەتێك ناتوانێت سترانبێژ یان چیرۆکبێژ بێت، بەشێوەیەکی بەڵگەمەند و مەنتیقی روون نەکراوەتەوە. هەڵبەت هێندێك لە بوارەکان تایبەت بە یەکێك لەو دوو رەگەزەن. وەك شینگێڕی لەلایەن ئافرەتانەوە (لە کۆڕی پرسەدا) و سترانبێژی لەلایەن زاوا و هەڤاڵانییەوە لە رێوڕەسمی زەماوەنددا. لە کوردستاندا ئەگەرچی گرووپە نەریتی و موحافیزەکارەکان، بەشداریی ئافرەتان لە کۆڕێکی تێکەڵی ئافرەت و پیاویان بە کارێکی نەشیاو وەسف کردووە و پێیان وایە ئافرەتان دەبێت لەژێر سێبەری پشتیوانیی باوك و برا و ئەگەریش شوویان کردبێت مێردەکەیاندا بن، سەرەڕای ئەوەش ژمارەیەك لە توێژەران باس لەوە دەکەن کە بەدرێژایی مێژوو هەموو کات ئافرەتگەلێك هەبوون کە شیعریان هۆنیوەتەوە و سترانیان چڕیوە. کوردناسی بەناوبانگ، توما بوا ( Tomas Bois ١٩٩٥) ئیدیعای کردووە زۆربەی گۆرانیبێژان و مەقام خوێنان ئافرەت بوون و تەنانەت گۆرانییەکانی دڵداری و شەڕ، لەلایەن ئەوانەوە دروستکراوە. ژابا (Jaba) یەکێك لە فۆلکلۆریستە کۆنەکان نووسیویەتی ئەو ژن و کچە قارەمانانەی لە شەڕدا کوژراون، ئاواز و گۆرانیی زۆر ناسك و پڕشۆریان بۆ گوتراوە و بە وتەی رۆماننووسی بەناوبانگی کورد "محەمەد ئۆزۆن"، کە سەردانی ناوچە کوردنشینەکانی سووریای کردووە، ژمارەیەکی بەرچاو لە ژنانی ئەو ناوچەیە گۆرانیبێژن. هەروەها هێندێك ئافرەتیش هەن کە لە کۆڕ و کۆبوونەوە تێکەڵەکاندا و بە ئامادەیی پیاوان گۆرانی نالێن، بەڵام لە کۆبوونەوەی ئافرەتاندا بێ هیچ کێشەیەك گۆرانی دەڵێن.

منداڵی کورد زۆربەی هەرە زۆری ستران و چیرۆکەکان لە دایك و پوور و دایەگەورەی دەبیستێت و فێریان دەبێت، چونکە ژنان بەشێوەیەکی نەریتی لە ماڵەوە دەمێننەوە خەریکی کاروباری ناوماڵ دەبن و ئەرکی گەورەکردنی منداڵانیشیان لە ئەستۆیە. ئێستاکەش کاتێك پیاوەکان بۆ خەباتی چەکداری لە کوێستانەکانن، یا کاتێك بەرەو مەنفا دوور دەخرێنەوە، یان دەکوژرێن، ئافرەتان نەك رۆڵێکی بەرچاویان لە گواستنەوەی فۆلکلۆردا هەیە، بەڵکو بەشێوەیەکی زۆر دیار کاریگەرییان لەسەر وشیاریی نەتەوەیی بەرەی نوێ هەیە.

زۆربەی فۆلکلۆریستە کوردەکان، دان بە پەیوەندیی حاشاهەڵنەگری نێوان ئافرەت و فۆلکلۆردا دەنێن. بەو پێیە دەتوانین بەو بەرەنجامە بگەین کە فۆلکلۆری کورد زیاتر هی ئافرەتانە تا هی پیاوان. ئافرەتان لە ریزی سترانبێژان و بەرێوەبەران و چاوەدێرانی بەرهەمە مەزنەکان دان، بەرهەمگەلێکی وەك "مەم و زین"، "زەمبیل فرۆش"، بەیتە قارەمانییەکانی وەك "دمدم" و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی تر و غەزەلە عاشقانەکان. ئەگەرچی هێندێك لە شێوازەکان بە ئاشکرا هی ئافرەتانن، بەڵام لە بواری چۆنێتیی پێشکەشکردن، دەربڕین و گواستنەوە و وەرگرتنیان، جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان ژن و پیاودا نییە و لەمەڕ ئەوەی ئافرەتانی کورد هەست بکەن ئەو شێوازە فۆلکلۆرییانەی لەلایەن پیاوانەوە خوڵقاون، لایەنی زاڵمانەیان هەیە، یان لەمەڕ ئەوەی ئەو شێوازە جۆراوجۆرانەی یەکێك لەو دوو رەگەزە خوڵقێنەری بوون لەگەڵ یەکدا جیاوازن، هیچ بەڵگەیەکمان بە دەستەوە نییە.

دەبێ قەبووڵی بکەین ئەو ئافرەتانەی لە بوارە جۆراوجۆرەکانی فۆلکلۆردا چالاکییان هەبووە، لە بەرامبەر ئەو کارەی ئەنجامیان داوە، خۆیان دەرنەخستووە. بە هەرحاڵ لەو شێوازانەدا کە پیاوان لە خوڵقاندنیاندا هیچ رۆڵێکیان نەبووە، ئافرەتان لە دەربڕینی ئاواتەکان و بۆچوونەکانی خۆیان ئازاد بوون و بە کردەکی بۆ پاراستنی ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بە فۆلکلۆرەوە هەیە، هەوڵیان داوە.

ژنان لە شینگێڕیکردن بۆ مێردەکانیاندا، زۆر جوان و عاشقانە باسی لێ دەکەن، تەنانەت ئەگەر لە درێژایی ژیانی هاوبەشیاندا قەتیان مێردەکەیان خۆش نەویستبێت. هەروەها ژنان لە رێورەسمی شینگێڕیدا، بۆ دەربڕینی خەم و تووڕەیی و نارەزایەتیی خۆیان، لە رووداوەکانی دەوروبەریان کەڵك وەردەگرن. بۆ وێنە بەرگریی لە مافە

کۆمەڵایەتی و یاساییەکانی خۆیان دەکەن و ئەو کەسانەش کە لەو ڕێوڕەسمەدا بەشداری دەکەن بە باشی لەو شتەی بە تەوس و توانج لەلایەن ئافرەتەوە باس دەکرێت، تێدەگەن و دەتوانن پەیامە شاراوەکانی وەربگرن. هەڵبەت ئەوە شتێکە کە پیاوەکان پەسندی ناکەن و هەوڵ دەدەن ئەو جۆرە ڕێورەسمانە لە فۆلکلۆری کوردیدا نەمێنێت. ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی فۆلکلۆریستەکان لە لێکۆڵینەوەکانیاندا تووشی گەلێك کێشە و گرفت بێن و لە بەدواداچوونی ئەو شێوازانە دڵسارد بنەوە. جگەلە ڕێوڕەسمی شینگێڕی کە لەلایەن ئافرەتانەوە بەڕێوە دەچێت و بەو هۆکارانەی باسکرا دژایەتیی دەکرێت، لایەلایەکانیش کۆمەڵەیەکی جۆراوجۆرن کە لێکۆڵینەوە لەمەڕ ئەوان لەلایەن پیاوانەوە زیاتر پەسند دەکرێت.

**خەیاڵ، پشتیوانیی ئافرەت:**

چیرۆکە فۆلکلۆرەکان، ئافرەت لە گرووپگەلێکی جۆراوجۆر و سەرنجڕاکێشدا دەخەنە بەرچاوی بیسەر. شازادە و سیحرباز و زڕدایکە خراپەکان لەو چیرۆکانەدا بوونەتە کلێشەگەلێك کە کەسایەتیی ئەوان لە سەرووی تایبەتمەندییەکانی تاکەوەیە و لە چیرۆکە جۆراوجۆرەکاندا، زۆر یا کەم هەر ئەو تایبەتمەندییانەیان هەیە. ئەگەر قەرار بێت بۆ دەستەواژەگەلێکی وەك دێوەزمە، ئەجننە و پەری کە لە چیرۆکە فۆلکلۆرە کوردییەکاندا زیاتر باسیان کراوە، ناوێك بدۆزینەوە، بێگومان لایەنێکی وەهم و خەیاڵ لەخۆ دەگرێت. ئەگەرچی زۆربەی کوردەکان، ئەوانەیان وەك شتێکی ڕاستەقینە قەبووڵ نییە، بەڵام لە هێندێك ناوچەی کشتوکاڵیی جیهاندا (بۆ وێنە لە بەریتانیا)، خەڵکانێك هەن کە بڕوایەکی ڕاستەقینەیان بە بوونەوەرگەلی ئەوپەڕ سروشتی هەیە.

زۆربەی ئەو کەسایەتییانەی لە فۆلکلۆری کوردیدا دەردەکەون، هەر ئەوانەن وا لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی وڵاتانی دراوسێ -عەرەب، تورك و فارس- و لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی ئەورووپاشدا بوونیان هەیە و لەو کەسایەتییە هاوبەشانە بۆ دەربڕینی مەبەستی خۆیان کەڵك وەردەگرن. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، ئافرەت لە فۆلکلۆردا و بەتایبەت لە چیرۆکەکاندا ڕۆڵێکی بنەڕەتیی گێڕاوە و ئەوەش دەربڕی دووپاتبوونەوەی ئەو ڕووداوانەیە کە بەسەری هاتووە. ئافرەت لە زۆربەی چیرۆکەکاندا، شەڕڤانێکە کە بە جلی پیاوانەوە دەچێتە مەیدانی شەڕ و هەموو شەڕڤانانی تر دەبەزێنێت و سەرئەنجام

قارەمانی چیرۆك -كە پیاوە- بەسەریدا زاڵ دەبێت و لەو كاتەدا ئەو لەگەڵ قارەمان دەكەوێت و لە هێندێك لە چیرۆكەكاندا شووی پێ دەكات.

مەكێنزی (O. N. Mackenze) ئەو چیرۆكانەی كۆكردووەتەوە كە وەها كەسایەتیگەلێكیان تێدایە. ئەو وەك نموونە چیرۆكێكی ناوچەی سلێمانی دێنێتەوە. شا ئیسماعیل و كامبێرتا(؟) بە مەبەستی دۆزینەوەی دەزگیرانەكەی كە كچە شێخێكی عەرەبە وەڕێدەكەوێت. لەسەر ڕێگایدا دەزگیرانێكی تر دەگرێت كە كچی ئیسلام شا (شای پەریان)-ە. شا ئیسماعیل بە ناوچەیەكدا تێدەپەڕێت كە لەلایەن "ڕەشەسوار"ەوە قۆرغ كراوە و بارودۆخێكی پڕ لە ترس و تۆقاندن بەسەر ناوچەكەدا زاڵ بووە. كاتێك قارەمان دەگاتە ناوچەكە، كۆمەڵێك سەر و لەش دەبینێت كە بەقەد بەرزایی منارەیەك بەسەر یەكدا كەوتوون. ئەو پەنا دەباتە بەر ئەشكەوتێك. كاتێك "ڕەشەسوار" دەگاتە ئەشكەوتەكە، زۆر لەسەر ئەوە پێ دادەگرێت كە ئەو دەبێت لە كۆشكەكەی ببێتە میوانی و سبەی بەیانی لەگەڵ یەكدا بەشەڕ بێن. درێژەی چیرۆكەكە بەم شێوەیەیە: "بەیانیی ڕۆژی دواتر پاش ئەوەی لە خەو هەستان، چوونە ناو گۆڕەپانەكە و بە بەرچاوی هەموانەوە، پەلاماری یەكتریان دا. ڕەشەسوار وتی: "ئەی لاوە جوانچاكەكە، من بە تەما نیم بە تێغ و شەمشێر شەڕت لەگەڵ بكەم. حەز دەكەم لەگەڵ یەكتر زۆران بگرین. ئەگەر من پشتی تۆم لە زەوی دا، ناتكوژم و دەتكەمە كۆیلەی خۆم. ئەگەریش تۆ منت دا بە زەویدا، ئەوەی دەتەوێت بیكە". شا ئیسماعیل وەڵامی داوە: "قسەكانی تۆ هیچ بایەخێكیان لای من نییە. ئەگەر تۆ بەسەر مندا زاڵبووی، سەرم لە لەشم جیاكەوە و ئەگەر من بەسەر تۆدا زاڵبووم، وەك سەگێك سەرت لە لەشت جیا دەكەمەوە". ئەوان حەوت شەو و ڕۆژ لەگەڵ یەكتر زۆرانبازییان كرد. پیاوە لاوەكە زۆر لەبەر خوا پاڕایەوە. ئەو لەكاتێكدا كە زۆر بە توندی ڕەشەسواری گرتبوو وتی: "ئەی خدری نەمر، بەزینی ئەو ویست و ئارەزووی تۆشە، كەوایە یارمەتیم بدە". پاشان ئەوی خستە سەر لاشان و وەك چۆلەكەیەك گرتی و دای بە زەویدا. پاشان بە شەمشێر هێرشی كردە سەری بۆئەوەی سەری لە لەشی جیاكاتەوە. لەم كاتەدا ڕەشەسوار بەرۆكی خۆی دادڕی و مەمكەكانی وەدیار خست. پیاوەكە بە دیتنی ئەو دیمەنە هاتەوە سەرخۆ. ڕەشەسوار وتی: "سینگی من داپۆشە. لە بەهەشت و زەویدا چارەنووسی من وەها بووە كە شووت پێ بكەم. من لەگەڵ خوای خۆم پەیمانم بەستبوو

تەنیا شوو بە کەسێك بکەم کە بتوانێت لە وەها شەڕێکدا بەسەرمدا زاڵ بێت". ئەوان پێکەوە بەرەو کۆشکەکەی رەشەسوار وەڕێ کەوتن. کاتێك رەشەسوار جلەکانی گۆڕی، شائیسماعیل ئەویٰ زۆر جوانتر لە پێشوو هاتە بەرچاو. پاش ئەم رووداوە "رەشەسوار" رەگەڵ هێزەکانی مێردەکەی کەوت و شانبەشانی ئەوان لە شەڕگەکاندا شەڕی دەکرد. بەهۆی ئەوەی کە ئەو کچی شای پەریانە، هێزێکی سێحراوی و شارەزاییەکی بێ وێنەی هەیە. لە دیمەنێکدا کە ئافرەتبوونی رەشەسوار ئاشکرا دەبێت، وا دێتەر بەرچاو کە ئەم رێکەوتە لە کاتی شەڕەکەدا بە ئەنقەست روو دەدا. هێندێك نموونەی تریش لە دەستدان کە ئەو بۆ ناسینی نەیارانی، بە سیحر تاقییان دەکاتەوە.

ئەگەرچی لەم سەردەمەدا هێندێك لە گرووپە پێشڕەوە کوردەکان، شەڕڤانی ئافرەتیشیان هێناوەتە ناو ریزی خەباتکارانیان، بەڵام قارەمانەتی شەڕڤانانی ئافرەت، لە مێژووی کوردستاندا شتێکی ئاوارتەیە. سەرباقی ئەوەی چ لە چیرۆکە فۆلکلۆریکەکاندا و چ لە شەڕە هاوچەرخەکاندا، شەڕڤانیی ئافرەت زیاتر سەرنجڕاکێشە.

لە سەرەتای نەوەدەکان، لە چەند شارێکی وەك دهۆك و هەولێر، وێنەی ئەو ئافرەتانەی جلی پێشمەرگەیان لەبەردا بوو زۆر دەهاتە بەرچاو. ئەگەرچی زۆربەی ئەو ئافرەتانە هی ناوچەکانی تر بوون، بەڵام ئافرەتانی ئەو ناوچانەش لە کاتی رێوڕەسمە تایبەتەکاندا جلی پێشمەرگەیان دەکردە بەر.

شەڕڤانانی ئافرەت لە پارتە کوردییەکانی عێراق-دا زۆر نەبوون و خەباتی ئافرەتان لەم وڵاتەدا زۆر بەربڵاو نەبووە. لەناو ئەو ئافرەتە دەگمەنانە، ناوی "مارگریتا" ئێستاش هەر لە یادی خەڵکدا ماوە. بارودۆخ و هەلومەرجی ناوچە کوردنشینەکانی ئێران و تورکیا جیاوازە. ئەگەرچی ئافرەتان لەو ناوچانە چالاکترن، بەڵام ئەم دیاردەیە لە رووداوە دەگمەنەکانی سەدەی بیستەمە. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە لە چیرۆکە فۆلکلۆرییەکاندا، ئافرەت هەموو کات هاوڕێی بوونەوەرگەلێکی خەیاڵیی وەك دێوەزمە و سیحربازەکان بووە، نەك شتە راستەقینەکان. لە چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیدا، زۆربەی کات لە کۆتایی چیرۆکەکەدا، ئافرەت دەبێتە ملکەچی پیاوێك، بەڵام ئایا ئافرەتان بەڕاستی دەسەڵات و زاڵبوونی پیاوانیان قەبووڵ کردووە؟ هیچ بەڵگەیەکمان بۆ سەلماندن یان رەت کردنەوەی ئەم شتە لەبەر دەستدا نییە.

"زێدە وەسف"

## لایەنێکی جوانیناسانەی بەیتی "خەزێم"

عەبدولخالق یەعقووبی- بۆکان

-١-

ئەگەر بەیتی کوردی وەکو دەقێکی نووسراوەی هونەری- ئەدەبی بخوێنرێتەوە کام تایبەتمەندی و رەگەز جوانیی پێدەبەخشن؟ سەرچاوە و ئاخێزگەکانی جوانی دەقی بەیت چین؟ بۆچی خوێندنەوەی بەیت، وەکو دەق، چێژبەخشە؟ چی وا لە مرۆڤی هەنووکەی کۆمەڵگای هاوچەرخی کوردی دەکات کە دەقی بابەتێکی وەکو بەیت، کە هەڵقووڵاوی کۆمەڵگایەکی جووتیاریی نەریتخوازە، بە تامەزرۆییەوە بخوێنێتەوە و دواجار هەر بەپێی عەقڵانییەتی سەردەمی خۆی، کە سەردەمی مۆدێرنیتەیە، چێژی جوانیناسانەشی لێوەربگرێت؟ لە سەردەمی، بە قەولی ئادۆرنۆ، سەنعەتی کولتووردا کە بەرهەمە هونەرییەکان دەرەتانی پەرەپێدان و فراوانبوونی میکانیکیان بۆ رەخساوە و شوێنەوار و ئاسەوارە هونەرییەکان لە بەرگی پیرۆزێتی و تاکێتی خۆیان داماڵدراون و میدیاکان رێگایان بۆ یەکانگیرکردنی چێشکە و مرخە جوانیناسییەکان خۆش کردووە و تەنگیان بە هەمەرەنگی و هەمەجۆری دید و روانگەکان هەڵچنیوە و دەسەڵاتە پاوانخوازەکان لەسەر دەستی دەزگاکانی گشتی بیرۆکەی خۆیان بەسەر زەین و زمانی خەڵکاندا دادەسەپێنن، چۆنە بەیتی کوردی هێشتاش دەنگێکە لە گەرووی یادەوەری و خەون و خولیا و مێژووی مرۆڤی کوردەوە دێتە دەرێ و دەبێتە پردێك کە رابردووی تژی لە کارەساتی نەتەوەیەك پێیدا دەگوزەرێ و خۆی بە دەقەری جوانییەکانی ئێستای دەگەیەنێت و لە هەمان کاتدا هەنووکەی پڕ لە هەرا و زەنازەناشی دەگوازرێتەوە بۆ هەواری بێدەنگ و سوکنایی بەخشی رابردووی؟

دیارە لە سۆنگەی ئەوەی زمانی زانست، زمانی چەمکە و "چەمك" (Concept)یش شتێکی ئینتزاعی و سەڵتە و نایبندرێت، باسی جوانیناسی، کە باسێکە لەسەر کۆڵەکەی ناسینی بابەتی هەستپێکراو دامەزراوە، ناچارەکی دەشێت بگوازرێتەوە بۆ بەستێنی هونەر و ئەدەب، کە زمانیان زمانی "وێنە" (image)یە و وێنەش بابەتی هەستپێکراوە. کەواتە ئێمە بۆمان هەیە لە زانستدا باس لە راستی و ناڕاستی، لە بە سوودبوون و بێ سوودبوونی چەمك بکەین، لە هونەریشدا باس لە جوانی و ناحەزی "وێنە" بێنینە گۆڕێ. بەم پێیە زانست بۆی هەیە "بە کەڵك" یان "بێ کەڵك" بێت، هونەر و ئەدەبیش بۆیان هەیە "جوان" یان "ناحەز" بن. کەواتە باسکردن لە بۆ نموونە "زانستی جوان" و "هونەری بە سوود" باسکردن لە دوو

دەستەواژەی بێبەری لە مانان، بەڵام جوانیناسی وەکو زانست واتە "زانستی جوانیناسی" بابەتێکە کە بە زمانی چەمك لەسەر لایەنەکانی جوانیی هونەر یان ئەدەب قسان دەکات. بە وتەیەکی روونتر ئەگەر بابەتی جوانی لە هونەردا بێتە هەوێنی تاووتوێکردنێکی زانستی، ئەوە جوانیناسییە کە ئەم ئەرکە وە ئەستۆ دەگرێت. کەواتە جوانی شتێکەماڵی هونەرە و لەنێو دڵی هونەردایە و بڕبڕەی پشتی هونەرە، بەڵام جوانیناسی لە دەرەوەی هونەردایە و هەوڵی ناسینی رۆح و جەستەی هونەر دەدات. بەم پێیە باسکردن لە جوانییەکانی بەیتی کوردی، یان وردتر بدوێین، لایەنەکانی جوانیناسانەی دەقی بەیتی کوردی هەوڵێکە کە دەکەوێتە خانەی زانستی جوانیناسیی بەیتی کوردییەوە کە خانەیەکی چۆڵە و تا ئێستا قەڵەمی توێژەران سەریان پێدا نەکردووە و لایان لێ نەکردووەتەوە. ئەوەی لەم وتارەدا دەکرێت هەوڵێکی بچووکە لەم پێناوەدا.

-٢-

وەك دەزانین بەشێك لە جوانیی بەرهەمی هونەری لە سۆنگەی ئەو تەکووزی و رێکوپێکی و هاوەدەنگییەدایە کە لە نێوان پاژەکانی پێکهێنەری ئەو بەرهەمەدا بەدی دەکرێت، بەڵام بەرهەمی هونەری لەو رووەوە کە هەمیشە هەوڵی شێوە ئاشنایی سڕینەوەیە کە لەسەر ئاستی روخسار و ناوەرۆکدا، بۆی هەیە هەندێ جار لە رێگای لادان لە راستەڕێی تەکووزی و نەزم و رێکوپێکیی رێژەی جوانی خۆی بباتە سەرێ. لێرەدایە کە هونەر رێگای تەمەیدی "زێدە وەسف"(*) دەگرێتە بەر و لەم روانگەیەوە لە جیهانی دیاردەکان دەڕوانێت. داستایۆفسکی، رۆماننووسی ناسراوی رووسیا، لە شوێنێکدا گوتوویەتی: "سەرلەبەری هونەر، تا رادەیەك تێکەڵ بە زێدە وەسفە، بەڵام سنوورەکانی زێدە وەسف نابێت لە رادەبەدەر پەرەیان پێبدرێت، چونکە لەوانەیە هەر ئان و سات وێنەکە بگۆڕدرێت و ببێتە کاریکاتۆر". کەواتە زێدە وەسف وردەکارییەکە دەستی هونەرمەند دەیخولقێنێت تا لە شوێنی پێویست کاریگەریتی جوانیی بەرهەمەکەی خۆی زیاتر بکات. زێدە وەسف وەك رێکارێکی هونەری بۆ بەخشینی لایەنێکی جوانیناسانە بە بەرهەمی هونەری بۆی هەیە خاوەن چەندان کارکرد بێت. دەکرێت بڵێین زێدە وەسف لە هونەردا بۆ دەربڕینی بیرۆکەی دەسەڵاتی بێ پایانی مرۆڤە

بۆ نموونە لەو شوێنەی کە مرۆڤ پێویستە لە هەمبەر کارەساتەکانی ژیاندا چۆك دانەدا و وورەی بەرز بێت. هەروەتر بۆی هەیە ڕێگایەك بێت بۆ بەخشینی خەیاڵ و خولیاکانی مرۆڤ بە ئەمری واقیع. بە وتەیەکی تر هونەرمەند لەسەر دەستی زێدە وەسف واقیع بە ڕەگەزەکانی خەیاڵ و خەونی مرۆڤانە کە بۆیان هەیە سنووری واقیع ببەزێنن، پاراو دەکات. هەروەها هونەرمەند لە ڕێگای بەکارهێنانی زێدە وەسفەوە بەردەوام کەف و کوڵی بەرزەفڕانەی خۆی و بەردەنگەکەی (مخاتەب) وەك دوو مرۆڤ دادەمرکێنێت. زێدە وەسف مرۆڤ لە هونەردا دەگەیەنێتە ئەو دەڤەرە لە نیشتمانی ئاواتەکان کە لەوانەیە لەسەر عەردی واقیع هەرگیز پێیان نەگات. دواجار ئەوەمان لەبیر نەچێت کە زێدە وەسف، بەو شەرتەی داستایۆفسکی پێی قایل بوو، هەمیشە کاریگەریتی عاتیفیی خەیاڵی هونەری زێتر دەکات و سەرنجی بەردەنگی هونەریش پتر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت و چێژی خوێندنەوەی بابەتی هونەری پتر دەکات.

-٣-

دەقی بەیتی کوردی ڕەنگە نەك هەر تەنیا لەبەرئەوەی بەشێکی زۆری باسی قارەمانی گەورە و عیشقی پاك و بەسەرهاتی کارەساتاوی دەکات، بەڵکو لەو سۆنگەیەشەوە کە بۆ بەخشینی بەردەوامی لایەنێکی جوانیناسانە بە دنیای تایبەتی خۆی، پێویستی بە بەزاندنی سنوورەکانی ئاسایی ڕوانین و عادەتی ڕەفتارکردن و ساکار بەسەربردن بووە زۆر لە زێدە وەسف کەڵکی وەرگرتووە. جا زێدە وەسف جاری وایە لە سەرومری پێکهاتەی دەقی بەیت دایە، وەکو نموونەی "شێخ فەرخ و خاتوون ئەستی" کە شێخ فەرخ هەر لە کاتی لە دایکبوونیدا قسان دەکات، یان لەسەر لانکەوە دەچێتە پاڵ ئەستێ، یان دەنا لە هەندێ پاژ و بەشی بەیت، بەپێی پێویست و مەنتقی دارشتنی خودی بەیتەکە، بەکار دەبردرێت، وەکو نموونەی دەقی بەیتی "خەزێم" کە لەم وتارەدا پتر لێی ورد دەبینەوە. لە بەیتی "خەزێم"دا تا ئەو شوێنەی کە کوڕە دۆم پێویستی بە نیشاندانی ئاستی بەرزی عیشقی خۆی نییە "زێدە وەسف"ێك لە ئارادا نییە، کەچی هەر کە گەیشتە ئەو شوێنەی بیەوێت ڕادەی ئەویندار و ڕێژەی وەفاداریی خۆی بنوێنێت، بەیتساز زێدە وەسف تێکەڵ بە گێڕانەوەی بەیتەکەی دەکات. بۆ نموونە لە وەسف و پەسنی ئەو کراسەی بڕیارە بۆ کچە دۆم بدووردرێت، چونکە ئەم بابەتە

پێوەندی بە هەست و خوستی هەناوی کوڕە دۆم بە نیسبەت کچە دۆمەوە نییە، زێدە وەسف نابینرێت، کەواتە لەم پاژەدا کە دەنگی کچە دۆمە، وەسفەکە وەسفێکی بێبەری لە زێدە وەسفە:

... دەڵێت: "کراسم دەوێ ساف لە ماهووت بێ،

دەوری دامێنی دوڕ و یاقووت بێ،

لە راستی مەمکی دەنکی زومڕووت بێ..."

بەڵام کە کوڕە دۆمە دەنگ هەڵدەبڕێت و هەستی هەناوی خۆی دەردەبڕێت، زێدە وەسف وەك رێگایەك بۆ بەخشینی جوانی بە دەقەکە، بەکار دەبرێت:

سەد وەستام دەوێ لە بانی کۆیە

هەشتا لە موسڵێ، شێست لە شنۆیە

کراس بدوورن لە گوڵی لیمۆیە،

دە بلێ تەنك بێ، ناسك و شلك بێ

بۆ چاو هەڵۆیە

لەم کۆپلەیەدا، زێدە وەسف لە ژمارەی سەرجەمی وەستاکاندا دەبینرێت کە پێکەوە دەبنە دووسەد و چل وەستا، هەروەتر لە کۆکردنەوەی ئەم هەموو وەستایە لە سێ شوێنی جیاوازی کوردستان و دواجار لە کراس دوورین لە گوڵی لیمۆیە.

زێدە وەسف لەم شوێنەی دەقی بەیتی خەزێمدا ناڕاستەوخۆ بە خوێنەر دەڵێت، کە عیشق و ئەڤینی مەزن، داوای مەزن و کاری مەزنی پێویستە. بە وتەیەکی تر بەیتساز لەم دەقەدا گەورەیی و شان و شکۆی ئەڤینی کوڕە دۆم لە هەمبەر کچە دۆم دەترنجێنێتە نێو زێدە وەسفەکانی خۆی و لەم رێگایەوە چێژی خوێندنەوەی دەقەکە پتر دەکات. بەتایبەت لە بیرمان نەچێت کە قارەمانی ئەم بەیتە کوڕ و کچە دۆمێکی پاپەتی و رەش و رووتن کە نزمیی ئاستی ژیانی رۆژانەیان رووبەڕووی بەرزیی رادەی ئەڤینی راستەقینەیان دەبێتەوە.

دیسان ئەگەر لە پێکهاتەی چیرۆکی ئەم بەیتە ورد بینەوە، دەبینین لەو شوێنانەی کە گێڕانەوەی چیرۆکەکە تەنیا پێوەندی بە کرداری کچەوە هەیە زێدە وەسفێك لە ئارادا نییە و هێڵێکی داستانی ساکار و بێ گرێ و گۆڵ دەچێتە پێشێ:

ئەگەر وای زانی ئەو نازەنینیٚ

هات و دەستی گرت لە هەڵپەڕینیٚ...

ئاخر لەو کراسەی وا کردبوو حاشا

ئەلحەمدولیلا خەزێمیش نەما...

دەڵیٚ: خەزێمی کەپۆم کاری مێردینیٚ،

لە کەپۆم کەوت لە هەڵپەڕینیٚ

مەگەر بچم بۆ وڵاتی مەدینیٚ

کەچی هەر کە گێڕانەوە باسی پێوەندی و کارلێکی نێوان کچە و کوڕە دەکات، زێدە وەسف دەست پێدەکاتەوە:

ئەگەر لاو زانی ئەو قەرە خەبەر

خۆڵی حەوت دێیان لاو دەکا بەسەر

لەم بەیتەدا زێدە وەسف سەرەڕای ئەوەی پیشاندەری هەندیٚ دۆخی تایبەتی نێو داستانی ئەڤینی کوڕە دۆمە و کچە دۆمەیە، بە دەستەوەدەری چەند حاڵەتێکی جیهانی دەروونی زەینییەتی کوڕە دۆمە لە هەمبەر ئەم ئەڤینەدا. بۆ نموونە لەم کۆپلەیەی خوارەوەدا دەکرێت رادە و رێژەی خەم و کەسەری کوڕە ونبوونی خەزێمی کچە و گرێدانی چارەنووسی کوڕە بە چارەنووسی خەزێم و ئامادەبوونی ئێرادەی کوڕە کە هەمیشە لە خزمەت بە عیشقی کچەدایە و ونبوونی خەزێم کە نیشانەیەکە لە ونبوونی بەشێك لە جوانیی کچە، ببینین، هەرچەند وێدەچیٚ زێدە وەسفی ئەم کۆپلەیە ئەوندە خەست و خۆڵ و بەرچاو نەبێت:

دەڵیٚ: "ئەگەر بمرم، بژیم، بمێنم

دەبیٚ ئیشەڵڵا ئەو کارەی پێکبێنم

یانە ماڵی خۆم پاك دەدۆڕێنم

یان ئەوەتا سەری خۆم دەبەتلێنم...

قەت چەکوچیٚ نەکوتم لەسەر سندانیٚ

لە خۆم حەرام دەکەم رێی گوزەرانیٚ"

دیاره زێده وەسف بۆی هەیە نەك هەر بۆ رەنگدانەوەی بابەتی واقیع بەکاربێ، بەڵکو رەنگدانەوەی خەون و خولیا و ئاوات و ئارەزووشی تێدا بێت. بۆ نموونە لەم کۆپلەیەی دەقی بەیتی "خەزێم"دا بەیتساز هەم زێدە وەسفی واقیعی ونبوونی خەزێمی کچە دۆمە دەکات، هەمیش لە رێگای شوبهاندنی ناڕاستەوخۆی کوڕە دۆم بە زێی بادینان خەون و خولیا و ئاوات و ئارەزووی کوڕە دۆمە دەردەبڕێت:

زێیە بادینان چ گەورە و پان بوو
قومێکی ئاوێی تێدا نەمابوو
ماسی بەستەزمان هەمووی خنکابوو
لە دەریام کردووە وا پرسیارێ
لەگەڵ دەریام دوو قسەی گوفتارێ
دەڵێم: "بۆ ئیشك بووی بە تەڕی بەهارێ"
دەڵێ: "تازیەیە بۆ خەزێمی یارێ".

دیاره بەیتساز لێرەدا هێندە وردەکارانە و بە نەرم و نیانی زێدە وەسفی خەمی کوڕە دۆم دەکات، کە دواجار قەناعەت بە خوێنەر دێنێت کە ئەم زێدە وەسفانە وەك بەشێکی گرنگ و گرانی تانوپۆی دەقەکە لە قەڵەم بدات و بە پاژێکی لێکدانەبڕاوی پێکهاتەی بەیتەکەی بزانێت. لە ئاکامدا ئەم زێدە وەسفانە نەك هەروەك سەنعەتێکی بەلاغی و ئارایشتکارانە، بەڵکو وەك لایەنێکی هونەری و جوانیناسانەی بەیتەکە خۆیا دەبن.

-٤-

بەیت نەك هەر نوێنگەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و دیاردەکانی تری دەرەوەی دەقییە، بەڵکو وەك دەقێکی ئەدەبی نموونەیەکیشە لە چێشکەی جوانیناسانەی هونەری مرۆڤی کورد. بۆیە بە رای من کەمتەرخەمییە بەیت تەنیا هەر بە کەرەسە و ئامیانێك بزانرێت بۆ تێگەیشتن لە واقیع و مێژووی کۆمەڵگای کوردی، بەڵکو دەشێ بابەتێکی بەرباسی زانستی جوانیناسیش بێت بۆ پێزانین بە شوێنی مرخی ئەدەبی و شانی چێشکەی هونەریی کۆمەڵگا. جوانیی بەیتی کوردی نیشاندەری جوانیی رۆح و

ئەندێشە و زەین و زمانی لێزانانی بەیتسازی و شارەزایانی بەیت بێژییە. مێژووی بەیتی کوردی تەنیا هەر مێژووی کارەساتی نەتەوەیی گەلی کورد نییە، بەڵکو مێژووی رۆحی جوانیناسانەی ئەم گەلەشە. خوێندنەوەی بەیتی کوردی خوێندنەوەی جوانی و ناحەزی مێژووی کوردستان و مێژووی جوانی و ناحەزی ئەم وڵاتەیە.

(*) لە سەنعەتەکانی ئەدەبیدا جیاوازی نێوان زێدەبێژی (مبالغە) و زێدە وەسف (اغراق) لەوەدایە، کە زێدەبێژی هەم عەقڵ قبووڵی دەکات، هەم عادەت، بەڵام زێدە وەسف عەقڵ قبووڵی دەکات، کەچی عادەت حاشای لێدەکات. (غلو) جۆرە زێدەکارییەکە نە عەقڵ قبووڵی دەکات و نە عادەت.

لە مێژووی لێکۆڵینەوەکانی بەیتناسیدا، هەمووکات شێوازە جوداوازەکانی بەیت و باو و بەگشتی لقە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، هەر کامەیان بە جودا و بەشێوەیەکی لێکدابڕاو تاوتوێ کراون. لاوك بە ژێرکۆمایەك (زیرمجموعە) لە خەرمانی ئەدەبی زارەکی کوردی و حەیران بە ژێرکۆمایەکی تر حسیاب کراوە. ئەوپەڕی پێوەندی نێوان ئەم دوو لقە فۆلکلورییە کە بە رەسمی ناسرابێت و باسی لێوە کرابێت، لەوانەیە هاوسنووری و جیرانەتی بەستێنەکانیان بووبێت، تەنانەت ئەوکاتەی بۆ نموونە کار لەسەر بەیتەکان کراوە هەرکام لە بەیتەکان، سەربەخۆ لەوانی تر شرۆڤە کراون. سەیدەوان باسێکی تایبەتی لەسەر کراوە و خەج و سیامەند باس و خواسی جوداوازی تری بۆ ئامادەکراوە. دەکرێت بڵێین بەگشتی دوو هۆکار بۆ پێکهاتنی ئەم بارودۆخە، کارێگەرێتی تایبەتیان هەبووە:

ئەلف: جەختکردن لەسەر ناوەرۆکی هەرکامە لە بەیتەکان بە جودا و گرنگی نەدان بە فۆرم و پێکهاتەی گشتییان.

ب: جۆرە تێڕوانینێك بۆ بەیت کە گرنگی بەیت هەر بەتەنیا لە زانیارییە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و زمانییەکانی ئەم بابەتەدا دەبینێت و بەیت وەکو بابەتێکی هونەری کە خاوەنی جوانیناسی تایبەت بە خۆیەتی و وەکو ژانرێکی ئەدەبی خۆبژێو کە خاوەنی یاسا و رێسای خۆیەتی، بەفەرمی ناناسێت.

دیارە هەرکام لەم گریمانانە، گرفتی تایبەت بە خۆیان بۆ هەرێمی باس و بابەتەکانی بەیتناسانە رەکێش دەکەن. ئەگەر ئێمە هەر بەتەنیا قسە لەسەر ناوەڕۆکی بەیتەکان بکەین، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ کە بۆ نموونە مەنزوومەی شیعریی "قەڵای دمدم"ی مەلاکەریم فیدایی، چ جوداوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ بەیتی "دمدم"ی رەحمان بەکر دەبێت؟ یان مەم و زینە وەرگێڕدراوەکەی هەژار چ جوداوازییەکی بنچینەیی لەگەڵ مەم و زینی نوسخەی ئۆسکارمان دەبێت؟ ئەگەر لە وەڵامدا بڵێین "قەڵای دمدم"ی مەلا کەریم فیدایی لەباری ناوەڕۆکەوە، جوداوازە لە بەیتەکەی رەحمان بەکر. دەکرێت ئەم وەڵامە بەم پاساوە رەت بکرێتەوە کە ئەم چەشنە جوداوازییە ناوەرۆکییانە، تەنانەت جوداوازی لەمەش زیاتر، زۆر جاران لەنێوان دوو نوسخەی بەیتێکیشدا بەدی دەکرێت. ئەگەریش بڵێین جوداوازی ئەم مەنزوومە شیعرییە، لەگەڵ بەیتە فۆلکلۆرییەکە، جوداوازییەکە واوەی جوداوازی ناوەڕۆکی و پێوەندی بە فۆرم و

پێکهاتەی هەرکام لەو بابەتانەوە هەیە. ئەودەم راست دەگەین بەو قەناعەتە کە بۆ ناسینی بەیتەکان جەختکردنی رووت لەسەر ناوەرۆکی بەیتەکان، کەڵکێکی ئەوتۆ نابەخشێت بەو کەسانەی بە راستی بەدوای ناسینی بەیتەوەن. ئەو شێوازە بەیتناسییەی وا نەتوانێت بەشێوەیەکی شیکارانە جوداوازییەکانی بەیتێکی فۆلکلۆری لەگەڵ مەنزوومەیەکی شیعریی لێکبداتەوە، شێوازێکی شیاوی پشت پێ بەستن نییە.

دیسان گرفتێکی تر، کە هەر گریمانەی ئەلف بۆمانی ساز دەکات، ئەوەیە کە بۆ نموونە لەبابەتی وەکو ئازیزە یان پاییزە یان گەلۆدا، کەم و زۆر چوارچێوە ناوەرۆکییەکان دیاریکراون. زۆربەی نوسخەکانی پایزە، بە چاوپۆشیکردن لە هەندێك جوداوازی ناگرنگ، ناوەرۆکێکی هاوبەشیان هەیە. ئازیزە و گەلۆش هەروەتر، دەی ئەگەر گرنگی باسەکە هەر لە ناوەرۆکی ئەو بەندانەدایە، ئێمە بەچی دەزانین نوسخەیەکی ئازیزە لە نوسخەیەکی دیکە جوانتر و هونەریترە؟ بەیتناسێك کە تەواو ئاشنای بەندی گەلۆیە، ئەگەر نوسخەیەکی تازە دۆزراوە لەم بەندەی -کەپێشتر نەیدیتووە- لە بەردەست دابندرێت، تەنانەت بەر لە خوێندنەوەشی، زۆر و کەم دەزانێت بەندەکە باسی چی دەکات، ئەوەی ئەو بەیتناسە لە یەکەم خوێندنەوەیدا سەرنجی دەداتێ، چۆنییەتی داڕێژرانی رستەکان و رادەی ناسکبوونی تەعبیرەکان و بەگشتی شێوەی دەربڕین لەم نوسخەیەدایە و ئەوانە هەموویان لە دەرەوەی بەستێنێکی ناوەرۆکی رووتن.

بۆچوونی دووەمیش بەشێوەیەکی تر لە گرنگی بەیت کەم دەکاتەوە. گومان لەوەدا نییە بەیتی کوردی سامانێکی چڕوپڕ و دەوڵەمەندی لە زانیارییە مێژوویی و کۆمەڵایەتی و زمانییەکان لەخۆ گرتووە، بەڵام بەم حاڵەشەوە بەیت نە بەتەنیا بابەتێکی مێژووییە و نە بابەتێکی کۆمەڵایەتی رووتیشە. ئەگەر وابا دەبوو بەهۆی وتارێکی شیکارانەی مێژوویی لەسەر کارەساتی دمدم، هەرچی نوسخەی بەیتی دمدمە وەلانرابان، بەڕاستی ئەگەر لە بایەخە تایبەتەکانی جوانیناسیی بەیت بترازێین، ئەو بەندانەی خوارەوە لە بەیتی دمدم، لەباری مێژووییەوە هەڵگری چ زانیاریگەلێکی بەقەدر و قیمەتن؟

سوارێك هات بە نادری

کەس نییە چەکانی وەرگری

خان دەپرسێ: "ئەوهە کێیە؟"

"خان ئەوە عەزرەتی خدری"
سوارێك هاتووە لەبۆ گەشتێ
بەویە سوورەتی بەهەشتێ
خان دەپرسێ: "ئەوهە کێیە؟"
"ئەوهە وەیسی ماهی دەشتێ"
سوارێك هاتووە لە کارخانێ
بەویە سوورەتی ئیمانێ
خان دەپرسێ: "ئەوهە کێیە؟"
"خان شێخ عەبدولقادری گێلانێ"
سوارێك هاتووە هونەرمەندە
ئەسپابی دەعوایەی رەندە
خان دەپرسێ: "ئەوهە کێیە؟"
"خان ئەوهە شاهی نەخشبەندە"

بەڕاستی بلێی بکرێت ئەم بەندانە وەکو بەشێك لەو راپۆرتە مێژوویيە چاویان لێ بکرێت کە باسی رووداوی دمدم دەگێڕنەوە؟ لەوانەیە لە نووسراوە مێژوویەکانیشدا، گەیشتن بەو عەینییەتەی هەموو جوداوازییەکان لە هەموو راپۆرتە جۆراوجۆرەکان بسرێتەوە، کارێکی گونجاو نەبێت، بەڵام بەلانی کەمەوە دەکرێت بڵێین لە نووسراوە مێژوویيەکاندا، گەیشتن بەو عەینییەتە دەتوانێت وەکو ئامانجێك -تەنانەت ئەگەر زۆر دوورەدەستیش بێت- لەبەرچاوی هەموو مێژوونووسێك بێت، کەچی ئێمە لەو بەشەی بەیتی دمدمدا، لەجیاتی عەینییەتی مێژوویی، لەگەڵ زەینییەتی تایبەتی کوردێك بەرەوڕوو دەبینەوە کە ئەگەرچی باپیرانی لە مەیدانی شەڕێکی نابەرانبەردا دۆڕاون، بەڵام لە چوارچێوەی تایبەتی بەیتەکەدا، دیاریکردنی ئارایشتی سوپای هەردووك لا بە مافی خۆی دەزانێت. بۆیە زۆر بەشێنەیی و لەسەرەخۆ، بەوپەڕی تێراديوييەوە، سوڵتان مەعرووفی کەرخی و شەمسی تەورێزی و رابیعەی عەدەوی و سەعدی وەقاز رەوانەی ناو سوپای کوردان دەکات و لەبەرانبەردا هەرچی کافر و مەلعوونە، بە پاڵەوپەستۆ دەباڵ

قۆشەنی هەنگامەی عەجەم دەپەستێ. کەواتە دەڵێین دەقی بەیتی دمدم، وەکو هـەموو بەیتەکانی دیکە دەقێکی هونەرییە.

نیشانەناسی، وەکو زانستی تاوتوێکردنی دەلالەتـە جۆراوجۆرەکـان پێمـان دەڵێـت، هەرچی نیشانەی زانستییە تەعبیر لە عەینییەتێك دەکات، بەدەر لە شوێن وەرگرتن لە زەینییەتە تاکەکان، بـەڵام نیشـانەی هونـەری تـەعبیر لـەو زەینییەتانـە دەکـەن کـە دەیانەوێت لەسەرڕاوە، بەشێوەیەکی تازە جیهان بخولقێنێتـەوە. بۆیـە هـیچ لەمپـەرێك ڕێگا لە بەیتبێژی کورد ناگرێت هەتا شەڕی قەڵای دمدم بە خەزایەك ببینێت کە ئاڵای "نەبی"ی تێدا هەڵکراوە.

ڕوانینی ڕووتی مێژوویی بۆ بەیت تەنانەت ئەم ختووکەیەشمان لە دڵ دەهاوێ کە بۆ نموونـە نوسـخەکانی بـەیتی هـەمزاغای مـەنگوڕ کـۆ بکەینـەوە و بـەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان، هەڵە مێژووییەکانیان لێ هەڵپەڕتێوین و نوسـخەیەکی پاڵاوتـە لـە بەردەستی خوێنەر بنێین!

مێژوونووس حەقی خۆیەتی بۆ ناسینی زیاتری کەسایەتیی کاکەمیر و کاکە شـێخ، ئاوڕ لەو نوسخانە نەداتەوە کە لەگەڵ دەقی شەرەفنامە ناکۆکن و زیاتر ئەو نوسخانەی بەلاوە پەسند بێت کە نێوەرۆکیان لەگەڵ نێوەڕۆکی سەرچاوە مێژووییە باوەڕپێکراوەکان یەك دەگرێتەوە، بەڵام نە ئەو مێژوونووسە دەتوانێت بەم پاساوە کە ئەو نوسخانە هەڵەی مێژووییان تێدایە شورت و گومیـان بکـات و نـە بەیتناسـیش دەتوانێـت لـە کـاری بایەخدانان بۆ ئەم نوسخانە، جوانکاری و ناسککارییە هونەرییەکانیان پشتگوێ بخـات و هەر بە تەنیا گرنگی بە سەنەدییەتی مێژووییان بدات.

وەکو دوایـین گوتـە لـەم بارەیـەدا دەمـەوێت پرسـیارێك ئاراسـتەی بەیتناسـان و خوێنەرانیش بکەم، پرسیارێك کە لەناو چوارچێوەی بارودۆخێکی گریمانەییدا دەتوانێت بێتە ئاراوە: با وای دابنێین دوو نوسخەمان لە بەیتی "کاکـە مـیر و کاکـە شـێخ" لـە بەردەستدایە. ناوەڕۆکی یەکێکیان لەگەڵ دەقی سەرچاوە مێژووییەکان یەك دەگرێتـەوە و ئەوی تریان ئەو هاوجووتییە ناوەڕۆکییەی تێدا بەدی ناکرێت، بەڵام ئـەو نوسـخەیەی نارێکە لەگەڵ دەقە مێژوویـیەکان، خـاوەنی فـۆرمێکی زۆر پتـەو و پێکهاتەمەنـدە و ڕستەکانی زۆر وەستایانە دارێژراون و تەعبیرەکانی لەوپەڕی ناسکیدان و نوسخەکەی تر لەم ڕووەوە ناگاتە ئاستی ئەمەیان. بەڕاستی لەم حاڵەتەدا بەیتناسێکی شـارەزا، کامـە

نوسخه به هونەری تر و گرنگتر دەزانێت و بێ ئەوەی هەوڵی شورت و گومکردنی هیچ کامیان بدات، کامەیان بەرزتر دەنرخێنێت؟

به وەلانانی ئەو شێوە لێکۆڵینەوانەی هەر به تەنیا جەخت لەسەر لایەنی مێژوویی، یان کۆمەڵایەتی بەیت دەکەن، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ که چ مێتۆدێك بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر بەیت لەبار و بەکەڵکە؟ چ جۆرە شیکارییەك دەتوانێت چوارچێوەی بەیتمان پێ بناسێنێت و له تاوتوێکردنی دەقە جۆراوجۆرەکاندا شارەزامان بکات؟

ئەو بابەتەی لێرەدا دەمانەوێت بیخەینە روو، هاوچەشنی ئەو بابەتەیە وا له وەڵامی پرسیارێکدا گەڵاڵە دەکرێت که لەبارەی چۆنییەتی فێربوونی زمانێکی تازەوە پرسیار دەکات. دوای ئەوەی کەسێك رێزمانی زمانێکی تازە فێربوو و تا رادەیەکی شیاو ئاشنای وشە و زاراوەکانی ئەم زمانە تازەیە بوو، ئینجا بۆخۆی دەتوانێت رستەی رێزمانی تازە که دەلالەت بۆ مانای دڵخوازی دەکەن، دابهێنێت.

ئایا دەتوانین بەیتیش به خاوەنی رێزمانێکی ئەوتۆ بزانین که بکرێت یاسا و رێساکانی بدۆزرێتەوە و چوارچێوە گشتییەکەی وێنا بکرێت؟ بەڕاستی دەتوانین بڵێین ئەگەر ئەو رێزمانەی دانە دانە رستەکانی ناو بەیتی پێ دادەرێژرێت، رێزمانی کوردی بێت، رێزمانێکی بووتیقاییش هەیە که بەگوێرەی ئەم رێزمانە تایبەتە چۆنییەتی بەدوای یەکداهاتنی رستەکان و بەندەکان و بەگشتی چۆنییەتی تەرکیبی بەیت، دیاری دەکرێت. دۆزینەوەی چوارچێوەکانی ئەم رێزمانە بووتیقاییە، گەورەترین هەنگاوە که له بواری بەیتناسیدا دەتوانین هەڵیهێنینەوە.

ئێمە ئەگەر بزانین بۆ نموونە هەر بەندەی حەیران له سێ بەش پێکدێت و کۆتایی هەر به شەش له خۆگری رێکەوەندێکی سەرواداره که سەرواکەی لەگەڵ سەروای دوو بەشەکەی تر یەکن، ئەودەم دەتوانین ئەوەندە شارەزاییە وەدەست بهێنین که بزانین لەو دوو بەندەی خوارەوە، کامەیان بەشێوەیەکی رێزمانی دارێژراون و کامەیان لەم دەربڕینە رێزمانییە بێبەرین.

بەندی یەکەم:

ئەمن دەڵێم لەوێ نۆرێ هەتا ئەوێ نۆرێ

ئەوە مەڕ و مێگەلی خۆیان راکێشان بۆ سەر گۆلی دە بەرخ شۆرێ

ئەتۆ دای و خوشکی دە خۆت نەبوون

لە بۆتیان ناردبانەوە بە دیاری هەر دۆلاّغ و گۆڕێ

بەندی دووەم:

ئەی خودا هاوار ئەی موسولّمانان!

کوڕم کوژراوە

بە پیرە سەری جەرگم بڕاوە

نەك هەر فۆرمە فۆلکلۆرییەکان خاوەنی ڕێزمانی تایبەت بە خۆیانن، بەلّکو چۆنییەتی ئالّوگۆڕکردنی فۆرمەکان و چۆنییەتی گۆڕانیان لە قالّب و شێوە گوتنێکەوە بۆ قالّب و شێوەگوتنێکی تریش، خاوەنی ڕێزمانێکی ڕێکوپێکە.

بەرلەوەی بپەرژێینە سەر چۆنییەتی وەدیهاتنی ئالّوگۆڕ لە فۆرمی بەربلاّوی بەیتی کوردیدا، با بەشێوەیەکی بەراوردکارانە، ئاوڕ لە بەستێنی ئەدەبی کلاسیك بدەینەوە و قسە لەسەر قالّبێکی شیعری کلاسیك بکەین کە لکی چکۆلّەتری لێبووەتەوە و دواتر ئەم لکە وەکو قالّبێکی تازە لە بەستێنی ئەدەبی کلاسیکدا بە فەرمی ناسراوە، ڕووداوێك کە لە بەستێنی بەیتی کوردیشدا ڕوویداوە، بەلاّم زۆرکەم ئاوڕی زانستیی لێ دراوەتەوە.

قەسیدە قالّبێکی شیعریی زۆر گرنگە لە شیعری کلاسیکی عەرەبی و فارسیدا، گرنگیی قەسیدەبێژی لە شیعری عەرەبدا تەنانەت بۆ دەورانی بەر لە ئیسلامیش دەگەڕێتەوە و ئەو حەوت پارچە قەسیدە فەسیح و بەلیغە کە بە "معلقات سبع" ناویان دەرکردووە و دەلّێن هۆنراوەی حەوت شاعیری بەنێوبانگی عەرەبی زەمانی جاهیلین و وەختی خۆی لە دیواری کابە هەلاّوەسراون، شاهیدی ئەم بۆچوونەن. فارسەکان ئەم قالّبە شیعرییەیان لە عەرەبەکان وەرگرتووە و بۆ مەدحی پادشا و ئەمیرە گەورەکانیان بەکاریان هێناوە. (لەبەرئەوەی لە کۆمەلّگای کوردیدا، حکومەتێکی نەتەوەیی بەهێز نەبووە کە بە دیاریکردنی ناوەندێك، حوکم بەسەر هەموو بەشەکانی ولاّتی کوردانـدا بکات، یان ئەگەر هەبووە وەکو نموونەی فەرمانڕەوایی بەدرخان، زۆرکەم خایەن بووە، هەربۆیە دەرباری ئاواش نەبووە کە بە پووت زێڕ و زێو بخاتە بەردەمی ئەو شاعیرە مەدداح و پەسن بێژانەی کاریان هەر بەتەنیا هۆندنەوەی قەسیدەی مەدحی بێت. ئەوەتا لە ئێرانیشدا، لە سەدەی شەشەم و حەوتەم بەملاوە، بەدوای تێکچوونی

فەرمانڕەواییەکی بەهێزی ناوەندی لە ئاکامی هێرشی مەغوولدا، گوتنی قەسیدەش بەم شێوەیە لەناو چوو و قەسیدە بێژەکانیش لە مەدحی پادشاکانەوە بایان داوە بۆ پەسنی وەلی و پیاوچاکان.

قەسیدە پارچە شیعرێکی درێژە و تەنانەت جاری وایە هەتا حەفتا بەیتیش خۆی لەبەریەك دەکێشێتەوە. ئەم قاڵبە شیعرییە لە چوار بەش پێکدێت. بەشی یەکەم (تەشبیب)ی پێ دەڵێن. وشەی تەشبیب کە لەگەڵ وشەی (شباب) هاوڕیشەیە، بەمانای یادکردنەوەی هەڕەتی لاوییە. لەبەرئەوەی قورسایی زۆرتری هەست و سۆزی ئەم دەورەیە، دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی و ئەوینداری، کەواتە ئەم بەشەی قەسیدە، زیاتر لەخۆگری شیعری ئەویندارانەیە. هەربۆیە ئەو بەشە سەرەتاییە، جگەلە (تشبیب) بە (تغزل) واتە گوتنی شیعری ئەویندارانە و هەروەها بە (نسیب) واتە گوتنی شیعری ناسك بۆ ژنانیش ناسراوە. دیارە لەبەرئەوەی بەشی سێیەمی قەسیدە، مەدح و پێهەڵگوتنی پیاوێکی گەورە لەخۆی دەگرێت، دەبێت شاعیر بتوانێت بەشێوەیەکی زیرەکانە بەشی یەکەم، یان بەشی تەشبیب لە بەشی سێیەم واتە بەشی مەدح گرێ بدات و لێکیان ببەستێتەوە. ئەوبەشەی کاری ئەو پێوەندی سازکردنە مانایە دەکات (تخلص)ی پێ دەڵێن، کە بەشی دووەمە و سەرکەوتنی بەرچاوی شاعیریش بۆ ڕێکخستنی ئەم پاژە کە ئەگەرچی لە هەموو بەشەکانی دیکەی قەسیدە کورتترە، بەڵام لە هەموویشیان دژوارترە، (حسن تخلص)ی پێ دەگوترا. دوای بەشی مەدح کە زۆرترین پێوانە لە ڕووبەری قەسیدەکە دەگرێتەوە، لە دوایین بەشیدا کە (شریتە)ی پێ دەڵێن، شاعیر دوعای بەخێر بۆ کەسایەتییە گەورەکە (مەمدووح) دەکات و لەبەر ئەوەی شاعیری قەسیدە بێژ لەم بەشەدا زۆرتر هیوای تەمەن درێژی هەتاهەتایی و ژیانی ئەبەدی بۆ مەمدووح دەخواست، ئەم بەشە، (دعای تایید)یشی پێ دەگوترێت، کە بەمانای دوعای هەتا ئەبەد مانەوەیە.

نموونەیەك لەم قەسیدە مەدحییانە بەهەر چوار بەشەکانییەوە ئەم پارچە شیعرەی خاقانی-یە:

(تشبیب)

ما فتنه بر توایم و تو فتنه بر آینه — ما را نگاه در تو، ترا اندر آینه

تا آینه جمال تو دید و تو حسن خویش — تو عاشق خودی، ز تو عاشق تر آینه

| | |
|---|---|
| در اینه دریغ بود صورتی کزو | ببیند هزار صورت جانپرور آینه |

(تخلص)

| | |
|---|---|
| از روی شاه گیرد نور و چوو آفتاب | و ز روی تو پزیرد زیب و فر آینه |

(مدح)

| | |
|---|---|
| سلتان اعزم انکه اشارات او زغیب | چونان دهد نشانی کز پیکر آینه |
| شاهنشهی که بر عروس جلال اوست | هفت آسمان مشاته و هفت اختر آینه |

(شریته)

| | |
|---|---|
| بادت جلال و مرتبه چندان که آسمان | هر صبحدم براورد از خاور آینه |

ئەوە قاڵبـی تایبەتی و فۆرمی گشتی قەسیدە بوو، بەڵام ئەم بابەتـەی دەمانـەوێت لەم وتارەدا جەختی لەسەر بکەین، باسێکی واوەی باسی ئەم قاڵب و فۆرمەیە. قەسیدە لە لایەکەوە لەبەرئەوەی دووردرێژ بوو و بێبەری بوو لـە تایبەتمەنـدیی کورتبڕینـەوە و لەلایەکی تریشەوە لەبەرئەوەی بەردەنگەکەی هەر بەتـەنیا کەسـێك، یـان کەسـانێکی تایبەت بوون، وێڕای ئەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانەی باسمان کردن، بەرەبەرە لە کـورتی و لە کزی دا، بەڵام لـەجیاتی ئـەو، بەشـی یەکـەمی واتـە تەشبیب هـەم لەبەرئـەوەی ناسکترین و هونەریترین بەشی قەسیدە بوو و هەم لەبەرئەوەی سـەرنجی جەماعـەتێکی یەکجار زۆری بۆلای خۆی رادەکێشا، بەرەبەرە لە قەسیدە جودا بووەوە و وەکو قـاڵبێکی شیعریی سەربەخۆ بە ناوی "غەزەل" ناوی دەرکرد. لە غـەزەلدا بەگوتـەی نووسـەرێکی ئێرانی، مەعشووق جێگای بە مەمدووح لێژ کرد و بە سیمایەکی دلڕفێنی ئـەوتۆ کـە تێکەڵاوێك بوو لە سێ سیمای مەعشووق و مـەعبورد و مەمـدووح، هاتـە مەیـدانی شیعری کلاسیك. لەبەرئەوەی شاعیر لە قەسیدەدا، بەر لە دەستپێکردنی بەشی مـەدح، تەخەللوسی بەناوی مەمدووحەکەوە دەکرد، دوای لـەکزی دانـی قاڵبـی قەسـیدە و وە رمێن کەوتنی قاڵبـی غەزەل، تەخەللوس بوو بە کۆتـایی غـەزەل و شـاعیر لـەجیاتی ناوی مەمدووح، ناوی خۆی دەهێنا.

غەزەل تا ئەو رادەیە لەلایەن شاعیران و شیعرناسانەوە گرنگی پێ درا کـە دیـوانی زۆریەك لە شاعیرە گەورەکان، لەڕاستیدا دیوانی غـەزەلیات بـوو، بـەڵام دیسـان ئـەو قسـەیە هـەتا ئێسـتاش لـە سـەرزاری شیعرناسـان بـووە کـە: "غـەزەل تەشبیبـی

قەسیدەیە". بەم شێوەیە غەزەلێك کە ئەوپەڕی هەتا دە بەیت درێژ دەبووەوە جێگای قەسیدەی حەفتا بەیتیی گرتەوە و ناوەرۆکی تەڕی وەسفی ئەویندارانە جێگای نێواخنی ئیشکی وەسفی دەستەڵاتدارانی گرتەوە.

حافز لە قەسیدەیەکدا بۆمەدحی دەستەڵاتدارێك دەڵێت:

وزیر شاەنشان، خواجەی زمین و زمان — کە خرمست بدو حال انسی و جان

قوام دولت و دنیا محمد بن علی — کە میدرخشدش از چهرە فر یزدان

بلێی بەلای شیعرناسانەوە زیاتر ئەم دوو بەیتەی سەرەوە پەسند بێت، یان ئەم دوو بەیتەی خوارەوە کە هەر لە غەزەلێکی حافزەوە هەڵبژێردراون.

آە از ان نرگس جادوو کە چە بازی انگیخت

واە از ان مست کە با مردم هشیار چە کرد

اشك من رنگ شفق یافت ز بی مهری یار

تالع بی شفقت بین کە درین کار چە کرد

بەیتی کوردی مەدحی دەستەڵاتداران ناکات. وێکچوونی بەیت و قەسیدە، نەك لەم لایەنە ناوەرۆکییەدا، بەڵکو لە لایەنێکی فۆرمی و پێکهاتەییدا زەق دەبێتەوە. بەیتە درێژەکان لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی چەندین بەشی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرن، کە مەنتیقی فۆرمیی و ناوەرۆکیی ئەم بەشە جۆراوجۆرانە تاڕادەیەك پێکەوە جوداوازییان هەیە.

بەیت لە هەندێك بەشیدا بە وەسفی ناسك و ئەویندارانە شێوازێکی لیریك و غینایی بەخۆیەوە دەگرێت. لەم بەشانەدا زۆرتر وەسف و نزایەکی ئەویندارانە و پاڕانەوەیەکی دڵسووتاوانە لە قالبی مۆنۆلۆگدا بەدی دەکرێن:

مەرزینگان هەر لە کن من مەرزینگانە

لە کن من چاوی کۆترە و لێی ون بووە هێلانە

لەکن من بەرخە کۆرپەڵەی دوای مێگەلانە

لە کن من گەوهەری خەزێنەی شاە و سوڵتانە

هەر لە کن من موحتەبەرە، لەبەر دلانە

یان دەبێ سەری خۆم بەرمەوە گۆڕ و گۆڕخانە
یان دەبێ سەری خۆم بکەم بە کۆی مەیدانە

لە هەندێك بەشی تردا، بەهۆی زەقبوونەوەی کێشەکان (کێشە بە مانا دراماتیکییەکەی)، ڕەنگی دراماتیکی بەیت بەشێوەیەکی تۆختر خۆی دەنوێنێت. بەیت ئەگەر لە بەشە لیریکییەکەیدا مەنتیقێکی ستاتیك و نەرم و نیانی هەیە، لە بەشە دراماتیکەکەیدا خاوەنی مەنتیقێکی دینامیك و پڕ جوولەترە. لەم بەشانەدا کارەساتە تراژیدییەکان بە خێراییەکی زۆر لە حاڵی قەومان دان:

دەجا سواران با وەخڕ بن. جڵەوگیری دوژمن بکەن ڕۆژی لێ قەومانە
کەلاك دەکەوێتە گۆڕێ و ڕۆژی دڵ هێشانە...

لەشکر بەرانبەری یەکتری دەبوون، دەنگی قەرەبینایە و ڕمبی دەم ڕەشی هەژدە قەماوە شۆڕ مەحموود هەرجارێکی ڕکێفی بۆ وڵاغی شێرخەزاڵی (؟) دەهێناوە
دوازدە کەسی لە ئەمیر و سەردار عێلان لەسەر پشتی ڕکێفی فڕێ دەداوە.
مەستی مەرزینگانە، دەربەستی مردن نییە هیچ ئاگای لەخۆی نەماوە
وادەزانێ دەستی لە گەردنی مەرزینگاندایە، هەر نازانێ ڕۆژی دڵ هێشانە و قەوماوە

جودا لەم دوو بەشە، لە هەندێك بەشی تردا، شێوازی بەیت نە ئەوەندەی شێوازە دراماتیکە پڕ جوولەکە، تەژی لە کێشەیە و نە ئەوەندەی شێوازە لیریکە نەرم و نیانەکە، ڕاوەستاوە یان بڵێین هەم جوولەیەکی دراماتیك و هەم نەرم و نیانییەکی لیریکی تێدایە. لەم شوێنانەشدا هۆی دراماتیکبوونی دەق، گوتوبێژێکی بەردەوام لەنێوان دوو کەسە و هۆی لیریکبوونیشی، ئەوەیە کە ئەم گوتوبێژانە زۆرتر ئەویندارانەن و لەبەر ئەوەی وەسفەکان درێژ دەبنەوە و دەلالەت بۆ کردە و کێشە بگۆڕەکان ناکەن، بەڵکو دەلالەت بۆ حاڵەت و وسفە نەگۆڕەکان دەکەن، خەسڵەتێکی ڕاوەستاویان هەیە:

شۆڕ مەحموود هاتە بەر پەنجەرە بانگی مەرزینگانی کرد و گوتی:
کیژێ بێ بەعسەتی، بەعسەت پێ نەدراوی

رەشە ڕێحانەی ئێستا دەست لێ نەدراوی، نەژاکاوی و هەڵنەکەندراوی
زەردە مەمامن حەفس کردووە لەژێر کراسی مەخمەڵ دارایی دا بەمیسالی هەرمێ گوڵاوی
تێچووی تەرکە و تورکومانم دەیە بۆم هەڵێنە گۆشە چاوی...
مەرزینگان ئەگەر چاوی بە شۆڕە مەحمود کەوت، بەرۆکی ئاواڵە کرد و گوتی:
ئەوە کاری بابمە دەتنێرێ بۆ جەنگی جوکلی هەمەوەند و سمێڵ سپی کامەرییە
ئاگاداری تۆبێ ئەلیاس لە بەحرێ و خدر لە چۆلی و لە بەرییە...
لە پاشت بەجێ نەمێنێ بەژنێکە باریك و دوو کولمەی لیمۆییە

لە هەندێك شوێنی تردا، قورسایی بەیت دەکەوێتە سەر شینگێڕی و نزای عەودالانە. لەم بەشانەدا، دیالۆگی ئەویندارانە جێگای خۆی دەدا بە وایلۆکی مەزلوومانەی کەسێکی لێقەوماو:

سوارینە وەرن لە دڵێکە من گەڕێن ئەوە چ بووە چ قەوماوە
ئەی لەوی خەبەری لە نەدیو و لە نەکاوە!
کوڕە خۆ راستە دەڵێن شۆڕ مەحمود لە گێژی دەریایەدا خنکاوە
سەڵای گەورە و گرانم لێ رابوو کەسم لە ماڵە باوانی نەماوە
شەرت بێ پاش تۆ یەخەی کەتانی من بۆ کەس ئاواڵە نەکراوە
تا ئەو رۆژەی دەڵێن رۆژی قیامەتە و رۆژی عەرشە و خودا دیوانی داناوە.

کەواتە وەکو ئەنجامگیرییەك دەکرێت بڵێین، لە بەیتەکاندا، چەند بەشێکی وەك وەسف و نزا، گێڕانەوەی رووداوەکان و شینگێڕی، کری بەیت دەچنن، ئینجا لە بەشی گێڕانەوەشدا جاری وایە رەوتی رووداوەکان خێرا و پڕ کێشە دەبێتەوە و جاری واشە بە هاتنی گوتوبێژێکی دوولایەنە بێ ئەوەی رەوتەکە تەواو بوێستێ، تارادەیەك لە خێراییەکەی کەم دەبێتەوە. لە بەشی وەسف و نزادا، هیچ رەوت و رووداو و ئاڵوگۆڕێك بەدی ناکرێت و ئەوەی هەیە پێهەڵگوتنە. بەشی شینگێڕی بەچەند هۆ تارادەیەك تایبەتمەندیی بەشەکانی تریشی پێ دەبڕێت. هۆی یەکەم ئەوەیە کەسی شینگێڕ بە بیانووی شینگێڕییەوە، بەشێك لە رووداوە تراژیدییەکە دەگێڕێتەوە، رەنگدانەوەی

کێشەکان لەم بەشەدا تارادەیەکی کەم وەبەرچاو دەکەوێت. هۆی دووەم ئەوەیە، چونکە کەسی قوربانی نزیك و خۆشەویستی کەسی شینگێڕە، کەواتە وەسف و نزا و پیهەڵگوتنیش دێتە ناو شینگێڕییەکەوە.

لەنێو ئەم بەشە جۆراوجۆرانەدا، جوانترین و ناسکترین و سەرنجڕاکێشترین بەش، دیالۆگی ئەویندارانەی کیژ و کوڕە. هەر ئەو بەشەیە کە لە پێکهاتەی بەیت جودا بووەتەوە و وەکو جۆرێکی فۆلکلۆری سەربەخۆ بەناوی حەیران، درێژەی بە ژیانی خۆی داوە. ئەگەر غەزەل تەشبیبی قەسیدە بێت، حەیرانیش ئەو غەزەلەیە کە لە تەغەزوللی بەیتەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. حەیران بە پێچەوانەی بەیتە درێژەکان، دەتوانێت تەنانەت هەتا سێ رستەش کورت بێتەوە. کەواتە هیچ سەیر نییە کە حەیران لەبەر ئەم سووك و چکۆڵە و گرد و کۆبوونە لە لایەك و لەبەر ناسکبێژی و جوانکارییەکانی لەلایەکی ترەوە، جێگای بە بەیت لێژکردبێت و زیاتر لە جۆرە فۆلکلۆرییەکانی تر وەرمێن کەوتبێت. ئێستا بەم ئاکامە گرنگە دەگەین کە بەرلەوەی لەبارەی جوغرافیاییەوە پرسیار لە شوێنی سەرهەڵدانی حەیران بکەین، دەبێت لەباری فۆرمی و پێکهاتەییەوە، لە چۆنییەتی ئەم سەرهەڵدانە وردبینەوە. ئەوە هەڵەیەکی زۆر گەورەیە بڵێین حەیران لە دەشتی هەولێر، یان ناوچەی موکریانەوە سەری هەڵداوە. ئەگەرچی ئێستا ئەم دوو هەرێمە، وەك دوو ناوچەی جوداواز لەناو جوغرافیای دوو وڵاتی جیران چاویان لێ دەکرێت، بەڵام لە کاتی سەرهەڵدانی حەیراندا، رۆژهەڵاتی موکریان هەتا رۆژاوای دەشتی هەولێر لەناو یەك یەکە (واحید)ی جوغرافیاییدا بوون. لە زەمانی زوودا ئەو هۆزانەی نیوەی ساڵیان لە کۆیە و بیتوێن و پشدەر، رابواردووە، نیوەی تری ساڵیان لە شنۆ و لاجان و سندووس و شارویران بردووەتە سەر و بە پێچەوانە ئەو هۆزانەی نیوەی ساڵ لە کوێستان ژیابێتن، نیوەکەی تری لە گەرمێن ژیاون. راستە هۆزی واهەبووە مەودای هێڵی گەرمێن و کوێستان کردنەکەی مەودایەکی بەرتەسك بووبێت، بەڵام بەگشتی ئەو هێڵەی دەشتی هەولێر بە موکریان دەلکێنێت، بەسەر ئەو ناوچانە تێدەپەڕێت کە هەموویان بۆ هۆزە کوردەکان ئاشنابوون. هۆی ئەوەی هەندێك تەعبیر و زاراوەی وەکو بەری سوێسنایەتی و بەری پیران و وڵاتی مەرگە و پشدەرییان و زۆر زاراوەی تری لەم دەستەش هەر لە کۆنەوە لە ئاخاوتنی کوردیدا باوبوون، ئەمەیە هۆزە کوردەکان سەرەڕای هەموو گەرمێن و کوێستان

کردنەکانیان بۆ کاروباری ئاژەڵداری، ناچار بوون بۆ کاروباری کشتوکاڵیش، تارادەیەك خۆیان بە شوێنێکەوە ببەستنەوە، بەڵام کێ هەیە حاشا لەوە بکات کە ئەو خۆبەستنەوە و مانەوەی وەك ئەو دامەزران و مانەوەیە نەبووە کە کوردەکان لە سەدەکانی نۆزدە و بیستدا بەرەبەرە وەکو شێوەی ژیان هەڵیانبژاردووە و ئەم شێوە ژیانە بەهۆی سنوورەکانیشەوە هێندەی دیکە پەرەی سەند.

بەڕاستی کێ هەیە بڵێ عەشیرەتێکی وەکو مەنگوڕ هەر بەتەنیا خەڵکی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانن، یان بڵێ هەر بەتەنیا خەڵکی باشوورن. پرژ و بڵاوی ئەو شوێنە جوغرافیاییانەی عەشیرەتی هەرکی تێیاندا نیشتەجێن لە شوێنی نیشتەجێبوونی مەنگوڕەکانیش زۆرترە و هەر سێك هەرێمی باشوور و باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان دەگرێتەوە. کەواتە با چیتر بە پرسینی ئەو پرسیارە ساویلکانەیە کە حەیران لە کامە ناوچەی کوردستان سەری هەڵداوە، خەریکی دۆزینەوەی وەڵامی لەویش ساویلکانەتر نەبینەوە و نەمانەوێت بە دەمارگرژییەکی ناوچەییەوە خۆمان لە قەرەی بابەتێکی زانستی بدەین. شوێنی سەرهەڵدانی حەیران، هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە لەنێوان موکریان و دەشتی هەولێر هەڵکەوتوون. دیارە دواییش بەهۆی گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی سەدەی نۆزدە و بیستەم و بەهۆی لێکدابڕانی ئەو ناوچانە، حەیرانی دەشتی هەولێر و حەیرانی موکریان لەباری چۆنییەتی بەکارهێنانی تەعبیرەکانەوە نەختێك لێك جوداواز بوون.

کەواتە لەجیاتی ئەوەی دەربارەی شوێنی سەرهەڵدانی حەیران پرسیار بکەین، باشتر وایە ئەو پرسیارە بهێنینە گۆڕێ کە پێکهاتەی حەیران لە چ پێکهاتەیەکی ترەوە سەری هەڵداوە. بۆئەوەی باشتر ئەو بابەتە بسەلمێنین کە پێکهاتەی حەیران، بەشێکە لە پێکهاتەی بەیت، با ئەم بەشەی خوارەوە لە گوتوبێژی لاس و خەزاڵ لەگەڵ بەشێکی تر کە لە حەیرانێك هەڵبژێردراوە، هەڵسەنگێنین:

خەزاڵ دەڵێ:

بریا ئەمن دیوە خانێك بوایەم بەرەو قوبڵە، شوعرەی منیان بکێشایە
پەنجەرەی سێ دەریان لە پێشی من لێ بدایە
ئێوارە و سبحەینان لێی بدرایە شوبایە
کەسێکی ماندوو بوایە و عێجز بوایە

بیکوتایە ئەوە جێگای ئیسراحەتگایە.

لاس دەڵێ: ...

چاوت بە من بمێنێ بە ئەستێرەکەی ڕۆژێ ئەگەر تازە هەڵدێ پڕیشکان داوێ

بەژنت بە من بمێنێ بە چووزەی پیرە لاولاوێ

سبحەینان تاو لێی نادا گوڵی لاولاو گەشە، نیوەڕۆیان هیچ کەس لێی نایینێ کام و کاوێ

حەیران:

دەجا براینە برادەرینە بریا ئەمن گوڵێك بام لە گوڵی کەس نەناسی

ڕەخسابام لە نەویان، لە کەویان، لە قووچەکەی بلّباسی

دەلێم بریا شتلە ڕێحانێك بام لەسەر هەیوانی ماڵە بابی نازدار حەیرانێ

هەموو ئێوارە و سبحەینانێ ئاوی ئیستکانی دەبن کردبام...

بەژنی تۆ بەمن بمێنێ بە کەوێ سەهەند و سۆلاوان

سوورە قورینگێ گەردەن گۆزەڵێ، بەوی خارێ گوڵ بەدەمێ

ئەگەر شەختێ پایزانی لێدەدا لە رووباری پیرە کەلۆێ

بەژنی تۆم بە من بمێنێ بە وێنەی لکە ریواسی

ئەگەر بوهاران دێنەدەرێ لەسەر قەبری حاجی مەمێندی غولامکێ لەگەڵ گوڵی بێژانێ

لەوانەیە لە بەیتێکدا هەر بەتەنیا بەشی شینگێڕییەکە مابێتەوە و چۆنییەتی ڕوودانی کارەساتە تراژیکەکە لە ڕێگای شینگێڕییەوە بگێڕدرێتەوە. لەڕاستیدا زۆر بەیتی وەك سەیدەوان، سوارۆ، ئەحمەدی شەنگ و کاکە میر و کاکە شێخ بەم شێوەیەن، لەبەرئەوەی لەم بەیتانەدا لەجیاتی ئەو مەنتیقە مەجازییەی لە بەیتە درێژەکاندا وە بەرچاو دەکەوێت، زۆرتر مەنتیقێکی خوازەیی دەبینیدرێت، دەکرێت ناوی، "بەیتی خوازەیی" لەسەر ئەم جۆرە بەیتانە دابنێین.

هەر بەم شێوەیە و بەپێی ئەو مێتۆدەی لەم وتارەدا قسەی لێ کراوە، دەکرێت چۆنییەتی سەرهەڵدانی فۆرمە چکۆڵەترەکانی فۆلکلۆری لەناو فۆرمی بەربلاوی بەیت، شی بکەینەوە.

سەرچاوەکان:

١- ئۆسکارمان، تحفە موزەفەریـە، پێشـەکی و سـاغکردنەوەی مامۆسـتا هـێمن، انتشارات سیدیان، ل٣-٢١٢.

٢- سەلاح پایانیانی، کانی مرادان، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیه، ١٣٨١، ل١٩٥.

٣- سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٦.

٤- میمنت میرصادقی، واژەنامه هنر شاعری، کتـاب مهنـاز، چـاپ دوم، تـەران، ١٣٧٦، ل٢١٠-٢٠٨.

٥- دکتر سیروس شمسیا، انواع ادبـی، انتشـارات فردوسـی، چـاپ پـنجم، تـەران، ١٣٧٦، ل٢٧٩.

٦- سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩.

٧- لسان الغیب، با تصحیح و مقدمه پژمان بختیاری، انتشارات امیرکبیر، چـاپ یازدهم، تهران، ١٣٧٨، ل٥١٥.

٨- سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.

٩- قادر فتاحی، قازی، شـۆر محـمـوود و مـەرزینگان، انتشـارات دانشـگاه تبریـز، ١٣٤٨، ل٧٢.

١٠- سەرچاوەی پێشوو، ل٥٥-٥٤.

١١- سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.

١٢- سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

١٣- قادر فتاحی، قازی، منزومه کردی لاس و خزال، انتشـارات دانشـگاه، تبریـز، ١٣٧٩، ل٦٦.

١٤- سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠.

١٥- ئەحمەد بەحری، گەنجی سەربەمۆر، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل١٧٢.

١٦- سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢.

## بەیت و باوی کوردی

## ئاسۆ بایزیدی- نەرویج

هەموو دەزانین کە لەم هەزارەی سێیەمەدا هەر ڕۆژ لاپەڕەیەکی پێشکەوتن هەڵدەدرێتەوە و خۆرێکی نوێ لە ئاسۆی دیتنەوەکانی مرۆڤدا هەڵدێت. مرۆڤ لەژێر سێبەری دەستکەوتەکانیدا پاڵیداوەتەوە و حەیرانی حەسانەوەی بۆ دەڵێت. هەر ئەم بێخەیاڵی و پاڵدانەوەیە بووەتە هۆی ئەوەی زۆر لایەنی خاوێن و روونی فەرهەنگ و وێژەی رابردوو تەپوتۆزی لەبیرچوونیان لەسەر بنیشێت. پێشکەوتن و شانازیکردن بە پێشکەوتن کاتێ دەتوانێت جوان بێت کە کۆڵکەزێڕینەی فۆلکلۆر و کەلەپوور لە ئاسمانی ژیانی تازەدا بدرەوشێتەوە و ببێت بە مانگەشەو بۆ رێگای پڕ لە هەوراز و نشێوی داهاتوو.

هەر نەتەوەیەك کە لە ئامیان (هەوێن)ی ئەدەبیاتی خۆیدا رەسەنایەتیی ئەدەبی فڕێداتە دەر، نە بە لووتکەکان دەگات و نە دەشتوانێت لە داوێنی چیاکاندا رەشماڵی جێگیربوون هەڵدات. کەسانێك هەن کە فیز و دەماریان لە ئاسمانە و بە بیانووی نوێخوازی شەق لە فۆلکلۆر هەڵدەدەن. خۆیان بە ئاشنای مودێرنیزم و مەکتەبە سوور و رەشەکانی ئەدەبی، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی دەزانن و بە تەوری بە خەیاڵ رووناکبیری، کەوتوونە دارستانی رابردوو. ئەوانە نەیانتوانیوە هەست بە گرنگی مەسەلەکە بکەن. ئاوڕدانەوە بۆ پشتەوە بە مانای دواکەوتوویی نییە. مێژوو،

فەرهەنگ، دابونەریت، پەند، مەتەڵ، بەیت و باشترین بەردن بۆ بناغەی کۆشکی فێربوون و زانستی ئەمرۆی هەر نەتەوەیەك.

من لەم کورتەباسەدا نامەوێت و ناشتوانم بە تەواوی باسی چیرۆك و بەیت بکەم لە ئەدەبی بەربلاوی کوردیدا، بەڵام وەك کورد وتەنی دیاریی شوانی ئاڵەکۆکە منیش تا ئەو جێیەی مێشکم بڕی کردووە و هەلم بۆ رەخساوە لەم کتێب و لەو کتێب هەرچی سەبارەت بە بەیتی کوردی بووە، پاشەڕۆکم کردووە. لەم کورتە نووسراوەیش تەنیا مەبەستم ئەوە بووە کە بڵێم و تا رادەیەکیش بیسەلمێنم کە لەنێو نەتەوەی کورددا زۆر چیرۆکمان هەن کە شان لەشانی شاکارە ئەدەبییەکانی نەتەوەکانی دیکەی دونیا دەدەن.

هەر لە کۆنەوە بەیتەکان کە بەیتبێژان لەنێو شیناوەردی بۆنخۆشیی فۆلکلۆری خەڵکی شار و دێ بە هێڵەکی سەرەنج و وردبینی دایانبێشتوون و هەروەك ئەڵماسێکی ئاسمانی لەنێو هەنبانەی بیرەوەرییەکانی رۆژگاردا جێگایان بۆ کردوونەوە. بووکی شیکپۆشی چیرۆك شەوانە دەیان رەزاسووك و گوڵمە نەخشین تارای لەسەر لادەبەن و نەك بە چاوی سەر، بە چاوی دڵ لێی دەڕوانن و بە گوێی دڵ گوێی بۆ دەگرن. چیرۆکێکە لە ناخی دڵ کار دەکات. چیرۆکبێژان بەیتەکان دەبەنە گەرمێن و کوێستانی دڵەکان تا ئێمە لە ئاوێنەی کەڵك و عەبرەتا چاویان لێ بکەین و ببن بە بناغەیەك بۆ دانانی کۆشکی داهاتوو.

لە رۆژگارانی پێشوودا بەیت گێڕانەوە و حیکایەت خوێندنەوە لەنێو زۆربەی نەتەوانی دونیادا باوبووە. بۆ وێنە لە ژاپۆن بنەماڵەیەك بە نێوی کاتاری - بە (Katari-be) ئەو کارەیان دەکرد و لە بەریتانیاش باردەکان (Bard) لە جێژنەکان و کۆبوونەوە جۆراوجۆرەکاندا بەیت و باویان بۆ خەڵك دەگوت. لە روسیادا دەستەیەك بە نێوی ئیسکمروخ (Skomorokhi)ی هەبوون، کە بەیتی پاڵەوانەکانیان بە شیعر هۆنیبووەوە و بۆ خەڵکی شار و دێیان دەخوێندنەوە. راپسودوسەکان (Rhapsodus)یش لە وڵاتی یۆناندا کاریان ئەوە بوو کە نەهێڵن چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان بفەوتێن. دەگێڕنەوە کە هومێر یەکێك بووە لەو راپسودوسانە. لە کوردستانی ئێمەشدا مێژوویەکی زۆر کۆنی هەیە. شەوانی زستان مامە پیرەی دێهاتەکان لە دەوری کورەی داران زۆر ژن و پیاوی لەخۆ کۆ دەکردەوە، وردە وردە لەگەڵ خواردنی مێوژ و گوێز دەنگی نەرمی تێکەڵ ترپەترپی دڵۆپەکانی باران دەکرد و

سەرمای نەبوونی لەبیر بیسەر دەبردەوە و ناحەزی و نالەباری شەوی بە بەیتی خۆش و رێکوپێك بەرەو دونیای نەبوون دەبرد، لەلایەك سەفەری دووردوودرێژی "ناسر و مالمال"ی باس دەکرد، تاوێکی تر کوێرەوەرییەکانی "لاس و خەزال"ی دەگێرایەوە و بۆ لای نیوەشەو دەگەیشتە پەژارەکانی "خاکمال".

ئەو بەیتبێژانە کەچاوەڕوانیی خەلات و ڕێزانە نین، نەك هەر لە شەوانی زستان و دەوری کورەی داران، بەلکو لە هەر جێیەك کە هەلیان بۆ دەرەخسا، دەستیان دەکرد بە گێڕانەوەی ئەو حیکایەتانە. لە بەهار و هاویندا، لەژێر سێبەری فێنك و ئێسك سووکدا، لەنێو دەستەی دروێنەوانان و کەلگەڕاندا ئەو چیرۆکانە تام و چێژی تایبەتی خۆیان هەبوو. لە ریزی هەرەوەرز چیاندا و لە پێشەوەی هەمووان کەسێ هەبوو بە دەنگی خۆش بەیتی بۆ دەگوتن. حیکایەتی "حاجی ڕێوی"... "هاوارەبەرە"... "گەنج خەلیل ئاغا" ماندووبوونی لە لەش دەردەکردن. تاوێکی کە چیرۆکی "سەیدەوان" فرمێسکی لە چاو دەڕژاندن، جاروبارێش چیرۆکی "حەسەن ترسەنۆك" بزە و کەنینی دەکردنە میوان.

ئەو چیرۆکبێژانە شانبەشانی مێژوو و بە وەبەرچاو خستنی پاش و پێشی بەیتەکان لە هەر جێیەك کە بە پێویستیان دەزانی بێدەنگی ڕۆژیان دەشکاند و بەیتێکیان بە پوختی و پڕی، بێ ئەوەی شتێکی گرنگی لێ کەم وەکەن بە یادگاری بە مرۆڤی ئەمرۆی دەدەن، بەلام ئێمەی پێنەزان، ئێمەی نوستوو قامبێژ بە لۆتیی دادەنێین. ئاوڕدانەوە لە رابردوو بە دواکەوتوویی دەزانین. چاوەڕوانین "فیتزجرالدێ، نیکلسۆنێ، ئەدوارد براونێ" شتەکانمان بۆ کۆبکەنەوە. لەوەشدا چیرۆکمان هەیە "رەجەب" کاکلەکەشمان لە زار داوێن زەحمەتی شەویلکە پێوەکەنان بە خۆ نادەین.

پاش باسێکی کورت سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی بەیت، بەیتێکی ناوچەی سەردەشت دەخەمە بەرچاو.

ئەو بەیتانە کۆمەلێك باسن سەبارەت بە کردەوە و ئاکاری مرۆڤەکانی بەرایی، هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە بۆ یەکەم جار لەسەر ئەم دونیایە سەریان هەلداوە و تەواوی ئەو ڕووداوانەی کە لە کانیاوی شانازی هەر نەتەوەیەکەوە سەرچاوە دەگرن.

ئەو بەیتانە روانینێکی بەرچاون بەرەو دونیای شاراوە و پڕ لە رەمز و رازی مێژوویی و خەیالات و فۆلکلۆری هەر نەتەوەیەك. ئەو بەیتانە هەر لە کاتی لەدایکبوونەوە دەست دەکەن بە گێڕانەوەی بەسەرهات و گۆڕانکاری و پالەوانبازی و شەڕکردن و خوێنڕشتن و هەلاتن و هاتنەوە و زۆر باسی تر... و لەڕاستیدا ئەو شتانە یانی شەڕکردن و هەلۆاسین و کوشتن و لە سەرچاوەی ئۆستۆرە ئاو دەخۆنەوە و زۆر شیاوی باسن.

ئەو بەیتانە لەدوای تێپەڕبوون لە دەورانی رێکوپێك بوون بە جلوبەرگێکی رازاوە بەنێوی پێناسەی نەتەوەیی، خۆمان پیشان دەدەن. واتە دەبنە "پێناسەی میللی". هەر ئەو پێناسەیە باسی مێژوو و ئاوات و بیروبڕوای بەرز و زۆر ناوەرۆکی بە بایەخی دیکەی نەتەوەیی دەکات کە بە درێژایی مێژوو نەیانتوانیوە خۆ نیشان دەن.

لەنێو هەموو بەیتەکانی گەلانی دونیادا لە بواری چۆنی و چاکیی جیاوازیی زەق دەبینرێت، بەلام لە زۆر جێگاش لە یەك دەچن. ئەو خالانەی کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکەم لە هەموو بەیتێکی فۆلکلۆردا وەبەرچاو دەکەون.

١- لە هەموو حیکایەتێکدا پالەوانێکی گەورە هەیە کە نە کەس پێی دەوێرێت و نە کەس دەتوانێت پشتی لە ئەرز بدات، بەلام هەر ئەو پالەوانە لە کۆتایی تەمەنی بەدەست مرۆڤێکی زۆر ئاسایی دەکوژرێت. وەك بەیتی "لاس و خەزال" و چۆنییەتی کوژرانی بە دەستی چلکنێك.

٢- یەکەم بەردی بناغەی هەر بەیتێك سەفەرێکە کە لەو سەفەرەدا زۆر کوێرەوەری و چەرمەسەری بۆ یەکەم پالەوانی چیرۆك دێتە پێش. هەر ئەو سەفەرە بە رادەیەك لەو حیکایەتانەدا دەوری هەیە کە زۆرجار بەیتێ لە سەفەرێکدا کۆ دەبێتەوە وەك سەفەری حەوت سالەی "ناسر و مالمال".

٣- پێخۆری هەموو بەیتەکان لەسەر کێشەیەکە. زۆرجار ئەو کێشەیە لەسەر خاك و نیشتمانە وەك بەیتی "دمدم"، جاری واشە لەبەر خاتری گەیشتن بە ژنێك، ئەو کێشەیە دادەمەزرێت، وەك چیرۆکی "خاکمال". جاروباریش زولم و زۆری ئاوری ئەو کێشەیە خۆش دەکات کە هەوێنی زۆربەی بەیتەکانی کوردی ئەوەیە.

٤- لەو حیکایەتانەدا ئاژەل دەوری بەرچاویان هەیە. کەڕەتی وایە پالەوان لە مردن رزگار دەکەن. جاری واشە بۆ کوشتنی دوژمن یارمەتیی پالەوان دەدەن.

٥- چوارچێوەی ئیشکردنی پاڵەوان، یان پاڵەوانانی چیرۆك نازانرێت. بۆ وێنە هێندێ جار پاڵەوان لەسەر ئەرزە و ماوەیەکی تر دەچێتە دونیای مردووەکان، یان ماوەیەك لە بەهەشتێیە، ماوەیەکی تر لە دۆزەخە.

٦- خەون بە داهاتووە و دیتن یەکێکی ترە لە تایبەتمەندییەکانی ئەو حیکایەتانە، کە چۆن پاڵەوانی بەیت خەونی دیبێت هەر ئاوا دێتە دی. وەك بەیتی "گەنج خەلیل ئاغا".

٧- لەو بەیتانەدا زۆر باسی دێو و درنج و جادوو دێتە پێش. پاڵەوان لەگەڵ دێوان دەکەوێتە شەڕ و دەیانکوژێت. جاری واشە لەگەڵیان ئاشت دەبێتەوە و دەبێتە دۆست. وەك بەیتی "حەسەن ترسەنۆك".

٨- بەغیرەتی و ڕووڕاستی و ئازابوون بەرچاوترین تایبەتمەندی پاڵەوانی ئەو بەیتانەن. مردنی لە دیلی پێ باشترە. هەموو کات یارمەتی مەزڵووم و هەژارەکان دەدا، هەر بۆیە خۆشەویستی هەموو خەڵکە.

ئەو بەیتانە لە کۆنەوە بە دوو بەش دابەشکراون. بەشی یەکەم ئەو بەیتانەن کە کەس نازانێت بۆ یەکەم جار کێ دایناون و کاری لەسەر کردوون، ئەوانە سینگ بە سینگ بە ئێمە گەیشتوون. ڕەسەنترین جۆری بەیتەکە حەیرانبێژ و بەیتبێژان لە شار و دێ لەبەر دەیانخوێندنەوە و خەڵکی دیکە لەبەریان دەکردن. لە ئەدەبی کوردەواریدا جۆرە چیرۆکی ئاوا زۆر هەن وەك "ئایشە گوڵ"، "شێخ فەرخ" و "سەیدەوان".

بەشی دووەم ئەو بەیتانەن کە لە کۆنەوە نەبوون، بەڵکو سازکراوی بیر و مێشکی حیکایەتبێژانن. هەر لە سەرەتاوە بیسەر بۆی دەردەکەوێت کە زۆر ڕەسەن نییە، چونکە بە چاولێکەری لە حیکایەتەکانی دیکەوە گوتراون و نووسراون. ئەو چیرۆکانە زۆر بەربڵاون، بەتایبەت لە ناوەڕۆکدا. هۆی ئەو بەربڵاوییەش ئەوەیە کە دانەریان لە هەرجێیەك کە کەیف سازبووە و ناوەرۆکیشی پێ خۆشبووبێت بە کەیفی خۆی بۆی داناوە. وەك چیرۆکی "عیسا و موسا و شێخە".

زمانی گێڕانەوەی ئەو چیرۆکانە سادە و کاڵە. لە بواری ئەدەبییەوە بایەخێکی ئەوتۆی نییە. لە زۆر شوێنیش قسەی بێ ئەدەبانە و دوور لە ئەخلاق دەگوترێت.

حیکایەتبێژان کاتی گێڕانەوەی ئەو بەیتانە بە پێویستی شوێن و کات زۆر شتیان پێوە دەنێن و زۆرجاریش شتیان لێ کەم دەکەنەوە، بەتایبەت ئەو کاتانەی کە بەیتیان

بۆ ئاغا و بەگ و بەگزادە دەگێڕنەوە، چونکە هەر لە ترسدا بوون کە نەکا شتێ بڵێن کە بە کەیفی ئاغا و پاشا نەبێت و سەری خۆیان دانێن.

**خاکماڵ:**

هەبوو نەبوو لە رۆژگاری پێشوودا پاشایەك هەبوو حەوت کوڕی هەبوو. کوڕە گەورەکەی نێوی ئەحمەد و کوڕە بچووکەکەشی نێوی خاکماڵ بوو. ئەو حەوت برایە پێکەوە پەیمان دەبەستن کە لەگەڵ یەك ژن بێنن و هەر حەوت ژنەکەشیان دەبێ خوشك بن، هەر بەو مەبەستە دەچنە لای بابیان و داوای ژن دەکەن. بابیان دەڵێ ئێوە قامك لەسەر هەر شازادەیەك دانێن بۆتان دێنم، بەڵام ئەوان دەڵێن کە ژنەکانمان دەبێ هەموو خوشك بن. بابی وەڵام ئەداتەوە: "یانی چی، مەگەر ئێوە شێت بوون ئاخر شتی وا چۆن دەبێ؟ ئەمن حەوت خوشکان لە کوێ پەیداکەم؟ ئەگەر پیاون بڕۆن بۆخۆتان وەبینن ئەوی کەی لەسەر من".

باروبنەی سەفەر پێکەوە دەنێن و وەڕێ دەکەون. خاکماڵ کە برا چووکەیە دەبێتە بەرپرسی چاسازکردن و دارکۆکردنەوە و چێشتلێنان و هەوڕشتن. دەبوو لە پێش برایەکانی لە خەو هەستێ و دەس بە کارەکانی بکا و شەوانەش تا درەنگانێك نیگابانی لەجیاتی برایەکانی دەدا.

رۆژێك بەڕێوە بوون، یان دوو رۆژ، یان مانگێ، یان دوو مانگ، گەیشتنە دۆڵێکی چۆڵ کە کانیاوێکی خۆشی لێ بوو. لەسەر کانیاوەکە شتومەکیان لە بارگینان دابەزاند کە ئەو شەوە لەوێ وەحەسێن. نان و چایان خوارد پاش ماوەیەك قسە، لێی نووستن و خاکماڵ دوای هەڵوەژاردنی شتومەکەکان و شتنی هەوڕەکان کەمێ خەوت. لای بەیانی بۆ سازکردنی چا لە خەو هەڵستا. کەمێ چیلکە و هەژگەڵی سەریەك نان کە ئاور بکاتەوە. کاتێ لە گیرفانەکانیدا گەڕا، دیتی ئاوری پێ نییە. دڵی نەهات برایەکانی هەستێنێ. لە دوور چاوی بە ئاورێ کەوت، بە خۆی گوت بە هەڵاتن دەچم لەو ماڵە ئاور دێنم. بە هەڵاتن کە دەڕۆیشت دەنگێك هات پێی گوت: خاکماڵ، خاکت بەسەر بۆ کوێ دەچی؟" وەڵامی داوە: "ئەگەر بزانی من خاکماڵم دەشزانی بۆچی دەچم". دەنگەکە دووبارە پێی گوت: "ئەوە دەچی بۆ وێ، دێوە گەورە خەوتووە مەمکی چەپەی راخستووە و مەمکی راستەی بە خۆدا داوە. دەچی مەمکی چەپەی دەگری و

مەمکی ڕاستەی دەمژی و دەڵێ بە کوڕی خۆت قەبووڵم کە". خاکماڵ گەیشتە لای دێوە، دەنگەکە چۆنی پێ گوتبوو وای کرد. دێوەکە خەبەری بۆوە چاوی لێکرد ئینسانێ لەسەر باوەشیەتی، پرسی: "چت دەوێ ئادەمیزاد؟" گوتی: "هاتووم بە کوڕی خۆت قەبووڵم کەی". دێوەکە گوتی: "بڕۆ لاچۆ، کوڕەکانم ئێستا دێنەوە دەتکوژن". گوتی: "ناڕۆم". بە ناچاری بە کوڕی خۆی قەبووڵی کرد و لەبن شاقەلی کراسەکەی شاردیەوە. لەو قسانەدا بوون کە مڕەمڕی دێوەکان پەیدابوو. بۆ لای دایکیان هاتن دوای سڵاو هەر دێوەی لەسەر مەنجەڵە چێشتی خۆی کە لەپێشدا دایکیان بۆیانی ساز کردبوو، دەستیان بە خواردن کرد. پاش ماوەیەك گوتیان دایە بۆنی ئادەمیزاد دێت، وەڵامی داوە: "ڕۆڵە گیان، ئەوە ئادەمیزاد نییە، کوڕی منە و برای ئێوە. چتان لێ بشارمەوە؟ حەوت ساڵ لەمەوبەر پێش ئەوەی بابتان بمرێ کوڕێکمان بوو کە نەمان هەویست وەك خۆمان بەدبەخت بێ، هەر بۆیە وەبەر خوێندنمان نا و ئێستا جارجار لە مەکتەبخانە دەگەڕێتەوە و دێ سەرم دەدا. ئێوەش نابێ ئازاری پێ بگەیەنن". دێوەکان زۆریان پێ خۆش بوو، خاکماڵیان لەباوەش گرت و بۆنیان پێوە دەکرد. خاکماڵ پرسی: "خەریکی چن؟ چ دەکەن؟" حەوت دێوەکان باسیان ئاوا دەست پێکرد کە ئێمە ئاشقی حەوت کچی پاشای ئەو شارەین. هەر شەو خەریکی کونکردنی دیواری قەسری پاشاین کە بچین کچەکان بدزین". خاکماڵ گوتی: "زۆرم پێخۆشە، ئەمشەو منیش یارمەتیتان دەدەم. ئیوە لێرە بن ئێستا دێمەوە". چوو بۆ لای براکانی. حەوت گوڵمیخ و حەوت گوریسی بارگینەکانی هێنان و لەگەڵ حەوت دێوەکە بەرەو قەسری پاشا وەڕێکەوت، گەیشتنە بن دیوار و هەر ماوەی میترێك گوڵمێخێکی چەقاند و گوریسەکانی لێ بەستن. بۆخۆی لەسەر دیواری قەسرەکە ڕاوەستا و بە دێوەکانی گوت یەکە یەکە وەرنە سەرێ و هەر کەس بەشە کچی خۆی بێنێت. دێوەکان یەکە یەکە دەهاتنە سەر و خاکماڵ بە شمشێرەکەی سەری دەبڕین تا هەر حەوتی کوشتن، دوایە چووە ژووری قەسرەکە و یەکڕاست چوو بۆ وەتاخی پاشا. کە چاوی لێکرد ئەژدیهایەك خۆی سازکردووە پاشا بخوا. فەورەن شمشێری پاشای لە سەری ڕۆکرد و شمشێرەکەی خۆشی لە کلکی چەقاند. پاشان ڕووی کردە دیوی کچەکانی پاشا و کچە بچووکەکەی دیەوە و ئەنگوستیلەکەی خۆی و ئەوی لەگەڵ یەك گۆڕییەوە. لای بەیانی بۆ لای براکانی

گەڕایەوە. ئەحمەدی برای زۆری لێ قەڵس بوو کە نە ئاوری کردبووەوە و نە نان و چاشی ساز کردبوو، بەڵام خاکماڵ هیچی نەگوت.

کاتێ بەیانی پاشای ئەو شارە لە خەو هەڵستا چاوی بە ئەژدیها و حەوت دێوە کوژراوەکان کەوت بە جارچیانی گوت بڕۆن هەموو خەڵك حەتا ئەوانەی دەنکە جۆیەکی منیان خواردووە، لە گەورەترین مەیدانی شار کۆکەنەوە. کاتێ خەڵك کۆبوونەوە پاشا پێی گوتن هەرکەس ئەو پیاوەتییەی دوێشەوی لەگەڵ من کردووە بێت و بڵێ تا هەر حەوت کچەکەمی بدەمێ و بیکەمە جێگری خۆم لەسەر تەختی پاشایەتی.

یەکێ دەهات دەیگوت: "دوێنێ گاڕان لە ناو گەنمەکەی تۆدا بوو". یەکی کە دەیگوت: "دوو رۆژ لەوە پێش مەڕێکی قەڵەوم بۆ کردی" بەخێر خولاسە سەرتان نەهێشێنم پاشا گوتی: "هیچتان ئەوە نین". رووی کردە وەزیر کە چارەی کار چییە؟ وەزیر وەڵامی داوە: "دوێنێ کە لە راو دەهاتمەوە بەرەو شار، کاروانێکم دی کە لەسەر فلانە کانی چادریان هەڵدابوو و زۆر لە شازادان دەچوون. پاشا ئەمر فەرموون بانگیان بکەن بزانن ئەوان نەبوون ئەو پیاوەتییەیان کردووە". بە داب و رەسمێکی زۆر جوان پاشا لەدووی ناردن کە بێنە شار. ئەوانیش زۆر بە خۆشییەوە قەبووڵیان کرد.پاش چەن ساعەت رێگابڕین، گەیشتنە شار. پاشا دوای بەخێرهاتن لێی پرسین ئێوە پیاوەتیتان لەگەڵ من نەکردووە؟ ئەحمەد لەجیاتی هەمووان وەڵامی داوە: "ئێمە ئاگامان لە هیچ شتێ نییە". خاکماڵ نەیهێشت قسەی ئەحمەد تەواو بێت گوتی: "جەنابی پاشا، کاکم شۆخیتان لەگەڵ دەکا، ئەمن دوێشەو لەگەڵی بووم کە حەوت دێوەکەی لەبن دیواری قەسرەکە تۆپاندن و ئەژدیهاکەی پشت سەری تۆشی بە شمشێری خۆی و جەنابتان کوشت".

پاشا بەو قسەیە زۆر کەیف خۆش بوو. دەستووری دا چل شەوان شایی بکرێ و خەڵکی ناو شار لە خۆشی و هەڵپەڕکێدا بن. بە رەسم و دابێکی جوانەوە هەر حەوت کچەکانی لێ مارەکردن و هەموویانی لە قەسری خۆی دامەزراند. پاش شەش حەوت مانگ رۆژێك ئەو برایانە لەلای یەك دانیشتبوون. دایك و باب و کەسوکاریان وەبیرهاتەوە، هەر بۆیە بەڵێنیان دا بەرەو ماڵی بابیان بگەڕێنەوە. پاشا بیست نۆکەر و قەرەواشی لەگەڵ کچ و زاواکانی خست، بەرەو ماڵی بابیان وەڕێکەوتن. لەو شارەدا

پیرێژنێکی لێ بوو کە خاکماڵی زۆر خۆش دەویست و پێی گوتبوو کە پێش ڕۆیشتنتان حەتمەن بتبینم، بەڵام خاکماڵ دوای ئەوەی کە لە شار چووبوونە دەرێ قسەی پیرێژنەی هاتەوە بیر، هەر بۆیە بە بیانوویەك بەرەو شار گەڕایەوە چووە لای پیرێژن و داوای لێبووردنی لێکرد و ویستی خوافیزی لێبکا، پیرێژن پێی گوت: "پێش ئەوەی وەڵامی خواحافیزیت بدەمەوە پێت بڵێم کە لە دەرەوەی شار دەگەنە دوو ڕێیانێك کە ڕێگایەکیان حەوت مانگی پێدەچێ تا بگەنە ماڵێ و ڕێگاکەی کە حەوت ڕۆژ، بەڵام لەسەر ئەو ڕێگایە سێ دێوی لێن کە ئەگەر نەتوانن بیانکوژن جادووتان دەکەن و دەبێ تا ئاخری عومر نۆکەریان بکەن". خاکماڵ دەستی پیرێژنی ماچ کرد و خۆی گەیاندە براکانی.

پاش ماوەیەك ڕۆیشتن گەیشتنە سەر دوو ڕێیانەکە. خاکماڵ و براکانی ڕێگای دووەمیان هەڵبژارد کە بە حەوت ڕۆژ دەگەیشتنە ماڵێ. دوو ڕۆژان ڕۆیشتن. لە ڕۆژی سێیەمدا لە دەشتێ بار و بنەیان دابەزاند کە ئەو شەوە لەوێ وەمێنن. شەو وردەوردە درەنگ بوو. خاکماڵ وەك شەوانی تر خەریکی نیگابانی بوو لەپڕ دەنگێ بانگی کرد: "خاکماڵ، خاکت بەسەر، حەوت برات کوشتم وەرە تۆڵەی هەمووانت لێ وەکەم". خاکماڵ کە چاوی لێکرد، ئەوە دێوی ڕەشە. گوتی: "وەرە سەگە بزانم چت پێیە". کەوتنە شەڕ. گورزێك لە خاکماڵ، گورزێك لە دێوەکە، مستێك لە ئەو، مستێك لەم، تاکو ئەوەی خاکماڵ شمشێرێکی لە سەری دا و کوشتی. پاشان گوێ و لێو و لووتی بڕین و لە گیرفانی نان. هاتەوە لای براکانی و زۆر ماندوو بوو، هەر بۆیە خەوی لێکەوت. ژنەکەی بەری بەیانی کە خەبەری بووەوە، نە ئاور کراوەتەوە و نە خاکماڵیش نیگابانی دەدا. بۆ خاتری ئەوەی براکانی لە خاکماڵ قەڵس نەبن، زۆر زوو ئاوری کردەوە و لەجیاتی خاکماڵیش دەستی بە نیگاباندان دا.

دیسان وەڕێکەوتن، بۆ سبەی شەو لە جێیەك دووبارە بار و بنەیان دابەزاند کە لەو دۆڵەدا بۆ ماوەی شەوێ وەمێنن. وەك شەوانی تر خاکماڵ خەریکی نیگابانیدان بوو لەپڕ دەنگێ بانگی کرد: "خاکماڵ، خاکت بەسەر، هەشت برات کوشتم. وەرە پێش با تۆڵەی هەمووانت لێوەکەم". خاکماڵ چاوی لێکرد ئەوە دێوی سوورە، گوتی: "وەرە سەگە بزانم چت پێیە". بوو بە شەڕ. گورزێك لە ئەم، گورزێ لە ئەو، مستێك لە ئەو، مستێك لە ئەم تا خاکماڵ شمشێرەکەی لە سەری دا و کوشتی. پاشان گوێ و لێو و لووتی بڕین و

لە گیرفانی نان و هاتەوە لای برایەکانی. زۆر ماندوو بوو، زوو خەوی لێکەوت وەك جاری پێشێ ژنەکەی ئاوری کردەوە و نان و چای ساز کرد.

هەمیسان وەڕێ کەوتن. ڕۆژێکی تر ڕۆیشتن. ڕۆژی حەوتم بوو کە لەسەر تەپۆلکەیەك شتومەکیان دابەزاندن، کە ئەو شەوە لەوێ وەمێنن و سبەینێ بچنەوە ماڵی خۆیان. لای نیوەشەو کە خاکماڵ خەریکی نیگابانی بوو، دەنگێ بە بەرزی هات و گوتی: "خاکماڵ، خاکت بەسەر، نۆ برات کوشتم وەرە پێشێ تۆڵەی هەموانت لێوەکەم". خاکماڵ کە چاوی لێکرد ئەوە دێوی سپییە، گوتی: "وەرە سەگە بزانم چت پێیە". بوو بە شەڕ. هەرچەند خاکماڵ بە شمشێر و گورز و بە مەست لە دێوی سپی دەدا، بەڵام کاری لێ نەدەکرد. دێوی سپی خاکماڵی بن هەنگڵیدا و بردی بۆ لای دایکی گوتی: "دایە ئەوەش خاکماڵ کە نۆ جار زگی تۆی سووتاندووە، چی لێ بکەم؟" وەڵامی داوە: "ڕۆڵە گیان، من کارم پێی نییە". دێوی سپی گوتی: "چۆن کارم پێی نەبێت؟ نۆ برای منی کوشتوون ئێستا لەبەر خاتری تۆ کارێکی پێ دەڵێم ئەگەر توانی بیکا، ئەوە ڕزگاری دەکەم، دەنا لێرە دەیخۆم". ڕووی لە خاکماڵ کرد و پێی گوت: "دەبێ بە چل ڕۆژان بچی بۆ لای پاشای چینێ و کچەکەی ئەوم بۆ بێنی. لەبیریشت بێ ئەگەر کچەکەت هێنا لەسەر فلان کێو چاو لە ئاسمان کە، ئەگەر پەڵە هەورێ لەوێ بوو، ئەوە بزانە من ماوم و لەو سەری دونیاش بێت دەتبینمەوە، کەوایە لە بیری هەڵاتن و هەڵفریودانی منا مەبە". خاکماڵ بە ناچاری قەبووڵی کرد، وەڕێکەوت، پاش ماوەیەك ماندوو بوو، گەیشتە باخێ کە جۆگەلە ئاوێ بە نێویدا دەڕۆیشت. کەمێ ئاوی خواردەوە و لەژێر دارێك لە قەراخ جۆگەکە خەوی لێکەوت. کاتێ خەبەری بووەوە چاوی لە شمشێرەکەی کرد کە لەسەر جۆگەکە رایەڵی کردبوو و لەسەر شمشێرەکەی مێروولە ریزیان بەستبوو و بە سەریدا دەپەڕینەوە. پاش ئەوەی هەموویان پەڕینەوە، پاشای مێروولەکان هاتە لای خاکماڵ. سوپاسی کرد و تارە موویەکی لە سەری خۆی هەڵکەند و دای بە خاکماڵ و گوتی: "هەر وەختێ ئەو مووە هەڵپڕوزێنی زوو دەگەمە لات و هەر کارێکت هەبێ بۆتی دەکەم". خاکماڵ زۆری پێ سەیر بوو. تاڵەموەکەی هەڵگرت و دیسان بەرەو چین وەڕێکەوت. ڕۆیشت... ڕۆیشت تا لەپڕ چاوی بە مەڕومالاتی دێیەك کەوت کە گورگێکی کز و زەعیف دوو دانە مەڕی قەڵەوی خنکاندبوو و لەسەر شانی دانابوون و خەریك بوو هەڵدەهات. خاکماڵ گوتی: "تیاح ئەو گورگە بە تاقەتە".

گورگەکە لێی گەڕایەوە و گوتی: "کوا من تاقەتم هەیە؟ دەڵێن لەودیو پاڵەوانێکی لێیە بە نێوی خاکماڵ سەرم بێت بە قوربانی، بە شەوێکی حەوت دێوی کوشتووە". خاکماڵ پرسی: "جا ئەتۆ بۆ پێت خۆشە کە ئەو دێوانە کوژراون؟" گورگەکە وەلامی دایەوە: "ئاخر ئەوان ئەو ناوچەیان داگیر کردبوو، کەس نەیدەتوانی کار و کاسپی بکات". خاکماڵ دیسان پرسی: "ئەگەر ئێستا خاکماڵ ببینی چ دەکەی؟" لە وەلامدا گوتی: "هەتا دەمرم نۆکەریی دەکەم". گوتی: "من خاکماڵم". گورگەکە زۆری پێ خۆش بوو. تاڵە موویەکی دایە و گوتی: "لە هەر جێیە کارت بە من بوو هەڵیپرووزێنە زوو دێم و کارەکەت بۆ دەکەم". خاکماڵ زۆری پێ خۆش بوو. تاڵەمووەکەی هەڵگرت و دیسان درێژەی بە ڕۆیشتن دا.

پاش چەند ڕۆژ ڕۆیشتن گەیشتە کابرایەك کە وەك با دەڕۆی. گوتی: "تیاح ئەو کابرایە توند دەڕوا". کابرا گەڕایەوە و گوتی: "جا ئەوە چییە؟ دەڵێن لەودیو پاڵەوانێکی لێیە بە نێوی خاکماڵ سەرم بێت بە قوربانی، بە شەوێکی حەوت دێوی کوشتووە". خاکماڵ پرسی: "جا ئەتۆ بۆ پێت خۆشە کە ئەو دێوانە کوژراون؟" وەلامی داوە: "ئەوان ئەو ناوچەیەیان قاچاخ کردبوو، کەس نەیدەتوانی کاسپی بکات. لەوەتەی ئەوان کوژراون خەڵك بە ئازادی خەریکی مەعامەلە و کاسپی کردنن". خاکماڵ دیسان پرسی: "ئەگەر ئێستا خاکماڵ ببینی چ دەکەی؟" لە وەلامدا گوتی: "هەتا دەمرم نۆکەریی دەکەم". گوتی: "من خاکماڵم". کابرا زۆر پێی خۆش بوو تاڵە موویەکی دایە و گوتی: "لە هەرجێیە کارت بە من بوو، هەڵیپرووزێنە زوو دێم و کارەکەت بۆ دەکەم". خاکماڵ زۆری پێ خۆش بوو. تاڵە مووەکەی لەگەڵ مووی مێرووله و گورگەکە لە گیرفانێ هاویشتن و درێژەی بە ڕۆیشتن دا. ڕۆیی... ڕۆیی تا گەیشتە وڵاتی چینێ. یەکڕاست چوو بۆ قەسری پاشا و گوتی هاتووم شەرتەکان ئەنجام بدەم. پاشا گوتی: "هەی منداڵ! هەتا ئەمڕۆ زۆر کەس لەسەر ئەم کچە کوژراون، چونکە نەیانتوانیوە شەرتەکان بەجێ بێنن". خاکماڵ لە وەلامدا گوتی: "قەیناکا با منیش وەك وان بکوژرێم". پاشا بە وەزیری گوت: "یەك یەك شەرتەکانی پێ بڵێ با بڕوا ئەنجامیان بدات". خاکماڵیان بردە ژوورێك، پووتێك گەنم، پووتێك برینج و پوتێك جۆیان بۆ تێکەڵ کرد پێیان گوت: "هەتا بەیانی دەبێ ئەوانە لێك هەڵاوێری". خاکماڵ کەمێ خەریك بوو. وردەوردە ماندوو بوو. لەناکاو مێروولەکانی وەبیر هاتەوە. مووەکەی

هەڵپڕووزاند. زوو مێرووەکان گەیشتنە وێ پرسیان: "چ کارێکت هەیە بۆت بکەین؟" گوتی: "ئەوانەم بۆ لێك هەڵاوێرن". بۆ خۆی لێی نووست و مێروولەکان هەرچی خواردیان، خواردیان، ئەوانی دیکەشیان لێك جوداکردنەوە. بەیانی کە هات پاشا و وەزیر لەگەڵ چەند نۆکەر هاتە وەتاقی خاکماڵ کە بیبەن سەری لێ وەکەن، چونکە پێیان وابوو ناتوانێ لێکیان هەڵاوێرێ. کە چوونە ژوورێ دیتیان خاکماڵ کارەکەی بە جوانی و چاکی ئەنجام داوە و تەخت لێی نوستووە. زۆریان پێ سەیر بوو. لە خەویان هەڵستاند. کە خاکماڵ دیتی گەنم و جۆ و برینجەکە لێك جودابوونەوە زۆری پێ خۆش بوو زۆر سوپاسی مێروولەکانی کرد.

پاشا گوتی: "سبەینێ نۆبەی شەرتی دووەمە. دەبێ سەگێ بێنی کە لەگەڵ سەگی من شەڕ بکات". خاکماڵ بیری کردەوە ئەو سەگە لە کوێ بێنم. لەپڕ گورگە کزەکەی وەبیرهاتەوە. زۆر زوو مووەکەی هەڵپڕووزاند. گورگەکە گەیشتە وێ پرسی: "چ فەرمایشێکت هەیە بفەرموو با بیکەم؟" خاکماڵ گوتی: "وەرە جارێ پشوو بدە هەتا سبەی". سبەینێ دەستی گورگەکەی گرت و چوو بۆ قەسری پاشا. مەیدانێکی گەورەی لێبوو کە لە هەرچوار دەورەی نۆکەر و قەرەواش و فەرماندە و جارچی لێبوون. سەگی پاشا کە سەگێکی زۆر گەورە بوو لەگەڵ سەگی خاکماڵ تێك بەربوون. گورگەکە بە گەرووی سەگی پاشاوە نووسا هەرچی سەگەکە ئەولا و ئەملای کرد نەیتوانی لە خۆی وەکات هەتا تۆپاندی. پاشا زۆری پێ ناخۆش بوو. گوتی: "دوو شەرتت ماوە". کچی پاشا کە چاوی بە خاکماڵ کەوت نە یەك دڵ، بە سەد دڵ ئاشقی بوو. چوو بۆلای بابی و گوتی: "بەسە با لەسەر من ئەوەندە ئینسان نەکوژرێن". بابی وەڵامی داوە وس بە چەتیوە ئەو هەتیوە ئابڕووی منی برد شەرتە بەڵایەکی بەسەر بێنم کە لە کتێباندا بینووسن".

پاشا بە وەزیری گوت: "بڕۆ بە خاکماڵ بڵێ نەفەرێ بێنێت کە لەگەڵ پیاوی من بچێتە بەغدا و سێ کیلۆ خورما بێنن. خاکماڵ زۆر بیری کردەوە لەلایەك بۆخۆی نەیدەتوانی بە سێ رۆژ بچێتە بەغدا و لەلایەکی دیکەشەوە لە ترسی دێوی سپی عەجینی نەمابوو. لەپڕ کابرای هاتەوە بیر کە وەك بای دەڕۆی. زوو مووەکەی هەڵپڕووکاند. کابرا گەیشتە وێ و گوتی: "فەرمووو بڵێ چ کارێکت هەیە؟" خاکماڵ گوتی: "وەرە وەحەسێ هەتا سبەینێ". دەبێ لەگەڵ پیاوی پاشا بڕۆی بۆ بەغدا و بە

زوویی و لەپێش ئەودا بێیەوە ئێرە و سێ کیلۆ خورما لەگەڵ خۆت بێنی". سبەی بەیانی هەر دوو وەڕێکەوتن تا لە شار دەرچوون. هەر کە لە شار دەرکەوتن پیاوی خاکماڵ وەك با تێپەڕی و سێ ڕۆژی پێ نەچوو کە دارخورمایەکی لەگەڵ خۆی هێنا و لەبەر دەرکی قەسری پاشا چەقاندی. پاشا زۆر پەشۆکا. ئەو گرێوەش دۆڕا. دوایین شەرت مابوو کە خاکماڵ دەبوو ئەنجامی بدات. پاشا گوتی: "ئەو چنارەی کە لە حەساری قەسردایە دەبێ قاپێ ئاو لەگەڵ خۆت بەریە سەر نووکی چنارەکە و نابێ دڵۆپێکیش ئاو بڕژێ". خاکماڵ گوتی شتی وا چۆن دەبێ؟" ئەو شەوە هەر لە فیکردا بوو. تازە هیچ ئومێدێکی نەمابوو. لای نیوەشەو قەرەواشی کچی پاشا هاتە لای پێی گوت ئەو ئەنگوستیلەی کچی پاشایە بەیانی کە ویستت بچییە سەر چنارەکە ئەو ئەنگوستیلە لە قاپەکە هاوێ، ئاوەکە بۆخۆی دەیبەستێ. پاشان بچۆ سەرێ. دوایش کە هاتییە خوار لە نزیك زەوی ئەنگوستیلەکە بێنەدەر.

بەیانی هات لەبن چنارەکە نایلۆنیان راخست و لە دەورووبەری نایلۆنەکە پاشا و وەزیر لەسەر تەخت دانیشتن و دەستیان کرد بە پێکەنین. قاپە ئاوەکەیان دا بە خاکماڵ. دەستی کرد بە چوونە سەر، هەر کە دوو سێ مەتر چووە سەر، ئەنگوستیلەکەی لە قاپەکە هاویشت قاپە ئاوەکە بوو بە سەهۆڵ بە توندی هەتا سەر لووتکەی چنارەکە ڕۆیشت. لەسەر چنارەکە کە چاوی لەولاولا کرد، چاوی بە ماڵی بابی کەوت. باب و دایك و ژن و براکانی وەبیر هاتەوە. فرمێسکێکی لە چاو هەڵوەری و کەوتە سەر نایلۆنی بن چنارەکە. هەموو دار و دەستەی پاشا لە قاقای پێکەنینیان دا کە خاکماڵ دۆڕا. خاکماڵ وردەوردە هەر چۆن قەرەواشی کچی پاشا پێی گوتبوو هاتە خوار و قاپە ئاوەکەی بە ساخ و سلامەتی دا بە پاشا. پاشا پێکەنی و گوتی: "تۆ دۆڕای!" بڕۆن سەری بڕن! خاکماڵ گوتی: "من نەدۆڕاوم، ئەو دڵۆپەی هاتە خوار ئەوە فرمێسکی چاوم بوو. زانایانی ئەو شارە هاتن و دڵۆپە فرمێسکەکەیان تاقی کردەوە. دیتیان کە ئەو دڵۆپە سوێرە بۆیان دەرکەوت کە ئەوە ئاوی قاپەکە نەبووە. پاشا هەمیسان دۆڕا بە قەڵسی گوتی: "وەرە کچەکەمت بدەمێ". خاکماڵ کچەکەی هەڵگرت و وەڕێکەوت تا گەیشتە سەر ئەو کێوەی کە دێوی سپی بۆی دانابوون. خاکماڵ کە چاوی لە ئاسمان کرد دیتی پەڵە هەورێکی ڕەش لەسەر سەریەتی، زانی کە دێوی سپی ماوە. لەو قسانەدابوو دێوی سپی پەیدا بوو. خاکماڵ و کچەکەی هەڵگرت و یەکڕاست بردنی بۆلای دایکی.

پێی گوت: "دایە ئەوەش خاکماڵ، ئەمگوت دەتوانێ کچی پاشای چینیم بۆ بێنێ. ئێستا ئەوە خاکماڵ و کچەکە لەلای تۆ بن تا چل رۆژی کە، تا دەچمە راوێ و دوایە دێمەوە لەپێشدا خاکماڵ دەخۆم و پاشان لەگەڵ کچەکەش زەماوەند دەکەم". دێوی سپی رۆیشت بۆ راو.

لێرەدا وا باشە ئاوڕێ بدەینەوە ماڵی بابی خاکماڵ و حاڵ و ئەحواڵی ماڵ و منداڵی بزانین.

خاکماڵ کە حەوت ساڵ بوو نەهاتبووە بۆ ماڵ. باب و دایکی پێیان وابوو مردووە، هەربۆیە شەش براکەی چوونە لای ژنی خاکماڵ و پێیان گوت: "کە مێردەکەی تۆ حەوت ساڵە رۆیشتووە و تازە نایەتەوە وا چاکە ئەگەر لەبەر خاتری قسەی خەڵکیش بێت شوو بکەیەوە". ژنی خاکماڵ لە وەڵامدا گوتی: "باشە بە چاوان، بەڵام من شەرتێکم لەگەڵ خۆم کردووە، هەر وەختێ ئەو شەرتەم بردە سەر ئەوکات شوو دەکەم. ئەویش ئەوەیە کە دەبێ ئەو خوریانە بڕێسم". هەر بۆ خاتری چاوەڕوانی خاکماڵ رۆژانە دەیڕێست و شەوانەش شی دەکردەوە.

کاتێ دێوی سپی خاکماڵ و کچی پاشای چینێی لەلای دایکی بەجیهێشت و رۆیشت بۆ راو، دایکی دێوی سپی بانگی خاکماڵی کرد و پێی گوت: "راستە نۆ جار زگی منت سووتاندووە، بەڵام چون لەسەر حەق و راستی ئەوانت کوشتوون، یارمەتیت دەدەم کە خۆت رزگار کەی". درێژەی بە قسەکەی دا و گوتی: "لە فلان کێوە ئەوە دێوی سپی خەریکی راوە. هەر لەو کێوە سێ ئاسکی لێن یەکیان سوورە، یەکیان بەڵەکە و ئەوی تریشیان بۆرە. دەچی ئاسکە بەڵەکەکە دەکوژی و کوولەکەی رووحی دێوی سپی لەوێدایە. بیهێنە دەر و بیتەقێنە، ئەوکات دێوی سپی بۆخۆی لەبەین دەچێ". خاکماڵ دایکی دێوەکە چۆنی پێگوتبوو وای کرد. دێوی سپی کوشت و هاتەوە لای دایکی دێوەکان. دەستی ماچ کرد و پێی گوت: "خۆت ساز کە تا لەگەڵ خۆم بتبەمە شاری خۆمان". دایکی دێوەکان گوتی: "نا من بۆ شاری ئێوە نایم. من دێو و ئێوە ئینسان. لێرە بەجێم بهێڵە، بەڵام جارجار وەرە سەرم بدە". خاکماڵ دیسان دەستی ماچ کرد و گوتی: "کوڕی کوڕەکەشم بە نەعلەت بێت ئەگەر سەرت نەدات". لەگەڵ کچی پاشای چینێ خواحافیزیان لە دێوەکە کرد و بەرەو ماڵ وەڕێکەوتن. لە نزیکەی شاری خۆیان حەوت منداڵی دین کە پێکەوە شۆخییان دەکرد و تەنیا شۆخییان لەگەڵ منداڵێ

نەدەکرد. خاکماڵ چووە لایان و لێی پرسین: "بۆ یاری لەگەڵ ئەو ناکەن؟" وەڵامیان داوە ئەوە کوڕی مامە خاکماڵییە. حەوت ساڵە بابی ڕۆیشتووە و هەموو کەس دەڵێ مردووە". خاکماڵ چووە لای کوڕەکەی و ماچی کرد و پێی گوت: "بچۆ بۆ لای دایکت بڵێ بابم هاتەوە". کوڕەکە بە هەڵاتن چوو بۆ لای دایکی و مژدەی پێدا. خاکماڵ گەیشتەوە ماڵ و لەگەڵ ژن و خزم و کەسوکاری لە دوای حەوت ساڵ بە یەك شاد بوون. منیش کاڵەم دڕا و هیچم پێ نەبڕا.

کۆمەڵێك هۆکاری جۆراوجۆر دەبنە هۆی ئەوەی کە رابردوو بکەنە مێژوو و هەرکامەیان بەجۆرێك لەم پرۆسەیەدا رۆڵ دەگێڕن، دەسەڵات، سووژە، رووداو و... بەڵام ئەوەی لەم نێوەدا لە گۆڕینی رابردوو بە مێژوو رۆڵی سەرەکی دەگێڕن، سەرچاوەکانی دەسەڵاتن. لەڕاستیدا ئەوە سەرچاوەکانی دەسەڵاتن کە دەنگی رابردوو بەرز دەکەنەوە و رابردووی مردوو دەکەنەوە بە دەقی زیندوو! سەرچاوەکانی دەسەڵات دیاریی دەکەن کە چ شتێك مێژووە و چ شتێك مێژوو نییە، چ شتێك دەبێت بگێڕدرێتەوە و چ شتێك نابێت بخرێتە چوارچێوەی گێڕانەوەوە. سەرچاوەکانی دەسەڵات سەرچاوەی پیرۆزی بەخشین، پەراوێزخستن و نەفرینی مێژوون، ئەوانن دیاریی دەکەن کە کامە کەسایەتی دەبێت رێز و حورمەتی لێبگیرێت و کامە کەسایەتی دەبێت پەراوێز، یان تووشی نەفرینی یەکجارەکی بێت.

بەگشتی سەرچاوەکانی دەسەڵات بەدیهێنەری سنووربەندییە مێژووییەکانن، دیاردەی رەش و سپی بەدی دێنن و دەورەی تاریکی و رووناکی دەخولقێنن، زەمەن و کاتەکانی رابردوو دەکەنە چاخی زێڕین، یان بە یەکجاری دەیخەنە زبڵدانی خەیاڵی خۆیانەوە. لەسەر ئەم بنەمایەش هەرکام لە سەرچاوەکانی دەسەڵات مێژووی خۆیان دەخولقێنن و هەرکام لەم مێژووانەش بەنیسبەت گەورە و بچووکیی سەرچاوەکانی دەسەڵات بەشێوەی مێژووی زاڵ یان پەراوێزخراو دروست دەکەن. گێڕانەوەیەکی بەهێز و زاڵ لە مێژوو پێوەندیی قووڵی لەگەڵ دەسەڵاتێکی بەرین و باڵادەست هەیە، هەروەها گێڕانەوەی لاوەکی و پەراوێزخراویش سەر بە سەرچاوەیەکی لاواز و بەرتەسکە. بەم چشەنە گێڕانەوە زاڵ و پەراوێزەکان شکڵ دەگرن و مێژووی دەسەڵاتداران و تاوانباران دەخولقێت. لە مێژووی جیهاندا نموونەی زۆر بەرچاو لە گۆڕێدان کە سەلمێنەری ئەم پێوەندییەی دەسەڵات و گێڕانەوەی رابردوون. لە رۆژهەڵاتی ناڤینـدا چوارده سەده لەومەوبەر عەرەبەکان لە شێوە دوورگەی عەرەبستانەوە هێرشیان کرد و سەرانسەری ئاسیای رۆژئاوایان خستە ژێر رکێفی خۆیانەوە، ئەم دەسەڵاتە تازەیە، روانینێکی نوێی بۆ رابردوو هەبوو و لەسەر بنەمای ئەم تێڕوانینە نوێیە، مێژووی دادەڕشت. ئەوان دەسەڵاتی باڵادەست بوون و لە رێگای هێرش، حکومەتداری، سیاسەت و داپڵۆسین و سەرکوتەوە روانگە و گێڕانەوەی خۆیان دەخستە روو، گەرچی لە بەرامبەر گێڕانەوە و ریوایەتەکانی ئەوانیشدا کۆمەڵێك ریوایەتی لاوەکیش شکڵیان گرت، بەڵام ئەو

ریوایەتانە هیچکات نەیانتوانی لەگەڵ ریواتی زاڵ و باڵادەستدا هاوسەنگی بکەن و بۆ هەمیشە لە پەراوێزدا مانەوە.

لە مێژووی ئێرانیشدا دەکرێت چەندین نموونەی لەم جۆرە مێژووە دەستنیشان بکرێت. یەك لەو نموونە بەرچاو و جێگای سەرنجانە رووداوی قەڵای دمدمە. لەمەڕ ئەو رووداوە دوو جۆر گێڕانەوە و ریوایەت لەبەر دەستدایە، یەکیان ریوایەتێك کە ئەسکەندەر بەیگ سکرتێر و مێژوونووسی سەردەمی شاعەباسی سەفەوی لە کتێبی (عالەم ئارا)ی عەباسیدا باسی کردووە و ئەوی دیکەشیان بەیتی کوردیی (دمدم)ە، کە کەس، یان کەسانێکی نەناسراو هۆنیویانەتەوە و لە سەردەمی سەفەوییەوە سینگ بە سینگ گێڕدراوەتە هەتا گەیشتووەتە ئەمڕۆ. ریوایەتی یەکەم لە رووداوی دمدم، ریوایەی زاڵی ئەو رووداوەیە و وەك ریوایەتی سەرچاوە دەناسرێت، بەڵام ریوایەتی دووەم، وەکو گێڕانەوەیەکی لاوەکی دێتە ئەژمار کە هەتا ئێستا هیچکام لە رۆژهەڵاتناس و مێژوونووسان گرنگی و سەرنجیان پێنەداوە و بەگشتی هیچ زانیارییەکیان لەبارەیەوە نییە. بۆ زانین و تێگەیشتنی زیاتر لە جیاوازیی ئەم دوو رووداو و گێڕانەوە و جۆری روانینی ئەوان بۆ ئەو رووداوە، بەشێوەی سەرەتایی دەپەرژێینە سەر ئەم دوو رووداوە:

**ریوایەتی ئەسکەندەر بەیگ لە دمدم:**

(ئاماژەدان بە دژایەتی و تاوانی ئەمیر خانی برادۆست)، ئەمە سەردێڕی گێڕانەوەکەی ئەسکەندەر بەیگە و دەیەوێت بپەرژێتە سەر تاوان و نافەرمانیی ئەمیرخانی برادۆست، پاشان باس لە چۆنییەتی لوتف و کەرەمی شاعەباس لە ئاست ئەمیرخاندا دەکات، کە گوایە شاعەباس هەندێ دەڤەری پێ ئەسپاردووە و ئەمیرخانیش لە بەرامبەردا دەستی ناوەتە سەرسینگ و فەرمانبەرداری کردووە، بەڵام ئەمیرخان نەختە نەختە بەهێز دەبێت و دەسەڵات پەیدا دەکات و بە وتەی ئەسکەندەر بەیگ "لە ماوەی کەمتر لە رۆژێکدا غروور گرتوویە و لەخۆبایی بووە" و لە رووی دەمارگرژیی مەزهەبی، یان شەڕەنگێزییەوە لەگەڵ ئەمیر و دەسەڵاتدارانی قزلباشی سەرسنوور دەرکەوتووە، سەودای سەربەستی و سەرەڕۆیی لە مێشکیدا جێگای گرتووە..." گێڕەرەوە ئەمیرە کوردەکان بە کەسانێکی درەندەی مرۆڤایەتی وەسف دەکات و پاشان باس لە چۆنییەتی دروستکردن و جێگیربوونی ئەمیرخان لەناو قەڵای دەمدا دەکات، کە وەکو

سەرچاوەی شەڕ و دووبەرەکیی ئەمیرخان ناوی دەبات. لە وەسف و پەسنی پێوەندییەکانی خان لەگەڵ حاکم و ئەمیرەکانی سەفەویدا، ئەسکەندەر بەیگی میرزا ڕەفتاری ئەمیرخان بە سەرپێچ و لادەر، تاوانبار، سەرکێشی و هەڵچوون دادەنێت و ڕەفتاری دەرباری سەفەوییەکان بە لوتف و کەرەم و بەزەیی بەرامبەر ژێردەستەکان وەسف دەکات.

لە درێژەی گێڕانەوەکەدا، گێڕەرەوە دەپەرژێتە سەر گرژی و ئاڵۆزیی نێوان سەفەوییەکان و خانی دمدم و گرژییەکە دەگاتە قۆناغێك کە قەڵای دمدم لەلایەن لەشکری سەفەوییەکانەوە گەمارۆ دەدرێت. لەکاتی گەمارۆکەدا یەکێك لە ئەمیرەکانی سەفەوی لەگەڵ ئەمیرخان وتوویژ دەکات، مێژوونووسی شاعەباس حاڵی ئەمیرخان لەکاتی دانوستاندا بەم چەشنە وەسف دەکات "ئەمیرخان بە فێڵ و تەڵەکە و بە ڕواڵەت خۆی بە ئجلوبەرگی جوان و زرق و بەرق ڕازاندبووەوە..." وتوویژی نێوانیان بە ئەنجامێك ناگات و ئەسکەندەر بەیگ هۆکارەکەی بەم جۆرە باس دەکات "سەرەنجام مەبەست و نیەتی ئەمیرخان دەرکەوت کە وتوویژەکانی تەنیا بە مەبەستی خۆنواندن و فێڵ و تەڵەکە بووە و بەهۆی شوێنی بەرز و ڕازاوەی قەڵاوە غروور گرتوویەتی و ڕێگای دوژمنایەتی و سەرەڕۆیی گرتووەتە پێش..." لە درێژەدا گێڕەرەوەکەی ئەسکەندەر بەیگ باسی گەمارۆی چەند مانگەی قەڵا دەکات و هەمووی هەر باسی بوێریی و ئازایەتی هێرشبەرانی قزڵباش دەکات و بە (غازی)یان وەسف دەکات. سەرەڕای بەرگریی خۆڕاگرانەی ئەمیرخان و شەڕڤانەکانی لە هەمبەر هێرشبەرانی سەفەویدا، گەمارۆی قەڵا بەرە بەرە تێك دەشکێنرێت و ئەسکەندەر بەیگ دەنووسێت "بە یاریی خودا و بە زۆری باسکی پیاوانە و قار و غەزەبی زاڵی هێزەکانی ئەمیرخان قەڵاکە دەستی بەسەرداگیرا..." بەم چەشنە ئەمیرخان تەسلیم دەبێت و قەڵا لەلایەن سەفەوییەکانەوە داگیر دەکرێت. گەرچی ئەمیرخان و هاوپەیمانەکەی واتە "خان ئەبدالی موکری" بۆ پێشگرتن لە ڕەشەکوژی و قەڵاچۆ تەسلیمی سوپای سەفەوی دەبن، بەڵام هەموویان دەستبەجێ و پاش بەرەنگارییەك لەناو گەمارۆی لەشکری سەفەویدا دەکوژرێن. ئەسکەندەر بەیگی داڕێژەر و گێڕەرەوە ئەو کوشتارە بە کردەوەیەکی هەڵە دادەنێت و بەم چەشنە ریوایەتی ئەسکەندەر بەیگ لە ڕووداوی دمدم کۆتایی پێدێت.

**ریوایەتی دووەم، بەیتی دمدم:**

دڵم ناڕاوەستێ لەبەر ئەوەی غەمێ، لەبەر ئەوەی ژانێ، بانگێك وەبەر خودای- ئەوی دیکەم بەر پەیغەمبەری ئاخر زەمانێ.

ئەمە دەسپێکی بەیتەکەیە بە دەنگی خەماویی بەیتبێژ، بەیتبێژ لە سەرەتای بەیتەوە پەنا دەباتە بەر خودا و کەسایەتییە بەرز و پیرۆزەکان و داوای یارمەتییان لێدەکات. پاشان باسی قسەکانی ئەمیرخان لەگەڵ خان ئەبدالی موکری دەکات: بەڵا بۆت بم بە برایەکی دایك و بابییە.../ دەمانچانت بۆ دەشکێنم جوێ لە میسرییە.../ تفەنگانت بۆ دەشکێنم خانی قوم جوێ لە وەستا شاقولییە.../ مەگەر ئەو شەڕە کێ کردبی ڕۆستەمی مازندەرانی لەبن کێوی دەماوەندی، سپی دێوی دەهێنا زەوتی شێرییە/ دڵی خانی بە برینە، چەند بە برین بە برینە. بۆت دەچمە گۆلی دمدمێ، چ دمدمێکی رە نگینە/ چۆمی باراندیزێ دیت خوارێ چەندی زوڵاڵ و شیرینە/ لێم بویە قەسرێکی جندییە خەڵخواری دەبرییەوە...

دوای ئەوە گێڕەرەوە وتەکانی شاعەباس کە رووبەڕووی حەسەن خان کردوویە بە شیعر هێناوەتەوە:

حەسەن خانە/ بلا بکەین تەگبیر و رایانە/ بەسەرماندا هات زستانە/ زستان چوو و رابرد هاوینە/ رابە بە دڵ و یەقینە/ زووکە شوغڵم بۆ پێکەنینە/ دمدمم لەبۆ بسێنە/ ئەو ساڵ حەوت ساڵە لەمن یاغینە...

حەسەن خان لە بەرامبەر داوای شاعەباسدا سەرەتا خۆ دەبوێرێ و دەڵێ کە لە ڕێگای رۆمییەکانەوە عوسمانییەکان یارمەتی دەکەن و شکستیان دەدات، بەڵام شاعەباس وادەی یارمەتی پێداوە و بەم چەشنە حەسەن خان رەوانەی دمدم دەکات. بەو جۆرەی کە بەیتبێژ دەڵێ لە سەرانسەری دەسەڵاتی سەفەوییەکانەوە بۆ گەمارۆدانی قەڵای دمدم لەشکر کۆکراوەتەوە، وەکو: هەرات، ئەیرەوان، کەشمی، گیلان، سنە، کرماشان بە چەشنێك کە:

لە قۆشەنی لە توغیانێ/ دار و بەرد هاتە هەژیانێ/ گرتی بەری ئاسمانێ/ بووە رۆژی ئاخر زەمانێ.

گێڕەرەوە لەبارەی ئەو لەشکرەوە دەڵێ: لەو کافرەی دە بە فێڵە/ سەری رەمبیان دەلێی بێڵە و ئەم جۆرە وشانە دەربڕینی (عالەم ئارای عەباسی)ن لەمەڕ بەد

مەزهەبیی دانیشتووانی دمدمەوە بەرەبەرە لەشکر نزیکی دمدم دەبێتەوە و ئەم هەواڵەش دەگاتە خان: جواب چوو لەبۆ خانیە/ چاکە خۆ بکا قەوییە/ عالەم بۆ ئەو بزووتییە/ چاك شەڕێك لەسەر دینیە.

لەم کاتەدا خان دەڵێت ئەگەر ئەو شایە ئەمنیش خانم و هەموویان تەفروتوونا دەکەم. سوپای سەفەوی گەمارۆی دمدم دەدەن، شەڕ لەنێوان دلێر و شەڕڤانانی دمدم و لەشکری سەفەویدا دەست پێدەکات: دمدم بەردی مەیدانیٚ/ لێی دە تۆپی ئیسفەهانیٚ/ تۆز گرتی بەری ئاسمانیٚ/ دمدم بەردێکی شینە/ چوار زستانە پێنج هاوینە/ تێیدا خانی لەب زێڕینە/ زەفەریان پیٚ نەبردینە...

گێڕەرەوەی بەیتیش وەکو ئەسکەندەر بەیگی مێژوونووس، شەڕی خان بە (غەزە) ناودێر دەکات. پاشان بەیتبێژ باسی خیانەتی (حەمەد بەگ) ناوێك دەکات، کە لە دمدم هەڵاتووە و پەنا دەباتە بەر لەشکری سەفەوییەکان. ئەو کەسە سەراب و چاوکەی ئاوی قەڵا پیشانی سوپای سەفەوی دەدات و ئەو مەسەلەیە بۆ دانیشتووانی قەڵا دەبێتە گرفتێکی گەورە. بەشێك لە گێڕانەوەکەی ئەسکەندەر بەیگ بۆ ئەمە تەرخانکراوە و بەیتەکەش ئاماژەی پێداوە، بەڵام بارینی بەفر، گرفتی کەمئاوی چارەسەر دەکات و هەوڵی سوپای سەفەوی لەم بارەیەوە بە ئەنجامێك ناگات. جارێکی تر سەفەوییەکان داوا لە خان دەکەن تەسلیم ببێت، بەڵام خان: کوتیە تایفەی خەزاییە/ هەرچی هەڵیٚ قەیدی نییە/ هەرچی بمریٚ فیداییە/ هەرچی بکوژریٚ خەزاییە...

بەیتبێژ دیسان لە زمانی خانەوە دەستەو داوێنی کەسایەتییە دینییەکان دەبێت و داوای یارمەتییان لێدەکات: سوارێك هاتووە ئەسپی شێیە/ خان دەپرسیٚ ئەوە کێیە/ خان ئەوە گەورەی پیرۆتی مەرگییە/ سوارێك هاتووە بە نادریٚ کەس نییە چەکانی وەرگریٚ/ خان دەپرسیٚ ئەوە کێیە خان ئەوە عەزرەتی خدریٚ/ سوارێك هاتووە لەبۆ گەشتیٚ/ بە وییە سوورەتی بەهەشتیٚ/ خان دەڵیٚ ئەوە کێیە/ خان ئەوە وەیسی ماهیدەشتیٚ...

داواکردنی یارمەتیی خان لەو کەسایەتییانە لە کاتی دوایین بەرگرییەکانی لەشکری سەفەویدا: خان ئەبداڵ و کاکە خانە/ حەوت شەوان و حەوت رۆژانە/ شەڕیان دەکرد بە شێرانە/ شێران نەیان دی کێلانە/ لەش کەوتبوون وەکی گردانە/ خوێن رۆیی هەروەك جۆگانە... کاکە خان کە گوایە کوڕی ئەمیرخان بووە، لە شەڕدا

دەکوژرێ. ئەوکات نۆرە دەگاتە ئەمیرخان: بانگم وەبەر میری میران/ خان بۆ خۆی دەکا تەگبیران/ حەوت پۆلی دایە بەر شێران/ بانگم وەبەر پادشای قودرەتێ/ خانیان شەهید کرد بە کوتکی خێوەتێ/ هاوار و رۆڕۆ دمدمە. بەم چەشنە خان دەکوژرێ و بە وتەی بەیتبێژ عەجەمان لە قەڵا وەسەر دەکەون و قەڵا لەلایەن عەجەمانەوە داگیر دەکرێت و بەیتبێژ، ئێستا شینگێڕی وێرانیی قەڵایە و بە دەنگێکی پڕ لە خەم و کوڵەوە دەڵێت:

کوانێ سوارێ دە نازەنین؟ هاوار و رۆڕۆ دمدمە.

بەڵام لە دوایین چرکەساتەکانی داگیرکردنی قەڵادا، خاتوونی خان لەگەڵ ژنانی دیکەی ناو قەڵا خۆیان لە سەربانی قەڵاوە بەر دەدەنە خوارەوە هەتا گرفتاری عەجەمەکان نەیەن. بەیت لێرەدا کۆتایی پێدێت، هەرچەند درێژەی هەیە، بەڵام ئەو درێژبوونەوە و زیادکردنە لە قۆناغەکانی دیکەدا پێی زیاد کراوە و خاڵێکی جێگای سەرنجی هەیە و ئەویش ئەوەیە، کە گێڕەرەوە یان بگێڕەرەوەکان لەم شکستەی خان زۆر خەمین و بە پەرۆش بوون و ویستوویانە بە هەرلەونێ بووە تۆڵە لە عەجەمەکان بکەنەوە.

**بەراوردی هەردوو ریوایەتەکە:**

ریوایەتی یەکەم، تێگەیشتن و و روانینی حاکمە لە رووداوی دمدم، لەم ریوایەتەدا گێڕەرەوە کە خۆی مێژوونووسی دەرباری شاعەباس بووە لە روانگەی دەسەڵاتی زاڵی سەفەوییەکانەوە پەرژاوەتە سەر ئەم رووداوە. لە ریوایەتەکەی ئەودا جیاوازی و سنووری نێوان شا و رەعیەت لە گۆڕێدایە، شا خاوەنی دەسەڵات و رەوایی بووە و نۆکەرو بەردەستی ئاغا دەبێ گوێڕایەڵ و ملکەچی بن. لە روانگەی ئەو مێژوونووسەوە شاعەباس بەردەوام سەرچاوەی، لوتف و کەرەم، بەرکەت و گەورەییە. سەرپێچیکردن لە فەرمانی شا کە بە قەولی ئەو، سەرچاوەی گەورەیی بووە، لەڕاستیدا بە واتای خیانەت و سپڵەیی و تاوانە. کەسی تاوانبار بەردەوام ئەو تاوانەی بەنێو چاوانەوەیە، یان دەبێت تۆبە بکات، یان ئەوەی کە مەحکووم بە مردنە. لە سەرانسەری دەق و ریوایەتی ئەسکەندەر بەیگدا ئەم روانگەیە دەبینرێت و لەم روانینەشدا بۆچوونی مەزهەبیی ئەو بە نیسبەت کافر زانینی ئەمیرخانەوە بە روونی دیارە. ئەم ریوایەتە بووەتە ریوایەتێکی

زاڵ لە ڕووداوی دمدم و لە سەرچاوە مێژووییەکانی دیکەشدا بەم چەشنە گێڕدراوەتەوە و ئەمەش خۆی دەبڕی پێوەندیی چڕوپڕی نێوان مێژوو و دەسەڵاتە و خاڵی جێگای سەرنجیش ئەوەیە کە هەر ئەم ڕیوایەتە بۆ لێکۆڵەرانی ئەمڕۆ فۆرم و شکڵێکی سەرچاوەیی بە خۆوە گرتووە.

بەڵام ڕیوایەتی دووەم، ئەم ڕیوایەتە کەمتر دەرگیری وردەکارییە و لەوانەیە زمانی شیعری پێشی دەربڕینی وردەکارییەکانی گرتبێت، گەرچی بەیتبێژ هێندێ جار زمانی شیعر وەلا دەنێت و خۆی دەپرژێتە سەر چیرۆکەکە. ڕوانگەی مەزهەبی لەم ڕیوایەتەدا زاڵە و تەنانەت گێڕەرەوە ئەو شەڕەی بە شەڕێکی مەزهەبی وەسف کردووە و جیا لەوەش زۆربەی ئەو زانا و سۆفییانەی کە لەم بەیتەدا ناویان هاتووە، خۆی دەربڕی ئەم ڕوانگە دینییە یە.

ئەم ڕیوایەتە پێچەوانەی ڕیوایەتی ئەسکەندەر بەیگ، نەك تەنیا ئەمیرخانی بە یاخییەك وەسف کردووە، بەڵکو بە کەسێکی زانیوە کە لەلایەن سەفەوییەکانەوە هێرشی کراوەتە سەر و بۆ بەرگری لە خۆی لەو قەڵایەدا سەنگەری گرتووە. ئەو خۆی بە خان دەزانێت و ئامادە نییە گوێڕایەڵ و ملکەچی شا بێت، هەرچەند لە سەرەتادا لەگەڵ ئەمیرەکانی سەفەوی دەکەوێتە گفتوگۆوە، بەڵام هەم خۆی و هەم دەوروبەرەکەی ئاگاداری درۆ و مەکری عەجەمەکان و لەباتی ئەوەی کە تەسلیم ببێت بەرەنگارییان هەڵبژارد و لە تەك سوپای سەفەوییەکاندا کەوتنە شەڕەوە و سەرەنجام هەموویان کوژران.

بەیتی دەمدم، گێڕانەوەی بەرخودان و بەرەنگاریی گرووپێکی کەمینەیە لە بەرامبەر دەسەڵاتی زاڵدا و لە ڕوانگەی بەیتەوە، بەرگرییەکی ڕەوا بووە، بەرگری لە بەرامبەر ملەوڕ و سەرەڕۆییەکی دەسەڵاتخوازدا کە پێڕەویکردن و ملکەچیی ئەو گرووپە کەمایەتییەی ویستووە. ئەم بەیتە هەرچەند بە زمانی هۆنراوەیە، بەڵام جیا لە کۆتاییەکەی کە پێوەندییەکی بە خودی بەیتەکەوە نییە، کەمتر توخمی چەواشەکاری و درێژدادڕی تێیدا بەچاو دەکەوێت، دەڵێی بەیتبێژ دەیەوێت ئەو بەرەنگارییە وەکو جەوهەری خودی ڕووداوەکە وێنا بکات. هەڵبەتە بەیتی دمدم لەبەرئەوەی کە لەناو دڵی دەسەڵاتێکی لاواز و بەرتەسکدا بووە، کەوتووەتە پەراوێزەوە و وەك بەشێك لە فۆلکلۆر و ئەدەبی زارەکی دێتە ئەژمار و نە ئەوکات و نە ئێستاش توانایی

رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕیوایەتی زاڵی نییە. بەهەرحاڵ ڕووداوی دمدم بە جوانی دەربڕی مێژووی دەسەڵاتداران و تاوانبارانە و زۆرن، ڕووداو و بەسەرهاتی دیکەی لەم چەشنە کە ڕیوایەتی دەسەڵاتداران و ژێردەستانی بە زۆر مەحکوومکراوی رابردوو دەگێڕنەوە.

ژێدەر:

١- مێژووی عالەم ئارای عەباسی، ئەسکەندەر بەیگ.
٢- بەیتی دمدم بە دەنگی بەیتبێژ محەمەد غەزاڵی ناسراو بە "حەمەدی بەیتان".
٣- توحفەی مەزەفەرییە، وەرگێڕانی مامۆستا هێمن.

## سەیدەوان

خوسرەو سینا، کارناسی شانۆ- مەهاباد

و. لە فارسییەوە: شەریف فەلاح- سنە

خوسرەو سینا

سەیدەوان یەکێکە لە بەناوبانگترین بەیتە کوردییەکان، کە بە کەڵکوەرگرتن لە ناوەرۆك و هەوێنێکی (ئاینی- ئوستوورەیی) پڕژاوەتە سەر چیرۆکی ژیانی یەکێك لە خان و ئاغاواتە کوردەکانی ناوچەی داسنی (بەشێکی بچووك لە کوردستانی عێراق)، کە دانیشتووانی خاوەن مێژینە و کەونارای هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی ئیزەدی (میترائیست- میەر پەرست) بوون. بەیتی سەیدەوان بە خەونی عەبدولعەزیز پاڵەوانی گێڕەرەوە کە لەم چیرۆکەدا بە (عەزیزە کوێر)یش ناوی هاتووە، دەست پێدەکات و بە کارەساتی مەرگی کوڕەکانی عەبدولعەزیز و خۆکوژیی خۆی، کۆتایی پێ دێت.

بۆ زیاتر روونبوونەوەی هەرچی زیاتری چیرۆکی ئەم بەیتە، لێرەدا کورتەیەك لەم داستانە دەخەینە روو. پێویست بە ئاماژەیە ئەوەی لێرەدا دەخرێتە بەرباس، بەرەنجامی تاوتوێ و هەڵسەنگاندنی چەندین گێڕانەوەی جیاوازە لەم بەیتە کە لە زمانی چەندین بەیتبێژی جیاجیاوە و خاڵە هاوبەشەکان باسکراوە و خاڵە جیاوازە لاوەکییەکانیان چاوپۆشییان لێکراوە.

((عەبدولعەزیز خەون دەبینێت کە لە یەکێك لە رۆژەکانی کۆتایی وەرزی بەهار بۆ هێنانی گژوگیا روو لە کوێستانێکی شاخاوی دەکات، بەڵام کاتێك دەگاتە دوندی کێوەکە لە دەوروبەری خۆی دەڕوانی و دەبینێت هیچ چەشنە گژوگیا و رووەکێکی لێ نییە، هەر بۆیە بە نائومێدی و پەرێشان حاڵییەوە روو لە گوند دەکات و دەگەڕێتەوە)).

سپێدەی بەیان، زۆرێك لە شارەزایان و خەوگوزارەکان بانگ دەکات هەتا لێکدانەوەی ئەو خەونەی بۆ بکەن. لێکدەرانی خەون بەم چەشنە خەونەکەی بۆ لێك دەدەنەوە، کە ئەوپەڕی رۆژڕەشی و چارەنووسێکی وەیشوومە بەرۆکی عەبدولعەزیز دەگرێت کە قەدەری ئیلاهییە و مرۆڤ تێیدا هیچ دەسەڵات و دەربازبوونێکی لێ نییە، بەڵام عەبدولعەزیز روانگەیەکی دیکەی هەیە. هەربۆیە بڕیار دەدات بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو جۆرە لێکدانەوەیەی کە بۆ خەونەکەی کردوویانە، شایی و گۆڤەند و هەڵپەرکێیەك رێك بخات و بۆ هەرسێ کوڕەکەی ژن بهێنێت.

جارچییان خەڵکی هەموو ناوچەکە بۆ بەشداری لەو شایی و گۆڤەندە داوەت دەکەن، ژەنیار و شایەرەکان دەست دەکەن بە ژەندن و گۆرانی و کیژ و کوڕانی لاویش دەست دەکەن بە هەڵپەڕکێ و شایی.

لەم کاتەدا هەواڵی مەرگی کوڕە گەورەی عەبدولعەزیز کە بۆ راو چووەتە چیا، بە عەبدولعەزیز رادەگەیەنن، ریش سپی و پیاوماقووڵان دەچنە لای عەبدولعەزیز و داوای لێدەکەن کە کۆتایی بەو شاییە بێنێت و عازیەتباری بۆ کوڕەکەی بگرێت، بەڵام عەبدولعەزیز گوێ بەو داواکارییەی ئەوانیش نادات و دەڵێت لەم بارەیەوە هیچ مەڵێن هەتا خەڵك خۆش بن و کیژان و کوڕانی لاو دڵ بریندار نەبن. دیسان چۆپی کێشان و قریوە و هەڵپەڕکێ گەرموگوڕتر لە پێشوو درێژەی دەبێت کە ئەم جارەشیان هەواڵ بۆ عەبدولعەزیز دێنن کە کوڕە دووەمەکەشی رۆیشتووەتە پەردە و لەوێ بەهۆی شەرم و حەیاوە بە ناکامی مردووە، بەڵام ئەم جارەشیان عەبدولعەزیز هیچ گوێ بە راسپاردە و داواکاریی گەورەکانی خێڵ نادات و لەو باوەڕەدایە کە دەبێت زەماوەندەکە درێژەی هەبێت. خۆیشی مەلوول و دڵشکاو و خەمین رێگای کوێستان دەگرێتە بەر هەتا بە راوکردن ئاوپرژێنی زامەکانی بکات، کە لەناکاو لە شوێنی راو و لە پشت تاشەبەردێکەوە چاوی دەکەوێتە بزنە کێوییەکی سووره‌ڵە و قەڵەو - عەبدولعەزیز ریشی بزنەکێوی و کڵاوی سەیدەوانی لێ تێکدەچێت و سێرە لە نێچیرەکە دەگرێت و قامك بە پەلاپیتکەدا دێنێت و کاتێ دەڕواتە سەر نێچیرەکە، بەوپەڕی سەرسوورمانەوە دەبینێت ئەو نێچیرەی کە لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێت، کوڕە بچووکەکەی خۆی سەیدەوانە کە عەبدولعەزیز بە دەستی خۆی کوشتوویەتی.

خەمین و مەلوول لەسەر تەرمی کوڕەکەی دادەنیشێت و سوێند دەخوات کە ئیدی لەمەوبەدوا لەگەڵ داسنیەکان ناژیت و رێگای مەڵبەند و شوێنێکی تر بۆ ژیان بگرێتە بەر و ئیدی هیچکاتێ بە مەبەستی راو روو لە شاخ نەکات. لە هەندێ لە گێڕانەوەکانی دیکەشدا هاتووە کە عەبدولعەزیز دوای ئەو رووداوە خۆی دەکوژێت و ژیانی بەبێ کوڕەکانی ناوێت.

بێگومان بەیتی سەیدەوان، ژیانی تراژیکی کۆمەڵێك لەو مرۆڤانەیە کە لە هەناوی ئایین و ئوستوورەکانەوە هەڵقوڵیوە و بەشێوەیەکی شانۆیی دەربڕی ئەندێشە ئوستوورەییەکانی کوردانە.

"جی ئێسکار براکت" لە کتێبی مێژووی جیهان (بەشی سەرچاوەی ئایینی شانۆ)دا دەنووسێت: "چیرۆك و ئوستوورەکان زۆرجار لە دەوروبەری ئایینەکاندا سەرهەڵدەدەن هەتا شییان بکەنەوە، وێنایان بکەن یان بیانکەن بە ئارمان، ئەو ئوستوورانە هەتاڕادەیەکی زۆر لەناو چیرۆکەکاندا گۆڕانی بنەڕەتییان بەرسەردا هاتووە.

ئوستووره هەندێ جار نوێنەر و دەربڕی ئەو هێزە بان سروشتییەیە کە لە ڕێگای ئایینەوە پیرۆزیی (تقدس) پەیدا دەکات، یان خێڵ هەوڵ دەدات لە ڕێگای بەڕێوەبەردنی ڕێوڕەسمی ئایینییەوە بیخاتە ژێر کاریگەرییەوە، بۆیە بەڕێوەبەرانی ئایین لەگەڵ بەشدارانی ڕێوڕەسمەکان، ڕۆڵی کەسایەتییە ئوستوورەییەکان، یان هەمان ئەو هێزە میتافیزیك و بان سروشتییە دەگێڕن و ئەو ڕۆڵگێڕانەش نیشانە، یان دەسپێکی پەردە و شانۆیەکی دراماتیکییە.

سەیدەوان چیرۆکێکی تراژیکە بە پاڵەوانگەلێکی تراژیکەوە - دەزانین کە وشەی تراژیدی لە وشەی یۆنانی "تراگویا" بە واتای ئاواز و گۆرانی وەرگیراوە و هۆی ئەم ناونانەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێورسمە مەزهەبییە یۆنانییەکان لە ئایین و جەژنی بەرز ڕاگرتنی "دیڤ نوسوس"، کە بزنێکیان بۆ خودای شەراب و پیت و بەرەکەتی بەروبووم دەکردە قوربانی. پاشان لە دڵی هەمان ئەو ڕێوڕەسمانەوە تراژیدییە یۆنانییەکان بەدیهاتن. خاڵی جێگای تێڕامان لەم دوو لێکچوونەدا چارەنووسی پاڵەوان و کاراکتێری تراژیدی و ئەو بزنێکە کە لەو بۆنەیەدا دەکرایە قوربانی، کە ئاکام و بەرەنجامی هەردووکیان قوربانی بوون بوو، چونکە هەموو قارەمانان و ئەکتەرانی سەرەکی ئەو چیرۆکە لە چینی باڵای کۆمەڵگان، یان بە واتایەکی تر خوداگەلێکن لە گیان و ڕۆحی مرۆییدا.

"عەزیزە کوێر" وەکو سەرۆکی عەشیر و خێڵ و خوداوەندی ئیرادە و بڕیاردەری خێڵ، خاوەنی پێگەیەکی تایبەتە و بەوپێیە کوڕەکانیشی لەم خەسڵەتە بێبەری نین.

شێوازی گێڕانەوەی چیرۆکەکە و کۆتایی کارەساتاوی کە بەهۆی هەڵەیەکەوە مەرگی قارەمان "هامارتیا" تراژیکێك ڕوو دەدات و لەم ڕێگایەوە چارەنووسی قارەمانانە تراژیکییەکانی دیکە لە چیرۆکی دیکەدا پێکەوە گرێ دەدات.

بەیتی سەیدەوان، چیرۆکی گریان و شیوەنی هونەرمەندانە و شاعیرانەی عەبدولعەزیزە لە تازیە و ماتەمی منداڵەکانیدا. عەبدولعەزیز کەسێکی هەستۆکی و خۆ بەکەمگر نییە، پیاوێکی مەزنە، لە ژیاندا سەختی و زەجر و ئازاری زۆری چێشتووە، بەڵام بەڕاستی بڕك و ئێشی لەدەستدانی سێ جگەرگۆشە، ئەویش لە مەودایەکی کەمدا لەگەڵ تاقەتی مرۆدا ناگونجێت. مەرگی سەیدەوان وەکو سێڵاو عەبدولعەزیز لە ریشەوە هەڵدەکەنێت، عەبدولعەزیز دڵپڕ لە خوێنە لەبەرئەوەی کە

زوڵمێکی گەورەی بەرامبەر ئەنجامدراوە، بە مەرگی سەیدەوان تراژیدیی ژیانی عەبدولعەزیز دەگاتە لووتکە.

بەیتی سەیدەوان پێچەوانەی بەیتەکانی دیکە، جیا لەوەی کە هەڵگری فۆرم و پێکهاتەیەکی داستانییە، قارەمانیشی هەیە. رووداو و کارەساتەکان یەك بەدوای یەکدا روودەدەن، گریێ و گۆڵ و ئاڵۆزییان تێدایە، بەڵام خێرا تێدەپەڕن، رووداوەکانی ناو بەیتی سەیدەوان بەدوای یەکدا ریز نەکراون، لە زۆربەی گێڕانەوەکاندا چیرۆکەکە لەوێوە دەست پێدەکات کە عەبدولعەزیز ناکام، خەمبار و ئازیەتبار لەسەر گڵکۆی رۆڵەکانی دادەنیشێت و شیوەن و گریانیان بۆ دەکات. چیرۆکی سەیدەوان دژی کاراکتێرە، عەبدولعەزیز و کوڕەکانی لەو کارەساتەدا جیا لە چارەنووس دوژمنایەتییان لەگەڵ کەس نییە.

بەیتی سەیدەوان بەشێوەیەکی زۆر تراژیك بە مەرگی قارەمانەوە کۆتایی پێ دێت، مەرگێك کە لەناکاو و کتوپڕ نییە، بەڵکو سەرەنجامی لۆژیك و راستەوخۆی زنجیرەی رووداوەکانە. گۆڕانی چارەنووسی قارەمان لەبەر هەڵەیەکە، هەمان ئەو هەڵەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە عەبدولعەزیز ئازار و ژان بچێژێت، ئەویش سزایەکی دژوار و ئەستەم. زێدەڕۆیی لە ئازار چێشتنی قارەمان و نادادپەروەری لە تاوان و سزایە، کە هانمان دەدا لەگەڵ کاراکتێر هاودەردی بکەین. پێمان وایە زوڵمی لێکراوە، هەستی روحم و بەزییمان دەوروژێت. حازر نین ئەوە قبووڵ بکەین کە هەڵەی کردووە. هەڵە و تاوانەکە دەخەینە ئەستۆی چارەنووس، یان زۆر جار هەلومەرجی مێژوویی، بنەماڵەیی و کۆمەڵایەتی بە هۆکاری سەرەکیی کارەساتەکان دادەنێین.

بەهەرحاڵ غروور و لەخۆباییبوون، بەرچاوترین کەمکوکوڕیی کەسایەتی و دەروونیی قارەمانی ئەم تراژیدیایەیە. لەڕاستیدا یەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی سەرهەڵدانی تراژیدیایەك، هەڵەی قارەمان، یان کەسایەتییە سەرەکییەکانی داستانە، واتە لە جەریانی داستانەکەدا رێگایەك هەڵدەبژێرن، هەڵوێستێك دەگرنە بەر، کە یان دژی روانگە و بۆچوونی کەسایەتییەکانی دیکەیە، یان پێچەوانەی دابونەریت و کولتووری گشتیی کۆمەڵگان. شاکارەکانی ویلیام شکسپیر وەکو: "میللەت و رۆمیۆ ژۆلیەت" دەرخەری راستیی ئەم بابەتەن. بەڵێ، غرووری عەبدولعەزیز بنەما و جەوهەری ئەم رووداوە خەماوییانەیە. پرسیار لە خۆمان دەکەین بۆچی عەبدولعەزیز گوێ بە ئامۆژگاریی دەوروبەرکەی نادات؟ بۆچی سەرنج ناداتە ئەو خەونە پڕ لە

گومانەی؟ ئەوکاتەی ئێمە وەك بیسەر یان خوێنەرێك پەی بە وەلامی ئەم پرسیارە دەبەین تازە دەرد و ژانی دەروونیمان دەست پێدەکات. بەرەبەرە گوناحەکەی لەبیر دەکەین و بەو ئەنجامە دەگەین کە عەبدولعەزیز تاوانبار نییە، بەڵکو ئەوە چارەنووس و قەزا و قەدەرە کە بە هیچ لەونێ ناگۆڕدرێن. عەبدولعەزیز قوربانیی یاریی بێڕەحمی چارەنووسە، بەهەرحاڵ عەبدولعەزیز قارەمانە، چونکە لە هەمبەر چارەنووسی ناچار و داسەپێنراوی خۆیدا تەسلیم نابێت و پێداگری دەکات. هەموو هەوڵی خۆی دەخاتە گەڕ هەتا بەسەریدا زاڵ بێت غافڵ لەوەی لە چنگی چارەنووس ڕێگای دەربازبوون نییە.

بەیتی سەیدەوان خاڵە وەرچەرخانێکی ئەدەبیاتی زارەکیی کوردە. ئەگەر ڕۆژاوا بە سەرهەڵدانی "دۆن کیشۆت" گەیشتە بەردەم دەروازەی مۆدێرنیتە، زێدەڕۆیی نییە کە ئەگەر تراژیدیی سەیدەوان بە یەکێك لە هیواکانی داهاتوو و ئاسۆی ڕوونی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کورد دابنێین، بۆئەوەی ببێتە هەوێنی گۆڕان و شۆڕشێکی ئەدەبیی مەزن.

**ئەلف) لێکدانەوەی پێکهاتەیی بەیتی سەیدەوان:**

قارەمانی چیرۆك، عەزیزە کوێر خۆی وەکو گێڕەرەوە دەست دەکات بە گێڕانەوەی ڕووداوێك کە بۆ خۆی دەستپێشخەری بووە و لە زمانی یەکەم کەسی تاکەوە داستانەکە دەگێڕێتەوە. لەلایەك وەکو زانایەکی کامڵ ئاگاداری هەوراز و نشێوی فکری و ڕۆحی و هەروەها نهێنی و ڕەمزە داستانییەکانە. ئەم وشیارییە لەو ڕووەوەیە کە عەزیزە کوێر-گێڕەرەوە کاتێك داستانەکە پێناسە و شی دەکاتەوە کە سێ بەهار بەسەر دەسپێکی یەکەم ڕووداو (خەون دیتن)دا تێدەپەڕێت. ڕووداوەکە لە سێ بەهاری پشت سەر یەکدا ڕوو دەدات کە بەم چەشنەیە:

١- بەهاری یەکەم: عەبدولعەزیز خەون دەبینێت و بەتەمایە خەونەکەی بۆ لێك بدەنەوە (خاڵی دەسپێك).

٢- بەهاری دووەم: ڕووداوی زەماوەند و ئاکامەکەی (کرۆکی سەرەکیی و چەقی گێڕانەوەکە).

٣- بەهاری سێیەم: عەبدولعەزیز (گێڕەرەوەی داستان) دەست دەکات بە گێڕانەوەی ڕووداوەکان و بڕیاری کۆتایی لەمەڕ چارەنووسی خۆی (خۆکوژی) دەدات (خاڵی کۆتایی- کردنەوەی گرێکوێرە و ڕێگاچارە).

کات بە دوو کارکردی (کاتی پیرۆزی و کاتی مێژوویی) و سەرووی سروشت وەك دەسپێکی ڕووداوەکان: "میر چاه الیاده" لە کتێبی ئوستوورەی گەڕانەوەی هەتا هەتاییدا لەمەڕ ئەم دوو کاتەوە دەنووسێت: پێگەی بەرزی مرۆڤ لە کۆمەڵگا کۆن و لەمێژینەکان ئەمە بوو، کە کاتیان وەکو ڕەوگە و ئاراستەیەکی دەورلێدەر و گەڕۆك دادەنا و بەم چەشنە بە فریویان دەدا. بوون و جەوهەری مرۆڤی سەرەتایی بۆ ئەمە بووە کە کرداری مرۆڤە سەرەتاییەکان وەکو سەرباشقە (الگو) دووپات بکاتەوە و بەم چەشنە بەردەوام لە حاڵەتێکی نەگۆڕدا بمێنێتەوە. زەمانی بەردەوام و مێژوویی هۆکاری دۆزینەوەی مرۆی ئەمڕۆییە کە لە ئاسۆی کرداری کۆنی ئۆلگویی دابڕاوە و ناتوانێت لە ترسی مێژوو ڕزگاری بێت، مەگەر ئەوەی کە لە ڕێگای خۆبەستنەوە بە خودا و مەزهەبەوە مرۆڤ تێکەڵ بە مێژوو بێت، لە بەرامبەر ئەمەدا وادەی ژیانێکی باشتر لە دنیایەکی تر (بەهەشت) بە مرۆڤ دەدات-لە سەرانسەری ئەم داستانەدا ئامادیی کەسایەتیی پێگەی میتافیزیکی (خودا) هەرکات هەست پێدەکرێت و لەڕاستیدا تەواوی ڕووداوەکان بەرهەمی گەردەنکەشی و نافەرمانییەکە کە قارەمان لە فەرمانی خودا و قەدەری ئیلاهی سەرپێچی کردووە.

لەم داستانەدا قارەمان ئیرادەی تاکەکەسیی خۆی لە سەرووی هێز، دەسەڵات و قەدەری ئیلاهییەوە دادەنێت.

خاڵێکی تر کە لە باسی پێکهاتەیی داستاندا ئاماژەکردن پێی زەرووری دێتە بەرچاو، ئەمەیە کە تاوتوێی ڕووداوەکان هەڵگری ڕیزبەندی و تەکووزمەندی (نەزم)یەکی تایبەتە، بیسەر یان بەگشتی، بەردەنگ کاتێك لەگەڵ ڕووداوەکانی داستان بەرەوڕوو دەبێتەوە، کە داستانەکە کۆتایی پێهاتووە و لە کۆتاییەوە دەگات بە دەسپێك.

پێشتر ئاماژەمان پێکرد کە سەیدەوان چیرۆکێکی تراژیدییە لەمەڕ چارەنووسی قارەمانێك کە بە بتی ئیرادەی خۆی بە تەمایە بەرەنگاری چارەنووس و قەدەری خۆی بێتەوە.

عەزیزە کوێر خەونێك دەبینێت کە باس لە ڕوودانی کارەساتێکی ژانـاوی و جەرگبڕ دەکات کە لەلایەن خوداوە دیاریکراوە و ڕەوڕەوەی چارەنووسی دیاری دەکات، بەڵام ئەو بە زانست و وشیارییەوە بەدوای ڕێگاچارەوەیە هەتا بە تێگەیشتنی خۆی ڕێگایەك بۆ دەربازبوون لەم چارەنووسە ڕەشە ببینێتەوە. هەر بۆیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو

چارەڕەشییەی دەست دەکات بە ڕێکخستنی خۆشی و شادییەك (ڕێوڕەسمی زەماوەندی کوڕەکانی).

ئەم مەسەلەیە وەکو کرۆکی سەرەکیی داستانەکە جار نە جاریٚ دووپات دەبێتەوە و چەندین جار لە زمانی خودی گێڕەرەوە (عەبدولعەزیز)ەوە دەگێڕدرێتەوە.

بۆ نیشاندانی ئۆلگووە پێوەندیارەکانی نێوان زمانی فیزیکی و زمانی گێڕانەوە لە میتۆدی خوارەوە کە میتۆدێکی داهێنراوی خودی نووسەری ئەم بابەتەیە، کەڵك وەردەگرین، بۆ وێنە بەیتی سەیدەوان لەم پۆلێنبەندییەدا دەکەوێتە خانەی ژمارە (٥)ەوە.

مۆتیفی چارەنووس تارێنی، واتە هەڵاتن و دەربازبوون لەدەست چارەنووس، مۆتیفێك نییە کە ئێمە بۆ یەکەم جار لەگەڵی بەرەوڕوو بووبێتین، ئەم مۆتیفە (چارەنووس

تـارێنی) هەتاراددەیـەك لـەنێو هـەموو گـەل و نەتـەوەكان و لـە سـەردەم و قۆناغـە جیاجیاكانی مێژووی مرۆڤایەتیدا مۆتیڤێكی باو و دووپاتكراوە بووە.
تاكێك بە وشیارییەوە بەرەنگار و رووبەڕووی چارەنووسێك دەبێتەوە كە پێشتر بۆیـان دیاریكردووە. (بە وتەی خەڵكی ئاسـایی چارەنووسـی و بـەختێك كـە هـەر لـە رۆژی لەدایكبوونەوە بە نێوچاوانییەوە نووسـراوە) و مـرۆڤ رێگـای دەربـازبوونی نییـە لێـی. گێڕەرەوە: نەیدەزانی كە قەدەری ئیلاهی بیر و فكری مرۆڤ بەتاڵ دەكاتـەوە (كورتەیـەك لە دەقی داستانەكە) لە داستانە بەناوبانگەكانی وەكو تراژیدییەكانی یۆنانی كـەونارا (سیزیف، پرۆمتـە، ئۆدیـپ، شـەهریار، ئـیلكترا و...) و هـەروەها حیماسـەی ئێرانـی (شانامەی فیردەوسی) ئێمە لەگەڵ رووداوگەلێكی لەم چەشنە بـەروڕووین، بـەڵام لـەم نێوەدا چارەنووسی قارەمانی ئەم گێڕانەوەیە بەشێوەیەكی زۆر جوان لەگەڵ چارەنووسـی ئۆدیپی شەهریار هاوسەنگی هەیە و دەگونجێت.
ئۆدیپ شا دەزانی كە سەرەنجام رۆژێك ناچار دەبێت باوكی خۆی بكوژێـت و لەگـەڵ دایكی خۆی جووت ببێت و ئەمە چارەنووسێكە كە خوداكان بۆیان لەبەرچاو گرتـووە و قارەمانەكان رێگای دەربازبوون نییە لێیان، بەڵام ئۆدیـپ بـە وشـیارییەوە بـەرەنگاری چارەنووس دەبێتەوە و بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم چارەنووسـە رێگـای دیـارێكی تـر دەگرێتە بەر، بەڵام سەرەنجام بە سەركەوتن بەسەر باوكیـدا و كوشـتنی لـە شـوێنێكی تەنگەبەر و دۆزینەوەی مەتەڵی ناڕوونی ئێسـفنكس-بوونـەوەرێكی ئوسـتوورەیی كـە سەری مرۆڤە و جەستەی شێر (ابوالهـول)، كـە بـۆ نـابووتكردنی دەبـا ئـەو مەتەڵـە بەناوبانگەی وەڵام بدەیتەوە (ئەمـە چ گیانلەبەرێكـە كـە بـەیانی چـوارپایە/ نیـوەڕۆ دووپا/ ئێوارە سێ پایە و شەویش لـە جووڵـە دەكـەوێ؟) "ئینسـان" بـۆ جووتبـوون دەڕواتە سەر جێی دایك. لە هەقیقەتدا شكسـتی تراژیكیـی ئـەو لـەم پرۆسـەیەدا بـە دۆزینەوەی راستییەكان دەبینینەوە. چارەنووسی ئۆدیپ كـە وەك گـەورەترین قارەمـانی چارەنووس تارێن دەكرێت ناوی لێ ببرێت، لەگەڵ چارەنووسی عەبدولعەزیزدا دەگونجێت.
خاڵی جێگای ئاماژە لـە بـەراوردكردنی ئـەم دوو داسـتانە (سـەیدەوان و ئـۆدیپی شـەهریار) چـارەنووس تـارێنی وشـیارانەی ئـەم دوو قارەمانەیـە و لـەم بەرەنگارییـە نابەرابەرەدا شكست یان پیرۆزی گرنگ نییە، چونكە ئەوە خەبات و بەرەنگارییەكـە بـۆ سەلماندنی خود، نەك تاقیكردنەوەیەكی خۆ بەكەمزانین، دەكرێت سەرەنجامی ئەم باسـە

لە دوو وشەی "چارەنووس" و "چارەووس تارێنی"دا پێناسە بکەین، کە لێرەدا وەکو کرۆك و هەوێنی سەرەکیی ئەم داستانە لەبەرچاویان دەگرین.

قارەمان (عەبدولعەزیز) لەم چیرۆکەدا لە چەقی هێندی پەرۆشی و کێشمەکێشدا گیری خواردووە، کە بۆ لێرەدا بە کورتکردنەوەی ئەو کێشمەکێشە جۆراوجۆرانە دەپەرژێینە سەر هێندێکیان:

**الف) تاك لەگەڵ خۆی:** کێشە و ئاڵۆزییە دەروونی و هەستۆکییەکانی قارەمان-گێڕەرەوە.

**ب) پێوەندیی تاك لەگەڵ بان سروشت (میتافیزیك):** گەوهەری سەرەکی گێڕانەوە، "توخمی سەرەکی گێڕانەوە".

**ج) تاك لەگەڵ تاك:** بەرەنگاری و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سەیدەوان بۆ سەپاندنی ئیرادەی خۆی بەسەریدا.

**د) تاك لەگەڵ کۆمەڵگا:** پێداگریی لە هەمبەر ویست و داخوازی ریش سپییان بۆ گۆڕینی جەژن و شادی بە تازیەباری و قبوولکردنی قەدەری ئیلاهی (لێکدانەوەی خەون).

**ه) تاك لەگەڵ سروشت:** بەرەنگاریی عەبدولعەزیز بۆ دووبارە روانەوەی سروشت. "بە لێکدانەوەیەکی خێرا پێکهاتەی رووداونی ئەم چیرۆکە لە بنەڕەتدا بۆ نیشاندانی ئەم کارکردەیە".

**و) کۆمەڵگا لەگەڵ کۆمەڵگا:** خەبات و بەرەنگاریی سیستمی باوکسالاری لەگەڵ سیستمی دایکسالاری.

**الف) "شرۆڤەی کارکردیی بەیتی سەیدەوان":**

"هەر رەمزێك گیان و جەستە و بەرەنجامێکی هەیە و هەر خەونێك راستییەك- O. milouz-".

مرۆڤ فێرکراوە کە لەباری جیهان و راستییەکانی دەوروبەرییەوە بیر بکاتەوە، بەڵام ئەو جیهانەی کە تێیدا دەژی هەر بەو چەشنەی کە هەستی پێدەکات و هێزی لێیەوە وەردەگرێت و وێنەی راستییەکانی لەسەر پەڕەی رۆحی وێنا دەکرێن، دەرك پێدەکات و دەیناسێت، بەڵام لەم نێوەدا رەمز کانییەکی هەڵقوڵیوە کە لە دووتوێی کەتوارە

هەستپێکراو و بەرچاوەکان تێگەیشتنێکی قوولتر لە ئالۆزیی دەروونیی مادەکان و پێوەندیی زاتی و دەروونییەکان لەگەڵ مرۆڤ دەخاتە روو. بەم پێشەکییەوە ئێمەش هەوڵ دەدەین بڕۆینە ناو دونیای پڕ راز و رەمزی چیرۆکی سەیدەوانەوە:

گێڕانەوەی سەیدەوان بەپێی ئەو خەونەی کە عەزیزە کوێر دیویەتی، دەست پێدەکات و لەڕاستیدا ئەم خەونە بەشێوەیەکی سیمبۆلیك دەربڕی تەواوی ئەو رووداوانەیە کە بەسەر ئەو قارەمانەدا هاتوون. ئەوەی کە عەزیزە کوێر لەو خەونەدا دەیبینێت، هێما و نیشانەیەکە کە ریشەی لە هزری نابە ئاگای ئەو دایە، چونکە خودئاگایی بەردەوام وێنای جۆری - بریتییە لەوەی کە لە ناوشیاریی گشتیدایە و لەگەڵ کینە و گرێ و ئالۆزییە دەروونییەکان پێوەندییەکی زۆر نزیکی هەیە و یەکێك لە جەوەرە پێکهێنەرەکانی رۆحی مرۆڤە- "orchtype" چەشنی سیمبۆل دەرك دەکات، واتە وێنا و سیمای جۆری لەناو کۆمەڵی وێنا و تێگەیشتنە گشتییەکان کە لەناو هەموو قەوم و نەتەوەکان هاوبەشە و لە قووڵایی خرۆشانی هەر دەروونێکدا لە جەریان دایە، دەردەکەوێت. هەربۆیە هەرکاتێ سیمای بەرهەست لەناو کۆمەڵەی سیمبۆلدا دەردەکەوێت، مرۆڤ لەناخی خۆیدا هەست بە حاڵەتێکی سەرسووڕمان دەکات.

((ئەمڕۆکە سەرم بەژانە و دڵی عەبدولعەزیز کورەی داسنی، بەڵام من ئەوشۆکە خەونێکم بینیوە پێم وابوو کۆتایی بەهارە. کۆشاران و سەرشاخەکان بەدوای گژوگیادا دەگەڕام، بەڵام مخابن چنگم نەکەوت. تۆ ئەو خوایەی لەبان سەرە، ئەی خوداناسان ئەم خەونەی من لێك بدەنەوە. دەترسم کارەساتێکی گەورە بەسەرما بێت)).

لە کتێبی لێکدانەوەی خەونی فرۆید لە پێوەندی لەگەڵ ئەم سیمبۆلانەدا هاتووە:

سەرکەوتن بۆ سەرشاخ: گەڕان بەدوای خۆ بەسەرتر زانین. ئیرادەی خۆت بەسەر خەڵکانی تردا سەپاندن/ لووتکەی کێو: بەرزترین قۆناغی نزیکیی مرۆڤ بە خودا و بە مەنزڵگا گەیشتن/ دروێنەی گیا و گوڵ: سوود و کەڵکوەرگرتن لەو شتانەی کە پێوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، یان بە واتایەك بەختەوەری و کامەرانی.

بە ئاماژەکردن بەم لێکدانەوانە، دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە عەبدولعەزیز لە خەوندا ئەو هەقیقەتەی کە لە کاتێکی نزیك لە ژیانیدا روودەدات، بەشێوەی سیمبۆلیك هەست پێدەکات. ئەو بەدوای دۆزینەوەی خۆیە وەك کەس و مۆتیڤێکی باڵا

و بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ چارەنووسی ئیلاهی و ویستی عەشیرە و خێڵەکەی لەمەڕ ئەوەی کە خۆی بسپێرێتە دەستی چارەنووس، دەست دەکات بە رووبەڕووبوونەوەیەك کە راستە پێچەوانەی ئاراستەی چارەنووسیەتی، بەڵام بەرەنجامەکەی ناکامی و سەرکەوتن بەسەر قەدەرە بەسەر ئیرادەی تاکەکەسیی خۆیدا.

لەو رووەوە کە ناوەرۆکی خەونی عەبدولعەزیز بۆ دووبارەبوونەوەی ژیان، بووژانەوەی زەوی و بەخەوەری و وشیاریی هێزە چالاك و ئەکتیڤەکانی دروونە، باشترین شێوازی لێکدانەوەی پشتبەستن بە میتۆدی پێشنیاریی "یۆنگ"ە بۆ لێکدانەوەی سیمبۆلیکی.

- یۆنگ هەموو واتا و ناوەرۆکە ئەفسانەییەکان و جیهانبینیی قەوم و نەتەوە سەرەتاییەکان و واتا مەزهەبییەکانی نەتەوە جۆراوجۆرەکان بە نیشانەی هێما و دابونەریتە گشتییەکانی خەڵك دادەنێت و وەکو ئەندێشە سەرەکییەکانِ ناودێریان دەکات و لەو باوەڕەدایە کە هەر ئەو ئەندێشە سیمبۆلیك و وێنا زەینییانەن کە جێگۆڕکێی شەو و رۆژ لە قەوارەی بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤ و ئەژدیهادا دەکێشێتەوە. بەگشتی هەر ئەم هێزانە بەدیهێنەری ئەفسانە و حیماسە مرۆییەکانن، چونکە پێکدادانی دەروون لەگەڵ سیمبۆلە نابەئاگاکان دەبنە هۆی تێکشاکانی ئەو بەربەستانەی کە رێگایان لە هێز و توانا دەروونییەکان گرتووە و پاش دەرکەوتنی واتای گشتیی سیمبۆل، پەردە لەسەر واتا تاکەکەسییەکانیشی هەڵدەدرێتەوە.

ئەو دڵەڕاوکێیەی کە عەبدولعەزیز تووشی بووە، بنەما و جەوهەرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ جیهانبینییەکی ئوستوورەیی، ترس لەوەی کە ئەو هێز و توانا بەسوودانەی کە ئەویان (وەك سەرۆکی خێڵ و عەشیرە) ناساندووە، کۆتاییان پێدیت، دەترسن کە خۆر لە ئەنجامی سیحر و گۆڕانکارییە سروشتییەکان لە ئاکامدا خامۆش ببێت و هەروەها مانگیش کاتێك کە گژوگیاکان لەناوچوون، ئیدی هەڵنەیەت.

لە هەمبەر هەر راسان و نوێبوونەوەیەك، هێز تووشی هەمان دڵەڕاوکێ و شڵەژان دەبێت و لەبەر خۆیەوە دەڵێت کە ئەو هێز و توانایە ناسەقامگیرە و ترسی ئەوە لە گۆڕێدایە کە تەمەنی کۆتایی پێ بێت. ئەم دڵەکوتە و نیگەرانییانە بەتایبەت لە بەرامبەر گۆڕان و نوێبوونەوەیەکدا کە ناوبەناو روودەدەن، وەکو رووان و شینبوونی دووبارەی گوڵ و گیا کە هەڵگری ریتم و ئاهەنگیکی تێکەڵ بە خامۆشییە، هەر بۆیە مەرگی زەوی لە زستاندا تژی لە دەرد و ژانارییە.

به لەبەرچاوگرتنی ئەم خاڵە، واتە ئەو وەرزەی کە عەبدولعەزیز تێیدا خەون دەبینێت بەهارە و ترسی ئەویش دەست نەکەوتنی گژوگیا و گوڵە، کەوایە ئاراستەی گشتیی هەوڵی ئەو، راگراتنی ئەو پێوەندی و هاوسەنگییە هەمیشەییەی سروشتە لە بووژانەوە و لەدایکبوونەوەی دووبارەدا.

نابێت ئەوەش فەرامۆش بکەین کە بەدرێژایی مێژوو و لە تێگەیشتن و فامی مرۆڤە ناشارستانییەکاندا کلیلی دووبارە زیندووبوونەوە و راسانی سروشت، پێشکەشکردنی قوربانییە، بۆ وێنە ئوستوورەی "ئۆزیریس" لە میسر و جەژنەکانی "دیڤ نوسوسی" یۆنانییەکان کە هاوکات بە شادی و رێورەسمی سروود خوێندنی "دیترامپ" و دەست راوەشاندن و هەڵپەڕکێوە بەڕێوە چووە. لە هەقیقەتدا ئەو شادییەی کە عەبدولعەزیز لە کاتی رێورەسمی زماوەندی کوڕەکانیدا پێکی دێنێت، بەشێوەی سیمبۆلیك شادیی تازیە و رێورەسمی کوڕەکانییەتی کە بێتاوان یەك لەدوای یەك دەبنە قوربانی و مەرگ لەئامێز دەگرن کە لەڕاستیدا هێمایەکن بۆ پرۆسەی بەرەکەت و بووژانەوە و هەروەها مەرگی سروشت. دەبێت واتای ئەم قوربانییانە مرۆڤییانە لە دووتوێی تیۆریی کۆن و لەمێژینەی پشت بە پشت و نۆرە بە نۆرەی هێزە پیرۆزەکاندا ببینینەوە.

"میرچاە الیادە" لە بەشی بەرزیگەری و قوربانی لە کتێبی "نامیلکەیەك لە مێژووی دینەکان"دا نووسیویە: ئوستوورە بەدیهێنەری جیهانی تایبەت، بەدیهێنەری ئایینی مەرگ، مەرگی پڕ توندوتیژ و کوشتنی دێوەزمەیەکی سەرەتاییە کە لە پەیکەرەکەی جیهان بەدیهاتووە و شینایی و بەتایبەت گیا و دانەوێڵە رووان، کە لەگەڵ وەها قوربانییەکدا پێوەندییەکی قووڵیان هەیە. گیاکان و گەنم و دارە مێو... لە خوێن و گۆشتی بوونەوەرێکی ئوستووریی کە بەپێی رێککەوتنی ئایینەکان لە بنەڕەتدا قوربانی کراوە، چرۆ دەکەن و دەڕوێنەوە. لەڕاستیدا قوربانیکردنی گیانلەبەر مرۆیی لەبەر تازەبوونەوەی ژیانی هێزێکە کە لە دروێنە (یان لە کاتی دروێنە)دا دەبووژێتەوە و لەڕاستیدا بە واتای نوێبوونەوەی کاری خولقێنەرە کە پێشتر گیانی وەبەر ئەو تۆو و دانەوێڵەدا کردووە و پەیکەری ئەنجن ئەنجنی مرۆڤ لەگەڵ پەیکەری بوونەوەری ئوستوورەی سەرەتایی کە لە ئاکامی جەستەی ئەنجن ئەنجنی، کە کراوەتە قوربانی و تۆو و دانەوێڵەی لێ بەرهەمهاتووە، پێکەوە دەگونجێن.

لەم نێوەدا دەکرێت ئاماژە بە پێوەندیی سیمبۆلیکی ژیانەوەی دووبارەی سروشت (خەونی عەبدولعەزیز) و ژنهێنان بۆ کوڕەکانیشی بکەین. زەوی و ژن وەکو دوو هێزی سەرچاوەی زایەن (زاینده) و وەك سیمبۆلەکانی زاوزێ لەلایەك و دوو مۆتیڤی گیا و کوڕەکانی وەکو هۆکاری زکپڕی و زاوزێ. -زەمینێك کە گیای لێ ناڕوێ= کوڕەکانی کە خوازیاری ژنهێنان نین. -بەم بەراوردکردنە دەکرێت پێوەندییەکی دیکەش لەنێوان قوربانیبوونی کوڕەکان بۆ دووبارە بووژانەوەی زەوی و روانەوەی گیاکاندا ببینینەوە. عەبدولعەزیز کاتێك بەتەمای راو رەوانەی شوێنی راو دەبێت، وێنەیەکی "دیفۆرمە" لە کوڕەکانی لە شکڵی بزنە کێوییەکدا دەبینێت و لەم بەراوردە خەیاڵییەدا ریشاڵی کڵاوەکەی "سەیدەوان" لەباتی ریشی بزن بە هەڵە دەبینێت و بە لێدانی گوللەیەك لەپێی دەخات.

بوونی سیمبۆلی حەیوانی لەم چیرۆکەدا دوو کارکردی تایبەتی هەیە:

الف) ئاماژە بە چارەنووسی سەیدەوان کە وەکو قارەمانی تراژیك - ئاماژە بە واتای وشەی "تراگودیا" کە لە هەرحاڵدا بەرەنجامی ژیانی تەواوی قارەمانانی تراژیك مەرگە. -دەبێتە قوربانیی ئارمان و خولیاکانی خۆی.

ب) ئاماژەکردن بە پێوەندیی سیمبۆلیکی بزن لەگەڵ رێوڕەسمی قوربانی. -کەوایە ئەو وێنایەی کە عەبدولعەزیز لە کوڕەکەی خۆی وەك بزنە کێوییەك هەیەتی، ناکرێت وەك لێکچوون و بەراوردێکی سادە بێت، ئەویش کاتێك کە زەمینەیەکی وەکو رێوڕەسمی زەماوەندەکە لەپێشدا وەکو کەش و دۆخی زاڵ بەسەر رووداوەکەدا هاتووە، هەتاڕادەیەك هەموو رێوڕسم و جێژنێکی کوردەکان تێکەڵ بووە لەگەڵ هەڵپەڕکێ و شایی و چۆپی کێشان و ئێستاش هەر هەیە. بۆ وێنە جێژنەکانی دەسپێکی ساڵی نوێ و نەورۆز، یان رێوڕەسمی تایبەت بە داچاندنی تۆو و دانەوێڵە وەکو: داچاندن و هەڵگرتنەوە و گێرەکردن. لەم گێڕانەوەیەدا ئاماژە بە هەڵپەڕکێی رەشبەڵەك و چۆپی کێشانی کچان و کوڕان کراوە، کە دەکرێت وێنایەك بێت لە پێکهاتەی رێکوپێکی هێزە ئەرێنیی پیاوان (نێر)- هێزی نەرێنیی ژنان (مێ)- بێت کە لە بیرۆکەی "مائۆئیستەکان"ی چین و ژاپۆنیشدا هەیە. دەزانین کە کوردەکان بەشێوەی تێکەڵاو و رەشبەڵەك (پیاو و ژن) و بەتایبەت بەشێوەی بازنەیی هەڵدەپەڕن، کە دەکرێ سیمبولێك لە گەڕیانی دوا بەدوای سروشتیی وەرزەکان بێت. هەروەها دەکرێت سیمبۆلیکی ترسی عەبدولعەزیز لە تێکدان

و شێواندنی ڕێوڕەسمی شایی کوڕەکانی بە هەمان ترس لـە تێکـدانی تەکووزمەنـدیی سروشتی لە گەردوون و خولگەی زاوزێی دووبارەی سروشت لێك بدەینەوە.

- گێڕەرەوە پاش باسکردنی مەرگی خەماویی سەیدەوان بە دەست باوك، بـاس لـەو گۆڕانانە دەکات کە لە سروشـتدا ڕوودەدات و ئامـاژە بـە داچـۆڕانی ئـاوی کۆسـاران، شـینبوونەوەی دووبـارە و سـەردەرهێنانی گیـا و گوڵـە سـوورەکان لـە خـاك دەکـات. ئاماژەدان بە ڕەنگی سوور کە لە چەندین شوێنی ئەم گێڕانەوەیەدا هاتووە، ئاماژەیەکی سـیمبۆلیکە بـە ئوسـتوورەی زایـن (زایـش) و قوربـانی بـوون- لـەناو ئوسـتوورە ئێرانییەکانیشدا هێندێ لێکچوون هەیە، بۆ وێنە ڕێوڕەسمی "سیاوشون" کە لە ئێرانی کەونارا و لە بوخارا بەڕێوە چووە، ڕێوڕەسمێکی هاوشێوەی "دیونوسوس"ی یۆنانییـەکان کە تێیدا بۆ بەرز ڕاگرتنی یاد و بیرەوەریی سیاوشون قارەمانی ئوستووری ئێرانی کە لە خۆڕا دەکوژرێت، بەڕێوە دەچوو- لەوانەیە بنەڕەت و هەوێنی ئەو ڕێوڕەسمەش بگەڕێتەوە بۆ یۆنان، هەروەها دەسەڵات و فەرمانڕەوایی (٢٠٠) سـاڵەی یۆنـان بەسـەر ئێرانـدا- بەهەرحاڵ لە خوێنی سووری "سیاوەش" گیایەك دەڕوێت کە بە "میەر گیا" یان گیای سەرچاوەی ژیان ناسراوە. "حاجی فیرووز" کە ئەمڕۆ لە سەرەتاکانی سـاڵی نـوێ و لـە وەرزی بەهاردا دێت، هێمایەکە بۆ هەمان ڕێوڕەسمی تازیەباریی مـەرگی سـیاوەش کـە ڕوخسـاری ڕەش دەکـات (سـیمبۆلێك لـە زەوی) کراسـێکی سـوور لەبـەر دەکـات (سیمبۆلێك لە خوێنی سیاوەش) و بەدەم شیعر خوێندنەوەوە دەف لێدەدەن و هەڵدەپەڕن (سیمبۆل و کرییەکە لە ڕێوڕەسمە سەرەکییەکە).

ج) ئوستوورەی ڕۆڵە کوشتن و تاوتوێی ڕەگ و پێگەی ئەم ئوسـتوورەیە لـە بـەیتی سەیدەواندا:

ئۆدیب بۆ تێرکردنی کێشە و گرێ دەروونییەکانی خۆی (بەپێی شرۆڤەی فرۆید) و گەیشتن بە دایك، هەوڵی لەناوبردنی باوکی دەدات، لە کاتێکدا کە وەکـو ڕێبـوارێکی نەناسراو تێپەڕ دەبێت، دەیکوژێت. (باوك کوشتن).

- هابیل بۆ گەیشتن بە خوشکەکەی، براکەی خۆی قابیل دەکوژێت. (براکوژی) و...

بە تاوتوێی کـورتی ئوسـتوورە و ئەفسـانەکان، دەکرێـت شـێوازی جۆراوجـۆر لـە براکوژی و باوك کوشتن و... دەربکەون، بەڵام بێگومان ئوستوورەیەکی وەکو ڕۆڵە کوشتن کەمتر بەچاو دەکەوێت. دەکرێـت نموونـەی بەرچـاوی ئـەم گـرژی و تێکهەڵچـوونە لـە

ئەدەبیاتی حیماسیی ئێران و شانامەی فیردەوسیدا دەستنیشان بکەین. (کوژرانی سوهراب بە دەستی رۆستەم). رۆستەم لە بەرەنگاربوونەوەیەکی نابەرامبەردا پێچەوانەی مەیلی دەروونیی خۆی و لە رووی نەزانییەوە کوڕەکەی خۆی (سوهراب) دەکوژێت و کاتێك بە مەسەلەکە دەزانێت کە ئیتر زەمان بە فیڕۆ چووە و دانی دەرمان لە پاش مەرگ هیچ شتێك سارێژ و چارەسەر ناکات. ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئاخ هەڵکێشان و پەشیمانییە. لەبارەی مەبەستی سەرەکیی کوژرانی سوهراب بە دەستی رۆستەم زۆر لێکدانەوەی جیاواز و هێندێ جار پێك ناکۆك لە گۆڕێدان و هێندێ کەس بە ناشارەزایی لە قەڵەم نادەن، بەڵکو مەبەستی ئەنقەستیان لە پشتە، رێك هەمان رووداویش بۆ سەیدەوان دووپات دەبێتەوە و رووبەڕووبوونەوەیەکی نابەرامبە- دەستی بەتاڵ لە بەرامبەر چەك- لەنێوان باوك و کوڕدا روودەدات کە دەبێتە هۆی کوژرانی سەیدەوان.

بێگومان ئوستوورەی رۆڵەکوشتن یەکێك لە دراماتیکترین ئوستوورەکان و لە هەمان حاڵیشدا یەکێك لە ژاناویترینیانە.

با وەبیری بێنینەوە کوژرانی منداڵەکانی (مێدیٚ ئا) بەدەستی خۆی-مێدیٚ ئا بەرهەمی هەرمان و بەناوبانگی "ئۆرۆپید" تراژیدی نووسی ناوداری یۆنانییە- کە مەبەستی "مێدیٚ" لە کوشتنی رۆڵەکانی، تۆڵەسەندنەوەیە لە بیٚ ئەمەکیی مێردەکەی "جیسۆن" و هەروەها لەناوبردنی پردی پێوەندیی خۆیە لەگەڵ جیسۆن، کە هەمان منداڵەکانین و لەلایەکی دیکەشەوە سەلماندنی لەسەر هەقبوونی خۆیە.

کوشتنی سوهراب بە دەستی رۆستەمیش بۆ بەرگری لە پێگە و ئوسلووبی پاڵەوانی و لەڕاستیدا سەلماندنی راستیبوونی خۆیە و بێگومان ئەنگیزەی عەبدولعەزیزیش لە کوشتنی سەیدەوان دابینکردنی مافی خۆی و پێداگرییە لەسەر ئارمانە تاکەکەسییەکانی خۆی، بەڵام ئاخۆ مەبەستی ئێمە لە ئارمانە تاکەکەسییەکانی عەبدولعەزیز چییە؟

عەبدولعەزیز ژن بۆ کوڕە گەورەکەی دێنێت، بەڵام چونکە بە مراد ناگات، بە زۆر بووکەکە دەداتە کوڕی دووەمی، ئەویش بەناکامی پەردەگیر دەبێت و دەمرێت و کاتێك کە نۆرە دەگاتە سەیدەوان، لە بەرامبەر ویستی باوکیدا رادەوەستێت و سەرپێچی لە بڕیارەکەی دەکات، بێگومان پاداشتی ئەو خۆبواردن و سەرپێچییەش مەرگە. کەوایە

عەبدولعەزیز وەك باوك -مەرگی ئاگایانە و بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری کۆمەڵایەتیی عەشیرە (بەربەرەکانی لە بەرامبەر مەرگ "توتم") دەکوژرێت.

سەیدەوان چوارچێوە و بۆتەی تابۆکان تێك دەشکێنێت و لە بەرامبەر ئیرادەی تایفەدا، مەحوومە بە کوژران. لەوانەیە یەك لەو هۆیانەی کە ئەم بەیتە بە سەیدەوان بەناوبانگە هەمان خۆبواردن و یاخیگەریی ئاگایانەی سەیدەوان بێت لە بڕیارەکەی باوکی، لە حاڵێکدا قارەمانی سەرەکی و "پرۆتاگۆنیست"ی ئەم بەیتە عەبدولعەزیزە، کە لێرەدا روخساری هێزێکی بەرگریکار "ئانتاگۆنیست" دەردەکەوێت و رووداوەکە سیمای بەرەنگارییەکی ئاشکرای نێوان باوك کوڕ بەخۆیەوە دەگرێت.

بۆ شرۆڤەی گشتی و کەشفی توناییەکانی ئەم گێڕانەوەیە خشتەی "اکتانسیل" بەکار دەهێنین.

A هۆکار C بنێر E هێزە یارمەتی دەرەکان

B شوێن(مەبەست) D وەرگر F هێزە بەرگریکارەکان

پێوەندییەك کە لەنێوان عەبدولعەزیز و عەشیرە و منداڵەکانی هەیە، پێوەندییەکە بە تایبەتمەندیی دەسەڵاتی "تۆتالیتێر"ەوە. کاتێك دیتران هەوڵدەدەن لە بڕیارەکەی پاشگەزی بکەنەوە و لەو مەترسییە گەورەیەی کە چاوەڕوانییەتی بەئاگای دێننەوە، ئەو بە هێندیان ناگرێت و ئیرادەی خۆی بەسەر ئیرادەی عەشیرەکەیدا زاڵ دەکات، بە ئیرادەی خۆی ژن بۆ کوڕەکانی دێنێت، کەوایە پێوەندیی ئەو لەگەڵ منداڵەکانی و کەسانی

دەوروبەر و ژێردەستی پێوەندییەکی باوکسالارانەیە کە ئەمە خۆی هۆیەکە بۆ سەلماندنی پێوەندیی تۆتالیتێر و زاڵمانەی باوکسالارانە- هێزی بەرامبەری دایکسالارانە کە ئەویش پێوەندییەکی تۆتالیتێرانەیە، جێگای گرتووە.

**الف)** زۆرینەی کاراکتێرەکان پیاوانن (زۆریی ڕێژەی پیاوان لە بەرامبەر ژناندا).

**ب)** توخم و مۆتیڤێك بەناوی دایك لەم داستانەدا ڕۆڵی دەرەکیی نییە و هیچ ئاماژەیەکی پێ ناکرێت.

**ج)** ئیرادەی زاڵی عەبدولعەزیز وەك (باوك - تۆتم) لە بەرامبەر گشت کۆمەڵدا ڕاوەستاوە.

ڕاڤە و لێکدانەوەیەك کە دەکرێت لەمەڕ هۆی ژنهێنانی عەبدولعەزیز بۆ کوڕەکانی ئاماژەی پێ بکرێت، توخم و خەسڵەتەکانی سیستمی باوکسالارییە، واتە داسەپاندنی ئیرادەی خۆی لەبارەی پێکهێنانی ژیانی هاوبەشی کوڕەکانی، لەڕاستیدا گرێ دەروونییەکانی (ئانیمایی-ژن-خەیاڵی)یە کە "یۆنگ" لەو باوەڕەدایە کە لە هزری نابەئاگای هەر پیاوێکدا حزووری هەیە، خاڵ و هێزی بەرامبەری (ئانیموس-پیاو خەیاڵی)یە بۆ ژنان- خۆی تێر دەکات و لە ڕێگای بەکارهێنانی میکانیزمی جێگری- لە دەروونناسیدا بریتییە لە جێگیرکردنی کردار، یان خوویەك کە پێشی پەرەسەندن، یان خۆنواندنی گیرابێت، بە خوو و ئاکارێك کە ئیتر بۆ وێنە نیازی منداڵێك بۆ مڵك لێدانی مەمکی دایك دواتر خوویەکی وەکو جوینی نینۆك، یان سیگارکێشان-لە هەوڵی تێرکردن و قەرەبووکردنەوەی گرێ درەروونییەکانی خۆی وەکو سەرۆکی عەشیرەیە. عەبدولعەزیز بە زەماوەندکردن بۆ کوڕەکانی لە هەوڵی دەسەڵاتێکی چوارگۆشەی "ماندێلایی" دایە، کە خۆی لە ناوەڕاست و کرۆکەکەیدایە، بەڵام بەم بەراوردکردنەشەوە گرێیە (ئانیمایی)یەکەی چارەسەر و تێر نابێت.

چوارگۆشەی ماندێلایی: چوار گۆشەی بەناوبانگی پێشنیاریی یۆنگ کە لەو باوەڕەدایە مرۆڤ بۆ نیشاندانی گشتییەتی شتێك، بە چاوی یەك سەنتەرەوە دەڕوانێتە سیمای هەر چوارگۆشە جیاوازەکەی. بۆ وێنە چوار وەرز بۆ پیشاندانی هەموو ساڵ، یان چوار شوێنی جوگرافیایی بۆ پیشاندانی هەموو جیهان و... ماندێلاکانی سەدەکانی ناوەڕاستیش بریتی بوون لە چوارگۆشە و ڕێڕەو و بە سەنتەریی مەسیح و یارەکانی (متی، مرقص، یوحنا، لوقا) کە لە دەوروبەری بوون. پێکهاتەی سەرسووڕمانی

چوارگۆشە بریتییە لە (٣+١) بۆ وێنە ژنێك بۆ سێ کوڕ کە خودی عەبدولعەزیز لە ناوەڕاستیان و چەقی ئەم چوارگۆشەیەدایە.

+B+C+D=E

قارەمان-گێڕەرەوە لە ناساندنی خۆیدا نازناوی "کوێر"ی هەڵبژاردووە و دەگاتە جۆرێك لە باوەڕمەندی. ئاماژەی گێڕەرەوە بە خاڵی لاوازیی خۆی (کوێر بوون) دەکرێت لە دوو رەهەندەوە لێك بدرێتەوە:

**الف- لایەنی دراماتیکی:**

کوێربوونی عەبدولعەزیز مۆتیف و وێنایەکە کە لە بەرامبەر راستییەکاندا چاو بنووقێنرێت، چونکە عەبدولعەزیز بە باشی دەزانێت کە ئەو توانای بەرەنگاربوونەوەی

قەدەرەکانی نییە، بەڵام بەو حاڵەشەوە رووبەڕوویان دەبێتەوە و بە چاو بەستراوەیەوە رێگایەك هەڵدەبژێرێت، کە بێگومان جیا لە شکست و چارەڕەشی بەرەنجامێکی دیکەی نییە. یان بە واتایەکی باشتر کوێربوونی خۆی بەکار دێنێت هەتا لە خەم و نەهامەتییەکانی کەم بکاتەوە، پەشیمانی لە کردەوەکانی خۆی، پەشیمان لە کوژرانی منداڵەکانی و لە گشتی گرنگتر کوشتنی ئاگایانەی سەیدەوان کە راسەوخۆ بە تفەنگ و لە رێگای "چاو"ەوە جێبەجێکراوە.

عەبدولعەزیز لە هەقیقەتدا چاوی لە ئاست بینینی ئەو کەتوارە کۆمەڵایەتیانەشدا کە حاکمیانە دەبەستێ و چەشنی بەندییەوانێك کە بۆ چاوەدێری لە زیندانییەکانی ژێر دەستی بەناچاری خۆیشی بەندکردووە، دەجووڵێتەوە. بەڕای "ئێسپینۆزا"- حەکیمی رەسەنایەتیی بوونگەرای هولەندی- مرۆڤ کاتێك لەنێو خەڵکدایە سەربەستانەتر کار دەکات، چونکە پابەندی یاسایە، لە حاڵێکدا لە خەڵوەتی تەنیایدا خۆی دەسپێرێتە ویستە دەروونییەکانی. ئێستا عەبدولعەزیز وەکو "دەسەڵاتدار- یاسادانەر" هەست و ویستە تاکەکەسییەکانی خۆی بەسەر ئیرادەی کۆمەڵدا زاڵ دەکات. گشت کۆ ئەو وەکو "تابۆ-باوك" چاو لێ دەکەن و لە چوارچێوەی بڕیارەکانی ئەودا وەکو سەرۆکی خێڵ لە ئارامی و ئاسایشی کۆمەڵ دەڕوانن، وەکو نیازێك کە منداڵ بە باوکیەتی و بە بەراوردی گەورەتر، پێویستیی کۆمەڵ بە خودا کە لە بواری ترسی سیمبۆلیکەوە لە میتافیزیکیان هەیە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە عەبدولعەزیز وشیارانە رووبەڕووی میتافیزیك (قەدەر) دەبێتەوە و چاوی ئەقڵ و ئاوەزی نیازەکانی کۆمەڵگا بۆ دەستەوداوێن بوون بە خودا دەبەستێت.

ڤۆڵتێر نووسەری فەرەنسایی دەڵێت: "ئەگەر خودا نەبایە، بێگومان مرۆڤ دەیخولقاند". ئەمە بەرەنجامی هەمان ئەو ئەخلاقەیە کە لە کۆتایی ئەم داستانەدا بۆ هەمووان دەردەکەوێت.

### ب) تیۆریی دەروونشیکارانە:

بەڕای فرۆید و لایەنگرانی قوتابخانەی دەروونشیکاریی راست، خولق و خووی مرۆڤ بۆ گەشەی جەستەیی و دەروونی پێویستی بە تێپەڕکردنی چەندین قۆناغی جیاواز هەیە، ئەوەی راستە و دیارە ئەوەیە کە وەستانی تاك لە یەکێك لە قۆناغەکانی گەشەی جەستەی و رۆحی- فرۆید بە دوو قۆناغی سەرەکی (عەشق بە خود و عەشق بەویدی)

دابەش دەکات- دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشە و گرێی دەروونی و سەرهەڵدانی "نۆرۆس"- نەخۆشیی دەروونی و نەفسی کە بەهۆی وەستانی گەشەی مرۆیی لە یەکێك لە قۆناغەکانی فراژوو (تکامل)یدا دێتە ئاراوە.

هۆکاری ئەوەی کە عەبدولعەزیز ناوبەناو ئاماژە بە کوێریی خۆی دەکات، دەبێت لەم خاڵەدا ببینرێتەوە، پەرچەکرداری عەبدولعەزیز بەم نەورۆزە بە دژکردەوەیەکی گۆرانی دێتە ئەژمار- ئاماژەکردنی عەبدولعەزیز بە کوێربوونی خۆیشی، جۆرێکە لە دەستنیشانکردنی هۆکارێکی جەستەیی بۆ قەرەبووکردنەوەی کەموکووڕیی ڕۆحی، ئێستا هەمووان دەزانین کە لە بنەڕەتدا عەبدولعەزیز کوێر نەبووە، بەڵکو ئەمە پاساوێکە بۆ داپۆشین و قەرەبووکردنەوەی هەڵەکانی لە کوشتنی منداڵەکانیدا و بەشێوەی ڕواڵەتی و نمایشی چاوی عەقڵی بە رووی وشیاری و ڕاستییەکاندا داخستووە کە تێیدا گرێ و کێشەی دەروونیی مرۆڤ بەشێوەی نوقسانیی جەستەیی (کوێری، کەڕی و لاڵی) خۆی دەردەخات.

ج) شرۆڤەی دەروونشیکارانەی بەیتی سەیدەوان:

فرۆید بەشێوەی تیۆری لەو ڕوانگەیەوە دەیڕوانییە پرۆسە زەینییەکان کە زەین لە بواری ئەگەری ڕوانینەوە (امکان نگاری) دەکرێت بە سێ بیاڤی خود ئاگا، نیوە وشیار و نابەئاگا دابەش بکرێن، کە جیایی بنەمایەکە لەنێوان خود ئاگان و نابەئاگادا و نابەئاگاش بریتییە لە مەیل و ویستە سەرکوتکراوەکان، کەوایە بەپێی ئیرادە ناکرێت لە ڕەهەندی خودئاگاییەوە لە قەڵەمی بدەین. لەلایەکی دیکەشەوە بیاڤی نیوە وشیاری پێوەندی بەو دەستە لە توخمە زەینییانەوە هەیە کە ئێمە لە هیچ کات و زەمەنێکی تایبەتدا ئاگامان لێیان نییە، بەڵام بەپێی ئیرادە دەتوانین پەلکێشی بیاڤی خود ئاگاییان بکەین. فرۆید، هەروەها پۆلێنبەندییەکی تازەی لەژێر ناوی تیۆریی پێکهاتەیی پێشنیار دەکات کە لە شرۆڤەی بەیتی سەیدەواندا لەبەرچاومان گرتووە، بەپێی ئەم تیۆرییە زەین لە سێ توخم پێکهاتووە:

١- هەوێن (ID)، کە سەرچاوەی سەمەد (انگیزە)کانە و پرۆسەکانی بە تەواوەتی نابەئاگایانەیە.

٢- من (خود EGO)، کە شوێنی لۆژیك و ئاوەز و تێگەیشتنی دونیای دەرەوەیە و بەم حاڵە پرۆسە و توخمەکانی بەگشتی نابەئاگان.

٣- سەرووتر لە من (سەرووتر لە خود SUOEREGO): کە ئەگەری بینینی هەست و مەیل و رەخنەگرتنی مەیل و ویستەکانە و پرۆسە و ناوەڕۆکی هەتارادەیەك وشیارانەیە، بەڵام زیاتر نابەئاگان. ئێستا بە ناساندنی ئەم سێ توخمە لە روانگەی دەروونشیکاریی دەقەوە، دەست دەکەین بە شرۆڤەی کەسایەتی عەبدولعەزیز کە جۆرێکە لە رەخنەی نوێ:

ئەگەر عەبدولعەزیز وەکو کەسایەتی جەمسەری داستان لەبەرچاو بگرین، سێ کوڕەکەی هەرکامەیان وەکو یەك لەو هێز و توخمانە کە باسیان لێوە کرا، رۆڵ دەگێڕن.

نێچیروان: کەوتووەتە بەر رق و کینەی سروشت و بەهۆی هەڵدێران لە شاخ لە کاتی راودا گیانی لەدەست دەدات و بەناوی "EGO"، چونکە سیمبۆلی دەرك و ئاوەزی جیهانی دەرەکییە.

وەلکەوان: کە بەهۆی شەرم و کەمڕوویی پەردەگیر دەبێت (هەوێن ID)، لەبەرئەوەی سیمبۆلی خوو و خوو رەفتاری ئاژەڵانە.

سەیدەوان: بەهۆی دژبەری و بەربەرەکانێ وشیارانەی بەدەستی باوکی خۆی دەکوژرێت، توخمی وشیار و دژی رەوتی داستانەکەیە و وەکو (سەرووتر لە من SUOEREGO) وەك سیمبۆلی وشیاری و رەخنەگری جەوهەری داستان دەردەکەوێت.

لەڕاستیدا ئەم سێ کوڕە وەکو هێما و سیمبۆلی عەبدولعەزیز رۆڵ دەگێڕن- ژمارەی (٣) وەکو ژمارەیەکی سیحراوی چەندین جار لەم گێڕانەوەیەدا بەکارهاتووە، کە بێگومان کارکردێکی سیمبۆلیك و رەمزاویی هەیە، "م. لوفر دولاشۆ" لە کتێبی "زمانی رەمزیی حیکایەتەکانی پریوار" ئاماژە بە رۆڵی ژمارەکان دەکات و دەنووسێت دەروونشیکاران بە توێژینەوە لەسەر "رویا"کان بەو قەناعەتە گەیشتوون کە ژمارەی (٣) هێمایەکی جەستەییە و لە جەمسەرێکی دیکەدا سیبیانەیەکی عیرفانی پێك دەهێنێت (باوك-کوڕ-روح القدس)، کە ئەم سیبیانەیە بنەما و جەوهەری زۆرێك لە بیرۆکە مەزهەبی و ئایینە کۆنەکانی وەکو میهرو روونـاکی پەرستییە کە دەکرێت ژمارەی ٣ وەکو ٢+١ش ناوی بەرین، واتە دووانەیەك کە زاوزێ دەکەن (دیسانەوە ئوستوورەی زاین) کە لە کۆی هەرسێ هێز و توخمەکە و ئەکتیڤبوونی یەك بە یەکیان بەهۆی مەرگی عەبدولعەزیز دەگاتە تێگەیشتنی تەواو کامڵ.

**د) تاوتوێی شێوازی کار و بەراوردی گێڕانەوە جیاوازەکان لە بەیتی سەیدەوان:**

ئەوەی کە ئاماژەکردن پێی لەم نێوەدا زەرووره، ئاماژە بەو جیاوازییانەیە کە لە گێڕانەوە جۆراوجۆرەکانی بەیتێکدا بەتایبەت لە گۆڕێدایە. بەو پێیەی کە تەواویی ئەم بەتانە سینگ بە سینگ و لە ناوچەیەکی دیکەوە گێڕدراونەتەوە، کەوایە بوونی جیاوازیگەلی لەم چەشنە حاشاهەڵنەگرە، چونکە داستان و حیکایەتەکان بۆ گونجان لەگەڵ هەلومەرجی سروشتی و کاتیی بەناچاری بەهۆی گۆڕانەوە (ئادابتە) بوون، هەتا بتوانن سنوورە جوگرافی، مێژوویی، میللی و مەزهەبی و... یەکان ببەزێنن. لە بەیتی سەیدەوان و گێڕانەوە جۆراوجۆرەکانیشدا وەکو بوارەکانی دیکەی ژیانی مرۆڤ لەگەڵ جیاوازی و پێکناکۆکیی بچووك و گەورە بەرەو روو دەبین. هێندێ دەڵێن بوونی رستەی زیادە پێوەندیی بە تەکنیکی گێڕانەوەوە هەیە و بەتەواوەتی مەسەلەیەکی تاکەکەسییە. بەشێکی تر لەو جیاوازییانە دەگەڕێتەوە بۆ تەکنیکی تاکەکەسیی بەیتبێژ، کە دەکرێت بە گوێدان بە داستان و حیکایەتی دیکە کە دەیگێڕێتەوە، بە جوانی دەتوانین تێبگەین کە رستە زیادەکان پێوەندییان بە تەکنیکی گێڕانەوەوە هەیە و دەگەڕێنەوە بۆ لایەنی تاکەکەسی. بەشێکی دیکەش لە جیاوازییەکان بەهۆی بیر نەکردنی بیر و زەینی بەیتبێژە کە بەرەبەرە بەیتەکانی لەبیرچووەتەوە، یان بەشێك لە حیکایەتێکی هێناوەتە ناو حیکایەت و سەربوردەیەکی ترەوە و پێکەوەی گرێداون. دەستەیەکی تر لەم جۆراوجۆرییانەش پێوەندییان بە دۆخی شوێن و کاتی بەتبێژەوە هەیە کە بەیتبێژ تێیدا دەستی کردووە بە گێڕانەوە و بەپێی دۆخەکە لە خۆیەوە شتێکی بە بەیتەکان (بەپێی گونجانی هەلومەرج) زیاد، یان کەم کردووە. ئێستا ئاماژە بە چەند جیاوازیی گشتی لە بەیتی سەیدەواندا دەکەین بەپێی ئەو گێڕانەوە جۆراجۆرانەی لەبەر دەستدان:

١- لەبارەی مەرگی نێچیروانەوە دوو ریوایەت هەیە:

**الف)** هۆی مەرگیان بەربوونەوە لە شاخ لە کاتی راو راگەیاندووە.

**ب)** ئەویش تووشی چارەنووسێکی هاوشێوەی سەیدەوان دەبێت (واتە بەدەستی عەبدولعەزیز دەکوژرێت).

٢- لەبارەی رێژەی ئەو کچانەی کە عەبدولعەزیز بۆ کوڕەکانی دەهێنێت، دوو ریوایەت باسکراوە:

الف) عەبدولعەزیز کچێك بۆ کوڕە گەورەکـەی دەهێنێـت، بـەڵام بـەهۆی مـەرگی کوڕەکەی بووکەکە دەدرێتە کوڕی دووەم و پاشان کوڕی سێیەم.

ب) عەبدولعەزیز هاوکات بۆ هەرسێ کوڕەکەی، سێ بووك دەهێنێت.

٣- لەمەڕ چارەنووسی عەبدولعەزیزیش سێ ریوایەت لە گوڕێدان:

الف) عەبدولعەزیز بڕیار دەدات کە ئیتر لەگەڵ تایفـەی داسـنی پێوەنـدیی خـۆی بپچڕێنێت و ڕێگای دیارێکی تر بگرێتە بەر.

ب) عەبدولعەزیز خۆی دەکوژێت.

ج) عەبدولعەزیز بڕیار دەدات کە ئیتر هیچکاتێ نەڕواتە راو.

## ئەدەبی زارەکی و چەند سەرنجێک

شەریف فەلاح- سنە

بەدرێژایی مێژوو زۆر نەتەوە هەبوون کە سەرەڕای پێشینە و کەونارایی پڕ لە شانازییان، بەهۆی جۆراوجۆریی سیاسی و مێژووییەوە نەیانتوانیوە زمان و ئەدەبی خۆیان گەشە پێ بدەن و لە ئەدەبی زارەکییەوە بیکەنە ئەدەبی نووسیاری، یان لانیکەم ئەدەبی زارەکیی خۆیان بپارێزن، هەر بەم هۆیەوە یان بە یەکجاری لەناوچوون و هیچ شوێنەوارێکیان لە مێژوودا نەماوەتەوە، یان فەرهەنگ و ئەدەبەکەیان لەناو فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوەکانی دیکەدا قاڵ بووەتەوە. لەم نێوەدا، نەتەوەی کوردیش وەکو یەکێك لە کۆنترین و کەوناراترین نەتەوەی ڕۆژهەڵاتی، گەرچی هەموو کات کەوتووەتە بەر شاڵاوی داگیرکاری و جینۆسایدی فیزیکیی حکومەتە باڵادەستەکانی وەکو (عێراق، تورکیا، ئێران و سوریا)وە، بەڵام بەخۆشییەوە لە ماوەی مێژووی پڕ لە هەوراز و نشێوی خۆیدا نەکەوتووەتە بەر جینۆسایدی فەرهەنگی و ئەدەبییەوە، یان لانیکەم بەهۆی بوونی وزە و توانایی و کاراکتێرە بەهێزەکانی ئەم بوارەوە و لە سایەی خەبات و تێکۆشانی سیاسی و فەرهەنگیدا نەیهێشتووە سێبەری لەناوچوون و قاڵبوونەوە باڵ بەسەر ئەدەبی زارەکی (فۆلکلۆر)دا بکێشێت، ئەم ئەدەبە خۆماڵی و ڕەسەنە کە هەوێن و ریشەی لە هەناوی فەرهەنگ و ژیار و دابونەریتی نەتەوەی کورددایە، درێژەی بە ژیانی خۆی داوە و بووەتە ئەستووندەکێکی قورس و قایم بۆ دەوار و خێوەتی زمان و ئەدەبی کوردی لە سەردەمە جیاوازەکان. کەوایە ئەدەبی زارەکی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا خاوەن پێگە و ڕۆڵێکی پڕ بەها و گرنگە.

ئەدەبی زارەکی (فۆلکلۆر)ی کورد بەگشتی هەڵگری سێ توخمی سەرەکی وەکو: بەند، بەیت و حەیرانە. بەند و حەیران ئەو دەستە لە شیعری خۆماڵین کە لە فۆرمێکی داستانی و گێڕانەوەی ئەمڕۆیی و توخمە پێکهێنەرەکانی دراماتیک بەدەرن و زیاتر دەچنە خانەی چامەی بەرزی عاشقانە، گۆرانیی میللی و ناوچەیی، پەسن و وێنای جوانییەکانی نیشتمان، عەشق و دڵدارییەوە. نموونەی ئەم جۆرە ئەدەبە ئەمانەن: پاییزە، باڵۆرە (لاواندنەوەی مردوو، بەتایبەت ئەوانەی کە لاوچاك و شۆڕەسوار بوون کە زیاتر لە جنووبی کوردستان و ژنان دەیچڕن) گۆرانی، بەهارە، ئازیزە، گوڵێ و سەحەرە، بەڵام بەیتەکان شیعرگەلێکی داستانیی رەشۆکین کە هەڵگری پێکهاتەیەکی شانۆیین، رێژەیان لە جۆرەکانی دیکەی ئەدەبی زارەکی زیاترە و بەشی هەرە زۆری ئەدەبی زارەکیی کورد پێك دەهێنن. بەگشتی بەیتەکان لەبارەی بابەتەوە بەسەر شەش گرووپدا دابەش دەبن: عاشقانە (مەمی ئالان)، تراژیك (سەیدەوان)، ئایینی (زەمبیل فرۆش- شێخی سەنعان)، حیماسی (مەم و زین)، مێژوویی (قەڵای دمدم) و ئەفسانەیی (لاس و خەزاڵ).

چامە داستانییەکان حیکایەت، ئەفسانە و ئوستووەرگەلێکن کە لەسەر بنەمای رووداوە مێژووییەکانی ناوچە، خەبات و تێکۆشانی میللی و مەزهەبی، شەڕ و قەڵاچۆی ناوچەیی کە بە تێهەڵکێشێك لە خەیاڵ و زانیارییە راستەوخۆکانی گێڕەرەوە (بەیتبێژ) گێڕدراونەتەوە. ئەم چیرۆکە زارەکییانە کە سەرهەڵدانیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەرەبەگایەتی و فیودالیزم لە کوردستان. سینە بە سینە لە دانەر و گێڕەرەوەی نەناسراوی سەدەکانی پێشووەوە گەیشتوونەتە دەستی گێڕەرەوە و بەیتبێژەکانی ئەمڕۆ. گرنگرتین حیماسە و چامەکان (بەیت) کە بە دەنگی بەرز و لە کۆڕی گشتیدا دەوترێنەوە، بریتین لە: ئازیزە- گەنج خەلیل- برایموك- بارام و گوڵئەندام- سەیدەوان- خەج و سیامەند- مەمی ئالان- ئەحمەد شەنگە- قونگرومی- شیرین و فەرهاد- عالی قەڵەندەر- قەبر- عەقیدە- مەم و زین- میەر و وەفا- زارا و موشتەری- قەڵای دمدم- عەبدولڕەحمان پاشای بابان- لەشکری- شەم و شەمزین- ناز و خدر- میرزام قەڵای خاو- شێر و کەڵ- لاس و خەزاڵ- ناسر و ماڵماڵ- شێخ فەرخ و خاتوو ئەستێ- شێخ مەند و شێخ رەش- پیر یوونس- سوڵتان ئەحمەد بنیاری- شێخی سەنعان- ئیمام حەمزە- محەمەد حەنیفە- بیگلەر بەگی- جوولەکان- کاکەمیر و

کاکەشێخ- شێخ عوبەیدوڵڵا و مەلا خەلیل- محەمەد رەشید خان- مەحمەل و ئیبراهیم دەشتیان- قۆچ عوسمان- جولەندی- خەزێم- قەر و گولزەر- زەمبیل فرۆش- عەلی عاشق- شاکە و خان مەسوور (دوو بۆچوون و گێڕانەوە لەبارەی ئەم بەیتەوە هەیە کە یەکیان لە ناوچەی دیواندەرە و دەوروبەری سەقز و گەلاڵەی کوردستانی عێراقە و ئەوی دیکەشیان لە ناوچەی مانشت و دەوروبەری شاری ئەیوان لە پارێزگای ئیلام)ە و دوو چیرۆکە شیعری دڵداریی: عەزیز و کوبرا و وەنەوش و بەڕەزا و هتد...

بەیتەکان هەڵگری واتا و بابەتی جۆراوجۆرن، بابەت و هەوێنی هەندێکیان تەنیا ناوچەیی و خۆجێین و دەربڕی ئێش و برك و ئازار و ئەو هەوراز و نشێوە نەتەوەییانەیە کە لەم چاخەی ئێستا و چاخە کەونارایەکاندا بەسەردا هاتووە، وەکو: مێژووی کورد، شەڕ و خەباتی نەتەوەیی- مەزهەبی. رووداوە راستەقینە و تاڵ و شیرینە ناوچەییەکان، چیرۆکی ئەویندارى و نموونەی لەم چەشنە. بەیتەکان لەباری وشە و دەستەواژەوە وەکو گەنجینەیەکی بەنرخ دێنە ئەژمار، کە زۆرێك وشەی رەسەن و پەتییان لە فەوتان رزگار کردووە و لەم بارەیەوە هەڵگری بایەخی ئەدەبی و مێژووین، لەلایەکی دیکەشەوە لە هەناو و دووتوێی بەیتەکاندا دەکرێت بە جوانی هەست و سۆز و کاکڵەی ژیانی مرۆڤی کورد، پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، جۆری کەش و هەوا و سروشت، دۆخی جوگرافیایی و سیاسی، جۆری چالاکیی خەڵك و باوەڕ، ئەندێشە و تێگەیشتنە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانی خەڵك وەکو وێنەیەك لە ئاوێنەدا ببینرێت.

ژنان و پیاوانی بەیتبێژ بەپێی دۆخ و پێگەی کۆمەڵایەتیی خۆیان لە سەرسەرای (دیوان) مزگەوتەکان، قاوەخانە و کۆبوونەوە و شەوچەرەی ماڵان، لە بەزم و رەزم و کاتی کارکردندا بە دەنگ و چریکەی سیحراویی چیرۆك و لاواندنەوەوە چریویانە و سینە بە سینە گواستوویانەتەوە و لە مەترسیی فەوتان و لەبیرچوونەوە رزگاریان دەکردن. بەهەرحاڵ بەو پێیەی کە بەرهەمە ئەدەبییە زارەکییەکان تەنیا لە بیر و زەینی گوێگراندا دەپارێزران، بۆیە رووبەڕووی گۆڕانکاریی ناوەرۆك، جێگۆڕکێ و تەنانەت شێواز و جۆری گێڕانەوە بوونەتەوە، بە چەشنێك کە هێندێ کات گێڕانەوە و تێگەیشتنی جیاواز لە بەرهەمێکی زارەکی لە گۆڕێدایە. هەوێن و سەرچاوەی بەیتە کوردییەکان جیاوازە و لەوانەیە ئەفسانە، یان رووداوێکی مێژوویی و نەتەوەیی، یان بیرەوەریی ناڕوونی شکست، یان سەرکەوتنێك، یان بیروباوەڕی ناوچەیی و مەزهەبی،

کاریگەریی سۆز و خەیاڵاویی شاعیرانە، یان تێهەڵکێشێك لە هەموو ئەمانە ببێتە هەوێنی بەیتێك، بەڵام جەوهەر و رۆحی گشتیی بەیتەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان دەربڕی ئارەزوو، ئومێد، هیوابڕاوی، تاڵییەکان، پێکەنین، گریانی شادییەکان و هاوار و ناڵەی بی سەرەنجامن کە لە چنگی چارەنووسی مرۆڤ و زەبری گەردوون و خیلقەت دان. مرۆڤەکان لەو ئەفسانە و ئوستوورانەدا، ئاوات و خەونە سەرکوتکراوەکانی خۆیان دەبیننەوە، بەدوای چارەنووسی باب و باپیر و ریشە و رەچەڵەکی خۆیانەوەن و رق و کینەیان لە بەرامبەر ستەمکار و زاڵمان و خائینان لە دووتوێی وشەکاندا دەردەخەن.

بەیتەکان تژین لە بەرەنگاری، تووڕەیی، ئاوات، بیروباوەڕە دینی و نەتەوەییەکان کە بەوپەڕی هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامەوە لەپێناو جوانکردن و واتابەخشین بە ژیانی شەرافەتمەندانەوەن. لە بەیتەکاندا، بیروباوەڕی خەڵك، سادە، راستگۆیانە و بێ فیز و لەخۆبایی دەردەکەون، هەڵگری ئاڵۆزی و رەمز و راز نین، بەیتەکان رەنگدانەوەی ژیانی خەڵکن، پێوەندیی مرۆڤەکان و شێوازی رەفتار و هەڵسوکەوتیان لەتەك یەکتر و هەروەها دیاردە نەناسراوەکانی دەوروبەری خۆیان تاتوتوێ و شرۆڤە دەکەن، بەگشتی بەیتەکان راڤەی هەست و سۆزی قووڵی مرۆڤایەتین و لە هەرێنی خۆیان و لە سەردەم و چاخە جیاجیاکاندا، پێکهاتەی سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیی کۆمەڵگایان پاراستووە.

بەیتە کوردییەکان سەرنجی زۆرێك لە رۆژهەڵاتناسان و نووسەرانی بیانییان بۆ لای خۆیان راکێشاوە، کەسانێکی وەك: ئوسکارمان (OSKARMAN)، کراولینسۆن (H.CRAWLINSON)، شودزکۆ (A.CHDZKO)، لێریش (P.LERCH)، شنیدلر (A.HOTOMSCHIADLER)، پریم (PRYM)، سوسین (SOCIN)، رسیویل (JABA RECUEIL)، مار (MAR)، مینورسکی (MINORSKY)، واسیلی نیکیتین، رۆژە لسکۆ، وایگرام، میلنگن، رۆدینکۆ (AM RADUDENKO) و مایکل چات وسون ئەو نووسەر و لێکۆڵەرانەن کە ساڵانێکی زۆر لە تەمەنی خۆیان بۆ کۆکردنەوە و وەرگێڕانی بەیت و ئەدەبی زارەکیی کوردی تەرخان کردووە. لە کوردستانی رۆژهەڵاتیش زۆرن ئەو نووسەر، لێکۆڵەر و فۆلکلۆرناسە دڵسۆزانەی کە خۆبەخشانە لەم پێناوەدا خزمەتیان کردووە و ئێستاش بەردەوامن، لەوانە دەتوانین ئاماژە بە نەمران عەلائەدین سەجادی، عەبدولحەمید حەیرەت سەجادی، مامۆستا هێمن و عوبەیدوڵڵا ئەیوبیان

بکەین، هەروەها ئەوانەش کە ئێستا لە ژیاندا ماون بریتین لە: قادر فەتاحی قازی، ئەحمەد بەحری، عەبدولحەمید حوسێنی، ناسر سینا، خوسرەو سینا، سەلاحەدین ئاشتی، ئەحمەد قازی، جەعفەر حوسێنپوور (هێدی)، محەمەد سالح ئیبراهیمی، دکتۆر سۆران سنەیی، ئەحمەد شەریفی، عەزیز شاهرۆخ، عەزیز ئیبراهیمی، محەمد رەحیمیان، یەحیا سەمەدی، سەلاح پایانیانی، سەلاح خزری، عەزیز وەلیاتی، حەبیبوڵڵا تابانی، عەلی خزری، دکتۆر رەهبەر مەحمودزادە، سەید محەمەد سەمەدی، عەلی ئەشرەف دەروێشیان، مەنسوور یاقووتی، عەلیڕەزا خانی، نیعمەت زەحمەتکێش و محەمەد عەلی سوڵتانی، جەلیل ئاهەنگەرنژاد و... لەم بارەیەوە کاریان کردووە، بەڵام ئەو بەرهەمانەی کە هەتا ئێستا چ لەناوخۆ و چ لە دەرەوەی وڵات کۆکراونەتەوە و چاپ و وەرگێڕدراون، لە هەمبەر ئەو سامانە بەپێز و دەوڵەمەندەی کە هەتا ئێستا ماون و کۆ نەکراونەتەوە، دڵۆپێکە لە دەریایەك دوور و گەوهەر.

ئەوە راستییەکی حاشاهەڵنەگرە کە لەم بارەیەوە بەربڵاوترین هەوڵ ئۆسکارمانی رۆژهەڵاتناسی گەورەی ئاڵمانی ئەنجامی داوە. ئۆسکارمان خزمەتێکی مەزن و بەرچاوی بە زمان، فەرهەنگ و ئەدەب و مێژووی نەتەوەیی کوردان کردووە، خزمەتێکی دەگمەن و فەرامۆش نەکراو، بە چەشنێك کە ناوی ئەم بیرمەند و دڵسۆزە بێگانەیە لە مێژووی ئەدەبی کورددا بە نەمری هێشتووەتەوە. بۆیە لێرەدا پێویستە ئاماژەیەکی کورت بە ژیان و بەرهەمەکانی بکەین.

ئۆسکارمان، ساڵی ١٨٦٧ لە بەرلینی ئەڵمانیا چاوی بە دنیا هەڵهێناوە و لە ساڵی ١٩١٧ لە هەمان شار کۆچی دوایی کردووە، ئۆسکارمان لە ساڵی ١٩٠١ هەتا ساڵی ١٩٠٧ و لە ساڵی ١٩٠٨ هەتا ١٩١١ی زایینی بۆ لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەبارەی زمانەکانی کوردی و فارسی سەفەری رۆژهەڵاتی ناڤین و ئێرانی کردووە. ناوبراو ساڵی ١٩٠٣ی زایینی سەردانی مەهابادی کردووە و لە ماوەی نیشتەجێبوونی لەو شارە، جیا لە کۆکردنەوەی ١٧ بەیتی کوردی (دمدم- مەم و زین- لاس و خەزاڵ- ناسر و ماڵماڵ- برایمۆك- شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ- مەحمەل و برایم دەشتیان- قۆچ عوسمان- جولەندی- خەزێم- کاکە میر و کاکە شێخ- لەشکری- قەر و گولزەر- زەمبیل فرۆش- باپیرئاغا- عەلی عاشق و عەبدولڕەحمان پاشای بابان)، کۆمەڵێکی زۆر بابەتی رێزمانی و فەرهەنگ و دەستەواژەی کوردی، نزیك بە ٢٠٠ غەزەل و

گۆرانیی کوردی لە زاری گوندنشینێك بەناوی (ڕەحمان بەکر)ەوە کۆکردووەتەوە و وەریگێڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی و ساڵی ١٩٠٥ی زایینی لەژێر ناوی بەیت و باو و ئەدەبی زارەکیی زاراوەی موکریانی بە هەمان ئاخاوتەی سەرەکی و بە ڕێنووسی لاتینیی تایبەت لە بەرلین بە چاپی گەیاند.

(واسیلی نیکیتین) ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی، ساڵانێکی زۆر لە تەمەنی خۆی بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لەمەڕ بەرهەمە فۆلکلۆرییە کوردییەکان تەرخانکردووە، واسیلی نیکیتین لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی کورد و کوردستان وەرگێڕدراوی (محەمەد قازی) پاش ئاماژەکردن بە چەند بەیتێکی حیماسی، ئەویندراری و مێژوویی لەمەڕ ئەدەبی زارەکیی کورد هێندێ خاڵی ورد و جێگای تێڕامانی خستووەتە ڕوو، کە لێرەدا دەیانخەینە بەرباس:

ئەوەی لە ئەنجامی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەدەباتی کوردی مرۆڤ تووشی سەرسووڕمان دەکات، گەشەی لەڕادەبەدەری فۆلکلۆرەکەیەتی، کە بە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی دێتە ئەژمار. لەبەرئەوەی خەڵکی کورد دەرەتانی خوێندن و نووسین بە زمانی زگماکیی خۆی نەبووە و لەو مافە بێبەش بووە و لە بەراورد لەگەڵ دراوسێیەکانی وەکو: تورك و فارس و عەرەب لەم بارەیەوە ژێرچەپۆکە بووە و زوڵمی لێکراوە و ناچار بووە بۆ دەربڕینی خەیاڵ و ئێش و برك و ئازارەکانی ژیان بپەرژێتە سەر ئەدەبی زارەکی و بەشێوەیەکی بەرین و لەم دەریایە قووڵ و مەنگەدا مەلە بکەن، ئەمەش خۆی دەبڕی ئەوەیە کە ئەم خەڵکە مەیل و هۆگرییەکی زۆریان بە فێربوونی زمانی زگماکیی خۆیان هەبووە. کەوایە هەر هەرچەشنە توێژینەوە و بەدواداچوونێك لەبارەی ئەدەبی دەبێت سەرەتا و پێش هەر هەوڵێك بگەڕێینەوە بۆ فۆلکۆر، بەیت و باو، پەندی پێشینان، قسەی نەستەق و بەگشتی فەرهەنگ و ژیاری لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیی ئەم نەتەوەیە، کە نەتەنیا هەڵگری میراتێکی زۆر دەوڵەمەندی ژیان و جیهانبینیی نەوەکانی پێشووە و زۆر جاریش لە بابەت و هەوێنی فۆلکلۆریکی نەتەوە دراوسێیەکانی کەڵکی وەرگرتووە و بە تواندنەوەی لە لەناو فۆلکلۆری کوردیدا هەردەم بۆ گەشە و پەرەپێدانی هەوڵی داوە. بەڕای "ویلچسفکی" گەشەی لەڕادەبەدەری فۆلکلۆری کوردی، دەربڕی ئەخلاق و کەسایەتیی چینایەتییە، کە ئەمە خۆی نیشانەی زەوق و داهێنانی زارەکیی کۆمەڵی

کوردەوارییە، داهێنانێك کە بەڕای ئەو بە پلەی یەکەم لەناو کار و شێوەی ژیانی توێژی
باڵای کۆمەڵگای کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە، ئەگەر بێت و وەها تیۆرییەك قبووڵ بکرێت،
فۆلکلۆری کورد دەبێتە ئامرازێك لە دەستی فیئۆداڵەکان کە لەو ڕێگایەوە دەسەڵات و
هێزی خۆیان بەسەر چینی شوانکارە و وەرزێڕی کورددا دەسەپێنن. هیچ حاشا لەوە
ناکرێت کە لە هێندێ لە بەرهەمە فۆلکلۆریەکانی کورددا بابەتی سەرەکیی چیرۆك
بریتییە لە پێداهەڵگوتن، وەسف و پەسنی هونەر و شاکارەکانی ئاغا و شێخ و مەلا،
یان کەسوکاریان بووە و بە ڕوونی دیارە کە زمانی ئەو بەرهەمانە زمانی چینێکی
خوێندەوارترە کە بە وشە و دەستەواژەگەلی عەرەبی و فارسیش ڕازاوەتەوە. ویلچفسکی
لەو باوەڕەدایە کە بۆچوون و ڕوانگەکانی واسیلی نیکیتین تەنیا لەمەڕ هێندێ لە
بەرهەمە فۆلکلۆری و زارەکییەکانی کورد وەڕاست دەگەڕێ، نەك لەمەڕ هەموو
بەرهەمەکان، ویلچفسکی بۆ خۆیشی کە وەها ڕوانگەیەکی دەربڕیوە، بۆچوونەکەی
وەڕاست گەڕاوە و نابێت ئەوەش فەرامۆش بکەین کە ژیانی نەتەوەی کورد لە ماوەی
چەندین سەدەدا گیرۆدەی پێکهاتەی فیئۆداڵی بووە، بەڵام ئەم سیستمەش ئەو دەرفەتەی
بۆ کوردستان ڕەخساند کە شوناسی تایبەتی نەتەوەیی خۆی بپارێزێت، بە واتایەکی تر
کاتێك شایەر و گۆرانیبێژێکی گەڕیدەی کورد داستانی قارەمانێتی کەسێکی وەکو
یەزدانشێر و عەبدولڕەحمان پاشای بابان بە ڕیتم و ئاهەنگەوە دەخوێنێت، لە هەمان
حاڵدا باس لە گێڕانەوەی بەرەنگارییەك دەکات کە بەناوی کوردەوە لەگەڵ بێگانە
ڕوویداوە و ئەو بەم چەشنە ئیرادەی نەتەوەیی خۆی لە بیرەوەرییەکانیدا زیندوو دەکاتەوە.
لەبارەی شێوازی هۆنینەوەی شیعرە فۆلکلۆرییەکانەوە، دەبێت دەست بدەینە لێکۆڵینەوە
و شیکاریی پێکهاتەخوازانەی وردتر هەتا بکرێت بەدڵنیاییەوە بوترێت کە جیاوازی لە
نێوان شێوی ئاخاوتنی چینی باڵاو کۆمەڵانی ئاسایی خەڵکدا هەیە، یان نا؟ لە حاڵی
حازردا بۆچوونی ڕەها لەم بارەیەوە لەوانەیە نەختێ گرفت بێت، ئێستا زیاتر وا هەست
دەکرێت کە لەنێوان دوو شێوازی ئاخاوتنی چینی باڵا و کۆمەڵانی خەڵکدا
جیاوازییەکی کەم هەیە، ئەو جیاوازییانەی کە هەستیان پێ دەکرێت زیاتر لە
جیاوازیی زاراوەکان و لە سوان و ڕەخنەکردنی لەڕادەبەدەری وشە و دەستەواژە زمانە
بیانییەکاندایە. بوونی وشە عەرەبییەکان زیاتر بەرەنجامی هۆنینەوەکانە هەتا لە زەین
و هزری گوێگراندا زیاتر ڕەنگدانەوەی هەبێت، چونکە عەرەبی زمانی قورئان،

پێغەمبەر و هەروەها زمانی خوێندەوار و چینی نەجیب زادە و ئەشرافەکان بووە و هەروەك دەبینن زۆرینەی شێخ و سۆفی و سەیدەکان ریشە و بنەچەی خۆیان دەبەستنەوە بە ئیمام و یارانی پێغەمبە و بنەماڵە ناودارە عەرەبەکانەوە. دەبێت ئەوەش بوترێت کە فۆلکلۆری کوردی لەباری فراوانی و فرەچەشنیی بابەتەوە زۆر دەوڵەمەندە و تێیدا جیا لەوەی کە ئاهەنگ و شیعرگەلێك هەیە کە لانکەم شێواز و ریتمێکی دیار و تابەتیان هەیە و هەڵگری کۆمەڵێك بەرهەم و شیعری زاتین کە لە ئان و ساتێکدا بەرهەمهاتوون و توخمێکی تەواو رەشۆکی و ئاساییان هەیە و بێبەرین لە هەرچەشنە روخسارێکی دەسکرد و رازانەوەیی و لە هەمان حاڵدا ئەو رووداوەی کە بووەتە هەوێن و کاکڵەیان دەستبەجێ پاش رووداو و کارەساتەکان لەلایەن هۆنەرانەوە دانراون. لێرەدا ناکرێت ئاماژە بە خاڵێکی گرنگی دیکە نەکەین، ئەویش ئەوەیە کە بەڕای (ژی بێدیر j.bedier) لەناو بەرهەمە ئەدەبییە زارەکییەکاندا ئەو شێوازەی کە دەبێت لە ریزی بەرچاوترین و بەرجەستەترین بەرهەمەکاندا دابنرێن، سروود و شیعری گۆانیی لیریکی و دڵدارین، کە توخمی رەسەنایەتیی خۆیان باشتر پاراستووە و کەمتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی بابەت و فکری بیانییەوە و لە ئەنجامدا ئەگەر بکرێت ئەدەبی بەراوردی بگەڕێننەوە بۆ پێگەی جەوهەر و راستیی خۆی، باشترین بەڵگە و سەرچاوەن بۆ بابەتی لێکۆڵینەوە. تەنیا چەند نموونەیەکی لاوژە و شیعری گۆرانی و لیریکی و دڵداریی کوردی بەسن بۆ تێگەیشتن لە کاکڵەی سەرەکیی ئەدەبی زارەکی و خۆماڵی، کە ئەویش بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ ئایین و رێوشوێنەکانی عەشق و توخمەکانی جەنگی داسەپاو و بەرەنگاریی رەوا کە دوو جەوهەری ئاشکرای رۆحی سەرکێشی نەتەوەی کوردن. جەوهەری فۆلکلۆر خۆی نیشاندەری تەواوی ئەو شتانەیە کە لە رابردووی ژیار و جیهانبینی نەتەوەیەکدا لەئارادا بوون و هەن. لە دووتوێی گۆرانییە خۆماڵییەکانی دوو هۆنەری ناوداری کورد "شاکە و خان مەسوور"، لە سەد و پەنجا ساڵی رابردوودا، گۆرانیبێژانی میللییەکانی وەکو: سەید محەمەد سەفایی، رەسوڵ نادری، برایم قادری، برایم نەورۆزی، عەبدوڵڵا ماچکەیی، یووسف ئاسکە و سیاچەمانە چڕە بەناوبانگەکانی رابردوو و ئێستای هەورامان و هۆرەچڕی بەناوبانگی وەکو "عەلی نەزرە مەنووچهری" کە ئەم چەند دێڕە نموونەیەکن لە دەقی هۆرەی عەلی نەزەر:

زڕەی یەی دەسی پاوەن لە پامە

م لەی شابادە کی هەوا خوامە

بنوور وەی قاقەز دووس دورەوە

بزان چووە نوساس وە دلگیرەوە ؟

بلبل تۆ مەگیر وە زار زارەوە

بەش تۆ ماگە گوڵ وە دارەوە

زرەی شەماڵ تیەی لەلا قەسرەوە

دەمچەو لا بریاگە هاوە ئەسرەوە

چەتر چو لەولاو بخەوە لاوە

کوچگانگ چەن کەس نایدە وەکاوە

نە قاقەز دیرم نە قەڵەم دەوات

راز دڵەگەم بنووسم ئراد

بەیت و باڵۆرە و لاواندنەوەی ژنــان و کچــان لــە کــاتی گەرمەشــینی لەدەســتدانی ئازیزان و خۆشەویستاندا و هەروەها دەقەکانی چەمەری، پڕن لە حیماسە و بەرخودان و رەزم، گۆرانییە لیریکی و دڵدارییەکان تژین لە عەشق و سۆزی مرۆڤی کورد و هەروەها هەڵگری جوانییە سیحراوییەکانی سروشتی کوردەواری. ئەو گۆرانییانەی کە رۆژانە لــە زاری شایەر و هۆنەرەکانەوە لە شادی و گۆڤەندی کورداندا دەوترێنــەوە، ئەگەرچــی لــە رواڵەتدا سادە و ساکارن، بەڵام لە دووتوێ و هەناوی ئەو دەقانەدا دنیایــەك زانیــاری و خەیاڵ و هزری کورد حەشاردراون، کە مرۆڤی کونجکۆڵ و شــارەزای دەوێ کــە بیانخاتــە روو و شــەن و کــەویان بکــات. خوێنــەری ئــازیز نووســینی لــەبارەی ئــەدەبی زارەکــی و فۆلکلۆری کوردییەوە خوێندنــەوە و لێکۆڵینەوەیــەکی کۆمەڵناســانە و رەوانبێژیانــەی پۆلێنکراوی دەوێت کە هەرکام لەلایەنەکانی بە وردی لێك بداتەوە، کە لە تاقەتی ئەم وتارە گشتییەدا نییە.

هەروەك مامۆستا هێمن دەڵێت: مەم وزین بە ناوبانگترین چیرۆکی کوردییە.

چیرۆکێك کە چەندین گێڕانەوەی هەیە و بڕێ جیاوازی لەنێوان توخمەکانی گێڕانەوەیدا هەیە، بەڵام ناوەرۆکی ڕەسەنی چیرۆکەکە کە ئوستوورەیەکی کۆنی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستە کە لە شوێنی خۆیدا بە تەواوی باسی لەسەر دەکەین. ئەم چیرۆکە وەکو هەموو چیرۆکە کوردییەکان و بەگشتی وەکو هەموو چیرۆکە کۆنەکانی دنیا لە سەرەتاوە بەشێوەی زارەکی و لە زمانی شایەرەکانەوە (کە بە بەیتبێژ دەناسرێن) گوتراوە، هەر بۆیە جیاوازیی گێڕانەوە و هەروەها تێکەڵبوونی توخمەکانی گێڕانەوە، لە ئەدەبی زارەکی و ئەم بەیتەشدا شتێکی ئاسایی و حاشاهەڵنەگرە.

هەر شایەرێك بەپێی پێخۆش بوون و بۆچوونی خۆی هێندێك شتی بۆ چیرۆکەکە زیادکردووە، یان گۆڕیویەتی، ئەم دەستێوەردانە تا ئەوکاتەی کە چیرۆکەکان تۆمار نەکرابوون، زۆر زەقتر بوو، بەڵام دوای تۆمارکردنی بەیتەکان کە هاوکات بوو لەگەڵ لاوازبوونی بەرچاوی ئەدەبی زارەکی ئەو گۆڕانکارییانە کەم بوون، یان بە تەواوی نەماون.

لەبارەی مەم و زینەوە ئەوەی لە بەردەستدایە، گێڕانەوەی بەناوبانگی خانییە کە بەڕاستی شاکارێکی ئەدەبییە و مەم و زینی لە بەیتێکی سادە تا رادەی حیماسەوە کێشاوەتەوە سەرەوە. دووەم گێڕانەوەی پیرەمێردە کە بە وتەی مامۆستا هێمن ئیبداعێکی خۆیەتی و زیاتر لە ئەدەبی ڕۆژئاوایی و درامەکانی شکسپیر چووە. سێیەمیش گێڕانەوەی "ڕەحمان بەکری" شایەرە کە ئۆسکارمان تۆماری کردووە و وادیارە شێوەی باو لەناو بەیتبێژانی کوردستانی ئێراندا هەر ئەم گێڕانەوەی ڕەحمان بەکرە بووە (چونکە بە وتەی ئۆسکارمان جیاوازیی نێوان گێڕانەوەی شایەرەکان بەگشتی زۆر کەم بووە).

ئەوەی ئێمە لێرەدا پشتی پێدەبەستین، دوو گێڕانەوەی خانی و ڕەحمان بەکرە، بە تەواوی و بەدڵنیاییەوە ناتوانین بڵێین کام لەم دوو گێڕانەوە ڕەسەنترە. گێڕانەوەی خانی لەبەرئەوەی کە تێکەڵی وردەکاریی سۆفیانە و بۆچوونی عیرفانی بووە، لە چوارچێوەی ئوستوورەیی و فۆلکلۆری چیرۆکەکە دەترازێت و گێڕانەوەکەی ڕەحمان بەکریش بەبۆنەی تێکەڵکردنی چەندین ئوستوورەی و دەقی ئایینیی جیاواز لەناو ئوستوورەیەکی تایبەت، ڕەنگە خوێنەری شارەزا تووشی سەرلێشێواوی بکات و لێی ون بێت کە

ناوەڕۆکی ئوستوورەیی چیرۆکەکە بەڕاستی کامەیە. بۆیە لە هەردوو ئەم گێڕانەوەیە کەڵك وەردەگرین بۆ وەدەرخستنی پاژە پرش و بلاوە ئوستوورەییەکانی ئەم چیرۆکە، کە بە ئوستوورەی خودای کوژراو (شەهید) دەناسرێت.

### ئوستوورەی خودای کوژراو:

لە دنیای ئوستوورەناسیدا زۆرجار هەیە کە لەنێوان ئوستوورەی چەندین نەتەوەی جیاوازدا توخمگەلی ئوستوورەیی هاوبەش دەکەوێتە بەرچاو، تەنانەت جار هەیە کە ئوستوورەی نەتەوەیەك دەقاودەق لەناو نەتەوەیەکی بە رواڵەت دوور لە نەتەوەی پێشوو دەبینرێت و تەنیا ناوەکان دەگۆڕدرێن کە بەم ئوستوورەگەلە دەڵێن ئوستوورەگەلی هاوتەریب. لە ڕێگای ئوستوورە هاوتەریبەکانەوە زانیاریی زۆر لەبارەی پێوەندیی نێوان نەتەوەکان و هەروەها مێژووی هاوبەشی ئەوان، یان شێوەی ژیانی ئەو نەتەوانە دەکەوێتە دەستی توێژەر و رەنگە بازنە ونبووەکانی مێژووی نەتەوەیەك بەهۆی ناسینی ئوستوورەکانی وەدەرکەوێت.

یەکێك لە ئوستوورە هاوبەش و هەرە ناسراوەکانی ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست ئوستوورەی "خودای شەهید" بووە، ئوستوورەیەك کە پێوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ شێوەی ژیانی خەڵکی ناوچەکەوە هەیە و گرنگترین ئوستوورەی ژیانی وەرزێرییە. ئەم ئوستوورەیە پێوەندی هەیە لەگەڵ کشتوکاڵ و چاندن و دروێنەی بەروبوومدا. ناوەڕۆکی ئوستوورەکە باس لە پاڵەوانێك دەکات کە تایبەتمەندیی هەرە بەرچاوی داوێنپاکییە. ئەم پاڵەوانە کە بووەتە دڵداری ژنێکی خاوەن دەسەڵات، بۆ ماوەیەك دەکەوێتە زیندان، یان بیر، یان دۆزەخ (کە جۆرێك لە مردنە) و خەڵك رێورەسمێك بە بۆنەی مردن، یان لە زیندانکەوتنی پاڵەوانەکە بەڕێوە دەبەن. لەم داستانەدا پاڵەوانەکە نوێنەری تووی گیایە، واتە خودایەکی گیاییە کە وەرزێر لەژێر خاکی دەکات و هیوادارە شین ببێت و سەرهەڵبێنێت. لە بۆچوونی ئینسانی ئوستوورەییدا پێوەندی (علت و معلولی) هێشتا مانای نییە و ئەو هێشتا بەو قەناعەتە نەگەیشتووە کە سەرهەلهێنان و ڕووانی گیا چەندین مانگ پاش چاندنی شتێکی سروشتی و ئاساییە ڕووداوی لەدایکبوونی منداڵیش هەر بەو شێوەیەیە. سەرەتا دڵەڕاوکێی ئەوەی کە ئایا ئەو شتەی کە چاوەڕوانییە روو دەدات، یان نا، دەبێتە هۆی خولقاندنی ئایین و دابونەریتی تایبەتی

(که زۆر جار لەگەڵ ڕێوڕەسمی قوربانی بۆ خودایان بەڕێوە دەچێت) پاشان ئەو دابونەریتە دەبێتە بەشێکی نەگۆڕی ئەو دیاردە سروشتییە، واتە لەبەر چاوی ئەو دەبێت بە عیللەتی ئەو ڕووداوە سروشتییە، (بۆ نموونە سەرهەڵێنانی تۆو لە خاك). ئینسانی ئوستووریی ئایینەکان و دابونەریتی زۆر بە لاوە گرنگە و وا دەزانێت جێبەجێ نەکردنی ئەوانە دەبێتە هۆی تۆران و ڕقهەستانی ئیزەدی ئەو داب و ئایینە و تۆڵەکردنی ئەو. بۆ نموونە پێدا هەڵنەگوتنی ئیزەدی ئاو دەبێتە هۆی تۆرانی ئەو و پشت هەڵکردنی لە خەڵك و زاڵبوونی دێوی وشکەساڵی، بۆیە هەموو هەوڵی خۆی دەدات کە ئەو خودایانەی کە پێوەندی ڕاستەوخۆیان بە ژیانەوە هەیە و هەمیشە بە باشی ستایش و پەرەستن بکات. خودای گیایش یەکێك لەو خودایانەیە کە ناوەند و کۆڵەکەی ژیانی وەرزێرییە.

کۆنترین بیچمی ئەم ئوستووەیە، ئوستوورەیەکی مێزۆپۆتامیاییە، لەم ئوستوورەیەدا ئینانا ژن- خودایەکە کە عاشقی کوڕە شوانێك دەبێت بە ناوی دومووزی، دومووزی مل بەو خۆشەویستییە نادات و ئینانا بە تۆڵەی ئەو نافەرمانییە کارێك دەکات دومووزی بکەوێتە دنیای ژێرزەوی، یان دۆزەخ.

لە ئوستووره بابلییەکاندا "ئینانا" دەگۆڕدرێت بە ئیشتار و دوموزیش دەبێتە تەمووز، بەڵام داستانی خۆشەویستیی بێ ئاکامی ژن- خودا و تۆڵەکردنەوەی لەجێی خۆی ماوەتەوە، ئەم مۆتیڤە دەڕواتە کەنعان و شارستانییەتی ئۆگاریت و لەوێوە وەکو چیرۆکی پێغەمبەرێکی پاکداوێن بەناوی یوسف دەڕواتە ناو دەقە پیرۆزەکانەوە، (واتە تەورات و ئینجیل و قورئان)، کە دەگاتە ئێران ناوی چیرۆکی سیاوەشی لەسەر دادەنرێت. کوردیش وەکو نەتەوەیەکی ئەم بیاڤە فەرهەنگییە خاوەن گێڕانەوەیەکی خۆجییە لەم ئوستوورەیە، کە لە چوارچێوەی چیرۆکی "مەم و زین"دا دەیناسین.

جیاوازیی بەرچاوی چیرۆکی سیاوەش و مەم لەگەڵ ئەوانی دیکە، گۆڕانی پیشەی خودای کوژراوە. لە چیرۆکە کۆنترەکاندا ئەم خودایە هەمیشە شوانە، کە ئەمەش دەتوانێت بۆ خۆی هۆکارێك بێت بۆ ئەو مانایە کە ئەم چیرۆکە لە لایەنێکەوە باس لە گۆڕانی شێوەی ژیانی ئینسان لە شوانی و ئاژەڵداری دەکات بۆ وەرزێری (شوان دەکوژرێت و دەبێتە قوربانیی گیا و وەرزێری). لە داستانی مەم و زیندا ئەو بەشە گۆڕاوە، بەڵام هەر لەو مۆتیڤەوە دەیان چیرۆکی سەربەخۆ و جوراوجۆر سەری هەڵێناوە،

تا ڕادەیەك کە چیرۆکی خۆشەویستیی نێوان شوان و کچە ئەمیر، یان کچەخان بووە بە ناوەرۆکی بەشی زۆری بەیت و چیرۆکە کوردییەکان و بۆ هەمووان ناسراو و ئاشنایە کە لە شوێنی خۆیدا و کاتێ گەیشتینە ئەو چیرۆکانە باسی لەبارەوە دەکەین.

لە هەرکام لەم چیرۆکانەدا، بنەما ئوستوورەییەکە بە هێندێك لق و چڵ و وردە گێڕانەوەی جۆراوجۆر داپۆشراوە، بەڵام هەبوونی چەند خاڵ خوێنەر بەرەو ناوەرۆکی ئیزەدی شەهید کراو ڕێنوێنی دەکات. لە چیرۆکی "مەم و زین"یشدا ئەو خاڵانە بەم شێوەیە دەکەونە بەرچاو:

### ١- خۆشەویستیی زین بۆ مەم:

ئەگەرچی لەم چیرۆکەدا باس لە خۆشەویستیی دوولایەنەی مەم و زینە، بەڵام لە گێڕانەوەی هەردوو سەرچاوەکەدا بۆ ئێمە دەردەکەوێت کە خوازیاریی زین زەقتر و بەرچاوترە، لە مەم و زینی خانیدا پاش یەکەم دیداری مەم و زین (بە جلی گۆڕدراو و لە جێژنی نەورۆزدا) ئەو کەسەی هەوڵ دەدات بۆ ناسینی ئەوی دیکە، زینە. زین دایەی خۆی ڕادەسپێرێت کە لەبارەی ئەو کەسەی کە بینیویەتی، (مەم) لە فاڵگیر پرس و جۆ بکات و پاش ناسینیشی دیسان دایە بۆ لای ئەو دەنێرێت و بە مەم ڕادەگەیەنێت کە خۆشی دەوێت. لەوەوە دیارە خۆشەویستی لەلایەن زینەوە دەست پێدەکات. تەنانەت لە سەرچاوەی دیکەشماندا (مەم و زینی تۆمارکراوی ئۆسکارمان) لە بەشێك لە چیرۆکەکەدا مەم بە ئاشکرایی زین ڕەت دەکاتەوە و سێ جار بەدوای یەکدا دەڵێت کە زینی ناوێت. ئەگەرچی حیکایەتخان هۆکاری ئەو هەڵوێستەی مەم بە تێکدەریی "بەکر" دەزانێت و دەڵێت بەکر بە گوێی مەمی گەیاندووە، کە زین نەخۆشیی پیسی گرتووە، بۆیە کاتێ میر زێنەدین (برای زین) سێ جار زین بە مەم دەدات، ئەو هەرسێ جارەکە ڕەتی دەکاتەوە و دەڵێت نامەوێت، بەڵام دیارە ئەمە دەستێوەردانی شایەرەکانە و بەشێوەیەکی قووڵ پێکهاتەی ئەم ڕەتکردنەوانە و هەروەها پێشدەستی و هەستی بەتینی زین، بەرەو هەمان "ژن- خودای عاشق" و "ئیزەدی پاکداوێن" ڕێنوێنیمان دەکات.

### ٢- له زیندان کەوتنی مەم:

لە هەردوو سەرچاوەکەی ئێمەدا هۆی زیندانی بوونی مەم ئاڵۆزکاری و فیتنەگێڕی بەکر (معرفی) دەکرێت، بەڵام لە گێڕانەوەی ڕەحمان بەکردا ڕەتکردنەوەی زین لەلایەن مەمەوە دەبێتە بەردی بناغەی کێشەی میر و مەم و لە ئاکامدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەبێتەهۆی زیندانیبوونی مەم.

### ٣- مەرگی مەم و شینگێڕی کردنی:

لە گێڕانەوەی خانیدا بە ڕوونی باس لە ڕێوڕەسمێکی گەورە بە بۆنەی مەرگی مەم دەکرێت، هەروەها بەڕێوەبردنی زەماوەند بۆ مەم و زین پاش مردنیان. ڕێوڕەسمی ماتەم و شینگێڕان بۆ ئیزەدی گیایی بەشی ئایینی ئوستوورەکەیە. هەر بەوجۆرە کە لە سەرەتا باسکرا، ئوستووره و ئایین پێوەندییەکی زۆر نزدیکیان پێکەوە هەیە و بەردەوام یەکتر ئەکتیڤ، یان بەهێز دەکەنەوە، بەڵام بەهۆی پەراکتیك بوونیەوە دیارترە و لە ڕێگای ئایینەکانەوە دەتوانین پاژە پەرش و بڵاوەکانی ئوستوورەیەك کۆ بکەینەوە و پێکەوە پێوەندییان بدەین.

نموونەی هەرە بەرچاوی شینگێڕی بۆ ئیزەدی گیایی، شینی سیاوەشە لە ئێراندا کە پێش لە ئیسلام بەڕێوە دەچوو و لە هێندێ شوێن وەکو شیراز تەنانەت تا سەدەی بیستەمیش مابوو. ئەو ئایینە ئەوەندە بە بەهێز و بەربڵاو بوو کە پاش زاڵبوونی ئیسلامیش توانی خۆی ڕاگرێت و لە ڕێگای گۆڕانی ناوی پاڵەوانەکانەوە درێژە بە ژیانی خۆی بدات. شینی سیاوەش بە زۆربەی تایبەتمەندی و زۆرینەی سیمبولەکانییەوە لەژێر ناوی عاشوورای حوسێنیدا دیسان بە هێژمۆنیەی پێشوویەوە سەری هەڵێنا و ئێستاکەش هەر ساڵ لەناو شیعەکانی ئێراندا بە تینێکی تایبەتەوە بەڕێوە دەچێت. سەرنجدان و لێوردبوونەوە لەسەر ئاڵا و بەیاخەکانی ڕۆژی عاشوورا کە پڕن لە نیشانەکانی ڕێوڕەسمێکی وەرزێری (وەکو درەختی سەروو و گیا و باڵندە و... هتد) سەلمێنەری ئەو ڕاستییەیە کە عاشوورای حوسێنی درێژەدراوی شینی سیاوەشە و یەکبوونی -این همانی- ئەم دوو ئایینە دەخاتە بەرچاو.

شینی سیاوەش و شینی مەم، دوو ڕێوڕەسمی هاوتەریب و دوو گێڕانەوەی یەك ئایینن کە ئەگەری زۆرە کە لە هەموو بەشەکانی ئێراندا بەڕێوە چووبێت.

## ٤- شینبوونی گیا، یان گوڵێك لەسەر مەزاری مەم و زین:

لە هەردوو گێڕانەوەکانی خانی و ئۆسکارماندا باسی شینبوون و سەرهەڵدانی گیا، یان گوڵێك لەسەر مەزار، واتە لە خاکی گڵکۆی مەم و زین هاتووەتە دەر. هاوشێوە -معادل-ی ئەم ڕووداوە لە چیرۆکی سیاوەشیشدا هەیە. شینبوونی گیای سیاوەشان لە خوێنی سیاوەش و شینبوونی گوڵ لەسەر مەزاری مەم، ئەوە نیشان دەدات کە ئوستوورەکە شوێنی کەوتووە. هەر بەو جۆرە کە باسمان کرد ئوستوورە و بەتایبەت ئایینە پێوەندیدارەکان بە ئەوانەوە تێکوشان و پەلەقاژەی ئینسانی ئەو سەردەمەیە بۆ ڕازیکردن و پێ خۆشبوونی ئەو خودایانە کە هەرکامیان بەڕێوەبەری بەشێکی سروشت بوون، بۆئەوەی کە بتوانێت لە سروشت بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆی کەڵك وەرگرێت و هیچ کێشە و کارەساتێکی سروشتی ژیان و کاروبار و شێوەی ژیانەوەی -معیشت- نەخاتە مەترسییەوە.

ئوستوورەی ئیزەدی شەهیدکراو، ئوستوورەی ژیانی وەرزێرییە و ئاوات و ئامانجی هەمیشەیی وەرزێر هاورێبوونی زەوی و وەرزەکان لەگەڵ ئەو و باشبوونی بەروبوومەکەیەتی. بۆیە ڕێوڕەسمێك لەژێر سێبەری ئوستوورەیەکدا بەڕێوە دەبات بۆئەوەی ژن- خودای زەوی[1] لێ خۆش بێت و کشتوکاڵێکی بە بەهرەی بداتێ. واتە دوایەمین بەشی چیرۆکەکە ئەو چاوەڕوانییە و ئەو ئومێدە نیشان دەدات کە ئینسان بەهۆی ئەوەوە ئوستوورەکەی خولقاندووە. ئەو گوڵەی کە لەسەر مەزاری مەم و زین شین بووە، هۆکاری ڕەسەنی پێکهاتنی چیرۆکی مەم و زینە.

جیاوازیی سەرەکیی چیرۆکی مەم و زین لە گەڵ چیرۆکە هاوتەریبەکانی خۆی لە ناوچەدا، گۆڕانی ئاکسیۆنی ژن- خودایە (زین)، لە هەموو چیرۆکە هاوشێوەکاندا ژنی چیرۆکەکە ژنێکی هەوەسبازە کە هەندێك جار واشتا (معشوقە)کەی خۆی دەکوژێت،

---

١- خودای زەویش وەکو خودای ئاو لەنێو ئوستوورەی هەموو وڵاتەکاندا ژنە، بۆ نموونە ئەرمەئیتی کە ناوی لە ئاڤێستادا هاتووە کچی ئەهوورامەزدایە و خودای زەوینە.

بەڵام زین ئەو ئاكسیۆنەی نییە و وەكو یارێكی وەفادار لەگەڵ مەمدا دەمێنێتەوە و لە سۆی یارەكەی دەمرێت.

ئەوەی كە لە چ زەمەنێكەوە چیرۆكی مەم و زین ڕێگای خۆی گۆڕیوە و لە هاوتاكانی خۆی لەو بارەیەوە دووركەوتووەتەوە، بە ڕوونی دیار نییە، بەڵام ئەوەندە دەزانین كە ئەم گۆڕانەش تەنیا بەسەر مەم و زیندا نەهاتووە و هاوتایەكی دیكەی هەر لەنێو ئوستوورە ئێرانییەكاندا هەیە، ڕادەی دووركەوتنی ئەو چیرۆكە لە ئوستوورەی ژێدەر زۆر زیاترە، بەڵام نێوەرۆكی چیرۆكەكە هەمان ئوستوورەیە، ئەوەش چیرۆكی بیژەن و مەنیژەیە، لەنێو بیر زیندانیكردنی بیژەن هەمان زیندانیبوونی ئیزەدی گیاهییە، بەڵام لێرەشدا مەنیژە ئەو ژن- خودای هەوەسباز و دڵڕەق نییە، بەڵكو ڕۆڵی دڵداریی بیژەن دەگێڕێت.»

ئەو چیرۆكبێژانە كە بەرەبەرە و لە گێڕانەوە جیاوازەكان و لە زەمەنەكاندا سیمای زین و مەنیژەیان گۆڕیوە، ئەگەرچی ئوستوورەكەیان لە فۆرمی ڕەسەن دوور كرخستووەتەوە، بەڵام باری دراماتیك و هەستیاریی چیرۆكەكەیان زۆر بردووەتە سەر و بەو شێوەیە توانیویانە لە ڕێگای گۆڕینی داستانی دەسەڵاتی خودایان بە چیرۆكی دڵداری دوو ئینسان مانەوەی گێڕانەوەكە گەرەنتی بكەن و هەست و هاودەردی و (همزات پنداری) خەڵكەكە بكەن بە پارێزەری كیانی بەشێك لە فەرهەنگ و دابونەریتی خۆیان. ڕەنگە ئەگەر بیچمی ڕاستەقینەی زین وەدەركەوتایە ئەم چیرۆكە ئەوەندە لەسەر زار و نێو دڵی خەڵكی كورد نەمابایە و بەهۆی ئەوەی كە نەتەوەی كورد زۆر بە دێری دەستی بە تۆماركردنی ئەدەبی زارەكی خۆی كرد، بە تەواوی لەناو نەچووبایە، چونكە لە دەورانی ڕەواجی ئەدەبی زارەكی ئەوەی ژیانی دەقەكان دەپارێزێت مێشكی شایەر و دڵی گوێگرەكەیە. گوێگری بەیت ئەگەر بەیتەكەی بەیتەكەی بە دڵ نەبێت و بە بیستنی هەستی نەجووڵێت و نەتوانێت لەگەڵ ئەكتەرەكان و ڕەوتی داستانەكەدا پێوەندییەكی دەروونی و قووڵ پێكبێنێت. ئەو چیرۆكە خۆبەخۆ لە مێشكی شایەرەكانیش كۆچ دەكات و شایەر بۆ حەز پێكردن و ڕەزامەندیی گوێگرەكانی بەیت دەڵێت، بۆیە لە ڕەوتی زەماندا بەشگەلێ لە چیرۆكەكان گۆڕدراون و گۆڕانی سیمای زینیش لە ژن- خودایەكی هەوەسباز و خۆپەسند بە دڵداری وەفادار و غەدرلێكراوی مەم لەم چەشنەیە.

**توخمە ئوستوورەییەکانی مەم و زین:**

ئەگەرچی ناوەرۆکی چیرۆکی مەم و زین ئوستوورەی خودای گیاییە، بەڵام هێندێك گێڕانەوەی لاوەکی کە وەکو لق و چڵ و گەڵای ئەو چیرۆکە، ماجەراکە بەربڵاو دەکەن و رواڵەتی داستانیی پێدەدەن، لەم بەیتەدا هاتووە کە زۆرجار دەربڕی دابونەریت و فەرهەنگی کۆنی خەڵکی ناوچەکەن و جاریش بڕگەگەلێ لە ئوستوورەیەکی جیاواز و سەربەخۆن کە خزاونەتە ناو گێڕانەوەکەوە، ئەم تایبەتمەندییە لە زۆربەی هەرە زۆری بەیتەکاندا زەق و بەرچاوە کە لە شوێنی خۆیدا باسیان لەسەر دەکەین، بەڵام بۆ لێکدانەوەی ئەو بەشانەی مەم و زین کە لەباری توخمە فەرهەنگی و ئوستوورەییەکانەوە شایانی ئاماژە پێکردنن، دەست دەکەین بە خوێندنەوەی هاوکاتی هەردوو گێڕانەوەی خانی و رەحمان بەکر:

لە سەرەتای مەم و زینی رەحمان بەکردا (تۆمارکراوی ئوسکارمان) لەگەڵ کەش و هەوایەکی ئەفسانەیی و هەزارویەك شەوی رووبەڕوو دەبین: پاشایەك کوڕی نابێت و بەدوای راز و نیاز لەگەڵ خودا و پاڕانەوەی زۆر، بەهۆی سێوێکی بەهەشتی دەبێتە خاوەن کوڕێك و ناوی دەنێت مەم. دەقی بەیتەکە لەبارەی چۆنییەتی لەدایکبوونی مەم (کە سەرەتای چیرۆکەکەشە) ئاوا دەست پێدەکات:

**ئیبراهیم پاشای یەمەن هیچ کوڕی نەبوو، دەگەڵ وەزیری خۆی هەڵستان رۆین بۆ ماڵە خولاّ، دوازدە مەنزڵان رۆین، خولاّ رەحمی بەوان کرد. وەیسەلقەرەنی ماهیدەشتی ناردیە کن ئەوان، دوو سێوی پێدا نارد... ئەوانە بۆ کوڕی هاتوون بچنە ماڵە خۆیان شەو جومعەی دەسنوێژێ هەڵگرن، ئەو سێوەی لەتی بکەن، لەتێکی بۆ خۆی بخوا لەتێکی ژنی...**

بەڵام لە گوتنەوەکەی خانی-دا نە باسی سێوی بەهەشت دەکرێت و نە مەمیش شازادەیە، بەڵکو کوڕی نووسەری میرە.

شێوەی لەدایکبوونی مەم و سێو بەهەشتی و... هتد وەبیرهێنەری ئەفسانەیەکی ئیسلامییە کە لەودا پێغەمبەر بەهۆی خواردنی سێوی بەهەشتی دروست دەبێت. مۆتیڤی سێوی بەهەشت زۆر کۆنە و ئاماژە بە ئەستوورەی تەوراتی دەکات و خواردنی میوەی قەدەغە لەلایەن ئادەم و حەوا کە خوازەیەکە بۆ پێوەندیی جنسیی ژن و مێرد،

ئادەم و حەوا میوەی قەدەغەکراو (سێو) دەخۆن و بەدوای ئـەوەدا لـە رەگـەزی خۆیـان بەئاگا دێن، کەوابوو یەکەم منداڵی ئەوان بەشێوەی ناڕاستەوخۆ لـە خـواردنی سـێوی بەهەشت خولقاوە. ئەم جۆرە لەدایکبوونە بەوە ڕێنوێنیمان دەکات کە لەگـەڵ چـیرۆکێ ڕووبەڕووین کە باسی خولقـانی سـەرەتایی دەکـات و تێکـدەری زەمـانی مێژوویـیـە و دەیەوێت ڕەوتی ژیانی ئینسانی لە سەرەتاوە تا گەیشتن بەو بەشە کە مەبەستی ئەسڵیی ئوستوورەکەیە، باس بکات. لە واقیعدا ئەم گێڕانەوەیە تا سەردەمی خولقانی سەرەتایی و یەکەمین دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان تایبەتمەندیی بەشێکی زۆرە لە ئوستوورەکان.

ئوستوورە بە پێچەوانەی ڕۆمان، یان داستانی ئەمڕۆ، کامێرای خـۆی ناخاتـە سـەر بەشێکی دیاریکراو لـە زەمـان و شـوێن. زەمـانی ئوسـتوورەیی زەمـانێکی تۆکمـە و لێکدانەبڕاوە (پیوستاری و غیر قابل تجزیە)، گشتییەتێکە کە بەش بەش ناکرێتـەوە و شوێنیش قەت بە ڕوونی باسی لێ ناکرێت، تەنیا ناوێکی لەسەرە ئەوەش بۆ ئەوەیە کە خەڵکی ناوچەکە (کە خولقێنەری ڕاستەقینەی ئوستوورەکانن)، دەیانەوێت بەستراوەیی (تعلق) ئوستوورەکە بە خۆیان بخەنە بەرچاو، کە ئەوەش دەبێتە هۆی هەستی (همزات پنداری) و پێوەندی هەستیارانە لەگەڵ ئەکتەرەکان، هۆکاری مانەوەی چـیرۆکەکان لـە ئەدەبی زارەکیدان.

لە بەیتی مەم و زیندا، شێوەی لەدایکبوونی مەم باسی چۆنییەتی خولقانی یەکەم مرۆڤ دەکات و پاش ئەوەش دەچێتە سەر بەشێکی دیکە لـە دابونـەریتی هـەرە کـۆنی ئینسان و بەو شێوەیە ڕەوتی ژیانی مرۆیی وێنا (تصویر) دەکات.

مەم لە سەرەتاوە نۆکەرێکی هەیە بە نـاوی بەنگینـە (کـوڕی وەزیـری پاشـا، کـە هەڵبەت لە مەم و زینی خانیدا باسی لێ ناکرێت و ئەو کەسەی کە ڕۆڵی هاوڕێی مەم دەگێڕێـت قەرەتاژدینـە)[٢]، مـەم و بەنگینـە دوای لـەدایکبوون بەسـەرهاتێکی سەیروسەمەرەیان هەیە. بەیتەکە دەڵێت:

---

٢- قەرەتاژدین لە بەیتە تۆمارکراوەکەی ئوسکارماندا تەنیا مێردی خاتوو ئەستێی خوشکی زینە، بەڵام لە گێڕانەوەی خانیدا قەرەتاژدین کوڕی وەزیر و دۆست و هاوڕێی مەمە و لەگەڵ ئەو بۆ جزیرە دەڕۆن و لەوێ تاژەدین خاتوو ئەستێ هەڵدەبژێری و مەمیش زین.

**... بە دایانیان دان، دووساڵ لە کن دایانێ بوون، لە پاشان بە لەلەیان دان، سێ ساڵ لە کن لەلەی بوون لە پاشان سواریان کردن، دووساڵان سوار بوون، ئەوجار هێنایانن بردیاننە مەدرەسەی لە خزمەت مامۆستا دانیشتن، حەوساڵان دە ژێرخانێدا بوون، رۆژ و شەویان لێ قەدەغە کردن...**

ئەم بەشە جگەلەوەی کە بەهۆی ئاماژە بە بەشێکی ئایینی میترایی گرنگی تایبەتی هەیە، دەتوانێت لەلایەکی دیکەشەوە درێژەی رەوتی ژیانی ئینسانی بێت. سواربوون ئاماژەی ناڕاستەوخۆ بۆ دەستەمۆکردنی ئەسپ (کە رۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی لە ژیانی مرۆڤدا گێڕاوە)، لەژێر خان بوونیش ئاماژە بە سەردەمی ئەشکەوت نشینی و لە هەمان کاتیشدا دەتوانێت ئاماژە بێت بە نەریتێکی کۆن بۆ تەربییەت و پەروەردەی مێرمندالان کە ئەوانیان لە خەڵك دووردەخستەوە و لە هەلومەرجی سەخت و بە ئەستەم و تەنانەت زۆرجار لەژێر ئەشکەنجە و ئازاری جەستەیی پەروەردە دەکران و پاشان دەگەڕانەوە بۆ نێو کۆمەڵگا. حەوت ساڵ قەدەغەکردنی رۆژ، وەبیرهێنەری ئەو یاسا سەختە کۆمەڵایەتییانەیە.

پێوەندیی ئەم قەدەغەکردنە لەگەڵ رۆژ و هەروەها لە ژێرخان زیندانیکردنی کوڕەکان بەرەو ئایینی میترایی رێنوێنیمان دەکات، لە ئایینی میتراییدا رێورەسمەکان لە ئەشکەوت بەڕێوە دەچوون. ئەم ئەشکەوتانە نوێنەری تاقی ئاسمان بوون... بەڵام لەو شوێنانەدا کە ئەشکەوت نەبوو پەرستگەکانیان بە لاساییکردنەوە لە ئەشکەوت، لە ژێرزەوی دروست دەکرد و پلیکانێکی درێژ پەرستگەکەی دەگەیاندە سەر عەرز، ئەم پەرستگانە هیچ پەنجەرە و شتی وایان نەبوو. لە گۆڕەپانی پەرستگەکەدا ئاگردان و ئاودان و شتانی دیکە هەبوو. (بەهار، ١٣٧٣: ٣٢-٣٣).

دکتۆر بەهار هەر لەم دەقەدا (واتە لە ئوستوورەوە تا مێژوو) ئاماژە بەوە دەکات کە تەنیا ئەو پیاوانەی کە گەییشتوونەتە تەمەنی گەورەساڵی دەتوانن لە رێورەسمی میتراییدا بەشداری بکەن و مێرمندالان بۆ ئەو مەبەستە، واتە بەشداری لە رێورەسمی میترایی، بەشێوەی شەرڤان (بە لاساییکردنەوەی میترای شەرڤان) پەروەردە دەکرێن. بەهۆی ئەم بەڵگانەوە دەتوانین بڵێین ئەو شێوە پەروەردە و بارهێنانە کە بۆ مەم و بەنگینە باسکراوە، ئاسەواری ئایینی میترایی پێوە دیارە و ئەم گومانە بە ئاوڕدانەوە بە

درێژیی بەیتەکە بەهێزتر دەبێت، مەم و بەنگینــە بــە هەڵکــەوت پەنجەرەیــەك بــەرەو دەرەوەی ژێرخانیان بۆ دەردەکەوێت:

**تیشکی ڕۆژ هاتە ژووریٚ، ئەستەغفروللا گوتیان ئەوە خولاٚیە مامۆستای وان لە ویٚ نەبوو، هەر ئامێزیان لە تیشکی وەدەرهێنا بۆیــان نــەدەگیرا... گوتیــان ئــەوە خولاٚیــە هاتۆتە نێو مە...**

مامۆستا هێمن تەنیا باسی ئەوە دەکــات کــە ئــەم بەشــە، تــەورات و حیکایــەتی ئیبراهیمی پێغەمبەرمان وەبیر دێنێتەوە، بەڵام ئەو حیکایەتەی تەوراتیش خۆی بەستراوە بــە ئــایینی بــەربلاٚوی پەرەســتنی مــیترا و خــۆر- خودایــە کــە لــە هــەر وڵات و شارستانییەتێکدا ناوێکی جیاوازی لەسەرە و لە ڕێگەی ڕیوایەتــە ئوســتوورەییەکانەوە چووەتە نێو دەقە پیرۆزەکانی تەورات و قورئانیش[٣].

لە درێژەی بەیتەکەدا باسی هاتنە دەرەوەی مەم و بەنگینــە دەکرێــت و مشــتومڕی مەم لەگەڵ بابی لەبارەی ئەوەی کە حەوت ڕۆژی دیکە بمێنێتــەوە یــان حــەوت مــانگ. دیارە حەوت خۆی ژمارەیەکی پــیرۆزە و قۆناغــەکانی هەنتــەش (تشــرف) لــە ئــایینی میتراش حەوت قۆناغە و لە زۆربەی چیرۆکە کۆنەکانی دنیادا چەند ژمارەی پیرۆز هەیە وەکو سیٚ، چوار، دوازدە و چل و لە مانەدا حەوت لــە هــەمووی زەقــترە. هــەرکام لــەم ژمارانە بۆ ئینسان مانایەکی هەبووە و بەو بۆنەیەوە مانا و باری پیرۆزی پیٚ بەخشیون. بۆ نموونە سیٚ پێکهاتووە لە (٢+١) کــە نوێنــەوی جــووت بــوون و زیــادکردن، واتــە زاوزێیە لە ئوستوورەی مەسیحیشدا سیٚ خودایی هەر ئەو مانایەی هەیە، باب و کــوڕ و ڕۆحی پیرۆز (کە بەبۆنەی سەقامگیربوونی فەرهەنگی دژە ژن و هەروەها بۆ خولقانی بیچمێکی ئابستراکت و ئیستعاری و پیرۆز و نائاسایی نواندنی پێوەندییــەکان جێگــەی دایکی گرتووەتەوە) ((شەرحی زیاتری دەوێت)).

بەیتەکە دوای هاتنە دەرەوەی مەم و بەنگینە باسی یەکــەم دیــداری مــەم و زیــن دەکات. لە بەیتە تۆمارکراوەکەی ئۆســکارماندا ئــەو یەکــەم دیــدارە زۆر خــەیاڵاوی و ئەفسانەییە و چیرۆکەکانی هەزار و یەك شەو و "دکامرۆنی بووکاچیۆ" و داستانەکانی

---

٣- ناوی خۆر لە زمانی عەرەبی و لە قورئاندا بە ڕوونی ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت وشەی شەمس لە زمانی عەرەبیدا هەمان شەمەش خۆر- خودای بابلییە.

جندۆکە و دێو و پەریمان وەبیر دێنێتەوە، واتە رواڵەتی رۆمانسەکانی سەدەی شازدە و حەڤدەی هەیە کە لە ئێراندا عەییارنامەکان بەو شێوازە بوون.

زمانی بەیتبێژ لەم بەشەدا دەبێتە زمانێکی مەوزوون و لێرە بەدواوە بە وردی هەموو وردەکارییەکانی ماجەراکە باس دەکات: شەوێك سێ پەری دێنە سەر کۆشکی مەم و دوای هێندێ قسە لەسەر جوانی مەم و زین، هەر لە شەودا زین لە جزیرە دەگوازنەوە بۆ کۆشکی مەم. شایەر ئەگەرچی ئەم گواستنەوە زۆر درێژە پێدەدات، بەڵام زمانێکی شیرین و گێڕانەوەیەکی جوانی هەیە کە گوێگر دەباتە دنیای خەیاڵ و ئیزنی ئەوەی دەدات تا هەموو وردەکارییەکانی وتووێژی پەرییەکان و دیداری مەم و زین بێنێتە بەرچاو. لێرەدا بەشێکی کورتی داستانی ئەو شەوە بۆ ئاشنابوونی خوێنەر لەگەڵ زمان و دەربڕینی ناسك و خەیاڵاویی شایەر دەگێڕینەوە:

**خالق هەر ئەتۆی لە سەرە**

**سێ پەری لە ئاسمانی حەوتەمین بەستوویانە لەنگەرە**

**لەسەر کۆشکی کاکە مەمی هەڵدەنیشن ئەوبەر ئەوبەرە**

**خوشکی گەورە دەڵێ بە خوشکی چکۆلە**

**خولاکەی خوشکی رومەتی کاکە مەمی زەریفە یان چراو فەنەرە؟**

**خوشکی نێونجی وای گوتیە**

**هەر لە عەرشی تا کورسییە**

**هەر لە گای هەتا ماسییە**

**هەموو دنیام پشکنیە**

**هیچکەسم نەدیوە لە گوێن جوانی کاکە مەمییە...**

ئەم بەشەی بەیتەکە بە هەموو جوانییە زمانییەکانییەوە لە تەسڵی گێڕانەوە ئوستوورەییەکە دوورکەوتووە و تەنیا ماجەرایەکی خەیاڵاوی بەیان دەکات، بەڵام مەم و زینی خانی لەم بابەتەوە جیاوازە و لەوە دەچێت بە رێگای رەسەنی گێڕانەوەکەدا چووبێت، چونکە ئەو رەوتەی کە باسمان کرد (واتە گێڕانەوەی ژیانی ئینسان لە سەرەتاوە تا گەیاندنی بەو شوێنەی کە مەبەستی ئوستوورەکەیە)، لە گوتنەکەی

خانیدا نەپچڕاوە و چۆنییەتی یەکەم دیداری مەم و زین پێوەندیی سەدا سەدی لەگەڵ ڕەوتی ئوستوورەیی پاش و پێشی خۆی هەیە.

خانی مەم و زینی لە جێژنی نەورۆزدا تووشی یەکتر کردووە. ماجەراکە بەگشتی وایە کە مەم و تاژەدین بە جلی کچان دەڕۆن بۆ جێژنی نەورۆز لەوێ چاویان بە دوو کوڕە لاوی جوان و چالاك دەکەوێت کە خەریکی زۆران و شەڕن و کەس نایانبەزێنێت. مەم و تاژەدین وەدوویان دەکەون و بۆیان دەردەکەوێت کە ئەوانە کوڕ نەبوون، بەڵکو دوو کچی جوان بوون و هەر لەوێ عاشقیان دەبن، کچەکان ئەنگوستیلەی خۆیان لەگەڵ کوڕەکان دەگۆڕنەوە و دەگەڕێنەوە بۆ کۆشکی خۆیان.

جێژنی نەورۆز کە جێژنێکی بەهارییە بۆخۆی پێوەندی ڕەسەنی لەگەڵ خودای کوژراودا هەیە. ڕێوڕەسمی شینگێڕان بۆ خودای کوژراو لە سەرەتای بەهاردا ئەوکاتەی کە خەڵك چاوەڕوانی شینبوونی خاکن، بەڕێوە دەچوو، جادوویەکی لاساییکەرانە بووە بۆ هاندان و هەڵخڕاندنی ئیزەدی زەوی و بەو جۆرە مەجبوورکردنی بەوەی کە گیای لێوە شین ببێت و پیت و بەرەکەت بدات بە ژیانی وەرزێری لە دنیای ئوستوورەییدا هەموو جێژنەکان پشت ئەستوور بە گێڕانەوەیەکی ئوستوورەیی لە شێوەی ژیان و تایبەتمەندییەکانی ژیانی ئینسانن، واتە جێژنەکان هەموو واتای تایبەتییان هەبووە و هیچ جێژنێك بێ پاڵپشتی مانایی و ئایینی نەبووە. جێژن دەرخەری باوەڕە ئوستوورەییەکانی ئینسان و پێوەندییەکانی ئەو لەگەڵ خودایانی بەڕێوەبەری دنیا و هەروەها زمانی دوانی ئینسان لەگەڵ سروشتدایە، بەو زمانە داخوازییەکانی خۆی بەرانبەر بە سروشت دەخاتە بەرباس و لە هەمان کاتدا ئەمەگناسیی خۆی بە یاسا سروشتی و کۆمەڵایەتییەکان نیشان دەدات و حورمەت یان بەها بۆ تەکووزەکان دادەنێت.

دەرچوون لە تەکۆزی باو و ئاسایی و تێکدانی زۆربەی یاساکان کە تایبەتمەندیی بەرچاوی زۆربەی جێژنەکانە، لەڕاستیدا گەڕانەوە بە هەلومەرجی ئاژاوەی پێشڕۆژییە بە مەبەستی وەدیهێنانی پێویستی تەکۆز و دیسانەوە گەڕانەوە بە تەکۆز و یاسا و پاراستنی جیدیتری (ئەو تایبەتمەندییە لە نەورۆزدا لە بەڕێوەبردنی ڕەسمی میری نەورۆزیدا دەکەوێتە بەرچاو)، تایبەتمەندییەکی دیکەی زۆربەی جێژنەکان (تعلیقە) کە لە دوو بواری زەمان و شوناسدا خۆی دەنوێنێت (تعلیقی) زەمانی لە ڕێگای سەما و

هەڵپەڕکێ و (خلسە) و (تعلیقی) شوناسی لە ڕێگای گۆڕینی جلوبەرگ و شاردنەوەی شوناس و (شخصیتی) ڕاستەقینەی کەسەکانەوە دەستەبەر دەبێت. ئەم گۆڕینە گۆڕینێکی جیاواز و تایبەتە، جاری وا هەیە جلی گیانلەبەرە جۆراوجۆرەکان لەبەر دەکرێت و (ماسکی) جانەوەرەکان لەسەر دەکرێت، جاریش هەیە جێگای ژن و پیاو دەگۆڕدرێت، واتە ژنان جلی پیاوان لەبەر دەکەن و پیاوانیش جلی ژنان[٤] ئەم جێگۆڕکێیە دەبێتە هۆی نەناسراوی و جۆرێك لە (تعلیقی) شوناسی دەخولقێنێت.

لە چیرۆکی "مەم و زین"یشدا ئەم تایبەتمەندییە هەیە، مەم بە جلی کچان و زین لە بەرگی کوڕاندا بۆ یەکەم جار یەکدی دەبینن.

دوای ئەم ناسینەش چیرۆکی دڵداریی مەم و زین دەست پێدەکات و پاشان ڕۆڵگێڕانی ئەکتەری شەڕ خولقێن، یان دژەپاڵەوانی چیرۆکەکە واتە بەکر کە ڕاوێژکاری ئەمیرە و بەهۆی کارتێکدانی ئەو، دوو دڵدار لە یەکتر دوور دەکەونەوە. بوونی دژەپاڵەوان ئەگەرچی بۆ گەیاندنی چیرۆك بە لووتکەی کاریگەری هەستیارانە گرنگە و هیچ چیرۆکێکی سەرکەوتوو نییە کە دژەپاڵەوانی تیا نەبێت، بەڵام لەباری ئوستوورەییەوە بە ئاوڕدانەوە لە ئەسڵی ئوستوورەکە بۆمان دەردەکەوێت، کە دژەپاڵەوان بوونی نییە و دواتر بۆ پاساو (توجیە)ی دابڕانی مەم و زین هاتووەتە ناو چیرۆکەکەوە. کاتێك لە ڕوانگەی ئوستوورەییەوە چاو لە چیرۆکەکە بکەین و بزانین ئەم چیرۆکە گێڕانەوەیەکی کوردی لە ئوستوورە ئیشتار و تەمووزە، ڕەتکردنی خواستی زین لەلایەن مەمەوە نەتەنیا شتێکی سەیروسەمەر نییە، بەڵکو دەرخەری بەراورد دوو گێڕانەوەکەیە. هەروەك پێشتریش باسمان کرد لەم بەشەی چیرۆکەکەدا میرزینەدین برای زین سێ جار زین پێشکەش دەکاتە مەم و هەرسێ جارەکەش مەم دەڵێت نامەوێت و ئەم ڕووداوە لە دەرەوەی پێکهاتە (بافتی) ئوستوورەییەوە شتێکی نەگونجاوە بۆ چیرۆکێکی دڵداری، بۆیە ئەکتەرێك بە ناوی بەکر وەکو دژەپاڵەوانی چیرۆك ئەم کردەوەیەی مەم (توجیە) دەکات، بەو شێوەیە کە ژنانێکی بەکرێگیراو ڕادەسپێرێت کە

---

٤- ئاسەواری ئەم ڕەسمە لە یەکێك لە جێژنەکانی پێش لە نەورۆز هێشتا ماوە. لەم ڕەسمەدا کە بە کۆسە دەناسرێت کۆڕێکی گەنج لە جلی کچاندا و لەگەڵ چەند هاوڕێی دیکەی خۆی ماڵ بە ماڵ دەگەڕێن و بۆ شادیی خەڵك گۆرانی دەڵێن و پارە، یان دیارییەکیان لێ وەردەگرن.

بە مەم بڵێن زین نەخۆشینی پیسی هەیە و لەو ڕێگایەوە ڕای مەم بەرانبەر بە زین دەگۆڕێت.

دوای ئەمەش تۆڵەکردنی برای زین ڕوو دەدات کە لە واقیعدا هەمان تۆڵەکردنی ژن- خودایە، مەم زیندانی دەکرێت و بەرەو خاڵی لووتکە (نوقتەی اوج) چیرۆکەکە لێرەوە دەست پێدەکات. گرفتاربوونی مەم لە گرتووخانە و شین و ناڵەی زین لە دووری ئەو بەڕاستی جوانترین و کاریگەرترین بەشی مەم و زینە (بەتایبەت لە گێڕانەوەکەی خانیدا) زمانی ناسکی خانی لەم بەشەدا سۆز و تاوێکی بێ وێنەی هەیە. بۆئەوەی خوێنەریش چێژێك لەو دەقە ببات بەشێکی کورتی لێرەدا دەخەینە بەرچاو، زین بەم زمانەوە گلەیی لە گەردوون و چارەڕەشیی خۆی دەکات:

ئەو زینی بە دوایی دڵ گرفتار
ئارامی ل لا نەما بە یەك جار
... بێ هێز و توان و دەستە و ئەژنۆ
هەر مەم مەمی بوو بە داد و رۆڕۆ
دەتوایەوە بۆی دڵی رەقی بەرد
لاواز ببوو ببووە موویەکی زەرد
گەر لێی نەدەبووەوە هیچ دەرووی روون
هاواری دەکرد چەرخی گەردوون
چم کردووە بۆچی بوویە دوژمن
تۆڵەی چ دەسێنی دێیتە گژ من
مەم ببووە بەشم ئەوەند بە قینی
هێشتا بە منت ڕوا نەبینی
تۆ تاقە مەمێك بە زۆر بزانی
لێم بدزی برادەری دەزانی؟!
بۆ تووشی کچێکی وەك منت کرد
سووچم چ بوو پاشی بۆ ونت کرد
دوو دڵ کە بە ئاگرت پڕووکان
چیت پێ گەیی تۆ جگە لە تووکان

**لای هەرکەسێ بەزم و پێکەنینە**
**هەر لای من و مەم شەپۆڕ و شینە...**

ئەم بەشەی چیرۆکی مەم و زیـن بەڕاسـتی زۆر جوانـە، بـەڵام لێـرەدا باسـی ئیمـە شتێکی ترە و خوێندنەوە و چێژبردن لە دەقە بەرزەکەی خانی دێڵینەوە بۆ خوێنەر.

مەم لە گرتووخانە دەمرێت و زینیش کە بەرگەی خەمی مەرگی مەم ناگرێت، لـە داخی مەرگی دڵدارەکەی دەمرێت و پێش لە مردن لە برای خۆی داوا دەکات کە وەکـو بووك و زاوا جێژن و ئاهەنگیان بۆ ساز بکـات و هـەروەك چـۆن بـۆ خـاتوو ئەسـتێی خوشکی کردوویە بۆ مەم و زینیش شار و دێ برازێنێتەوە.

لێرەدا ئوستوورەکە دەگاتە ئاکامی خۆی، واتە بەڕێوەبردنی ڕێورەسمێـك بـۆ خـودای رووەکی و ڕێزنان لە ژیانی وەرزێری، بە مەبەستی کاریگەریی زیاتر لەسەر سروشت بۆ پیت و بەرەکەت بەخشین بە خەلە و خەرمان. هەر ئەو جۆرەی کە پێشتریش باسمان کرد ئوستوورە و ئایین پێوەندیی راستەوخۆیان پێکەوە هەیە و هەر ئوستوورەیەك بەستراوەی ئایین و ڕێورەسمێکی فەرهەنگی- کۆمەڵایەتی تایبەتە و لەڕاستیدا مانا بە ئایینەکان دەبەخشێت و لە ڕێگای گێڕانەوەی هۆکاری خولقان و وەبیرهێنانی گرنگـی ئایینـەکان سنوورەکانیان دەپارێزێت. ئایینی ئیزەدی کوژراو کە لە بەهاردا بەڕێوەدەچێت، سـەرەتا بە شینگێڕان بۆ ئیزەدی نێژراو دەست پێدەکات و پاشـان شـادی و سـەما بـۆ رووانـی دووبارەی ئەم ئیزەدە لە خاك.

شایی و ئاهەنگێك کە زین داوای دەکات هەمان جێژن و شـادییە ئایینییەکەیـە، واتە لە رەوتی گۆڕانی ئوستوورە بە چیرۆکێکی هەستیارانەی دڵداری، شایی و ئاهەنگە ئایینی و گرییەستانە (قراردادی) کە رواڵـەتێکی سـۆزمەندانە و دراماتیـك بـەخۆوە دەگرێت.

لە دوایەمین بەشی چیرۆکەکەشدا چقڵی مـەم و زینـان لەسـەر مـەزاری ئـەو دوو دڵدارە دەڕوێت و رۆڵی مەم وەکو ئیزەدێکی رووەکی دەسەلمێنێت. شایانی ئامـاژەیـە کـە مەرگی زین لـەم بەشـەدا رووداوێکـی رەسـەن نییـە و دواتـر چـووەتە نـاو (بـافتی) ئوستوورەکە، واتە رۆڵی ژن- خودا لەم ئوسـتوورەیەدا زیـاتر رۆڵێکـی ستەمکارانە و هەوەسبازانەیە، ئەگەرچی (بە لە زیندانکردنی ئیزەد کە ئیستیعارەیەکە بـۆ چـاندنی

تۆم)، کاریگەریی ناڕاستەوخۆی لە (بارووری) زەویدا هەیە، بەڵام بەرەکت بەخشی ئەکسیۆنی ڕاستەوخۆی ئیزەدی کوژراوە.

شەنکردنی مێژووی گەلێکی خاوەن ڕووداو و پڕ لە ئـەزموون، بـۆ بەرهـەمهێنانی پـڕۆژەی سـەردەمییانە و دۆزینـەوەی بـیری بـوونزانی و بـژارکردنی هـەوێنی مانـەوە، پێویستی بە زانستێکی بەربلاو و قوولبوونەوە لە فەرهەنگی ئەو گەلە هەیە.

هەر گەلێك فۆلکلۆر و کۆ زانستێکی تایبەت بە خۆی هەیە. وەك چۆن "تاك" لـە ڕووی ڕوانگەوە لە "کۆمەڵ"ێـك تـەرێك دەخرێتـەوە، کۆمـەڵێش لـە ڕووی ڕوانگـە و فەرهەنگی جیاواز لە گەلانی دیکە دادەبڕدرێت. ئـەم دابڕانـە هـەڵگری شۆناسـێکی سنووردارە، کە تـەنیا لـە ڕووی ناسـینی فەرهـەنگ و زمـانی ئـەو گەلـەوە دەکرێـت سنوورەکان ئاشکرا بکرێن (سنووری فەرهەنگی، کۆمەڵایـەتی و بـوونزانی). سـنووری سروشتی و سیاسی، گەلێکی تێکەڵ بە گەلانی تر کردووە، گەلێکیشـی وا شـڵەژاندووە کە لـەنێو گەلانـدا ون بـووە، ئەمـەش بووەتـە کێشـەی نـاو گـەلان و مشـتومڕێکی لەمێژینەی لەنێوانیاندا زەقکردووەتەوە.

پێناسەکردنی شۆناسی گەل لە ڕووی جوغرافیا و سنووری، سیاسی و زانستییانەدا نییە، چونکە هەموو گەلان لە ڕووی جەستە و لەش و شوێن و زەمەنـەوە هـاوڕەنگن و جیاوازییان نییە، بەڵکو لە ڕووی بیر و بڕوا و ڕوانین، فەرهەنگ و زمانـەوە ناسـنامەی جیا بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن. ئەم خاڵگەلی جیابوونەش بە تێپەڕبوونی دەیان سەدە و هەزارە بەرە بەرە بووەتە هۆی "gane" جیاوازیی نێو گەلان.

هێڵی دەسکرد و دروشمی جوگرافیای سیاسی، لە گەردەنی مێژوومانـدا هەڵواسراوە، ئەمەش تا ئەو ڕادەیەی کاریگەریی لەسەر داناوین کـە باوەڕمـان بـە پـرژ و بـڵاوی و دابڕان و نەبوونی پێناسە و بوونزانی کردووە.

### بەشەکانی فۆلکلۆر:

فۆلکلۆر وشەیەکی ئەورووپییە، لێکدراو لە دوو بەشی "فۆلـك-folk": کۆمـەڵ، مەردم، گرۆ، "لۆر-lore": بـاوەڕ، فەرهـەنگ، ئـەزموون. واتـە بـاوەڕ و ئـەزموونی کۆمـەڵ.

ئەزموونی لەمێژینەی کۆمەڵ پێکهاتووە لە:

١- مووزیك و گۆرانی: حەیران، لاوك، مەقام، گۆرانی، سۆز، قەتار، سیاچـەمانە و هۆرە، لەمێژ ساڵە هەڵگر و پارێزەری زمان و هیوای گەل بوون.

٢- داستان و چیرۆك (راز): ئەلف) بوێری : وەکو "رۆستەم و زۆراب، کاوەی ئاسنگەر، سیاوەش، دوانزە سوارە و ...".

٣- ئەوینداری و عەشق: وەکو "شیرین و فەرهاد، مەم و زین، دێوانە و شەم و...".

٤- پەند: ئەم بەشە گرنگترین و پۆدارترین بەشی ئەزموونی کۆمەڵە. مرۆڤ تووشی هەر چەشنە کێشە و داوێك هاتبێت، بۆ دەرباز بوون و زاڵ بوون بەسەر هەر رووداوێکدا، کۆمەڵێ مرۆڤ لە دەوری یەکتری خڕ دەبنەوە و بە تاوتوێکردنی رێچکەیەك، چارەیەك دەدۆزنەوە. بۆئەوەی ئەوەی داهاتوو لە ئەزموونی وان کەڵك وەربگرن، بیر و چارە و تەجروبەی خۆیان وەکو تابلۆ لە رستەیەکدا دەربڕیوە. ئەم دەستەواژەیە، هەڵگری بوونزانی و جیهانبینیان بووە.

لەم وتارەدا چەند پەند لە روانگەی کۆمەڵایەتی، بونزانی و رامیارییەوە شی دەکەینەوە.

**بەشی کۆمەڵایەتی:**

**"بە تاسەی حەوت خیەی سەگ بە"**

**"حەوت خیە" واتە حەوت کردەوە و رەوشتی چاکی سەگ.**

**حەوت خیە بریتین لە:**

١- وەفاداری: هەموو گەلان بەگشتی دەڵێن سەگ چاکەی لەبیر ناچێتەوە. سەگ بە کلکە لەقە سوپاس و پێزانینی خۆی دەردەبڕێت. قەت بەزەیی و یارمەتی و میهرەبانیی کەس لەبەرچاوی بزر نابێت و لە کاتی تەنگانەدا وەفاداریی خۆی نیشان دەدات.

٢- بێ راز و ریوەتی(قەناعەت): سەگ بە وشکە نان (ورکە نان) و پاروویەك قەناعەت دەکات. سکن و نەوسن نییە. کاتێ ران بەیانی زوو رەو دەدرێ و تا ئێوارە کاتی گەڕانەوە بۆ پەچە هیچ ناخوات، مەگەر ئەوەی پاروە نانێك، ئەویش ئەگەر شوانە بۆی بهاوێژێت، کەچی مەڕ و بزن تا ئێوارە دەلەوەڕێن.

٣- پاسەوانی: پاسی ماڵ و خێوەت و هەوارگە ئەرکی سەگە لە کاتی پشوودا، سەگ پاشکۆ نادات و بە چەند وەڕینێ جیاواز پاسەوانی دەدات. "سەگ لە مانگێ دەوەڕێ" تەنانەت کاتی دەرکەوتنی مانگ لە شاخەوە بە ئاگاداری مەردم رادەگەیەنێت.

٤- وەڕینی سەگ کە شوێنگە و سنووری خۆی:

سەگ هەرگیز ڕێ بە خۆی نادات لە سەرەوەی سنووری خۆی بوەڕێت. خۆی لە کێشە و گرفت و ژیانی شوێنێ کە پێوەندی بە ئەوەوە نییە، تێوە ناگلێنێت "سەگ لە هەر شوێنێ ناگەڤێ" سەگ لە دەرەتان و سنووری دیاریکراوی خۆیدا کلکی بەرزە. لە دەرەتانی دیکەدا کلکی شۆڕە.

٥- دەس لە پەلامار هەڵگرتنی سەگ کاتێك کە دابنیشێت:

سەگ پەلامارت بداتێ، دانیشیت رزگار دەبیت.

ئەوە کەسەی هەڵمەت لە کەوتوو بدا لە سەگ کەمترە "قانع"، (ئامادەکار).

دانیشتن نیشانەی خۆ بەدەستەوەدان و ئاشتی و شکستە، سەگیش لە بەرامبەردا ڕێز بۆ ئاشتی و ئارامی دادەنێت و بە ئارامی دەکشێتەوە.

٦- ناسێنەری: سەگ کەس و ناکەس لە یەکتری جیا دەکاتەوە، ئەگەر بۆ جارێك سەگ کەسێك ببینێت پێی دەوەڕێ، بۆ جاری دووەم بەو کەسە ناوەڕێت. دەگێڕنەوە ڕۆژێك کەسێك خۆی بە خاوەنی مەزرایەك دەزانێت و سوورە لەسەر خزمایەتی و ناسینی چەند کەسێك، گەورەی دێ دەڵێت: "ئەگەر گەماڵە بۆرم تۆی ناسی و جارێك تۆی دیبێت، باوەڕت پێ دەکەین". گەماڵە بۆر هەر لە دوورەوە چاوی بەو کەسە کەوت مرەمرێ بۆ پیاوە دەڕوانێ. پیاوەکەش دان بە ڕاستیدا دەنێت و دەڵێت: "خەڵکی ئێرە نیم، بەڵام کەسێك ڕای سپاردووم!!"

"بە هیوای سەگ بوومە عەلی بەگ"

٧- شەونەخوونی:

سەگ لە شەودا ناخەوێت. شەو بێداریی سەگ لەبەر ترس و دڵەڕاوکێ نییە، بەڵکو دەزانێت تاریکی چرای دوژمنە. ئەم شەو بێدارییە وریایی و لەسەرەخۆیی پێشان دەدات، چونکە دوژمن پیلانی لە تاریکیدا دادەڕێژێت.

بە هەموو کردەوە و چاکەی سەگ، مرۆڤی کورد تەنانەت جارێك ڕێی پێ نەداوە لە دەرکەوە بێتە ژووری، قۆڵکێشیان نەکردووە لە بەراسانی ماڵەوە بڕوانێتە ژوورەوە، بەڵام پشیلەی سپڵە، خوان و شوێنی گەرم و نەرمی بۆ دابین دەکەن لەبەرئەوەی حەدیسی لەسەرە و لەنێو عەرەباندا خۆشەویستە.

**بەشی بوونزانی:**

"هەر گیایەك لەسەر پنجی خۆی دەڕوێ"

سێ وشەی سەرەکی:

پنج: شوێن= "مکان" (هۆ="علت")

روان: روانەوە= "روبیدن" (هۆکار="معلول")

گیا: گژ و گیا، مرۆ="موجودات" (رووداو="اتفاق")

ریزبەندی "هۆ"، "هۆکار"، "رووداو"، یاسای گۆڕانی فیزیکییە. لە گەڕدابوونی ئەم گۆڕانەدا، رووداو جێگای شوێن دەگرێت. ئەم گەڕان و دووپاتەیە تا رادەیەك بەردەوامە کە شوێن، بە شوێن گەلێکی جۆراجۆر دابەش دەکرێت. بە دابەشبوونی شوێن، یاساکانیش دەگۆڕدرێن، ئەم دابەشبوونە بەرە بەرە گچکەتر دەبێتەوە، تا رادەی وردیلەترین شوێن "ئەتۆم"، واتە دابەزین تا هەستە و کاکڵی ئەتۆم. لەم بارەیەشەوە دەڵێن: "مرۆ زیانە خرۆی مرۆیە- homo homini lupus".

مرۆ لە زەوی (شوێنی زێ="مکان زایش") دەڕوێت. مرۆ بەرەبەرە بە پێی زەمەن دابەش دەکرێت و بەو رادەیەش هەر تاکێك هزر و بیری جیاوازی هەیە.

هەست بە بیری جیاواز لەلایەن مرۆڤەوە دابەش دەکرێت. خواستی تاك، دەسەڵاتە، بۆ گەیشتین بەم دەسەڵاتە چوار مێخەیەك دەتاشێت، چونکە دەزانێت شوێن هۆی بوون و مانەوە و بەردەوامییە.

لەش، شوێنی رۆح و رەوانە، بێ لەش رەوانیش بزر دەبێ.

بێ نیشتمان و زێد، فەرهەنگ و زمان و بیریش پێناسە ناکرێ.

هەر دارێ لەسەر ریشۆڵەی خۆی چەکەرە دەکا- سەگ لە پەساری خۆی دەوەڕێ- هەنگ لە کەندووی خۆی دەگەڕێ.

"برۆ و بگەڕێوە" واتە گەڕانەوەش لەدوای گۆڕان و دابەشی ئەوتۆ، خولیا و هەوڵێکە بۆ مانەوە. گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆت، دەسەڵات دەبەخشێ، بەهێزترین دەسەڵاتیش مانەوە و بەردەوام بوون و پاراستنی بنجە و ریشەیە.

**بەشی رامیاری:**

"دڵنیابوون خەیاڵێکە تا دەڵە گۆرگێك هەبێ"، " سەگ هەس تا دەڵە گورگێك هەس" سەگ لە کاتی ئاژەڵداریدا پاڵپشتی بەهێزی کۆمەڵ بووە. تەنانەت رێزی سەگ تا رادەیەك بووە کە مرۆڤ ئەسپەردەیان کردووە.

ئەم پەندە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەمیشە بە تەواوەتی لە هیچ کەسێك دڵنیا مەبە. دەگێڕنەوە کە شوانێك ئەوەندە متمانەی بە سەگەکەی هەبووە کە هەموو مەڕ و ماڵاتی بە سەگ راسپاردووە تا لەباتی شوان گەلە ران بەرێتەوە شاخ و ئێوارەش بیگەڕێنێتەوە بۆ پەچەی ران. رۆژێك دەڵە گورگێك لە شاخەوە دەردەکەوێت، گەماڵە سەگیش لەگەڵی جووت دەبێت و دەڵە گورگیش مەڕان دەخوات و سەگیش بێدەنگ دەبێت. ئەو جووتبوون و مەڕ خواردنە دەگاتە ئاستێك شوان هەستی پێدەکات، شوانە سەگ لەدار دەدات. بارامی گۆڕیش کە بۆ شکار لە تیسفوونەوە بۆ "بەموو" بناری شاوە هاتبوو لە داردانی سەگ لە شوانە دەپرسێت. شوانە بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "دڵنیابوون بە سەگ، بێ ئاوڕدانەوە خیانەتی بە دواوە دەبێت"، بارام خەنجەری پاشایەتی بە شوانە دەبەخشێت و خێرا بۆ پایتەخت دەگەڕێتەوە. جاڕ دەدات کە هەرکەسێ گلە و گازندەی لە کاربەدەستانی دەسەڵات هەیە بیدرکێنێت. لە رادەبەدەر خەڵکی ئێران گلە و سکاڵای بەدبەختی خۆیان بۆ بارام دەخەنە روو. پیلانی کوشتنی بارام و لەشکرکێشی رۆم بۆ ئێرانیش ئاشکرا دەبێت، بارامیش هەموو وەزیرەکانی وەك سەگ لەدار دەدات و دەڵێت: حاکم دەبێت متمانە بە هیچ کەس نەکات.

**بەشی بوونزانی:**

"هەر گیایەك لەسەر پنجی خۆی دەڕوێ"

سێ وشەی سەرەکی:

پنج: شوێن= "مکان" (هۆ="علت")

روان: روانەوە= "روییدن" (هۆکار="معلول")

گیا: گژ و گیا، مرۆ="موجودات" (رووداو="اتفاق")

ریزبەندی "هۆ"، "هۆکار"، "رووداو"، یاسای گۆڕانی فیزیکییە. لە گەڕدابوونی ئەم گۆڕانەدا، رووداو جێگای شوێن دەگرێت. ئەم گەڕان و دووپاتەیە تا رادەیەك بەردەوامە کە شوێن، بە شوێن گەلێکی جۆراجۆر دابەش دەکرێت. بە دابەشبوونی شوێن، یاساکانیش دەگۆڕدرێن، ئەم دابەشبوونە بەرە بەرە گچکەتر دەبێتەوە، تا رادەی وردیلەترین شوێن "ئەتۆم"، واتە دابەزین تا هەستە و کاکڵی ئەتۆم. لەم بارەیەشەوە دەڵێن: "مرۆ زیانە خرۆی مرۆیە- homo homini lupus".

مرۆ لە زەوی (شوێنی زێ="مکان زایش") دەڕوێت. مرۆ بەرەبەرە بە پێی زەمەن دابەش دەکرێت و بەو رادەیەش هەر تاکێك هزر و بیری جیاوازی هەیە.

هەست بە بیری جیاواز لەلایەن مرۆڤەوە دابەش دەکرێت. خواستی تاك، دەسەڵاتە، بۆ گەیشتین بەم دەسەڵاتە چوار مێخەیەك دەتاشێت، چونکە دەزانێت شوێن هۆی بوون و مانەوە و بەردەوامییە.

لەش، شوێنی رۆح و رەوانە، بێ لەش رەوانیش بزر دەبێ.

بێ نیشتمان و زێد، فەرهەنگ و زمان و.بیریش پێناسە ناکرێ.

هەر دارێ لەسەر ریشۆڵەی خۆی چەکەرە دەکا- سەگ لە پەساری خۆی دەوەڕێ- هەنگ لە کەندووی خۆی دەگەڕێ.

"برۆ و بگەڕێوە" واتە گەڕانەوەش لەدوای گۆڕان و دابەشی ئەوتۆ، خولیا و هەولێکە بۆ مانەوە. گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆت، دەسەڵات دەبەخشێ، بەهێزترین دەسەڵاتیش مانەوە و بەردەوام بوون و پاراستنی بنجە و ریشەیە.

**بەشی رامیاری:**

"دڵنیابوون خەیاڵێکە تا دەڵە گۆرگێك هەبێ"، " سەگ هەس تا دەڵە گورگێك هەس" سەگ لە کاتی ئاژەڵداریدا پاڵپشتی بەهێزی کۆمەڵ بووە. تەنانەت رێزی سەگ تا رادەیەك بووە کە مرۆڤ ئەسپەردەیان کردووە.

ئەم پەندە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەمیشە بە تەواوەتی لە هیچ کەسێك دڵنیا مەبە. دەگێڕنەوە کە شوانێك ئەوەندە متمانەی بە سەگەکەی هەبووە کە هەموو مەڕ و ماڵاتی بە سەگ راسپاردووە تا لەباتی شوان گەلە ران بەرێتەوە شاخ و ئێوارەش بیگەڕێنێتەوە بۆ پەچەی ران. رۆژێك دەڵە گورگێك لە شاخەوە دەردەکەوێت، گەماڵە سەگیش لەگەڵی جووت دەبێت و دەڵە گورگیش مەڕان دەخوات و سەگیش بێدەنگ دەبێت. ئەو جووتبوون و مەڕ خواردنە دەگاتە ئاستێك شوان هەستی پێدەکات، شوانە سەگ لەدار دەدات. بارامی گۆڕیش کە بۆ شکار لە تیسفوونەوە بۆ "بەموو" بناری شاوە هاتبوو لە داردانی سەگ لە شوانە دەپرسێت. شوانە بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: "دڵنیابوون بە سەگ، بێ ئاوڕدانەوە خیانەتی بە دواوە دەبێت"، بارام خەنجەری پاشایەتی بە شوانە دەبەخشێت و خێرا بۆ پایتەخت دەگەڕێتەوە. جاڕ دەدات کە هەرکەسێ گلە و گازندەی لە کاربەدەستانی دەسەڵات هەیە بیدرکێنێت. لە رادەبەدەر خەڵکی ئێران گلە و سکاڵای بەدبەختی خۆیان بۆ بارام دەخەنە روو. پیلانی کوشتنی بارام و لەشکرکێشی رۆم بۆ ئێرانیش ئاشکرا دەبێت، بارامیش هەموو وەزیرەکانی وەك سەگ لەدار دەدات و دەڵێت: حاکم دەبێت متمانە بە هیچ کەس نەکات.

## حەیران و سەرهەڵدانی

یەحیا سەمەدی- سنە

نەتەوەی کوردیش وەك هەر نەتەوەیەکی سەرگۆی زەوی خاوەن فۆلکلۆرێکی زیندوو و ڕەسەنە و لەم بوارەدا یەکێکە لە نەتەوە دەوڵەمەندەکانی جیهان. کورد بە فۆلکلۆر هزر و بیری خۆی دەربڕیوە و شارستانییەت و داب و مێژوو و کولتووری خۆی پێ پاراستووە. نەتەوەی کورد وەك نەتەوەیەکی زیندووی ڕۆژهەڵات، هەر لە دێرزەمانەوە خاوەن گۆرانی و مۆسیقا، ئاواز، مەقام، ریتم، ئیقاع، شایی و هەڵپەڕکێی تایبەت بە خۆی بووە. فۆلکلۆر بەردی بناغەی ئەدەبیاتی هەر نەتەوەیەکە و کەرەسەیەکی خاو و بەپێز و سەرچاوەیەکی ڕەسەن و پتەوە بۆ هۆنەر و بوێژان. ئەگەر ئێمە نەوەی ئەمڕۆ بە باشی لە ڕابردوو تێبگەین، بەرهەمی ئەمڕۆمان زۆر ڕەنگین دەبێت و ئەوکات دەتوانین زۆر بە وردی لە گرنگی و بایەخی فۆلکلۆر تێبگەین.

نەتەوەی کورد بۆئەوەی لە ڕابردووی بگات و بەرهەمی ئەمڕۆی پێ ڕەنگین بکات، پێویستە لە فۆلکلۆر و دەقە ڕەسەن و خۆماڵی و نەنووسراوەکانی بکۆڵێتەوە. حەیران وەك بەشێکی دەوڵەمەندی ئەم فۆلکلۆرە بەرفراوانە مەیدانێکی زۆری بۆ خۆی تەرخان کردووە.

### حەیران چییە؟

حەیران لق و شاخەیەکی زیندووی ئەم فۆلکلۆرە دەست لێنەردراوەی نەتەوەی کوردە کە هەتا ئێستا کەمی لەبارەوە نووسراوە و بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدراوە، کە ئەوە دەخوازێت بابەتێکی بەنرخی لەم چەشنە چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی زانستی و تۆکمەی لەبارەوە بنووسرێت و ببێتە سەرچاوە بۆ ئۆگرانی کولتور و هونەری ڕەسەنی نەتەوەکەمان. بەڵام بەداخەوە جگەلە هێندێ هەوڵ لە بواری کۆکردنەوە و چەند هەوڵێکی سەرەتایی بۆ لێکۆڵینەوە شتێکی تر شك نابەین. حەیران جۆرێکە لە ئاوازی کوردی، بە دەنگ هەڵبڕین و بە ئای ئایەکی پڕ لە گەرووە دەگوترێت و لە چەند ڕستەیەکی کورت پێکدێت، کە تێیایدا هەست بە ئەوینێکی گەرم و پڕ لە کوڵ دەکرێت. حەیران، هەستی عاشق (کە زۆر جار حەیران بێژەکە خۆیەتی) بەرامبەر ئەوینەکەی دەردەبڕی، یان باس لە ڕووداو و بەسەرهاتێك دەکات. حەیران هەستێکی برووسکەئاسا بە دەمارەکانی مرۆڤی گوێگردا سەردەکات و دەیهەژێنێت.

زۆر کەس لەوانەی لە حەیران دواون و هەروەها گوێگرانی حەیرانیش، حەیران بە ئاوازێکی فۆلکلۆر تێدەگەن. کە بەڕای زۆر کەس ئەمە زۆر ڕاست نییە، لەبەرئەوەی کە

هەر حەیرانبێژێك حەیرانی تایبەت بە خۆی هەیە و بە نازداری خۆیدا هەڵدەڵێت، یان باسی رووداو و بەسەرهات و کارەساتێك دەکات کە یان بەسەر خۆی هاتووە، یان لە ناوچە و دەڤەر و شوێنی ژیانی ئەو روویداوە، یان بۆیان گێڕاوەتەوە. لەوانەیە حەیرانبێژان حەیران لە ئەوانی دیکە وەربگرن و بیڵێنەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەو جۆرە ئاوازانەیە وەکو دەقەکانی دیکەی فۆلکلۆر دەماودەم ناکرێن و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر ناگوازرێنەوە. ئەمەش بە پێچەوانەی پێناسەی فۆلکلۆرە کە دەماودەم دەکات و لە زارێکەوە دەپەڕێتە زارێکی تر. هەر حەیرانێکیش باس و بەسەرهاتی ناوچەی ئەو حەیرانبێژەیە کە تیایدا ژیاوە، یان پیایدا تێپەڕیوە، کە دەتوانین بڵێین حەیران دۆکیۆمێنتاری زیندووی پڕ لە رووداو و تراژیدیا و بەسەرهاتی ئەویننداری و قارەمانێتی و حیماسە و بەرخودانی پڕ خولیای نەتەوەیە و ناوەرۆك و شێوازی دەبڕینی جۆرەکانی حەیرانی ناوچە جیاجیاکان جیا لە لێکچوون جیاوازیشیان پێکەوە هەیە، واتە لە ناوچەیەکەوە ناپەڕێتەوە بۆ ناوچەیەکی تر. گۆرانی و ئاوازەکانی دیکەی کوردەواری زۆربەی زۆریان جگە لەو تێکست و هۆنراوانەی کە ناوی شوێن و دەڤەرەکانیان لەگەڵە، هەر نازانرێت لە کوێ سەریان هەڵداوە. گۆرانیی هەڵپەڕکێی بەزم و گۆڤەند، یان لاوك لە سەرتاسەری ناوچەکاندا دێن و دەچن و لە هەر شوێنێکدا مۆرکی شێوەزار و ئاخاوتنی ناوچەیی بەسەریاندا زاڵە و لە یەکتر جیادەبنەوە، بەڵام زێدی سەرهەڵدانیان دەست نیشان ناکرێت، مەگەر مێژوو پێمان بڵێ ئەو رووداوە لە فلانە شوێن رووی داوە. بۆیە دەبێت حەیران بچێتە خانەی ئەو جۆرە سامانە گشتی و نەمرەی کە پێی دەوترێت (میللی). ئەمەش هەر سامانێکی نەتەوایەتییە و دەوڵەمەندیی کەلەپووری کورد دەگەیەنێت.

**سەرهەڵدانی حەیران:**

حەیران لە بنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی شێوە ژیانی کۆچەری و گەرمیان و کوێستانکردنی مەڕدار و ئاژەڵداران. بەتایبەت ئەوانەی لە ژیانی نیوە کۆچەری و نیوە دێمانی (گوندنشینی و مانەوە لە گوند)دا دەژیان. لە نیوەی بەهارەوە لە دەشتە گەرمێنەکانەوە بە خۆیان و بە پەز و مەڕ و ماڵاتیان لەگەڵ هەڵکشانی وەرزی بەهاردا بەرەو ژوور هەڵدەکشان و پێ بە پێ لەگەڵی دەڕۆیشتن هەتا بەهاریان لە هەموو شوێنێك تەواو دەرکرد، ئەوجار لە ناوەڕاستی هاوین بەدواوە بەرەو ژێر دەگەڕانەوە و

دەستیان لە ژیانی کۆچەرایەتی و ڕەشماڵنشینی هەڵدەگرت و پاییز و زستانی داهاتوویان بە نیشتەجێبوون لە خانوو و گوندەکان بەسەر دەبرد.

حەیران بەگشتی دوو جۆرە، جۆرێکیان ناوی نراوە ((سەرچیایی))، کە لەمەیاندا حەیرانبێژ بە هەموو توانایەکی گەروو دەچریکێنێت و تێ هەڵدەکات، بۆئەوەی کاتێ کە بەڕێوەن و لە کۆچدان دەنگی بگات بە گوێی خەڵکەکە، یان لە هۆبە و ڕەشماڵەکاندا کە دوور لە یەکتر هەڵدەدران و خەڵکەکە پرژ و بڵاو لە یەکتر کاریان دەکرد، یان پشوویان دەدا. دیارە ئەمجۆرە لە حەیران زیاتر لە کۆچ و کۆچباری و کاتی گەرمیان و کوێستان کردندا گوتراوە. دوور نییە زۆربەی ئەوینە گەرموگوڕەکان لەمەیاندا هاتبێتە سەرزاری شوان و مەڕ لەوەڕین و سەپانەکان و ئەوانەی حەیرانیان چڕیوە و بەتەنیا لە دەشت و کەژانەوە ماونەتەوە و گڕی ئەوین و گراوەکانیان بە حەیرانی "سەرچیایی" و دەنگ هەڵبڕین و هاوار و ناڵەیەکەوە دەربڕیبێت.

جۆرەکەی تری حەیران کە ناویان ناوە ((مەجلیسی))، لە ماڵان و لە کۆڕ و کۆبوونەوەی بەگزادە و پیاوماقووڵان، یان دیوەخانی ئاغا و کوێخا و سەرۆك و هۆز و خێڵەکانی کورددا بە دەنگێکی نەرم و هێورتر گوتراوە. هەڵبەت ئەو حەیران بێژانەی کە دەنگیان خۆشە، گەروویان گونجاوە بۆ وتنی هەر دوو جۆرە ئاوازەکە، بەڵام لەوانەشە هێندێکیان هەر جۆری مەجلیسیان بە لاوە پەسند و گونجاو بوویێت، بەتایبەتی هێندێك لەو حەیرانبێژانە کە پیاوی ناسراو و بەناوبانگ بوون و شایستەی ئەوە بوون کە لەناو جڤات و کۆڕی پیاواندا دانیشن و گەرمیی ژیان و ئەوین و بەسەرهات و ڕووداوە کۆمەڵایەتی و قارەمانەتییەکان بەردەنە ناو دڵی دانیشتووان و دەروون و ناخیان بهێننە جۆش. هەڵبەت نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە حەیرانیش چەشنی سیاچەمانەی هەورامان تەنیا لە پاوانی پیاواندا نەبووە و لەناو کورددا زۆر ژنی دەنگخۆش و بوێر هەبوون کە حەیرانیان گوتووە، وەکو مەنیج حەیران، بە تایبەتی لە پرسە و تازییەکاندا کە بە کەسانی کۆچکردوویان هەڵداوە و بە حەیران شین و شەپۆڕ و گریانیان بۆ کردوون و کۆڕی گریان و فرمێسك باراندنیان بۆ گەرم کردوون. گوێگری حەیران سەرنج دەدات، حەیرانبێژ زۆر جار کتومت وەك گەواڵەی هەوری بەهاران وایە، وەك چۆن لە جێگەیەکەوە شریخە و گرمەی لێ هەڵدەستێ و دەست پێدەکات و بەڕێوە بەرەو باکوور نمە بارانێك دەبارێنێت، بەڵام ڕەهێڵە و ڕێژنە بەخوڕ و تاوەکە لە شوێنێکی زۆر دوور

دەبارێت. هێدێك جار حەیرانبێژیش وادەكات، دەسپێكی چڕینەكەی لە شوێنێكەوە دەڕوا هەتا دەگاتە شوێنێكی دوور، خۆشی و بزە و سەرسامییەك بە گوێگرەكەی دەبەخشێت و گەلێك جار لە كۆڕ و دانیشتنان ((ئۆو...))یەكی دووردرێژ لە دەمی گوێگرەوە دێتەدەر و هونەری حەیرانبێژیش شانبەشانی هونەر و رووداوە سەیرەكانی سروشتە. كەواتە هونەری گۆرانی، مێژوویەكی دێرین و دووردرێژی هەیە و سەرەتای هونەری مۆسیقایە.

**پێناسەی حەیران:**

وشەی حەیران مانای (سەرسووڕماو، سەرگەردان و بەلاگێڕ) دەگەیەنێت، جگەلەوەش واتای جۆرە مەقامێكی كوردی دەبەخشێت كە لەسەر مەقامی بەیات دەگوترێت. لە زمانی عەرەبیشدا ((حەیران)) لە ((الحیر))ەوە هاتووە بەو مانایەی كە كەسێك لە كارێكیدا، یان هەڵوێستێكیدا تووشی وڕی و گێژی و كاسێ بێت و سەری لێ بشێوێت، بەو كەسە (حائر)، یان (حەیران) دەڵێن.

هەر دوو وشەی (حەیران)ی كوردی و عەرەبی، هەر یەكەیان وشەیەكی فەرهەنگی زمانەكەی خۆیانن و بەندن بەو زمانەوە. جۆرە لێكچوونێك لە نێوان هەر دوو وشەكەدا هەیە، زۆرجار حەیرانبێژ لە دووریی خۆشەویست و گراوەكەی و وڕ و گێژ دەبێت و كڵپەی ئەوین سەری لێ دەشێوێنێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە هەر دوو وشەكە یەكن، لەبەرئەوەی كە حەیرانە كوردییەكە لەلای كورد بووەتە ناوی مەقامێك و چەكێكی تایبەتی هەیە و ئەوی لای عەرەبیش تایبەتە بە عەرەب و لە فەرهەنگی عەرەبیدا واتای خۆی هەیە كە باسمان لێوە كرد. نەمر دكتۆر "مارف خەزنەدار" نووسەر و لێكۆڵەر بەم شێوە لەبارەی حەیرانەوە رای خۆی دەربڕیوە: ((حەیران بۆ ئەو بابەتە شیعرییە بەكار ئەهێنرێ كە بەشێوەی كرمانجیی خواروو (سۆرانی) هەڵئەبەسترێ، زیاتر لە ناوچەكانی هەولێر، كۆیە، رواندز، مەهاباد، سەردەشت و پیرانشار و بەتایبەتی لەناو خێڵەكاندا باوە)).

نووسەری كۆچكردوو خالید جووتیار دەڵێت: ((حەیران پارچە پەخشانێكی پاراو و ناسكە، بە زمانێكی سادەی خۆمانە نووسراوە، دەشێ (پەخشانە شیعری) پێ بگوترێ و دەستوور و رێوشوێنی تایبەتی خۆی هەیە. ئەگەر سەربەند و دوابەندی یەك نەگرنەوە، بە حەیران دانانرێت، حەیرانیش بەشی زۆری دڵداری و وەسفە، لەم دواییانەشدا هەستی

نەتەوەیی و چیرۆکی حیماسی و مەسەلەی شەڕ و کارەساتەکانی لەئامێز گرتووە)).
هەروەها رزگار خوشناو بەم شێوە حەیران دەناسێنێت: ((تایبەت بە هێندێ لەو ناوچانەیە کە بەشێوەزاری سۆرانی دەئاخوێن و لەو هەرێمانە بنجی خۆی داکوتاوە و بۆتە زمانحاڵی خەڵك وەك: (دەشتی هەولێر- بەشێك لە خۆشناوەتی- بەشێك لە هەرێمی پشدەر و مەخموور). هەروەها دەڵێت: رستەکانی حەیران رەوتی شیعری تەواویان نییە، کە تێیدا باس لە دڵداری و وەسف و جوانی و شۆخ و شەنگیی ژنان و سیحری سروشت و کەلچەر و کەلەپووری نەتەوەی کورد دەکات، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی و لە قاڵبێکی تەزوو و پڕ لە سۆزی خەیاڵی و دڵگیریدایە کە بە تەواوەتی گوێگر دەخاتە دەریای خۆشەویستی و کەش و دۆخێکی نوێوە)).
((ئەحمەد حەیران))یش لە ((دیوانی حەیران بێژان))دا دەڵێت: ((جۆرێکە لە جۆرەکانی مەقام و تایبەتە بە نەتەوەی کورد، جۆرە ئاواز و هەڵبەستێکی تایبەتی خۆی هەیە. لە لادێوە سەری هەڵداوە و شێوە داڕشتنی زیاتر دەچێتەوە سەر پەخشانە هۆزان، چونکە هەموو دوا بەندەکانی بە یەك سەروا (قافیە) کۆتایی دێت. بە زۆری باسی جوانیی ژن و ئەڤینداری و وەسفی سروشت و کەمێکیش باسی ستایش و پیاهەڵدان دەکات)).
(سەعدوڵڵا ئیسماعیل شێخانی)، کە ئەویش یەکێکە لەوانەی بایەخ بەم بوارە دەدات، لەم بارەوە گوتویە: ((لەنێو دەریای هونەری گۆرانیی کوردیدا، حەیران شەقڵێکی تایبەتی هەیە لە پاڵ مۆرکێکی رەسەنانەی کوردیدا و هەردەم گۆشکراوی خەم و پەژارە بووە)).
(نامق هاوکار)یش وا لە حەیران گەیشتووە: ((حەیران ئەو وشە ناسك و پاراوانە، ئەو وشە پڕ جۆش و خرۆشانە، ئەو وشە سادە و دەروون تەزێنانەیە کە حەیرانبێژ لە سەربەند و دوابەندا لێکی دەداتەوە و بە سەروایەکی وەکو یەك دەستی پێدەکات و کۆتایی پێ دێنێت)). ئەو پێناسانەی کە لە حەیران کران تێگەیشتنی ئەو کەسانەیە کە لە حەیرانیان کۆڵیوەتەوە. دیارە چێژوەرگرتن و تێگەیشتن لەلای هەر خوێنەر و نووسەر و گوێگرێك بەشێوەیەکە و چەمك و دەلالەتی خۆی هەیە، هەربۆیە هەر یەك لەو کەسانە بەجۆرێك لە حەیران گەیشتوون. هێنانەوەی ئەم پێناسانەش بۆ ئەوەیە کە گوێگر و خوێنەر بە وردی سەرنجیان بدات و لە چەمکی حەیران بگات. حەیران ئەو

ئاوازە بە سۆزەیە کەوا لە گەرووی شمشاڵی شوانەکانی کوردستان دێتەدەر و بە سەردەم و ڕۆژگارێکی دیکەمان ئاشنا دەکات، کە ئەویش رابردووە، بەڵگەش بۆ وێنە هونەرمەندی گەورەی شمشاڵژەن ((مام قادر عەبدوڵلازادە، ناسراو بە قالەمەڕەیە)).

حەیران باسی ژیانی سادە و ساکاری کۆمەڵی کوردەواری و جوانی و ناسکیی ژن و خۆشەویستیی نێوان کوڕەتیمە حەیران و کچەتیمە حەیران و جوانی و رازاوەیی سروشتی کوردستان و راو و شکارمان بۆ دەکات و سۆزی پەنگ خواردووی ناخی کوڕەتیمە حەیرانە و دەکوڵێ و هەڵدەچێت. تۆماری ئەڤینە و باس لە بە مراد نەگەیشتن و بێوەفایی ماڵەبابی نازدار حەیرانێ لە بەرامبەر خۆشەویستی و وەفاداریی کچەتیمە حەیران و کوڕەتیمە حەیرانی دەکات. هەناسەیەکە بۆکڕووزی دووری و سۆزداری و توانەوە و هەڵقرچان و فەنابوونی لێدێت، هێندێ جاریش خۆشی و ناخۆشیی نەتەوە و کارەسات و رووداو و نەهامەتییەکان لە دووتوێی حەیراندا دەگونجێنرێن و دەبنە تراژیدیا و مۆرکی حیماسە و بەرخودانی نەتەوەی کورد.

لاوك، کە ئەویش لە جۆرە گۆرانییەکانی کوردە و بە تاکەکەسی دەگوترێت، باسی بەسەرهاتی ئەڤین و دڵداری و سووتان و هەڵقرچان و دووری و بێوەفایی و کارەسات و رووداوی پێوەندیدار بە چیرۆك و داستانە دڵدارییەکانی کورد دەکات و زیاتر لەو ناوچانەی کە بەشێوەزاری کرمانجیی ژووروو دەئاخوێن، باوە.

هەر دوو گۆرانییەکە هەست و دڵپاکی و ئیحساس و گەورەیی و دەوڵەمەندیی کورد نیشان دەدەن.

**جۆرەکانی حەیران:**

بۆ دیاریکردنی جۆرەکانی حەیران هەتا ئێستا دوو را لە گۆڕێدایە:

١- دابەشکردن بەپێی ئەو ئاوازەی حەیرانی پێ دەوترێت (بەرزی و نزمی).

٢- دابەشکردن بەپێی ناوچە، دەکرێت حەیران بکەین بە سێ بەشەوە:

یەکەم: سەرچیایی، (ناوچەی تیرە و هۆزی خۆشناوەتی)، کە شەقلاوە و هیران و هەریر و سەلاحەدین دەگرێتەوە.

دووەم: پشدەری، کە ناوچەکانی کۆیە و رانیە و قەڵادزێ دەگرێتەوە.

سێیەم: حەیرانی دەشتی هەولێر و موکریان کە تایبەتە بە تیرە و هۆزی گەردی و دزەیی و شارەکانی کوردستانی ئێران، وەك: بۆکان، مەهاباد (مەنگوڕایەتی)، سەردەشت و پیرانشار.

رزگار خۆشناو جۆرەکانی حەیرانی بەپێی ناوچە دیاری و دابەشکردووە، بەڵام بەڕای شارەزایانی بواری مووزیك و گۆرانیی رەسەن، حەیران بەپێی ناوچە دیاری ناکرێت، بەڵکو بەپێی شێوەی دەربڕین و گوتنەکە دیاری دەکرێت، لەبەرئەوەی کە حەیرانی ناوچە جیاوازەکان لە رووی فۆرم و ناوەرۆکەوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە و شێوازی گوتنیش لە رووی بەرزی و نزمییەوە دەنگی حەیرانبێژ دیاری دەکرێت.

ئەم جۆرە دابەشکردنە، راست نییە، لەبەرئەوەی کە سەرەڕای لێك نزیکیی فۆرم و ناوەرۆکی حەیرانەکان، وشە و زاراوەکانی نێو تێکستی حەیرانەکانیش هەتا رادەیەکی زۆر لە یەکتری نزیکن، بەڵام غەفوور مەخمووری کە لەم بارەیەوە کتێبێکی نووسیوە، دەڵێت: ((بەڕای من جۆرەکانی حەیران بەپێی ئەو ئاوازەی حەیرانی پێ دەوترێت، دیاری دەکرێت، لەبەرئەوەی دوای وردبوونەوەم لە حەیران بۆم دەرکەوت کە بە دوو جۆر دەگوترێت، ئەلف: سەرچیایی. ب: مەجلیسی. ئەم دوو جۆرە گوتنەش لە هەموو ئەو ناوچانەی کە حەیرانیان تێدایە هەن. حەیرانبێژی ناوچەی خۆشناوەتی، یان دەشتی قەراج، یان پشدەر بەم دوو جۆرە حەیران دەڵێن. بەڕای هێندێ لە فۆلکلۆرناسان حەیران سێ جۆرە: ((سەرچیایی- مەجلیسی- پشتڕێی))، بەڵام سروشتی دەنگی حەیرانبێژەکە وادەکات کەوا حەیران بە دوو جۆر دابەش بکەین.

**ئەلف- سەرچیایی:** ئەم جۆرە حەیرانە بە هەوایەکی بەرز دەگوترێت و دەبێت چینەکانی دەنگی حەیرانبێژەکە بەهێز بن و بە دەنگێکی بەرز حەیرانەکە هەڵبدات، باشترین حەیرانبێژ لەم مەیدانەدا خوالێخۆشبووان: (عومەر گاوەرەیی و حەمەد بەگ)ن. ئەگەر سەرنج و گوێ بدەینە کاسێتە تۆمارکراوەکانیان بۆمان دەردەکەوێت کەوا هەتا چ رادەیەك سەرکەوتنیان وەدەستهێناوە.

**ب- مەجلیسی:** ئەم جۆرە حەیرانە تایبەتە بە مەجلیسی و دانیشتنی نێو دیوەخان و کۆشك و سەرای پیاوماقوولان و بە دەنگێکی نزم و لەسەرەخۆ دەگوترێت، تەنیا دانیشتووانی مەجلیسەکە گوێیان لێ دەبێت و باشترین حەیرانبێژی ئەم بوارەش (مام خدر خەرابەدراوی)یە.

**حەیران لە رووی فۆرمەوە:**

ئەگەر وەکو تێکستێکی فۆلکلۆری سەیری حەیران بکەین، جگەلە ناوەرۆکەکەی، خاوەن فۆرمێکی تایبەت بە خۆشییەتی کە زیاتر لە فۆرمی پەخشانەشیعر نزیک دەبێتەوە و دەتوانین بە پەخشانە شیعریشی دابنێین. رای (ئەحمەد حەیران) ئاوایە: ((شێوەی دارِشتنی زیاتر دەچێتەوە سەر پەخشانە هۆزان)).

(خالید جووتیار)یش لەم بارەیەوە وای بۆ دەچێت: حەیران پارچە پەخشانێکی پاراو و ناسکە، بە زمانێکی سادەی خۆمانە نووسراوە و دەشێت پەخشانەشیعری پێ بگوترێت و (رزگار خشناو)یش لەم بارەیەوە پێی وایە رستەکانی حەیران رەوتی شیعریی تەواو نین.

تێکرِای ئەو رایانەی کە خرانە بەرباس، لەسەر ئەوە کۆکن کە (حەیران پەخشانەشیعرە). ئەم پەخشانە شیعرە لە رووی دارِشتنی وشەکانییەوە هەتا رادەیەکی زۆر رستەکان بەیەکەوە بەستراون و وشە و دەستەواژەی زاراوە و شێوە ئاخاوتنی ناوچەیی و بن زاراوە و شێوەزاری ئاخاوتنی رۆژانە بەسەریدا زاڵە. لە رووی سەرواوە سێ سەروای هەیە. ١- سەربەند. ٢- ناوبەند. ٣- دوابەند.

**حەیران لە رووی ناوەرۆکەوە:**

دوای گوێگرتن لە حەیرانبێژان و وردبوونەوە لە تێکستی ئەو حەیرانانەی کە بڵاوبوونەتەوە، یان بە نووسراوە لەبەر دەست دان، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە لە رووی ناوەرۆکەوە دەبێت بکرێن بە دوو بابەتەوە:

١- سەرەکی. ٢- لاوەکی:

ناوەرۆکی بابەتە سەرەکییەکان بریتین لە: ((دڵداری- سۆزداری- ئایینی- وەسف- دەردی دووری)) و ناوەرۆکی بابەتە لاوەکییەکانیش بریتین لە: ((مێژوو- دڵدانەوە- بەزم و رابواردن- سێکس- پیاهەڵدانی منداڵان- دەردی پیری- وەسیەت و راسپاردە- شیوەن ...)).

١- بابەتە سەرەکییەکان: مەبەستمان لە بابەتە سەرەکییەکانی ناوەرۆکی حەیران ئەو بابەتانەن کە بوونەتە وێردی سەر زمانی حەیرانبێژان و زۆربەی زۆری تێکستەکانی حەیران لەم بابەتانە بێبەش نین. ((دڵداری- وەسف- دەردی دووری- سۆزدان- ئایینی)).

٢- بابەتە لاوەکییەکان: گەلێ بابەت هەن کە بەشێوەیەکی لاوەکی ناوەرۆکی حەیران دەگرنەوە، واتە بابەتی سەرەکی نین و جارجار حەیرانبێژ ئەم جۆرە بابەتانە دەچڕێت، وەکو: مێژوو- وەسیەت- نائومێدی و...

**مەڵبەندی سەرهەڵدانی حەیران:**

لەم بارەیەوە هەر لەمێژەوە وا باو بووە مەڵبەندی سەرهەڵدانی حەیران دەشتی هەولێر و قەراج و کەندیناوەیە و لەوێوە پەلی هاویشتووە بۆ ناوچەکانی دیکە کوردستان، وەکو موکریان، هەڵبەت لەمەڕ ئەم رایە لەناو نووسەران و شارەزایانی فەرهەنگ و فۆلکلۆر و تێکست و دەقە رەسەنەکان بیروڕای جیاواز هەیە. بەڵگەش بۆئەوەی کە لە دەشتی هەولێرەوە سەری هەڵداوە، ئەوەیە کە زۆربەی حەیرانبێژەکان خەڵکی ئەو ناوچە و دەڤەرانەن و ناوی ئەو شوێن و ناوچانەی نێو دەقی حەیرانەکان هەموو هی ئەو دەشتە پان و بەرینەیە و کەم حەیرانبێژ هەیە کە ناوی قەراج و کەندیناوە و هەولێر نەهێنێت. بێجگە لەمە، کاتێک حەیرانبێژ دەست بە گوتنی حەیرانەکەی دەکات لە قەراج و مەخموور هەڵدەستێت و بۆ هەر کوێیەک بڕوا هەر دەگەڕێتەوە ئەو ناوچەیە.

(د. مارف خەزنەدار) دەڵێت: یان لە موکریان و دەوروبەری مەهابادەوە هاتووەتە دەشتی هەولێر، یان بە پێچەوانەوە، بەڵام هونەرمەند (عەزیز شاهڕوخ)رای وایە: ((کە حەیران لە ناوچەی قەراج و کەندیناوەوە سەری هەڵداوە و گەیشتووەتە کوردستانی ئێران)). (غەفوور مەخمووری) پێی وایە: ((کە مەڵبەندی سەرهەڵدانی حەیران دەشتی هەولێر و قەراج و کەندیناوە و مەخموورە)).

(حەسەن سیساوەیی) کە بە شێخی حەیرانبێژانی کورد ناسراوە، لەمەڕ ئەم رایە کە حەیران لە ناوچەی موکریانەوە هاتووەتە دەشتی هەولێر، یان بەپێچەوانەوە، دەڵێت: ((هەموو کەسێ لە دەنگ و هەوای دەشتی هەولێرەوە فێرە حەیران بووە، بۆئەوەی دڵتان بکرێتەوە حەیرانی من هەم هی دەشتی هەولێرەوە هەم هی چیایە. هەروەها دەڵێت: خۆ هەموو کەس وەك یەك نابێت، ئەگەر حەیرانبێژ حەیران بڵێت، خەڵکی کوێ بێت بە هەوای مەڵبەند و ناوچەی خۆی بیلێ خۆشترە)). (ئەسعەد عەدۆ)ش رای وایە کە: (ئەم گۆرانییە تایبەت بە ناوچەی دەشتی هەولێر و بەتایبەت ناوچەی (خۆشناوەتی) و هەروەها بناری (هەیبەت سوڵتان) لە کۆیە و لەسەر سەرلووتکە بەرزەکەی

(قەندیل)-ەوە خۆی گەیاندووەتە ناوچەی (موکریان) و دەور و پشتی (بۆکان) و خولی خواردووەتەوە و لەوێوە بەرەو (مەنگوڕایەتی) و (خانێ) و (سەردەشت) و (قەڵادزێ) و (پشدەر) و هەروەها لەوێوە بەرەو (حاجی ئۆمەران) گەڕاوەتەوە و دەنگی زوڵاڵی بردووەتە نێو ئەشکەوت و گوێچکەی ئەو خانمە شۆخانەی سەرکانی و کانیاوە ئاواتەکانی (زێنوێ) و (دەربەندی رایات) و لەوێش بەسەر لووتکە بەرزەکەی (هەندرێن) و (زۆزك)ەوە بەرەو (داری شەکرانێ) و ناوچەی (بەڕانایەتی) و (شەمامك) گەڕاوەتەوە کانگا و مەڵبەندی خۆی و لە باوەشی (قەراج) و لە (بێژنگ بەسەر) پەروباڵی گف کردووەتەوە.

**گۆرانیبێژانی حەیران (حەیرانبێژان):**

حەمەد حەیران- حەمەدی بەیتان- عومەر گاوەرەیی- حەمەد بەگی- خدر گردگراوی- سەعید باداوەیی- محەمەد گۆران- نادرسیان- خدر خەرابەدراوی- رەسوڵ بێزار گەردی- حەسەن حەیران- جەمیل عەلیاوەیی عەلی کەردار و عارەب عوسمان و...

**جوگرافیای شێوەی گۆرانیی حەیران:**

هەولێر، کەندیناوە، شەمامك، خۆشناوەتی، قەرچۆغ، بێژنگ بەسەر، زوور گەزراو، رایات، دەشتی دزەیی، پشدەر، هەیبەت سوڵتان، زینوێ شێخان، رەواندوز، هەندرێن، زۆزك، سەفین، گەلی عەلی بەگ، داری شەکران، موکریان و بۆکان ناوچەی مەنگوڕایەتی و دەورووبەری شنۆ و زۆر شوێنی دیکە.

**سەردەمی سەرهەڵدانی حەیران:**

سەردەمی سەرهەڵدانی حەیران دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی دەرەبەگایەتی. دوایی گەشەی سەندووە و بایەخی پێدراوە و هەر لەو سەردەمەشدا بە تەواوی گەیشتووەتە چڵەپۆپە. چەند وشەیەکی (ئەحمەد حەیران) هەیە بۆ ئەم بابەتە، کە ئەویش لە پێناسەی حەیراندا دەڵێت: ((وێنەیەکی فۆتۆگرافی ئەم شێوە ژیان و بەند و باوەی کێشاوە کە لە رۆژگاری خۆیدا باوبووە و بەتایبەتی رۆژگاری دەرەبەگایەتی و کۆڕ و کۆبوونەوەی ناو دیوان و دیواخان)). هەروەها حەیران لە دیواخانی ئاغاکاندا بایەخی پێدراوە و حەیرانبێژان تێیدا کۆبوونەتەوە و حەیرانیان چڕیوە.

ئەوەی شایانی باسە و دەبێت ئاماژەی پێ بکرێت، ئەوەیە: لە مۆسیقا و گۆرانیی تاکەکەسیدا ئەم گیانەخرۆشان و هەڵچوون و حیماسەتە، بە گوێرەی جیاوازیی ناوچەکان، ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت و بەپێی هەڵکەوتەی تۆپۆگرافی (بەرزی و نزمی و شاوخاوی بوون)ی ناوچەکان جیاوازیی ئاشکرا هەست پێدەکرێت، کەواتە ناوچە زۆزان و سەختەکان پلەی دەنگ و ریتمی مۆسیقا و گۆرانییان، توند و گورجە و هەتا بەرەو ئاران و پێدەشت و هەردە و هەڵەتی باشووریش شۆڕتر بینەوە، ریتمی مۆسیقا و گۆرانییەکان هێمن و خاو و ئارامتر دەبنەوە. وەك ئەوەی ئەگەر لە جوگرافیای لاوك و لاوژە و حەیران و سیاچەمانەدا کە لە هەرێمە کوێستان و سەختەکاندا ریتمی مۆسیقایان گورج و حیماسی بێت، ئەوا لە پێدەشتەکانی گەرمیانی دەوروبەری کەرکوك و سلێمانی و کرماشاندا مەقامی خەمین و لەسەرەخۆی وەك ئای ئای و قەتار و خاوکەر و هۆرە دەبیسین.

**سەرچاوەکان:**

١- حەیران (چەمك، ناوەرۆك و سەرهەڵدان) غەفوور مەخمووری، هەولێر، ٢٠٠١، ئاراس.

٢- هەمان سەرچاوە - پێشەکی بۆ حەیران: بەدران ئەحمەد حەبیب.

٣- مەقامە تایبەتییەکانی کورد، رزگار خۆشناو، گۆڤاری رۆشنبیریی نوێ، ژمارەی ٨١.

٤- مێژووی مۆسیقای کوردی، محەمەد حەمەباقی، شهر کرد، ١٣٧٥.

٥- گۆڤاری رامان، ژمارەکانی ٦٣ و ٦٤.

٦- گوێگرتن لە کاسێت و وتووێژەکانی هونەرمەندی کۆچکردوو قالەمەڕە.

سوپاس و پێزانین بۆ:

- دکتۆر بەخیتار سەجادی، مامۆستای زانستگای کوردستان لە سنە بەبۆنەی تێبینی و سەرەنجە بەپێزەکانی لە رەوتی بە ئەنجامگەیشتنی بەرگی یەکەمدا.
- دکتۆر رەهبەر مەحمودزادە، بۆ هاندانم بۆ کاملکردنی ئەم پرۆژەیە و هەروەها راوێژە زانستی و بەپێزەکانی.
- هاورێیانی شاعیرم کاک فەرەیدوون ئەرشەدی و کاک ئەیاز خوونسیاوەشان بۆ هاکاری و پێشنیارەکانیان.
- کاک وریا رەحمانی وەرگێڕ بۆ لە ئیختیار نانی هێندێ سەرچاوەی بەنرخ.
- هاورێی شاعیری لاو کاک زانکۆ خەلیفە لە شاری مەهاباد، بۆ یارمەتی و دڵسۆزییەکانی بۆ دەستخستنی سەرچاوە.
- هەموو بەشدارانی ئەم پرۆژەیە و ئەو دڵسۆز و خەمخۆرانەی بەردەوام مشووری ئەم پرۆژەیە بوون ئیزنینان دا بەرهەمەکانیان لەم پرۆژەیەدا چاپ بکرێت.

**سەرچاوەکان:**

**- گۆڤار و کتێبەکان:**

١- گۆڤاری زرێبار، ژمارەکانی ٥٨ و ٥٩ زستانی ٨٤، فایلی تایبەت بە فەرهەنگ و ئەدەبیات و ژمارەکانی ٧٤ و ٧٥ زستانی ١٣٩٠، فایلی تایبەت بە زمان و کۆمەڵگا.

٢- گۆڤاری مەهاباد، ژمارە ١١٢.

٣- ژمارە سەرەتاییەکانی گۆڤاری سروە.

٤- کۆمەڵە وتاری یەکەم کۆڕی نێونەتەوەیی ئەدەبیاتی کوردی، زانستگای کوردستان- سنە، بەشی کوردی.

٥- گەنجینەی فۆلکلۆری کوردی، نامیلکەی دەستنووس، ئامادەکردنی: وریا رەحمانی.

٦- ئەحمەدزادە، دکتۆر هاشم، از رمان تا ملت، وەرگێڕانی: دکتۆر بەختیار سەجادی، چاپی زانستگای کوردستان- سنە.

7- یەعقووبی، عەبدولخالق، لە کولتوورەوە بۆ ئەدەبیات، کۆمەڵە وتار، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم، ساڵی ٢٠٠٨.

**- وێبلاگ و ماڵپەڕەکان:**

- وێبلاگی خێوەت، دکتۆر رەهبەر مەحمود زادە،
http://www.xewat.blogfa.com

- وێبلاگی زڕنەی ئاسۆ، رەئووف مەحمود پوور،
http://www.zerneyaso.blogfa.com

- وێبلاگی جەعفەر حوسێن پوور (هێدی)،
http://www.hedih.blogspot.com

- وێبلاگی پێشەنگ، یوونس رەزایی، شاعیر،
http://www.peshang.blogfa. com

- وێبلانگی زانکۆ خەلیفە، شاعیر،
http://www.zanko.blogfa.com

- وێبلاگی ژوانگەی ئەدەب، شەریف فەلاح،
http://jwan1387.blogfa.com
- ماڵپەڕی سەرەکی کانوونی فەرهەنگی، زانستیی ڕۆنان- مەریوان.
http://www.ronankurd.org/
- ماڵپەڕی سەرەکیی ئەنجومەنی قەڵەمی کوردستانی ئێران،
http://www.qelem.org
- ماڵپەڕی سەرەکیی هەواڵدەریی نێودەوڵەتیی کوردپرێس،
http://www.kurdpress.com

## زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (٢٠١٢)ی

## بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| ١ | مەنفاکان | و. عەزیز رەئوف | شانۆنامە | ٨٣٨ |
| ٢ | ئەکرۆباتێکی ونبوو | ئیسماعیل حەمە ئەمین | وتاری رەخنەیی | ٨٣٩ |
| ٣ | پەیکی شادی | محەمەد سەعید نەجاری | شیعر | ٨٤٠ |
| ٤ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٢ |
| ٥ | خاوەن شکۆ | د. یەحیا عومەر ڕێشاوی | لێکۆڵنەوە | ٨٤١ |
| ٦ | ئایین و ئیستاتیکا | خسرەو میراودەلی | لێکۆڵینەوە | ٨٤٢ |
| ٧ | کولێنەری هەڵم | محەمەد بەرزی | زانستی | ٨٤٣ |
| ٨ | چرایەك لەسەر مادیان کۆ | و. عەزیز گەردی | رۆمان | ٨٤٤ |
| ٩ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٣ |
| ١٠ | سایکۆلۆژیای بەهرەمەندان | عمر مەرگەیی | لێکۆڵینەوە | ٨٤٥ |
| ١١ | شوناسێکی بێنۆقرە | سەردار عەزیز | کۆمەڵە وتار | ٨٤٦ |
| ١٢ | کۆمەڵە وشە و پێکەوەهاتن | د. بێستوون حەسەن | زانستی زمان | ٨٤٧ |
| ١٣ | مێژووی چاپخانەکانی سلێمانی | مارف ناسراو | رۆژنامەوانی | ٨٤٨ |
| ١٤ | وێستگەکان | و. محەمەد کەساس | کۆمەڵە وتار | ٨٤٩ |
| ١٥ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٤ |
| ١٦ | مێژووی دێرینی کوردو شوێنەوارەکانی | کەمال نوری معروف | مێژوویی | ٨٥٠ |
| ١٧ | ئەزموونی چیرۆکنووسین | محەمەد فەریق حەسەن | وتار | ٨٥١ |
| ١٨ | پۆست مۆدێرنەو چەند بابەتێکی شانۆیی | ئەنوەر قادر ڕەشید | شانۆیی | ٨٥٢ |
| ١٩ | هەڵوەدای کوترێك | رەنجەی ئابینا | کۆمەڵەچیرۆك | ٨٥٣ |
| ٢٠ | ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو | عەلا نووری | مێژوویی | ٨٥٤ |
| ٢١ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٥ |
| ٢٢ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٦ |
| ٢٣ | سمکۆ | سەید کەمال ئیبراهیمی | مێژوویی | ٨٥٥ |
| ٢٤ | تەلیسمی گێڕانەوە | کامیل محەمەد قەرەداغی | لێکۆڵینەوە | ٨٥٦ |
| ٢٥ | نارنجی فڕین | ئەمین گەردی گلانی | چیرۆك | ٨٥٧ |
| ٢٦ | ئایین و کایە جیاوازەکان | سەنگەر زراری | کۆمەڵە دیدار | ٨٥٨ |
| ٢٧ | تیۆرە نوێیەکانی رەخنەی ئەدەبی | د. کەمال مەعروف | رەخنەی ئەدەبی | ٨٥٩ |
| ٢٨ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٧ |
| ٢٩ | رەنگدانەوەی ریالیزمی سیحری | حسین سابیر علی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٠ |
| ٣٠ | میدیا و دەسەلات | و. فاروق جمیل کریم | رۆژنامەوانی | ٨٦١ |
| ٣١ | ئەدەبی ئەمریکای لاتین | و. تەها ئەحمەد رەسول | ئەدەبی | ٨٦٢ |
| ٣٢ | پلۆت لە چیرۆکی کوردیدا | بوشرا کەسنەزانی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٣ |

| ٣٣ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٨ |
|---|---|---|---|---|
| ٣٤ | تروسکەیەك لە تاریکیدا | صلاح نیساری | کۆمەڵە چیرۆك | ٨٦٤ |
| ٣٥ | سی و حەوت خوێندنەوەی جیاواز | نەبەز تالیب | بایۆگرافی | ٨٦٥ |
| ٣٦ | سایکۆلۆژیای شۆفێری | بەختیار محمد | زانستی دەروونناسی | ٨٦٦ |
| ٣٧ | بکوژی بابانوئێلەکان | و. مستەفا زاهیدی | کۆمەڵە چیرۆك | ٨٦٧ |
| ٣٨ | بارگە | رەفعەت موورادی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٨ |
| ٣٩ | شێوازی شیعری نوێ- کرمانجی ناوەڕاست | د. حمە نوری عمر کاکی | لێکۆڵینەوە | ٨٦٩ |
| ٤٠ | مادام بۆڤاری (وەرگێڕان) | جەبار سابیر | رۆمان | ٨٧٠ |
| ٤١ | رۆمانە فارسیە هاوچەرخەکان | عمر شینکی | رانانی کتێب | ٨٧١ |
| ٤٢ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار | ژمارە ٧٩ |
| ٤٣ | وەرزەکانی ئەیرۆبیك و دابەزینی کیش بۆ پیاوان و ئافرەتان | و. ریباز ئەحمەد فرج | زانستی | ٨٧٢ |
| ٤٤ | دەقئاوێزان لەشیعری نوێی کوردیدا | شنۆ محەمەد محمود | ئەدەبی | ٨٧٣ |
| ٤٥ | ئەنفال تاوانێکی دژ بەمرۆڤایەتی | ستارە عارف | لێکۆڵینەوە | ٨٧٤ |
| ٤٦ | تەکنیکەکانی سەردەم | جمال محەمەد ئەمین | زانستی | ٨٧٥ |
| ٤٧ | ڕەهەندەکانی شوێنکات لەدەقەوالاکانی شێرکۆ بێکەس | لوقمان ڕەئوف عەلی | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٨٧٦ |
| ٤٨ | لەوڕیوشتە جوانەکانەوە | و. رەئوف حەسەن | کۆمەڵە چیرۆك | ٨٧٧ |
| ٤٩ | جۆرەکانی دەقئاوێزان لە رۆمانی پێنجەمین کتێب | د. نەجم ئەڵوەنی | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | ٨٧٨ |
| ٥٠ | نەریت و کلتووری کوردی | م. زەکیە ڕەشید محەمەد ئەمین | کلتووری | ٨٧٩ |
| ٥١ | گۆڤاری هەنار | | گۆڤار. | ژمارە ٨٠ |
| ٥٢ | شەوانی بۆن و سەفەر | فروغ نیعمەت پور | کورتەچیرۆك | ٨٨٠ |
| ٥٣ | گۆران لە یادەوەری هاوچەرخەکانیدا | ڕێبوار حمە تۆفیق | لێکۆڵینەوە | ٨٨١ |
| ٥٤ | پێگەی پارتە سیاسییە ئیسلامییەکانی کوردستان | فەیسەڵ سلێمان محمد | لێکۆڵینەوە | ٨٨٢ |
| ٥٥ | بنەما و پێکهاتەکانی زاراوە لەزمانی کوردیدا | شەهاب شێخ تەیب تاهیر | زمانەوانی | ٨٨٣ |
| ٥٦ | فۆرمی لۆژیك لە زمانی کوردیدا | د.کاروان عمر قادر | زمانەوانی | ٨٨٤ |
| ٥٧ | حەریق | سەید نەجمەدین عەلی محەمەد | دیوان | ٨٨٥ |
| ٥٨ | ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا . | جلال محمود علی سوبحانی | فەرهەنگ | ٨٨٦ |
| ٥٩ | تەکنیکی گۆرانی وتن | و. یەدیٚ شاکری (هۆگر) | لێکۆڵینەوە | ٨٨٧ |
| ٦٠ | ئێکسیری وشە | و. هادی محەمەدی | رەخنە | ٨٨٨ |
| ٦١ | ژنێك بۆ خۆشویستن | و. دلاوەر قەرەداغی | رۆمان | ٨٨٩ |

| ٦٢ | فەرهەنگی ئەڵمانی - کوردی | عەبدولکەریم عوزێری | فەرهەنگ | ٨٩٠ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٦٣ | فەلسەفەی شارستانی | و. عەبدوڵلا مەحمود زەنگەنە | فەلسەفە | ٨٩١ |
| ٦٤ | لە خاچدانەوەی کریست | و. غەفور ساڵح | رۆمان | ٨٩٢ |
| ٦٥ | میدیا ناسی | شاڵاو جەعفەر | رۆژنامەوانی | ٨٩٣ |
| ٦٦ | دیبلۆماسیەتی کورد لە سەردەمی بوەیهیەکان | ئاراس رەفیق زەینەڵ | مێژوویی | ٨٩٤ |
| ٦٧ | شاسوارێك بەسەر پشتی باوە | و: محەمەد کەریم | رۆمان | ٨٩٥ |
| ٦٨ | پرسی جەستە لە یارییەکی بوونگەراییدا | عەبدولموتەڵیب عەبدوڵلا | فیکریی | ٨٩٦ |
| ٦٩ | کورتەیەك لەسەر جینۆسایدو تاوانکاری نێودەوڵەتی | ئەحمەد فەتاح محەمەد | یاسایی | ٨٩٧ |
| ٧٠ | جەلادێکی قوربانی | پشتیوان عەلی عەبدولرەحیم | کورتە چیرۆك | ٨٩٨ |
| ٧١ | کاریگەری سەوزایی لەسەر ژینگەی شاری سلێمانی | رزگار رەسوڵ عەبدولرەحمان | زانستی باخچەکان | ٨٩٩ |
| ٧٢ | نەمری و گێرانەوە | ئارام صدیق عەبدول | لێکۆڵینەوە | ٩٠٠ |
| ٧٣ | لە پەراوێزی مەرگی شاپەرەوەردا | برایم محێدین عارف | کەلەپور | ٩٠١ |
| ٧٤ | رۆچنەیەك بۆ ئەدەبی کوردی | ئا. شەریف فەلاح | لێکۆڵینەوە | ٩٠٢ |
| ٧٥ | بۆتیقای پێکهاتەخواز | محەمەد تەرەغە | فیکری | ٩٠٣ |
| ٧٦ | ناسیۆنالیزمی کوردی و هۆکارەکانی کامڵ نەبوونی | ئازاد تۆفیق خەیات | لێکۆڵینەوە | ٩٠٤ |

دەستنیشانکردنی ناوی "رۆژهەڵاتی کوردستان" وەك جوگرافیا و ناوچەیەکی تایبەت بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم پرۆژەیە، لە راستی و واقیعێکی سیاسییەوە سەرچاوە دەگرێت و حاشای لێناکرێت، کە نەتەوەی کورد بەسەر چوار وڵاتی جیاوازدا دابەش بووە، کە هەرکامەیان هەڵگری بارودۆخ و تایبەتمەندیی سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و ئابووریی جیاواز لە یەکترن و کوردیش وەك نەتەوەیەکی ژێردەست و کەمینەیەکی پەراوێزخراو، لەژێر کاریگەری و هەژموونی زاڵی ئەو حکومەتانە بەدەر نەبووە و ئەدەبیاتیش وەك یەکێك لە ژێرخانەکانی نەتەوە کاریگەریی هەرکام لەو وڵاتانەی بەسەرەوەیە.

کۆمەڵناسانی ئەدەبیات لەو باوەڕەدان لە هەر شوێنێك زمان و دیالێکتی جیاواز هەبن، ئەدەب و سەرنجی جیاوازیش سەر هەڵدەدەن. لە دەستنیشانکردنی شێواز و ڕێبازی نووسینی هەر نووسەرێکدا، جیا لە خەون و خەیاڵ و هەستە تاکەکەسی و دەروونییەکان، کۆمەڵێکی بەرچاو لە گەوهەر و توخمەکانی پێوەندیدار بە ژینگەی کۆمەڵایەتی و جوگرافیایی بەردەوام کاریگەری و رۆڵیان هەبووە.

بەڕێوەبەرێتیی
چاپ و بڵاوکردنەوەی
سلێمانی
2012